فیۆدۆر دۆستۆیڤسکی

منتدى إقرأ الثقافي

# تاوان و سزا



وەرگێڕانی: کەیوان هەورامی

ڕۆمان



لەگەڵ ١١ شرۆڤە

# تاوان و سزا

**فیۆدۆر میخائیلۆڤیچ دۆستۆیڤسکی**

وەرگێڕانی: کەیوان هەورامی



بەرگی دووەم

ADIBAN

## ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان

بەڕێوەبەری گشتی: ئارامی مەلا محەمەد

**ناونیشان:** سلێمانی، شەقامی ئیبراهیم پاشا، قولکەی گۆزەکان، تەنیشت نارنجلیی ڕۆژهەڵاتی گۆران

**پەیوەندی:** 07701974656 - 07501590032 - 07731974646 - 07501696369

**Email:** bookadiban@gmail.com

**Facebook:** https://www.facebook.com/eadiban/

### ناسنامەی کتێب

ناونیشان: تاوان و سزا.

نووسەر: فیۆدۆر میخائیلۆفیچ دۆستۆیفسکی.

بابەت: ئەدەبیاتی ڕووسی — سەدەی ١٩ی میلادی.

ژانر: ڕۆمان.

وەرگێڕانی: کەیوان هەورامی.

پێداچوونەوە: عیسا عوسمان.

بڵاوکەرەوە: ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان.

دیزاینی دەق: ئارام مەلا محەمەد

ساڵی چاپ: ٢٠٢٠ میلادی، چاپی یەکەم.

## یەک

لوژن بۆ بەیانیی ڕۆژی دواتر، زۆر بە پەرێشـــانی و جددییەتەوە کەوتبووە بیرکردنەوە لە دیدارە چارەنووســـازەکەی نێوان خۆی و دونیـا و پولخێریـا. کە بەیـانی داهـات، ســـەرەڕای ئەوەی لە دڵەوە حەزێکی پێچەوانەی هەبوو، کەچی ناچار بوو بەرەبەرە ئەو ڕاســـتییە پەســـەند بکات کە دوێنێ ئێوارە وەک شـتێکی نەکردە و نامۆ بیری لێ دەکرەوە. بە درێژایی شـــەو حورمەتی شـکاوی وەک ڕەشـــمارێک بە دڵییەوە دەدا. کە هایی بووەوە، دەمودەســـت چووە بەر ئاوێنە و لە خۆی ڕوانی، نەکا نیوەشـەو تووشـی زەردوویی بووبێت؟ نا، سـوپاس بۆ خوا تەندروست بوو و جارێ وا دەهاتە بەرچاو کێشەیەکی نەبێت؛ هاتەوە ســەرخۆی، تەماشـایەکی ڕووخســاری خانەدانانە و سـپیی – هەڵبەتە لەم دواییانەدا خەپ و شـلومل– خۆی کرد و بۆ سـاتێک لێبڕا کە لە شـوێنێکی دیکەدا بۆخۆی بەدوای ژندا بگەڕێت، کێ ناڵێ یەکێکی زۆر باشتریشـی بەنسـیب نابێت. بەڵام هەر زوو گەڕایەوە هەلومەرجە هەنووکەییەکەی خۆی، ڕووی لە ئـاوێنەکە وەرگێرا و قووڵ تفێکی کرد. جووڵەکەی بزەیەکی تانەئامێزی خســـتە ســـەر لێوی ئاندرێی ســـیمیۆنۆڤیچ لیبیزیاتنیکۆف، کە هاوڕێیەکی گەنجی بوو و لای ئەو دەمایەوە. لوژن بە بزەی تانەئامێزی هاوڕێکەیی زانی و دەمودەستیش وەک خراپەیەک بەســەرییدا شـکاندەوە. لەم دواییانەدا چەندان نمرەی نەرێنیی دیکەی لە کارنامەکەیدا بۆ دانابوو. کتوپڕ بە زەینید هات ئەوە ئەوپەڕی بێئەقڵی بووە کە بابەتی گفتوگۆکەی دوێنێی بۆ لیبیزیاتنیکۆف گێڕاوەتەوە. ئەوە یەکەمین جاریشـــی نەبوو، دووەمین جار بوو کە

گەرم دادەهات و لەم جۆرە هەڵانەی دەکردن، ئەمەش هەم لەتاو تووڕەیی بوو هەم بۆ خۆخاڵیکردنەوە. جا وەک بڵێیت هەموو ئەمانە هێشتا کەم بن، بەدبەختی لێی نەدەبووەوە و، ئەو بەیانییە، بەدوای یەکدا، ڕووداوی نەخوازراوی هاتنە ڕێ. تەنانەت بابەتی دۆسییەکەشی لە ئەنجوومەنی پیراندا ڕێکوپێک کاری لەسەر نەکرا. بەڵام لە هەمووی خراپتر خاوەنی ئەو ئەپارتمانە بوو کە لای خۆیەوە بۆ مەبەستی ژیانی هاوبەش بەکرێی گرتبوو و ئێستەش خەریک بوون لەسەر حسێبی ئەو دەستێکیان پێدا دەهێنا و دەیانڕازاندەوە. ئەپارتمانەکە هی بازرگانێکی ئەڵمانیی دەوڵەمەندی تازەچاوپێکەوتوو بوو، لەگەڵ ئەوەشدا بە هیچ شێوەیەک پێی خۆش نەبوو یەک قسە لەسەر هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستەکە ببیستێت، چونکە هێشتا واژۆی خوار گرێبەستەکە وشک نەبووبووەوە و سوور بوو لەسەر ئەوەی بەپێی ڕێککەوتنی نێوانیان بە تەواوی باجی پەشیمانبوونەوەی لێ وەرگرێت، وەک ئەوەی کە هەر بە خەیاڵیشیدا نەیێت کە لوژن ئەپارتمانەکەی وەک چەپکە گوڵێک بە ڕازاوەیی دەخاتەوە بەردەست. هەر هەمان کێشەشی لەگەڵ قەنەفە و ناوماڵفرۆشەکاندا هەبوو و ئەوانیش ئامادە نەبوون تەنانەت یەک ڕۆبڵ لە بەیعانەکەی[1] بدەنەوە، سەرەڕای ئەوەی کە هیچ ناوماڵێک هێشتا نەگەیەنرابوو و لە دوکاندا بوو! *کێ لەبەر خاتری دوو پارچە تەختە ژنی هێناوە، تا من بیهێنم!* لوژن ئەمەی گوت و ددانەجیڕەیەکی کرد و هاوکات دیسان لەوپەڕی بێهیواییدا هیوایەک کەوتە دڵییەوە: *یانی هیچ ڕێچارەیەک نەماوەتەوە و هەموو شتێ براوەتەوە؟ تۆ بڵێی نەکرێ هەوڵێکی تریشی بۆ بدەمەوە؟*

بیرکردنەوە لە دونیای شیرین، دڵیی هێنایە لەرزین و لوژن لەو ساتەدا وەها ئەشکەنجەیەکی ئەزموون کرد کە ئەگەر هەر بە ڕاستی

---

١. بەیعانە: بێعانە؛ عەرەبون؛ عربوول؛ پێشەکیی سەو، پارەیەک کە کڕیار بەر لە وەرگرتنی کاڵا دەیداتە فرۆشیار.

بیتوانیبا لەڕێی ئاواتخواستنێکەوە دەستبەجێ ڕاسکۆلنیکۆف بکوژێت، ئەوا بێ لەوە هیچ ئاواتێکی دیکەی نەدەخواست.

بەدەم گەڕانەوەوە بۆ ژوورەکەی لیبیزیاتنیکۆف، کەسـاسـانە لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *باشـە بۆچی نەمکرد پارەیەک بدەمە دەستی ئەم دایک و کچە؟ ئەمەش هەڵەی خۆم بوو دەی، یانی پێویست بوو ئەوەندە بەزمی جوولەکەیی لێبدەم؟ خۆ ئەم کارە پێویستیی بەو دەستنووقاوییە نەبوو! بۆیە پارەم نەدانێ تا هەر وا لە قەیراندا بمێننەوە و چاولەدەستی خۆم بن... جا ئێستەش سەیرکە چ گێچەڵێکیان بۆ ناومەتەوە! گەر بۆ نموونە هەزار و پێنجسەد ڕۆبڵێم لە دەست بباوە بۆ پاشتێلانە و گەوهەرات و ئەو وردەواڵەیەی کە دەبوو لە فرۆشگەی کنوپ یان دوکانی ئینگلیزیدا دەست دەکەوت*[1]*، ئێستە بە چاکی قسەی خۆمم سوار کردبوو و نەیاندەتوانی دەست بە ڕوومەوە بنێن و ڕەدم بکەنەوە! ئەمانە لەو جۆرە کەسانەن کە ئەگەر هاوسەرگیرییەک هەڵبوەشێننەوە، باجەکەشی دەدەن و پارە و دیاری و هەموو شتێکت ڕادەست دەکەنەوە. وەلێ ئەمانە تاپلووچن و چۆنچۆنی دەیاندایەوە؟ کەواتە نەیاندەتوانی و پاشگەز دەبوونەوە و، دوای ئەوەش، ویژدانیشیان لە کۆڵیان نەدەبووەوە و زوو زوو بە خۆیان دەگوت باشە ئێمە چۆن مرۆڤێکی ئەوەندە دڵئاوامان لە خۆمان توراند؟.... ئمممم، ئەرێ، هەڵەم کرد!*

لوژن هەمدیسـان ددانەجیڕەیەکی کرد و بە خۆی گوت زۆر دەبەنگیت... جا بێگومان لەژێر لێوەوە گوتی نەک بە دەنگی بەرز.

بەم ئەنجامگیرییەوە گەڕایەوە ماڵێ، بەڵام تووڕەیی و پشووکورتیی لەچاو بەیانی و کاتی چوونەدەرەوەی، دووهێندە بووبوو. بێنەوبەرەی ئامادەکردنی فراوێنی بەخاکسپاردن لە ماڵی کاترینا ئیڤانۆڤنادا، تۆزێک

---

١. دوو فرۆشگەی ڕاقی و بەناوبانگ لە شەقامی نێفسکیی پیتەربورگ. «و. ف»

هەستت و هۆشیی شپرزە کرد. دوێنێ بیستبووی کە بڕیارە ڕێورەسمێک بەڕێوە ببرێت و خواردەمەنی ئامادە بکەن و تەنانەت وا دیار بوو ئەویشیان بانگهێشت کردبوو، بەڵام هێندە بە دەردیسەرییەکانی خۆیەوە سەرقاڵ بوو، بە باشی سەرنجی لەوە نەدابوو. لوژن کاتی بەفیڕۆ نەدا و لای خاتوو لیپی ڤیخزیلی خاوەنماڵ زانیاریی لەسەر ڕێورەسمەکە وەرگرت -کاترینا ئیڤانۆڤنا چووبووە سەر قەبران و خاتوونیش لە پێواریی ئەودا هەڵسووڕاندنی کاروباری ماڵەکەی لەئەستۆ نابوو- جا تێگەیشت کە بڕیارە میوانداریییەکی شایستە بکرێت و دەشیا بڵێین هەموو دراوسێکان داوەتن، تەنانەت ئەوانەش کە خوالێخۆشبوویان نەدەناسی. لیبیزیاتنیکۆفیش سەرەڕای دەمەقاڵەکەی پێشتری لەگەڵ کاترینا ئیڤانۆڤنادا، داوەت کرابوو و بەڵام ئەو، بەڕێز لوژن، نەک هەر بە تەنیا داوەتیان کردبوو بەڵکە تامەزرۆیانە چاوەڕێی بوون، دواجار ئەو گوڵی سەر سەبەتەی ئامادەبووان بوو! خاتوو لیپیڤیخزیلیش سەرەڕای بەرکەوتنە نەخوازراوەکانی ئەم دواییانە، هێندە فەرمی و بە ڕێزەوە بانهێشت کرابوو کە ئێستە خەریک بوو بۆ بەڕێوەچوونی ڕێورەسمێکی بێکەموکوڕی بە ڕاست و چەپدا فەرمانی دەکرد و بەملا و بەولادا فرکەفرکی بوو و زۆریش ڕازی بوو. هێندە شکۆدارانەش خۆی ڕازاندبووەوە کە هەر مەپرسە، زیاتر لە هەر ساتێک خانومان و بەخۆناز بوو: ئاوریشمی ڕەشی تازە لە تەوقی سەرییەوە هەتا نووکی پێی داپۆشیبوو. لوژن شتگەلێکی بیستبوون و پزیسکێکیان گرتبووە زەینی و بە بیرێکی قاڵەوە چووە ژوورەکەی، یانی ژوورەکەی لیبیزیاتنیکۆف. لە کاتی گوتوبێژەکەدا بیستبووی بڕیارە ڕاسکۆڵنیکۆفیش بێت.

لیبیزیاتنیکۆف ئەو بەیانییەی لە ماڵەوە بەسەر بردبوو. هەڵسوکەوتی لوژن لەگەڵ ئەم کاکە بەڕێزەدا سەیر بوو و لە

لایەکیشـــەوە -لانیکەم لە هەندێک لایەنەوە- زۆر ئاســـایی؛ هەر لەو ڕۆژەوەی کە هاتبووە لای لیبیزیاتنیکۆف، لە ڕوویەکەوە گەلێک پێی قەڵس بوو و ڕقی لێی دەبووەوە، لە هەمان کاتیشـــدا، لەبەر هەر هۆکارێک بێت سڵی لێ دەکردەوە. هەر بە تەنیا لەبەر پیسکەیی نەبوو کە لەگەڵ گەیشتنە پیتەربورگ لەوێ کۆڵ و باری خستبوو -هەڵبەتە پێدەچوو گرنگترین هۆکاریشی هەر ئەمە بێت- بەڵام لوژن بیستبووی کە هەر ئەم دەستپەروەردەیەی جارانی خۆی، لیبیزیاتنیکۆف، بووەتە یەکێک لە گەنجە پێشـڕەو و ســەرکەوتووەکان و وا شــوێنی خۆی لە ئەڵقەگەلە ناســراوەکانی ڕۆژدا دەکاتەوە و بەرەبەرە دەبێتە داشــێکی گرنـگ. ئەم خـاڵە لوژنی ســـەراســـیمە کرد و خســـتبوویە ژێر کاریگەرییەوە. دەمێک بوو ئەو بە شـێوەیەکی تایبەت و ناڕوون سـڵی لەم ئەڵقە بەهێز و هەمووشـــتزانانە دەکردەوە کە ڕقیان لە هەموو شـــتێک دەبووەوە و دەیانکردە پەڕۆ. هەڵبەتە ئەو لە هیچ ڕێگەیەکەوە لەو ژیانە دوورەشـــارییەدا نەیدەتوانی تا ڕادەیەک وێنای ئەو جۆرە شــتانە بکات و تەنیا وەک ئەوانی دیکە بیســتبووی *پێشــکەوتنخواز* و *نیهلیستەکان* و لەو چەشـنە گرووپانەی دیکە بەتایبەت بە پیتەربورگدا دەخولێنەوە، بەڵام وەک هەمووان زیـاد لە ڕادە گەورەی کردبوو و گرنگی و مانای ڕاســـتەقینەی ئەو وشـــانەی تا ڕادەیەکی ناماقووڵ بەلارێدا بردبوو. لە تەواوی ئەو ســـاڵانەدا زیاتر لە هەمووی ترســـی لەوە هەبوو کە ڕۆژێک بیکەنە *پەڕۆ* و هەر ئەمەش بووبووە هۆکاری ســـەرەکیی دڵەڕاوکێی بەردەوام و بێڕادەی، بەتـایبەت کـاتێکیش کە بیری لە گواســـتنەوەی کـاروبـاری خۆی بۆ پیتەربورگ دەکردەوە. خراپ لەمە دەترســـا، بە جۆرێک کە هەندێک کات وەک منداڵ زیڕەی دەکرد، چەند ســـاڵێک لەوەوبەر، کاتێک کە تازە خەریک بوو کاری ســـەربەخۆی خۆی دەخســـتە ســـەر پێ، دوو دۆســـییەی کەوتبوونە بەردەســـت کە تێیاندا زۆر بێبەزەییانە دەســـتی یەک دوو دانە لە کەللەزلانی شارەکەیان ئاشکرا کردبوو. تەنانەت یەکێک لە دۆسییەکان

ڕسواییەکی باوەڕپێنەکراوی لێ کەوتبووەوە و هەر لەبەر ئەوەش بوو کە لوژن خۆی پێچایەوە تا گەیشـــتە پیتەربورگ بۆ ئەوەی ســـەر لە بابەتەکە دەربکات تەنانەت ئەگەریش پێویست بێت، لەڕێی مەراییکردنی نەوەی گەنجـــــەوە، دەســـتپێشـــخەری بکات و بۆ ئەمەش پشـــتی بە لیبیزیـــاتنیکۆف قـــاییم بوو. تەنـــانەت بەر لە ســـــەردانیکردنی ڕاسـکۆڵنیکۆفیش توانیبووی چەند زاراوەیەکی زەقی باوی ڕۆژ لە بەر بکات...

هەڵبەتە زۆر زوو تێگەیشت کە لیبیزیاتنیکۆف هیچی لە باردا نییە و بە مانای ڕاســتەقینەی وشــە گەمژەیە، بەڵام بەمەش ئاســوودە نەبوو؛ تەنانەت گەر ئەرخەیانیش ببووبا کە هەموو پێشکەوتنخوازەکان گەمژە و لە توخمی لیبیزیـاتنیکۆفن، هەر دڵی ئـارامی نەدەگرت و دڵەڕاوکێ وازی لێ نەدەهێنا. ڕاســــتییەکەی ئەوە بوو کە هیچ حەزێکی بۆ ئەو بنەما و تیۆرییانە نەبوو کە ئەو دەیویســـت بە ســـەرییدا بتەپێنێ. لوژن بەدوای ئامانجی خۆیەوە بوو: دەیویست زۆر زوو تێبگات کە مەسەلە چییە و هەر بە ڕاســتی دەســەڵات بەدەســت ئەم گرووپەوەیە یان نا؟ هۆکارێک هەیە بۆ ترسـان لە ئەوان یان نا؟ ئەگەر فلان و فیسـارە کار بکات، دەیکەنە پەڕۆ؟ ئەگەر دەســـتیان ئاشـــکرا کرد، کتومت بەدوای چییەوەن و بۆچی دەیـانەوێ بیکەنە پەڕۆ؟ هەروەهـا خـاڵێکی گرنگی دیکەش ئەوەیە کە ئەگەر هەر بە ڕاستی دەسەڵات بەدەست ئەوانەوە بێت، ئایا دەکرێت بە جۆرێک لە جۆرەکان ســـمێڵیان چەور بکەیت و بەکاریان بهێنێت؟ پێویســـــت دەکات؟ ناکرێت بۆ نموونە بەکاریان بهێنێت یان لەڕێی ئەوانەوە شتێکی دەست بکەوێت؟ بە کورتییەکەی لە زەینی خۆیدا لەگەڵ چەندان پرسی لەم جۆرەدا کێشمەکێشی بوو.

لیبیزیاتنیکۆف کەســێکی وردیلە و ســیســەڵە و نەخۆش بوو کە لە یەکێک لە بەڕێوەبەرایەتییەکاندا کاری دەکرد، بە قژێکی زەردی ئێجگار

تۆخ و ڕیشـــێکی وەک کوتێلەوە[1] کە زۆریش پێیەوە دەینازی. دایمەی خواش کێشـــەی لەگەڵ چرووچاویدا هەبوو. دەکرا بڵێین دڵێکی باشـــی هەبوو، وەلێ هەندێک جار بە وەها بڕوابەخۆبوونێکەوە دەدوا و خۆی فش دەکردەوە کە گەمژانە بوو و لەبەر ئەوەی لەگەڵ قەلافەتیدا یەکی نەدەگرتەوە، وەک چۆن گـاڵتەجـاڕانەش دەهـاتە بەرچـاو. بەڵام خۆشـەویسـت و سـۆمای چاوانی خاوەنماڵەکەی بوو، چونکە هەرگیز نەیدەخواردەوە و هەمیشـــەش لە کاتی خۆیدا کرێکەی دەدا. وێڕای هەموو ئەم تـایبەتمەنـدیـانە، لیبیزیـاتنیکۆف هەر بە ڕاســـتی کەمێک دەبەنگ بوو و تەنیا و تەنیا خرۆشـانێک بوو کە لەگەڵ نەوەی گەنجدا خۆی بۆ ئامانجی پێشـــکەوتنخوازەکان تەرخان کردبوو. ســـەر بە لەشـــکری ڕەنگاوڕەنگی ئەو فەحانە بوو کە هەرهەموویان کۆمەڵێک دەبەنگی لاسار و نیوەخوێندەوارن و ئامادەن هەرچۆنێک بووە خۆیان بە بیرە باوەکانی ڕۆژەوە هەڵبواسن و هەر دەڵێیت ئەرکیان ئەوەیە بە هەر ئـایـدیـا و ئـامـانجێکەوە بلکێن، بیبیزێنن و بیکەنە گـاڵتەجـاڕی، ئەگەرچی ویستیشیان پاک بێت.

بەڵام لیبیزیـاتنیکۆفیش بەو کراوەییەی خۆیەوە خەریـک بوو بەرەبەرە لە لوژنی هاوژوور و پارێزەرە دێرینەکەی وەڕەز دەبوو. بێ گومـان هەردووک لا نـائـاگـایـانە ئەم هەســـتەیـان لەلا چێ بووبوو. لیبیزیـاتنیکۆف مرۆڤێکی فرە ســـادە بوو، وەلێ ئیدی خەریک بوو دەرکی بەوە دەکرد کە لوژن ئەو بە گەمژە دەزانێت و لە دڵدا پێی قەڵســـە و دەیزانی ســـەروکـاریی لەگەڵ مرۆڤێکی ڕێکوپێکدا نییە.

---

١. کوتێل: جۆرە خۆراکێک کە تێکەڵەیەکە لە گۆشتی قیمەکراو، سیفەزەمینەی کوتراو و تۆزێک ئارد کە وەک هەویرێکی لێ دێت و پارچەپارچە ســووری دەکەنەوە. «و. ک»

ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دابوو تا ڕیشـــا و بنەماكانی فوریە[1] و تیۆریی داروینی دەرخوارد بدات، وەلێ لەم دواییانەدا لوژن گاڵتەجاڕانە گوێی بۆ دەگرت و تەنانەت جوێنیشـــی دەدا. شـــتێک بە لوژنی دەگوت كە لیبیزیاتنیكۆف هەر بە تەنیا گەمژە و فەحەیەک نییە بە تەواوی مانا، بەڵكە لەوانەیە درۆزنیش بێت و تەنانەت لەو ئەڵقەیەشـــدا چوار دانە ناسـیاوی ڕێكوپێكی نەبێت كە بكرێت بڵێیت دەسـتیان دەڕوات و ئەو قسـانەش كە دەیانفڵتێنێت، لەملا و لەولادا بیسـتوونی و فەرمایشـتی ئەوانی دیكەن نەک هی خۆی. وای بۆ دەچوو لیبیزیـاتنیكۆف بە ئەگەرێكی زۆر تەنانەت لەبارەی ئەو بانگەشانەشەوە كە وەک چالاكی دەیكردن، شتێكی وا نازانێت و ئەمەش لەو مشتومڕە بێسەروبەرانەدا دەردەكەوت كە هەمیشـە تووشـی خۆی دەكردن. باشـە ئەم بێقابلیەتە دەیتوانی هیچ كەسـێـک بكـاتە پەڕۆ؟ خراپ نییە زۆر بە كورتی ئاماژەیەكیش بەوە بدەین كە لوژن لەو دە ڕۆژە و بەتایبەت ڕۆژانی سـەرەتادا چێژێكی تەواوی لە تاریف و پیاهەڵدانە زمانلووسـانە و ماسـتاوچییەتییەكەی لیبیزیاتنیكۆف وەرگرتبوو. بە پێویسـتیشـی نەدەزانی قسـە بەلاشـەكانی ئەو ڕاسـت بكاتەوە یان خوانەخواسـتە لە دژیان بوەسـتێتەوە. تەنانەت لەو كاتانەشـدا كە لیبیزیاتنیكۆف ئەوی هەڵنابوو كە دەزانێت گوایە جەنابی لوژن ئامادەیە بۆ دروسـتكردنی

٢. Fourier System: ڕێگەیەكی بیركـارییە كە تـا ئێسـتەش سـوودی لێ وەردەگیرێت، كار لەسـەر شـیكاركردنی هەر هاوكێشـە و بڕێكی بیركاری دەكات لەڕێی دابەش و ڕیزكردنەوە. ناونانی بە فوریە دەگەڕێتەوە بۆ بیركاریزانی فەڕەنسی جۆزێف فوریە (١٧٦٨-١٨٣٠) كە داهێنان و بەرەوپێشـچوونێكی دیاری لە بواری زنجیرە سینگۆشەییەكانەوە هێنایە كایە. «و. ک»

کۆمۆنی[1] تازە لە شەقامی *میشیانسکایا*دا[2] خەرجییەکی باش بکات و یان هەڵیتوپەڵیتێکی لەم جۆرەی کە لوژن بە هیچ شێوەیەک منداڵەکانی داهاتووی لە ناو هەڵناکێشێ و ئەگەر دونیا خاتوون بەر لە تێپەڕینی مانگێک بەسەر زەماوەندەکەیاندا پەیوەندییان لەگەڵ کەسێکی دیکەدا بەست، ئەو ورتەشی لێوە نایێت و لەم جۆرە قسانە. لوژن بەپێی ئەو خووەی کە ساڵانێک لەسەری ڕاهاتبوو، ناڕەزایی دەرنەدەبڕی کە بۆچی لیبیزیاتنیکۆف ئەم شتانەی دەداتە پاڵ و تەنانەت واش دەردەکەوت کە سەرلەبەری پەسەندکراون. بە کورتییەکەی هەر ئەوەندە بەس بوو پێیدا هەڵبدەن، هەرچییەکیشیان دەگوت لە گوێی ئەمدا شیرین بوو.

لوژن ئەو بەیانییە بە چەند دانەیەک لە چەکە لە سەدا پێنجییەکانییەوە لەپشت مێزەوە دانیشت و دەستی کردە ژماردن. لیبیزیاتنیکۆفیش وەک هەمیشە باخەڵی بە تەونی جاڵجاڵۆکە تەنرابوو، بە ژوورەکەدا خەریکی ئامۆشۆ بوو و وای دەنواند کە ئەو سەفتە ئەسکەناسانە بەلای ئەوەوە هیچ بایەخێکیان نییە و تەنانەت سووکیش لێیان دەڕوانێت. جا بە دڵنیاییەوە لوژن بەم شتانە نەدەخەڵەتا و بە هیچ شێوەیەک بڕوای نەدەکرد کە لیبیزیاتنیکۆف ئەو هەموو پارەیە ببینێت و دەست و دڵی نەلەرزێت. لە لایەکی دیکەوە، لیبزیاتنیکۆڤ

---

١. کۆمۆن: کۆمەڵگە یان گرووپێک کە هەموو ئەندامانی لەوەی کە هەیانە بەشدارن و هی هەموویانە. لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا زۆربەی ڕۆشنبیرانی ڕووسی بۆ دەستبەرکردنی ڕەوشێکی سۆسیالیسی هەوڵی پێکهێنانی ئەو کۆمەڵگەیەیان دەدا. «و. ک»

٢. لەنێوان دەیەی ساڵی ١٨٦٠دا پیاوان و ژنانی گەنجی ڕادیکاڵی پیتەربورگ دەستیان کردە ڕێکخستنی چەند کۆمۆنێک لە پیتەربۆرگدا و ڕۆمانی *دەبێ چی بکەین؟* کە بەرهەمی *نیکۆلای چیرنیشفسکی*یە، لە هاندانیاندا ڕۆڵێکی کاریگەری هەبوو. کۆمۆنەکان زۆر زوو بە دژەکڵێسا و خوا و ئاکار ناویان دەرکرد. کۆمۆنی نیهلیستەکان مەودایەکی فرە کەمی لەگەڵ ماڵەکەی ڕاسکۆلنیکۆفدا هەبوو. «و. ف»

خەریک بوو سـوێی ببێتەوە بۆ ئەوەی بزانێت ئاخۆ لوژن ئێسـتە چۆن بیر لەو دەکاتەوە و تەنانەت لەوانەشە زۆر بەوە دڵخۆش بێت کە وەها دەرفەتێکی زێڕینی بۆ لواوە تـا لەم ڕێیەوە ئـامـاژەیەک بە نەداریی هاوڕێ گەنجەکەی و ئەو جیاوازییە زۆرەی نێوانیان بکات و هەڵبەتە بە گومانی خۆی لەڕێی ئەو سـەفتە ئەسـکەناسـانەوە دەیتوانی لە قاڵبی بداتەوە.

لوژن زیاتر لە هەر کاتێک تووڕە و بێباک بوو، هەر نەشـــتدەگوت لیبیزیاتنیکۆف دەستی کردبووە فرەڕێسی لەبارەی باسە دڵخوازەکەی خۆیەوە، یـانی دامەزرانـدنی کۆمۆنێکی نوێ و تـایبەت. ئەو توانجە کورت و خێرایانەی کە لوژن لەنێوان تەقەتەقی دانی چۆرتکەکەوە بە بێڕێزی و دەســـئەنقەســـت لەوی دەدان، هیچ گومـانێکیـان لەوەدا نەدەهێشـتەوە کە هەر بە تەنیا نیازی ئەوەیە گاڵتە بە ئەو بکات. بەڵام لیبیزیاتنیکۆف هەر بە ڕاسـتی مرۆڤ بوو و ئەو بەدخووییەی لوژنی دایە پاڵ داخی یەک ڕۆژ جیایی لە دونیا و خواخوای بوو باســـی ئەم بابەتەش بێنێتە ناوەوە. پەیوەســـت بەم بابەتەوە ســـەرنجێکی ئێجگار پێشـــکەوتنخوازانە و پەنـدئـامێزی لە هەگبەدا بوو کە دەکرا ببێتە دەرمانی ئازاری دڵی هاوڕێ گرانقەدرەکەی و نکوڵیی لێ نەدەکرا کە یارمەتیی پێشکەوتنی دەدات.

– ئەرێ دەڵێی لە ژووری ئەو بێوەژنەدا خەریکی ئـامـادەکردنی مێزن... وایە؟

لوژن کتوپڕ قســـەی بە لیبیزیاتنیکۆف بڕی، جا لە ســـەرەکیترین شوێنی بابەتەکەشدا.

– یانی ئاگادار نین؟ خۆ دوێنێشـــەو خەریک بووم بۆم باس دەکردن کە بۆچوونم لەبارەی ئەم جۆرە ڕێوڕەســـم و کۆبوونەوانەوە چییە...

وا دیارە ئێوەشـــی داوەت کردووە، من وام بیســـت. دوێنێ قســـەتان لەگەڵ دەکرد کە...

– هەرگیز بە خەیاڵمدا نەدەهات ئەو دەرۆزەکەرە فەحەیە ئەو برە پارەیە لە وەها ڕێوڕەســـمێکدا خەرج بکات کە لە دەرۆزەکەرێکی تری فەحەی راســـکۆڵنیکۆفـنـاوەوە وەرگرتووە. هەر ئێســـتە لە کـاتی هاتنەژوورەوەدا، بینیم کە خەریکی چ پەخشانوتەخشانکردنێکن! دەڵێی هەموو پیتەربورگیـان داوەت کردووە! هەر خوا دەزانێ لێرە چی بە چییە!...

لوژن کە پێدەچوو مەبەســـتێکی تایبەتی لە کردنەوەی ئەم باســـەدا هەبێت، درێژەی پێدا:

– ئەرێ بە ڕاست چیتان گوت؟ یانی منیش داوەت کراوم؟

پاشانیش کتوپڕ سەری هەڵبڕی و بۆی زیاد کرد:

– باشـــە ئەم داوەتە کەی بووە کە من بیرم نییە؟ خۆ من تاقەتیم نییە. ســـەری ســـیرم، قونکی پیازم؟ دوێنێ هەر ســـەرپێیی لە دەمم دەرچوو کە لەبەر ئەوەی مێردەکەی فەرمـانبەری دەوڵەت بووە و خۆشـی ئێســتە هەژار و دەســتکورتە، بۆی هەیە یارمەتیی بدەن. نەکا لەبەر ئەوە ئێمەی داوەت کردبێ؟ هەهەهە!

لیبیزیاتنیکۆف گوتی:

– منیش هی ئەم جۆرە ڕێوڕەسمانە نیم.

– کاکە دەستخۆش! ئەو ژنەتان داوەتە بەر لەقە و بۆگز، جا ئێستە منەتیش دەکەن! دەی، دیارە کە تەریق دەبنەوە، هەهەهە!

– کێ؟ من کەسێکم داوەتە بەر لەقە و بۆگز؟

لیبیزیاتنیکۆف پەشۆکا و تەنانەت خوێنیش پەڕییە ڕووخساری.

– بەڵێ دەی! ئێوە لە کاترینا ئیڤانۆڤناتان دا، هەر مانگێک لەمەوبەر. دوێنێ بەسەرهاتەکەیم بیست، جەنابی پایەبەرز... ئەوەش بیروباوەڕە پتەوەکانی ئێوە!... ئیتر پرسی مافی ژنانیش کە خستبووتانە بەر باس، خۆمان خۆش، هەهەهە!

لوژن دەتگوت بە تەواوی ئاسوودە بووە کە قسەکانیی کردن و ئیدی پەرژایەوە سەر حسێبوکتێب و چۆرتکەکەی.

لیبیزیاتنیکۆف هەمیشە کە خۆی لە هەر ئاماژەکردنێک لەم بابەتە دەدزییەوە، هاواری لێ هەستا:

– بوختانە بەڕێز، قسەی قۆڕە! ئەسڵەن وا نەبووە! مەسەلەکە زەوی تا ئاسمان لەگەڵ ئەوەدا جیاوازە... بە پێچەوانەوە هەواڵەکەیان پێ گەیاندوون، ئای لەدەست ئەم هەڵیتوپەڵیتە فاتوفیتکەرانەیە! منی داماو لەو مەسەلەیەدا تەنیا بەرگریم لە خۆم دەکرد. ئەوە کاترینا ئیڤانۆڤنا بوو کە سەرەتا بەو چرنووکانەیەوە بەگژمدا هات و... ڕیشی دەرهێنام... هەموو کەسێ مافی بەرگریلەخۆکردنی هەیە، لام وایە هیچ گومانێ لەمەدا نییە! هەروەها، منیش بنەمایەکم هەیە و ڕێ نادەم هیچ کەسێ زۆری خۆیم بەسەردا بسەپێنێ... چونکە شەڕەنگێزیش بە جۆرێ لە جۆرەکان هەر ستەمکارییە. یانی دەبوو وەک پارچە تەختەی وشک لەوێ ڕاوەستابام و لێدانم بخواردبا؟ دەی خۆ تەنیا پاڵێکم پێوە نا.

لوژن هەر وا خەریک بوو نارەسەنانە گاڵتەی بە هاوڕێکەی دەکرد:

– هەهەهە!

– ئێوەش حاڵتان باش نییە و تووڕەن، گرتووتانە بە منەوە!... بەڵام، ئەمە هەموو قسەی بێسەروبەرە و هیچ پەیوەندییەکی بە پرسی ژن و مافی ژنانەوە نییە! ئێوە لە نووکەوە بۆ نووک بە هەڵە تێی گەیشتن. سەرەتا وام بیر دەکردەوە کە ژن و مێرد لە هەموو لایەنێکەوە

یەکسانن، تەنانەت لە لایەنی هێزی جەستەییشەوە (کە هەندێکیان بێ ئەوەی هێشتا هیچ بووبێ بانگەشەی ئەوە دەکەن!)، کەواتە لەم ڕووەشەوە دەبێ یەکسانی لە بەرچاو بگیرێ! هەڵبەتە دواتر بە خۆمم گوت وەها پرسێک نابێ بورووژێنرێ، لەبەر ئەوەی نابێ هیچ شەڕ و دەمەقاڵێیەک لەئارادا بێ. هەر لە بنەڕەتەوە لە کۆمەڵگەی داهاتووی ئێمەدا شوێنێک بۆ شەڕ و دەمەقاڵێ نییە... ئاخر چۆن دەکرێ تەنانەت وێناشی بکەین؟ جا ئەوەش شتێکی زۆر سەیرە کە لە گەرمەی شەڕدا بەدوای یەکسانییەوە بێ! ئەوەندەش گەمژە نیم من... ئەم شەڕ و دەمەقاڵێیانە تەنیا ئێستە هەن... خۆ بڕیار نییە لە داهاتوودا هەبن... بەس بە داخەوە لە کۆمەڵگە مرۆییە ئەمڕۆییەکاندا هەن هێشتا... دەک سندان لە هەموویان بدا! قسەکردن لەگەڵ ئێوەدا هەر ئەمەی لێ دەکەوێتەوە دەی، مرۆڤ سەری لێ دەشێوێ... نا، بە هەڵە تێگەیشتن، لەبەر ئەوە نییە کە نامەوێ بچمە ئەو ڕێوڕەسمە. خۆ گوتم منیش بنەمام هەیە بۆ خۆم و ئامادە نیم بچم تێکەڵی ئەم دابونەریتە ژەنگگرتوو و قێزەونەی ڕێوڕەسمی تازیە و فراوێنی بەخاکسپاردنە بم... ئەمە هۆکاری نەڕۆیشتنی منە، نەک هیچ شتێکی ترا! هەڵبەتە خراپیش نییە مرۆڤ بچێت و تێر پێبکەنێ... حەیف کە بڕیار نییە قەشە بێنن. گەر قەشە و شتیشی تێدابا ئەو هەلەم لەکیس خۆم نەدەدا و دەڕۆیشتم!

– یانی ئامادەن لەسەر سفرەی لیقەوماوێک دانیشن و تێر و پڕ بخۆن، لەگەڵ ئەوەشدا تف بکەنە ئەو سفرەیە و خانەخوێکەشتان بکەنە گاڵتەجاڕی خەڵکی کە بە ناخێری گیانی داوەتی کردوون! مەبەستتان ئەمەیە یانی؟

– تفی چی؟ نەخێر، قسەی من ئەوەیە کە مرۆڤ دەبێ نارەزایی خۆی نیشان بدا. من ئامانجێکی بەرزتریشم هەیە و لەوانەیە بتوانم بە جۆرێ لە جۆرەکان هاریکاریی ڕۆشنگەری و بانگەشەکەمان بکەم لەم

نێوەندەدا، ئاخر ڕۆشنگەری و بانگەشە ئەرکی یەک بە یەکی ئێمەیە و لەوانەشــە تا پەیامەکەمان توندوتیژتر بن، ئەنجامێکی باشــتریشــیان هەبێ! لەوانەیە بتوانم ئایدیاکانم وەک تۆو بچێنم... جا کتوپڕیش سەیر کەی ئائەو تۆوە بەرێکی داوە. ئێســـتە کوێی کارەکەی من تفکردنە لەمانە؟ بۆی هەیە لە ســـەرەتاوە لە بەردڵیان گران بێ، بەس دواتر تێدەگەن چ چاکەیەکم لەبەرانبەر کردوون. هەر لەم دواییانەدا خاتوو *تیریبێینوای* خۆمانیان، کە ئێســـتە بووەتە ئەندامای کۆمۆن، لۆمە دەکرد کە بۆچی کاتێ دەســـتی لە خێزانەکەی هەڵگرتووە و... خۆی لە باوەشی خۆشەویستەکەی ناوە، بۆ دایک و باوکیی نووسیوە کە ئیتر ئامادە نییە وەک عەوام و لەگەڵ هەمان دابونەریتە تاڵکێشـــبووەکاندا بژی و خەریکە دەچێتە نێو ژیانێکی تازە و هاوســـەرگیرییەکی ئازاد دەکا... دەیانگوت شـێوازی نووسـین و قسـەکانی زۆر زبر و بێڕێزانە بوونە و دەیتوانی زیاتر ڕەچاوی ڕێز و حورمەتی دایک و باوکی بکا. من دەڵێم قســەکانیان پڕوپووچن، بۆ نەرمونیانی تا ئێســتە کێشــەی کەسی چارە کردووە؟ نەرمونیانیمان بۆچییە! بە پێچەوانەوە، نارەزایی بەکەڵکمان دێ، نارەزایی! ئەی خاتوو *ڤارێنتس* کە حەوت ساڵی ڕەبەق لەگەڵ مێردەکەی ژیا، پاشانیش دەستی لە هەردوو منداڵەکەی هەڵگرت و ڕێکوڕەوان بۆ مێردەکەیی نووسی: *دواجار تێگەیشتم کە هیچ کاتێ ناتوانم لەگەڵ تۆدا بەختەوەر بم. تا دواهەناسە ناتوانم لێت ببوورم کە فریوت دام و لێت شـاردمەوە کە سـیسـتمێکی کۆمەڵایەتیی تریش هەیە... ئەم کۆمۆنانە. تۆ پێت نەگوتم وەلێ لەم دواییانەدا لە کەسێکی تێگەیشتووەوە بیستم و خۆشمم دایە دەستی ئەم کەسە تێگەیشتووە و دەمانەوێ پێکەوە کۆمۆن پێک بێنین. ڕێکوڕاســت قســەی خۆمت بۆ دەکەم، چونکە بێشـــەرەفییە بمەوێ بتخەڵەتێنم. تۆش چیت پێ باشـــە بیکە. بیر لە پاشـــەکزکردنەوەی منیش مەکەوە ئیتر درەنگە! هیوادارم بەختەوەر و شاد بی!* بیستتان؟ دەبێ ئەئاوا بنووسی!

– خاتوو تیری‌بیێڤا ئەوەیە کە گوتت سـێیەمین هاوسـەرگیریی ئازادیشی کردووە لەسەر خێر؟

– نەخێر، گەر بمانەوێ وردتر بیڵێین دووەمینە! جا قەیدی چییە! گریمان چوارەم یان پازدەیەمیش بێ، لەو قسـە بێمانایە! من تا ئێستـە خەفەتم بۆ مردنی دایبابم نەخواردبوو، وەلێ ئێستـە با. بە خۆم دەڵێم ئاخ ئەگەر زیندوو بان، وام پێ دەکردن تا ماون بتلێنەوە! بە مەبەسـت بەزمێکم دەنایەوە کە... تێبگەن لەدژوەستانەوە چییە و چ تامێکی هەیە! نیشـانم دەدان! سـەراسـیمەم دەکردن! ئاخ خۆ ئیتر کەسـوکارێک نەماوەتەوە!...

لوژن قسەی پێ بڕی:

– تا سـەراسـیمە بکرێن، ها؟ هەهە! باشـە، خۆتان باشـتر دەزانن. وەلێ ئێسـتە بلێن بزانم، ئێوە کچی ئەم خوالێخۆشـبووە دەناسـن؟ مەبەسـتم هەمان ئەو کچەیە کە هەر دەڵێی لوولەی نێرگەلەیە! ئەو قسانەی کە لەبارەیەوە دەکرێن ڕاستن؟

– جا چییە؟ بە بۆچوونی من، یانی گەر بۆچوون و قسـەی دڵی منتان بوێ، ئەوا دەڵێم بە لامەوە ئاسـاییە ژن و شـت وا بێ! باشـە بۆ وا نەبێ؟ دەی، لێگەڕێن بـا بـابەتەکە بکەینەوە. هەڵبەتە لە کۆمەڵگەی ئەمڕۆیی ئێمەدا ئەمە بە شـتێکی ئاسـایی نایێتە ئەژمار، چونکە بە زۆرە! وەلێ لە کۆمەڵگەیەکی نموونەییدا سـەد لە سـەد ئاسـاییە و دەبێتە شـتێکی ئارەزوومەندانە و خۆخوازانە! تەنانەت لەم دۆخە هەنووکەییەشـدا ئەم کچە کارە ڕاسـتەکەی کردووە. کوێرەوەری سـەری تێ نابوو و، دەی، هەر ئەمەی بەدەسـتەوە بوو، یانی وەک دەڵێین سـەرمایەی کەسـی بوو و خۆیشـی سـەرپشـک. هەڵبەتە لە کۆمەڵگەیەکی نموونەیی تردا هیچ کەسـێ سـەرمایە و ئەم جۆرە شتانەی ناوێ و ڕۆڵی کەسیی ژن بایەخێکی تری دەبێ، زۆر لۆژیکیانە

و تەواو هاوئاهەنگ لەگەڵ دەوروبەردا. لەبارەی خودی کەسایەتیی سۆنیا خاتوونیشەوە، لەم دۆخەدا کارەکەی ئەو وەک ناڕەزاییەکی شاز لەدژی پێکهاتەی کۆمەڵگە لێک دەدەمەوە؛ ئەسڵەن ئەم جووڵەیەی نموونەی ناڕەزاییە لەدژی ئەو سیستەمەی کە بەسەر ئەم کۆمەڵگەیەدا فەرمانڕەوایە! هەر لەبەر ئەوەشە ڕێزێکی زۆر زۆری بۆ دادەنێم و کە دەیبینم دەگەشێمەوە!

– وەلێ بیستم کە ئێوە واتان کرد لێرە وەدەری نێن!

لیبیزیاتنیکۆف چەقۆت لێ بدابا خوێنی لێ نەدەهات، هاواری کرد:

– بوختان بە دوای بوختاندا! بە ڕەهایی وا نەبووە! بە هیچ شێوەیەک! بە جددیمە، کاترینا ئیڤانۆڤنا لە خۆیەوە ئەمانەی گوتن، چونکە ئەو ژنەتیوە لە هیچ تێنەدەگەیشت! من هەر دەستیشم بەر سۆنیا خاتوون نەکەوتووە، چ جا بگا بەوەی کە مەرایی بۆ بکەم! تەنیا دەمویست چاو و گوێی بکەمەوە و هیچ مەرامێکیشم پێی نەبوو! تەنیا دەمویست وای لێ بکەم ناڕەزایی دەرببڕێ... تەنیا دەمویست پاڵێکی پێوە بنێم بەرەو ئەولا. جا لەم نێوەندەدا گەر منیش نەبام، سۆنیا خاتوون هەر نەیدەتوانی لێرە بمێنێتەوە!

– بانگهێشتتان کرد بۆ ئەو کۆمۆنەتان، ها؟

– ببوورن ها، جەنابی لوژن، بەڵام ئەم گاڵتانەی کە دەیانکەن، زۆر ناخۆش و بێتامن! لە کۆمۆندا هیچ کەسێ وەها ڕۆڵێکی نییە... خۆی کۆمۆن بۆ ئەوە پێک هێنراوە تا ئەم شتانە نەبن! وەک ئەوەی کۆمۆن دونیایەکی ئاوەژوو بێ و هەرچی لێرە گەمژانە بێ، لەوێ ژیرانە بێ، هەر شتێکیش نائاسایی دیار بێ، لەوێ ببێتە ئاسایی! دەوروبەر، بەڕێز گیان! دەوروبەر سەرەکییە و یەکلاییکەرەوەیە. مرۆڤ هیچبەدەستە. لەگەڵ ئەوەشدا، بە کوێرایی چاوی ناحەزان، من و سۆنیا خاتوون پەیوەندیمان تا ئێستە زۆر باش بووە و ئەمەش دەری دەخا تا ئێستە

هیچ کات هەستی نەکردووە کە من خراپەم لەگەڵ کردووە یان دژمنیم! ڕاســـتە، من تەقەللامە تا بیهێنمە ناو کۆمۆنەکەمان، وەلێ ئامانجم شـــتێکی ترە، قوربان! ئەمە کوێی پێکەنیناوی بوو؟ دەمانەوێ کۆمۆنی خۆمانمان هەبێ، کۆمۆنی ئاســـایی نا، کۆمۆنێکی تایبەت، کە لەســـەر بنەماگەلی بەرفراوانتر بێ. بیروباوەڕمان ڕۆژ دوای ڕۆژ پتەوتر دەبێ و هەر ڕۆژەو شتی زیاتر ڕەد دەکەینەوە! خودی *دابرالۆبافیش* گەر لە گۆڕەکەی بهاتبا دەر، مشـــتومڕێکمان لەگەڵ دەکرد کە هەر مەپرســـە! ئەوە هەر باســـی *بلینسـکی* مەکە، بڕســـتمان لێ دەبڕی! هێشـتا هەر وا خەریکی پەروەردەکردنی سۆنیا خاتوونم! نازانن سرووشتێکی چەندە جوان و بەرزی هەیە ئەم کچە!

– جا ئێوەش بە دڵی خۆتان ئەم ســـرووشـــتە جوانە (وەک دەڵێن) دەقۆزنەوە، ها؟ هەهەهە!

– نا، بە هیچ شێوەیەک! هەرگیز! ڕێک بە پێچەوانەوە...

– یانی بە پێچەوانەوەیە مەســـەلەکە! هەهەهەهە! ئێوەش لەم نێوەندەدا قسەیەکی سەیروسەمەرەتان فڕێدا!

– باوەڕ بکەن! ئاخر، بۆچی دەبێ درۆتـان بۆ بکەم؟ هـا؟ بۆچی؟ هەر بە ڕاستیش خۆم تیاماوم کە ئاخۆ بۆچی کە دەگاتە من شەرمنتر و سەنگینتر دەبێ و وەک ئەوە وایە کە تەریق بێتەوە!

– ئێوەش بەدەم پێشـکەوتنەوە خەریکن دەیکەنەوە... هەهەهە! هەڵبەتە خەریکن بۆی بسەلمێنن کە ئەم سـەنگینی و شـەرموحەیایە لە شـتێکی بێکەڵک بەولاوە هیچی تر نییە، ها؟...

– نەخێر! بە هیچ شـــێوەیەک! ببوورن، وەلێ تێگەیشـــتنی ئێوە لەبارەی پێشکەوتنەوە ئێجگار ڕووکەشییە و بە جۆرێ لە جۆرەکانیش نەفامانە! ئێوە بە هیچ شێوەیەک تێناگەن! خوایە گیان، ئاخر ئێوە چۆن

تا ئێستە ئاوا بە کاڵفامی ماونەتەوە! ئێمە خەریکین خۆمان دەپڕووکێنین بۆ ئازادیی ژنان و کەچی ئێوەش هەر هەمان بیرکردنەوە نەفرەتییەکە لە کەللەی پیرۆزتاندایە!... گەرچی بە گشتی پرسی شەرموحەیای ژنانە و داوێنپاکی لە خۆیدا شتێکی پڕوپووچە وەلێ ئەوە پەسەند دەکەم کە سۆنیا خاتوون شەرم لە من بکا، چونکە مافی خۆیەتی و ئەم ئازادییەی هەیە! هەڵبەتە ئەگەر خۆی پێم بڵێ *دەمەوێ لەگەڵ تۆ بم*، دەبمە بەختەوەرترین پیاوی دونیا، چونکە ئەم کچەم زۆر خۆش دەوێ! بەس لەم هەلومەرجە هەنووکەییەدا ئێوە بفەرموون و کەسێ بێنن کە لە من هاوڕێیانەتر و بەڕێزانەتر هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کردبێ... یان لە من زیاتر خەمی حورمەت و پێگەی ئەوی هەبێ. من لێرە تەنیا چاوەڕێم و تامەزرۆی ئەو ڕۆژەم کە... هەر ئەوەندە!

– دیارییەک، شتێکی بدەنێ کارەکەتان خێراتر جێبەجێ دەبێ. گرەو دەکەم خۆتان شتی واتان بە مێشکدا نەهاتبوو!

– ئاخ، دە تێناگەن ئێوە، خۆ پێم گوتن! هەلومەرجەکەی، دەی، دیارە، وەلێ قسەکە شتێکی ترە! ناچێتە مێشکتانەوە ئێوە، قسەی من شتێکی ترە! مێشکی ئێوە باش نالێ لەبارەی ئەم کچەوە، چونکە بە خەیاڵی خۆتان خەریکن حەقیقەتێک دەبینن کە بە بۆچوونی ئێوە –جا هەڵبەتە بە هەڵە– چەپەڵ و قێزەونە، ماچێکی ئینسانیەتتان کردووە و خستووتانەتە لاوە و لێبڕاون کە ئیتر وەک مرۆڤێک ئەو نەبینن! ئێوە نازانن چ کەسایەتی و سرووشتێکی هەیە ئەم کچە! من تەنیا خەفەتی شتێ دایگرتووم: لەم دواییانەدا دەستی لە کتێبخوێندنەوە و کتێبوەرگرتن بە ئەمانەت شۆردووەتەوە! پێشتر بە ئەمانەت کتێبم دەدایێ. هەروەها زۆر بە داخەوەم کە سەرەڕای ئەو وزە و مکووڕییەی کە لە نارەزاییدەربڕینەکەدا نیشانی دا، کەچی بڕوابەخۆبوونی زۆر لاوازە و دەڵێی هێشتا وەک پێویست سەربەستیی تایبەتی نییە تا

بتوانی... کۆمەڵی خورافات و وەهم تووڕ بدا. وەلی هێندە باش هەندێ پرســـی دەچنە مێشـــکەوە ئەم کچە! بۆ نموونە ماچکردنی دەســـتی کەسێک. دەی، سووکایەتیکردنە بە ژن کە پیاوێک بیەوێ دەستی ماچ بکا، بۆ خۆی نیشـــانەی نایەکســـانییەکی تەواوە![1] گوتوبێژمان لەســـەر ئەم بابەتە کرد و هەموو شتێکم بۆ شی کردەوە. کە باسی یەکیەتیی کرێکارانی فەرەنســـاشم[2] بۆ کرد، چاک گوێی بۆ شل کردبوو. ئێستە خەریکم پرسی مەترسیداری ئازادیی *چوونەژوورەوەی ناو کۆمەڵگەی نموونەیی*[3] بۆ روون دەکەمەوە.

– چیی بۆ روون دەکەنەوە؟

– لەم ماوەیەدا وەها باســـی هاتە ئارا: ئایا ئەندامانی کۆمۆن ئەو مافەیان هەیە هەر کاتێ حەزیان کرد بچنە ژووری ئەندامانی دیکەوە، جا ئەو ئەندامانە چ ژن بن یان پیاو؟ بڕیاری کۆتاییش ئەوە بوو کە بەڵێ، ئەو مافەیان هەیە!

– ئـــاخر، ئەی ئەگەر کـــاتەکە شـــیـــاو نەبوو و بۆ نموونە ئەو، پەرژینێکی ئەســـتوور بێ لە رووتاندا، خەریکی کارێکی پێویســـت بوو؟ هەهەهە!

---

١. ئەم خاڵە بە راشـــکاوی لە رۆمانی «دەبێ چی بکەین؟»ی چیرنیشـــێفســـکیدا خراوەتە روو و دۆستۆیفسکی وەک گاڵتەپێکردنێک لە زمانی لیبیزیاتنیکۆفەوە ئاوها دەیڵێتەوە. «و. ف»

١. گۆڤـاری ســـەردەم لەو دەورانەدا گرنگییەکی زۆری بە یەکیەتیی کرێکـارانی فەرەنسا دەدا و لە ساڵی ١٨٦٤دا رای وا بوو کە سەرپێکەوتنی ئەم یەکیەتییە، نەک بە تەنیا جۆرە ئازادییەک، بگرە پێشکەوتنێکی ئاکاریشە بۆ چینی کرێکاران. «و. ف»

٢. چیرنیشـــێفســـکی لە رۆمانی «دەبێ چی بکەین؟»دا خســـتییە بەر باس ژن و پیاوێک کە پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتییان هەیە، هەرکامیان ژوورێکی تایبەتییان هەیە کە پاشـــێلکردنی ســـنووری ئەو ژوورە قەدەغەیە و هەروەها ژوورێکی هاوبەش بۆ نانخواردن و... ئەو پرســـەی کە لیبیزیاتنیکۆف لێرانەدا دەیخاتە بەرباس، زیاتر لە پرسەکەی چیرنیشێفسکی پێی لێ رادەکێشێت. «و. ف»

لیبیزیاتنیکۆف کە ئیدی خەریک بوو دەیری دەبوو، بە ڕقەوە هاواری کرد:

– ئێوەش بیرتان هەر بە دەوری ئەم کارە پێویستانەدا دەخولێتەوە! ئاخ نازانن چەندە لە خۆم پەستم کە ئەم حەزە پێویستانەم نایە دەمتان! ئەو کاتە بوو کە خەریک بووم باسی سیستمەکەمانم بۆ دەکردن. سندان لە دۆخی وەها دا! مرۆڤ سەروکاریی لەگەڵ کەسێکی وەک ئێوەدا بێ، لەم شتانەدا تووشی کێشە دەبێ، چونکە بێ ئەوەی بزانن و تێبگەن دەیدەنە بەر قەشمەریات! ئێوە لاتان وایە لەسەر هەقن و چ شانازییەکیش بە خۆتانەوە دەکەن! تف! زمانم مووی لێ دەرهات هێندەی بە خۆم بڵێم دەبێ ئەم پرسە بخرێتە کۆتا یان ئەو کاتەی کە تازەکارەکان لانیکەم سەرە واوێک لە مێشکیاندا بێ! نابێ هەر وا بە گۆترە بیدەیتە دەست کەسانێ کە هێشتا بیروبڕوایەکی ڕێکوپێکیان نییە! هەر بە ڕاست، تکا دەکەم من لەم بڕگەیە تێبگەیەن: جەنابی بەرزوبەڕێز، بۆ نموونە ڕقتان لە چیی چاڵی ئاوەڕۆیە و پێی تەریق دەبنەوە؟ ئەوە من ئامادەم هەر ئاوەڕۆیەک بڵێن، پاکی بکەمەوە! بابەتەکەش لەخۆبردوویی و قوربانیدان و ئەمانە نییە! کارە بەڕێز گیان، کار! کاری چاک و بەسوود بۆ کۆمەڵگە! هیچیشی لە کارەکانی تر کەم نییە! تەنانەت زۆر لە کاری کەسانی وەک ڕافایل و پووشکینیش ئاوڕوودارانەترە! بۆچی؟ چونکە بەسوودترە![1]

– بەڵێ، ئاوڕوودارانەترە. ئاوڕوودارانەتر، هەهەهە!

– مەبەستتان چییە ئاوڕودارانەتر و ئاوڕوودارانەترتان گرتووەتەوە؟ نازانم ئەم قسە زل و زەقانە چ پەیوەندییەکیان بە

---

١. ئاماژەیە بە ڕەخنەی دۆستۆیڤسکی لە گۆڤاری *گوتاری ڕووسی*دا کە دیدگەکەلی سوودگەرایانەی هەبوون و نووسەرانی گوتبوویان جووتێک *پووت، لە پووشکین بەکەڵکترن*. دیمیتری پیساریێف کە ئەم ڕستەیەیان داوەتە پاڵ ئەو، ئامانجی سەرەکیی ڕەخنەکەی دۆستۆیڤسکییە. «و. ف»

چالاکیی مرۆییەوە هەیە! چی بەرز و بەشکۆیە؟ هەرچی بۆ بەنیئادەم بەسوود بێ![1] من لەمە زیاترم بە مێشکدا ناچێ. یەک وشە: سوود! جا ئێستەش هەر لە ژێرەوە بە من بحیلکێنەوە! وەلێ کرۆکی بابەتەکە ئەوە بوو کە گوتم!

لوژن لە ناخی دڵەوە دایە قاقای پێکەنین. پارەکەیی ژماردبوو و وا کۆی دەکردەوە، بەڵام یەک دوو ئەسکەناسێکی لەسەر مێزەکە هێشتنەوە. بابەتی ئاوەڕۆکە، تازە نەبوو و مشتومڕیان لەسەر ئەم بابەتە نابەجێیە، بۆ پێشتر دەگەڕایەوە، وەلێ ئەوە دەبەنگانە بوو کە لیبیزیاتنیکۆف خەریک بوو لە ڕقاندا شێت دەبوو، کەچی هەموو شتێک بۆ لوژن وەک سەرگەرمییەک وابوو؛ هەڵبەتە ئەوەش لە لایەک کە لەو ساتە تایبەتییەدا دەیویست هاوڕێ گەنجەکەی پەست بکات.

دواجار لیبیزیاتنیکۆف خۆی پێ نەگیرا و تەقییەوە:

– لە داخی ئەو نەهامەتییەی دوێنێیە کە ئاوا بەدخوو و تووڕە بوونە.

لیبیزیاتنیکۆف بەو هەموو سەربەستی و نازەزاییەی خۆیەوە هەر نەیدەتوانی ڕاستەوخۆ لە دژی لوژن بوەستێتەوە و هێشتا بە گشتی هەر بەو ڕێز و حورمەتەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکرد کە بە درێژایی ئەو هەموو ساڵە خووی پێوە گرتبوو.

لوژن بە شێوازێکی پشووکورت و لووتبەرزانە قسەی پێ بڕی:

– سەیرکەن چیتان پێ دەڵێم! ئێوە ئەوەندە قسەتان دەڕوا داوا لەو کچۆڵەیە بکەن دوو هەنگاوێک بێتە ئێرە؟ وا بزانم هەموویان لە

---

[1]. ڕەنگدانەوەی ئایدیای چیرنیشێفسکی کە لە کتێبی *بنەمای مرۆڤناسی لە فەلسەفەدا* پەرژاوەتە سەری: *دەشێت هەر بە تەنیا ئەو شتە بە چاک و باش بزانین کە بۆ مرۆڤ بەسوودە.* «و. ف»

ســـــەرقەبران گەڕانەوە... دەنگی پێ دەبیســــــتم... دەمەوێ ببینم، ئەو کچۆڵەیەی کە ئێستە باس هەر باسی چاکەی ئەو بوو...

لیبیزیاتنیکۆف دۆشداماو پرسیی:

– بۆچیتانە؟

– تەنیا دەمەوێ چاوێکم پێی بکەوێ! هاکا ڕۆیشــــتم و هەر لەبەر ئەوەشە دەمەوێ بەر لە ڕۆیشتن پێی ڕابگەیەنم... وەلێ بۆچی خۆتان لە ژوورەکەدا نامێننەوە تا بە گوێی خۆتان ببیســـتن؟ هەر بە ڕاســـت زۆر بـاشـــــە ئێوە خۆشـــــتـان بمێننەوە. هەر خوا دەزانێ دواتر چ بیرکردنەوەیەک بەو کەللەیەتاندا دێ!

– هیچ بیرکردنەوەیەک بە کەللەمـدا نـایێ... تەنیـا پرســـــم. ئەگەر قسـەیەکیشـتان لەگەڵی هەیە، بانگی دەکەم بێ، خۆ هیچی تێناچێ. هەر ئێســـــتە دەیهێنمە لاتان و ئێوەش بێخەم بن من لە کاتی گفتوگۆکەتان ناگرم!

لیبیزیاتنیکۆف پێنج خولەک دواتر لەگەڵ ســـــۆنیادا گەڕایەوە. کچە وەک هەمیشـــە شـــەرمن و پەشـــۆکاو هاتە ژوور. ترســـی لە خەڵکی غەوارەش هەبوو، هەر لە منـداڵییەوە وا بوو و ئێســـــتە خراپتریش بووبوو... لوژن گەرم و بەڕێزانە پێشـــــوازیی لە کچەکە کرد، وەلێ دەنگی شـــتێک لە گاڵتەکردن و بێباکیشـــی تێدا بوو و لای وا بوو ئەوە بۆ پیاوێکی بەڕێز و دیاری وەک خۆی، لە کاتی بەرکەوتن لەگەڵ وەها بوونەوەرێکی کەمتەمەن و ســـەرنجڕاکێشـدا شـتێکی شـیاوە. پاشــان کەوتە کردوکۆش بۆ هێور و ئاسوودەکردنی کچە و لەپشت مێزەکەوە لەبەرانبەر خۆیدا دایینیشـــــاند. ســـــۆنیا دانیشـــــت و تەماشـــــایەکی دەوروبەریی کرد: لیبیزیاتنیکۆف، ئەســـکەناســـەکانی ســـەر مێزەکە و لوژن... جا دواجار چاوی لە لوژن بڕی. لیبیزیاتنیکۆف خەریک بوو

بەرەو دەرگەکە دەچوو کە لوژن ئاماژەی بۆ سۆنیا کرد هەڵنەستێتەوە و خۆی لە ئاستانەی دەرگەکەدا ڕێی لە لیبیزیاتنیکۆف گرت.

لوژن بە ورتەورت پرسیی:

– ئەوە ڕاسکۆڵنیکۆفە لەولاوە؟ هاتووە؟

– ڕاســــکۆڵـنیـکـۆف؟ بەڵـێ، بەڵـێ، خـۆیەتـی. بـۆچـی... بەڵـێ، ڕاسکۆڵنیکۆفە. خۆم بینیم هاتە ژوور... بۆچی؟

– باشـــە، ئێســـتە مادام وایە، دەبێ تکاتان لێ بکەم لەگەڵ ئێمەدا بمێننەوە و بۆ یەک خولەکیش من لەگەڵ... ئەم خـاتوونە گەنجەدا بە تەنیا جێ نەهێڵن. تەنیا چەند قســـەیەکی ئاســـاییم هەیە و هەر خوا دەزانێ ئەمانەش چیی تری پێوە دەلکێنن! نامەوێ قسەی ڕاسکۆڵنیکۆفم بێتە سەر... خۆ تێدەگەن چی دەڵێم؟

لیبیزیاتنیکۆف کتوپڕ لە مەبەستی تێگەیشت:

– ئەهـا، بەڵێ! تێدەگەم! ئێوە ڕاســـت دەکەن... وەلێ گەر لە من دەپرسن، ئەوا دەڵێم لە خۆڕا دەترسن و ئەگەرێکی زۆر لاوازە وەلێ... هەرچۆنێـک بووە هەقی خۆتـانە! بۆ نەمێنمەوە، دەمێنمەوە. ئەلێرە لە بەرپەنجەرەکەدا ڕادەوەســـتم بـا تۆزێ ئـاســـوودە بن... لام وایە قسەکەتان خراپ نەبوو...

لوژن گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی؛ بۆ سەر قەنەفەکە و ئاسوودە ڕووبەڕووی سـۆنیا جێگیر بوو. بەوپەڕی سـەرنجەوە سـەیری کچەی دەکرد و کتوپڕ بارێکی بێڕادە بەشـــکۆ و تەنانەت جددیی وەرگرت، وەک ئەوەی بە کچە بڵێت *ئەی خاتوونی بچکۆلە! وریابە هەنگاوی لار نەنێی ها!* سۆنیاش لە شەرماندا خەریک بوو دەبووە ئاو.

– سۆنیا خاتوون، بەر لە هەر شتێ لە لایەن منەوە سەرەخۆشی لە دایکی بەڕێزتان بکەن، ڕاســـتم گوت وایە؟ کاترینا ئیڤانۆڤنا بۆ ئێوە وەک دایکتان وایە، ئەرێ؟

شـــێوازی قســـەکردنی لوژن ئێجگار بەکەش‌وفش بەڵام گەرم و نەرمونیـان بوو و هیچ گومـانێکی نەدەهێشـــتەوە کە مەبەســـتێکی هاوڕێیانەی هەیە.

سۆنیا شەرمنانە و زۆر بە پەلە وەڵامی دایەوە:

– بەڵێ، وایە، بەڕێز. لەجێی دایکمن کاترینا ئیڤانۆڤنا!

– کەواتە داوای لێبوردنی منیـان پێ دەگەیەنن؟ هەلومەرجێـک هاتووەتە پێش کە لە دەســـت مندا نییە و ناچارم بڕۆم. خانمخاســـی دایکتان منیشیان بانگهێشت کردووە، وەلێ ناتوانم بێمە خزمەتیان.

– سەرچاو، بێگومان پێیان دەڵێم، هەر ئێستە...

سۆنیا وەک برووسکە لەجێی خۆی هەستایەوە تا بڕوات.

– بوەستن باوکە گیان، جارێ قسەم ماوە...

لوژن کچەکەی ڕاگرت و بە ســـادەیی و بێئاگایی ئەو لە ئەتەکیەتی کۆمەڵایەتی بزەی هاتێ.

– سۆنیا خاتوون، ئەگەر هەر بە ڕاستی واتان زانیوە بۆ بابەتێکی ئەوەندە بچووک ئەزیەتم داون، کە هەر بە تەنیا پەیوەندیی بە خودی منەوە هەیە، کەواتە بەقەد ســـەرەدەرزییەک منتان نەناســـیوە. نەخێر، مەبەستێکی ترم هەیە.

ســـۆنیا بە هەمان هەڵپەوە دانیشـــتەوە. جارێکی دیکەش بۆ چەند ســاتێک نیگای چووەوە ســەر پەنجا ڕۆبڵە خوڵەمێشـی و ســەد ڕۆبڵە پەلکەزێڕینەییەکەی ســەر مێزەکە، بەڵام خێرا ڕووی وەرگێڕا و چاوی

بڕییە لوژن. کتوپڕ هەستی کرد زۆر ناشیرین و بێڕێزانەیە کە کەسێک تەماشـــای پارەی ئەوانی دیکە بکات، جا بەتایبەت کەســـێکی وەک ئەویش؛ لەبەر ئەوە بوو کە بە چاویلکە ئاڵتوونییەکەی لوژن (لوژن بە دەســـتە چەپ چاویلکەکەی ڕاگرتبوو) و ئەنگوســـتیلەی پانی پەنجەی ناوەڕاســـتیدا کە بەردێکی زەردیشـــیان پێوە لکاندبوو، واق بووبوو. وەلێ کتوپڕ نیگای لێیان دزییەوە و تیاماو لەوەی کە ســـەیری کوێ بکات، هەمدیســـان چاوی لە ڕووخســـاری لوژن بڕییەوە. ئەم جارەیان بێدەنگییەکەی شـــکۆیەکی زیاتر لە جاری پێشـــووی هەبوو و جەنابی پایەبەرز دواجار درێژەی پێ دا:

– دوێنێ زۆر بە هەڵکەوت پێش هات کە چەند قســـەیەک لەگەڵ کاترینا ئیڤانۆڤنادا بکەم. هەڵبەتە ئەو چەند قسەیە بەس بوو تا تێبگەم... کە ئەوان بارودۆخێکی ئاساییان نییە و... وەک دەڵێن ئەسڵەن بەسەر ئەم زەوییەوە نین.

سۆنیا بە دوایدا دووبارەی کردەوە:

– بەڵێ، بەڕێز، بارودۆخێکی ئاساییان نییە...

– با قورســـی نەکەین، لێگەڕێن ســـووک و ئاســـان بیڵێین: ئەوان نەخۆشن.

– بەڵێ، با قورســـی نەکەین و ســـووک و ئاســـان بیڵێین.. ئەوان نەخۆشن، بەڕێز.

– کتومت! هەر بەو بۆنەیەوە لەبەر مرۆڤدۆستی و خۆشەویستی... یان دەتوانن بیدەنە پاڵ باوەڕ و چاکەویستی، من دەمەوێ هەرچۆنێک بووە یارمەتییەکی ئەوان بدەم، چونکە دواجار وا منیش دۆخی شـــڕ و بەختوناوچاویان دەبینم! ئێستە ئیتر باری ئەم خێزانە کۆستکەوتووە بە ملی ئێوەدا کەوتووە، وایە؟

– دەرفەت بدەن شتێکتان لێ بپرسم...

سۆنیا هەستایەوە و درێژەی پێ دا:

– وا دیارە ئێوە دوێنێ باسی برانە و ئەم جۆرە شتانەتان لەگەڵ کاترینا ئیڤانۆڤنادا کردووە. خۆیان پێیان گوتم کە ئێوە بەڵێنتان داوە هەر چۆنێ بووە برانەی بۆ دەستەبەر بکەن، وا بووە، بەڕێز؟

– بە هیچ شێوەیەک، خاتوونی گەنج! من تەنیا ئاماژەم بەوە کرد لەبەر ئەوەی ئەوان ژنی فەرمانبەرێک بوونە کە لە کاتی خزمەتکردندا مردووە لەوانەیە بتوانێ یارمەتییەکی ماددیی کاتی دەست بخا، جا بۆ ئەمەش ئەگەر واستەیەکی هەبێ. وەلێ وا دیارە باوکی خوالێخۆشبووتان خزمەتەکەی نیوەچڵ بووە و تەنانەت لەم دواییانەشدا هەر دەوامی نەکردووە! هەر لەبەر ئەوەشە ئەگەر هیوایەک هەبێ، نابێ چاوەڕێی ئەوە بی کە ماوەدرێژ بێ، چونکە هەر لە بنەڕەتەوە ناتوانی لەم دۆسییەیەدا داکۆکییەک بکەی. بانگەشەی چی، بەڵکە بە پێچەوانەوە!... کەواتە خانمخاس هیچیهیچنەبوو وا خەون بە برانەوە دەبینن، هەهەهە! کاترینا ئیڤانۆڤنا زۆر هەڵپەکارە!

– بەڵێ، بیری برانەی کەوتووەتە سەر... کاترینا ئیڤانۆڤنا خۆشباوەڕە و زۆریش دڵپاش. هێندە دڵی باشە هەرچی ببیستێ یەکسەر باوەڕی پێ دەکا بەڕێز جا... جا... دەی، وایە ئیتر. ئێوە بە گەورەیی خۆتان لێی ببوورن، بەڕێز!

سێیەمین جار بوو سۆنیا بە نیازی ڕۆیشتنەوە هەڵدەستایەوە.

– بەس خۆ ئێوە هەموو قسەکانمتان نەبیستوون هێشتا، خاتوونی لاو!

سۆنیا لەژێر لێوەوە گوتی:

– نا، بەڕێز، هەموو قسەکانتانم نەمبیستوون هێشتا...

– کەواتە دانیشن!

سۆنیا کە خەریک بوو لە شەرماندا دەبووە دڵۆپێک ئاو، بۆ سێیەمین جار دانیشت.

– ئێستە کە وا بە چاوی خۆم ئەم نەهامەتییە دەبینم کە ئەم ژنە و وردەمناڵە چارەڕەشەکانی تێی کەوتوون، حەز دەکەم، وەک چۆن کەمێ لەمەوبەر گوتم، بەپێی توانام دەستی بگرم... هەڵبەتە بەپێی توانام، نەک زیاتر. لەوانەیە بکرێ پارەیەکی بۆ پێکەوە بنێین، بەخشین و ئەم جۆرە شتانە... یان بلیتی یانسیب و... ئەمانە. خێزانەکەمان و هاوڕێیان و تەنانەت ئەوانەش کە دوورترن، نیازی خێریان هەیە و دایمە لەم جۆرە کارانە دەکەن. دەمویست ئەمە بڵێم. لەوانەیە بکرێ شتێکی لێ بکەین.

– بەڵێ... زۆریش باش دەبێ، خوا پاداشتتان بداتەوە...

سۆنیا بە لوژندا واق بووبوو و هەر وا تەتەڵەی دەکرد.

– لەوانەیە بکرێ شتێکی لێ بکەین... وەلێ دواتر لێی دەدوێین... لەوانەشە بکرێ هەر ئەمڕۆ دەستی پێ بکەین. جا بۆ نەیکەین؟ هەر ئەم ئێوارەیە دانیشین و قسەی خۆمان بکەین و یەکەمین هەنگاو بنێین. ئێوە کاتژمێر حەوت وەرن، چاوەڕێتانم. بەڕێز لیبیزیاتنیکۆفیش دەست بە رووممانەوە نانێ و لەو کاتژمێرەدا لامانە و یارمەتیمان دەدا... وەلێ... ئەم کارە مەرجێکی لەگەڵە کە دەبێ پێشوەختە و زۆر بە وردی ئاماژەی پێ بکەم. هەر لەبەر ئەوەش بوو ئەزیەتم دان و داوام کرد بێنە ئێرە. بە کورتی و پوختییەکەی، خانمخاس، هێندەی ئەقڵی من بیبڕێ ناکرێ پارەکە بدەینە دەست کاترینا ئیڤانۆڤنا... کارێکی ژیرانە نییە. فەرموون، بەڵگەش لە ئاسمانەوە باری... هەر ئەم فراوێن و پەخشانوتەخشانەی ئەمڕۆ! یەک تیکەنانی ڕەشیان بۆ بەیانیی خۆی و مناڵەکانی نییە... هەرهەمووشیان ڕووت و پێخواس

دەســـوورێنەوە! کەچی ئەو تۆزە پـارەیەشـــیـان لە خواردنەوەی جامایکایی و مادیرایی و قاوەدا بەفیڕۆ داوە! لە کاتی هاتنەژوورەوەدا بە چاوی خۆم بینیم. بەیانی هەمدیسـان دەبێ لە سـفرەوە دەست پێ بکەنەوە! هەموو شـــتێ دەکەوێتەوە ئەســـتۆی ئێوە و ئەوسـا دەبێ وردەنان کۆ بکەنەوە... چونکە هیچ شـتێکی دیکەیان بۆ نامێنێتەوە! خۆ وا نابێ، خـانمخـاس. بۆچوونی تـایبەتیی من ئەمەیە کە کتومت لەبەر ئەم هۆکـارە دەبێ بە جۆرێک یارمەتییەکان کۆ بکەینەوە کە بێوەژنە کلۆڵەکەی ئێمە پێی نەزانێ و تەنیا و تەنیا ئێوە ئاگادار بن. قســـەکەم ڕاست نییە؟

– نازانم، بەڕێز... لە هەموو تەمەنیدا تەنیا ئەم ڕێوڕەســـمەی ڕێک خســـتووە کاترینا ئیڤانۆڤنا... تا ئێســـتە پێشـــینەی نەبووە... پڕ بە دڵ دەیویسـت ڕێوڕەسـمەکەی باوکم شـکۆدارانە بێ و بە باشـی پرسـەکە بەڕێوە بچێت. هێندەی من بزانم ژنێکی تێگەیشـــتووە، کاترینا ئیڤانۆڤنا. وەلێ با بەو جۆرە بێ کە ئێوە بە چاکی دەزانن، بەڕێز... من تا بتوانم دوعـای خێرتـان بۆ دەکەم... هەموومـان دوعـاتـان بۆ دەکەین... خوا پاداشتتان بداتەوە، بەڕێز... ئەو مناڵە هەتیوانەش...

ســـۆنیا نەیتوانی قســـەکەی تەواو بکات، دایە پرمەی گریان و بە پانایی ڕووخساری فرمێسکی ڕشت.

– باشـــە، کەواتە خۆتان ئاگادار بن! فەرموون تکا دەکەم، ئەمەش یەکەمین یارمەتی لەلایەن منەوە و هەڵبەتە بەپێی بارودۆخەکەم. وەک یارمەتییەک پێشـکەشـە بە کەسـوکاری ئێوە. تەنیا داوا دەکەم با ناوی منی ناشـــایان نەبرێ، یانی بە جۆرێ لە جۆرەکان پێداگرم! فەرموون، خـاتوونی لاو... چۆن بڵێم، ئـاخر هەر کەســـەو بۆ خۆی گیرۆدەی کۆمەڵێک دەردیسەرییە. لەوە زیاترم لەدەست نایێ...

لوژن لەگەڵ ئەم پێشـەکییەدا دەقی ئەسـکەناسـە دە ڕۆبڵییەکەی بە سەرنجەوە کردەوە و بۆ سۆنیای درێژ کرد. سۆنیا پارەکەی وەرگرت و تا بناگوێ سـوور هەڵگەڕا. پاشـانیش لەژێر لێوەوە شـتێکی گوت و هەستایەوە تا بڕوات. لوژن بە کەشوفشـەوە تا بەردەرگە ڕایی کرد و کچە دواجـار حەپەسـاو و دامـاو هـاتە دەر و بە بـارێکی ئێجگار شپرزەوە گەڕایەوە لای کاترینا ئیڤانۆڤنا.

لیبیزیـاتنیکۆف بە درێژایی ئەو مـاوەیە یـان لە بەرپەنجەرەکەدا ڕاوەسـتابوو یان بە ژوورەکەدا هاتوچۆی دەکرد و بە هیچ شـێوەیەک نەیدەویسـت قسـە بەو دووانە ببڕێت، کەچی هەر کە سـۆنیا هەنگاوی نایە دەرێ، چووە بەردەم لوژن و زۆر جددی دەستی بەرەو ئەو درێژ کرد.

– من هەموو شتێکم بە گوێی خۆم بیست و بە چاوی خۆم بینیم...

جەختێکی زۆری لەسەر بینیم کردەوە و درێژەی پێ دا:

– چەندە جوامێرانە بوو، مەبەسـتم ئەوەیە کە چەندە مرۆڤانە بوو کارەکەتان! تەنانەت دەشـتانویسـت تا دەکرێ لە بایەخی کەم بکەنەوە و تەنانەت سوپاسیش نەکا، خۆم بینیم! دەبێ بڵێم بەپێی ئەو بنەمایەی کە هەمە نـاتوانم خێرپێکردن پەسـەنـد بکەم، چونکە ئەوە هیچ کە نەداری ڕیشـەبڕ ناکا، تەنانەت باڵ و پەڕیشـی پێ دەبەخشـێ! وەلێ دانی پێدا دەنێم کەیفم بەو کارە هـات. بەڵێ، بەڵێ، چەنـدە کەیفم پێی هات!

لوژن لەژێر لێوەوە گوتی:

– ئەوە چییە لە خۆڕا گەورەی دەکەن!

پێدەچوو خۆیشـی نائارام بێت و هەر وا لەژێر چاوەوە نیگـای گوماناویی دەگرتە لیبیزیاتنیکۆف.

– نا، گەورەی ناکەم! کوا، لە کوێ مرۆڤی وا پەیدا دەبێ کە تازە گێچەڵێکی وەک ئەوەی دوێنێی ئێوەی بەسەردا هاتبێ و کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بتوانێ ببێتە هاوخەمی لێقەوماوانی تر! وەها مرۆڤێ، ڕاستە کە خەریکە تووشــــی هەڵەیەکی کۆمەڵایەتی دەبێ... بەس شــــیاوی ڕێزلێنانە! ئەوەی ڕاسـتی بێ چاوەڕوانیی شـتی وام لە ئێوە نەدەکرد، جەنابی لوژن، بەتایبەت لەبەر ئەو بۆچوونانەتان! ئاخ بەدەســـت ئەو بۆچوونانەتانەوە کە بوونەتە بەربەستی پێشکەوتنتان! بۆ نموونە هەر ئەو نەهامەتییەی دوێنێتان... تەماشـا چۆن لە ناوەوە خۆتانی بۆ ئازار دەدەن!

لیبیزیاتنیکۆفی دڵباش لەبەر لوژن کردبوویە هەرا و هەسـتی دەکرد خۆشەویستیی بۆ ئەو هەر وا هەڵدەکشێ:

– ئاخر بۆچی گرتووتانە بە هـاوســـەرگیرییەوە، جا بەتـایبەت هاوسەریگیریی فەرمی و یاسایی؟ ها، جەنابی لوژنی هێژای من؟ وەها چوار دەست و پا باوەشتان بە هاوسەرگیریی یاساییدا کردووە وەک بڵێی... دەی، هـا فەرموون بســــرەوێنن بە بنـاگوێی مندا، وەلێ زۆر دڵخۆشم، لە ناخی دڵەوە خۆشحاڵم کە سەری نەگرت و ئێوە هێشتا ئازادن و بۆ مرۆڤایەتی هێشـــتا لەنێو نەچوونە... ئاە، دە فەرموون، دواجار قسەی دڵمم کرد!

– تێگەیشتنی قورس نییە، بەڕێز! نامەوێ بکەومە داوی یەکێ ئەلەم (وەک خۆتان دەڵێن) هاوسەرگیرییە ئازادانەی ئێوەوە و خەڵکی قاوم بدەن کە کڵاوی گەوادیی لە ســـەر ناوە و باڵیش بادەدا و دواجاریش ناچار بم توولەی کەسێکی تر بەخێو بکەم! ئێستە تێگەیشتن بە گوتەی خۆتان بۆچی گرتوومە بە هاوسەرگیریی یاساییەوە یان نا؟

لوژن وەڵامی لیبیزیاتنیکۆفی دایەوە، بەڵام دیار بوو تەنیا ویستبووی قسەیەک بکات؛ شتێک لەبەر هەر هۆکارێک بێت مێشکی قاڵ کردبوو و لە فکردا ڕۆچووبوو.

– توولە؟ مەبەستتان مناڵ بوو؟ ڕاست تێگەیشتم ئیتر، مناڵ؟

لیبیزیاتنیکۆف وەک ئەسپێکی جەنگی کە دەنگی کەڕەنای شەڕی بیستبێت، لە جێگەکەی دەرپەڕی.

– مناڵ گرفتێکی کۆمەڵایەتییە، هەروەها گرفتێکی زۆر جێسەرنجیشە، قەبووڵمە! وەلێ ڕێچارێکی تریشی بۆ دەدۆزرێتەوە. خۆ کەسانێ هەر لە بنەڕەتەوە مناڵخستنەوە بە هەڵە دەزانن؛ چ مناڵخستنەوە و چ هەر شتێکی تر کە پەیوەندیی بە شیرازەی خێزانەوە هەبێ! لەبارەی مناڵەوە کاتێکی تر زیاتر لێی دەدوێین وەلێ ئێستە کە قسە هاتە سەر کڵاوی گەوادی، دەبێ بە جەنابتانی ڕابگەیەنم ئەم بابەتە بووەتە خاڵی لاوازی من! پووشکینیش بەو دەربڕینە قێزەونە سەربازییەیەوە، کە هەر بە کەڵکی خۆی و ئەو ئەفسەرانە دێ، هیچ شوێنێکی لە داهاتووی ئێمەدا نییە[1]. باشە ئەم کڵاوی گەوادییە چییە؟ کامە کڵاو؟ هەمووی قسەی قۆڕە! خۆ هاوسەرگیریی ئازاد ئەم جۆرە چەپەڵکارییانەی تێدا نییە! ناپاکی بەرئەنجامی سرووشتیی هاوسەرگیریی یاساییە، وەک ئەوە وایە بە جۆرێ لە جۆرەکان ڕاستی بکاتەوە و نارەزاییەکیشە لەدژی بنەما پڕوپووچەکانی! کەواتە کڵاوی گەوادی مایەی ئاوڕووچوون نییە و ئەگەر ڕۆژێ دابێ سەرم بکێشێ بە دارێکدا و نیازم بێ هاوسەرگیریی یاسایی بکەم، هیچ کێشەیەکم لەگەڵ کڵاوی گەوادیدا نابێ! بە ژنەکەم دەڵێم: *ئازیزەکەم، تا ئێستە تەنیا عاشقت بووم، وەلێ لە ئێستە بەدواوە ڕێزیشت دەگرم، چونکە نیشانت دام دەتوانی نارەزایی دەربڕی!* ئێوە پێبکەنن، بە دڵی خۆتان

---

١

پێبەکەنن! بۆیە پێدەکەنن کە ناتوانن پێشـــگریمانە پواوەکانتان توورِ بدەن! دەی سندان لە هەموویان بدا! منیش تێدەگەم کە شتێکی چەندە نەشیاوە پیاو ژن بێنێ، چا بەتایبەت شـەرعی و یاساییش، جا ئەوسا ناپاکیی لێ بکرێ، تۆ بڵێی ئەوەندە حۆل بم! بەس ئەمە هێندەش نامۆ نییە، ئەمە لە بنەڕەتدا ئەنجامی بۆگەنی دۆخێکی چەپەڵترە کە هەردوو لای هاوســەرگیرییەکە تێیدا ســـووکایەتییان پێ دەکرێ! کاتێ ڕێگەی ناپاکی کراوە بێ، بۆ نموونە بەم هاوسـەرگیرییە ئازادەی ئێمەوە، ئیتر دەبینن ناپاکییەک نامێنێ و کڵاوێکیش لەئارادا نییە تا مێردە گیان لە ســـەری بکا یان نا! بە پێچەوانەوە... ژنەکەتان گەر وا تێبگا کە ئێوە ناتوانن لەبەردەم بەختەوەرییدا ببنە بەربەست و ئەوەندەش ڕۆشنبیرن کە تۆڵەی لێ نەکەنەوە، ئەوا ســـەلماندوویەتی زۆر زۆر ڕێزتان لێ دەنێ! ئەی نەفرەت لەم ژیانە! پێش هـاتووە کە لەبەرخۆمەوە بکەومە خەیاڵپڵاوی کە ئەگەر بە مێردم بدەن... ئاە، یانی گەر ژن بێنم، جا ئازاد یان یاســـایی بێ جیاوازیی نییە، گەر خۆی نەیتوانی قۆڵی لێ هەڵماڵێ، ئەوا خۆم دەگەڕێم و دۆسـت بۆ ژنەکەم دەدۆزمەوە! پێشـی دەڵێم، *ئازیزەکەم، خۆشـــم دەوێی، وەلێ لە ســـەرووی ئەوەشـــەوە دەمەوێ ڕێزم بگرێ!* قسەکەم ڕاست نییە؟ قەبووڵتان نییە؟

لوژن بە ڕووالەت گوێی دەگرت و لەژێر لێوەوە پێدەکەنی، بەڵام مەیلێکی وای نەبوو و تەنیا بە زۆر جاروبار یەک دوو وشـــەیەک لە قسەکانی لیبیزیاتنیکۆفی دەبیستن. زەینی بە شتێکی دیکەوە مەژغوول بوو و تەنانەت لیبیزیـاتنیکۆفیش دواجار تێگەیشـــت کە هـاوڕێکەی هەســـت و هۆشـــی پەرشـــوبڵاوە. لوژن بە تەواوی خرۆشـــابوو، دەســـتەکـانیی هەڵـدەگلۆفین و لە جیهـانێکی دیکەدا بوو. وەلێ لیبیزیاتینیکۆڤ نەک دەمودەســـت، بەڵکە ماوەیەک دواتر ئەمەی بیر هاتەوە و توانیی پارچەکانی بابەتەکە بخاتە پاڵ یەکدی...

## دوو

بەم سـادەییە ڕوون نـاکرێتەوە کە بیرۆکەی ئەو فراوێنی بەخاکسپاردنە سەیروسەمەرەیە کتومت لە کێوە و چۆن لە مێشکی شێواوی کاترینا ئیڤانۆڤنادا سەری هەڵدا. نیوەی ئەو بیست و شتە ڕۆبڵەی کە ڕاسکۆڵنیکۆف بۆ بەخاکسپاردنی مارمیلادۆڤ دابووی، لەم فراوێنەدا خەرج کرابوو. لەوانە بوو کاترینا ئیڤانۆڤنا هەستی کردبێت ئەرکی سەر شانیەتی کە ڕێوڕەسمێکی پرسەی ئاوڕوودارانە بۆ مێردەکەی سـاز بکات تا هەموو دراوسێکان و لە سەرووی هەمووشیانەوە خاتوو لیپی ویخزیلی خاوەنماڵی تێبگەن کە بەڕێز مارمیلادۆڤ هیچی لەوان کەمتر نەبووە و تەنانەت ڕەنگە لەوانیش باشتر بووبێت و ئێستە هیچ کەسێک بۆی نییە بڵێت بەری چاوی ئەو خوالێخۆشبووە کلی پێوە بووە. لەوانەشە مەسەلەکە حورمەتی مرۆڤێکی دەستکورت و سیلاویی ڕووخسارسوور بووبێت کە بە هیچ حورمەتێک بەراورد ناکرێت و زۆر کەس لەوانەی کە بە زۆر دەستیان دەگاتە دەمیان، ناچار دەکات ئەو چەند پەنابایە پاشەکەوتکراوەشیان لە ئاهەنگگێڕان و مەراسیم و ئەم شتانەدا بەفیڕۆ بدەن... تەنیا و تەنیا بۆ ئەوەی وەک ئەوانی دیکە دەربکەون و هیچ کەسێک بە چاوی کەم سەیریان نەکات. هەڵبەتە لەلایەکەوە، بە ئەگەری زۆرەوە کاترینا ئیڤانۆڤنا -کتومت لەم دۆخە و لەم ساتە تایبەتەدا کە هەرهەمووان ئەویان پشتگوێ خستبوو- لە ناخی دڵەوە ویستبێتی بەو کرێچییە بێتامانەی نیشان بدات کە زۆر باش شارەزای ژیانکردن و میوانداریییە، خۆ ئەم جۆرە شتانە بۆ ئەو تازە نین، چونکە ئەو لە خێزانێکی

خانەدانیی سەرهەنگێکدا پەروەردە بووە! بەڵێ، خۆ بۆ ئەوە گەورەیان نەکردووە زەوی گسک بدات و نیوەشەو جلی چڵکنی پواوی منداڵان بشوات! تەنانەت بۆ هەژارترین مرۆڤەکان و خۆشەویستترینەکانیش ئەوە دێتە پێش کە تووشی هەڵمەتی لووتبەرزی و خۆپەسەندی ببن. ئەو هەڵمەتە لە دەروونیاندا دەگۆڕێت بۆ جۆرێک لە تینوویەتیی شێتانە و دانەمرکاو. هەڵبەتە کاترینا ئیڤانۆڤنا لەم جۆرە مرۆڤانە نەبوو. ئەم نەهامەتی و دۆخە هەنووکەییەی ژیانی بۆی هەبوو ببێتە هۆکاری مەرگی، وەلێ نەیدەتوانی لە زەویی بدات، یانی کاترینا ئیڤانۆڤنا بییەک نەبوو بەم بایانە بلەرزێت و ویستی تێک بشکێت و کەلەلا ببێت. سەرەڕای ئەمانەش، سۆنیا هەقی بوو بڵێت کاترینا ئیڤانۆڤنا هەست و هۆشی شێواوە. نەدەکرا بڵێیت بە تەواوی شێت بووە، وەلێ لە یەک ساڵی ڕابردوودا هێندە چەرمەسەریی کێشابوو کە دوور بوو زەینی نەکەوتبێتە ژێر کاریگەریی ئەو گوشارانەوە. بە گوتەی دکتۆرەکان لە قۆناغەکانی کۆتایی نەخۆشیی سیلدا ژیریی مرۆڤ دەشێوێت.

پێرستی خواردنەوەکان بەو جۆرەی کە لوژن کردبوویە هەڵا، پان و درێژ نەبوو، نە هیچ هەواڵێک لە چەند جۆر شەرابی ڕەنگاوڕەنگ لەئارادا بوو و نە مادیرا. بەڵام جۆرێک شەرابیان هەبوو. هەم شەرابی لیسبون هەبوو و هەم ڤۆدکا و ڕام. خواردنەوەکان لە هەرزانترین جۆرەکان بوون، بەڵام بەشی پێویست دەستەبەر کرابوو. کۆتیای تایبەت بە مەراسیمەکەشیان هەبوو، بەس لە مووبەقی خاوەنماڵەکەدا سێ‌چوار جۆر چێشتی دیکەشیان لێنابوو و کێکی تاوەیی لێ بوو. دوو دانە سەماوەریشیان خستبوونە سەر ئاگر کە ئێستە ئیدی قوڵەقوڵیان دەهات تا چای و پەنچ[1] دوای فراوێنی میوانەکانیش

١. Punch: خواردنەوەیەکی کحوولییە، لەگەڵ شەراب یان تێکەڵەی خواردنەوەی کحوولیی دیکە، یاخود ئاوی میوە، ئاو و شەکر دروست دەکرێت. «و. ک»

بەردەست بێت. کاترینا ئیڤانۆڤنا خۆی کاری کرێنەکەی لە ئەستۆ نابوو، هەڵبەتە بە هاوکاریی یەکێک لە کرێچییەکان کە پۆڵەندییەکی کوڵەبنەی بەدبەخت بوو و تەنیا خوا دەیزانی بۆچی لەوێ ژووری بە کرێ گرتووە. کرێچییە پۆڵەندییەکە یەکسەر بووە پاکاری[1] کاترینا ئیڤانۆڤنا و بەیانیی ئەو ڕۆژە و دوێنێکەشی هێندە وەک واشە[2] بەملا و بەولادا فرکەفرکی کردبوو کە ئیدی کەوتبووە هانەهان و لە لایەکیشەوە زۆر تامەزرۆ بوو هەمووان بارودۆخی ببینن و سەرنجێک رابکێشێت. بۆ هەر ئیشێکی گرنگ و سەرپێیی خۆی بە کاترینا ئیڤانۆڤناوە دەنووساند و تەنانەت لە فرۆشگەی گاستینی دوور[3]یشدا لە کۆڵی نەدەبووەوە و هەیتاهەیتا بە پۆڵەندی وشەی خاتوونی دەگوت و بە دەوریدا دەسووڕایەوە: *پانی، پانی! پانیی بەڕێز!* بە جۆرێک بێتامی کرد کە کاترینا ئیڤانۆڤنا تەنانەت بەر لە تەواوکردنی کارەکانی، ئیدی چاوی بە چڕوچاوی کابرای پۆڵەندی هەڵنەدەهات، گەرچی لە سەرەتاشەوە گوتبووی بێ یارمەتیی ئەم بەڕێزە *دەستوپێبەخێر* و هێژایە پۆڵەندییە دەرەقەتی کارەکان نایێت. هەر لە بنەڕەتەوە ئەوە یەکێک بوو لە تایبەتمەندییە ئاکارییەکانی کاترینا ئیڤانۆڤنا، هەر کەسێک دەربکەوتبا، هەر لە دوورڕا هێندە بە شان و باڵییدا هەڵدەدا کە هەر مەپرسە! تاریف و ستایشەکانی هێندە بێبنەما و زیادەڕۆیانە بوون کە هەندێک جار هەمووانی شەرمەزار دەکرد، بۆ بردنەئاسمانی بەرانبەرەکەی، لە خۆیەوە بەسەرهاتی هەڵدەبەست و بەرەبەرەش لە ناخی دڵەوە بڕوای دەکرد کە ئەوە ڕاستە. پاشانیش لە چاوترووسکانێکدا باری دەگۆڕا و بەرانبەرەکەیی لە بەرچاو دەکەوت؛

---

[1]. پاکار: بەردەست؛ کرێکارێکی بەردەست بۆ وردەکاری و هاتوچۆ.

[2]. واشە: باشووکە؛ کەوزەنەک؛ باڵەوان؛ پەلەوەرێکی ڕاوکەر بە لەشێکی بچووک، لاقی درێژی زەرد، کلکی درێژ و باڵی کول و خڕەوە.

[3]. بەشێکی دیکە لە فرۆشگە ڕاقی و خانەدانییەکانی شەقامی نێفسکی و یەکنەگرتنەوەی لەگەڵ ژیانی هەژارانەی خەڵکانی ڕووسیادا. «و. ف»

جـا لەو کـاتـانەدا بوو کە هەرچیی بە دەمـدا بهـاتبـا پێی دەگوت و دەیتاراند و حەشری هەمان ئەو کەسەی دەژەنی کە چەند کاتژمێرێک پێشـــتر وەختبوو خـاکی بەرپێشـــی مـاچ بکات! کاترینـا ئیڤانۆڤنـا سرووشتێکی بەکەیف و سەرەحاڵ و ئاشتیخوازی هەبوو، بەس ئەو سـیاچارەیی و شــکســتە یەک لەدوای یەکانەی کە کۆتاییان نەبوو، پێدەچوو وایان کردبێت ئێســتە تەنیا ســکاڵا بکات و ئاوات بخوازێت تەنانەت گەر بە زۆریش بێت هەمووان بە بێوەیی و خۆشـــی بژین و بگرە زاتیشـــیان نەبێت ئەو ئاســـایش و خۆشـــییە تێک بدەن. لەم نێوەندەدا گەر دەنگێکی ناکۆک هەبا یان بەر بەربەســـتێک بکەوتبا، تا ســەر ئاســتی شــێتبوون پێی تێک دەچوو و لە ســاتێکدا ئەو خەون و ئـاواتە درەوشـــــاوانەیی لەبیر دەچوونەوە و دەســـتی دەکردە نەفرەتبارانکردنی چارەنووسی و هەرچیی بە دەستەوە بهاتبا دەیدڕاند و دەیوەشــاند و خۆیشــی ســـەری بە دیواردا دەکوتی. مەســـەلەی خاتوون لیپیویخزیلیش هەر ئەمە بوو. ئەو خاتوونە کتوپڕ بە جۆرێک لە بەرچاوی کاترینا ئیڤانۆڤنادا هەڵکشـــابوو و وەها ڕێزلێنانێکی بە خۆیەوە دەبینی کە لە باسدا نەبوو و بە ئەگەرێکی زۆریش هۆکارەکەی تەنیا ئەوە بوو کە دواجار دەشـــیا ڕێورەســـمێک بەڕێوە بچێت و خـاتوونیش بە دڵ و بە گیـان خۆی تێکەڵی بەرنـامەکـان کردبوو: ڕازاندنەوەی مێز و هێنانی کەلوپەلی ســـەر ســـفرە و کەرەســـتەی فەخفووری و ئەمانەی گرتبووە ئەستۆ و ڕازی بووبوو لە ناندینەکەی ئەودا چێشت لێبنێن. کاترینا ئیڤانۆڤناش هەموو شتێکی بەو سپاردبوو و خۆی چووبووە ســـەرقەبران. ئەنجامێکی چاکیشـــی لێ کەوتەوە؛ مێزەکەیان لە کاتی خۆیدا ئامادە کردبوو و ســەرمێزییەکی تا ڕادەیەک خاوێنیشیان بەسەردا دابوو. هەڵبەتە کەلوپەلە چینی و چەقۆ و چەنگاڵ و پەرداخەکان هاوشێوە نەبوون چونکە هەر یەکەیان لەلای کەسێکەوە هێندرابوو، بەڵام هەرچۆنێک بووە مێزەکە لە کاتی دیاریکراودا ئامادە بوو و خـاتوونی خـاوەنمـاڵیش کە هەســـتی دەکرد شـــاکـارێکی

بێکەموکوڕیی کردووە، بەو کراسە ئاوریشمییە ڕەش و قردێلە تازە و تازیەیەی سەر کڵاوەکەیەوە، سنگیی دەرپەڕاند و بەدەم ئەوانەوە چوو کە لە سەرقەبرانەوە دەگەڕانەوە. گەرچی کەشفوفشی خاتوونی خاوەنماڵ پاساوێکی هەبوو، کەچی کاترینا ئیڤانۆڤنا پێی تێک چوو. هەڵبەتە ئەویش هۆکاری خۆی هەبوو: *دەڵێی هەر ئەوان دەتوانن مێز بڕازێننەوە و ئێمە شتی وامان لێ نایێ، ئەستێرەی داگرتووە!* زۆریش بە کڵاو و قردێلە تازەکانی خاتوونی خاوەنماڵ پەست بووبوو: *نەکا ئەم ژنەتیوە خەڵەفاوە ئەڵمانییە، هەر لەبەر ئەوەی کە خاوەنماڵە وای زانیبێ دەستباری کرێچییە داماوەکانی دەدا؟ خۆ شتی وای لێ دەوەشێتەوە! خێرپێکردن، ها؟ ئای خوایە! تۆ بیهێنە بەرچاوت... باوکە گیانی ئەفسەری پلەبالام کە خەریک بوو دەبووە فەرماندار، دایمە ڕایدەسپارد مێز بۆ چل کەسێ بڕازێننەوە، جا لە ڕۆژگارێکیشدا کە نەیاندەهێشت ئەڵمانی و شتی وەک لیپیویخزیلی بێنە موبەقیشەوە!* وێڕای هەموو ئەمانەش کاترینا ئیڤانۆڤنا لەگەڵ خۆیدا سازا و جارێ بەو بەرکەوتنە ساردوسڕە لەگەڵ خاوەنماڵدا قایل بوو، وەلێ لە دڵدا لێبڕابوو کە لە یەکەمین دەرفەتدا ئەو لە قاڵب بداتەوە، چونکە هەر بە ڕاستی دیار نەبوو ژنەتیوە خۆی بە کێ دەزانێ و لای وایە لە چ پێگەیەکدایە! خاڵێکی دیکەش هەبوو کە کڵپەی لە ئاگری ڕقەکەی کاترینا ئیڤانۆڤنا هەڵدەستاند: بۆچی لەنێو ئامادەبووانی ماڵەکەدا کە بۆ بەخاکسپاردنەکەش بانگهێشت کرابوون، تەنیا ئەو بوودەڵە پۆڵەندییە هاتە سەرقەبران؟ کەچی لەسەر سفرەی فراوێنەکەدا بەرماوەخۆرترین و چەپەڵترینی کرێچییەکانیش قوت بووبوونەوە؟ هێژا و سەنگینەکانیان دیار نەبوون؛ وەک ئەوەی پێشوەختە بڕیاریان دابێت خۆیان نیشان نەدەن. بۆ نموونە هەر ئەم جەنابی لوژنە کە لە هەموویان سەنگینتر بوو، ئەوەتا هەر دەر نەکەوت؛ سەرباری ئەوەش کە کاترینا ئیڤانۆڤنا دوێنێ ئێوارە جاڕی دابوو تا هەمووان -خاوەنماڵ، پۆلینکا، سۆنیا و بوودەڵەی لەهستانی- ببیستن کە لوژن پیاوێکی دڵئاوا و هێژایە بە

موڵکێکی زۆر و ماڵ و ســـــامانێکی چاک و ناســـــیاوی گەورە و بچووکەوە و، هەروەها، هاوڕێی یەکەم مێردی کاترینا ئیڤانۆڤناش بووە و هاتوچۆی ماڵی باوکیشـــی هەبووە... ئێســـتاکەش بەڕێز لوژن بەڵێنی بەو داوە دەســـەڵاتی خۆی بەکار بهێنێت و بڕانەیەکی چاکی بۆ دەبر بکات. ئەوەمان بیر نەچێت کە ئەم هەڵســـوکەوتانەی کاترینا ئیڤانۆڤنا هیچ پاڵنەرێکی نهێنی و بەرژەوەندیی کەســـییان لەپشـــتەوە نەبوو، بە پێچەوانەوە، لە ناخی دڵەوە فیزی بە سـامان یان پەیوەندیی بەهێزی ئەوانی دیکەوە لێدەدا و لەم نێوەندەدا هیچ شـــتێکی بۆ خۆی نەدەویســـــت؛ هەر بە تەنیا چێژی لەوە دەبرد کە پێگەیەکی بەرزتر ببەخشـــێتە بەرانبەرەکەی. بە ئەگەرێکی زۆریش ئەو لیبیزیاتنیکۆفە بێقابلیەتە خۆی بە هاوشانی لوژن زانیوە بۆیە نەهاتووە. *نەکا خوێڕیی وا هەر بە ڕاســـتی خۆی لێ بووبێتە شـــت! ئێمە لە دڵپاکی خۆمانەوە داوەتمان کرد و، ئێ، ئەوەش کە دۆســــــت و هاوژووریی لوژنە و نەدەکرا داوەتی نەکەین!* خاتوونی ئالۆوالا و کچە شـــۆخەکەشـــی لەو کەســــــانە بوون کە نەهاتبوون. دایکە و کچە حەفتەیەکیش نەدەبوو لەوێ ژووریـان بە کرێ گرتبوو، بەڵام چەنـدان جـار، بەتـایبەت لەو کاتانەدا کە مارمیلادۆڤ ســـەرخۆش و بەدمەســـت دەگەڕایەوە ماڵێ، لەبەر قەڕەقەشـــە و شـــەڕەکانی نێو ماڵی کاترینا ئیڤانۆڤنا ســـکاڵایان کردبوو. هیچ گومـانێکیش لەوەدا نییە کە کـاترینـا ئیڤـانۆڤنـا بـابەتی شـــکاتەکەی لە خانمی خاوەنماڵەوە بیســـتبوو. خاتوونی خاوەنماڵ لە گەرمەی شـەڕ و هەڕەشـەدا کە هەموویان بە سـەرەپێ لە دەرگەکەوە دەکاتە دەرێ، شـــاتاندبووی کە ئەوان نابنە *خاکی بەرپێی کرێچییە ڕەســـەن و خانەدانەکانی ئەو و تەنیا بێزاریان دەکەن.* کاترینا ئیڤانۆڤنا گوڕی خواردبووەوە تا ئەو خانمخاســـە ڕەســـەنە و کچەکەی داوەت بکات و ئەوێک کە *خاکی بەرپێشـــیان نەبوو* و کاتێک بە هەڵکەوت تووشی یەکدی دەبوون، دووقوڵی لووتیان دەکردە ئاسمان و ڕوویان لێ وەردەگێڕا، تێیان بگەیەنێت کە بیر و هەستی زۆر لەوە ڕەسـەنترە

و ڕق لە دڵ ناگرێت. گەر بهاتبان بە چاوی خۆیان دەیانبینی کە ئەو لە بنەڕەتەوە بۆ ئەم جۆرە ژیانانە نەکراوە. بەرنامەشــی ئەوە بوو کە بە ئاماژەکردن بە پێگەی باوکیی خوالێخۆشــبووی و ئەگەری بوونە فەرمانداریی هەموو شـتێکیان بۆ ڕوون بکاتەوە و هاوکات ئەوەشـیان بە ڕوودا بداتەوە کە ئەو ڕوو وەرگێڕانە گـاڵتەجـاڕانەیەیـان چەنـدە گەمژانە بووە. ســەرهەنگدووەمە خڕوخەپەکەشــیان دیار نەبوو -کە بێگومان تەنیا ئەفســەرێکی پلەنزمی خانەنشــینکراو بوو- وەلێ دواتر زانرا جەنابی پایەبەرز دوو ڕۆژێکە نەخۆشـە. بە کورتییەکەی لەســەر مێز بەدەر لە پیاوە پۆڵەندییەکە، فەرمانبەرێکی هێڕی ســـیاچارە و بۆگەنی بە ســـەروڕوویەکی زیپکاوییەوە لێ بوو کە کۆتە چڵکنەکەی دەتکوت ڕۆنی لێ دەچکێت و پیرەمێردێکی کەڕیش کە کەم تـا زۆر چاوی هیچی نەدەبینی و ســـەردەمانێک فەرمانبەری بەڕێوەبەرایەتیی پۆســـتەوگەیاندن بووە و دیاریش نەبوو کە کێ و بۆچی لە ماوەیەکی زۆر لەوەوبەرەوە لەو ماڵەدا ژووری بۆ گرتبوو. لەنێوان میوانەکاندا پلەدارێکی سـەرخۆشـی خانەنشـینکراوی بەڕێوەبەرایەتیی پێداویسـتیی ســـوپاش هەبوو کە زۆر ســـەیر و بە دەنگی بەرز و بێشـــەرمانە پێدەکەنی و *جا بیهێننە بەرچاوتان* کە تەنانەت کۆتیشی لە بەردا نەبوو! کەســێکی دیکەشــی لێ بوو کە بەبێ ســڵاو یان تەنانەت نیگاکردنێکی کاترینا ئیڤانۆڤناش لەســەر مێزەکە دانیشــت. دواجاریش بوونەوەرێک دەرکەوت کە بە بیجـامەکەیەوە لە ژوورەکەی هـاتبووە دەرێ، ئـاخر پێدەچوو جلوبەرگێکی دیکەی نەبێت. وەلێ ئیدی ئەمەیان بەرگەنەگیراو بوو و خـاتوونی خـاوەنمـاڵ و پیـاوە پۆڵەنـدییەکە یەکیـان گرت و کـابرایـان جواب کرد. هەڵبەتە بوودەڵە پۆڵەنـدییەکە دوو پۆڵەنـدیی خراپی دیکەی خســتبوونە شـوێن خۆی کە ئەســڵەن نیشـتەجێی ئەو بینایە نەبوون و هیچ کەســـێکیش تا ئەو کاتە ئەوانی لەوێ نەدیبوون. کـاترینـا ئیڤـانۆڤنـا بە گشـــتی دۆخەکەی ئێجگـار نەخوازراو دەهـاتە بەرچاو و بە تەواوی پەســـت بووبوو: *یانی بۆ ئەم کوێر و کەچەڵانە*

*خۆمان پڕووکاند و ڕێوڕەسممان ڕێک خست؟* مێزەکە، سەرتاسەری ژووری مارمیلادۆڤی گرتبوو. منداڵەکانیان لەپشت مێزەکەوە دانیشاندبوون تا شوێنی میوانەکان تەسک نەبێت. لەلایەکی ژوورەکەوە دوو دانە بچووکەکەیان لەسەر نیمکۆتێک دانیشاندبوون و فراوێنەکەشیان لە بەردەمیاندا خستبووە سەر سندووقێک. پولینکاش وەک خوشکی گەورە بڕیار بوو ئاگاداریان بێت و چێشتیان بەدەمەوە بکات و نەهێڵێت چڵمیان بێتە خوار؛ ڕێک وەک خزمەتکاری منداڵە خانەدانان. لە ڕاستیدا کاترینا ئیڤانۆڤنا نەیتوانی بەر بە خۆی بگرێت و نائاگایانە بە شانوشکۆ و تەنانەت لووتبەرزییەکی زۆریشەوە پێشوازیی لە میوانەکان کرد. بە نیگایەکی هێندە زەقەوە کە بەردیشی دوولەت دەکرد، لە هەندێکیانی ڕوانی و زۆر لەخۆباییانە فەرمووی لێ کردن دابنیشن. دیار نەبوو چۆن بەو ئەنجامە گەیشتبوو کە خاوەنماڵ بە جۆرێک لە جۆرەکان دەستی لە نەهاتنی میوانە کەللەزلەکاندا هەیە و هێشتا میوانییەکە دەستی پێ نەکردبوو، لێی لووتەلا بوو. جا بێگومان ئەوان بە گۆڕانی هەڵسوکەوتی کاترینا ئیڤانۆڤنایان زانی و ناوچاویان پێکدا دا. بە کورتییەکەی مانگ هەر لە ئەوەڵ ڕۆژەوە دیارە! دواجار هەمووان دانیشتن.

ڕاسکۆڵنیکۆف ڕێک لە کاتێکدا سەروکەللەی دەرکەوت کە ئەوان تازە لە سەرقەبرانەوە گەڕابوونەوە. کاترینا ئڤانۆڤنا بە بینینی ئەو شاگەشکە بوو، جا ئەمەش لەبەر دوو هۆکار: یەکەمیان ئەوە بوو کە ڕاسکۆڵنیکۆف تاکە میوانی سەنگین و بڕوانامەداری کۆڕەکە بوو و کێ هەبوو نەزانێت ئەو دوو ساڵی دیکە لەسەر کورسیی مامۆستایەتیی زانکۆ دادەنیشێت؟ دووەمیشیان ئەوە بوو کە پیاوە گەنجەکە هێشتا نەگەیشتبوو کە لەوپەڕی ڕێز و حورمەتدا داوای لێبووردنی کرد کە نەیتوانیوە خۆی بگەیەنێتە بەخاکسپاردنەکە و لە دڵەوەش ڕایگەیاند کە بۆ ئەو مەبەستەش زۆر بەداخەوەیە. کاترینا

ئیڤانۆڤنا دەستبەجێ ئەوی لە دەستەڕاستی خۆیدا دانیشاند و لە دەستەچەپیشییەوە خاتوو لیپیڤیخزیل دانیشتبوو. کاترینا ئیڤانۆڤنا هەموو هەست و هۆشی لای میوانداریيەکە بوو تا نەکا خواردەمەنییەکان بە ڕێکوپێکی نەگێڕدرێن و هەمووان نەتوانن تامی هەر یەکێکیان بکەن. لە لایەکی دیکەشەوە ئەو کۆکە گورچکبڕانە تەنگیان پێ هەڵچنیبوو و نەیاندەهێشت یەک وشەش بڵێت؛ لەم چەند ڕۆژەی دواییدا وا دیار بوو دۆخی شەڕتریش بووە. وێڕای هەموو ئەمانەش، ڕاسکۆڵنیکۆفی دابووە بەر قسە و لە بناگوێیدا کەوتبووە چپەچپێکی کەم تا زۆر بە پەلە و باسی مەراقی دڵ و ناڕەحەتیی خۆی لەبارەی دۆخی فراوێن و بەخاکسپاردنەکەوە بۆ دەکرد کە حورمەتی چەندە پێی ڕووشاوە و لەنێوان قسەکانیشیدا تەشقەڵەی بە میوانەکان و بەتایبەت خاتوو لیپیڤیخزیل دەکرد و بە جۆرێک لە تریقەی پێکەنینی دەدا کە ئاستەم بوو بتوانێت بەری پێ بگرێت.

– هەمووی سووچی ئەو ژنەتیوە گێژوویژەیە کە لەوێ دانیشتووە! دەزانن کێ دەڵێم؟ دەی ئەو ژنەتیوە!

کاترینا ئیڤانۆڤنا بە سەر ئاماژەی بۆ خاتوون کرد.

– توخوا سەیری کەن! جا چاویشی بۆ دادڕیوم. سۆسەی کردووە باسی ئەو دەکەین، وەلێ نازانێ چی دەڵێین! وای لەو بایەقوشە شاخدارە! هاهاها! ئەو کڵاوە گاڵتەجاڕە چییە ناویەتییە سەری؟ هاهاها! سەرنجتان داوە کە خەریکە خۆی دەپڕووکێنێ تا هەمووان باش تێبگەن چاکەی کردووە و بۆ عالەمی بسەلمێنێ کە لێرەبوونی منەتێکە بەسەر منەوە! زۆر بەڕێز و ماقووڵانە داوام لێ کرد لەلایەن منەوە میوان داوەت بکا و دیارە مەبەستیشم ئەوانە بوون کە مێردە خوالێخۆشبووەکەمیان دەناسی! فەرموون! تەماشا چ کوێر و کەچەڵێکی داوەت کردووە؛ کۆمەڵێ گەپجاڕ! سەیری ئەو بوودەڵە زیپکاوییە، لەوێیە! ئەوە باسی ئەو پۆڵەندییە بۆگەنە هەر مەکە...

هاهاها! هیچ کەسێ نییە تا ئێستە ئەو دووانەی لێرە دیتبن، خۆ من تا ئێستە چاوم بە جوانییان ڕۆشن نەبووە! ئێوە بفەرموون، هەستاون و هاتوونەتە ئێرە کە چی ببێ؟ وەک منالانی قوتابخانەش قنج لێی دانیشتوون! هێی، کاکە گیان!

کاترینا ئیڤانۆڤنا کتوپڕ بە زمانی لەهستانی بەسەر یەکێک لە سیاچارە پۆڵەندییەکانیدا قیڕاند:

– ئادەی، کێکی تاوەییتان بەر کەوتووە؟ زیاتر تێکەن! بیرەش بفەرموون! ئەی ڤۆدکا؟ بینیتان چۆن گورج بووەوە و کڕنۆشی برد ئەو بوودەڵە داماوە؟ ئەم چارەڕەشانە برسییانە! با بخۆن! لانیکەم دەنگیان لێوە نایێ و ئەمەی باشە. ئەوەش لەلایەک کە خەمی کەوچکە زیوییەکانی خاتوونی خاوەنماڵمانم... خاتوون!

کاترینا ئیڤانۆڤنا لەناکاو ڕووی کردە خاتوونی خانەخوێ و بە جۆرێک کە هەمووان ببیستن، گوتی:

– گەر ئەم کەوچکانەی ئێوەیان خیت کرد، من بەرپرسیار نیم. ئەوە پێم گوتن! هاهاها!

زۆر لەو تەشەرە ڕازی بوو کە وەشاندبووی. پاشان بەدەم پێکەنینەوە ڕووی لە ڕاسکۆڵنیکۆف کردەوە و بە سەر ئاماژەی بۆ خاوەنماڵ کرد:

– هاها! لە یەک وشەشی تێنەگەیشت! ئەم جارەش نەیتوانی حاڵی ببێ چی دەڵێم! هەر دەڵێی بایەقوشی شاخدارە ئەم ژنە! بایەقوشی قردێلەلەسەر هاهاها!

پێکەنینەکەی کاترینا ئیڤانۆڤنا هەمدیسان گۆڕا بۆ نۆرەیەکی تۆقێنەری کۆکە کە تا پێنج خولەکیش لە کۆڵی نەبووەوە. تەوێڵی ئارەقەی دەدەلاند و پەڵەگەلی خوێنی سەر دەسڕەکەی سووریان

دەکردەوە. بە بێدەنگی خوێنەکەی نیشانی ڕاسکۆڵنیکۆف دا و هەر کە هەناسەی ئاسایی بووە هەمدیسان بەو گۆنا داگیرساو و سوورەوە لەتاو سیلەکەی، لە بناگوێی ڕاسکۆڵنیکۆفدا دەستی کردەوە بە چپەچپ، جا بە گوڕوتین و تامەزرۆییەکی زیاد لە ڕادەوە گوتی:

– خۆتان داوەری بکەن: ئیشێکی هەستیارم خستە بەردەستیان و زۆریشم لێ دووبارە کردنەوە کە بە سیاسەت و زیرەکی ئەو خانمخاسە و کچەکەی داوەت بکەن. خۆ دەزانن کێ دەڵێم؟ ئەم کارە زیرەکیی دەویست و شکۆی تایبەتی و خانەدانانە... وەلێ خانمی خانمان چیی کردووە؟ وای کرد ئەو دەبەنگە نەدیوبدییە لادێیی و فشەکەرەش بتوانێ بە جۆرێ هەڵسوکەوت بکا وەک ئەوەی ژوورەکەی ئێمە شیاوی ئەوە نەبێ ئەوان هەنگاوی بنێنە ناو و تەنانەت ئەو ئەرکەشی نەدایە بەر خۆی هەر لەبەر ڕێز و حورمەتیش بێ کەسێ بنێرێ تا لەلایەن ئەوەوە داوای لێبووردن بکا، هێندە هەرچیوپەرچییە![1] جا لاتان وایە ئەمە بۆچی؟ لەبەر ئەوەی ژنی ئەفسەرێک شتێک بووە و هاتووەتە پیتەربورگ برانەیەک بۆ خۆی ببرێتەوە و ئامادەشە لەپێناو دوو پەنابا برانەدا هێندە بەو فەرمانگە میریانەدا بسووڕێتەوە تا تووشی سەرەگێژە ببێ! بە پەنجا ساڵیش هێشتا سووراو و سپیاو دەکا ژنەتیوە! ئەو جەنابی لوژنەش نەهاتووە، باشە ئەو بۆچی؟ نازانم ئەی لەم نێوەندەدا سۆنیا لە کوێیە؟ بۆ کوێ چووە کتوپڕ؟ ئەها، فەرموو، خاتوون دەرکەوت دواجار! چی بووە، سۆنیا؟ لە کوێ بووی تۆ؟ مرۆڤ سەری لەوە سووڕ دەمێنێ کە چۆن ناتوانی لە ڕێوڕەسمەکەی باوکیشتدا لە کاتی خۆی ئامادە بی! جەنابی ڕاسکۆڵنیکۆف، شوێن بکەنەوە با لەتەکتانەوە دانیشێ. سۆنیالە، لەوێ دانیشە... هەرچیشت حەز لێیە بخۆ... لەو خواردەمەنییە هەڵگرە، لە هەمووی باشتر دەرچووە. وا بلینیش ئامادە دەبێ. مناڵەکان هیچیان

---

[1] ١. هەرچیوپەرچی: خۆڕیوتۆڕی؛ شەلاتی؛ بێکەسایەتی.

بەر کەوت؟ پۆلێنکا، تۆش ئەوەندە پێیەکانت مەجوولێنەوە و ڕێک دانیشە! ئەها، وەک بەڕێزێکی پاکوخاوێن! چیت گوت تۆ، سۆنیا؟

سۆنیا کاتی بەفیڕۆ نەدا و هەناسەسوار داوای لێبوردنی جەنابی لوژنی بە کاترینا ئیڤانۆڤنا ڕاگەیاند، هەولیشی دەدا تا دەکرێ بە دەنگی بەرز بدوێ بۆ ئەوەی هەموو میوانەکان گوێیان لێ بێت و بە ڕێز و شکۆیەکی زۆریشەوە باسی لوژن بکات. پاشان ئەوەشی بۆ زیاد کرد کە داوایان لەو کردووە بە کاترینا ئیڤانۆڤنا بڵێت لە یەکەمین دەرفەتدا دێت تا لەبارەی کارەکانەوە، بەتایبەتی قسەی لەگەڵدا بکات و بزانێت بە لەبەرچاوگرتنی دۆخی کاترینا ئیڤانۆڤنا دەشێت چی بکرێت.

سۆنیا باش دەیزانی کە ئەم قسانە بۆ کاترینا ئیڤانۆڤنا وەک ئاوکردن بەسەر ئاگردا وایە و چاک دایدەمرکێننەوە؛ بە جۆرێک لە جۆرەکان سەنگی بەرز دەکاتەوە و حورمەتی سارێژ دەبێت. بلەز نیمچە کڕنۆشێکی بۆ ڕاسکۆلنیکۆف برد، لەتەنیشتییەوە دانیشت و تەماشایەکی کرد. بەس دوای ئەوە، هەر چۆنێک بووە خۆی لە دواندن و تەماشاکردنی ئەو دزییەوە. پێدەچوو هەست و هۆشی سۆنیا لە شوێنێکی دیکە بێت، گەرچی چاوی لە کاترینا ئیڤانۆڤنا کلا نەدەکرد و هەموو خەم و خەفەتی قایلبوونی ئەو بوو. سۆنیا و کاترینا ئیڤانۆڤنا هیچکامیان نەیانتوانیبوو جلی فەرمیی پرسە لە بەر بکەن؛ سۆنیا کراسێکی قاوەیی تۆخی پۆشیبوو و کاترینا ئیڤانۆڤناش هەمان کراسە کەتانە خەتخەتە هەمیشەییەکەی و بێگومان هەر ئەوەشی هەبوو لە بەری بکات. پەیامەکەی لوژن پەرجوویەکی ساز دا. کاترینا ئیڤانۆڤنا زۆر قورسوقۆڵ و جددیانە تا کۆتا گوێی لە قسەکانی سۆنیا گرت و تەنانەت بە بارێکی قورسوقۆڵتر و جددیترەوە هەواڵی تەندروستیی لوژنی پرسی. پاشان کەم تا زۆر بە بناگوێی ڕاسکۆلنیکۆفیدا قیراند کە بە دڵنیاییەوە ئەوە شتێکی دژوارە بۆ کەسێکی وەک جەنابی لوژن

کە بیەوێت لەنێو کەسانێکی لەم چەشنەدا ئامادە بێت، جا با هاوڕێی باوکی ئەویش بووبێت و ئەوپەڕی ڕێز و خۆشەویستی بۆیان هەبێت.

کاترینا ئیڤانۆڤنا زیاتر دەنگی هەڵبڕی تا هەمووان ببیستن و بۆی زیاد کرد:

– هەر لەبەر ئەوەش قەرزاری خۆشەویستیی ئێوەم، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچی ئازیز کە داوەتەکەتان ڕەد نەکردەوە و تەشریفتان هێنا تا پێکەوە نانێ بخۆین، جا لەم ژینگە و دۆخە نالەبارەشدا! دەزانم تەنیا هاوڕێیەتیی ئێوە لەگەڵ مێردی خوالێخۆشبوومدا وای کرد لەسەر بەڵێنی خۆتان بمێننەوە!

کاترینا ئیڤانۆڤنا هەمدیسان بە شکۆ و سەنگینییەکی تایبەتەوە چاوی بە میوانەکانیدا گێڕا و کتوپڕ بە شێوەیەکی سەیر سەرنجی چووە سەر پیرەمێردە کەڕەکە و بە دەنگێکی بەرز هەر لەوبەری مێزەکەوە پرسیی کە هەمدیسان ئارەزووی لە گۆشتە و ئایا شەرابیان بۆ تێکردووە یان نا؟ هەڵبەتە پیرەمێردەکە وەڵامی نەدایەوە و تا ماوەیەک پێچی دایە خۆی و هەر نەیدەزانی مەسەلە چییە و چیی لێ دەپرسن. دراوسێکانیش بۆ پێکەنین سیخورمەیان تێ دەژەنی و ڕایان وەشاند. وێڕای هەموو ئەمانە پیرەمێردەکە تەنیا بە دەمی بەشبووەوە سەیری چواردەوریی دەکرد و ئەمەش بووە مایەی خۆشی و پێکەنینێکی زیاتری کۆڕەکە.

کاترینا ئیڤانۆڤنا کەوتە چەقەچەق لەگەڵ ڕاسکۆڵنیکۆفدا:

– کابرا هەر بە یەکجاری حەپۆلە! تەماشای کەن، ئێوە تەماشای کەن، هەر خوا دەزانێ بۆچی هێناویانەتە ئێرە؟ وەڵێ، خەریک بووم باسی بەڕێز لوژنم بۆ دەکردن، دایمەی خوا متمانەم بەم پیاوە هەبووە. بە هیچ شێوەیەکیش وەک...

لێرەوە بە شـــێوەیەکی شـــەڕەنگێزانە ڕوو لە خاتوونی خاوەنماڵ درێژەی بە قســـەکەی دا و هێندەش توندوتیژ و بە دەنگی بەرز، کە خاتوون لە شەرماندا تا بناگوێ سوور هەڵگەڕا.

– بەڵێ، وەک هەنـدێ کەس نییە، ئەم جەنـابی لوژنە! وەک ئەو شپرێوە سووراوکەرەی ئێوە نییە، خاتوون گیان، ئەگەر باوکم زیندوو بـا تەنـانەت نەیدەهێشـــت بێتە موبەقەکەشـــییەوە! تەنـانەت مێردە خوالێخۆشـبووەکەشـم ئەگەر ئەو شـانازییەی پێ ببڕیبان و ڕێگەی پێ بدابان تەنیا لەبەر بەزەیی و دڵگەورەیی خۆی بوو!

– بەڵـێ، خـاتـوون، بەڵـێ، شـــەیـدای خـواردنەوە بـوو ئەو خوالێخۆشبووە! زۆریشی دەخواردەوە!...

ئەوە پلەداری ئەوبەری مێزەکە بوو کە هاواری کرد و دوازدەهەمین پەرداخە ڤۆدکای بەدوایدا هەڵدا.

کاترینا ئیڤانۆڤناش لێی بێدەنگ نەبوو و هەمان سـات هێرشـی کردە سەری:

– مێردی خوالێخۆشـــبووم ئەو عەیبەی هەبوو و هەمووان دەیزانن و شـــتێکی نوێ نییە! وەلێ پیـاوەێکی دڵبـاش و بەحورمەت بوو و عاشـقی ژن و منداڵەکانی! خەفەتەکە ئەوەیە کە سـرووشـتە باشـەکەی لێی تێک دا و دڵی پـاکی وای کرد تێکەڵی خەڵکانی خراپ ببێ و بۆ خواردنەوە لەگەڵ کەسـانێ دانیشـێ کە لە خاکی بەرپێشی کەمتر بوون! ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ، دەزانن لە گیرفانیدا شـــەکرۆکەی کەڵەشـــێرییان دۆزییەوە؟ ســـەرخۆش بوو مێردەکەم، کەچی هەر بیری لای ژن و منداڵەکانی بوو!

پلەدارەکە هاواری کرد:

– کەڵەشێر؟ گوتتان کەڵەشێر؟

کاترینا ئیڤانۆڤنا شـــانازیی وەڵامدانەوەیی پێ نەبڕی و داڵغە بردییەوە، جا لە ناخی دڵەوە ئاهێکی هەڵکێشا.

– وا دیارە ئێوەش وەک ئەوانی تر لاتان وایە زۆر لەگەڵیدا خراپ بووم.

کاترینا ئیڤانۆڤنا ڕوو لە ڕاسکۆڵنیکۆڤ قسەی دەکرد.

– بەس وا نەبووە! ڕێزی منی لەلا بوو و بە تەواوی مانای قســـە ڕێزی لێ دەنام. ئاخ مێردێکی چەندە دڵباش و نەرمونیان بوو! هەندێ جار وەختە دڵم بۆی بسووتێ! لە لایەکەوە دادەنیشت و لێی دەڕوانیم، منیش دڵم پێی دەسووتا و دەمویست ڕووی بدەمێ و دەستێ بە سەر و گوێیدا بێنم، وەلێ دواتر لەبەرخۆمەوە بیرم دەکردەوە، *گەر ڕووی بدەمێ هەمدیســـان دەکەوێتەوە خواردنەوە!* هیچ چارەیەکی تریشـــی نەبوو، ئەو تۆزەش کە دەکرا گورجی بکەیەوە بە دەمەقاڵە و قەرقەشە بوو.

– بەڵێ، بەڵێ خاتوون! خوالێخۆشـــبوو بەوە ڕاهاتبوو کە زووزوو کـاکۆڵی بگرن و بەســـەر زەوییەکەدا کێشـــی بکەن، جـا جـار و دووجاریشی نەبوو!

ئەوە هەمدیسان پلەدارە خانەنشینکراوەکە بوو کە پەرداخی دواتری ڤۆدکای هەڵدەدا و قسەی زلی دەکرد.

کاترینا ئیڤانۆڤنا پێیدا هەڵشاخا:

– نەک هەر کاکۆڵ، هەندێ دەبەنگ دەبێ چاکچاکێک بە گســـک تەمبێیان بکەی تا تۆزێ بێنەوە سەر خۆیان! هەڵبەتە ئێستە مەبەستم مێردە خوالێخۆشبووەکەم نییە...

وا دیار بوو پەڵە ســـوورەکانی ســـەر گۆنای ســـات بە ســـات زیاتر دادەگیرســـان و ســـنگیشـــی توندتوند ســـەر و خواری دەکرد. ئەوەندە

بەس بوو یەک خولەکی دیکە بەم جۆرە تێبپەڕێت تا کاترینا ئیڤانۆڤنا هەڵایەک بنێتەوە. زۆربەی میوانەکان حیلکەحیلکیان بوو و زۆریش کەیفیان بەم نمایشـــە هاتبوو. هەر ئەوان شـــتکەلێکیان بە گوێی ئەو پلەدارەدا دەچپاند تا زیاتر ئاگرەکە خۆش بکەن و دیار بوو خۆیان بۆ بینینی فەرتەنەیەکی پیس دانابوو.

– مۆڵەت دەدەن بپرســم، خاتوون، کە ئەگەر لەگەڵ مێردەکەتانتان نییە... ئەی مەبەستتان کێیە...

پلەدار دیار بوو لە کەلی شەیتان نایێتە خوار و لە سەری ڕۆیشت:

– یانی مەبەستتان کەسێکی دیاریکراوە؟ ببوورن یانی کەسێکی نێو ئەم کۆڕە بە شـیاوی دارکاری دەزانن؟... وەلێ دەی، گرنگ نییە! ئەمە هەمووی قســەی قۆڕە! دواجار ئێوە بێوەژن کەوتن و منیش تێدەگەم! با لێگەڕێین بە گشتی... من ملکەچم!

پاشانیش پەرداخە ڤۆدکایەکی تریشی هەڵدا.

ڕاســکۆڵنیکۆف بێدەنگ دانیشــتبوو و بە قینەوە گوێی دەگرت. تەنیا لەبەر ڕێز جاروبار شـــتێکی دەخوارد، بۆ ئەوەی کاترینا ئیڤانۆڤنا دڵگران نەبێت، تامی ئەو خۆردەمەنیانەشـــی دەکرد کە هەیتاهەیتا دەیکردنە دەورییەکەیەوە. بە ســەرنجەوە ئاگاداری ســۆنیا بوو، بەڵام ســـۆنیا لەگەڵ تێپەڕینی هەر ســـاتێکدا نیگەرانتر و پەشـــێوتر دەبوو. ئەویش پێشبینیی گێچەڵێکی کردبوو و دەیزانی بڕیار نییە بە ئاشتی و خۆشـــی فراوێنەکە تەواو بکەن، وەلێ هیچی لەدەســـت نەدەهات و بە هەراســـانی چاوەڕێی هەڵچوونی ڕوو لە تەقینی کاترینا ئیڤانۆڤنا بوو. جا سۆنیا دەیزانی ئەو خاتوونە شارستانییە خانەدانانە، لە بنەڕەتەوە لەبەر ئەوە بە سووکایەتییەوە بانگهێشتەکەی کاترینا ئیڤانۆڤنایان ڕەد کردووەتەوە. خۆی لە خاوەنماڵەکەوەی بیســتبوو کە خاتوونی گەورە زۆر بەوە پەســت بووە کە داوەت کراون و تەنانەت پرسـیویەتی، ئەو

*خانمخاسـەـ چۆن حەدی هەبووە وا بیر بکاتەوە کە ئێمە گولکچەکەی خۆمـان لەگەڵ کچەتیوە بێئـابڕووەکەی ئەوان لەسـەر مێزێـک دادەنیشێنین؟* شتێک بە سۆنیای گوت کە ئەم قسەیە بەر گوێی کاترینا ئیڤانۆڤناش کەوتووەتەوە و سـووکایەتیکردنیش بە سـۆنیا لە هەر سـووکایەتیکردنێکی دی گرانتر لەسـەر دڵی دەکەوت، چونکە ئەگەر سـووکایەتییان بە خۆی، بە منداڵەکانی یان تەنانەت بە باوکیشـی بکردبا، کەمتر پێی ناڕەحەت دەبوو. سۆنیا دەیزانی کە کاترینا ئیڤانۆڤنا هەتا بەو دوو نەگبەتەی نیشـان نەدات هیچ نین، داناسـەکێت... جا لەم گێرەوکێشەیەدا دۆخەکە شڕتریش بوو، یەکێک لە میوانەکانی ئەوبەری مێزەکە دەسـت بە دەسـت قاپێکی گەیاندە دەسـتی سـۆنیا کە بە نانە جۆیەکی ڕەش ڕازێندرابووەوە کە دوو دڵی لەسـەر کێشـرابوون و تیرێک سـمیبوونی. کاترینا ئیڤانۆڤنا کەلەیی بوو و بە دەنگی بەرز شاتاندی بەسەر ئەوانەی ئەوبەردا کە ئەمە ئیشی سەگێکی سەرخۆشە هەڵبەتە! خـاتوو لیپیڤیخزیلیش کە زۆر بە لووتبەرزی و سـاردیی کاترینا ئیڤانۆڤنا قەڵس بووبوو، دواجار سـۆسـەی ئاژاوەیەکی کرد و بۆ گۆڕینی جەوی ئامـادەبووان و بە دڵنیاییەوە بۆ خۆنواندنیش، بێ پێشەکی و بەو زمانە ڕووسییە ترەیەوە دەستی کردە باسکردنی فڵانە ناسیاوی: *کارل لەناو دەرمانخانەیە، باشە؟ شەوێ گالسکە سوار بووە و گالیسکەوانیش کتوپڕ نیازی کوشتنیی هەبووە! کارل تکا دەبێ گیانم مەکێشە بەڕێز گیان! هەر فرمێسک دەڕێژێ باش، تکای کردووە، لەبەر ترسـی بووە دەی... ئەرێ، بە کورتی، پاشـانیش لە ترسان دڵی تەقی!* کاترینا ئیڤانۆڤنا زەردەخەنەیەکی کرد، وەلێ دەمودەسـت سـەرنجی خۆی دەربڕی کە وا باشترە خاتوون بە ڕووسی یادگاری نەگێڕێتەوە. خـاتوونیش زیـاتر پێی دڵگران بوو و هەمدیسـان بە هەمـان زمـانی ڕووسـیی ناڕوون خۆی گیف کردەوە کە *واتزانی کە چی؟ باوکی من لە بەرلین خۆی کەسێکە و بە جۆرێ کەسێکی سەنگینە کە لە باسـا نایێ، ڕێی کە دەکرد دەسـتی دەبرد بۆ گیرفان...* کاترینا ئیڤانۆڤنای

بەســـەرنج کە بەو حاڵەشـــەوە بە زۆر بەری بە پێکەنینەکەی گرتبوو، نەیتوانی جڵەوی خۆی بکات و هێندە تۆقێنەرانە پێکەنی کە ئیدی جامی سەبری خاتوون لێوپرێژ بوو و لەم دەقە و لەو دەقەدا بوو بیتەقێنێ.

– تەماشای ئەو بایەقوشە شاخدارە کەن توخوا!

کـاترینـا ئیڤـانۆڤنـا کە تـا ڕادەیەک خۆشـــکەیفیی گەڕابووەوە، سەرلەنوێ کەوتەوە چپەچپ بە بناگوێی ڕاسکۆڵنیکۆفدا.

– یانی باوکی بەدەم پیاســـەوە دەســـتی بە گیرفانیدا کردووە، بە جۆرێ گوتی کە کابرای کردووەتە گیرفانبڕ بەم قســـەکردنەی. هاهاها! هەر بە ڕاســـت هیچ بیرتان لێ کردووەتەوە، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ، کە بیـانییەکـانی پیتەربورگ و، ئەم ئەڵمـانیـانەی کە هیچ دیـاریش نییە لە کوێوە قوت دەبنەوە، چەنـدە لە ئێمە حەپۆلترن؟ ئـاخر ئێمە کـاممـان دەڵێین *کارل لەناو کتێبخانە!* یان *لە ترســان دڵی تەقی!* ئەی ئەو ورچە زلە لەجێی ئەوەی یەخەی گالیسکەوانەکە بگرێ و بە جۆرێ دەست و پێی ببەســـتێتەوە، وەک منداڵێکی چوار ســـاڵە هۆنهۆن فرمێســـکی ڕشتووە! حۆلە ئەم ژنە! ئێستە هەڵبەتە وا دەزانێ لەتاو یادگارییەکەی مووی لەشمان ڕاست بووەتەوە! خۆیشـی نازانێ چەندە دەبەنگە! گەر لە من بپرسی ئەوا دەڵێم ئەم پلەدارە بەدمەستەی خۆمان زۆر ژیرترە، بەڵێ دەی، عـارەق ئەقڵیی فەوتـاندووە، وەلێ ئەی ئەم بیـانیـانە؟ خۆ ئەمانە دایمە جددی و ڕێکوپێک و جلئوتوکراون لای خۆی... تەماشای کەن ژنەتیوە ئاخر؟ قنج دانیشـــتووە و وا چاوەکانی لە کاســـەوە دێنە دەر. پەست بووە! هاهاها!

کاترینا ئیڤانۆڤنا ئیدی بە تەواوی هۆشـــی لەســـەر خۆی نەمابوو و نەیدەزانی چی دەڵێت، بەدوای ئەم قســـانەدا چووەوە ســـــەر بابەتی بڕانەکە و بە ڕاســـکۆڵنیکۆفی گوت بڕیاری داوە کە بڕانەکەی جێگر

بوو، قوتابخانەی شـــەوانەڕۆژی بۆ کچە خانەدانانی *تاگانروگ*ی[1] زێدگەی بکاتەوە. کاترینا ئیڤانۆڤنا تا ئەو ساتە باسی قوتابخانەکەی بۆ ڕاسـکۆڵنیکۆف نەکردبوو، بەڵام لەو سـاتەدا قوڵی لێ هەڵماڵی و یەک بە یەکی وردەکارییە ئێجگار سـەرنجڕاکێشـەکانی نەخشـەکەیی خستنە سـەر مێز. کتوپڕیش دەتگوت لە غەیبەوە شـتێک لە دەسـتی کاترینا ئیڤـانۆڤنـادا دەرکەوت... هەمـان ئەو لەوحەی ڕێزلێنـانە بوو کە مـارمیلادۆڤ لە مەیخـانەدا بـاسـی کردبوو و هەمـان کـاتیش بە ڕاسـکۆڵنیکۆفی گوتبوو کە هاوسـەرەکەی، خاتوو کاترینا ئیڤانۆڤنای ڕێزدار، لە ڕێوڕەسـمی دەرچووندا لەبەردەم فەرماندار و بەڕێوەبەری قوتابخانە و ماباقیی سـەرزلەکاندا سـەمای کردووە. دەتگوت ئێسـتاکە ئەو لەوحەی ڕێزلێنانە ڕۆڵی مۆڵەتنامەیەکی بۆ کاترینا ئیڤانۆڤنا دەگێڕا تا قوتابخانە شـەوانەڕۆژییەکەی پێک بهێنێت، ئەوەش لەلایەک کە ئەو دەسـتەنقەسـت لەوحەکەی هێنابووە پاڵ دەسـتی تا لە کاتی خۆیدا دەری بخات بۆ ئەوەی گەر ئەو نەگبەتانە هاتن، لە قاڵبیان بداتەوە و بێ هیچ ئەملا و ئەولایەک بیسـەلمێنێت کە خاتوو کاترینا ئیڤانۆڤنا تەنانەت دەکرێ بڵێیت سـەر بە خێزانێکی خانەدانە، سـەرهەنگزادە و لە سـەرووی فلان و فیسـارە دەرگێڵەکەلی[2] سـەربەگێچەڵەوەیە کە نموونەیان لە هەموو لایەکدا هەیە و پەنابایێک ناهێنن!... بەڵام ئێستاکە بێ ئـامـادەگیی ئەو دایـک و کچە لە ڕێوڕەسـمەکەدا، لەوحەی ڕێزلێنـانەکەدا لە چاوترووسـکانێکدا بەنێو میوانە سـەرخۆش و

---

١. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە دۆسـتۆیفسـکی لە ئافراندنی سـیمای کاترینا ئیڤانۆڤنادا، ماریا دیمیتریێوناى یەکەم هاوسـەریی لە بەرچاو بووە، دەتواندرێت پێکچوونەکانی ئەو دووانە بژمێردرێن: کاترینا ئیڤانۆڤناش وەک ماریا لە تاگانروگدا لە دایک بووبوو، هەردووکی دەرچووی پلەنایابی کۆلێژی شـەوانەڕۆژی بوون و لە کۆتاییشدا هەردووکیان بە سیل گیان لەدەست دەدەن. «و. ف»

١. دەرگێڵ: دەرگەڕ؛ کەسـێک کە ناکەوێتەوە ماڵەوە و داناسـەکێت (وشـەکە هەورامییە).

بەدمەستەکاندا گێردرا و کاترینا ئیڤانۆڤنا بەری پێ نەگرتن، چونکە لە دەقەکەیدا هاتبوو کە باوکی ئەو راوێژکارێکی خاوەن مەدالیای میرییە و پلەکەشی هاوئاستی سەرهەنگە و، ئیدی هەر چۆنێک بووە، کاترینا ئیڤانۆڤناش دەبووە سەرهەنگزادە. کاترینا ئیڤانۆڤنا دەستی کردە فرەرێسی و کەوتە چەنەدان لەبارەی ژیانی داهاتووی هێمن و خۆشییەوە لە شارستان، ئەو مامۆستایانەی کە بەنیاز بوو لە قوتابخانەکەیدا دایان بمەزرێنێت و بەتایبەت فەرەنسییەکی بەساڵداچووی ئێجگار بەڕێز بە ناوی مەنگۆوە کە پێشتر وانەی بە خودی کاترینا ئیڤانۆڤنا گوتبووەوە و وا دیارە ئێستەش هەر لە شارستان دەژی. بەڕێز مەنگۆ بێگومان پەسەندی دەکات کە لە قوتابخانەکەی کاترینا ئیڤانۆڤنادا وانە بڵێتەوە. دواجار هاتە سەرەی بەرنامەکانی بۆ سۆنیا: هەڵبەتە پێکەوە دەچوونە شارستان و سۆنیاش لە هەموو کارەکاندا یارمەتیی دەدا. وەلێ هەر کە ئەمەی گوت، یەکێک لەوپەری مێزەکەوە حیلکەیەکی کرد. کاترینا ئیڤانۆڤنا هەتا توانیی، خۆی لە گێلی دا، بەڵام دەنگیی هەڵبڕی و دەستبەجێ زۆر لێبڕاوانە گوتی سۆنیا کچێکی لێهاتووە و دەرەقەتی کارەکان دێت، کچێکی پشوودرێژ و شەرمن و لەخۆبردوو و بڕوانامەدارە. هاوکات دەستێکی نەوازشی بە ڕووخساری سۆنیادا هێنا و دوو جاریش نیوخێز بوو و زۆر بە گەرموگوڕی ماچی کرد. سۆنیا سوور هەڵگەڕا و کاترینا ئیڤانۆڤناش کتوپڕ لە پرمەی گریانی دا و دەمودەست گوتی دەزانێت هەر وا لە خۆڕا دەبەنگانە و تووڕە هەڵسوکەوت دەکات، وەلێ حاڵی باش نییە و ئەم بابەتی ڕێوڕەسمی فراوێنەش زۆر درێژەی کێشاوە و وا باشە ئیدی چایەکەش بگێڕن. خاتوو لیپی‌ڤیخزێل تەواو بەوە دەبری بووبوو کە لە گوتوبێژەکەدا بەشدارییان بەو نەکردبوو و هیچ کەسێک گوێی لێ نەدەگرت. وەلێ ئێستە کاتەکەی بە هەل زانی و ویستی لەم دواهەمین ساتەدا هەڵبکوتێتە سەر نەیارەکەی. هەرچۆنێک بووە تووڕەبوونەکەیی شاردەوە و ویستی گوایا ئاماژە بە بابەتێکی ورد و

قووڵ بکات کە دەبێت کاترینا ئیڤانۆڤنا لەو قوتابخانە شەوانەڕۆژییەیدا سەرنجی لەسەر چەند خاڵێکی گرنگ بێت: یەکێکیان خاوێنیی چەرچەفی کچەکانە، جا نەک هەر کەسێکیش، بەڵکە ژێرەژنێک بۆ چەرچەفەکان دابنێ و دووەمیش ئەوەیە کە کچەکان شەوانە لەگەڵ خۆیاندا ڕۆمان نەبەنە ژێر لێفەوە... کاترینا ئیڤانۆڤنا خۆی وەک پێویست تووڕە و ماندوو بوو و ڕێورەسمی فراوێنەکەش ئیدی خەریک بوو پەستی دەکرد، هەر لەبەر ئەوەش ئیدی خۆی پێ ڕانەگیرا و پەڕییە نێو قسەکانی و گوتی لەبەر ئەوەی ئەو هیچ شارەزاییەکی لە بەڕێوەبردنی قوتابخانەدا نییە، قسەی ناشیانە دەکات، ئەوە خزمەتکاری جلشۆرگەیە کە دەبێ بپەرژێتە سەر چەرچەفەکان نەک بەڕێوەبەری قوتابخانەی شەوانەڕۆژیی خانەدانان! ڕۆمانبردنە ژێر پەتۆش قسەیەکی ناشیرینە و وا باشترە چاکەیەک بکات و ئیدی هیچ نەڵێت! خاتوون زۆر بەمە دڵگران بوو و فرە بە تووڕەیی ڕوونی کردەوە کە تەنیا ویستوویەتی لە چاکەخوازیان یارمەتییەکی بدات و نیازێکی هاوڕێیانەی هەبووە دەنا پێویستە بیری بخاتەوە کە وێڕای ئەوەی کاترینا ئیڤانۆڤنا دەمێکە کرێی ژوورەکەی نەداوە، کەچی ئەو هەر هاوڕێیانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکات! کاترینا ئیڤانۆڤناش دەمودەست بەگژیدا چووەوە و گوتی باسی کامە چاکەخوازی و هاوڕێیەتی دەکات و ئەوە چ درۆیەکە؟ خۆ هەر دوێنێ کە لاشەی مێردە خوالێخۆشبووەکەی کەوتبووە سەر جێگە، خاتوون تەنیا لە خەمی کرێکەیدا بووە و خەریک بوو سەری کاترینا ئیڤانۆڤنای کەچەڵ دەکرد! ئەم جارەیان خاتوون لە وەڵامدا گوتی بۆ ڕێورەسمەکەی ئەمڕۆش بەتایبەت ئەو خاتوونانەی داوەت کردوون، بەڵام خۆیان نەهاتوون، لەبەر ئەوەی دوو خاتوونی سەلارن، ئیدی ناتوانن بێنەماڵێکەوە کە شکۆی نەبێت! کاترینا ئیڤانۆڤناش ئاماژەی پێ کرد، لەبەر ئەوەی خاتوون خۆی لە پۆخڵەواتە پلەیەکەکانە، مافی ئەوەی نییە بڵێت چ کەسێک سەلارە و کێش ناسەلار! خاتوون دەستبەجێ گوتی باوکی

له بەرلیندا بۆ خۆی کەسـێکی فرە سـەنگین بووە و دایمە هەردووک دەستی بە گیرفانەکانیدا کردوون و بەدەم ڕێکردنەوە پفـپفی کردووە. دواتریش بۆ ئەوەی بە باشی وێنای باوکی بهێنێتە بەرچاوی هەمووان، لە جێگەکەی خۆی دەرپەڕی و لە بارێکدا کە میوانەکان قاقا پێدەکەنین، دەستی بە گیرفانیدا کرد، گوپەکانیی پڕ کردن لە هەوا و دەستی کردە دەنگدەرکردن... شـتێکی وەک پفـپف. میوانەکان کە سـۆسـەی فەرتەنەیەکی پیسـیان دەکرد، دەسـئەنقەسـت خاتوونیان هەڵدەنا تا لەسەری بڕوات. وەلێ کاترینا ئیڤانۆڤنا ئیدی بەرگەی ئەمەیانی نەگرت و بە جۆرێک کە هەمووان ببیستن، گوتی ئێمە چووزانین، ڕەنگە مادام هەر لە بنەڕەتەوە بێباوک بێ و لەو پیتەربورگییە بێگانانە بێت کە بۆی هەیە لە نانەوایی یان تەنانەت شـوێنێکی لەوەش خراپتردا شـەوی کردبێتەوە! جا ڕەنگی مادام وەک هی قرژاڵ سـوور هەڵگەڕا و کەوتە چیقەچیق کە لەوانەیە ئەوە خودی کاترینا ئیڤانۆڤنا بێت کە بێباوکە، چونکە باوکە گیانی ئەو لە بەرلین بووە و هەمیشەش فراکێکی درێژی پۆشـیوە و پفـپفی کردووە! کاترینا ئیڤانۆڤنا بە پێویسـتی زانی بە سووکایەتییەوە ئاماژەی پێ بکات کە خۆشبەختانە هەمووان بنەچەی[1] ئەو دەناسن و بەسەر هەمان ئەو لەوحەی ڕێزلێنانەوە نووسراوە کە باوکی سـەرهەنگ بووە، وەلێ باوکی خاتوون -جا بە گریمانەی ئەوەی کە بـاوکێـک لەئـارادا بووبێـت- بۆی هەیە لەو بێگـانە پیتەربورگیانە بووبێت و کاریشی شیرفرۆشی یان شـتێکی لەو بابەتە بووە. جا ئەوەش لەلایەک کە گومان لە بێباوکیدا نییە و هێشـتا ناوی تەواویشـی ڕوون نەبووەتەوە کە ئایا ئامالیا ئیڤانۆڤنایە یان ئامالیا لودۆیگاونا! خاتوون کە خەریک بوو لە ڕقاندا ڕەنگ دوای ڕەنگی دەگۆڕی، مسـتێکی توندی بە مێزەکەدا کێشـا و هاواری کرد کە ناوی تەواوی ئامالیا ئیڤانۆڤنایە، نەک ئامالیا لودۆیگاونا، چونکە ناوی باوکە

[1]. بنەچە: تۆ و تۆرەمە؛ بن و بنەوا؛ باب و باپیران؛ ئەسڵ و نەسەب.

گیانی هەمان یۆهان یان هەر ئەم ئیڤانە ڕووسـیییە بووە و، هەروەها، سـەرۆکشـارەوانی بووە و بـاوکی کـاترینـا ئیڤـانۆڤنـا هیچ کـات سـەرۆکشـارەوانی نەبووە. کاترینا ئیڤانۆڤنا هەسـتایەوە و بە دەنگێکی جددی وەلێ بە ڕووالەت هێمنەوە -گەرچی ڕەنگی بە ڕووەوە نەبوو و سـینگی توندتوند سـەر و خواری دەکرد- گوتی گەر خاتوون جارێکی دی زات بکات ئەو باوکە نەگبەتەی بکاتە هاوشـانی باوکی ئەو، بە دەسـتی خۆی ئەو کلاوە قوزەڵقورت و پڕوپووچەی لە سـەر دەماڵێ و دەیخاتە ژێر پێیەکانییەوە! خاتوون بە بیسـتنی ئەم قسـانە کەوتە ڕاکردن بە ژوورەکەدا و پڕ بە گەرووی دەیشـاتاند کە ئەو خاوەنماڵە و کاترینا ئیڤانۆڤنا دەبێت هەر ئێسـتە ماڵەکە چۆڵ بکات. پاشـانیش دیار نەبوو بۆچی فڕکەی کردە لای مێزەکە و کەوچکە زیوینەکـانی کۆ کردنەوە. هەراوهـوریـا ژوورەکەی تەنیبووەوە، منداڵەکان کەوتنە گریـان و سـۆنیا فڕکەی کرد تـا بەر بە کـاترینا ئیڤانۆڤنا بگرێت و هێوری بکاتەوە. بەڵام کە مادام قسـەیەکی لەبارەی مۆڵەتنامەی زەردەوە فڕێدا، کاترینا ئیڤانۆڤنا سۆنیای پاڵ نایە دواوە و هێرشـی بۆ برد تا هەڕەشـەکەی بکاتە کردە. ڕێک لەم کاتەدا، دەرگە کرایەوە و لوژن لە ئاستانەکەیدا دەرکەوت و هەر لەوێ ڕاوەستا و بە سـەرنجێکی تیژ و بکۆڵەوە چـاوی بە ئامـادەبووانـدا گێڕا. کـاترینـا ئیڤانۆڤنا پڕتاوی کردە لای.

## سێ

کاترینا ئیڤانۆڤنا هاواری کرد:

– جەنابی لوژن! لانیکەم ئێوە فریامان کەون! ئەم ژنەتیوە دەبەنگە تێگەیەنن کە مافی ئەوەی نییە لەگەڵ خانمێکی بەڕێزدا کە بووە بەژێر هەزاران دەردیسەرییەوە، وەها هەڵسوکەوتێ بکا... وڵاتەکە یاسای هەیە... دەچمە لای خودی فەرماندار... دەبێ وەڵامی کار و قسەکانی بداتەوە... سوێندتان دەدەم بەو نانەی کە لەگەڵ باوکمدا خواردتان، چاوتان لەم منداڵە هەتیوانە بێ!

– مۆڵەت بدەن خاتوونی ڕێزدار... مۆڵەت بدەن...

لوژن بە ئاماژەی دەست کاترینا ئیڤانۆڤنای کشاندە دواوە:

– خاتوونی بەرز چاک ئاگادارن کە من شانازیی ناسینی باوکی بەرزوبەڕێزتانم پێ نەبڕاوە و (حیلکەی پێکەنینێک بەرز بووەوە) بە هیچ شێوەیەکیش نامەوێ خۆم تێکەڵی گێچەڵی نێوان ئێوە و مادام لیپیڤیخزیل بکەم کە سوپاس بۆ خوا هەر نابڕێتەوە... قسەیەکی ترم هەیە و کارەکەم تایبەتییە... دەمەوێ دوو قسە لەگەڵ کچی مێردە خوالێخۆشبووەکەتاندا بکەم... سۆنیا خاتوون... ڕاستم گوت؟... مۆڵەت بفەرموون بێمە ژوور، خاتوونی ڕێزدار...

لوژن بە لارەلار خۆی بەتەنیشت کاترینا ئیڤانۆڤنادا ڕەد کرد و بەرەو ئەو لایەی دیکەی ژوورەکە چوو کە سۆنیای لێ بوو.

کاترینا ئیڤانۆڤنا وەک ئەوەی برووسـکەی بەر کەوتبێت، لە جێوە وشـک بووبوو و نەیدەزانی جەنابی لوژن چۆن توانیویەتی نکۆڵی لە ناسـینی باوکی ئەو و ئەو نانە بکات کە پێکەوە خواردبوویان. بابەتی ئەم ناسـینە زادەی زەینی خودی کاترینا ئیڤانۆڤنا بوو، وەلێ ئێسـتە ئیدی باوەڕی پێی هەبوو و بۆ ئەو وەک ڕاسـتییەک وەها بوو. ئێجگار بە شـێوازی قسـەکردنی لوژنیش تاسـابوو، ئاخر بۆچی ئەوەندە وشک و تەنـانەت هەڕەشـەئـامێز؟ بە هـاتنەژوورەوەی لوژن بەرەبەرە دەنگوهەرای ئامـادەبووان کپ بووەوە. ئەسـڵەن ئەوە لەلایەک کە مرۆڤێکی بازرگان و جددیی وەک ئەو زەوی تا ئاسـمان جیاوازیی لەگەڵ ئەوانی دیکەدا هەبوو، بەڵام دەکرا بە ئـاسـانی ببینیـت کە بـابەتێکی گرنـگ ئەوی کێش کردووەتە ئەوێ کە گاڵتەی پێ نـاکرێت. نەدەکرا بە جۆرێکی دی ئامادەبوونی ئەو پاسـاو بدەیت و لە ئەنجامدا هەمووان هەستیان دەکرد شتێک لە لێواری ڕووداندایە. ڕاسکۆڵنیکۆف لەتەک سۆنیاوە ڕاوەستابوو و ڕێگەی دا لوژن تێپەڕێت، بەس دەتگوت لوژن نەیناسیوەتەوە. تۆزێک دواتر، لیبیزیاتنیکۆفیش دەرکەوت و هەر لە ئاستانەی دەرگەکەدا ڕاوەستا و نەهاتە ژوور، بەڵام دیار بوو کە لە نـاوەوەڕا کونجکۆڵیی خرۆشـاوە و بە جۆرێـک لە جۆرەکـانیش سەراسیمەیە. گوێی دەگرت، هاوکات پێنەدەچوو لە هیچ شتێک تێبگات.

لوژن لە دەسـتپێکی قسـەکەیدا ڕووی لە کەسـێکی تایبەت نەکرد و ڕوو لە ئامادەبووان گوتی:

– داوای لێبوردن دەکەم، بێزارم کردن، وەلێ گرفتێـک هـاتووەتە پێش کە زۆر گرنگە و هەڵبەتە خۆشحاڵم کە ئێرە خەڵکی تریشی لێیە.

پاشان درێژەی پێ دا:

– خاتوو لیپیڤیخزیل، من تکا دەکەم جەنابی بەرزوبەڕێزتان کە بەرپرسی ئەم ماڵەن، سەرنج بدەنە ئەو قسەیە کە لەگەڵ سۆنیا خاتوونی دەکەم. سۆنیا خاتوون...

لوژن ئێستە ڕاستەوخۆ قسەی لەگەڵ سۆنیادا دەکرد و ئەویش واقووڕ و ترساو.

– سۆنیا خاتوون، دوای دیدارەکەمان و ڕێک دوای ڕۆیشتنی ئێوە، تەماشام کرد یەک ئەسکەناسی سەد ڕۆبڵی لەسەر مێزەکەی من نەماوە. یانی لەسەر مێزی ژووری هاوڕێی ئازیزم بەڕێز لیبیزیاتنیکۆف. گەر ئێوە بە هەر جۆرێ ئاگاداری ئەم بابەتە هەن، هەر ئێستە بفەرموون کە سەد ڕۆبڵەکەی من لە کوێیە و منیش لەبەردەم هەمووواندا بەڵێنی شەرەف دەدەم کە هەر لێرە سەری هەموو شتێ بنێمەوە و هیچ شتێ دزە نەکاتە دەرێ. دەنا هیچ چارەیەکی ترم بۆ ناهێڵنەوە و هیچ ڕێیەک نامێنێتەوە بێ لە بەدواداچوونێکی جددی و فەرمیی کێشەکە و ئەوکات... ئیتر گلەیی خۆتان لەسەر خۆتان!

بێدەنگییەکی تەواو ژوورەکەی داگرت. تەنانەت منداڵەکانیش کە هەر لە سەرەتاوە کەوتبوونە گریان، نووزەیان لێوە نەدەهات. سۆنیا بە شێوەیەکی مەرگبار ڕەنگی پەڕیبوو و واقی بە لوژندا وڕ مابوو، تەنانەت نەیدەتوانی بۆ وەڵامدانەوە دەمیش بکاتەوە؛ دەتگوت هێشتا تێنەگەیشتووە لوژن چی دەڵێت. چەند چرکەیەک تێپەڕی.

لوژن چاوی بڕییە سۆنیا و پرسیی:

– دەی، دەفەرموون چی بکەین؟

سۆنیا دواجار بە زۆر چەند وشەیەکی دەربڕین:

– نازانم... من ئاگاداری ئەو بابەتە نیم...

– نازانن؟ یانی لێی بێئاگان؟

لوژن هەمدیسان چەند چرکەیەک ڕاوەستا.

- پەلە مەکەن کچە خاتوون، چاک بیری لێ بکەنەوە.

شێوازی قسەکردنی ڕقاوی و ڕەق بوو، بەڵام دەتگوت هێشتا بەتەمایە سۆنیا تەمبێ بکات:

- بڕوانن، من ئامادەم کاتی پێویستتان بدەمێ تا بە چاکی بیری لێ بکەنەوە. بە چاکەی خۆتان ئەوە لە بەرچاو بگرن کە من بەم کێوە ئەزموونەوە ئەگەر دڵنیا نەبام، خۆمم بەوە سووک نەدەکرد کە بە ڕۆژی ڕۆشن لەخۆڕا بوختانتان بۆ بکەم! وەها تۆمەتێک، جا بەتایبەت لەنێو کۆڕێکیشدا، تەنانەت گەر وەک هەڵەتێگەیشتنێکیش ناڕاست دەرچێ ئەوا بەسەر خۆمدا دەشکێتەوە و منیش چاک ئاگاداری ئەو خاڵەم! ئەمڕۆ بۆ خەرجیی خۆم چەند چەکێکی لە سەدا پێنجیم ورد کردەوە کە بە گشتی دەیکردە سێ هەزار ڕۆبڵێک. لە دەفتەرچەکەشمدا حسێبەکەم لایە. کە گەیشتمە ماڵەوە، یەکسەر دەستم کردە ژماردن و بەڕێز لیبیزیاتنیکۆفیش شاهێدە. دوو هەزار و سێسەد ڕۆبڵیم هەڵگرت و خستمە کیفەکەمەوە و کیفەکەشم نایە گیرفانی کۆتەکەمەوە. پێنجسەد ڕۆبڵێکی لەسەر مێزەکە مایەوە و سێ دانە ئەسکەناسی سەدیش تێکەڵی پارەکانی سەر مێزەکە بوو. هەر لەو کاتەدا بوو کە ئێوە بە بانگهێشتکردنی من هاتنە ژوور و بە درێژایی ئەو ماوەیەش بێزادە دەستەپاچە بوون و هەر پێچتان دەدایە خۆتان؛ لە گەرمەی قسەکردنەکەشمدا سێ جار هەستانەوە ویستتان بڕۆنە دەرێ! بەڕێز لیبیزیاتنیکۆفیش ئامادە بوون و دەتوانن شایەتی بدەن. ئێوەش بە دووری دەزانم بە زمانی خۆتان قسەکەم پشتڕاست نەکەنەوە کە بەڕێز لیبیزیاتنیکۆفم، تەنیا و تەنیا بە مەبەستی قسەکردن لەبارەی ئەو دۆخە شڕ و گێژاوە ناجۆرەوە ناردە شوێنتان کە کاترینا ئیڤانۆڤنای خێزانتان تێیدا گیریان خواردووە (هەڵبەتە نەکرا لە ڕێوڕەسمی فراوێنەکەیاندا بەژداری بکەم) هەروەها بۆ قسەکردن

لەسەر ئەگەری وەرگرتنی یارمەتی لە چاکەکاران و کۆکردنەوەی خێر و ئەم جۆرە شتانە تا بەشکووم کەمێ هەستنەوە سەر پێی خۆیان! ئێوە خۆتان سوپاسێکی زۆرتان کرد و تەنانەت فرمێسکیشتان بە چاودا هاتە خوار! وا خەریکم موو بە موو هەموو شتێکتان بۆ باس دەکەم تا بە زووترین کات ئێوەش هەموو شتێکتان بیر بکەوێتەوە و پاشانیش ڕێک تێبگەن کە یادگە و وردیی سەرنجی من قسەی لەسەر نییە و هیچ شتێکم بەسەردا تێناپەڕێ! پاشانیش دە ڕۆبڵییەکم لەسەر هەمان مێز هەڵگرت و پێشکەشم کردن تا ببێتە یەکەمین یارمەتیی من بۆ خێزانەکەتان. بەڕێز لیبیزیاتنیکۆفیش بە چاوی خۆیان هەموو ئەم شتانەیان دیون کە باسم کردن. ئاخیرەکەشی تا بەردەرگە لەگەڵتان هاتم و خۆ بیریشتانە کە تا دواهەمین سات هەر شپرزە بوون. دواتریش کە لەگەڵ بەڕێز لیبیزیاتنیکۆفدا تەنیا ماینەوە، دە خولەکێک پێکەوە دەمەتەقێیەکمان کرد و ئەوان چوونە دەرێ. من گەڕامەوە سەر مێزەکە، دەمویست هەمدیسان پارەی سەر مێزەکە بژمێرمەوە و کۆی بکەمەوە، وەک چۆن بەر لە هاتنی ئێوەش هەر دەمویست ئەم کارە بکەم. کەچی سەیرم کرد ئای فەقیرحاڵ خۆم، سەدڕۆبڵییەک دیار نەماوە! خۆتان بخەنە شوێنی من! خۆ ناتوانم گومان لە بەڕێز لیبیزیاتنیکۆف بکەم و تەنانەت شەرمیش دەکەم بیری لێ بکەمەوە! حسێب و کتێبەکەشم ڕاست بووە، چونکە بەر لە هاتنەژوورەوەی خاتوونی هێژا هەموویم ژماردبوو و بە گشتی تەواو بوو. دەی، بە لەبەرچاوگرتنی شڵەژانی سەیری ئێوە و تامەزرۆییتان بۆ چوونەدەر و هەڵبەتە ئەوەش کە تا ماوەیەک دەستتان لەسەر مێزەکە بوو و، لە لایەکی ترەوە، ئەو دۆخە کۆمەڵایەتییەی ئێوە و ئەو خووانەی کە ئەم دۆخە کۆمەڵایەتییە لەگەڵ خۆیدا دەیانهێنێ و، بە کورتییەکەی، بە سەرنجدان لە هەموو ئەمانە لە کاتێکدا ناڕەحەت و بێهیوا بووم و بە هیچ شێوەیەک نەمدەویست بە وەها ئەنجامێک بگەم، هەلومەرجەکە ناچاری کردم گومان لە ئێوە بکەم. لەوانەشە بێبەزەییانە بێ و بە

بۆچوونی ئێوە ناشـــایەن، وەلێ تەواو پاســـاودارە! مۆڵەت بدەن هەر لێرەدا بۆی زیاد بکەم کە چاک دەزانم وێڕای دڵنیاییەکی ســــەد لە ســــەدیش، تۆمەتبارکردنی ئێوە لە بنەڕەتدا یانی ئەوەی کە خەریکم خۆشـــم دەخەمە مەترســـییەوە. وەلێ خۆتان ببینیتان کە ڕێگەیەکی ترم نەبوو و نەمدەتوانی چاو لەو شـــتانە بپۆشـــم. ئێســـتە باشـــە من بۆچی کـاردانەوەیەکی کردەییم نواند؟ ڕایدەگەیەنم لە خزمەتتـانـدا: تەنیـا... بەڵێ، خاتوونی ڕێزدار، تەنیا و تەنیا بێئەمەکیی ئێوە بووە هۆکار. هەر بە ڕاســـــتی وایە! من ئێوەم بانگ کرد تا باســـــی خێزانە بێچارەکەتان بکەین و جـا بە دەســـــتی خۆشـــــم دە ڕۆبڵم پێ دان، کەچی ئێوە دەســـتبەجێ بە خیتکردنی ســـەدڕۆبڵیی من پاداشـــتم دەدەنەوە! هەر بە ڕاستی شـووورەییە! نا، کچە خاتوون، ئەمە ڕاســت نییە. دواجار دەبێ کەســـێ هەڵکەوێ و گوێتان ڕاکێشـــێ و وانەیەکتان دابدا. ئێســـتە تکایە هەموو ئەمانە لە بەرچاو بگرن و من وا وەک هاوڕێیەکی ڕاســـــتەقینە تکاتان لێ دەکەم، چونکە لەم هەلومەرجەدا هاوڕێیەکی لە من باشـــتر نادۆزنەوە! چاک ئاخیر و ئاقیبەتی کارەکەتان هەڵبســـــەنگێنن! من گەر بە ڕقدا بکەوم ئیتر هیچ شـــتێک و هیچ کەســـێ ڕامناگرێ!... دەی، چی بوو؟

سۆنیا تۆقیوانە لەژێر لێوەوە گوتی:

– من هیچم لە ژوورەکەی ئێوەدا هەڵنەگرت! تەنیـا خۆتـان دە ڕۆبڵتان پێ دام کە ئەوەتانێ، فەرموون، با لە خزمەت خۆتاندابێ!

سۆنیا دەسرەکەی لە گیرفانیدا دەرهێنا، گرێی دەسرەکەی کردەوە و دەرۆبڵییەکی دەرهێنا و دایە لوژن.

لوژن دە ڕۆبڵەکەی وەرنەگرت و بە شـــێوازێکی ســــەرکۆنەکەرانە گوتی:

– کەواتە ناتانەوێ دان بەوەدا بنێن کە ئێوە سەدرۆبڵییەکەی منتان بردووە؟

سـۆنیا چاوێکی بە ژوورەکەدا گێڕا. نیگاگەلی تۆقیو و لێوانلێو لە قێزی ئامادەبووان بەودا واق بووبوون. سەیری ڕاسکۆلنیکۆفی کرد... ڕاسکۆلنیکۆف دەستلەسەرسنگ لای دیوارەکەوە ڕاوەستابوو و بە چاوانێکی بڵێسەدارەوە لەوی دەڕوانی.

سۆنیا بێ ویست گوتی:

– خوایە!

– خاتوو لیپی‌ڤیخزیل، دەبێ بنێرین بەدوای پۆلیسدا و هەر لەبەر ئەوەش تکا دەکەم قاپچی بانگ بکەن.

شێوازی قسەکردنی لوژن لەسەرخۆ و تەنانەت نەرمونیانیش بوو.

خاتوون دەستەکانیی بەرز کردنەوە و بە تێکەڵەیەک لە ئەڵمانی و ڕووسی گوتی:

– وای خوا گەورە! دەمزانی دز کردووە ئەم کچە!

– یانی دەتانزانی؟

لوژن شوێن قسەکانی کەوت:

– هەڵبەتە پێشوەختە بەڵگەیەگ هەبووە کە ئێوە بەم جۆرە بیرتان کردووەتەوە. خاتوو لیپی‌ڤیخزیلی بەڕێز، تکاتان لێ دەکەم بیرتان بمێنێ کە لەبەردەم ئەم هەموو شایەتەدا چیتان فەرموو.

کاترینا ئیڤانۆڤنا کتوپڕ تێگەیشت چ بەزمێک نراوەتەوە و بەگژ لوژندا چووەوە:

– چی؟ تێنەگەیشتم! تۆمەت بۆ سۆنیا هەڵدەبەستن؟ بۆ سۆنیا؟ ئەی نارەسەنینە! کۆمەڵێ نارەسەنن هەرهەمووتان!

پاشــان بەرەو ســۆنیا ڕای کرد و باســکە چەقەکانیی وەک گیرە بە دەوریدا ئالاندن.

– ســــۆنیا! تۆ بۆچی دە ڕۆبڵیی ئەم خوێڕییەت وەرگرتووە؟ چۆن وێرات؟ کچەی گەمژە! ئادەی بمدەرێ! بیدەرە من ئەو دە ڕۆبڵییە...

کاترینا ئیڤانۆڤنا دە ڕۆبڵییەکەی لە چنگی سۆنیادا ڕفاند و گرمۆڵەی کرد و ڕێک بە دەموچاوی لوژنیدا کێشــا. دە ڕۆبڵییەکە دای بە چاوی لوژنــدا و کەوتە ســــەر زەوی. مــادام لیپیڤیخزیــل بە هەڵپەیەک ئەسکەناسەکەی هەڵگرتەوە. لوژن دەیری بوو و هاواری کرد:

– یەکێک بەر بەم ژنەتیوە شێتە بگرێ!

هەر لەو کاتەدا چەند کەسێک بەدوای لیبیزیاتنیکۆفدا لە دەرگەکەوە ســەریان کێشــایە ژوورێ. دوو خاتوونە کرێچییەکەش لەگەڵ ئاپۆڕا تازەهاتووەکەدا دەرکەوتن.

– چی؟ شێت؟ بە منت گوت شێت؟ نەفامی بێئاوەز!

کاترینا ئیڤانۆڤنا پڕ بە گەرووی دەیقیژاند.

– شــــێــت خۆتی، خوێڕی! وردەڵەبریکــاری تەڵەکەچی! زۆر کەموکورتی! ســــۆنیا، یانی ســــۆنیای من پارەی ئەم خوێڕییەی خیت کردبێ؟ ســــۆنیا دزی بکا؟ ســــۆنیایەک کە ئامادەیە هەموو پارەکەی خۆی بداتە ئەوانی تر؟ زۆر نەفامی!

کــاترینــا ئیڤــانۆڤنــا خەریک بوو بە بــارێکی ئێجگار هیســــترییەوە پێــدەکەنی و لە لایەکی ژوورەکەوە فڕکەی دەکردە لایەکی دیکە و لوژنی نیشانی هەمووان دەدا.

– بۆ خاتری خوا بڵێن لە کوێی دونیادا وەها نەفامێکتان پێ شــــک دێ؟

کتوپڕ لەگەڵ خاتوونی خاوەنماڵدا نیگایان گیرایە یەکدی:

– تۆیش؟ یانی تۆیش پشتی ئەوت گرت؟ تۆی ژنەتیوی باسترمەفرۆش[1]یش دەستت لەگەڵ ئەم دەبەنگەدا تێکەڵە یانی؟ تۆی نەگبەت چۆن مۆڵەتت بە خۆت دا بڵێی سۆنیا دزیی کردووە؟ دەزانی تۆ چیی؟ قاچەمریشکێکی ئەڵمانیی پۆخڵەوات کە لە داوێنێکی فشیان ڕاکردووە! ئەی بەنەفرت بن! نەفرەت لە هەمووتان! سۆنیا لەو کاتەوەی هاتووە لەم ژوورە پێی نەناوەتە دەر و ڕاستەوخۆ لەلای تۆی بێشەرەفەوە هاتووەتە ئێرە و لەلای مندا دانیشتووە... بەڵێ، ڕاست هاتە ئێرە و لای ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچەوە دانیشت! وەرن بیپشکنن! لەم ژوورە دووپێی نەناوەتە دەر، کەواتە دەبێ هێشتا پارەکەی لەلا بێ! دەی بیپشکنن، ئادەی بیپشکنە! وەلێ گەر ئەو سەد ڕۆبڵییە پیسەتت نەدۆزییەوە، وا دەکەم باجی یەک بە یەکی قسەکانت بدەی! دەچم و دەستەوداوێنی جەنابی بڵندپایە دەبم –خودی تزار، دەچمە لای خودی تزار– خۆم دەخەمە بەر پێی. هەر ئەمڕۆش دەڕۆم. هەر ئێستە! لەم دونیایەدا هیچ کەسێکم بۆ نەماوەتەوە! بێ کەسوکار کەوتووم! بە دڵنیاییەوە دەمکەنە ژوور! وا دەزانن ڕێگەم نادەن؟ هەڵە تێگەیشتووی، ڕێگەم دەدەن و چاکیش ڕێگەم دەدەن! پشتت بە چەوساوەیی و سەرکزیی سۆنیا قایم بوو، ئەرێ؟ گوێت نقەی لێوە نایێ! بەس وا نییە، ئەوە من لەجێی هەردووکمان بوێریم هەیە! نەیخۆی تاڵە! ها بیپشکنە، دەی بیپشکنە، بیپشکنە دەی!

کاترینا ئیڤانۆڤنا دەتگوت تووشی هەڵمەتی فێ بووە، توند لوژنی ڕاوەشاند و کێشی کردە لای سۆنیا.

---

١. قسەیەکی سووکایەتیئامێزی ڕوو لە ژنانی ئەڵمانیی ئەو سەردەمەی ڕووسیا، لەبەر ئەوەی زۆربەی دوکانە باسترمەفرۆشییەکان، ژنانی ئەڵمانی بەڕێوەیان دەبردن. «و. ف»

– من ئامادەم، دەیپشکنم و خاوەنی قسەی خۆشمم، هەرچی بوو لەسەر من... وەلێ هێور بنەوە خاتوون، هێور بن تکایە! بەڵێ، وا دەبینم ئێوە سەرکز نین و زۆریش بوێرن! باشە... باشە... وەلێ پشکنینی جەستەیی...

لوژن لەژێر لێوەوە درێژەی پێ دا:

– پشکنینی جەستەیی دەبێ لەبەردەم پۆلیسدا بێ... گەرچی ئێستەش شاهیدی زۆرمان هەیە... خۆ گوتم من ئامادەم... وەلێ دواجار پیاویان پیاو گوتووە و ژنیش ژن... پیاو شەرم دەکا... بەس گەر خاتوو لیپیڤیخزیل قۆڵی لێ هەڵماڵن... هەڵبەتە ئەمە ڕەوشی ئەم جۆرە کارانە نییە... دەی، ئێستە چۆن... لە کوێ...

کاترینا ئیڤانۆڤنا هاواری کرد:

– بە ئارەزووی خۆت کەسێ بێنە سۆنیا بپشکنێ! ئەسڵەن کێ حەز دەکا با بێتە پێش! سۆنیا، گیرفانەکانت هەڵڕژە ئادەی! ئەها، ئاوا! فەرموو، دێوی حەوتسەر، خۆت تەماشاکە! گیرفانی خاڵی بوو و هەر بە تەنیا دەسرەکەیەتی! ئەوەش گیرفانەکەی تری! ها، فەرموو، سەیرکە! خۆت سەیرکە دەی، سەیرکە!

کاترینا ئیڤانۆڤنا گیرفانەکانی سۆنیای خاڵی کردن. هەڵبەتە باشتر وایە بڵێین بەوپەڕی هێزییەوە هەوبەری گیرفانەکانیی ڕاکێشانە دەرێ، بە جۆرێک کە خەریک بوو بدڕێن. کتوپڕ کاغەزێکی چەندقەدکراو لە گیرفانی دەستەڕاستییەوە پەڕییە هەوا و کەوانەئاسا لار بووەوە و کەوتە بەرپێی لوژن. هەمووان ئەم دیمەنەیان بینی و هەندێکیشیان قیژەیەکی گاڵتەجاڕانەیان کرد. لوژن داچەمی، بە دوو پەنجە کاغەزەکەی هەڵگرتەوە و بە جۆرێک ڕایگرت کە هەمووان بتوانن بیبینن و دواجار کردییەوە. ئەسکەناسێکی سەدڕۆبڵی هەشتقەدکراو

بوو. لوژن ئەسـکەناسـەکەی بە بەرچاوی هەمووواندا گێڕا تا چاک ببینن.

– ئەی بەدزیی بێشەرم! بڕۆ لە دەرەوە! ون بە لە ماڵی من دەرەوە! بانگ بکەن پۆلیس، پۆلیس!

خاوەنماڵ دەنگی هەڵبڕیبوو و یەکبەخۆی دەیقیڕاند.

– ئەمانە دەبێ نارد بۆ سیبیریا! ون بە دەرەوە!

لە هەرچوارلاوە ژاوەژاو و واوەیلا بەرز بووەوە.

ڕاسـکۆڵنیکۆف وسـکت بوو و چاوی لە سـۆنیا کلا نەدەکرد، تەنیا جاروبار لەژێر چاوەوە نیگایەکی خێرای دەگرتە لوژن. بەڵام سـۆنیا بێجووڵە وشـک بووبوو و دەتگوت کاس بووە و تەنانەت نەیدەتوانی سـەرسـامیی خۆیشـی دەرببڕێت. کتوپڕ خوێن پەڕییە ڕووخسـاری، ناڵەیەکی کرد و ڕووخساری لەنێو دەستەکانیدا شاردەوە:

– نا، من نەبووم! من هیچ پارەیەکم نەبردووە! نازانم لە گیرفانی مندا چی دەکا!

شـیوەنە ڕۆحهەژێنەکەی دڵی هەمووانی خاشـخاش کرد. ڕایکردە لای کاترینا ئیڤانۆڤنا و ئەویش هێندە توند باوەشـی پێدا کرد وەک ئەوەی بیەوێت لە دەستی مرۆڤایەتیی بیپارێزێت.

– سۆنیا! سۆنیالە! من هەر باوەڕ ناکەم... باوەڕ ناکەم!...

کاترینا ئیڤانۆڤنا بێ ئەوەی حسـێب بۆ بوودەڵەکە و ئەو بەڵگە و ڕاسـتییە بکات کە بە ڕووالەت تۆزقاڵێک نکۆڵیی لێ نەدەکرا، هاواری دەکرد و سـۆنیای وەک کۆرپەلەیەک لە باوەشـیدا دەلاواندەوە و بە درێژایی ئەو ماوەیەش دەموچاویی ماچ دەکرد. پاشـانیش دەسـتەکانی کچەی خستنە مشتییەوە و هەردووکی ماچ کردن.

– تۆ پارەی کەسێک ببەی؟ خوایە، ئەمانە چەندە دەبەنگن!

ئێستە ڕوو لە هەمووان هاواری دەکرد:

– ئێوەی نەفام نازانن کە دڵی ئەم کچە لە زێڕە! پارەی کەسێ خێت بکا؟ ئاخر ئەو؟ گەر هەر کامێکتان بۆ یارمەتیی دابمابان، درێغیی نەدەکرد و کراسەکەی بەریی دەفرۆشت تا یارمەتیتان بدا! ئامادەیە خۆی پێخواس بێ، وەلێ دەستی ئەوانە بگرێ کە داماون! مرۆڤێکی ئاوایە! مۆڵەتنامەی زەردیشی بۆ ئەوە وەرگرت تا منداڵەکانی من بە برسییەتی سەر نەنێنەوە! خۆی لەبەر خاتری ئێمە و منداڵەکان فرۆشت... ئاخ ئەی پیاوە ڕۆیشتووەکەم! ئازیزە لەکیسچووەکەم! دەبینی؟ خۆ هەموو شتێ دەبینی؟ ئەوەش ڕێوڕەسمی پرسەکەت! ئەی بۆچی هەمووتان لاڵ بوون؟ بۆچی پشتگیریی لێ ناکەن؟ ئێوەی ترسنۆک، هیچکامتان حەدی نییە ببێتە خاکی بەرپێی ئەم کچە! خوایە، هەر خۆت بێ بە هانامانەوە!

وا دیار بوو شینوشەپۆڕەی ئەو بێوەژنە سیلاوییە نائومێد و بێدالدەیە کاریگەرییەکی قووڵی خستووەتە سەر بیسەرانی. ڕووخساری هەراسان و مەینەتکێشاوی بەو لێوە قاژقاژە خوێناویانەیەوە، دەنگی بریندارێ گیراوی، فرمێسکە جڵەوبەربووە منداڵانەکانی و شیوەن و لالانەوەی لێوڕێژ لە متمانەیەکی زارۆکانەی کە بێهیواییش تێیدا شەپۆلانی بوو، هەتا بڵێیت دڵسووتێن بوو. وا دیار بوو هەمووان بەداخەوەن بۆ ئەو بارودۆخەی. لانیکەم لوژن دەستبەجێ دڵی پێی سووتا و بە دەنگێکی خەمگینەوە گوتی:

– خاتوونی هێژا، خاتوونی ڕێزدار! خۆ ئەم ڕووداوە پەیوەندیی بە ئێوەوە نییە!

شێوازی قسەکردنی زۆر سەنگین و کاریگەر بوو.

– قەرار نییە هیچ کەسێ بێشەرمیی وا بنوێنێ و خوانەخواستە بڵێ ئێوە بە جۆرێ لە جۆرەکان دەســـتتان لەپشـــت ئەم کارەوە هەبووە، بەتایبەت لەبەر ئەوەی ئێســـتە خۆتان گیرفانەکانیتان خاڵی کردنەوە. هەر ئەمە نیشـــانی دەدا جەنابی هێژاتان لە بابەتەکە بێئاگا بوونە. من ئامادەم، گەر بزانم ســـۆنیا خان لەبەر هەژاری و ناچاری کاری وای کردووە، گەورەیی بنوێنم! وەلێ کچە خاتوون، بۆچی نەتانویست دانی پێدا بنێن؟ لە چی دەترسـان؟ لە حەیاچوون؟ یەکەمین جارتان بوو؟ وا بزانم شـــپرزەش بوون، وایە؟ بەڵێ، دەکرێ دەرکی پێ بکەین... وەلێ ئاخر بۆچی گەیاندتانە ئێرە!

لوژن ڕووو لە ئامادەبووان درێژەی پێ دا:

– بەڕێزان! زۆر دڵم بەمانە دەســووتێ و هەســـت دەکەم کەســی خۆمن. لەبەر ئەوەش ئامادەم ســەرەڕای ئەو ســووکایەتی و هێرشـەی کراوەتە سەرم، چاو لە گوناحەکانیان بپۆشم!

ئێستە ڕووی دەمی لە سۆنیا بوو:

– دەبێ ئەم شـــوورەییە ببێتە وانەیەک بۆ ئێوە، خانمخاس! منیش لەسەر بابەتەکە ناڕۆم و هەر لێرە سەری دەنێمەوە!

لوژن لەژێر چاوەوە ســەیرێکی ڕاســکۆلنیکۆفی کرد؛ نیگایان گیرایە یەک و ئاگری نیگای ڕاســکۆلنیکۆف دەیویســت دەســتبەجێ ئەو بکاتە خۆڵەمێش. بەڵام کاترینا ئیڤانۆڤنا دەتگوت لەم نێوەندەدا هیچ نابینێ و نابیســتێ، تەنیا دێوانەئاســا ســەر و ڕووی ســۆنیای ماچ دەکرد و لە باوەشــیدا دەیگوشـــی. منداڵەکانیش لە هەموو لایەکەوە باوەشــیان بە ســـۆنیـادا کردبوو. پۆلینکـا کە ڕێـک نەیـدەزانی چی بە چییە و لە فرمێســـکدا گەوزابوو، بەژنی نـازداری لەتـاو هەنســـکی گریـانـدا هەڵدەلەرزی و دەموچاوە بچووکە جوان و لەبەر گریان ئاوسـاوەکەی لە چاڵی شانی سۆنیادا شاردەوە.

کتوپڕ لە ئاستانەی دەرگەکەوە هاوارێک بەرز بووەوە:

– ئاخر سووکیش بە تام!

لوژن بەرەو دەنگەکە سووڕا.

– چ سووکییەک!

لیبیزیاتنیکۆف لە بەردەرگەکەدا قسەکەی دووبارە کردەوە و ڕاستەوخۆ چاوی بڕیبووە لوژن.

لوژن خراپ ڕاچەنی و هەموانیش ڕاچەنینەکەیان بینی و پاشان بیریان هاتەوە. لیبیزیاتنیکۆف هەنگاوی نایە ژوورەکەوە و بەرەو لای ئەو چوو:

– وێراتان منیش بکەنە شایەتی مەسەلەکە، ها؟

لوژن کەوتە تەتەڵەکردن:

– مەبەستتان چییە، جەنابی لیبیزیاتنیکۆف؟ باسی چی دەکەن؟

– مەبەستم ئەوەیە کە ئێوە... ئێوە بوختانتان کرد! مەبەستی قسەکانی من ئەمەیە!

لیبیزیاتنیکۆف بە هەڵچوونەوە وەڵامی دایەوە و بەو چاوە کزانەیەوە نەیارانە لە لوژن ورد بووەوە. هەتا بڵێیت تووڕە بوو. ڕاسکۆڵنیکۆفیش هەموو هەست و هۆشی خۆی دابووە ئەو و دەتگوت هەر وشەیەک کە لە دەمییەوە دێتە دەر، دەیڕفێنێ و سەنگوسووکی دەکات. هەمدیسان بێدەنگی باڵی کێشایەوە. لوژن بۆ یەکەمین جار زمان شکابووە دەمی.

– باشە گەر مەبەستتان منە... کێشە چییە؟ نەکا ئەقڵتان لەدەست دابێ؟

لەو کاتەش کە دەبوو قسە بکات، زمانی کەوتەوە گۆ.

– هەســـــت و هۆشـــــی من لەســــەر خۆیەتی! وەلێ ئێوە... زۆر تەڵەکەچین بەڕێز! باوەڕ ناکەم، ئای لەو سـووکییە! هەر لە ســەرەتاوە هەموو شــتێکم بە گوێی خۆم بیســت، وەلێ دەســـئەنقەســت دانم بە خۆمدا گرت تا ســـەر لە هەموو بابەتەکە دەربکەم... باشــە ئێوە بۆچی ئەم پیلانەتان گێڕا؟ من سەرم سووڕماوە!

– کامە پیلان؟ یانی چی بەدوای چییەوەم؟ واز بێنن بەڕێز ئەلەم مەتەڵە گەمژانانەتان! نەکا زۆرتان خواردبێتەوە و سەرخۆش بن؟

– ڕەنگە ئێوە خووتان بە خواردنەوەوە گرتبێ، بوودەڵەی ســووک، وەلێ من نا! بۆ خۆم بنەماگەلێکم هەیە و دەم لە ڤۆدکا نادەم! باوەڕ دەکەن هەر ئەم بوودەڵەیە، بە دەســـــتی خۆی ســــەد ڕۆبڵەکەی دایە سۆنیا خاتوون؟ بە چاوی خۆم بینیم و *شـایەتی* هەموو شتێ بووم. بەڵێ، ئامادەشـــم بە شـێوەیەکی فەرمی ســـوێند بخۆم! خۆی پارەکەی دایە سۆنیا خاتوون، خودی خۆی!

لیبیزیاتنیکۆف ڕوو لە ئامادەبووان دووبارە و ســێبارە قســـەکەیی گوتەوە.

لوژن هاواری کرد:

– وا دیــارە ئێوە شـــێت بوونە، کــاکی بەڕێز؟ کچۆڵەکە لێرەدا ڕاوەستاوە و خۆی هەر ئێستە لەبەردەم هەمووان‌دا گوتی من تەنیا دە ڕۆبڵم پێ داوە! کەواتە لە خۆڕا وڕەوڕی چیتە کە گوایە من ســـــەد ڕۆبڵم پێ داوە؟

لیبیزیاتنیکۆف کۆڵی نەدا:

– خۆم بینیم، ئەبەم چاوانەم بینیم! ڕاستە پێچەوانەی بنەماکانیشمە، وەلێ ئامادەم هەر ئێســـــتە لە دادگەدا بە هەرچییەک بتانەوێ ســــوێند

بخۆم، چونکە خۆم بینیم کە چۆن بە دزییەوە سەد ڕۆبڵەکەتان خزاندە گیرفانییەوە! هێندە نەفام بووم وام زانی لە چاکەخوازیان نیازی پارمەتیدانتان هەیە! کاتێ لە بەردەرگەکەدا خەریک بوون ڕاییتان دەکرد و تۆقەتان لەگەڵ دەکرد، بە دەستەکەی دیکەتان بە دزییەوە گەلاکەتان خزاندە گیرفانییەوە. من بینیم! خۆم بینیم!

ڕەنگ بە ڕووی لوژنەوە پەڕی:

– باشە بۆچی درۆ دەکەن؟

جا ڕووهەڵماڵراوانە قیڕاندی:

– باشە ئێوەیەک کە لکابوون بە پەنجەرەکەوە، چۆن لەوێڕا گەلاکەتان بینی؟ دەبێ خەونتان دیبێ... بەو چاوە کوێرانەتانەوە. وڕێنەی چیتانە!

– نەخێر، خەونم نەدی، هەتا بڵێی هۆشیاریش بووم! ئەرێ، لە ئێوەوە دوور بووم کە لەبەردەم دەرگەکەدا ڕاوەستابوون، وەلێ چاک هەموو شتێکم بینی. لە بەرپەنجەرەوە دژوارە مرۆڤ سەدڕۆبلی بناسێتەوە، نەفرەت لەوەی نکۆڵیی لێ دەکا! وەلێ من لەبەر هۆکاری ئێجگار تایبەت، بەبێ بینینیش هەر دەمزانی سەدڕۆبڵییە، چونکە هەر لەو ساتەدا کە دەتانویست دە ڕۆبڵییەکە بدەنە سۆنیا خاتوون، لە نزیک مێزەکەوە بووم و بینیم یەکێ لە سەدڕۆبڵییەکانیشتان هەڵگرت. هاوکاتیش بیرێکم بە زەیندا هات و هەر لەبەر ئەوەش بوو کە بابەتی سەدڕۆبڵییەکم بیر ما. چەندقەدتان کرد و بە درێژایی ئەو ماوەیە توند لە مشتتاندا گرتبووتان. بەهۆی شتگەلێکی ترەوە هۆشم شپرزە بوو و تا ئەوەی کە خەریک بوون هەڵدەستانەوە، لە دەستە ڕاستتانەوە داتانە دەستە چەپ و خەریک بوو بیخەنە خوار! هەمدیسان هەمان بیرکردنەوەم بە مێشکدا هاتەوە و گوتم ڕەنگە لەبەر ئەوە بێ تا لە بەرچاوی مندا گەورەی نەکەن کە پارەیان دەدەنێ. ئیتر خۆتان بیهێننە

بەرچاوتان کە چەندە دڵخۆشـــانە لێتانم دەڕوانی و بینیم توانیتان بە دزییەوە پارەکە بخزێننە گیرفانییەوە. بینیم، خۆم بینیم! پێویســـت بکا سوێندیش دەخۆم!

کتوپڕ لیبیزیـاتنیکۆف دەنگی گیرا. لە هەموو لایەکەوە بووە هەڵاوهوریا. زۆربەیان سـەرسـامیی خۆیان دەردەبڕی، وەلێ شـێوەی قسـەکردنی هەندێکیشـیان هەڕەشـەئامێز دیار بوو. میوانەکان دەوری لوژنیان دا و ئەڵقەکەیان سـاتبەسـات بچووکتر دەبووەوە. کاترینا ئیڤانۆڤنا بەرەو لای لیبیزیاتنیکۆف باڵی گرت:

– ئـاخ، جەنـابی لیبیزیـاتنیکۆف! بە نـاخێری گیـانم چـاک ئێوەم نەناسـیبوو و تووشـی چ هەڵەیەک بووبووم! توخوا نەجاتی دەن! هیچ کەسێکی تری نییە ئەم کچە، هەتیوە! خوا ئێوەی بۆ ناردووین! جەنابی لیبیزیاتنیکۆفی ئازیز!

کاترینا ئیڤانۆڤنا کە هۆشـی بەسـەر خۆیەوە نەمابوو و نەیدەزانی خەریکی چییە، لەبەردەم لیبیزیاتنیکۆفدا کەوتە سەر ئەژنۆ.

لوژن لە تووڕەیاندا گڕی گرتبوو، نەڕاندی:

– ئای لەو هەڵیتوپەڵیتە! یانی کە *هاوکات بیرێکم بە زەیندا هات، دەزانم کە سـەرڕۆبلی بوو، خۆم تێکەیشـتم*... ئاخر ئەم قسـە قۆڕانە چین؟ یانی جەنابی پایەبڵندتان دەڵێن کە من دەسـتەنقەسـت چوومە بەردەرگەکە و بە دزییەوە پارەم نایە گیرفانی ئەم کچەوە؟ باشـە لەپێناو چی؟ لەم کارەدا چ ئامانجێکم هەبوو؟ ئاخر چ پەیوەندییەک لەنێوان من و ئەمانەدا هەیە تا بمەوێ...

– ئەوەی ڕاسـتی بێ لەوەدا خۆشـم تیا ماوم! وەلێ هەرچیم گوت حەقیقەتی ڕووت و نکۆڵیلێنەکراو بوو! ڕێی تێنـاچێ هەڵەم کردبێ، بوودەڵەی پیس و چەپەڵ! چاکیش بیرمە کاتێ خەریک بووم دەستتانم دەگوشـی و سـوپاسـم دەکردن، چیم بە زەیندا هات. هەر لەو سـاتەدا

حەزم دەکرد بزانم چی وای کرد ئەو پـارەیە بە دزییەوە بخەنە گیرفانییەوە. ئاخر بۆچی بە دزییەوە؟ دەتانویســت من نەیبینم؟ چونکە واتان بیر دەکردەوە کە من هاوکاریکردنی تایبەتیی ئەوانی تر پەسەند ناکەم و بە بۆچوونی من هیچ کێشـــەیەک چارە ناکا؟ هەرچۆنێ بووە من وای بۆ چووم کە ئێوە شەرم دەکەن لە بەخشینی ئەو برە پارەیە. بیرم لەوەش کردەوە کە لوژنی ئێمە دەیەوێ دواتر ســـۆنیا خاتوون ســەد ڕۆبڵ لە گیرفانیدا بدۆزێتەوە و شـاگەشـکە بێ! (کەسـانێ هەن حەز دەکەن بەم جۆرە کارە خێرەکانیان نیشـــان بدەن) ئەگەرێکی تریشیان ئەوە بوو تا بزانن ئایا دوای ئەوەی کە پارەکەیان دۆزییەوە، دێ ســـوپاســـتان بکا یان نا. بە کورتییەکەی لەبەرخۆوە بیرگەلێکی تریشم کردنەوە و گوتم لەوانەیە بتانەوێ تا دەکرێ خۆتان لە ستایش و تاریفی ئەوانی تر بدزنەوە و، یان وەک لەم جۆرە هەلومەرجانەدا دەڵێن، دەســـتی ڕاســـتت بە دەســـتەچەپت نەزانێ![1] من وام بیر دەکردەوە... ئەوەندە بیر و خەیاڵی جۆراوجۆرم بە ســـەردا هاتن کە بڕیارم دا جارێ لێی گەڕێم بۆ دوایی و لە کاتی خۆیدا چاروبڕی بکەم و نەمویســـت بزانن کە من بە نهێنییەکەم زانیون! وەلێ دواتر خەمی ئەوەم لێ نیشـت کە نەکا خاتوو سـۆنیا نەدی و نەزان پارەکە ون بکا یان فڕێی بدا. هەر لەبەر ئەوە بوو کە هاتمە دەر تا بانگی بکەم و بە نهێنی پێی بڵێم کە تۆ سـەد ڕۆبڵت خسـتە گیرفانییەوە! بەس سـەرەتا چوومە مـاڵی خـاتوو *کـابیلیاتنیکۆف* تـا *پەیـامی گشـــتیی ڕۆشـــنی ئەقلانییان*[2] پێ بگەیەنم و، بەتایبەتی، ڕایانســـپێرم گوتاری *پیدریت* بخوێننەوە و بێگومـان وتـاری *ڤاگنەر*یش. دوای ئەوە بوو کە هـاتمە

---

١. ئاماژەیە بە *ئینجیلی مەتا: تۆ دەبێ بە جۆرێک خێر بکەیت، دەســـتەچەپت بەوە نەزانێ کە دەستەڕاستت دەیکات.* «و. ف»

١. کۆمەڵێک گوتار بە وەرگێڕان و ڕاســـتکردنەوەی ن. *نیخلۆداف* لە فەرەنســـی و ئەڵمانییەوە کە لە ساڵی ١٨٦٦دا لە پیتەربورگ چاک کرا. «و. ف»

ئێرە و سەیرم کرد چ حەشریکتان ناوەتەوە! ئێستە خۆتان بڵێن، چۆن دەکرێ خۆم تووشی ئەم هەموو بیر و خەیاڵ و نیگەرانییە بکەم، گەر بە چاوی خۆم نەمدیبێ کە ئێوە سەدرۆبڵییەکتان خستووەتە گیرفانییەوە؟

لیبیزیاتنیکۆف دواجار بەم ئەنجامگیرییە پتەوە گەیشتە کۆتایی مەنتیقی ئاگرین و ئیدی لە قسە کەوت. دەموچاوی ئارەقەی دەدەڵاند. بەڵام سەد حەیف کە نەیدەتوانی تەنانەت بە رووسیش تێروتەسەل بابەتەکە دەرببڕێت (گەرچی بێ لە رووسی هیچ زمانێکی دیکەشی نەدەزانی) و هەر لەبەر ئەوە بوو کە لە گۆ کەوت و دوای ئەو بەرگرییە پاڵەوانانەیە تەنانەت بە جۆرێک زیاتر لە جارانیش داماو دەهاتە بەرچاو. وەلێ مەنتیقەکەی کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر بیسەرانی هەبوو. بە وەها گوڕوتین و بڕوایەکەوە قسەی کردبوو کە هەمووان باوەڕیان پێ کردبوو. لوژن کە زۆر باش تێگەیشتبوو دۆخەکە شڕە، هاواری کرد:

– بە من چی کە ئەم جۆرە بیرکردنەوە گەمژانانە بە کەللەی پووچی ئێوەدا هاتوون! ئەمە چ جۆرە بەڵگەیەکە. کێ چووزانێ، بۆی هەیە تووشی خەیاڵات بووبن! بابەتەکە روونە بەڕێز گیان، ئێوە خەریکن بە رۆژی رۆشن درۆ هەڵدەبەستن! قسەکانتان هەمووی درۆ و بوختانە، تەنیا لەبەر ئەوەشە کە لە منی داماو کەوتوون بە رقدا! خۆم چاک دەمزانی بۆچی رقتان لە من کەوتووە، لەبەر ئەوەیە کە ئەو بیروباوەڕە کۆمەڵایەتییە وەک خۆتان دەڵێن ئازادفکر و کفرئامێزانەتان ئەقڵی من نەیبڕین و ناشیانبڕێ!

بەڵام ئەم بەرگریکردنە هیچ یارمەتییەکی ئەو دۆخە نالەبارەی لوژنی نەدا و ژاوەژاوی ناڕەزایەتی و ناکۆکی لە هەر چوار لاوە بەرز بووەوە.

لیبیزیاتنیکۆف هاواری کرد:

– ســەیرە، یانی ئێســتە دەتەوێ بەم شــتانە پاکانە بۆ خۆت بکەی! هەی درۆزن! پۆلیس ئاگادار بکەنەوە، دەمەوێ هەر ئێســتە شــایەتیی فەرمی بدەم. تەنیا لە شــتێ تێناگەم، ئەوەی کە بۆچی دەبێ بوودەڵەی وا کارێکی ئەوەندە چەپەڵانە بکا! ئەی نارەسەنی خوێڕی!

ڕاســـکۆلنیکۆف هاتە پێش و دواجار یەکلاکەرەوە و جددی تێکەڵی باسەکە بوو:

– من دەتوانم بڵێم بۆچی وەها ڕیســـکێکی کردووە و ئەگەریش پێویست بکات ئامادەم سوێند بخۆم.

ئەرخەیان و پشـــوودرێژ دەهاتە بەرچاو؛ باری ســـەیرکردن و ڕووخســـاری هیچ گومانێکی لەو بارەیەوە نەدەهێشـــتەوە کە ئەو وەڵامەکە دەزانێ و بڕیارە زۆر زوو مەتەڵەکە هەڵبهێندرێت.

ڕاسکۆلنیکۆف ڕووی کردە لیبیزیاتنیکۆف:

– ئێســـتە ئیتر لە ورد و درشـــتی بابەتەکە تێگەیشـــتم. هەر لە سەرەتای سەرەتاشەوە سۆسەم دەکرد کە کارەکەی فڕوفێڵێکی تێدایە. هەڵبەتە هەر لە بنەڕەتەوە بە لەبەرچاوگرتنی ئەو پێشینەیەی کە تەنیا من ئاگاداری بووم لێی کەوتمە گومانەوە و هەر ئێســـتەش ڕوونی دەکەمەوە با هەمووتان ئاگاداری بن، چونکە کلیلی هەڵهێنانی مەتەڵەکە ئەمەیە! بە شـــایەتیدانی بێڕادە بەبەهای ئێوە، جەنابی لیبیزیاتنیکۆف، دواجار هەموو شـــتێکم وەک ڕۆژ بۆ ڕۆشـــن بووەوە. تکا دەکەم هەمووتان چاک گوێ بگرن! ئەم جەنابی پایەبەرزە (ئاماژەی بۆ لوژن کرد) بەم نزیکانە لەگەڵ خاتوونە کچێکی گەنجدا بووبوونە دەزگیراندار و بەڵێنی زەماوەند و ئەم شـــتانەی دابوو و ئەو کچەش هیچ کەســـی نییە بێ لە خوشکی من، دونیا. وەلێ هەر لەگەڵ هاتنە پیتەربورگدا کە

پێزێ بوو و لە یەکەمین بەرکەوتنماندا لەگەڵ من بووە شـەڕی، منیش لە ژوورەکەمدا دەرم کرد و دوو شایەتیشم هەیە و دەتوانم بیسەلمێنم کە ڕاسـت دەکەم. کەسـێکی چەپەڵە ئەم کابرایە. ئەوەی ڕاسـتی بێ، پێزێ هەر ئاگاداریش نەبووم کە لێرە نیشتەجێ بووە و نەمدەزانی کە هەر هەمان ڕۆژی شـــەڕەکەمان، یانی پێزێ، منی لێرە دیوە کە بۆ ڕێوڕەسـمی بەخاکسـاپردن بڕێک پارەم داوەتە کاترینا ئیڤانۆڤنا، ئاخر بە ناخێری گیانم من هـاوڕێی مـارمیلادۆڤی خوالێخۆشـــبوو بووم! کەچی ئەمیش هەلەکە دەقۆزێتەوە و دەسـتبەجێ یادداشـتێک بۆ دایکم دەنووسێ کە من هەرچی پارەم هەبووە داومەتە سۆنیا خاتوون نەک کاترینا ئیڤانۆڤنا! هەر لەو یادداشتەدا ئاماژەیەکی نەشیاو و قێزەون بە کەســـایەتیی خاتوو ســـۆنیا دەکا و، چۆن بیلێم، وەک ئەوەی کە من چـاوم بڕیبێتە ئەوان. بێگومـان خۆشـــتـان دەزانن بۆچی. هەموو ئامانجەکەشی ئەوە بووە کە گێچەڵ بنێتەوە و دایک و خوشکم لەدژی من دنە بدا. دەیویسـت ئەوان لەوە تووشـــی دڵپیســـی ببن کە من وا خەریکم هەموو ئەو پارەیەی کە ئەوان بە دەردیسەری بۆیان ناردبووم و هەموو بوون و نەبوویان بوو، لە داوێنپیسی و خوێڕییەتیدا خەرجی دەکەم! دوێنێ عەســـر لەبەردەم دایک و خوشـــکمدا بە ئامادەبوونی خودی ڕێزدار لوژن گوتم من پـارەکەم بەبۆنەی ڕێوڕەســـمی بەخاکســـپاردنەوە داوەتە کاترینا ئیڤانۆڤنا نەک ســـۆنیا خاتوون! هەروەها، گوتم من پێشـــتر ســـۆنیا خاتوونم نەناســـیوە و تەنانەت تا کاتژمێرێک لەوەوبەر هەر نەشـمدیبوو و، ئەوەی کە، لوژن سـەرەڕای ئەو هەموو خۆبەزلزانی و خراپەگوتنەی سۆنیاش، لە خاکی بەرپێشی کەمترە. لوژن پرســـیی ئایا من ئـامـادەم ســـۆنیا لەتەک دایک و خوشـــکمەوە دابنیشـــێنم و منیش وەڵامم دایەوە کە بەڵێ! جەنابیان بێئاگان لەوەی کە هەر ئەو بەیانییە لەتەک یەکترییەوە دامنیشـاندوون! زۆر لەوە بە ڕقدا کەوت کە دایک و خوشـــکم بەو فـاتوفیتەی ئەو لەگەڵمدا نەیانکردە شـەڕ و بەرەبەرە دەسـتی کردە سووکایەتیکردن و

بێشـــەرمیکردن بەرانبەر بە ئەوان کە لەبەر ئەمانە هیچ کاتێک لێی نابوورم! دواجار مەسەلەی دەزگیرانییەکە هەڵوەشایەوە و خوشکم لە ماڵ وەدەری نا. هەموو ئەم بەسەرهاتە دوێنێ ئێوارە ڕووی دا. ئێستە تکا دەکەم زۆر چاک ســـەرنج بدەن: گەر ئێســـتە پیلانەکەی ســـەری بگرتبا و بیســـەلماندبا ســـۆنیا دەســـتی پیســـە، دەیتوانی بۆ دایک و خوشـــکمی بســـەلمێنێ کە تۆمەتەکانی لەخۆوە نەبوونە و هەقی خۆی بووە لەوە توورە بێ کە بۆچی من ئەوم لەتەک دایک و خوشـــکمەوە دانیشاندووە! جا وایان لێ بکا ئەوە پەسەند بکەن کە ئەگەر لەگەڵ من بەشـەڕ هاتووە، تەنیا لەبەر پاراسـتنی حورمەت و ئاوڕووی خوشـکم بووە! بۆی هەبوو گەر ئەمڕۆ سەر بکەوتبا، بیتوانیبا من لە خێزانەکەم دابڕێ و هیچ گومـانێکیش لەوەدا نییە کە خواخوایەتی بتوانێ ســـەرلەنوێ ســـەرنجی ئەوان بەلای خۆیدا ڕابکێشـــێتەوە و پێگەکەی جارانی بەدەسـت بهێنێتەوە، جا باسـی مەبەسـتە چەپەڵەکەی ناکەم بۆ تۆڵەکردنەوەی کەســـیی لە من. هەڵبەتە هۆکارگەلێکی هەن بۆ خۆی و چاک دەزانێ کە ئاوڕوو و ئارامیی سۆنیا خاتوون زۆر گرنگە بۆ من. بە کورتییەکەی بەدوای ئەم شـــتانەوە بووە ئەو! من ئـاوا بـابەتەکە دەبینم! وەڵامی مەتەڵەکە هەر ئەوەیە کە گوتم و بێ لەمە هیچی تر نییە!

ڕاسـکۆڵنیکۆف بەم ڕسـتانە کۆتایی بە قسـەکانی هێنا. هەمووان بە وردی تا کۆتا گوێیان بۆ قسەکانی گرت، هەڵبەتە بیسەرەکانی جاروبار دەنگی ســـــەرســـــامی و توورەییـــان لێ بەرز دەبووەوە. بەڵام ڕاســـکۆڵنیکۆف وێڕای ئەو ژاوەژاوەش هەر بە هێمنی و ڕوونی قســـەکانیی کردن و زۆریش ورد و پتەو. دەنگی لێبڕاو و شـــێوازی قســـەکردنی پڕبڕوا و بێخەوش و ڕووخســـاری وشـــک و جددیی کاریگەرییەکی قووڵی خستە سەر یەک بە یەکی ئامادەبووان.

لیبیزیاتنیکۆڤ بەوپەڕی خرۆشــــەوە پشــــتگیریی لە قســــەکانی ڕاسکۆلنیکۆف کرد:

– بەڵێ، بەڵێ دەی! هەر ئەوەیە! نـاشــــکرێ بە جۆرێکی دی بێ، چونکە بیرمە ئەو بوودەڵە کەموکورتە لەگەڵ هاتنەژوورەوەی ســـۆنیا خاتووندا، لێمی پرســـــی ئێوە هاتوون یان نا. یانی دەیویســـــت بزانێ ئێوەم لەنێو میوانەکـانی کـاترینـا ئیڤانۆڤنادا دیوە یـان نـا. هەر واش نەیپرســـــی ها، بانگی کردمە بەرپەنجەرەکە تا بە هێواشـــــی ئەمەم لێ بپرســـــێ! دیارە بۆ ئەوەی پیلانەکەی جێبەجێ ببێ، پێویســــــت بووە ئێوەشی لێ بێ! کەواتە ئەمەیە! ئاشکرا بوو!

لوژن نقەی لێوە نەهات و تەنیا بزەیەکی ســــووکایەتیئامێزی هاتێ. بەس ڕەنگی بە ڕووەوە نەمابوو و دەتگوت بیری تیا ماوە و بەدوای دۆزینەوەی ڕێگەیەکدا تەقەللایەتی تا خۆی لەو گێچەڵە ڕزگار بکات. ئامادە بوو بەوپەڕی خۆشـحاڵی و بەبێ دەنگوهەرا دەسـت لە هەموو پیلانەکانی بشـــــواتەوە، وەلێ لەو کاتەدا ئەمە نەکردە بوو، چونکە وا لێک دەدرایەوە کە ئامادەیە ئەو تۆمەتانە بەسەر خۆیدا ساغ بکاتەوە و جا دانیشـــی پێدا دەنێت کە بوختانی بۆ ســـۆنیا کردووە. لە لایەکەوە، ئامادەبووانیش کە دەمێک بوو گەرم بووبوون، ئێستە ئیدی هیچ شتێک بەری پێ نەدەگرتن و نەیاندەهێشـــت مەســـەلەکە هەر وا بە ســـادەیی کۆتـایی پێ بێت. پلەدارە خـانەنشــــینکراوەکە بە بـاشـــــی لە هەموو بەســـەرهاتەکە تێنەگەیشـتبوو، کەچی لە هەمووان بەرزتر دەینەڕاند و قســـــەگەلێکی ناخۆشـــــی لەبارەی بەگژداچوون و تەمبێکردنی لوژنەوە فڕێ دەدان. بەڵام هەموو ئـامـادەبووان ســــــەرخۆش و بەدمەســــــت نەبوون، کرێچیی ژوورەکانی دیکەش دەرکەوتبوون. ســـــێ پۆڵەندییە داماوەکەش بە شێوەیەکی تۆقێنەر هەڵچووبوون و یەکهەناسە بەسەر لوژندا دەیانقیڕاند و بە زمانی خۆیان هەڕەشـــەیان لێ دەکرد. ســـۆنیا گوێی شل کردبوو تا بە باشی قسەکان ببیستێت، کەچی هەر دەتگوت

چاک لە هەموو وردەکارییەکان تێناگات و وەک ئەو لەهۆشــچووانەی لێ هاتبوو کە تازە دێنەوە ســەر خۆیان. چاوی لە ڕاسـکۆلنیکۆف لا نەدەدا و هەسـتی دەکرد ئازادی و چارەنووسـی لە دەسـتی ئەودایە. کاترینا ئیڤانۆڤنا بە زۆر و فرە بە ئازارەوە هەناسـەی دەدا و بڕسـتی لێ بڕابوو. خاوەنماڵیش لەو نێوەندەدا بووبووە پەیکەری گەمژەیی، بە دەمی بەشـــکراوەوە وشـــک بووبوو و نەیدەتوانی لە کاکڵی بابەتەکە تێبگـات و چۆن گەیشـــتووەتە ئەمە؛ تەنیـا دەیبینی کە لوژن خراپ تێکەوتووە. ڕاســکۆلنیکۆف ویســتی هەمدیســـان شــتێک بڵێت، بەڵام ئەوانی دیکە دەرفەتیان نەدا و ئەڵقەکەی دەوری لوژنیان تەســـک و تەسکتر کردەوە. هەر بارانی جنێو و هەڕەشەوگوڕەشە بوو و بەسەر لوژندا دەباری. بەس خۆ جەنابی لوژن بییەک نەبوو بەم جۆرە بایانە بلەرزێت. کاتێک ڕووانیی پیلانی تۆمەتدانە پاڵ سۆنیا شکستی هێناوە، دەسـتپێشـخەریی کرد و بێشـەرم و ڕووداماڵراو دڕی بە ئاپۆڕاکە دادا و ڕێگەی بۆ خۆی کردەوە:

– ئادەی مۆڵەت بدەن، مۆڵەت بدەن، بەڕێزان، دەی بڕۆنە ئەولاوە! پاڵەپەســـتۆی چیتانە، بەڕێز؟ لاچۆ! ئەی هاوار! هەڕەشـــم لێ مەکەن! لەبەر خاتری خۆتانمە! دواتر ئەو قســـانە هەمووی بەســـەر خۆتاندا دەشکێنەوە کە بە زۆر و هەڕەشـە نەتانهێشـت دادپەروەری بچەسپێ! دز دەسـتی ئاشـکرا بووە و هەموو شـتێ وەک ڕۆژ ڕۆشـنە! ئێستەش مادام وای لێ هات، من ســـەری ئەم مەســـەلەیە نانێمەوە! خۆ دادگە کوێر و ســـەرخۆش نییە بێ و گوێ بە شـــایەتیی دوو ئاژاوەچی لەخوانەترســـی ناوزڕاو بدا کە ئامانجیان تۆڵەکردنەوەی کەســـییە و ئەوەندە گەمژەن، ســـوورن لەســـەر مەبەســـتی خۆیان! جا دەیبینین. ئێستە لێگەڕێن من بڕۆم!

– ئیتر لەو ژوورەمـدا نەتـانبینمەوە! تکـایە هەر ئێســـتە بڕۆن و هاوڕێیەتی و ئاشـــنایەتیمان هەر لێرەدا کۆتایی هات! ئاخ، کاتێ بیری

لێ دەکەمەوە کە دوو حەفتەی ڕەبەق چۆن جگەرخوێن بووم و چ ئارەقەیەکم ڕشت تا شتێکی تێبگەیەنم...

– مەیکەنە هەڵا، جەنابی لیبیزیاتنیکۆف! خۆم ئەمڕۆ پێتانم گوت کە لەسەر ڕۆیشتنم و ئەوە ئێوە بوون نەتانهێشت بڕۆم! ئێستەش تەنیا پێتان دەڵێم ئێوە لە گەمژەیەک بەولاوە هیچی دیکە نین. هیوادارم دەرمانێک بۆ ئەو مێشکە نەخۆش و چاوە کوێرەتان بدۆزنەوە! لێگەڕێن تێپەڕم دەی، بەڕێزان!

لوژن دواجار بەرەو دەرگەکە ڕێگەی کردەوە، بەڵام پلەدارە خانەنشینکراوەکە ئامادە نەبوو لێگەڕێ بابەتەکە بەم سانایییە ببڕێتەوە و نێچیرەکە هەر وا ئاسان لەدەستیان دەربچێت. پەرداخێکی لەسەر مێزەکە هەڵگرت و لە هەوادا بەسەر سەرییەوە خولاندییەوە و نیشانەی لە لوژن گرتەوە، کەچی پەرداخەکە بەر خاوەنماڵ کەوت. خاوەنماڵ قریشکاندی و پلەدارەکەش لەتاو هەوڵی بێڕادە بۆ نیشانەگرتنەوەیەکی ڕێک، هاوسەنگیی لەدەست دا و کەوتە ژێر مێزەکە. لوژن خۆی گەیاندە ژوورەکەی لیبیزیاتنیکۆف و نیو کاتژمێر دواتریش ئەو بینایەی جێ هێشت. سۆنیای بە سرووشت خۆشەویست پێشتریش ئەوەی بە بیردا هاتبوو کە زیاتر لە هەمووان لەبەردەم ئەگەری هەڕەشەی ئازار و بوختانی ئەوانی دیکەدایە و بەبێ ترس و بەوپەڕی پارێزراوییەوە دەتوانن سووکایەتی بەو بکەن، بەس تا ئەو ساتەش وای دەزانی دەتوانێت لەڕێی سەرکزی و نەرمونیانییەوە لەم جۆرە پێشهاتە کارەساتبارانە هەڵبێت. هەر لەبەر ئەوەش بوو زیاد لە ڕادە تێک شکابوو. هەڵبەتە دەیتوانی بە پشوودرێژی تەنانەت بەرگەی ئەم کارەساتەش بگرێت و نقەی لێوە نەیێت، بەڵام خولەکەکانی سەرەتا هەتا بڵێیت بۆ ئەو تاڵ و بەئازار بوون. سەرڕاستیی ئەو سەلمێندرا، وەلێ ئێستە کە ئەو تۆقین و تاسانە سەرەتاییە تێپەڕیبوو و دەیتوانی بە ڕوونی هەموو شتێک ببینێت و لێی حاڵی ببێت، هەستی

کەساسی و خەمناکییەکی تۆقێنەر دەستی بەسەر گیانیدا گرت و ئازار دڵیی گوشی. ئیدی بەرگەی ئەو کەشەی نەدەگرت. لەگەڵ ڕۆیشتنی لوژندا، لە ژوورەکە فڕکەی کردە دەرێ و بە ڕاکەڕاکە خۆی گەیاندەوە ژوورەکەی. خاتوونی خاوەنماڵیش کاتێک لە گەرمەی پێکەنینی ئامادەبوواندا پەرداخەکەی بەر کەوت، بە جۆرێک کەلەیی بوو کە بەدەم قیژاندنەوە وەک تۆپەڵە ئاگرێک بە گژ کاترینا ئیڤانۆڤنادا چوو، کە بە بۆچوونی ئەو، هۆکاری هەموو ئەو سەرئێشانە بوو:

– ونبە دەرێێێێێ! هەر ئێستە لە ماڵی من دەرێێێێێ!

کردبوویە هەراوزەنا و هەر شتێکی کاترینا ئیڤانۆڤناشی بە دەستەوە دەهات، بەسەر زەوییەکەدا پەرشوبڵاوی دەکردەوە. کاترینا ئیڤانۆڤنا کە ڕەنگپەڕیو و نیوەگیان لەتاو بێبڕستی کەوتبووە سەر تەختەکە و هەناسەی بۆ نەدەدرا، کتوپڕ لە جێگەکەی پڕتاوی کرد و هەڵمەتی بۆ برد. بەڵام ئەم شەڕە نابەرانبەر بوو و خاوەنماڵ وەک لاسکە کایەک فڕێی دایە لاوە.

کاترینا ئیڤانۆڤنای کڵۆڵ بەدەم فرمێسکڕشتن و هەناسەبڕکێوە شیوەنی بوو:

– خوایااا! ستەمی ئەو نارەسەنەمان بەس نەبوو، ئێستە ئەم دێوەش کەوتووەتە گیانمان! ئەمڕۆ مێردەکەمم ناشتووە و دەبێ ئەم قسانەش ببیستم و لە ماڵەکەشم وەدەرم نێ! ئەو دێوە نەگبەتە نمەکی کردووم و ئێستە خەریکە بەم چەند مناڵە هەتیوەوە فڕێم دەداتە سەر شەقام! خوایااا، ئێستە ڕوو لە کوێ کەم؟

چاوەکانی کاترینا ئیڤانۆڤنا لە یەک کاتدا فرمێسک و ئاگریان لێ دەباری و درێژەی بە شینەکەی دا:

– خوایاااا، ئەریّ لەســەر زەوییەکەت دادپەروەرییەک هەیە؟ ئەگەر پشــتوپەنای ئێمەی هەتیو نەبی، ئەی پشــتوپەنای کێی؟ جا دەبینین! یەک جـار واش نییە! بێگومـان لەســەر زەویی خوا یـاســا و دادپەروەرییەکی هەیە. دەزانم کە هەیە و دەیدۆزمەوە! جاریّ بوەستە... بوەســتە و ببینە، هەی ئاژەڵی خوانەناس! پۆلینکا، تۆ لەلای منالەکان بمێنەوە! من ئێســتە دەگەڕێمەوە. چاوەڕێم دەبن تـا دەگەڕێمەوە، تەنانەت گەر لە کۆلانیشـدا بیّ چاوەڕێم دەبن! جا دەبینین ئایا بەسـەر ئەم زەوییەوە ڕاستییەک هەیە یان نا؟

کاترینا ئیڤانۆڤنا هەمان ئەو شــاڵە ســەوزەی بە ســەریدا دا کە مـارمیلادۆڤ بۆ ڕاســکۆڵنیکۆفی بـاس کردبوو و بەنێو ئەو کۆمەڵە شپرزە و سەرخۆشەدا کە هێشتا نەچووبوونە دەریّ، ڕێگەی کردەوە و بەدەم شیوەن و فرمێسکڕشتنەوە ڕای کردە سەر شەقام، تا بەپێی مەبەســتە نـاڕوونەکەی خـۆی، لە هەر کـوێـیەک بـووە بەدوای دادپەروەریـدا بگەڕێـت و هەرچۆنێکیش بووە پێی بگـات. پۆلینکـا تۆقیوانە لەگەڵ خوشک و برا بچووکەکەیدا خزانە سووچێکی ژوورەکە و گرتنییە باوەش و سێقۆڵی بە سـەرتاپای لەرزۆکەوە لە چاوەڕوانیی دایکیاندا دانیشتن. خاوەنماڵ برووسکەئاسا بە ژوورەکەدا خولی دەدا. فەرتەنەیەکی نابوورەوە و دەیقیژاند و هاوکات هەرچییەکی بە دەستەوە دەهات، فڕێی دەدا و پەخشــی دەکرد. کرێچییەکان هێشــتا هەر وا قســەیان فڕیّ دەدا. هەندێک بەپێی ئەقڵی خۆیان بابەتەکەیان لێک دەدایەوە و ڕایان دەردەبڕی و چەند کەســێکیش بەرۆکی یەکدییان گرتبوو و جنێویان دەدا و بڕێکیش کەوتبوونە گۆرانیگوتن...

ڕاســکۆڵنیکۆف لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *ئیتر دەبیّ منیش بڕۆم! دەی، سۆنیا خاتوون، با بزانین ئێستە چی دەڵێ!*

جا بەرەو ماڵی سۆنیا کەوتە ڕێ.

## چوار

ڕاسکۆڵنیکۆف ویڕای ئەو ئازار و تۆقینە قووڵە، وەک پارێزەرێکی لێوەشاوە و زیرەک و هۆشیار لە دژی لوژن بەرگریی لە سۆنیا کردبوو. بەڵام ویڕای ئەو هەستە تایبەت و هەڵبەتە دڵییەی کە ئەوی ناچار کردبوو پشتی سۆنیا بگرێت، دوای ئەو نەهامەتییە سەیرەی بەیانیی ئەو ڕۆژە، ئەم گۆڕانی بارودۆخە بۆ ئەو خۆش بوو. لە لایەکەوە، کارێکی دیکەی دژواریشی لەبەردەمدا بوو و کە بیری لێ دەکردەوە سەراپای ترسی لێ دەنیشت: بڕیار بوو سۆنیا ببینێت و پێی بڵێت بکوژی لیزاڤێتا کێیە. پێشوەختە دەیتوانی سۆسەی بکات کە چ ئەشکەنجەیەک چاوەڕوانیەتی و لەبەر ئەوە بوو کە بە جۆرێک لە جۆرەکان تەنانەت خۆی لە بیرلێکردنەوەشی دەدزییەوە. لە کاتی هاتنەدەرەوە لە ماڵی کاترینا ئیڤانۆڤناشدا هەر وا بە خۆی دەگوت *دەی، سۆنیا خاتوون، با بزانم ئێستە چی دەڵێی!* هێشتا بەجۆشوخرۆش بوو و سەرمەست لە سەرکەوتن بەسەر لوژندا، ئامادەی بەگژداچوونەوەی هەموو دونیا بوو. وەلێ کە گەیشتە ماڵی سۆنیا کتوپڕ ترسی لێ نیشت و ئەژنۆی شل بوو. دڕدۆنگ لە بەردەرگەدا ڕاوەستا و پرسێکی سەیری بە بیردا هات: *باشە هەر دەبێ پێی بڵێم کە کێ لیزاڤێتای کوشتووە؟* هەر بە ڕاستیش پرسێکی سەیر بوو، چونکە هاوکات هەستی دەکرد نەک هەر بە تەنیا بێ لە گوتن چارەیەکی دیکەی نییە، بەڵکە لەوەش زیاتر ناتوانێ کارەکە دوا بخات. نەیدەزانی بۆچی ناتوانێت چیدی خۆی ڕابگرێت، تەنیا و تەنیا هەستی دەکرد ئیدی ناکرێت و ئەم دەرککردنە ئەشکەنجەدەرە

دەروونییەی لەبەرانبەر بابەتەکەدا، وەخت بوو تێکی بشـــکێنێت. بۆ ئەوەی لانیکەم زووتر کۆتایی بە دڕدۆنگی و ئەشـــکەنجەکەی بهێنێت، زۆر زوو دەرگەکەی کردەوە و هەر لە ئاســـتانەکەوە چاوی بڕییە سۆنیا. سۆنیا ئەنیشکەکانی خستبوونە سەر مێز و ڕووخساریی لەنێو لەپی دەستەکانیدا شاردبووەوە، وەلێ هەر کە چاوی بە ڕاسکۆلنیکۆف کەوت، دەمودەســـت لە جێگەکەی ڕاســـت بووەوە و بە جۆرێک هاتە پێشـــوازیی وەک ئەوەی چاوەڕێی بووبێت. لە ناوەڕاســـتی ژوورەکەدا پێک گەیشتن و بە پەلە ئەوی دایە بەر قسە:

– باشە گەر ئێوە نەبان چیم بەسەر دەهات؟

وا دیار بوو پڕ بە دڵ چاوەڕێی ئەم ســـاتەیە و گیانی دەرچووە بۆ ئەوەی ڕاسکۆلنیکۆف ببینێت و ئەمەی پێ بڵێت.

ڕاســـکۆلنیکۆف بەرەو مێزەکە چوو و لەســـەر هەمان ئەو کورســـییە دانیشت کە تا چەند ساتێک لەوەوبەر سۆنیای لەسەر دانیشتبوو. کچە دوو هەنگاو دوورتر لەبەردەمیدا ڕاوەســـــتا، جوولەکانی کتومت وەک هیکانی ڕۆژی ڕابردوو بوون.

– ئێ، سۆنیا؟...

ڕاسکۆلنیکۆف هەستی بە لەرزینی دەنگی دەکرد.

– مەسەلەکە هەمووی بەبۆنەی *دۆخی کۆمەلایەتی* و ئەو خووەوەیە کە *ئەم دۆخە لەگەل خۆیدا دەیهێنێ*. هەڵبەتە ئێتر خۆشـــت دەرکت پێ کردووە، وایە؟

دەموچاوی ســـۆنیا ئاوێنەی ئازار بوو. قســـەکەی ڕاســـکۆلنیکۆفی بڕی:

– تکاتان لێ دەکەم دەست بە قسەکانی دوێنێ مەکەنەوە! هەمدیسان ئەو شتانە مەڵێنەوە! بەم حاڵەشەوە خۆمان کەم چارەڕەش نیین!

جا دەستبەجێ زەردەخەنەیەکی بەدەم ڕاسکۆڵنیکۆفەوە کرد تا نەکا ڕەخنەکەی لە دڵ بگرێت.

– بێئەقڵیم کرد هاتمە دەر. تۆ بڵێی ئێستە لەوێ چی بگوزەرێ؟ ئێستە دەمویست بگەڕێمەوە لایان، وەلێ هەر بە خۆمم دەگوت ڕەنگە... ئێوە بێن.

ڕاسکۆڵنیکۆف باسی کرد کە چۆن خاوەنماڵ بە سووکایەتییەوە خەریک بوو ئەوانی وەدەر دەنا و کاترینا ئیڤانۆڤناش بەدوای دادپەروەری و ڕاستیدا چووە بۆ شوێنێکی نادیار.

سۆنیا هاواری کرد:

– وااای، خوایە گیان! دەی وەرن با زوو بڕۆین...

جا چنگی ڕاوەشاند و کۆڵوانەکەی هەڵگرت بۆ ئەوەی تا زووە بچن.

ڕاسکۆڵنیکۆف هەڵچوو:

– وا دیارە دایمە ئەم بەزمەیە! هەموو بیر و هۆشت هەر لای ئەوانە! تۆزێکیش لەگەڵ مندا بمێنەوە.

– وەلێ... وەلێ ئەی کاترینا ئیڤانۆڤنا؟

ڕاسکۆڵنیکۆف بە هەمان بەدخووییەوە بۆی زیاد کرد:

– خۆ کاترینا ئیڤانۆڤنا بێ تۆ هیچی پێ ناکرێ، مەترسە! ئێستە مادام لە دەرەوەیە، خۆی دێتە شوێنت! گەر لێرەش نەتدۆزێتەوە، هەر ئاژاوەکە دەهێنێتەوە کۆڵی تۆ!

سۆنیا نادڵنیا و نغرۆ لە دوودڵییەکی بەئازاردا، دانیشت. ڕاسکۆڵنیکۆف وسکت بووبوو، بە زەوییەکەدا وڕ مابوو، شتێکی لە زەینیدا تاوتوێ دەکرد، جا بێ ئەوەی سەیری سۆنیا بکات گوتی:

– ئەوە ئەم جارەیان بە بێوەی دەرچووی، لەبەر ئەوەی لوژن نەیویست تا کۆتایی بەدوایدا بچێ، وەلێ گەر بیویستبا و درێژەی بە پیلانە گڵاوەکانی بدابا و من و لیبیزیاتنیکۆفیش نەباین، خستبوتیە زیندانەوە، ڕاستە؟

سۆنیا بە دەنگێکی کز گوتی:

– بەڵێ.

جا هۆشپەرت و تۆقیوانە دووبارەی کردەوە:

– بەڵێ، بەڵێ!

– وەلێ هەر بە ڕاستی بۆی هەبوو من ئەمڕۆ لەو ناوەدا دەرنەکەوم! خۆ لیبیزیاتنیکۆفیش زۆر بە هەڵکەوت هاتە ئەوێ!

سۆنیا ورتەی لێوە نەهات.

– دەی، ئەی ئەگەر خۆت لە زینداندا بدیتباوە؟ بیرتە دوێنێ چیم پێ دەگوتی؟

سۆنیا ئەم جارەشیان وەڵامی نەدایەوە.

ڕاسکۆڵنیکۆف کە چاوەڕێی وەڵامی ئەو بوو، بە خەندەیەکی درۆیینەوە گوتی:

– گوتم هاکا دیسان هاوارت بەسەر منی چارەڕەشدا کردەوە کە *وازی لێ بێنە و مەیلێ و نامەوێ ببیستم!*

کە دوای دووسێ خولەکێکی دیکەش وەڵامێک نەبوو، گوتی:

– هێشتا هەر دەتەوێ بێدەنگ بی؟ دواجار دەبێ قسە بکەین یان نا؟ من زۆر حەز دەکەم بزانم چ بڕیارێ دەدەی بۆ چارەکردنی فڵانە لەمپەری تایبەت، وەک لیبیزیاتنیکۆف دەڵێ! (پێدەچوو سەرەداوی باسەکەی لەدەست دەرچووبێت) نا، بە جددی لێت دەپرسم! سۆنیا،

ســۆنیا وێنای بکە کە پێشــوەختە بتزانیبا لوژن چ ئامانجێکی چەپەڵی هەیە، نەک ئەوەی کە ســوســە و گومان بێ، بەڵکە بۆ نموونە گەر لە ئەســڵی بابەتەکە ئاگادار بای کە ئاقیبەتەکەی لەناوچوونی کاترینا ئیڤانۆڤنا و منداڵەکانە و تۆش لەم نێوەندەدا دەفەوتای (گوتم لەم نێوەندەدا، لەبەر ئەوەی تۆ هەر لە بنەڕەتەوە خۆت نابینی) ئەوە پۆلینکاش پێویست بە گوتن ناکا، چونکە ئەویش ڕێی تۆ دەگرێتە بەر دواجار. دەی، ئێستە ئەگەر تەنیا و تەنیا پەیوەست با بە بڕیاری تۆوە کە ئەوان زیندوو بمێنن یان لوژن، یانی لوژن زیندوو بمێنێ و هەر درێژە بە کارە گڵاوەکانی بدا یان لەبری ئەو کاترینا ئیڤانۆڤنا؟ چۆن بڕیارت دەدا کامەیان بمرن و کامەیان بمێنن؟ لەگەڵ تۆمە!

سۆنیا بە دڵخورتی تەماشایەکی ڕاسکۆڵنیکۆف کرد. لە پرسە پڕ لە گومانەکەی ئەودا ســوســەی شــتێکی دیکەی کردبوو، دەتگوت مەبەستێکی دیکە لەپشت وشەکانییەوە هەیە و ئاڵۆز دەدوا.

– هەستێک پێمی دەگوت بەتەمان شتگەلێکی وام لێ بپرسن!

نیگای سۆنیا پرسیارکەر بوو.

– باشە، با وابێ، وەلێ سەرەڕای ئەمەش بڕیات چی بوو؟

ســۆنیا حەزی بۆ درێژەدان بە گوتوبێژەکە نەبوو و تەنانەت بێزاریش لە شێوازی قسەکردنەکەیدا دەباری:

– ئاخر بۆچی ســوورن لەســەر ئەوەی شــتێکی ئەوەندە نەکردە بپرسن؟

– کەواتە بەم پێیە وا باشــترە لوژن بەو هەموو ســتەمەیەوە بە زیندوویی بمێنێتەوە! بوێریی بڕیاردانت نییە؟

– باشە من کوا لە قەدەری خوا بەئاگام؟... بۆچی شتێ دەپرسن کە هی پرســین نییە و ناشــکرێ وەڵام بدرێتەوە؟ ئەســڵەن ئەم پرســیارە

پووچ و بێماناییانە سـوودیان چییە؟ بۆ دەکرێ وەها شـتێ پەیوەندیی بە بڕیاری منەوە هەبێ؟ ئاخر من چیم تا ببمە داوەری مان و نەمانی خەڵکی؟

ڕاسکۆڵنیکۆف بە قەڵسی بۆڵاندی:

– باشــە، گەر بتەوێ بابەتی قەدەری ئیلاهی بێنیتەوە نێو باســەکە ئیتر قسەیەک نامێنێتەوە!

سۆنیا بە ئازارەوە هاواری کرد:

– ڕاشکاوانە قسەکەتان بکەن! دیارە بەدوای شتێکی دیکەوەن! قسە سەرەکییەکەتان چییە؟ نەکا بۆ ئەوە هاتبنە ئێرە من ئەشکەنجە بدەن!

ئیدی نەیتوانی بەر بە خۆی بگرێت و هۆنهۆن کەوتە فرمێسکڕشتن. ڕاســکۆڵنیکۆف بە حەپەســانێکی پڕ لە خەفەتەوە تەنیا ســەیریی کرد. پێنج خولەکێک بەم جۆرە تێپەڕی و ڕاســـکۆڵنیکۆف دواجار بێدەنگیی شکاند:

– هەڵبەتە تۆ ڕاستت گوت، سۆنیا.

شێوازی قسەکردنەکەی نەرم بوو. دەتگوت کتوپڕ گۆڕانی بەسەردا هاتووە و ئیدی ئەو شێوازە پێداگر و پڕ لە لووتبەرزییە لەئارادا نەبوو. تەنانەت چیتر دەنگی گیانی تێدا نەبوو.

– من دوێنێ پێم گوتی ئەگەر بێم بۆ لێخۆشـــبوون نییە، کەچی ئێســـتە هێشـــتا نەگەیشـــتوومەتە جێ داوای لێخۆشـــبوون دەکەم! هەرچیمان لەبارەی لوژن و قەدەری ئیلاهییەوە گوت، لەپێناو خۆمدا بوو... یانی خەریک بووم بەو قســـانە داوای لێخۆشـــبوونم دەکرد، سۆنیا.

ڕاسکۆڵنیکۆف زۆری بۆ خۆی هێنا تا بزەیەک بکات، بەڵام بزەیەکی بێڕەنگ کە بە ئاســـتەم توانیی بیهێنێتە ســـەر زمان، بێگیان بوو و

ناتەواو. ســـەریی دانەواند و ڕووخســـاریی لەنێو لەپی دەســـتەکانیدا شاردەوە.

کتوپڕ هەســـتێکی نامۆ و دۆشـــداهێن، لە توخمی ڕقێکی چزوودار لەدژی ســـۆنیا، دڵیی هێنایە لەرزە. وەک ئەوەی خۆیشـــی لەتاو ئەو هەستە سەراسیمە بووبێت و ترسابێت، لەپڕ سەری هەڵهێنا و چاوی لە ســـۆنیا بڕی، بەڵام ڕووبەڕووی نیگای پڕ لە ئێش و نیگەرانی و تەنانەت بەسۆزی ئەو بووەوە. لە نیگای سۆنیادا ئەوین شەپۆلی دەدا، ڕقەکەی ڕاســـکۆلنیکۆف وەک تارماییەک پێوار بوو. هەڵەکە لەلایەن ڕاسکۆڵنیکۆفەوە بوو، ئەو هەستەی لەگەڵ هەستێکی دیکەدا لێ تێکەڵ بووبوو. ئیدی خەریک بوو کاتی دەهات.

هەمدیســـان ســـەری دانەواندەوە و ڕووخســـاریی بە دەســـتەکانی شـاردەوە. کتوپڕ لە جێگەکەی هەستایەوە. ڕەنگی پەڕیبوو. سـەیرێکی سـۆنیای کرد و نائاگایانە و بێ ئەوەی ورتەی لێوە بێت، چوو لەسـەر تەختەکەی ئەو دانیشت.

هەســتەکەی لەو ســاتەدا هەتا بڵێیت بۆی ئاشـنا بوو، لە دۆخی ئەو کاتەی دەچوو کە تەورەکەی لە ئەڵقەی ژێربالیدا دەرهێنا و لەپشـــت پیرێژنەکەوە ڕاوەســـتابوو و هەســـتی دەکرد کە *نابێت یەک چرکەش بەهەدەر بدات*.

سۆنیا شەرمنانە پرسیی:

– چیتان بەسەر هاتووە؟

ڕاســـکۆلنیکۆف نەیدەتوانی یەک وشـــە دەرببڕێت. بە خەیاڵیشـــیدا نەهـــاتبوو دانپێـدانـانەکەی بەم جۆرە دەربچێـت و تەنـانەت هەر نەشـــیدەزانی چیی بەســـەر هاتووە. ســـۆنیا نەرم و هێمن چووە لای ڕاسکۆلنیکۆف و لەلایەوە لەسـەر تەختەکە دانیشت و چاوەڕێ ما. بە

درێژایی ئەو ماوەیەش سـەرنجی لەسـەر ئەو بوو و دڵی لەگەڵ هەر هەناسـەیەکدا خۆی بە سـنگیدا دەکوتی و دەوەسـتا. ئیدی ئەم دۆخە هی بەرگەگرتن نەبوو و ڕاسـکۆڵنیکۆف ڕووە ڕەنگپەڕیو و مردووئاسـاکەی کردە کچە. لێوەکانی تیاماوانە دەبزوان، دەیویسـت شتێک بڵێت و کەچی نەیدەتوانی. ترس دڵی سۆنیای گوشی.

– چیتان بەسەر هاتووە؟

سۆنیا ئەم جارەیان تۆزێک خۆی لە ڕاسکۆڵنیکۆف دوور خستەوە.

ڕاسکۆڵنیکۆف وەک تووشبووێکی وڕێنە لەژێر لێوەوە گوتی:

– هیچ نییە، سـۆنیا... مەترسـە! کە باش بیری لێ دەکەیەوە، سـەیر دەکەی ئێجگار پڕوپووچ و بێمانایە!

لەناکاو سەری هەڵبڕی و بە سۆنیادا وڕ بوو:

– بەس بۆچی دەبێ بێمە سـەروەختی تۆ و ئەشـکەنجەت بدەم؟ بە ڕاستمە، بۆچی تۆ؟ هەر خەریکم ئەمە لە خۆم دەپرسم، سۆنیا...

ڕاسـکۆڵنیکۆف چارەکێک دەبوو لەسـەر ئەم پرسـە لەگەڵ خۆیدا کێشـمەکێشـی بوو، بەڵام ئێسـتە بێئامان و سـەراپا لەرزۆکانە و بێ ئەوەی ڕێک بزانێت چی دەڵێت، درکاندی.

سۆنیا بە شپرزەیی ورتاندی:

– دەبینم چ ئەشکەنجەیەک دەکێشن!

– هەمووی کۆمەڵێک هەڵیتوپەڵیت و بیرکردنەوەی بێمانایە... گوێ بگرە، سۆنیا...

کتوپڕ و لەبەر هۆکارێکی ناڕوون زەردەخەنەیەک نیشتە سەر لێوی ڕاسـکۆڵنیکۆف. تەمەنی زەردەخەنە کز و بێڕەنگەکەی تەنیا چەند ساتێک بوو.

– بیرتە دوێنێ دەمویست چیت پێ بڵێم؟

سۆنیا چاوەڕێ ما تا قسەکەی تەواو بکات.

– لە کاتی ڕۆیشـــتندا پێم گوتی لەوانەیە بۆ تاهەتا ماڵئاواییت لێ بکەم وەلێ... وەلێ گەر بگەڕێمەوە، دەڵێم کە... کێ لیزاڤێتای کوشتووە!

سۆنیا سەراپای کەوتە لەرزین.

– دەی، ئێستە هاتووم هەموو شتێکت پێ بڵێم.

سۆنیا بە سەختی ورتاندی:

– کەواتە دوێنێ بە ڕاستی...

جا دواتر وەک ئەوەی کتوپڕ هەســت و هۆشــی هاتبێتەوە ســەر خۆی، خێرا پرسیی:

– ئێوە چۆن دەزانن ئاخر؟

ســـۆنیا لەگەڵ تێپەڕینی هەر ســـاتێکدا ڕەنگپەڕیوتر دەبوو و بە ئازارێکی فرەترەوە هەناسەی دەدا.

– دەزانم.

سۆنیا ئێستێکی کرد و پاشان بە شەرمنییەوە پرسیی:

– پێیان زانیوە؟

– نا، پێیان نەزانیوە.

– دەی ئاخر ئێوە چۆن دەزانن؟

دووەم جار بوو ئەوەی دەپرسی.

ڕاســکۆڵنیکۆف بەرەو ســۆنیا ســوورڕا و نیگا وڕەکەی لەو بڕی و هەمدیسان هەمان بزە بەدشێوەکەی هاتەوە سەر لێو و گوتی:

– سۆسەی بکە!

شەپۆلی لەرزە جەستەی سۆنیای دەلەراندەوە. بزەیەکی منداڵانەی کرد و گوتی:

– بەس ئاخر بۆچی ئێوە... ئاوها من دەترسێنن؟

ڕاسکۆڵنیکۆف درێژەی دایێ:

– کێ ناڵێ بکوژەکە هاوڕێم نییە... کە لێی ئاگادارم!

هێشتا نیگای لەسەر کچەکە جێگیر بوو و دەتگوت ناتوانێت چاوی لێ کلا بکات.

– وەلێ نەیدەویست لیزاڤێتا... بکوژێ... بە هەڵکەوت بوو. ویستوویەتی بچێ پیرێژنەکە بە تەنیا بەگیر بهێنێ و بیکوژێ... پاشانیش کتوپڕ لیزاڤێتا دێتەوە ماڵێ... ئیتر بەم جۆرەیە کە لیزاڤێتاش دەکوژێ.

خولەکێکی دیکەی سامناکیان بەسەر برد. هەردووکیان هێشتا لێک ڕامابوون.

ڕاسکۆڵنیکۆف لەناکاو پرسیی:

– ئێستەش هەر ناتوانی سۆسەی بکەی؟

هەستی دەکرد خەریکە لە تاوەرێکەوە سەراوسەر خۆی هەڵدەداتە خوارەوە.

دەنگی سۆنیا تەنانەت بە ورتەش دەرنەدەهات:

– ن... نا!

– کەواتە چاک بڕوانە!

هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو کە هەستێکی درەنگئاشنابوو دڵیی لەنێو چنگی بەستووی خۆیدا گوشی. تەماشای سۆنیای کرد و کتوپڕ لە ڕووخساری ئەودا لیزاڤێتای بینی. چاک باری ڕووخساری لیزاڤێتای لە بیر بوو، لەو کاتەدا کە تەوربەدەست لە ژنە داماوەکە نزیک بووبووەوە و ئەویش پشتاوپشت تا بن دیوارەکە کشابووەوە و دەستێکیی بەرەو پێش درێژ کردبوو. ئەو تۆقینە منداڵانەیەی کە ڕێک وەک زارۆکێکی بچووک تەماشای کردبوو؛ کاتێک بەرەبەرە تۆقین لە شتێک دەچێتە دڵییەوە، هەمان نیگای واق و پڕئازار و نیگەران لەو شتە تۆقێنەرە، هەمان کشانەوە و خۆگرمۆڵەکردن و هەمان دەستدرێژیکردن لە بەرەبەری دان لە پرمەی گریان. سۆنیاش کەم تا زۆر هەمان ئەو دۆخەی هەبوو: چەند ساتێک ترساو و تیاماو سەیری ئەوی کرد، پاشان دەستی چەپی درێژ کرد و هێواش بە پەنجەکانی دەستی گوشاری خستە سەر سینەی ئەو و هێمنهێمن لەسەر تەختەکە هەستایەوە، کشایەوە و خۆی لە ڕاسکۆڵنیکۆف دوور خستەوە، بەڵام نیگای لانەدەدا و تەنانەت بێجووڵەتر لە پێش لەو وڕمابوو. کتوپڕ ئەو تۆقینەی سۆنیا دزەی کردە گیانی ڕاسکۆڵنیکۆفیشەوە و زۆر زووش خۆی لە ڕووخساریدا نیشان دا. ئێستە ئیدی ڕاسکۆڵنیکۆفیش بە هەمان ئەو نیگا وڕە و بزەیەکی هاوتوخمی هەمان بزەی منداڵانە بەودا واق بووبوو.

ڕاسکۆڵنیکۆف دواجار لەژێر لێوەوە گوتی:

– توانیت سۆسەی بکەی؟

– وای خوایە!

ناڵینە سامناکەکەی سۆنیا لە ناخی دڵەوە بوو. ئیدی خۆی بە پێوە نەدەگرت، کەوتە سەر تەختەکە و ڕووخساریی بە سەرینەکەدا ڕۆ برد. وەلێ خولەکێکیشی نەخایاند کە هەمدیسان هەستایەوە، چووە

لای ڕاسکۆڵنیکۆف و هەردووک دەستیی خستە مشتییەوە. پەنجە ناسک و ئێسکنەکانی دەستی ڕاسکۆڵنیکۆفی وەک ئاسن دەگوشین. دیسان نیگا کاریگەر و تیژەکەی لەو بڕییەوە. ئەم جارەیان نیگای لە دەروونی ڕاسکۆڵنیکۆفدا لەدووی شتێک دەگەڕا و دەیویست قووڵایی دڵی ئەو ببینێت و دەستی بە دواهەمین تروووسکایی هیوادا ڕابگات. بەڵام نە تروووسکایی هیوایەک لەئارادا بوو و نە هیچ گومانێکیش لەبارەی حەقیقەتی باسەکەوە هەبوو.

سۆنیا دوای ماوەیەکی زۆر کە ئەمەی بیر خۆی هێنایەوە، فرە سەیر دەهاتە بەرچاوی کە بەو نیگایەی کۆتایی گشت دوودڵی و گومانەکانی ڕەویونەتەوە و لە بابەتەکە تێگەیشتووە. نەیدەتوانی بڵێت چاوەڕوانی وەها شتێک بووە یان پێشوەختە دڵی هەواڵی دابوو، بەڵام کە بابەتەکەی لە زمانی ڕاسکۆڵنیکۆفەوە بیست، بێپێشەکی هەستی کرد کە خۆیشی چاوەڕوانی بیستنی ئەوە بووە.

ڕاسکۆڵنیکۆف تکای لە سۆنیا دەکرد و دەکرا لە دەنگیدا هەست بە ئەشکەنجە بکەیت:

– بەسە، سۆنیا، بەسە ئیتر! ئەوەندە ئەشکەنجەم مەدە!

نا، بڕیار نەبوو پێهاتنەکەی[1] وەها بێت، بەڵام لە کۆتاییدا، بەم جۆرە دەرچووبوو.

سۆنیا مەدهۆشانە لە جێگەکەی پڕتاوی کرد و لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا ڕاوەستا و پەنجەکانیی لێک گرێ دان، بەس زۆر زوو گەڕایەوە و لەتەک ڕاسکۆڵنیکۆفەوە دانیشت. ئەم جارەیان کەم تا زۆر شانی لە شانی ئەو دەسووی. کتوپڕ وەک ئەوەی بریندار بووبێت،

---

١. پێهاتن: دانپێدانان؛ پەنەئامای.

هاوارێکی لێوە هەســـتا و بێ ئەوەی تەنانەت هۆکارەکەشـــی بزانێت، لەبەردەم ڕاسکۆلنیکۆفدا کەوتە سەر ئەژنۆ و بە خەفەتباری گوتی:

– باشە ئێوە چیتان لە خۆتان کردووە؟

ئەم جارەیان بەرزەپا ڕاســـت بووەوە و خۆی لە شـــان و ملی ڕاسکۆلنیکۆفەوە ئالاند، باسکی بە دەوریدا هێنا و توند گرتییە باوەش.

ڕاسـکۆلنیکۆف کشـایەوە و بە زەردەخەنەیەکی خەمگینەوە سـەیری کرد:

– تۆ کچێکی ســەیری، ســۆنیا! من باســی چیم بۆ کردی کەچی تۆ ماچم دەکەی و دەمگرییە باوەش! خۆشت نازانی خەریکی چیی.

سـۆنیا تەنانەت یەک وشـەش لە قسـەکانی ئەوی نەبیست و شـێتانە هاواری کرد:

– ئێســـتە لە ســـەرانســـەری دونیادا هیچ کەســـێ نییە هێندەی تۆ خەمگین بێ!

جا پاشان لە پرمەی گریانێکی تۆقێنەری دا.

شـــەپۆلی هەســـتێک کە ڕاســـکۆلنیکۆف زۆر دەمێک بوو ئەزموونی نەکردبوو، دڵیی تەنییەوە و هێوری کردەوە، ئەویش هیچ بەرگرییەکی نەکرد و دوو دڵۆپە فرمێسک بەسەر برژانگییەوە کەوتنە سەما.

– یانی دەستم لێ بەرنادەی، سۆنیا؟

نیگاکردنەکەی لە سۆنیا، شتێکی وەک هیوای تێدا بوو.

سۆنیا هاواری کرد:

– نا، نا، نا، هیچ کات و لە هیچ کوێ بە تەنیا جێت ناهێڵم! دەکەومە شـــوێنت، بۆ هەر کوێ بێ دەکەومە شـــوێنت! خوایاااا، چ ئازارێک لە

سینەی مندایە!... باشە ئێمە بۆ زووتر یەکتریمان نەناسی؟ تۆ بۆچی زووتر نەهاتی؟ خوایا!!!!

– خۆ ئێستە لێرەم.

– ئێستە! ئێستەیەک کە ئیتر کار لە کار ترازاوە!... ئێستە پێکەوەین... پێکەوەین...

سۆنیا وەک ئەوەی هۆشی لەسەر خۆی نەبێت، چەند جارێک کۆتاوشەی پاتە کردەوە.

– لەگەڵت دێمە سیبیریا!

راسکۆڵنیکۆف کتوپڕ کرژ بوو و کشایە دواوە. دیسان هەمان بزەی پڕ لە قین و لووتبەرزی نیشتبووەوە سەر لێوەکانی:

– لەوانەیە نەمەوێ بچمە سیبیریا، سۆنیا.

سۆنیا دەمودەست نیگایەکی گرتە ئەو.

هاوخەمیی پڕووکێنەر و پڕ لە گڕ و تینی لەگەڵ ئەو مرۆڤە خەمگینەدا، ئێستە شوێنی خۆی دابووە بیرکردنەوەیەکی تۆقێنەر لەبارەی کوشتن و وەهمێکی سەیر گیانیی داتەنیبوو. دەیتوانی لە ئاوازی گۆڕدراوی ئەودا دەنگی بکوژ ببیستێت و هەر لەبەر ئەوەش بوو کە دۆشداماو چاوی لێ بڕی. هێشتا شتێکی وای نەدەزانی، نە بە ڕێکی دەیزانی بۆچی و چۆن ئەم کارەی کردووە و نە لە پاڵنەر و مەبەستەکەی ئاگادار بوو. هەموو ئەم پرسانە کتوپڕ هێرشیان هێنایە سەر زەینی و هەر باوەڕی نەدەکرد: *یانی ئەم کەسە بکوژە؟ هەر بە ڕاست وەها شتێ ڕێی تێدەچێ؟*

وڕ بوو و دەتگوت هێشتا نەیتوانیوە بێتەوە سەر خۆی:

– یانی چی؟ ئەسڵەن من لە کوێم؟ ئاخر کەسێکی وەک ئێوە... باشە چۆن ڕێگەتان بە خۆتان دا وەها کارێ بکەن؟... یانی چی ئاخر، بۆچی؟...

– تەنیا پارەکانیم دەویست! واز بێنە، سۆنیا!

شێوازی قسەکردنەکەی تیاماو و تەنانەت تووڕەش بوو.

سۆنیا تاساو لە جێی خۆیدا بزمارکوت کرابوو، بەڵام کتوپڕ هاواری چووە ئاسمان:

– برسـیت بوو؟ دەتویسـت... دەتویسـت یارمەتیی دایکت بدەی، ئەرێ؟

– نا، سۆنیا، نا!

ڕاسکۆڵنیکۆف پشتی کردە سۆنیا و سەری دانەواند.

– برسـیم نەبوو... من، هەڵبەتە نیازم بوو یارمەتیی دایکم بدەم، وەلێ.. بۆ یارمەتیدانی دایکیشـم نەبوو... سـۆنیا، خەریکە ئەشـکەنجەم دەدەی!

سۆنیا ڕوو لە ئاسمان دەستی هەڵبڕی:

– یانی هەر بە جددی ئەوە ڕاستە! خوایە، ئاخر ئەمە چ ڕاستییەک بوو؟ کێ باوەڕ بەوە دەکا؟... ئاخر ئێوە چۆن دەتوانن هەموو پارەکەتان ببەخشن و لەگەڵ ئەوەشدا دزی بکەن و مرۆڤ بکوژن؟

جا کتوپڕ هاواری کرد:

– دەی بیڵێ!... ئەو پارەیەی کە داتانە ئیڤانۆڤنا... ئەو پارەیەش... یانی پارەی...

ڕاسکۆڵنیکۆف پەلەپەل قسەی پێ بڕی:

– نا، ســـۆنیا! ئەو پارەیەی کە دامە کاترینا ئیڤانۆڤنا هی خۆم بوو! خەمت نەبێ! دایکم بۆمی ناردبوو بڕیار بوو بازرگانێک بیگەیەنێتە دەستم. کاتێ گەیشتە دەستم، کە بە نەخۆشی کەوتبوومە جێگە... ڕێک هەمان ئەو ڕۆژەی کە دامە ئێوە... ڕازومیخینیش شـایەتە، چونکە ئەو لەبری من پارەکەی وەرگرت. ئەو پارەیە هی خۆم بوو، بە ڕاستمە.

سۆنیا هەروا واقوڕماو گوێی بۆ دەگرت و ئەوپەڕی هەوڵی دەدا تا هەرچۆنێک بووە سەر لە قسەکانی دەربکات.

ڕاسکۆڵنیکۆف بە نەرمی و وەک ئەوەی کە فکری خۆیشی قاڵ بێت، بۆی زیاد کرد:

– وەلێ ئەو پارانە... نازانم هەر بە ڕاســـتی پارەیەک لەئارادا بوو یان نا... کیفێکی بە ملییەوە هەڵواسـیبوو کە بردم... شـتگەلێکی زۆری تێ ئاخنیبوو... ئەوی تریشـی هەندێ زنجیر و قۆپچەی سـەرقۆڵ بوو کە هەموویم لەگەڵ ئەو کیفەیـدا ڕۆژێـک دواتر بردە کەلاوەیەک و خستمە چاڵی ژێر بەردێکی گەورەوە... ئێستە هەمووی لەوێیە...

سۆنیا سـەراپا بووبووە گوێ تا بتوانێت ببیستێت و تێبگات. کتوپڕ و خێرا، وەک ئەوەی هیوابڕاوانە لە هەوڵی چاککردنەوەی دۆخەکەدا بێت، گوتی:

– ئەی بۆچی... خۆتان گوتتان لەبەر دزینی پارەکان ئەم کارەتان کردووە، کەچی هیچیشتان هەڵنەگرتووە؟

ڕاسکۆڵنیکۆف هەر وا لە بیر و خەیاڵدا ڕۆچووبوو:

– نازانم... هێشتا بڕیارم نەداوە کە ئایا پارەکان ببەم یان نا!

بەڵام کتوپڕ هـاتەوە ســــەر خۆی و زەردەخەنەیەکی چزوودار و نیوەچڵی کرد:

– ئاخ، قسەی چەندە بێسەروبەر دەکەم، ها، سۆنیا؟

بیرکردنەوەیەک وەک برووســـکە بە زەینی کچەکەدا تێپەڕی: نەکا شــێت بێ؟ وەلێ ســۆنیا دەســتبەجێ ئەو بیرکردنەوەیەی تاراند. نا! مەســـەلەکە ئەوە نەبوو. هێشـــتا هەر تێنەدەگەیشـــت، بەڵێ، بە هیچ شێوەیەک دەرکی پێ نەدەکرد!

ڕاسکۆڵنیکۆف لەناکاو و بە شێوەیەکی پتەو گوتی:

– ســەیرکە ســۆنیا، هەموو قســەی من ئەوەیە و هیچی ترم نییە تا پێت بڵێم: گەر لەبەر برسییەتی مرۆڤم کوشتبووبا...

ســەیرکردنەکەی ســۆنیا ســەرلێشــێوێن و هاوکات هاوڕێیانە بوو و هەر وشەیەکی بە جەختلەسەرکردنەوەیەکی زۆرەوە دەردەبڕی:

– ئێستە... هیچ خەمێکم نەبوو! باوەڕ بە قسەکەم بکە...

خولەکێک تێپەڕی و ڕاسکۆڵنیکۆف داماوانە هاوارێکی کرد:

– ئاخر ئەوەی کە من دانی پێدا بنێم کە تاوانم کردووە، چیی تێدایە بۆ تۆ؟ ئەسڵەن تۆ بوویتە براوەی ئەم یارییە نەفامانەیە و شکستت بە من هێنا... باشە، چیت دەست دەکەوێ لەم نێوەندەدا؟ ئاە، سۆنیا... من ئەمڕۆ بۆ ئەوە نەهاتوومەتە لات تا ئەم قسانە بکەم!

ســۆنیا جارێکی دی تەقەللای کرد شــتێک بڵێت، بەڵام قســەیەکی لە دەم دەرنەچوو.

– دوێنێ داوام لێ کردی لەگەڵم بێی؛ چونکە بێ لە تۆ هیچ کەسێکم بۆ نەماوەتەوە!

سۆنیا بە شەرمەوە پرسیی:

– بۆ کوێ لەگەڵتان بێم؟

ڕاسکۆڵنیکۆف بزەیەکی تاڵی کرد:

– بۆ دزی و مرۆڤکوشتن نالێم، مەترۆقێ! ئێمە زەوی تا ئاسمان لێک جیاوازین... دەزانی سۆنیا، لەوانەیە بڕوا نەکەی بەس خۆشم ئێستە تێگەیشتم کە دوێنێ داوام لێ کردی بۆ کوێ لەگەڵم بێی! دوێنێ کتومت نەمدەزانی مەبەستم کوێیە. هاتمە لای تۆ و تکاکەم تەنیا یەک هۆکاری هەبوو: نامەوێ وازم لێ بێنی. خۆ بە تەنیا جێم ناهێڵی، سۆنیا، ها؟

سۆنیا دەستی ئەوی گوشی.

هەمدیسان خولەکێکی خایاند تا ڕاسکۆڵنیکۆف سەرلەنوێ و لەوپەڕی تیاماویدا دەم بکاتەوە، ئەم جارەیان نیگایەکی بێڕادە ئەشکەنجاویی گرتە سۆنیا:

– باشە بۆچی پێم گوت؟ بۆچی گرێی دڵمم لەلای ئەم کچە کردەوە؟ ئێستە ڕوونکردنەوەت لە من دەوێ، بەڵێ دەی، چاوەڕێ دانیشتووی و سەراپا بوویتەتە گوێ تا بەسەرهاتەکە ببیستی. وەلێ دەبێ چیت بۆ باس کەم؟ خۆ تۆ تێم ناگەی، تەنیا ئازارێک دێتە سەر ئازارەکانت... هۆکارەکەشی من دەبم! باشە، باشە! خۆ دیسان باوەشتت بە ڕوومدا کردەوە و وا دەگرییێ! بۆچی؟ چونکە من ناتوانم باری گوناحی خۆم لە کۆڵ بگرم و هاتووم تا بینێمە کۆڵی کەسێکی تر! ئەم کارەی من واتە *تۆش ئازار بکێشی تا ئازاری خۆم کەمتر بێتەوە!* هەر بە ڕاستی دەتوانی مرۆڤێکی ئەوەندە بوودەڵەت خۆش بوێ تۆ؟

سۆنیا هاواری کرد:

– وەلێ ئێوەش وا ئازار دەکێشن!

جارێکی دیکەش شەپۆلی هەمان هەستی نامۆ گیانی ڕاسکۆڵنیکۆفی تەنییەوە و تەنانەت بۆ خولەکێکیش توانیی دڵی نەرم بکاتەوە.

– سۆنیا، من ڕۆحم ڕەش بووە، ئەمەت بیر بێ! ئەمە لە خۆیدا زۆر شـــت ڕوون دەکاتەوە. هەر لەبەر ئەوە هاتم و ئەوەندەش نارەحەتم. زۆر کەس هەن کە ئامادە نین ئەمە بکەن. وەلێ من ترســـنۆک و... بوودەڵەم!... هەر لێی گەڕێ! هیچ گرنگ نین ئەم شـتانە... ئێسـتە کاتی ئەوەیە کە قسە بکەم، بەس نازانم چۆن دەستی پێ بکەم!

ڕاســـکۆلنیکۆف، نغرۆ لە بیر و خەیـاڵدا، ئێســـتێکی کرد، بەڵام هەمدیسان هاواری کردەوە:

– جیاوازیی نێوان ئێمە زەوی تا ئاســـمانە! یەک دونیا مەودامان لەنێواندایە. باشە بۆچی هاتمە ئێرە؟ قەت لە خۆم نابوورم!

سۆنیا هاواری کرد:

– نا، نا، چاکتان کرد کە هاتن! وا باشـترە هەموو شـتێ بزانم! زۆر زۆریش باشە!

نیگای ڕاسکۆلنیکۆف ئەشکەنجەی لێ دەباری:

– لەوانەشە وا بێ! بەڵێ...

دەتگوت ئاخرییەکەی توانیویەتی بڕیاری کۆتایی خۆی بدات:

– بەڵێ، وایە! دەمویســـــت ببمە نـاپلیۆن، هەر لەبەر ئەوەش ئەو پیرێژنەم کوشت... تێدەگەی یان نا؟

سۆنیا سادەدڵ و شەرمنانە وەڵامی دایەوە:

– نا...

بەڵام تکای کرد:

– وەلێ تۆ قســـەم بۆ بکە، قســـەی خۆت بکە! خۆم بە جۆرێ لە جۆرەکان تێی دەگەم.

– خۆت تێدەگەی؟ باشە، ئادەی بزانم!

ڕاسکۆڵنیکۆف ئەم جارەشیان بێدەنگ بوو و تا ماوەیەک لە جیهانێکی دیکەدا بوو.

– تەماشا، بابەتەکە ئەوە بوو کە ڕۆژێکیان لە خۆمم پرسی ئەگەر ناپلیۆن لەجێی مندا با چی دەبوو؟ یانی ئەگەر تۆلۆن و میسر و گوزەرگەی مونبلانی نەبا تا بیانکاتە پەیژەی سەرکەوتنی خۆی و لەبری ئەو هەموو کارە سەرووئاسایی و شکۆدارە، گریمان تەنیا پیرێژنێکی گاڵتەجاڕی لە بەردەستدا با کە ژنی سەرنووسەرێکی لە خۆی گەمژەتر بووە و ناپلیۆنیش دەبێ پیرێژنەکە بکوژێ تا بتوانێ پارەکەی ببا کە ئاخنیویەتییە ناو سندووقچەکەیەوە، ئەوەش تەنیا بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی، چونکە گریمان بەدەر لەمە ڕێگەیەکی دیکەی نەدەبوو، باشە ئەوسا دەیتوانی وەها کارێ بکا یان نا؟ ئایا لەوەش شەرمەزار نەدەبوو کە ڕێچارەکەی ئێجگار گاڵتەجاڕانە و... هەروەها تاوانیشە؟ باشە، لێگەڕێ با پێت بڵێم لەبارەی ئەم بابەتەوە زۆر خراپ خۆمم خواردووەتەوە... ئاخرییەکەشی، لانیکەم لەبەردەم خۆمدا، گەلێک شەرمەزار بووم، چونکە هەرچۆنی بوو، زۆر کتوپڕانە یەکلایی بوومەوە کە نا! ئەوە هیچ کە ناپلیۆن لەپای ئەم کارەدا هەستی بە کەمترین شەرمەزاری نەدەکرد... ئەسڵەن هەر ئەوەشی بە خەیاڵدا نەدەهات کە هیچ کاتێکی بۆ بەفیڕۆ بدا. دیارە کە ئەگەر ڕێیەکی تری نەبا، بەرانبەرەکەیی تەفروتوونا دەکرد و تەواو! دەی، منیش... بیر و خەیاڵم خستە لاوە و... پیرێژنەکەم کوشت. هەمان ئەو کارەم کرد کە ناپلیۆن دەیکرد و کتومت بەم جۆرە ڕووی دا! بە لاتەوە پێکەنیناوییە، ها؟ بەڵێ، سۆنیا، وەلێ لە هەمووی پێکەنیناویتر ئەوەیە کە لەوانەیە هەموو بەسەرهاتەکە هەر ئەوە بووبێ...

بە بۆچوونی سۆنیا بە هیچ شێوەیەک پێکەنیناوی نەبوو.

– دەی، باشــــتر بێ پێچوپەنا قســــەکەتان بکەن و ئێوە بن و خوا پێویستیش ناکا نموونە و شت بهێننەوە...

سۆنیا هێشتا هەر خەریک بوو تکای لێ دەکرد، شەرمنتر لە جاران و بە دەنگێکەوە کە دەتگوت لە بنی چاڵێکەوە دێت.

ڕاسکۆڵنیکۆف ڕووی کردە کچە و تەماشایەکی خەمناکانەی کرد و هەردووک دەستیی گرت.

– دیسـان تۆ لەسـەر هەقی، سـۆنیا. بە دڵنیاییەوە ئەمە هەڵێتوپەڵێتە و بە جۆرێ لە جۆرەکان هەمووی قسـەی بەلاشـە! تەماشـا، خۆ خۆت ئاگاداری، دایکی من تاپلووچە و خوشکەکەشم هەرچۆنێک بوو توانیی خوێندن تەواو بکا و ناچار بوو بچێ لەملا و لەولادا ببێتە مامۆسـتای ناو ماڵان! هەموو هیوایەکیان تەنیا بە من بوو! ئەوە منیش خوێندکاری زانکۆ بووم و تەنانەت نەمتوانی خەرجییەکەشـــی دەربهێنم و ناچار بووم گەر بە کـاتییش بێ، واز لە زانکۆ بێنم. تەنـانەت بە هەر کوێرەوەرییەک با، دەمامەوە و خوێندنەکەمم تەواو دەکرد، لەوانەیە دە دوازدە ســـــاڵ دوای ئەوە هیوایەک هەبا هەڵبەتە ئەگەر بەختێک لە دەرگەی ماڵەکەمی بدابا، ببمە مامۆســـتایەک، فەرمانبەرێک شـــتێک و ساڵی هەزار ڕۆبڵێکیش وەربگرم...

ڕاسکۆڵنیکۆف دەتگوت خەریکی گوتنەوەی وانەیەکی لەبەرکراوە.

– وەلێ ئیتر تـا ئەو کـاتە دایکم ئەوەنـدە خەفەتی دەخوارد و فرمێســـکی دەڕشـــت کە هیچی لێ نەدەمایەوە و ئەوســـا منیش نەمتوانیبوو ژیانێکی خۆشـی بۆ دابین بکەم... خوشـکیشـم لەوانەبوو لەمە خراپتری بەسەر بێ!... جا دوای ئەوەش خۆ گاڵتە نییە، کە هەموو کەس و هەموو شـتێ بخەیتە لاوە و پشـت لە هەموو دونیا بکەی و بیـرت بـچێتەوە خـۆ دایـکێـکیشـــت هەیە و بەوپەڕی ڕێز و خۆشـەویستیشـەوە چاو لەئاست هەر سووکایەتییەک بنووقێنی کە بە

خوشـــکەکەت دەکرێ؟ ئاخر لەپێناو چیدا؟ لەبەر ئەوەی ئەوپەڕی کە ئەوان مردن، کەســـانی تر –ژن و مندال و ئەوانە– لە ژیانتدا بێنیتە جێگەیان و پاشـــان بەبێ یەک پەنابا بیاندەیە دەســـت چارەنووس و مێشێکیش نەبێتە میوانت؟... لەبەر ئەوە بوو کە بڕیارم دا ببمە خاوەنی پـارەی پیرێژنەکە و هیچ نەبێ چەنـد ســـــاڵێکی ئەوەڵی زانکۆ بێ نیگەرانکردنی دایکم بەســـەر بەرم. تەنیا لە ئاســـتێکدا کە ســـەردەمی خوێندنەکەم تێبپەڕێنم و تۆزێکیش پارەم بەدەستەوە بمێنێ و تا دوای تەواوبوونی خوێندنەکەم کارێکی بەکەڵک بکەم، کارێکی ورد و ڕاســت و حسێببۆکراو کە هیچ کەلێنێکی تێ نەکەوێ و بتوانم ڕێ و پیشـەی ســـەربەخۆی خۆمم هەبێ... ئێ... هەر ئەوەندە... کوشـــتنی پیرێژنەکە هەڵە بوو و... زۆریش خراپ بوو... وەلێ بەسە ئیترا!

ڕاسکۆڵنیکۆف بە هەر تەقەللایەک بوو سەر و بنی بەسەرهاتەکەی هێنایەوە یەک و سەری دانەواند.

– ئاخ، نا! وا نابێ... یانی ناکرێ بەم جۆرە بێ...

سۆنیا بەدەم هاوارەوە هەر ئەمانەی دەگوتن.

– ئاخر چۆن کەسێک دەتوانێ... نا، ناکرێ!

– وا خۆشـــت دەڵێی کە ڕێی تێناچێ! وەلێ من قســـەی دڵمم کرد و ڕاستی ئەوەیە کە گوتم.

– باشە ئەمە چ ڕاستییەکە؟ خوایە، خۆت فریامان کەوە!

– من تەنیا ئەســـپێیەکم کوشـــت، ســـۆنیا. ئەســـپێیەکی بێکەڵک و قێزەون کە بوونی مایەی زیان بوو.

– باسی مرۆڤ دەکەین... یانی دەڵێن مرۆڤ ئەسپێیە!

– خۆشم دەمزانی کە ئەسپێ نەبوو...

ڕاسکۆڵنیکۆف نیگایەکی غەریبی گرتە کچە و درێژەی دایێ:

– وەلێ درۆ دەکەم، سۆنیا. دەمێکە خەریکی درۆکردنم... بەم جۆرە نییە و ناشکرێ وا بێ. تۆ ڕاستت گوت، سۆنیا. هۆکارێکی تریشی هەبووە ئەم کارە! سۆنیا، دەمێکە قسەم لەگەڵ هیچ کەسێکدا نەکردووە... سەرم زۆر دەئێشێ.

چاوەکانی ڕاسکۆڵنیکۆف تادارانە دەدرەوشانەوە. لە بەرەبەری وڕێنەکردندا بوو و زەردەخەنەیەکی شپرزەش بەسەر لێوییەوە سەمای دەکرد. وەلێ شڵەژان و خرۆشانەکەی ئیدی نەیدەتوانی کەساسییەکەی بشارێتەوە و هازێکی بۆ نەمابووەوە. سۆنیا دەیبینی کە ڕاسکۆڵنیکۆف چ ئەشکەنجەیەک دەکێشێت. ئەویش ئیدی وا سەرسووڕان زۆری بۆ دەهێنا. سەیر بوو کە شێوازی دوانی ڕاسکۆڵنیکۆف و جۆری دەربڕینی بەرەبەرە خەریک بوو بابەتەکەی بۆ سۆنیا ڕوون دەکردەوە.

*وەلێ ئاخر چۆن ڕێی تێدەچێ؟ خوایە، چۆن ڕێی تێدەچێ؟* سۆنیا ئەمەی گوت و بێهیوایانە پەنجەکانیی لێک گرێ دان.

– نا، سۆنیا! وا نییە...

کتوپڕ ڕاسکۆڵنیکۆف سەرلەنوێ کەوتەوە قسەکردن و بە جۆرێک سەری هەڵبڕی وەک ئەوەی گۆڕانکارییەکی کتوپڕانە و سەرسووڕهێن لە ڕەوشی بیرکردنەوەیدا ڕووی دابێت و ئەوی وروژاندبێت.

– وا نییە! تۆ باشترە... وای دانێ من خۆبەشتزان و بەخیل و چەپەڵم و گیانیشم پڕە لە ڕق و کینە و... بە جۆرێ لە جۆرەکانیش شێتییەتی لە خوێنمدایە! لێگەڕێ هەرچی هەیە و نییە لە یەک شوێندا بیخەمە ڕوو! ماوەیەکە قسەی شێتییەتی کەوتووەتە دەمیان و خۆم چاک ئاگادارم! ئێستە پێم گوتی کە نەمتوانی خەرجیی خوێندن و

زانکۆکەم دەربێنم. وەلێ دەزانی، بۆی هەبوو هەر بە ڕاســتیش بتوانم دەســتەبەری بکەم؟ دایکی داماویشــم مانگانەکەی بۆ دەناردم. خۆشــم دەمتوانی پارەی خواردەمەنی و پێڵاو و جلوبەرگەکەم دەربێنم. ئەرێ، دەکرا! وانەی تــایبەتی هەبوو کە یەکی نیو ڕۆبڵی تێدا بوو. ڕازومیخینیش خەریکی ئەمەیە خۆ! بەس من نەمویســـت ئەو کارە بکەم، هەمووشی لەبەر بوودەڵەیی خۆم... بەڵێ، هیچ شتێ لەمە باشتر ناتوانێ وەسفی بکا: بوودەڵەیی ڕووت! پاشان، وەک جاڵجاڵۆکەیەک بە تەون دەوری خۆمم تەنی! خۆ تۆ کونەمشکەکەی منت دیوە... دەتزانی ژوورێکی تاریک و تەســـک بە بنمیچێکی نزمەوە بەرەبەرە ڕۆح و مێشــکی مرۆڤ دەخوا؟ ئاخ، چەندە ڕقم لەو کونەمشــکە بوو، کەچی ئامادەش نەبووم لێی بێمە دەر! ئەمەش هەمووی دەسـئەنقەسـت بوو! شـــەو و ڕۆژم لەو کونەدا بەســـەر دەبرد، نە ئیشـــێکم دەکرد و نە ئیشـــتیهاشـــم بۆ خواردنی شـــتێ هەبوو. تەنیا لەوێ تەخت بۆی ڕاکشابووم. ئەگەر ناستاسیا پارووەنانێکی بۆ بهێنابام دەمخوارد؛ دەنا بە درێژایی ڕۆژ بە برســـییەتی دەمامەوە. شـــەوانەش مۆم و چرام نەبوو و لە تــاریکیـدا دەخەوتم، چونکە ئــامــادە نەبووم تەنــانەت جووڵەیەکیش بکەم و پــارەی مۆمەکەم دەربێنم! دەبوو خەریکی خوێندنەکەم بم، بەس تەنانەت کتێبەکانیشــمم فرۆشــتبوون! ئێســتەش یەک پەنجە تۆز نیشـــتووەتە ســـەر مێز و پەڕە و دەفتەرچەکانم. من زیاتر حەزم دەکرد تەخت بۆی ڕاکشـــێم و تەنیا و تەنیا خەریکی بیرکردنەوە بم... هەر وا خەریکی بیرکردنەوە بووم. هەموو جۆرە وەهم و خەیالاتێکیش بە مێشـــکمدا دەهات... نا، خۆ بەم جۆرە نەبوو! هەمدیســان خەریکی قســەی بێســەروبەرم و نەمتوانی بە چاکی باســی کەم! مەســـەلەکە ئەوە بوو کە ئەوســـا هەر وا لە خۆمم دەپرســـی من بۆچی ئەوەندە نەفامم کە لە کاتێکدا ئەوانی دی کۆمەڵێک دەبەنگن و منیش وا نەفامییەکەیان دەبینم، ئەی بۆ هەر نامەوێ واز لە گەمژەیی بێنم و بە ژیری و زیرەکییەکی زیــاترەوە هەنگــاو بنێم؟ دواتریش

تێگەیشــتم کە ئەگەر هەر وا بەدیار ژێربوونی ئەوانی ترەوە دانیشــی، تەمەنت بەفیڕۆ دەچێ... جا تێگەیشتم کە هەر لە بنەڕەتەوە وەها شتێ نەکردەیە و خەڵکی ناگۆڕێن، هیچ کەســـێ نەیتوانیوە ئەوان بگۆڕێ و ئەوەش ناهێنێ کاتی پێوە بکوژێ! ئەرێ، وایە! ئەمە یاسای سرووشتی مرۆڤە، سۆنیا... یاسایە! ئێستەش چاک دەزانم هەر ئەوەندە بەسە کە ڕۆح و زەینت بەهێز بن تا بتوانی بیانبەزێنی! کێ بوێرە، هەر ئەو کاکە و ســەروەرە! ئەو کەســە دەکەنە یاســادانەری خۆیان، کە حســێب بۆ مرۆڤایەتی ناکا. دایمەش ئەو کەســـە لەســـەر هەقە کە زات و بوێریی زیاترە! لەوەتی دونیا دونیایە هەر وا بووە! مەگەر کەســـێک کوێر بێ ئەم شتانە نەبینێ.

ئاراستەی نیگای ڕاسکۆڵنیکۆڤ لە سۆنیا بوو، بەڵام ئیدی بەلایەوە گرنگ نەبوو کە ئاخۆ هەر بە ڕاســتی لە قســەکانی تێدەگات یان نا. ســـەرتاپێی لە تادا دەســـووتا و لە لایەکیشـــەوە کەوتبووە بارێکی هەناســەســاردانەی نێوان هۆشــیاری و بێهۆشــییەوە. هەر بە ڕاســتی دەمێک بوو قسەی لەگەڵ هیچ کەسێکدا نەکردبوو! سۆنیا تێگەیشت کە ئەم یاســـا و ڕێســـا ڕەشـــانە بوونەتە باوەڕ و بنەمـای ژیـانی ڕاسکۆڵنیکۆڤ.

ڕاسکۆڵنیکۆڤ هەر بەو حاڵەوە درێژەی پێ دا:

– سۆنیا، لەو ساتەدا بوو کە بۆم یەکلایی بووەوە دەسەڵات تەنیا و تەنیا هی کەســـێکە کە دەوێرێ بچەمێتەوە و بەســـەر زەوییەوە بیرفێنێ. پێویســـتیش نـاکـا هیچی تری هەبێ! نە تـایبەتمەنـدییەکی بەرجەســتەی دەوێ، نە لێهاتوویەتییەکی دەگمەن... تەنیا دەبێ بوێریت هەبێ! پاشــان بۆ یەکەمین جار فکرەیەکم بە زەیندا هات کە پێشــتر بە زەینی هیچ کەســـێکدا نەهاتبوو، هیچ کەس! وەک ڕۆژ بۆم ڕۆشـــن بووەوە کە ئاخر چۆن کەســێک نەبووە و نییە لەم دونیا شــێتەدا لێی بچێتە پێش و لەقەیەک بکێشـــێ بە هەموو شـــتێکدا و قلْپی بکاتەوە؟

دەمویست بوێری بنوێنم... سۆنیا، دەمویست لەنێو ئەم هەموودا من بوێر بم و هەر لەبەر ئەوە بوو پیرێژنەکەم کوشـــــت! ئەمە بوو پاڵنەرەکەم!

سۆنیا تیاماوانە دەستی بەرەدو ئاسمان هەڵبڕی:

– ئاە، بێدەنگ بن، بێدەنگ! ئێوە لە خوا هەڵگەڕاونەتەوە و ئەویش پشتی تێ کردوون و داونیەتە دەست شەیتان!...

– یانی دەڵێن ئەو کاتانەی لە تاریکیدا ڕادەکشـــام و ئەمانەم بە زەیندا دەهاتن، ئەوە شـــەیتان بووە کە وەســـوەســـەی بۆ دروســـت کردووم؟ ها؟

– وس بن، کفر مەکەن! ئێوە تێناگەن! وای، خوایاااا، ئەوان تێناگەن و هیچ کاتێکیش ناتوانن تێبگەن!

– هێواش، ســـۆنیا، من خۆشـــم دەزانم کە هەوســـارم بەدەســـت شەیتانەوە بوو.

خەمگینانە و بە جەختلەسەرکردنەوە دووبارەی کردەوە:

– ســـۆنیا، تۆ وس بە! خۆم هەموو شـــتێ دەزانم و تێدەگەم. لەو تـاریکی و تەنیاییەدا، زۆر بیرم لێ کردووەتەوە و بە خۆمم گوتووە. وردترین خاڵەکانیم شەنوکەو کردوون و بەسەر بچووکترین شتیشدا تێنەپەڕیوم. خۆم لە هەموو شتێ تێدەگەم و بە پێچوپەناکەی ئاشـنام! نازانی چەندە لەو ســـەردەمە پووچە ماندوو بووم! دەمویســـت هەموو شـتێ لە بیر بکەم و سـەرلەنوێ دەست پێبکەمەوە، سۆنیا. دەمویست بیرکردنەوە وەلا بنێم. پێم بڵێ، خۆ تۆ وات نەزانیوە من وەک گەمژە کەللەپووتەکـان بە پێخواســـی بەنـاو کەوتووم، هـا؟ نـا، بەوپەڕی ئەقڵدروســـتییەوە هاتمە ناو ئەم یارییەوە و هەر ئەوەش تەفروتووناى کردم. نەکا لات وابێ نەمدەزانی! لە خۆمم دەپرســـی باشـــە تۆ هەر لە

بنەڕەتەوە ئەو مافەت هەیە کە دەسەلات بگریتە دەست؟ بە دڵنیاییەوە ئەو مافەم نەبوو! یان دەمپرسی بە بۆچوونی تۆ مرۆڤەکان ئەسپێن یان نا؟ کەواتە بۆم ڕوون دەبێتەوە کە مرۆڤەکان ئەسپێ نین. چونکە بەلای ئەو کەسەوە مرۆڤەکان ئەسپێن کە بێ پرسکردن بەرەو ئامانجەکەی مل دەنێ و هیچ بیرێکیش ناکاتەوە. منێ کە بە درێژایی ئەو ڕۆژانە هەر لە بەیانییەوە تا شەو بیرم دەکردەوە و لەگەڵ خۆمدا کێشمەکێشم بوو کە ئەگەر ناپلیۆن لەجێی مندا با چیی دەکرد، یانی خۆمم بە ناپلیۆن نەدەزانی... چ ئەشکەنجەیەکم کێشا بەدەست ئەم هەموو بیر و خەیاڵەوە و دواجاریش هەموو ئاواتم بووبووە ئەوە کە تەنیا خۆم لەو ئەشکەنجەیە ڕزگار بکەم! دەمویست بێ هیچ هۆکار و لۆژیکێک دەست بدەمە ئەو کوشتنە، سۆنیا؛ لەبەر خۆم، تەنیا لەبەر خۆم! نەمدەویست تەنانەت درۆ لەگەڵ خۆشمدا بکەم! بۆ یارمەتیدانی دایکم نەبوو کە مرۆڤم کوشت. نا، ئەمە درۆیە! چاوم بەدوای دەسەلاتەوە نەبوو تا لەڕێیەوە چاکە لەگەڵ کەسێکدا بکەم! ئەمە هەمووی درۆیە! زۆر بە سادەیی لێم دا و کوشتم، تەنیا لەبەر خۆم. لەو ساتەشدا بەقەد سەرەدەرزییەک بۆم گرنگ نەبوو کە بڕیارە چاکەیەک لەگەڵ کەسێکدا بکەم، یان تا کۆتایی تەمەنم وەک جاڵجاڵۆکەیەک دانیشم و خەڵکی بخەمە داوەوە و شیلەی گیانیان بمژم!... پارەشم نەدەویست، سۆنیا؛ یانی لەو کاتەی کە نیازی کوشتنیم هەبوو، شتێکی ترم بەلاوە گرنگ بوو... ئەوە ئێستەیە کە تێدەگەم چ حاڵێکم هەبوو. هەوڵ بدە دەرکی پێ بکەی. لەوانەیە گەر هەمدیسان ئەو ڕێگەیەم بگرتبا بەر، لە کوشتنەوە نەگلابام. لەو ساتەدا شتێکی تر بەرەو پێش پاڵی پێوە دەنام و دەبوو سەر لە شتگەلێ دەربکەم؛ دەبوو تێبگەم کە ئاخۆ دواجار منیش وەک ئەوانی تر ئەسپێم یان مرۆڤ؟ ئایا دواهەمین هەنگاو بنێم؟ زاتم هەیە دانەوێم و ئەو شتە هەڵگرمەوە کە دەمەوێ، یان نا؟ منیش یەکێکم لەو کۆیلە ترسنۆک و لەرزۆکانە، یان سەرپشک و خاوەنمافم...

سۆنیا دەستی پێکدا کێشا:

– خاوەنماف بن کە مرۆڤ بکوژن؟

ڕاسکۆڵنیکۆف بە تووڕەیی هاواری کرد:

– ئاخ، سۆنیا!

دەتگوت بەتەمایە ناڕەزایی دەرببڕێت، وەلێ تەنیا لەتاو قین بێدەنگ بوو و کەمێک دواتر درێژەی دایێ:

– قسەم پێ مەبڕە، سۆنیا، تەنیا دەمویست ئەوەت بۆ بسەلمێنم کە دەتگوت لەو ساتەدا شەیتان چووەتە بنکەڵیشەمەوە و ئەوە ئەو بوو کە پاڵی پێوە دەنام. جا کە لە کارەکەش بوومەوە، تێی گەیاندم مافی ئەوەم نەبووە بچمە ئەوێ، چونکە منیش ئەسپێیەک بووم وەک ئەوانی تر! شەیتانیش دواتر قەشمەریی پێ کردم و ئەوەتا ئێستەش بێرە گەیشتووم! بەخێرهاتن لە میوانەکەتان ناکەن؟ ئەسپێیەکم و هاتوومەتە ئێرە بۆ لای تۆ، وا نییە؟ گوێ بگرە: ئەو ڕۆژەی کە چوومە سەروەختی پیرێژنەکە، تەنیا بۆ تاقیکردنەوە بوو... دەبێ ئەوە بزانی!

– کەچی لێتان دا و کوشتتان! کوشتتان!

– بەڵێ، وەلێ خۆت سەیرکە ئاخر ئەمە چ کوشتنێ بوو؟ کێ بەم جۆرە مرۆڤی کوشتووە؟ هەر بە ڕاست کەسێکت دیوە وەک من بکەوێتە ڕێ و بڕوا، کەچی کەسێکی تر لەناوبەرێ؟ ڕۆژێ بۆت باس دەکەم چۆن چوومە سەروەختی... ئەمانە لەلایەک، بەس یانی هەر بە ڕاستی من ئەو قرچۆڵەم کوشت؟ من خۆمم کوشت، نەک پیرێژنەکە! بە لێدانێکی کاری بۆ تاهەتا خۆمم لەنێو برد!... ئەو قرچۆڵەیەش شەیتان کوشتی، نەک من... بەسە، سۆنیا! بەسە! وازم لێ بێنە!

کتوپڕ دەنگی بەرز بووەوە و لەتاو پەشێوی پێچی دایە خۆی:

– دەستم لێ هەڵگرە، وازم لێ بێنە!

ڕاسکۆڵنیکۆف ئەنیشکەکانیی خستنە سەر ئەژنۆکانی و لە قولاپی دەستەکانیدا سەریی شاردەوە.

– خوایە، چ ئەشکەنجەیەک بوو ئەمە!

سونیا بێ ویست دەیناڵاند.

ڕاسکۆڵنیکۆف کتوپڕ سەری هەڵبڕی و بە دەموچاوێکی قەڵس و گرژ لەتاو هەناسەساردی، چاوی بڕییە سۆنیا:

– دەی، ئێستە دەبێ چی بکەم؟ تۆ بڵێ!

– دەپرسی دەبێ چی بکەم؟

سۆنیا لە جێگەکەی قووت بووەوە. کتوپڕ بریقە کەوتە چاوە فرمێسکاوییەکانییەوە:

– هەستە!

جا دەستی خستە سەر شانی ڕاسکۆڵنیکۆف. گەنجەکە هەستایەوە و تاساوانە لەوی ڕوانی و سۆنیاش درێژەی پێ دا:

– هەر ئێستە دەچی لەسەر چوارڕیانەکە ڕادەوەستی، دەکەویە سەر ئەژنۆ، سەرەتا ئەو خاکە ماچ دەکەی کە حورمەتیت نەگرت و پاشانیش لەبەردەم هەموو دونیادا، لەئاست چوارقورنەی جیهاندا، سەر دادەنەوێنی و بە دەنگی بەرز بە هەموو خەڵکی دەڵێی: من بکوژم! ئەوسا خوا هەمدیسان ژیانت پێ دەبەخشێتەوە. خۆ دەڕۆی، ئەرێ؟ دەڕۆی؟

سۆنیا بە سەراپای لەرزۆکەوە دووبارە و سێبارە ئەمەی لە ڕاسکۆڵنیکۆف پرسییەوە. هەردووک دەستی گەنجەکەی گرتبوون و دەیگوشین و نیگا ئاگرینەکەیی لەو بڕیبوو.

ڕاســـکۆڵنیکۆف بەدیار کەفوکوڵە نامۆکەی ســـۆنیاوە دۆش داما و مەینەتبارانە پرسیی:

– مەبەسـتت سـیبیریایە یانی، سـۆنیا؟ یانی بڕۆم و خۆم ڕادەسـت بکەم؟

– ئازار بکێشە و باجی کارەکەت بدە تا نەجاتت بێ.

– نا، من ناچم.

سۆنیا هاواری کرد:

– ئەی بـاقیی ژیـانـت چیی لێ دێ؟ چۆن دەتەوێ بژیی؟ ئەوە نەکردەیە! باشـــە چۆن دەتوانی قســـە لەگەڵ دایکت بکەی؟ خوایە، تۆ بڵێی ئەوان چییان بەسەر بێ؟ بەس منیش قسەی بەلاش دەکەم! وازت لە خوشک و دایکت هێناوە، وا نییە؟ بە تەنیا جێت هێشتن، وایە؟

بەرزتر لە جاری پێشوو هاواری چووە ئاسمان:

– ئای خوایە! وەلێ خۆ خۆیان لە من باشـــتر ئەمانە دەزانن! ئاخر چۆن دەتوانن تەنیا و بێکەس بژین؟ ئێستە بڕیارە چیتان بەسەر بێ؟

ڕاسکۆڵنیکۆف بە نەرمی گوتی:

– منداڵ مەبە، ســـۆنیا! باشـــە من لەبەرانبەر ئەوانەدا تووشـــی چ گوناهێک بوومە؟ بۆ دەبێ بچم خۆم بە دەســـتەوە بدەم؟ باشـــە دەبێ من بچم چی بڵێم؟ ئەمە هەمووی خەیـاڵاتە... خۆیـان ملیۆنـانملیۆن مرۆڤ دەخەنە بەر دەمی تیغەوە و زۆریش شـــانازیی پێوە دەکەن. کۆمەڵێ نارەســـەن و چەپەڵن ئەمانە، ســـۆنیا!... من خۆم ڕادەســـتی ئەمانە ناکەم. گریمان خۆم ڕادەست کرد، ئەی چییان پێ بڵێم؟ بڵێم من

پیرێژنەکەم کوشــــتووە، وەلێ زاتم نەبوو پارەکەی بۆ خۆم هەڵگرم و تەنیا بردم و خستمە ژێر تلێکەوە[1]؟

بزەیەکی تاڵی کرد و درێژەی پێ دا:

– تەنیا پێم پێدەکەنن و دەڵێن *باشــە تۆ چ گەمژەیەکی کە پارەکەت نەبرد؟ هەم ترسنۆکی و هەم گەمژە!* ئەمانە لە هیچ تێناگەن و شیاوی ئەوەش نین تێی بگەن! بچم بۆ لای ئەوانە؟ نا، من ناچم! تۆش منداڵ مەبە، سۆنیا...

– بارێکی زۆر قورسە، بەرگەی ناگری!

ســۆنیا تکاکارانە دەســتەکانی بەرەو ڕاســکۆڵنیکۆف درێژ کردن و هەمدیسان گوتییەوە:

– بارێکی زۆر قورسە!

ڕاسکۆڵنیکۆف خەفەتبار و وەک ئەوەی لە فکردا ڕۆچووبێت، گوتی:

– ڕەنگە لەبــارەی خۆمەوە بێویژدانیم کردبێ. ڕەنگە هێشـــتا مرۆڤێکی ڕاستەقینە بم، نەک ئەسپێیەک... چ پەلەیەکم بوو بۆ سزادانی خۆم! لەوانەیە هێشتا بتوانم بجەنگم.

بزەیەکی پڕ لە شکۆ ڕێی بەرەو سەر لێوەکانی خۆش دەکرد.

– ئاخ، وای لەو بارە قورسە! جا تا کۆتای تەمەنیش!...

– پێی ڕادێم.

دوای تێپەڕینی خولەکێک درێژەی پێ دا:

– گوێ بگرە، گریان و شــیوەن بەســە! هاتم پێت بڵێم بەدوامەوەن، شوێنیان هەڵگردووم...

---

١. تل: بەردی گەورە؛ هەڵبەتە بچووکتر لە تاشەبەرد.

سۆنیا تۆقیوانە هاواری کرد:

– واااای!

– جا بۆ دەیکەیە واوەیلا؟ خۆ تۆ دەتویســـت من بنێریە ســـیبیریا، چی بوو؟ ئەی بۆچی ترســـای؟ وەلێ بیریان لە شـــتێ نەکردووەتەوە: بڕیار نییە لێگەڕێم چییان دەوێ بیکەن! هێشـــتا بەشـــی ئەوە هەســـتی ململانێ لە ناخمدا هەیە کە نەهێڵم کارەکەیان بەرەو پێش ببەن. جا هیچ بەڵگەیەکی ڕێکوپێکیشـــیـــان بە دەســـــتەوە نییە. دوێنێ خراپ کەوتبوومە مەترســـــییەوە و تەنـانەت خۆشـــــم گوتم ئیتر یـارییەکە گەیشتووەتە کۆتایی! بەس ئەمڕۆ هەموو شتێ باشتر دیارە. بەڵگەیەک، شـتێکیشـیان گەر بەدەسـتەوە بێ، لە بنەڕەتەوە شـمشـێری دوودەمە، یـانی دەتوانم هەر تۆمەتێک کە دەیـدەنە پـاڵم بە ســـــوودی خۆم هەڵیبگێڕمەوە، حاڵی دەبی یان نا؟ هەر واش دەکەم، ئیتر چاک شارەزا بوومە!... وەلێ گومان لە گرتنمدا نییە، ئەمەیان نکوڵیی لێ ناکرێ! گەر ئەمڕۆش بە بێوەیی دەرچووم تەنیا بەخت یـاوەرم بووە! هەڵبەتە تـا بەیانی کات زۆرە و لەوانەیە هەر ئەمڕۆش بمگرن! بەس کێشـــە نییە، ســـــۆنیا. هەمدیســـــــان بەرم دەدەنەوە، چونکە بەڵگەیەکی گرنـگ و دادگەپەســـەندیان بە دەســـتەوە نییە و بڕیاریش نییە بێتە دەســـتیان. سوێند دەخۆم! ئەو شتانەی کە کۆیان کردوونەتەوە، بۆ خستنەزیندانی کەسێ بەس نین. دەی، بەسە ئیتر... تەنیا دەمویست ئاگادار بی.... تەنیا دایک و خوشـــکم دەمێننەوە، کە هەوڵ دەدەم ئەوانیش بێخەم بکەم... خوشـــکم جارێ لام وایە لە مەترســـــی تێپەڕیوە و... هەر لەبەر ئەوە دایکیشـــــم.... تەواو. وەلێ تۆش هۆشـــــت لای خۆت بێ. گەر بکەومە زیندان، خۆ دێیە سەردانم؟

– دێم! بە دڵنیاییەوە دێم!

شانبەشانی یەکدی دانیشتن. هێندە کەساس و تێکشکاو بوون کە دەتگوت زریانێک ئەوانی شـــۆردووەتەوە و بە تەنیا فڕێی داونەتە قەراخێکی چەپەکەوە. ڕاســـکۆلنیکۆف لە ســـۆنیای ڕوانی و پڕ بە دڵ هەســـتی بە مەزنیی عەشـــقی ئەو کرد. ســـەیرتر ئەوە بوو کە ئەو بڕە عەشقە کتوپڕانەیەی ئازاربەخش هاتە بەرچاو. ئای لەو هەستە نامۆ و تۆقێنەرە! کە بەدەم هەنگاونانەوە دەهات بەرەو ماڵی ســـۆنیا، هەســـتی دەکرد گشت هیوایەکی بە ئەوە و تاکە ڕێی ڕزگارییەتی. چاوەڕێ بوو بتوانێت لانیکەم بەشـێک لە باری ئەشـکەنجەکەی لە کۆڵ بێتەوە. وەلێ ئێســـــتە کە دڵی ســـــۆنیا بووبووە هی ئەو، کتوپڕ هەتا دڵ حەز بکات خۆی خەمگینتر لە پێشوو دەبینی.

– سۆنیا، ئەسڵەن وا باشترە هەر نەیێیتە زیندان بۆ دیدەنیم.

ســـــۆنیا وەڵامیی نەدایەوە و خەریکی گریان بوو. چەند خولەکێک تێپەڕی.

– خاچتان هەیە؟

سۆنیا هێندە بێپێشـەکی ئەمەی پرسـی وەک بڵێیت کتوپڕ بە زەینیدا هاتبێت.

ڕاسکۆلنیکۆف سەرەتا لە مەبەستی تێنەگەیشت.

– دیارە کە نیتانە! پرســـینی ناوێ! ها، ئەمە بگرن، تەختەییە. من دانەیەکی ترم هەیە کە لە مســـــە، هی لیزاڤێتا بوو. پێکەوە خاچ و ئەم جۆرە شتانەمان دەگۆڕینەوە. لەم دواییانەدا خاچەکەیی پێدام و منیش کۆتەڵێکی بچکۆلەم دایێ. ئێســـــتە خـاچەکەی لیزاڤێتـا دەکەمە ملم و ئەمەیان دەدەمە ئێوە. بیگرن... هی خۆمە! خاچی خۆمە!

سۆنیا لێی پاڕایەوە خاچەکە بگرێ.

– هەردووکمــان پێکەوە ئەشـــکەنجە دەکێشـــین و پێکەوەش خاچەکەمان کێش دەکەین!....

ڕاسکۆلنیکۆف گوتی:

– بمدەرێ.

نەیدەویست دڵی سۆنیا بشکێنێت، بەڵام هەر هەمان سات دەستیی کشاندەوە.

– ئێستە نا، سۆنیا... با بۆ دوایی.

دواهەمین ڕستەی بۆ ئاسوودەکردنی کچەکە زیاد کرد.

سۆنیا بە پەرۆشییەوە قسەکانی ئەوی دووبارە کردنەوە:

– بەڵێ، بەڵێ، بـاشـــتر وایە بۆ دوایی بێ. کە دەچنە ئەوێ تـا ئەشـــکەنجەکەتان بکێشـــن، بیکەنە ملتان، یانی دێنە لای من و منیش دەیکەمە ملتان، پاشانیش دوعا دەکەین و پێکەوە دەچین.

ڕێک لەو ســاتەدا ســێ جار لە دەرگەیان دا و دەنگێکی ناســراویان هاتە گوێ کە بەڕێزانە دەیگوت:

– سۆنیا خاتوون، سۆنیا خاتوون، دەکرێ بێمە ژوور؟

ســـۆنیــا بە هەراســـــانی پرتــاوی کردە لای دەرگەکە و بەڕێز لیبیزیــاتنیکۆف بەو ســـــەر و ڕووە بۆرەیەوە ملی درێژ کردە نــاو ژوورەکەوە.

# پێنج

لیبیزیاتنیکۆف پەشۆکاو دەهاتە بەرچاو.

– سۆنیا خاتوون، هاتووم چاوم پێتان بکەوێ. ببوورن... سۆسەم دەکرد ئێوەش لێرە بدۆزمەوە (کتوپڕ ڕووی کردە ڕاسکۆلنیکۆف) مەبەستێکم نەبوو... نەبێتە هەڵەتێگەیشتن... تەنیا وای بۆ چووم لێرە بن... ئەوەی ڕاستی بێ، کاترینا ئیڤانۆڤنا ئەقڵی لەدەست داوە!

وازی لە ڕاسکۆلنیکۆف هێنا و دیسان ڕووی لە سۆنیا کردەوە و دەتگوت بەبێ ویست دواهەمین ڕستەی لە دەم دەرپەڕی.

سۆنیا هاواری کرد.

– یانی لانیکەم وا دەردەکەوێ کە شێت بووە! وەلێ... ئاخر ئێمەش نازانین دەبێ چی بکەین و ئەمەش بۆمان بووەتە کێشە! کاترینا ئیڤانۆڤنا گەڕاوەتەوە، ئێستە لە ماڵەوەیە. وا دیارە لەو شوێنە وەدەریان ناوە کە بۆی چووبوو و لەوانەیە لێشیان دابێ... ئەوەی ڕاستی بێ مەسەلەکە ئەوەیە... چووە بۆ لای بەڕێوەبەرەکەی باوکتان، وەلێ ئەو لە ماڵ نەبووە، لە ماڵی جەنەراڵی کەسێ بۆ فراوێن میوان بووە... بیهێننە بەرچاوتان، کاترینا ئیڤانۆڤناش بە ڕاکەڕاک دەچێتە شوێنی... جا باوەڕ ناکەن، بە جۆرێ لەسەر ئەوە سوو بووە هەر دەبێ سەرۆک ببینێ، کە دواجار بە ناچاری کابرا لەسەر مێز هەڵدەستێننەوە بۆ دەرێ. دەی ئیتر، خۆتان دەتوانن ئەوی تری بهێننە بەرچاوتان. بێگومان وەدەری دەنێن؛ وەلێ بەو جۆرەی کە کاترینا ئیڤانۆڤنا خۆی دەڵێ پێشتر جنێوێکی زۆری پێ داوە و تەنانەت

شتێکیشی گرتووەتە کابرا. ئاخر، ئەمە لە کاترینا ئیڤانۆڤنا دەوەشێتەوە و بە هیچ شێوەیەک لێیەوە بەدوور نییە... وەلێ ئەوەی کە چۆن بێوەی بۆی دەرچووە و نەیانگرتووە، ئەقڵی منیش نایبڕێ! وا ئێستەش حەشەریکی ناوەتەوە و خەریکە بەسەرهاتەکەی بۆ هەمووان دەگێڕێتەوە و خاوەنماڵیش لەوێیە! وەلێ ناکرێ بە باشی تێی بگەی چی دەڵێ، هێندە دەچیقێنێ و بە دەموچاویدا دەکوتێ... واوەیلایەکی ناوەتەوە هەر مەپرسە... دەڵێ ئێستە مادام هەمووان پشتیان تێ کردووە، ئەویش مناڵەکان دەبا و بە کەرەستەیەکی مۆسیقی یان شتێکەوە دەکەوێتە گەڕان بە کۆڵان و شەقامەکاندا و مناڵەکان هەم گۆرانی دەڵێن و هەم سەماش دەکەن، هەڵبەت بە خۆیشییەوە، تا پارە لە خەڵکی وەرگرن و هەموو ڕۆژێکیش دەچنە بەر پەنجەرەی ئەو جەنەراڵە تا وەک خۆی دەڵێ *هەمووان ببینن کە مناڵە هەتیوی فەرمانبەرێکی فەرمیی دەوڵەت چۆن کاسەی سواڵیان بە دەستەوە گرتووە.* هەیتاهەیتاش لە مناڵەکان دەدا و ئەوانیش کەوتوونەتە قیژە و گریان. خەریکە لیدا فێری گۆرانیی خوتاراک دەکا. کوڕیژگەکە و پۆلینکاشی ناچار کردوون سەما بکەن. خەریکە جلوبەرگەکەشیان دەدڕێنێ تا ئەو کڵاوانەی پێ دروست بکا کە هونەرمەندەکان دەیاننێنە سەریان. دەیەوێ لەجیێ ساز تەشتی جلشۆردنەکەتان بگرێ بە دەستییەوە و بە شاردا بکەوێتە گەڕان... هیچیش ناچێ بە مێشکیا... جا بهێننە بەرچاوتان کە تووشی چ بەزمێ هاتووین! پێویست بە گوتن ناکا!

گەر وازت لە لیبیزیاتنیکۆف بهێنابا تا بەیانی دەدوا، بەڵام سۆنیا کە تا ئەو ساتە بە هەناسەتەنگییەوە گوێی گرتبوو، لەناکاو پڕی بە کۆڵوانە و کڵاوەکەیدا کرد و لە ژوورەکە فڕکەی کردە دەرێ و بەدەم ڕاکردنەوە لە بەری کردن.

ڕاســـکۆڵنیکۆف بەدوای ســـۆنیادا ڕایکرد. لیبیزیاتنیکۆفیش کەوتە دوایان و لەو کاتەی کە خەریک بوون هەنگاویان دەنایە ســـەر شەقامەکە، بە ڕاسکۆڵنیکۆفی گوت:

– ژنە بە یەکجاری شێت بووە و هیچ گومانێکیشی تێدا نییە! گوتم با سۆنیا خاتوون نەترسێ، لەبەر ئەوە گوتم *لانیکەم وا دێتە بەرچاو*؛ بەس ئەم ژنەتیوە هەر بە ڕاستی ئەقڵی لەدەست داوە. دەڵێن ئەوانەی کە تووشی سیل دەبن، هەندێ جار سیلەکە لە مێشکیان دەدا؛ منیش بۆ نەگبەتی هیچ لە پزیشـــکی نازانم! هەوڵم دا ئەوەی تێبگەیەنم، وەلێ ئەم شتانەی بە مێشکدا ناچن.

– باسی کاریگەریی سیلت لەسەر مێشک بۆ کرد؟

– نا، قســـە لەســـەر ســـیل نەبوو، جا خۆ گەر بشـــمگوتبا هەر تێنەدەگەیشت! بەس قسەی من ئەمەیە: گەر بتەوێ بە لۆژیک کەسێ قایل بکەی کە شـــتێکی وا ڕووی نەداوە تا ئەم فینگەفینگی بۆ بکا، ئەویش واز لە گریان و شـیوەن دەهێنێ! ئەمە وەک ڕۆژ ڕۆشـــنە! بە بۆچوونی ئێوە وا نییە؟

ڕاسکۆڵنیکۆف وەلامی دایەوە:

– ئاخر، گەر وا بێ ژیان زیاد لە ڕادە ئاسان دەبێ!

– مۆڵەت بدەن، مۆڵەت بدەن تکا دەکەم! هەڵبەتە بۆ کاترینا ئیڤانۆڤنا ئەوەندەش ئاســـان نییە لەم شـــتانە تێبگا، وەلێ پایەبەرز ئەســـڵەن ئاگادارن کە لە پاریس خەریکی ئەنجامدانی چەند تاقیکردنەوەیەکی گرنگن تا بزانن دەکرێ تەنیا بە گوتوبێژی لۆژیکی شێتەکان هان بدەن و چارەسەریان بکەن؟ یەکێ لە خوێندکارە دیارەکان کە لەم دواییانەدا مردووە، شـێوازەکەشـی دیاری کردبوو. بڕوای وا بووە شـێتەکان لە ڕووی جەستەییەوە هیچ کێشـەیەکیان نییە و شـێتی لە بنەڕەتدا جۆرە

خەوشـــێکە لە لۆژیک و هێزی جیاکردنەوەدا، یانی جۆرە ڕوانینێکی هەڵە بۆ هەموو شـــتێ. پرۆفیســـۆر هەنگاو بە هەنگاو خەوشـــەکانی نەخۆشـــە شـــێتەکەی دیاری کردوون و بـاوەڕ دەکەن کە دەڵێن گەیشـــتووەتە ئەنجامگەلێکیش! وەلێ لەبەر ئەوەی لەتەک ئەمەشـــەوە ســـوودی لە شـــێوازی چارەســـەرکردن لە گەرماویشـــدا وەرگرتووە، نازانی بڵێی تا چ ڕادەیەک ســـەرکەوتنەکەی لەســـایەی شـــێوازە تازەکەیەوە بووە... لانیکەم بە ڕواڵەت وا دەردەکەوێ.

ڕاســـکۆلنیکۆف دەمێـک بوو کە ئیـدی گوێی لە قســـەکـانی لیبیزیـاتنیکۆف نەدەگرت و کە گەیشـــتنە مـاڵەکەی، ســـەرێکی بۆ لیبیزیـاتنیکۆف لەقـانـد و چووە ژوور. لەگەڵ ڕۆیشـــتنی ئەو لیبیزیـاتنیکۆف ڕاچەنی و وەک ئەوەی لە خەو ڕاچڵەکیبێـت؛ تەماشایەکی چواردەوریی کرد و بە پەلە کەوتەوە ڕێ.

ڕاسـکۆلنیکۆف چووە سـەرێ بۆ سـندووقەماڵەکەی و بێ جووڵە لە ناوەڕاستی ژوورەکەیدا ڕاوەستا. بۆچی گەڕابووەوە ئەوێ؟ سەیرێکی کـاغەزدیوارییە زەردە پواوەکە و چینەتۆز و قەنەفەکەی کرد و... لە حەسارەکەوە بێ وەستان دەنگی لێدانێک دەهات، وەک ئەوەی کەسێک بە چەکوش تەقەتەقێکی نابێـــتەوە... چووە بەرپەنجەرە، لەسەر سنگی پێ ڕاوەســـتا و تا ماوەیەکی زۆر بە حەســـاری ئەو ناوەدا واق بوو. بەڵام حەوشـەکە خاڵی بوو و ڕاسـکۆلنیکۆف نەیدەتوانی بزانێت کێیە چەکوش دەوەشـــێنێت. تاک و تەرا پەنجەرەکانی ماڵی لای چەپیان کرابوونەوە. گوڵدانگەلی گوڵەشـەمالیی ژاکاو و بێرەنگیان خسـتبوونە ســـەر هێرەکان[1] بەســـەر تەنافی بەرپەنجەرەکانیشـــەوە جلیان هەڵخســـتبوو... بەڵێ، ئەم دیمەنەی لە بەر بوو. لە پەنجەرەکە دوور کەوتەوە و لەسـەر قەنەفەکە دانیشـت. لە تەمەنیدا هەرگیز هێندەی ئەو

---

١. ڕیزە خشت یان کاشی و بەردی دەرهاتوو لە قاڵبی دیوار و گوێسەربانەدا.

ساتە ئاوها بە تۆقینەری هەستی بە تەنیایی نەکردبوو! بەڵێ، دووبارە هەمانْ ئەو هەستە کەوتەوە گیانی کە لەوانەیە ڕقی لە سۆنیا بکەوێت، بەتایبەت لەبەر ئەوەی ئێستە خۆی ئازارێکی بۆ ئازارەکانی ئەو زیاد کردبوو. باشە بۆچی چووبووە لای ئەو؟ تا فرمێسکی بۆ بڕێژێت؟ بۆچی دەبوو ژیانی ئەو کچەش لەناو ببات؟ ئاخ، لەو بچووکییە!

کتوپڕ لێبڕا: *بە تەنیا دەمێنمەوە. بڕیار نییە سۆنیاش پێی بنێتە زیندانەوە!*

پێنج خولەک دواتر، سەری هەڵهێنا و بزەیەکی غەریبی کرد. فکرێکی سەیر کەوتبووە سەرییەوە: *خۆ لەوانەیە چوونەسیبیریاشم خراپ نەبێ!* خۆیشی کتومت نەیدەزانی بڵێت چەندێکە لەوێ دانیشتووە و ئەم جۆرە بیرکردنەوانە لە زەینیدا ڕیزیان بەستووە. کتپڕ دەرگە کرایەوە و دونیا هاتە ژوور. هەڵبەتە سەرەتا لە بەردەرگەدا ڕاوەستا و سەیری براکەیی کرد، ڕێک وەک پێشتر کە براکەی بەدەم سەیرکردنییەوە ڕاوەستابوو. پاشان هاتە ژوور و لە هەمان شوێنەکەی دوێنێ ڕووبەڕووی ئەو دانیشت. ڕاسکۆڵنیکۆف لە بێدەنگیدا لەو ڕامابوو، بە جۆرێک کە وەک بڵێیت هیچ شتێکی لە زەیندا نەبێت.

دونیا گوتی:

– ناڕەحەت مەبە، براکەم. یەک خولەک زیاتر نامێنمەوە.

دونیا تێفکر بوو، بەڵام بێتاقەت نا. نیگای نەرم بوو و چاوەکانی درەوشاوە. ڕاسکۆڵنیکۆف سەیری کرد ئەم کچەش ئەویندارانە هاتووە بۆ لای.

– براکەم، من ئیتر هەموو شتێ دەزانم؛ هەموو شتێ! ڕازومیخین هەموو شتێکی پێ گوتم. لەبەر گومانێکی پڕوپووچ و جێی

شەرمەزاری و گەمژانە داماویان کردووی و بەدواتەوەن... ڕازومیخین پێی گوتم هیچ مەترسییەک لەئارادا نییە و تۆ لەخۆڕا ئاوها ترست لێ نیشتووە. وەلێ من وا بیر ناکەمەوە و ئێستە ڕێک تێدەگەم کە چەندە لە بەردڵت گران بووە و ڕەنگە تاهەتا برینەکەی بە ڕۆحتەوە بمێنێ. من لەوە دەترسم. لەسەر ئەوە داوەریت ناکەم کە وازت لە ئێمە هێناوە، نە ئێستە و نە دواتریش مۆڵەتی داوەری بە خۆم نادەم. هەروەها، بیوورە کە ئەو کاتە سەرکۆنەم کردی. زۆر باش دەتوانم وێنای بکەم کە ئەگەر ئەم نەگبەتییە تووشی من بووبا، منیش لە هەمووان دادەبڕام. لەبارەی ئەم بابەتەوە هەڵبەتە هیچ بە دایکم ناڵێم، وەلێ باستی بۆ دەکەم و لە زمانی تۆوە پێی دەڵێم زوو سەردانی دەکەی. خەمی دایەت نەبێ، ئەو لەسەر من! خۆم ئاسوودەی دەکەم. وەلێ تۆش لەوە زیاتر ئەشکەنجەی مەدە؛ لانیکەم یەک جار وەرە دیدەنیی. بیرت نەچێ، ئەو دایکتە! تەنیا و تەنیا بۆ ئەوە هاتوومە ئێرە تا پێت بڵێم (دونیا نیوخێز بوو تا بڕوات) گەر من کارێکم لەدەست دێ بۆت یان شتێکت لێم ویست... گیانم یان هەر شتێ بێ... ئاگادارم کە تا بێم، چونکە بێگومان دێم. خوا ئاگادارت بێ!

– دونیا!

ڕاسکۆڵنیکۆف بەری بە ڕۆیشتنی خوشکەکەی گرت و خۆی پێ گەیاند:

– ئەم ڕازومیخینە، یانی دیمیتری پراکۆفیچ، کەسێکی باشە!

کوڵمەکانی دونیا ڕەنگێکیان تێکەڕا و کە خولەکێک تێپەڕی، پرسیی:

– ئێ؟

– ئەم کوڕە، نەجیبە، ئیشکەر و زەحمەتکێشیشە؛ خۆشەویستییەکەی ڕاستەقینەیە... خوا ئاگادارت، دونیا گیان.

دونیا ئەم جارەیان تا بناگوێ سـوور هەڵگەڕا و کتوپڕ ترسـی لێ نیشت:

– وەلێ مەبەسـتت لەم قسـانە چییە، براکەم؟ بۆ بڕیار وایە تاهەتا لێک دابڕێین کە تۆ... ئامۆژگاریی کۆتا ساتت دەکەی؟

– جارێ ئەمە گرنگ نییە... بڕۆ بە بێوەیی.

ڕاسـکۆلنیکۆف ڕووی لە خوشـکەکەی وەرگێڕا و چووە لای پەنجەرەکە. دونیا بۆ خولەکێک ڕاوەسـتا و بە نارەحەتی لەو ڕاما؛ پاشانیش دڵخورت و بە بیرێکی قاڵەوە ژوورەکەی جێ هێشت.

نا، هەڵسـوکەوتی لەگەڵ خوشـکەکەیدا بە هیچ شـێوەیەک سـارد نەبوو. کتوپڕ پڕ بە دڵ حەزی دەکرد توند دونیـا بگرێتە بـاوەش و هەموو شـتێکی پێ بڵێـت و مـاڵئـاوایی لێ بکـات، بەڵام تەنـانەت نەشیتوانیبوو دەستی بگرێت.

*ئەگەر باوەشم پێدا بکردبا، پاشان کە بیری دەهاتەوە ئازای ئەندامی دەکەوتە لەرزین و بە خۆی دەگوت فریوی خواردووە و بێ ئەوەی بزانێ منی بکوژی ماچ کردووە!* چەند سـاتێک دواتر لەبەرخۆیەوە درێژەی پێ دا: *یانی ئەمەش مرۆڤێکە وەک ئەو کچەی تر بەرگەی ئەم تاقیکردنەوەیە دەگرێ؟ نـا، ناتوانێ خۆی ڕاگرێ. ئەم جۆرە مرۆڤانە دەرەقەت نایێن.*

جا داڵغەی دونیا بردییەوە.

شـنەیەکی فێنک لە پەنجەرەکەوە دەهاتە ژوورێ. دونیا ئیدی تەواو ڕۆشن نەبوو. ڕاسکۆلنیکۆف کڵاوەکەیی هەڵگرت و چووە دەر.

گرنگیی بە بارودۆخ و نەخۆشییەکەی نەدەدا و ئەسڵەن نەیدەتوانی خەم لەو شـتانە بخوات. بەڵام دڵەڕاوکێی بەردەوام و کێشـمەکێشـێکی ئەشکەنجاوی کاریگەریی نەرێنیی خۆی خستبووە سەر زەینی. گەر تا

ئێستەش بەو تایە تووشە لە پێ نەکەوتبوو، ئەوا لەوانەبوو تەنیا لەبەر ئەو شڵەژان و هەڵچوونە بەردەوامە دەروونییە بووبێت. خرۆشان بە پێوە دەیهێشتەوە و دەبووە هۆی ئەوەی تا ڕادەیەک ئەقڵی وەک خۆی بمێنێتەوە؛ گەرچی ئەم بارە، کاتی بوو و نەدەکرا بەردەوامیی هەبێت.

بێ ئامانج بە شەقامەکاندا دەسووڕایەوە. خۆر لە ئاوابووندا بوو. لەم دواییانەدا جۆرە دڵەڕاوکێیەکی دیکە یەخەی گرتبوو. شتێک نەبوو کە ئازارێکی ئەوتۆی بدات یان لە ناخەوە بیسووتێنێت، بەڵام بە جۆرێک لە جۆرەکان وای هەست دەکرد کە دەشێت دوایی نەیێت. دەتگوت بڕیار وایە تاهەتایە بەردەوام بێت، جا ساڵ دوای ساڵیش بیرهێنەرەوەی پەشێوییەکی تاڵی بێکۆتا و دڵتەزێن بێت لە هەمان ئەو بستە زەوییەدا. باری ئەم دڵەڕاوکێ تازەیە هەمیشە دەمەوئێواران قورستر دەبوو و زیاتر ئەشکەنجەی دەدا. زۆر کەسانە لەژێر لێوەوە ناڵاندی کە *بەڵێ دەی، بەم لاوازییە جەستەییە گەمژانەیە و بارودۆخێکەوە کە وابەستەی هەڵهاتن و ئاوابوونی خۆر و سەدان شتی گاڵتەجاڕانەی ترە، دەی خۆ دیارە کە مرۆڤ کاری گەمژانەی لێ دەوەشێتەوە! جا لە سۆنیا گەڕێ، گەر وا بڕوا دونیاشی دێتە سەر.*

گوێی لێ بوو یەکێک بانگی دەکات و ئاوڕی لە دەنگەکە دایەوە. لیبیزیاتنیکۆف بوو کە بە ڕاکەڕاک هاتبووە شوێنی.

– چوومە ماڵەکەتان، لەوێ نەبوون! باوەڕ دەکەن، کاترینا ئیڤانۆڤنا کاری خۆی کرد! منداڵەکانی بردوون و ڕۆیشتووە. من و سۆنیا خاتوون گیانمان دەرهات تا دۆزیمانەوە! خانمخاس بە تاوەیەک کەوتووەتە تەپڵێدان و خەریکە سەما بە منداڵەکان دەکا. منداڵەکانیش هەر وا فرمێسک دەڕێژن. بەم دۆخەوە لەسەر چوارڕیان و لەبەردەم هەموو دوکانەکاندا ڕادەوەستن و کۆمەڵێک شێتوشووریش بەدوایانەوەن. وەرن با بڕۆین.

ڕاسکۆڵنیکۆف کەوتە شوێن لیبیزیاتنیکۆف و بە دڵخورتی پرسیی:

– ئەی سۆنیا؟

– بە تەواوی ئەقڵی لەدەست داوە ئەم ژنە؛ کاترینا ئیڤانۆڤنا دەڵێم، نەک خاتوو سۆنیا! هەڵبەتە خاتوو سۆنیاش تێک چووە، وەلێ کاترینا ئیڤانۆڤنا شێت بووە. لە منی وەرگرن، ئەوەی کە پێی دەڵێن شێتی پەتبڕ، ئائەمەیە! دواجار ڕاپێچی بنکەی پۆلیسیان دەکەن و خۆشتان دەزانن ئەم کارە چیی بەدوادا دێ... ئێستە لەسەر پردەکەن، لە نزیک ماڵی سۆنیا خاتوونەوە؛ لێیانەوە دوور نیین.

لە نزیک پردەکە و تۆزێک لەولاتری ماڵی سۆنیاوە، کۆمەڵێک خەڵک کۆ بووبوونەوە کە زۆربەیان منداڵە وردکە بوون. تەنانەت دەکرا لەسەر پردەکەشەوە دەنگی گیراو و پچڕپچڕی کاترینا ئیڤانۆڤنا ببیستیت. هەر بە ڕاستی دیمەنێکی سەیر بوو و جێی سەرسامی نەبوو کە کۆمەڵێک بەدەم سەیرکردنییەوە ڕابوەستن. کاترینا ئیڤانۆڤنا بەو کراسە کۆن و شاڵە سەوز و کڵاوە حەسیرییە شڕووڕەوە کە لایەکی خراپ پلیشابووەوە، هەر بە ڕاستی وەک شێتێک دەهاتە بەرچاو. هەتا بڵێیت ماندوو بوو و هەناسەتەنگ. دەموچاوە سیلاوییەکەی زیاتر لە هەر کاتێک ئازاراوی و مەینەتبار بوو، گەرچی دۆخی سیلاوییەکان دایمە لە کەشی کراوە و لە بەر تیشکی خۆردا زیاتر لەو کاتانە بەئازار دێتە بەرچاو کە لە ماڵەوەن، کەفوکوڵی دانەدەمرکایەوە و خولەک دوای خولەک تووڕەتریش دەبوو. وازی لە منداڵەکان نەدەهێنا؛ یان هەیتاهەیتا پێیاندا هەڵدەشاخا یان بە بەقوربان و بەساقە هانی دەدان و هەر بە بەرچاوی خەڵکییەوە پێی دەگوتن دەبێت چۆن سەما بکەن و پێویستە چ گۆرانییەک بڵێن. تەنانەت ڕوونیشی دەکردەوە بۆچی دەبێت ئەم کارانە بکەن و کە سەیریشی دەکرد لە قسەکانی تێناگەن، بە جۆرێک تیاماو و پەست دەبوو، کە دەکەوتە گیانیان و لێشی دەدان... پاشان ڕووی لە خەڵکەکە دەکردەوە

و گەر لەنێویدا چاوی بە کەسێک بکەوتبا کە تەنانەت سووچێکی جلەکەشی لە هی کەسێکی ماقوول بچووبا، یەکسەر دەستەودامێنی دەبوو کە *سەیرکەن منداڵەکانی خێزانێکی ڕەسەن و تەنانەت بە جۆرێک لە جۆرەکان دەوڵەمەند، کەوتوونەتە چ ڕۆژێکەوە!* ئەگەریش دەنگی پێکەنینێکی بەرگوێ بکەوتبا یان تانەیەکی لە دەمی کەسێکەوە ببیستبا، هەڵمەتی بۆ دەبرد و چارەی دەکرد. هەندێک لە ناخی دڵەوە پێدەکەنین و هەندێکی دی سەریان ڕادەوەشاند، بەڵام هەمووان کونجکۆڵ بوون تا هەرچۆنێک بووە ملێک درێژ بکەن و بۆ جارێکیش بێت ئەم ژنە شێتە و منداڵە تۆقیوەکانی ببینن ئەو تاوەیەی لێ نەبوو کە لیبیزیاتنیکۆف باسی کردبوو یان لانیکەم ڕاسکۆڵنیکۆف نەیدەدیت. بەس کاترینا ئیڤانۆڤنا لەبری تەپڵلێدان، دەستە لاواز و وشکهەڵاتووەکانی پێکدا دەکێشان و هاوکات پۆلینکای ناچار دەکرد گۆرانی بڵێت و سەمای بە لیدا و کۆلیاش دەکرد. خۆیشی لەگەڵ پۆلینکادا گۆرانیی دەگوت، بەڵام بەر لەوەی بگاتە دووەم برگە، کۆکەیەکی سامناک دەنگیی دەبڕی و ئەویش ناچار دەکەوتە نەفرەتکردن و فرمێسکی دەڕشت. بەڵام ئەوەی کە زیاتر لە هەر شتێک ئاگری تووڕەیی ئەوی تاو دەدا، ترس و گریانی کۆلیا و لیدا بوو. دیاربوو کە هەوڵی داوە وەک گۆرانیبێژە سەرشەقامییەکان جل بکاتە بەری منداڵەکانی؛ وەک مێزەری سەری تورکەکان پارچەیەکی سوور و سپیی لە سەری کوڕیژگەکەوە پێچابوو، وەلێ نەیتوانیبوو کارێکی تایبەت بۆ لیدا بکات و تەنیا کلاوێکی سووری دەسچنی کە لە بنەڕەتدا شەوکلاوی مارمیلادۆڤی خوالێخۆشبوو بوو بە پەڕە وشترمەلێک (کە میراتی داپیرەی کاترینا ئیڤانۆڤنا بوو) ڕازاندبووەوە و کردبوویە سەری کچۆڵەکە. پۆلینکا هەمان جلەکەی جارانی لە بەردا بوو و دۆشداماو و شەرمن بە دایکیدا وڕ بووبوو و لەلای جمەی نەدەکرد. هەوڵی دەدا خەمناک دەرنەکەوێت، وەلێ سۆسەی دەکرد کە دۆخی دەروونیی دایکیان باش نییە و نارەحەت و ترساو لە

چواردەوریی دەڕوانی. ئەو شـەقامە و خەڵکەکەی زیرەی مەرگیان پێ کردبوو. ســـۆنیا هەنگاو بە هەنگاو بەدوای کاترینا ئیڤانۆڤنادا ڕێی دەکرد و بەدەم فرمێســـکڕشـــتنەوە لێی دەپاڕایەوە بگەڕێتەوە ماڵێ، وەلێ کاترینا ئیڤانۆڤنا ئەم قسانەی نەدەچوونە مێشکەوە:

– وازم لێ بێنە، سۆنیا، لە کۆڵم بەوە!

کاترینا ئیڤانۆڤنا دەیچیقاند و هەناســـەســـوار و هاوکات پەلەپەل دەکۆکی:

– خۆشـــت نـازانی چیت لە من دەوێ! هەر دەڵێی منـاڵی! خۆ پێشـتریش پێم گوتی دووپێم نانێمەوە ماڵی ئەو ژنەتیوە سـەرخۆشـە ئەڵمانییە! لێگەڕێ هەمووان ببینن، ئەسڵەن با هەموو پێتەربورگ ببینن کە ئەم منداڵە هەتیوانە بە کۆڵان و شەقامەکاندا کەوتوونەتە سواڵکردن؛ منداڵی فەرمانبەرێکی حورمەتدار کە بە درێژایی تەمەنی سـەرڕاسـت و ئـاوڕوودار خزمەتی کرد و دەکرێ بڵێی بەدەم خزمەتکردنیشـــەوە گیانی لەدەسـت دا! (کاترینا ئیڤانۆڤنا توانیبووی لە مێشـکی خۆیدا ئەم بابەتە ســەد لە ســەد خەیاڵییە هەراش بکات و ئێســتەش بە تەواوی بـاوەڕی پێی هەبوو) بـا ئەو جەنەراڵە چەپەڵە بێکەڵکەش ببینێ، چی لەوە باشتر! حۆلەحۆلی چیتە، سۆنیا. بڵێ بزانم، بەم حاڵەوە دەبێ چی بخۆین؟ ها؟ دە بڵێ ئیتر؟ تا ئێســـتەش زۆر تۆمان ئەزیەت داوە و قەرار نییە لێگەڕێم ئەمە درێژە بکێشــێ! ئاە، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ، ئەوە ئێوەن!

کاترینا ئیڤانۆڤنا کە ڕاسـکۆڵنیکۆفی بینی، هاواری چووە ئاسـمان و فڕکەی کردە لای:

– لانیکەم ئێوە ئەم کچە نەفامە تێگەیەنن کە چارەیەکی ترمان نییە! لەمە باشـتر چیمان لەدەسـت دێ؟ هەرچۆنێ بووە ژەنیارەکانیش هەر بە ژەنین نانی خۆیان پەیدا دەکەن. هەمووان زۆر زوو تێدەگەن ئێمە

لەوانی تر جیاوازین، تێدەگەن ئێمە لەو خێزانە ئاوڕووردار و بەڕێزە داخدارانەین کە لەسایەی ڕۆژگارەوە کەوتووینەتە سوالّکردن! ئەو جەنەراڵەش پۆستەکەی لەدەست دەدا، جا دەشیبینی! هەموو ڕۆژێ لە بەرپەنجەرەکەیدا بەرنامەیەک پێشکەش دەکەین و گەر تزار بەوێدا تێپەڕی، خۆم لە بەردەمیدا دەکەومە سەر ئەژنۆ و منالّەکان دەهێنمە پێش و نیشانی دەدەم و دەلّێم، *باوکە، تۆ هەقی ئێمە بستێنە!* تزار باوکی منالّە هەتیوەکانە، بەخشندەیە، دەستمان دەگرێ، جا دەشیبینن! ئەو جەنەراڵە ناپیاوەش... (لەم کاتەدا بە فەرەنسی گوتییە لیدا: پێت *دەلّێم ڕێک بوەستە!*) باشە ئیتر، کۆلیا، ئێستە نۆرەی سەمای تۆیە! ئەو نووزەنووزەت لە چییە؟ لە چی دەترسێی، گەمژە گیان؟ خوایە، ئاخر چی لەمانە بکەم؟ ئێوە بلّێن ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ! ئاخر ئێوە نازانن چەندە گەمژەن ئەم وردەلانە... باشە ئینسان چی لەمانە بکا؟

کاترینا ئیڤانۆڤنا کە خەریک بوو فرمێسکەکانی سەریان دەکرد – بەلام تەنانەت ئەوەش ڕەوتی خێرا و بێوەستانی قسەکانیی نەدەپچڕاند– ئەمەی گوت و بە دەست ئاماژەی بۆ منداڵە بێناز و چاوبەفرمێسکەکانی کرد. ڕاسکۆلنیکۆف هەولّی دا کاترینا ئیڤانۆڤنا ڕازی بکات بگەڕێتەوە مالّێ؛ تەنانەت بەهیوای ورووژاندنی خۆپەسەندییەوە گوتی سووڕانەوە بە شەقام و کۆلانەکاندا لە خاتوونێکی وەک ئەو ناوەشێتەوە کە بەنیازە ببێتەوە بەڕێوەبەری پانسیۆنی کچان.

– پانسیۆن، هاهاها! ئەمە هەمووی حەکایەتە، پانسیۆنی چی!

کاترینا ئیڤانۆڤنا بەدەم پێکەنین و هاوارەوە ئەمەی گوت، وەلێ پێکەنینەکەی بە کۆکە دوایی هات.

– نا، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ؛ ئەو خەون و خەیالانە بەسەر چوون! هەمووان ئێمەیان دایە دەست چارەنووس!... ئەو جەنەراڵە... گەر

ڕاستییەکەیتان دەوێ، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ، مرەکەبدانەکەم گرتە دەموچاوی؛ بە هەڵکەوت هاتە بەردەستم، لەسەر مێزی ژووری چاوەڕوانی بوو، لەتەنیشت هەمان ئەو پەڕەیەوە کە دەبێ سەردانیکەران ناوی خۆیانی لەسەر بنووسن و واژۆی بکەن. منیش ناوم نووسی و مرەکەبدانەکەم تێگرت و ڕام کردە دەرێ. سووکوچرووکینە! بەس ئەمە گرنگ نییە. لەمەودوا خۆم نانی منداڵەکان دەردێنم و سەر بۆ تاقە بەشەرێکیش دانانەوێنم! تا ئێستە بارگرانی بووین بەسەر ئەمەوە (بە دەست ئاماژەی بۆ سۆنیا کرد). ئادەی، پۆلینکا، چەند کۆ بووەتەوە؟ نیشانم دە ئادەی؟ هەمووی دوو کۆپیک؟ نەفرەت لە ویژدانیان! هیچ نادەن، تەنیا بە زمانی شۆڕەوە دوامان کەوتوون! دە فەرموو، ئەو کەللەپووچ و دەبەنگە، لەوێ... بە چی پێدەکەنێ؟ (ئاماژەی بە کەسێکی نێو خەڵکەکە کرد) هەچی دەکێشین بەدەست گێژیی ئەم کۆیلانەوەیە! پیری کردووم ئەم منداڵە! چییە، پۆلینکا؟ هەر قسەیەکت هەیە دەبێ بە فەڕەنسی بیڵێی! *Parlez-moi Fracais*! بە فەڕەنسی قسەم لەگەڵ دەکەی! خۆ فێرم کردووی! هەر دەبێ ئەو چەند ڕستەیە بزانی... گەرنا خەڵکی چۆن بزانن ئێوە بنەچەدارن و جیاوازن لە منداڵە گەڕۆکەکانی تر؟ خۆ بڕیار نییە دەست بکەینە پیترۆشکابازی[1]، دەمانەوێ گۆرانییەکی شیاو بڵێین... بەڵێ دەی... هەر بە ڕاست دەبێ چی بڵێین؟ زوو زوو لێم تێک دەدەن و ناهێڵن کاری خۆم بکەم، وەلێ ئێمە... خۆ ئێوەش ئاگادارن، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ؟ ئێمە لێرە ڕاوەستاوین تا بزانین دەبێ چی بڵێین... گۆرانییەک کە کۆلیاش بتوانێ سەمای لەگەڵدا بکا... خۆتان دەتوانن سۆسەی بکەن دەی، ئێمە کار و بەرنامەکەمان ڕاهێنانی پێشوەختەی لەگەڵ نییە. دەبێ بڕیار بدەین کە دەمانەوێ چی بڵێین و بە تەواوی

1. نمایشی سەرشەقامی و سوونەتیی ڕووسی کە لەبەر عەوامیبوونی لەگەڵ سەلیقە و پێوەرە خانەدانیانەکانی کاترینا ئیڤانۆڤنادا ناکۆکە. «و. ف»

مەشــقی لەســەر بکەین، پاشــان بچین بۆ شــەقامی نێفســکی، لەوێ کەســانی ماقووڵی لێن! زۆر لەمانەی ئێرە ســەخیترن و دەســتبەجێ بەدەممانەوە دێن. لیدا تەنیا دەزانێ خوتاراک بڵێ، تەنیا ئائەمە کە هەر کوێر و چەکەڵێکیش لە بەریەتی! نا، ئێمە دەبێ شــتی ماقووڵتر بڵێین... دەی، پۆلینکا، هیچت بە مێشکدا هات؟ تۆ دەبێ بتوانی یارمەتیی دایکت بدەی! هەر دەڵێی زەینم سڕاوەتەوە، هیچی تێدا نییە گەرنا خۆم شتێکم لێ دەکرد! خۆ ناتوانین هەر *ئەفســەرێک پاڵی بە شــمێرەکەیەوە داوە*[1] بڵێین! باشــــە، تێگەیشــــتم! با هەمووومان *Cinq sous* [2] بڵێین، ئەو گۆرانییە فەرەنســییەیە کە خۆم فێرم کردبوون، یارۆ پێنجپەنی[3] دەی! خەڵکی کە گۆرانیی فەرەنســــی بیســــت، تێدەگەن ئێوە ڕەســــەنن و هەموویــان پێکرا دەکەونە ژێر کــاریگەری! دەکرێ *مــالبرۆ دەچێتە بەرەی جەنگ*یش بڵێن، تایبەتە بە منالان، لایلایەی منالە خانەدانانە!

کاترینا ئیڤانۆڤنا دەســتی کردە گوتنی ئەم گۆرانییە فەرەنســییەی کۆتایی:

– *Marlbrough s'en va-t-en guerre*[4]... وەلێ نــا، هەمــان *Cinq sous* بڵێین باشــترە! باشــە، دەی کۆلیا، دەســتەکانت ببەرەوە پشتت ئادەی، دەی بجووڵێ! لیدا، تۆش دەبێ بەولادا بسووڕێی. من و پۆلینکاش دەیڵێین و چەپڵە لێدەدەین! *Cinq sous cinq sous*...

---

١. لەسەر بنەمای گۆرانیی *جیایی* بەرهەمی *کانستانتین باتیوشکاف* لە ساڵی ١٨١٤، کە ستۆزانییەکان لە بەرهەمی *قوژبنەکانی پێتەربورگــــی* کریستۆفسکیدا دەیڵێنەوە. «و. ف»

٢. ســــەربەنــدی گۆرانیی ســــوالکەران لە *La Grace de Dieu* لە میلۆدرامە بەناوبانگەکانی سەدەی نۆزدەیەم. «و. ف»

٣. پێدەچێ «پەن» یەکەی پارەی ڕووســــیا بێت، بەرانبەر بە پێنج شــــاهیی کۆنی ئێرانی و پێنج دیناری عێراقی. «و. ک»

٤. گۆرانیی فۆلکلۆریی فەرەنســــی کە دوای ســــاڵی ١٨١٢ بەهۆی ئاماژەکردن بە شکانی ناپلیۆن لە جەنگ لەگەڵ ڕووسیادا خۆشەویست بوو. «و. ف»

کۆکە هەناسـەی بە کـاترینـا ئیڤـانۆڤنـا بڕی، بەڵام ئەو هەر هەناسەسوارانە دەیگوت:

– ئـادەی جلەکەت ڕێکوپێـک کە، پۆلینکـا، سـەیری کە، چۆن کراسـەکەی بە بەرییەوە شـۆڕ بووەتەوە! دەی، ئێسـتە ئیتر دەبێ زۆر باش و بەڕێز بن و هەڵسوکەوتتان وەک هی منداڵە خانەدانان. من هەر ئەو کاتە گوتم دەبێ کراسێکی درێژتر و بەرینتری بۆ بسـەنین، کەچی تۆ، سۆنیا خاتوون، گوتت دەبێ کورتتر بێ و ئێستەش خۆت سەیرکە چیی لێ دەرچوو: منداڵەکە چەندە ناشـیرین بوو... خوایە، ئێوە بۆ هەمدیسـان دەسـتتان کردەوە بە گریان و ناڵین؟ باشـە چی بووە، حەپۆلینە؟ ئادەی زووکە، کۆلیا... دەی دەست پێکە، یەڵا! بجووڵێ دەی! خوایە، سـەبرم نەماوە! کێ دەرەقەتی ئەم منداڵانە دێ؟ دەی ئیتر، با بیڵێین: *Cinq sous cinq sous*... ئەی هاوار، خۆ ئەم پاسـەوانە هەمدیسان دەرکەوتەوە! چیتا دەوێ لە گیانمان؟

هەر بە ڕاستیش پاسەوانێک خەریک بوو درِی بە ئاپۆڕاکە دادەدا و دەهـاتە پێش. بەڵام هـاوکـات بەڕێزێکی نزیکەی پەنجـاسـاڵە بە سـەروسـیمایەکی جددی و کاریگەر و جلێکی فەرمی و کۆڵوانەوە دەرکەوت؛ قردێلەیەکی لە ملی بەسـتبوو کە زۆر کاترینا ئیڤانۆڤنای خۆشکەیف کرد و تۆزێکیش پاسەوانەکەی ترساند. پیاوێک بێ ئەوەی یەک قسـە بکات، سـێ ڕۆبلییەکی تازەی پشـتسـەوزی دایە کاترینا ئیڤانۆڤنا. بە باری دەموچـاویدا چاک دیار بوو کە چەندە لە دڵەوە هـاوخەمیەتی. کـاترینا ئیڤانۆڤنا پارەکەی وەرگرت، ڕوو لە پیـاوەکە کڕنۆشێکی بەڕێزانەی برد و زیادەڕۆیانە گوتی:

– کاکی میهرەبان، من منەتباری ئێوەم! ئەو ژیان و نەهامەتییەی کە تێی کەوتووین نـاچـاری کردووین... ئەو پـارەیە بگرە، پۆلینکـا. دەبینی کە کەسـانی بەڕێز و دڵئاواش کەم نین کە ئامادەن لە کاتی نەهامەتیدا دەسـتی ژنێکی ئاوڕوودار بگرن! بۆ ئاگاداریتان، جەنابی

پایەبەرز، ئەم منالە هەتیوانە خاوەنی بنەماڵەن و تەنانەت بە بنەچەش خانەدانن... جا ئەو جەنەراڵە چەپەڵە ناپیاوە دانیشـــتبوو و خەریکی خواردنی قەتێ بوو و... لەبەر ئەوەی بێزارم کردبوو، پێی بە زەویدا دەکوتی... منیش پێم گوت، *جەنابی بەرزوبەرێز، دەســـتی ئەم چەند ســـەر هەتیوە بگرن! خۆ پایەبەرزتان مێردی خوالێخۆشـــبوومتان دەناســـی؛ مارمیلادۆف... تازەبەتازە ناشـــتبوومان کە بوختانی دزییان بۆ کچەی کرد.* خوایە، چیی دەوێ ئەم پاســـەوانە لە گیانی من؟ کاکی بەڕێز، ئێوە یارمەتیمان بدەن، بەری پێ بگرن!

کاترینا ئیڤانۆڤنا بەدەم هاوارەوە دەســـتەودامانی فەرمانبەرەکە بوو و درێژەی پێدا:

– ئەم پاسەوانە بۆچی وازمان لێ ناهێنێ؟ تازە خۆمان لە دانەیەکی تریان لە شـــەقامی میشـــیانســـکایا نەجات دا و هاتینە ئێرە... باشـــە تۆ چیت دەوێ، دەبەنگ؟

– هەڵانانەوە لە شەقامدا قەدەغەیە! خەڵکی بێزار دەکەن...

– ئەوە تۆی کە خەڵکی بێزار دەکەی! ئێمە تەنیا خەریکی سازلێدانین و بۆ خۆمان دەگەڕێین، هەقمان چییە بەسەر تووە؟

– ســـــازلێدان مۆڵەتنامەی پێویســـــتە، وەلێ ئێوە تەنیا کۆمەڵێکتان خســـــتووەتە شـــــوێن خۆتان و ڕێگەکەتان گرتووە. ماڵتان لە کوێیە، خانمخاس؟

– مۆڵەتنامەی چی؟

کاترینا ئیڤانۆڤنا .کردبوویە شینوشەپۆڕ.

– من ئەمڕۆ مێردەکەمم ناشـــــت و ئێســـــتەش ئەم کابرایە داوای مۆڵەتنامەم لێ دەکا!

– هێور بن، خاتوون. تکا دەکەم هێور بن!

فەرمانبەرەکە هەوڵی دەدا کاترینا ئیڤانۆڤنا هێمن بکاتەوە:

– فەرموون با بڕۆین؛ من یاوەریتان دەکەم. شـوێنی ئێوە ئێرە نییە لەگەڵ ئەمانەدا... خۆ نەخۆشیشن...

کاترینا ئیڤانۆڤنا هاواری کرد:

– جەنابی پایەبەرز، کاکی بەڕێز، ئاخر خۆ ئێوە نازانن! ئێمە بەرەو نێفسکی دەچین. سۆنیا، سـۆنیا! ئەی کوا سـۆنیا؟ دە فەرموو، ئەمەش هەر وا خەریکە وەک هەوری بەهار فرمێسک دەڕێژێ! چ گلاراوێکتانە ئێوە؟ کۆلیا، لیدا؟ ئەوە بۆ کوێ دەچن، ها؟

کتوپڕ بە شێوەیەکی تۆقێنەر دەنگیی هەڵبڕی:

– کۆلیا، لیدا... بۆ کوێ دەچن؟...

کۆلیا و لیدا دەتگوت بە سامی ئاپۆڕاکە و کارە شێتانەکانی دایکیان شێت بووبوون و کە چاویشیان بە پاسـەوانەکە کەوت، وایان زانی بە دڵنیاییەوە بۆ گرتنی ئەوان هاتووە. لەبەر ئەوە بوو کە ئیدی خوشـک و براکە کتوپڕ دەسـتی یەکدییان گرت و بەوپەڕی تواناییانەوە کەوتنە ڕاکردن. کاترینا ئیڤانۆڤنای داماویش بەدەم فرمێسکڕشتن و شیوەنەوە دوایان کەوت. ئەم ڕاکردن و هەناسـەسـوارییەی دیمەنێکی خەمناک و دڵهەژێنی هێنابووە ئارا. سـۆنیا و پۆلینکاش بەدوای منداڵەکانەوە بوون.

– سـۆنیا، بیانگرە و بیانهێنە ئێرە!... خوایە، ئای لەو منداڵە پێنەزان و نەفامانەی من!... پۆلینکا، بیانگرە! ئاخر لەبەر ئێوەیە کە من...

کاترینا ئیڤانۆڤنا بەدەم ڕاکرنەوە سـەرسـمێکی دا و تەختی زەوی بوو.

سۆنیا بەسەر ژنە کلۆڵەکەدا چەمییەوە و قیژاندی:

– وای خوایاااا! لە خوێندا گەوزاوە!

هەمووان ڕایانکردە پێش و دەوریان دان. ڕاسکۆلنیکۆف و لیبیزیاتنیکۆف زووتر گەیشتنە لای سۆنیا و پیاوە بەخشندەکەش دوای ئەوان گەیشت و دواجار پاسەوانەکەش هات کە پشووکورتانە دەستی ڕادەوەشاند و لەژێر لێوەوە دەیبۆلاند، *چ سەرئێشەیەکە!*

پاسەوانەکە بە ڕووی ئاپۆڕاکەدا کە دەیانویست مل درێژ بکەن، قیڕاندی:

– ئەرێ بڕۆنە دواوە! دوا!

یەکێک لەنێو ئاپۆڕاکەوە هاواری کرد:

– وا دەمرێ!

دەنگێکی دی هاتە گۆ:

– شێت بووە!

ژنێک خاچی کێشا و گوتی:

– خوایە، هەر خۆت فریامان کەوە! ئەو دوو وردەڵەیەیان بۆ نەگیرا؟ ها... ئەوە دەیانهێنن، خوشکە گەورەکە گرتنی... چەندە سەیروسەمەرەن هەموویان!

کە باش لە کاترینا ئیڤانۆڤنا ورد بوونەوە، دەرکەوت کە بەرد و شت دەستوپلیی نەبڕیوە و ئەو خوێنەی کە بەردفەرشی پیادەڕێکەی سوور کردبوو، لە سنگییەوە دەهات.

کاکی بەخشندە ڕوو لە ڕاسکۆلنیکۆف و لیبیزیاتنیکۆف ورتاندی:

– من پێشتریش نەخۆشێکم لەم دۆخەدا دیوە. سیل کۆتاییەکەی ئەمەیە، خوێن هەڵدەهێنێتەوە و نەخۆشەکە دەخنکێنێ. ماوەیەک

لەمەوبەر یەکێک لە خزمەکانمی کوشــت، دونیایەک خوێنی هێنایەوە و چەند ساتێک زیاتریشی نەخایاند... ئێستە چی بکەین؟ هاکا تەواو بوو.

– با بیبەینە لای من، ئەوەندە دوور نییە! لەملاوە!

سۆنیا کەوتبووە پاڕانەوەوە.

– ســـەیری ئەو بینایە کەن... ســـەیر کەن، دووەمیان لەملاوە. من لەوێ نیشتەجێم. بیهێننە ماڵی من، پەلە کەن!

لە کەسێکەوە ڕووی دەکردە کەسێکی دی و داماوانە دەیگوت:

– کەسێ بنێرنە دوای دکتۆر! خوایە، فریاکەوە!

خۆشــبەختانە لەســایەی ئەو بەڕێزەوە، دەســتوبردیان لێ کرد و تەنانەت پاســـەوانەکەش دەســـتباری دان تا کاترینا ئیڤانۆڤنا بەرز بکەنەوە و بیبەنە ژوورەکەی ســـۆنیا، کە هەڵبەتە لەســـەر تەختەکە خەواندیان و کەم تا زۆر بێهۆش بوو. هێشتا خوێنی دەهێنایەوە، بەڵام دەتگوت وا بەرەبەرە دێتەوە ســـەر خۆی. ڕاســـکۆڵنیکۆف و لیبیزیاتنیکۆف و ئەو بەڕێزە لەگەڵ سۆنیادا هاتنە ژوور. پاسەوانەکەش بەدوایاندا هات، وەلێ ســـەرەتا ئاپۆڕاکەی ڕادایە دواوە کە تا پشـــت دەرگەی ژوورەکە هاتبوو. پۆلینکاش لەگەڵ کۆلیا و لیدادا گەیشـــتن. هەردووک منداڵەکە ئازای ئەندامیان هەڵدەلەرزی و دەگریان. چەند کەســـێکیش لە خێزانی خاوەنماڵەکە لەوێ بوون: خودی خاوەنماڵ کە پیاوێکی لاروویر بوو بە ســـەروســـیمایەکی ســـەیروســـەمەرە و قژ و ڕیشـــێکی درێژەوە؛ ژنەکەی بە باری تۆقینێکی بەردەوامەوە؛ لەگەڵ چەند منداڵێکی دەمداچەقیوی خۆی، لە ئاپۆڕاکە ڕامابوون. لە گەرمەی ئەم حەشـــرەدا، کتوپڕ ســـڤیدریگایلۆڤ دەرکەوت. ڕاســـکۆڵنیکۆف ســـەراســـیمە پێیدا واق بوو، نەیدەتوانی لەوە تێبگات کە ئەم کابرایە لە کوێوە پەیدا بووە، چونکە پێشتریش ئەوی لە قەڵەباڵقیدا نەدیبوو.

قسـه هاته سـەر ئاگاداركردنەوەی دکتۆر و قەشـه. پیاوه دڵباشـەکه چرپەچرپ بە ڕاسـکۆڵنیکۆفی گوت لای وایە ئیدی ئاگاداركردنەوەی دکتۆر بێسـوودە، کەچی لەگەڵ ئەوەشـدا هەر فەرمانی کرد کەسـێک بنێرنە دوای دکتۆر کە خاوەنماڵەکەی سۆنیا خۆی بە ڕاکەڕاک چوو.

کاترینا ئیڤانۆڤنا لەم ماوەیەدا هەناسەی هاتەوە سەر خۆی. وا دیار بوو خوێنبەربوونەکەشـی بە کاتی وەسـتاوەتەوە. بێحاڵ بوو، بەڵام نیگای لێبڕاو و کاریگەریی لە سۆنیا کلا نەدەکرد. سۆنیاش ڕەنگپەڕیو و لەرزۆک لەتەکییەوە ڕاوەسـتابوو و بە دەسـرێـک تەوێڵی لەئارەقەخووساوی ئەوی دەسڕی. ئاخرییەکەی کاترینا ئیڤانۆڤنا داوای کرد هەڵیبسـتێننەوە. لە دوو لاوە باسـکەکانیان گرت و هەر لەوێ لە سەر تەختەکەی دایاننیشاند.

– مناڵەکان لە کوێن؟

بە دەنگێکی بێگیان ئەمەی پرسی.

– هێناتن یان نا، پۆلینکا؟ ئەی، گەمژەینە... ئاخر بۆچی ڕاتان کرد... ئاخ بەدەستتانەوە!

لێوە وشـکەکانی هەمدیسـان خوێناوی بووبوونەوە. چاوی بە ژوورەکەدا گێڕا.

– یانی تۆ لێرە دەژیی، سـۆنیا! تا ئێسـتە نەهاتبووم ژوورەکەت ببینم... ئێستە لەم دۆخەدا...

بە نیگایەکی لێوڕێژ لە ئازارەوە سەیری سۆنیای دەکرد.

– ئێمە ژیانمان فەوتاندی، سـۆنیا. پۆلینکا، لیدا، کۆلیا، ئادەی وەرنە ئێرە. باشـە، هەرسـێکیان لێرەن، بیانگرە... وا بە تۆیان دەسـپێرم، هیچ شـتێکی ترمت بدەمێ... ئیتر ناتوانم!... دۆسـییەکەی داخراوە. خوایاااا!... لانیکەم لێگەڕێن بە ئارامی بمرم...

پارمەتییان دا هەمدیسان سەر بخاتەوە سەر پشتییەکەی.

– چی؟ قەشە؟... من قەشەم ناوێ... بۆ پارەت لێ زیادە! یانی منیش گوناحبارم! خوا بێ دانپێدانان و ئەمانە دەبێ بمبوورێ... خۆی دەزانێ چ چەرمەسەرییەکم کێشاوە! ئەگەریش نەمبوورێ گرنگ نییە!

ســـات دوای ســـات فرەتر بە دونیای ورێنەدا ڕۆدەچوو و زیاتر سرەوتی لێ دەبڕا. جاروبار تەکانی دەدا و چاویی لە کاسەوە لەملاوە بۆ ئەولا دەگێڕا، لەناکاوێکدا کەسانی چواردەوریی دەناسینەوە، وەلێ هەر هەمان کات هەســـت و هۆشـــیی لەدەســـت دەدا. بە دژواری و خێســـەخێس هەناســـەی بۆ دەدرا و غرەغرێکیش کە لە قوڕگییەوە دەردەهات، بە ئاشکرا دەبیسترا.

– پێم گوت جەنابی *پایەبەرزا*...

بۆ هەر وشەیەک هەناسەی هەڵدەکێشا و بە زۆر دەریدەبڕی.

– ئەو خاوەنماڵە ئەڵمانییە... ئاە! لیدا، دەســـتەکانتان بخەنە ســـەر کەمەرتان ئادەی. توندتر، توندتر (جا بە فەڕەنســـی گوتی *پێیەکانتان جوان بەســـەر زەوییەکەوە بجووڵێنن*) ئێســـتە لەگەڵ من پێ بە زەویدا بکوتن! تۆزێ جوان، ڕۆڵە گیان!

جا پاشان بە ئەڵمانی گوتی:

– *ئەڵماس و مرواریت هەیە*... باشـە، ئەی دوای ئەوە چی بوو؟ ئای لەو گۆرانییە! *چاوی دڵڕفێنت هەیە، ئیتر چیت دەوێ کچە خاتوون؟*[1] باشـە بۆچی ئەوی تریم بیر چووە؟ تۆ سـەیری! لە خۆیەوە چی دەڵێ! بە ڕاســـت، ئەم شـیعرە هەر ڕووســـیی خۆشـــمانە: *لە قووڵایی دۆڵی*

---

۱. وەرگیراو لە گۆرانییەکی ئەڵمانییەوە کە بەرهەمی *هاینریش هاینە* (۱۷۹۷-۱۸۵٦) «و. ف»

*داغســـــتان، گەرمای نیوەڕۆ بوو و من... هەتاو... ئاگر...*[1] خوایە، من شـــەیدای ئەو گۆرانییەم! شـــێتی دەکردم ئەوســـــا، پۆلینکا!... دەزانی، باوکت کاتێ دەزگیران بووین، ئەمەی بۆ دەگوتم... وای لەو ڕۆژانە! ئەرێ، باشـــترین گۆرانییەک کە دەمانتوانی بیڵێین، ئەمەیە! دەی، ئەوی تری چی بوو... ئاخ، بیرم چووە!... دەی بیرم بێنەرەوە! چی بوو ئەوی تری؟

کاترینا ئیڤانۆڤنا بە شـــێوەیەکی تۆقێنەر هەراســـان بووبوو و پێچی دەدایە خۆی تا هەرچۆنێک بووە هەســـــتێتەوە و لەســــــەر جێگەکەی دانیشێت. ئاخرییەکەی بە دەنگێک کە وشک و گیرا بوو و لە گەروویدا دەشـــــکا، دەســـــتی کردە گۆرانیگوتن. وەلێ دەنگی گۆڕا بۆ زیقە و بۆ هەر وشەیەک ناچار بوو هەناسەیەک هەڵمژێت و تا دەهات ئاسەواری ترسیش بە سیمایەوە زیاتر دەردەکەوت.

*– لە قوولایی دۆڵی داغســـــتاندا / قولەقولی نیوەڕۆ بوو و / من / بێجوولە/ بە زامی گوللەیەکەوە / کەوتبووم... / من کە خەوی مەرگ بردوومیەوە / هەتاو... ئاگرپژێنی دەکردم...*

کاترینا ئیڤانۆڤنا لەپڕ بە دەنگی بەرز شیوەنێکی نایەوە کە دڵی هەر مرۆڤێکی توێتوێ دەکرد و فرمێسک بە چاوانیدا جۆگەلەیان بەست:

– ئاگاداری ئەم مناڵە هەتیوانە بن! نمەکی مێردەکەمتان لە بەرچاو بێ!... خۆ سەر بە خانەدانەکان بوو ئەو خوالێخۆشبووە...

لێرانەدا بوو کە تەکانێکی توندی دا و هەست و هۆشی هاتەوە سەر خۆی و تۆقیوانە چـاوی بە هەمووانـدا گێڕا، بەس تەنیـا ســـــۆنیـای دەستبەجێ ناسییەوە.

– سۆنیا، سۆنیا!

---

[1]. بڕگەی یەکەمی شیعری خەون بەرهەمی ناسراوی *میخاییل لێرمانتۆف*. «و. ف»

نەرم و لاوێنەر وشەکانی دەردەبڕین و دەتگوت لەوەش سەرسامە کە ئەو لەوێدا دەبینێت.

– سۆنیای باوانم، تۆش لێرەی؟

هەمدیسان هەڵیانساندەوە.

– بەسە!... هەموو شتێ تەواو بوو!... خوا ئاگادارت، بێنازەکەم!... ئیتر گیانم تێدا نەماوە!

بەدەم هاوارێکی هەناسەساردانە و کەیل لە ناسۆرییەوە ئەمانەی گوتن و سەری کەوتە سەر پشتییەکە.

کاترینا ئیڤانۆڤنا هەمدیسان بوورایەوە، وەلێ ئەم جارەیان هێندەی نەخایاند. ڕووخسارە زەرد و ژاکاوەکەی خوێنی تێدا نەمابوو. سەری بە دوادا چوو و دەمی کرایەوە، پێی خۆبەخۆ کەوتە لەرزین، جا ئاهێکی بێڕادە قووڵی هەڵکێشا و گیانی دەرچوو.

سۆنیا خۆی بەسەر تەرمەکەدا دا و باسکەکانیی بە دەوری کاترینا ئیڤانۆڤنادا ئەڵقاندن. سەریی بە سنگی ژاکاو و بێگیانی ژنە کۆچکردووەکەوە دەگوشی و هەر وا لە جووڵە کەوتبوو. پۆلینکا خۆی خستبووە بەر پێیەکانی دایکی و ماچی دەکردن، سەرتاپێی لەتاو کوڵی گریان هەڵدەلەرزی. کۆلیا و لیدا ڕێک تێنەدەگەیشتن چی ڕووی داوە، بەڵام هەستیان دەکرد هەرچی هەیە، ڕووداوێکی ترسناکە. چاو لە چاوی یەکدی دەستەکانیان خستبوونە سەر شانە یەکدی و هەردووکیان هاوکات دەمیان کردەوە و پڕ بە قوڕگیان زریکاندیان. هێشتا جلی نمایشەکەیان لە بەردا بوو، دانەیەکیان مێزەرلەسەر و ئەوی دیکەیان بە پەڕی وشترمەلەوە.

هەر خوا دەیزانی کە ڕێزنامەکە چۆن لەو حەشـــــرەدا ئاوها لەتەک تەرمی کاترینا ئیڤانۆڤنا و لەســـــەر تەختەکە ســـــەوز بوو! ڕێک لەلای سەرینەکەشەوە بوو و ڕاسکۆلنیکۆف دەیتوانی ببینێت.

ڕاســـــکۆلنیکۆف بەرەو پەنجەرەکە چوو. لیبیزیـاتنیکۆفیش خۆی گەیاندە ئەو و گوتی:

– تەواو بوو!

– ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ، دوو قسەم هەبوو لەگەڵتان.

ســـفیدریگایلۆف لە باریکدا ئەمەی گوت کە خەریک بوو لێیان نزیک دەبووەوە.

لیبیزیاتنیکۆف دەمودەســـــت ڕێی بۆ کردەوە و بە پارێزەوە لێیان دوور کەوتەوە و سڤیدریگایلۆڤ ڕاسکۆلنیکۆفی کشاندە دواوە.

– کاری بەخاکسپاردن و ئەمانە لەسەر من. خۆ پێم گوتن کە وەک پێویست پارەم لە باخەڵە. باشە بۆچی لەمەدا خەرجی نەکەم؟ ئەو دوو دانە بچکۆلەیە و پۆلینکاش دەخەمە ناوەندێکی چاکی سەرپەرشتیکردن و یەکی هەزار و پێنجســـــەد ڕۆبڵیشـــــیان بۆ دادەنێم تا کە گەیشـــــتنە تەمەنی یاســـــایی بیاندەنێ. بەم جۆرە ســـۆنیا خاتوونیش بێخەم دەبێ. ئەویش لەم زەلکاوە دەردەهێنم، ئاخر کچێکی باشـــــە؛ خۆ ئێوەش هاوڕان؟ کەواتە تکایە بە دونیا خاتوون بفەرموون دە هەزار ڕۆبڵەکەی لەمەدا خەرج دەکەم.

ڕاسکۆلنیکۆف پرسیی:

– ئێستە ئامانجتان لەم بەخشندەییە چییە؟

سڤیدریگایلۆڤ پێکەنی:

– ئامان... ئامان بەدەســـــت بەدبینیی ئێوەوە! خۆ گوتم ئەو پارەیە هیچ کەڵکێکی من ناگرێ. کێشە چییە منیش کارێکی خێرخوازانە بکەم؟ مەبەســـــتم ئەوەیە کە، ئەو ژنە (ئاماژەی بۆ ســـووچی ژوور و تەرمی کاترینا ئیڤانۆڤنا کرد) خۆ ئەسپێ و لە توخمی قرچۆڵە سووخۆرەکان نەبوو بۆ نموونە؟ دەی، خۆتان بفەرموون کە کەســـــێکی *وەک لوژن*

*زیندوو بمێنێ و خەریکی چەپەڵکاری بێ یان کاترینا ئیڤانۆڤنا دەبێ* بمرێ؟ ئەگەر من دەســـتیان نەگرم، چارەنووســـی پۆلینکاش هەر وا دەردەچێ دەی...

ئەو چاوەی کە ســفیدریگایلۆف دایگرت، شــادییەکی تەڵەکەچیانەی تێدا بوو و بە درێژایی ئەو ماوەیەش چاوی لە ڕاســـکۆڵنیکۆف کلا نەکرد. ڕاسکۆڵنیکۆف بە بیســتنی ئەو قســانەی کە خۆی بۆ ســۆنیای کردبوون، ڕەنگی پەڕی و لەشــی بەســتی. دەستبەجێ کشــایە دواوە و کێویانە تەماشایەکی سفیدریگایلۆڤی کرد.

– ئێوە... چۆن زانیتان؟

دەنگی لە ئاستی چپەچپدا بوو و بە حاڵ هەناسەی بۆ دەدرا.

– ئاخر، منیش لێرە ژوورم گرتووە؛ لە خاتوو ڕێســـلیخم بە کرێ گرت، دیوار بە دیوارین! خاتوون هاوڕێی دێرین و زۆر ئازیزی منە. دراوسێین دەی، جەنابی پایەبەرز!

– ئێوە؟

– بەڵێ، من!

سفیدریگایلۆڤ لە خۆشیان خۆی بە پێوە نەدەگرت.

– جا ســـوێند بە شـــەرەف، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچی ئازیز، ئێوە پیس منتان شـــەیدای خۆتان کردووە! خۆ گوتبووم دەبینە هاوڕێی یەکتری! فەرموون، ئەوەش هـاوڕێیەتیی گیـانی بە گیـانی! خۆتـان دەبینن کە هاوڕێیەکی باشم! دەبینن کە تەنانەت دەشکرێ لەگەڵ من بژین...

# یەک

سـەردەمێکی سـەیر لە ژیانی ڕاسـکۆڵنیکۆفدا دەسـتی پێ کرد؛ دەتگوت کتوپڕ تەمومژێـک دەورەی داوە و لە دوورەپەرێزییەکی سـاماناکدا دیلی کردووە. دواتر کە ئەو سـەردەمە درێژخایەنەی بیر دەهێنایەوە، هەستی دەکرد هۆشـیار نەبووە و تا کاتی کارەسـاتەکەی دواییش تێگەیشـتنێکی تەواوی لەبارەی دەوروبەرییەوە نەبووە. لە دڵەوە هاتە سەر ئەو بڕوایەی کە ئەو سەردەمە لە زۆربەی بابەتەکاندا هەڵەی کردووە، بۆ نموونە لەبـارەی مێژوو و کـاتی هەنـدێـک لە ڕووداوەکانەوە. بەهەرحاڵ، وەختێک دواجار ئەوەی بیر هێنایەوە کە ڕووی دابوو و ویسـتی بیرەوەرییەکانی لە بەرڕۆشـنایی ئەو شـتانەدا لێـک بـداتەوە کە ئەوانی دیکە لەبـارەیەوە دەیـانگوت، دەرکی بە خاڵگەلێکی شـاراوەی پەیوەست بە خۆی کرد. بەرەبەرە تێگەیشت کە هەندێک لە پێشـهاتەکانی تێکەڵی یەکدی کردوون و هەموو شـتێکی لەسـەر بنەمای پەیوەندییەکی زەینیی خۆی لێک داوەتەوە. جاروبار پەشـۆکانێکی زیانەخرۆ و نەخۆشـانە یەخەی دەگرت کە تەنانەت تا سەر ئاستی تاسانێکی کوشندە تەشەنای دەکرد. خولەک و کاتژمێر و تەنانەت ڕۆژگەلێکیش لە ژیانیدا هەبوون کە بەبێ هیچ هەسـت یان کـاردانەوەیەک تـێـدەپەڕیـن وەک ئەوەی قەرەبـووکـردنەوەیەکـی ڕاسـتەوخۆی ترس و تۆقینە کوشـندەکەی جارانی بێت و کەم تا زۆر لەو دڵسـاردییەش دەچوو کە هەندێک جار دێتە سـەروەختی ئەو کەسـانەی کە لەسـەر مەرگن. بە گشـتی، وا دەردەکەوت لەو ڕۆژانەی دواییدا ویسـتبێتی خۆی لە تێگەیشـتنی تەواوەتیی هەلومەرجەکەی

بدزێتەوە و خۆی لە گێلی بدات. هەندێک خاڵیش هەبوون کە دەشـــیا دەســـتبەجێ لە بەرچاویان بگرێت و بۆ خۆییان ڕوون بکاتەوە و خراپیش ئازاری دەدان. هەســـتی دەکرد گەر خۆی لە باری زۆربەی دڵەڕاوکێکـان ئـازاد بکـات، ئەوا ئـاســـوودە دەبێـت؛ گەرچی لەو هەلومەرجەدا لە بەرچاونەگرتنیان یەکسـان بوو بە لەناوچوونی تەواو و بێ چەندوچۆنی خۆی.

بەڵام کەڵکەڵەی ســـەرەکیی بووبووە ســـڤیدریگایلۆڤ و شـــەو و ڕۆژی بە بیرکردنەوە لە ئەو ڕادەبرد. لەوساوەی کە قسە هەڕەشەئامێز و لە ڕۆژ ڕۆشنترەکانی سڤیدریگایلۆڤی لەلای پێخەمی مەرگی کاترینا ئیڤانۆڤناوە بیســـتبوون، دەتگوت زەینی ئیدی باش کاری نەدەکرد و ڕێچکەی ئاســایی بیرکردنەوەی پچڕابوو. هەڵبەتە ئەم پێشـهاتە تازەیە هەتا بڵێیت ڕاسکۆڵنیکۆڤی شپرزە کردبوو، کەچی لە لایەکی دیکەشەوە وەک ئەوە وابوو هیچ هەڵپەیەکی بۆ ئەوە نەبێـت کە ئەم بـابەتە بۆ خۆی ڕوون بکاتەوە. هەندێک جار کە لە شـــوێنێکی چەپەک و چۆڵ، ڕێی دەکەوتە مەیخانەیەکی پیس و چەپەڵ و بە تەنیا دادەنیشت و فکر و خەیاڵ دەیبردەوە و تەنانەت خۆیشـــی نەیدەزانی چۆن ســـەری لەو ناوە دەرهێناوە، لەناکاو سڤیدریگایلۆڤی بیر دەهاتەوە و دەمودەستیش بە دڵخورتی و ناڕەحەتییەوە بیری لەوە دەکردەوە کە دەبێت تا زووە لەگەڵ ئەم پیاوەدا بگەنە ســـازانێک و بە جۆرێک لە جۆرەکان کۆتایی بەو بـابەتە بهێنن. تەنانەت ڕۆژێکیان چووە شـــوێنێک و لەپشـــت حەســـارێکەوە ڕاوەســـتا و لای وا بوو بڕیارە ســـڤیدریگایلۆڤ ببینێت. کەڕەتێکی دیکەش بەر لە هەڵهاتنی خۆر لە خەو ڕاچڵەکی و تەماشـای کرد وا لە شـــوێنێکدایە و بەســـەر زەوی و لەنێو دەوەنگەلێکدا خەو بردوویەتییەوە و هەر نەیتوانی تێبگات ئاخۆ لەو ناوەدا چی دەکات. وەلێ کرۆکی بابەتەکە ئەوە بوو کە لەم چەند ڕۆژەی کۆتایی و دوای مردنی کاترینا ئیڤانۆڤنا، دووســـێ جارێک ســـڤیدریگایلۆڤی لە ماڵی

ســـــۆنیادا دیتبوو؛ جاروبار هەر وا ڕەچووە ئەوێ تا بۆ ماوەیەکی کورت ســـــەرێکی لێ بدات. ئەوان بێ ئەوەی ئاماژەیەک بە کرۆکی بابەتەکەی ئەو ڕۆژەیان بکەن، چەند قســـەیەکیشـــیان پێکەوە کردبوو؛ بەڵام دەتگوت بڕیارێکی نەگوتراو لەنێوانیاندا هەیە کە تا ماوەیەکی دیاریکراو بێدەنگ بن. لاشـەی کاترینا ئیڤانۆڤنا هێشتا لە تابووتدا بوو و ســـڤیدریگایلۆڤیش خەریکی ڕاییکردنی کاروباری بەخاکســـپاردن. سۆنیاش گەلێک ســەرقاڵ بوو. لە دیدارەکەی دواییدا، ســڤیدریگایلۆڤ بۆ ڕاسکۆڵنیکۆفی ڕوون کردەوە کە بە باشترین شێوە کارەکانی ڕێک خســـتوون تا منداڵەکانی کاترینا ئیڤانۆڤنا هیچ کێشـــەیەکیان نەبێت و هەروەها بە یارمەتیی ناســـیاوان و کۆمەڵێک پەیوەندیی تایبەت کە هەیەتی، توانیویەتی لەگەڵ کەســـــانێکدا گفتوگۆیەک بکات تا بتوانن هەرچی زووتر ئەم سێ منداڵە هەتیوە بخەنە ڕێکخراوێکی ڕێکوپێکەوە و ئەو پارەیەش کە ئەو بۆ داهاتووی ئەوان ســەرماگوزاریی کردووە، لێرانەدا دەبێتە پاڵپشـــتییەکی باش، چونکە هەتیوێک کە شـــتێکی بە ناوەوە کراوە، زۆر باشـــتر لەوانە شـــوێنیان دەبێتەوە کە پەنابایەکیان نییە! لەبارەی ســـۆنیاشـــەوە شـــتگەلێکی گوتن و بەڵێنی دا هەر لەو ڕۆژانەدا خۆی بچێتە لای ڕاســـکۆڵنیکۆف و ئاماژەیەکیشـــی کرد کە بەنیازە ڕاوێژێکی لەگەڵدا بکات و دەمەتەقێیەک بکەن و ئەو بابەتە ببڕێننەوە. ئەم گوتوبێژە لە پلیکانی ڕێڕەوەکەدا کرا. سڤیدریگایلۆڤ بە ڕاسکۆڵنیکۆفدا واق بوو، ئێستێکی کرد و بە دەنگێکی کز پرسیی:

– باشـــە ئەوە چییە، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچی ئازیز، ئێوە لەم ڕۆژانەدا دەڵێی لەســـەر خۆتان نین؟ تەماشـــا کەن، بە ڕوواڵەت گوێش دەگرن، وەلێ لێرە نین و لە قســـــە تێناگەن! خۆ وا نابێ، دەبێ بارودۆختان بگۆڕن! ئەو دەمەتەقێیەشـمان لەجێی خۆی و بێگومان بەرنامەیەکی بۆ دادەڕێژین؛ زۆر زۆر شەرمەزارم کە ئەوەندە خۆم لە کاری تایبەتی و پرسی ئەوانی ترەوە وەرداوە! ئاخ، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچی ئازیز...

جا کتوپڕ بۆی زیاد کرد:

– مرۆڤ پێویستی به هەواگۆڕینه، بەڵێ، هەوا، هەوای نوێ... هیچ شتێ له ژیاندا ئەوەنده گرنگ نییه!

پاشانیش خۆی لادا تا ڕێ بۆ قەشه و یاریدەدەرەکەی بکاتەوه که سەردەکەوتن. قەشه و یاریدەدەرەکەی هاتبوون تا دوعای لێخۆشبوون بۆ کاترینا ئیڤانۆڤنا بکەن. لەسەر ڕاسپاردەی سڤیدریگایلۆڤ، دوعا ڕۆژی دوو جار و له کاتێکی دیاریکراودا دەخوێندرا. سڤیدریگایلۆڤ چوو بەدەم کارەکانی خۆیەوه و ڕاسکۆلنیکۆف چەند ساتێک ڕاوەستا، بیرێکی کردەوه و ئاخرییەکەی بەدوای قەشەدا بەرەو ژوورەکەی سۆنیا ڕۆیشت، بەڵام نەچووه ژوور و له ئاستانەی دەرگەکەدا ڕاوەستا. قەشه و یاریدەدەرەکەی هێمن و تازیەبار دەستیان به ڕێوڕەسمی دوعاکه کرد. ئامادەگیی مەرگ هەر له منداڵییەوه دایمه ترسێکی نەناسراو بەڵام تۆقێنەر و بەئازاری دەخستە دڵییەوه. ماوەیەکی زۆریش بوو که له هیچ ڕێوڕەسمێکی دوعاکردندا بەشداریی نەکردبوو. بەس دەتگوت لێرانەدا شتێکی سامناکتر و بەئازارتر له مەرگ له هەوادا بوو. سەرنجی لەسەر منداڵەکان بوو: هەمووان به دەوری تابووتەکەدا کەوتبوونه سەر ئەژنۆ و پۆلینکا دەگریا. سۆنیا دوورتر، لەپشت ئەوانەوه ڕاوەستابوو، دوعای دەکرد و نەرم و وەک ئەوەی تەریق بێتەوه، فرمێسکی دەڕشت. کتوپڕ به زەینی ڕاسکۆلنیکۆفدا هات که *ئەم دوو ڕۆژه یەک قسەشی لەگەڵدا نەکردووم و نیگاشیم لێ دەدزێتەوه.* هەتاو ژوورەکەی ڕۆشن کردبووەوه، هەورۆکەی بوخوردەکان به ئاسماندا مەلەی دەکرد و قەشه دەیخوێندەوه: *ڕۆحی بخەره بەر بەزەیی خۆت، ئەی پەروەردگار...* ڕاسکۆلنیکۆف تا کۆتایی ڕێوڕەسمەکه مایەوه. قەشەکه دوعای خێری بۆ هەمووان کرد و ویستی بڕوات، تەماشایەکی تەلیسماویی چواردەوریی کرد. دوای ڕێوڕەسمەکه، ڕاسکۆلنیکۆف

چووە لای سۆنیا؛ کچە توند هەردووک دەستی ئەوی گرتن و سەری خستە سەر شانی. ئەم جوولە بچووک و هاوڕێیانەیە ڕاسکۆڵنیکۆفی دۆش داهێنا. زۆر بە لایەوە سەیر بوو کە ڕقێک یان دەستبەڕوونانێک لەئارادا نییە و سۆنیا تەنانەت دەستیشی دەلەرزێت. تێنەدەگەیشت ئەم دۆخە بێ لە سـوـوک و بچووککردنەوەی خۆی ئاخۆ دەبێ چی بێت؛ لانیکەم ئەو وەهای لێک دەدایەوە.

سۆنیا هیچی نەگوت. ڕاسکۆڵنیکۆف دەستی ئەوی گوشی و چووە دەرێ؛ هەستی بە کەساسی دەکرد و کاتی بە ناخۆشی لێ دەڕۆیشت. ئەگەر بکرابا هەر لەوێ و لە هەمان کاتدا بچێتە شـوێنێک کە بتوانێت بە تاقی تەنیا بێت —تەنانەت گەر ناچار با تا کۆتایی تەمەنی لەوێ بمێنێتەوە— دەیتوانی خۆی بە بەختەوەر بزانێـت. لەم دواییـانەدا زۆربەی کات هیچ کەسـێکی لە دەور نەبوو، سـەرەڕای ئەمەش هەر نەیتوانیبوو تەنیا و بێخەیاڵ بێت لە خەڵکی. هەندێک جار جادەیەکی دەگرتە بەر و لە شـار دەردەچوو و تەنانەت جارێکیان گەیشـتە دارسـتـانێکیش، بەڵام تـا شـوێنەکە دوورتر و چۆڵتر دەبوو، ڕاسـکۆڵنیکۆفیش لە تەک خۆیەوە زەقتر هەسـتی بە ئامادەگییەکی سامناک دەکرد. ئەو ئامادەگییە نەیدەترساند، وەلێ بە چەشنێک تووڕە و نارەحەتی دەکرد کە بە پەلە دەگەڕایەوە بۆ شـار و بە جۆرێک لە جۆرەکـان تێکەڵی کۆمەڵ دەبووەوە، دەچووە مەیخـانە و کـافێ و بە قەڵەباڵقیی سـێننایا و بازاڕی تالکۆچیدا پیاسـەی دەکرد. دەتگوت لە جەنجاڵیی ئەو شـوێنانەدا حاڵی باشـتر دەبێ و بەو جۆرەی کە خۆی حەزی دەکرد خۆی بە تەنیـا و دابڕاو لە خەڵکی دەبینی. جـارێکیـان دەمەوئێوارە لە مەیخانەیەکدا گۆرانییان دەگوت و ڕاسـکۆڵنیکۆفیش یەک کاتژمێر دانیشـت و گوێی گرت. دواتر بیری هاتەوە کە تەنانەت چێژێکی زۆری لێ بردووە. بەڵام دواجـار، کتوپڕ هەمـان بێقەراری هاتەوە سەروەختی و نارەحەتی کرد. دەتگوت ویژدانی ئازاری دەدات.

لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە، تۆ سەیرکە توخوا! *لێرە دەسەپاچە بۆی دانیشتووم و گوێ لە گۆرانی دەگرم! یانی کارێکی باشتر نەبوو بیکەم!* بەڵام ئەوە تەنیا بانگی ویژدانی نەبوو کە ئازاری دەدا، شتێکی دیکەش هەبوو کە دەشیا زۆر خێرا بڕیاری لەسەر بدات، وەلێ ڕێک نەیدەتوانی تێبگات یان کتومت بڵێت ئەو شتە چییە. گلۆڵەیەکی تێکئاڵۆزکاو بوو و نەیدەتوانی بیکاتەوە. بیری کردەوە، *نا! ناکرێ ئاوها بەردەوام بم! شەڕێک، گێچەڵێک، مشتومڕێک دەبێ هەبێ لانیکەم! سەروکاری لەگەڵ پارفێری لەچاو ئەم دۆخەدا زۆر شەرەفمەندانەترە! یان تەنانەت سفیدریگایلۆڤ!... دەبێ بەگژ یەکێکیاندا بچم... ئەرێ، وایە!* لە مەیخانەکە هاتە دەر و کەم تا زۆر بە ڕاکەڕاک دوور کەوتەوە. بیرکردنەوە لە دایکی و دونیا کتوپڕ ترسێکی سامناکی خستبووە دڵییەوە. هێشتا تاریک بوو کە هایی بووەوە. لەنێو دەوەنەکانی دوورگەی کریستۆفسکیدا خەو بردبوویەوە و ئێستە سەرتاپێی لەبەر تا هەڵدەلەرزی. بە پێ بەرەو ماڵ کەوتە ڕێ و دەمەو بەیانی بوو کە گەیشت. چەند کاتژمێرێک نووست، تاکەی نەما، بەڵام کە هەستایەوە فرە درەنگ بوو، نزیکەی دووی دوانیوەڕۆ.

بیری هاتەوە کە بڕیار بووە ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنی کاترینا ئیڤانۆڤا هەمان ڕۆژ بەڕێوە بچێت و لەوە دڵخۆش بوو کە توانیبووی خۆی لە ئامادەبوون لەو ڕێوڕەسمەدا بدزێتەوە. ناستاسیا تۆزێک خواردەمەنیی بۆ هێنا و ئەویش بەوپەڕی ئیشتیهاو تەنانەت چڵێسییەوە خواردی و خواردییەوە. سەری سووک و بیری کرابووەوە و لەبارەی ئەم سێ ڕۆژەی دواییەوە زۆر زۆر هێمنتر بوو؛ تەنانەت بە سەرسامی ئەو هەڵمەتی ترسانەی بیر خۆی دەهێنانەوە کە لەم دواییانەدا یەخەیان دەگرت و تێنەدەگەیشت چۆن و لە کوێوە هاتبوونە سەروەختی. لەم کێشمەکێشەدا دەرگە کرایەوە و ڕازومیخین هاتە ژوورێ.

– ها! پایەبەرز خەریکی نانخواردنن، کەواتە نەخۆش نین!

ڕازومیخین ئەمەی گوت و کورسییەکەی خستە لایەکی دیکەی مێزەکەوە و ڕووبەڕووی ڕاسکۆلنیکۆف دانیشت. بیری لای شتێک بوو و دیار بوو کە زۆر دڵخورتە و خۆیشی هەوڵی نەدەدا دڵخورتییەکەی بشارێتەوە. لە کاتی قسەکردندا بە ئاشکرا بەدخوویی دەنواند، وەلێ دەتگوت هیچ پەلەیەکی نییە و هێندەش دەنگیی بەرز نەدەکردەوە. وا دیاربوو کە لێبڕاوییەکی سەیر و تایبەت سەرانسەری بوونیی تەنییێتەوە.

– گوێ بگرە...

ڕازومیخین لێبڕاوانە سەری قسەی کردەوە.

– هێندەی پەیوەندیی بە منەوە هەیە، هەرهەمووتان دەتوانن فەرموونە دۆزەخ! جارێ هیچ لەو شتانە تێناگەم کە دەیانبیستم و دەیانبینم. جا ئێستە وا نەزانی هاتووم لێپێچینەوەت لەگەڵ بکەم! ئەسڵەن تامەزرۆ نیم هیچ شتێ بزانم! دەست بە درکاندنی ئەو نهێنییە پیسانەت بکە، جا ئەوسا دەبینی کە یەک خولەکیش لێرە نامێنمەوە تا بیانبیستم! تف ڕۆدەکەم و بەڕێی خۆمدا دەڕۆم! ئێستەش بەتایبەت بۆ ئەوە هاتووم تا بۆ یەکەمین و دواهەمین جار بزانم کە تۆ هەر بە ڕاستی شێتی یان نا. باسی شێتبوونت لەسەر زارانە، یانی هەندێ کەس سەد لە سەد دڵنیان کە تۆ کەوتوویتەتە بازاڕەوە! ڕاستە، خۆشم تا ڕادەیەک بڕوام کرد، بەتایبەت لەبەر ئەو کار و هەڵسوکەوتە دەبەنگ و قێزەونانەت کە بە هیچ شێوەیەک پاکانە ناکرێن. خۆت سەیرکە چیت بەسەر دایک و خوشکتدا هێناوە! تەنیا شێت و دێوە چەپەڵەکان ئەو کارانەیان لێ دەوەشێتەوە، خۆ دێو نیی، دەی کەواتە شێتی.

– دواهەمین جار کەی بینیتن؟

– هەر ئێســـتە. خۆ تۆ لەو ڕۆژەوە نەتدیون؟ باشـــە تۆ خەریکی چیی؟ لانیکەم ئەمەیان بڵێ! تا ئێســتە ســێ جار هاتوومە ســەردانت و لێرە نەبووی! دایکت لە دوێنێوە حاڵی تەواو خراپە. وڕکی گرتبوو بێ بتبینێ؛ دونیا خاتوونیش ویســـتی بەری پێ بگرێ، وەلێ خۆ هیچی وەرنەدەگرت! *گەر کوڕەکەم نەخۆش کەوتووە، گەر مێشـــکی تێک چووە، کێ باشـــتر لە دایک کە چاودێریی دەکا و لەلای دەبێ؟* بە کورتییەکەی هەموومان هەستاین و هاتینە ئێرە، خۆ نەدەکرا لێگەڕێین بە درێژایی ئەم هەموو ڕێگەیە تەنیا بێ! تا گەیشـــتینە جێ هەر لێی دەپاڕاینەوە ئارام بێ. دواجار هاتین و ئەوە تۆش لێرە نەبووی. دایکت دانیشـــت و دە خولەکێک چاوەڕوانیی کردی. ئێمەش بێدەنگ چاوەڕێ بووین. پاشان هەستایەوە و گوتی، *مادام چووەتە دەرەوە، یانی مادام ئەوەندە تەندروستە کە توانیویەتی بچێتە دەر، لەگەڵ ئەوەشدا دایکیی لە بیر کردووە، ئیتر ئەوە لە دایکێک نـاوەشـــێتەوە خۆی بچووک بکاتەوە و لە بەردەرگەی ژووری کوڕەکەیدا ســواڵی خۆشــەویستیی بکا!* گەڕایەوە ماڵێ و دەستبەجێ کەوتە جێگە. ئێستە تووشی تا بووە. گوتی، *بەڵێ دەی، کاتی هەیە بۆ ئەو کچۆڵەیە!* مەبەستی لەو کچۆڵەیە، ســۆنیا خاتوون بوو؛ دەزگیرانت، خۆشــەویســتەکەت... خۆ ئەوە من ســـەر لە هیچ دەرناکەم. پاشـــان من چوومە ماڵی ســـۆنیا خاتوون تا بزانم مەســـەلە چییە! وەلێ چاوم بە تابووتەکە کەوت و منداڵەکان کە دەگریان و ســـۆنیا خاتوونیش کە خەریکی لە بەرکردنی جلی تازیە بوو. تۆش دیـار نەبووی. داوای لێبوردنم کرد و گەڕامەوە؛ دونیـا خاتوونیشـــم ئاگادار کردەوە. کەواتە ئەوەشـــمان بۆ ڕوون بووەوە؛ جەنابی پایەبەرز بەتەمای ئەو کچەش نییت و بە ئەگەرێکی زۆر بەهێز شـێت بووی. وا ئێســتەش لێرە دانیشـتووی و بە جۆرێ ئەو گۆشـتە لوول دەدەی وەک ئەوەی ســێ ڕۆژێک بێ هیچت نەخواردبێ! هەڵبەتە شـــێتەکـانیش نـان دەخۆن، پەیوەنـدیی بەوەوە نییە. وەلێ جەنـابی خاوەنشـــکۆ هێشـــتا بە وشـــەیەکیش وەڵامی منت نەداوەتەوە... نا، تۆ

شێت نیی! سوێند بەم کەللە پیرۆزەی خۆم! نا، تۆ شێت نیی! ئەسڵەن سندان لە هەمووتان دا! ئەمە نهێنییەکی تێدایە و منیش نامەوێ مێشکم بە نهێنییەکانی تۆوە ماندوو بکەم؛ تەنیا بۆ ئەوە هاتمە لات تا تۆزێ جنێوبارانت کەم...

ڕازومیخین قسەکەی کورت کردەوە و هەستایەوە.

– خۆشم خاڵی بکەمەوە. ئێستەش چاک دەزانم دەبێ چی بکەم.

– ئێستە دەتەوێ چی بکەی؟

– بە تۆ چی کە دەمەوێ چی بکەم؟

– دەتەوێ بڕۆی و تا قوڕقوڕاگە بخۆیتەوە!

– ئاخر... تۆ چۆن زانیت؟

– دەی، خۆ تەواو ئاشکرایە!

ڕازومیخین ئێستێکی کرد.

– تۆ دایمەی خوا کەسـێکی زۆر مەنتیقی بووی و ئەقڵیشـت دایمە لەسەر خۆی بووە!

ڕازومیخین ئەمەی لە کتوپڕێکدا و بە گوڕوتینێکی زیاترە گوت و لەسەری ڕۆیشت:

– ڕاســـتـت گوت؛ دەمەوێ بچم تێر و پڕ بخۆمەوە! دەی خوا ئاگادارت!

جا پاشان بەرەو دەرگەکە بزوا.

– ئەرێ بە ڕاســـت دوێنێ دەمەتەقێیەکم لەگەڵ خوشـــکمدا کرد... پێرێ بوو لام وایە... لەبارەی تۆوە، ڕازومیخین.

– لەبارەی منەوە دەمەتەقێتان کرد! وەلێ... تۆ پێری خۆشـــکتت لە کوێ بینی؟

ڕازومیخین ئیدی درێژەی نەداێ و ڕەنگیشـــی تۆزێک پەڕی. دیار بوو کە دڵی بە هێمنی بەڵام تاوسەندوو لە سینەیدا دەخورپا.

– بە تەنیا سەردانی ئێرەی کرد، دانیشت و قسەی لەگەڵ کردم.

– دونیا خاتوون سەری لێ دای؟

– بەڵێ.

– چیت پێ گوت؟... مەبەســـتم ئەوەیە کە چیت لەبارەی منەوە پێ گوت؟

– گوتم تۆ گەنجێکی زۆر باش و ڕاســـتگۆ و ئیشـــکەر و ئەمانەی. ئیتر پێم نەگوت کە عاشقی بووی، چونکە خۆی دەزانێ.

– خۆی دەزانێ؟

– ئاخر، دژوار نییە تێگەیشـتنی! گەر من هەر نەهامەتییەکم بەســەر هات و کەوتمە هەر کوێیەکەوە، تۆ دەبێ لەلایان بمێنیەوە و ئاگاداریان بی. وەک دەڵێن، دەیانســـپێرمە دەســـتی تۆ، ڕازومیخین؛ چونکە باش دەزانم چەندە خۆشـــت دەوێ و دڵت پاکە و هەســـتیشـــت بێگەردە. لە لایەکیشەوە دەزانم کە دەکرێ دونیا تۆی بچێتە دڵەوە و لەوانەیە هەر ئێستەش ئەوە ڕووی دابێ. جا ئێستە بزانە بەرژەوەندیت لە چیدایە و خۆت بڕیار بدە کە دەتەوێ دەست بە خواردنەوە بکەی یان نا.

– ڕۆدیا! ســـەیرکە... ئەی خوا بە نەفرەتت کا! وەلێ تۆ بەتەمای کوێی؟ هەڵبەتە گەر نهێنییە و ناتوانی بڵێی ئەوە هیچ، وازی لێ بێنە... بەس من... ئاخرییەکەی دەچمە بنجوبناوانی ئەم نهێنییەوە و... دڵنیام لەو قسە پڕوپووچانەیە کە هەمیشە پێکیانەوە دەنێی. بەس سەرەڕای ئەمانەش، تۆ شازی کاکە، زۆر خۆشی!

– دەمویست ئەوە بلێم، پەڕییتە نێو قسەکانمەوە! دەمویست بلێم بڕیارێکی ژیرانەت داوە کە واز لە نهێنییەکانی من و ئەم بابەتە بهێنی. بیدەرە دەست کات و خۆشت بێتاقەت مەکە. کە کاتی هات خۆت لە هەموو شتێ تێدەگەی. دوێنێ کەسێ پێمی گوت مرۆڤ پێویستیی بە هەوای نوێیە، تەنیا هەوای نوێ. دەمەوێ یەکسەر بچمە سەروەختی تا بزانم مەبەستی چییە.

ڕازومیخین خرۆشاو و نغرۆ لە بیرکردنەوەدا، ڕاوەستا و بە بێدەنگی لەبەرخۆیەوە مەتەڵەکەی هەڵهێنا و کتوپڕ بە بیریدا هات: *بەرانبەرەکەمان لە یارۆ سەربەگێچەڵە سیاسییەکانە! ئەرێ، سەربەگێچەڵ! ئێستە وا دیارە بەتەمای شتی ترە! بەدەر لەمە نییە... هەرچییەکیش بێ، دونیا ئاگادارە...*

– کەواتە دونیا خاتوون هاتووەتە دیدارت.

ڕازومیخین سەرەتا هەر وشەیەکی سەنگوسووک دەکرد و پاشان دەریدەبڕی.

– وەلێ ئێستە وا بۆ لای کەسێ دەچی کە دەڵێ هەوای تازەمان دەوێ... کەواتە ئەو نامەیەش... دەبێ بە گشتی پەیوەندیی بەم بابەتەوە هەبێ.

ڕازومیخین بەم جۆرە دۆخەکەی لێک دایەوە.

– کامە نامە؟

– ئەمڕۆ دونیا خاتوون نامەی بۆ هات. کە نامەکەی وەرگرت، تەواو تێک چوو و زۆر زۆریش بێتاقەت بوو. من تۆم هێنایە ناو باسەکەوە، وەلێ دونیا خاتوون داوای لێ کردم هیچ نەڵێم. پاشان گوتی لەوانەیە بەم نزیکانە لێک جیا ببینەوە و دەستی کردە

سوپاسکردنی من و دوای ئەوەش چووە ژوورەکەیەوە و دەرگەکەی بەسەر خۆیدا داخست.

ڕاسکۆلنیکۆف تێفکرانە پرسیی:

– یانی نامەی بۆ هاتووە؟

– بەڵێ، یانی تۆ ئاگادار نەبووی؟ ئمممم....

هەردووکیان بێدەنگ بوون.

– ڕۆدیا، خوا ئاگادارت. ڕۆژانێک بوو، کاکی خۆم... کە من... لێی گەڕێ. خوات لەگەڵ. دەزانی، ماوەیەک... دەی، خوات لەگەڵ! منیش دەبێ بچم بەلای ئیشمەوە. نیازی خواردنەوەم نییە ئیتر، ئێستە کاتی نییە... خۆ بینیت دیسان بە هەڵەدا چووی...

ڕازومیخین پەلەپەل لە ژوورەکە چووە دەر و خەریک بوو دەرگەکەی بەدوای خۆیدا پێوە دەدا کە کتوپڕ ڕای گۆڕا و هەمدیسان دەرگەکەی کردەوە و بێ ئەوەی سەیری ڕاسکۆلنیکۆف بکات، چاوی لە لایەک بڕی و گوتی:

– ئەرێ بە ڕاست خۆ ئەو کوشتنەت بیرە؟ کوشتنی ئەو پیرێژنە... خۆ پارفێریشت لە بیرە؟ بکوژەکەیان گرت، کابرا دانی پێدا ناوە و بەڵگە و شایەتیشی خستووەتە ڕوو. یەکێ لە بۆیەچییەکان بووە، تۆ بیری لێ بکەوە! هەموو ئەو لێدە و بکوتە و قەشمەریات و پێکەنینەی کە لەگەڵ هاوڕێکەی لە پلیکانەکاندا ناویانەتەوە، لە کاتی سەرکەوتنی قاپچی و یارۆ دوو کەسەکەدا، تەنیا نمایش بووە بۆ ئەوەی کەس گومانی لێ نەکا! ئاخر زۆڵیەتیش تامی هەیە! ئای لەو تەڵەکە و مێشکە کارایە! ئەوە بە مێشکی ئەجندەشدا نایێ، وەلێ خۆی وای گوتووە و دانی بە هەموو شتێکدا ناوە. من چەندە گەمژە بووم بە درێژایی ئەم ماوەیە، کە وام زانی ئەو بێتاوانە! لام وایە خوای دووڕوویە ئەو

کابرایە و لەم کارەشــدا تەواو شــارەزایە. مێشــکی باش ئیش دەکا و جێی سەرسامی نییە! دەی، هەڵبەتە لەم جۆرە مرۆڤانەش هەڵدەکەون ئیتر، بۆ نــا؟ ئەســـــڵەن هەر ئەوەی کە کـابرا بەرگەی نەگرتووە و نەیتوانیوە تا کۆتایی ڕووی ڕاســتەقینەی بشــارێتەوە و دانی پێدا ناوە دەریدەخا مەســــەلەکە ئەوەیە و دەبێ باوەڕی پێ بکەی!... وەلێ هەر خـوا دەزانـێ کە مـن چ گێلەگێلێکم کرد لە ســـــەرەتـاوە! بە چ دەمارگیرییەکەوە لایەنی ئەوانم گرتبوو!

– تکایە بڵێ ئەمانەت لە کێوە بیســــتن و ئێســــتە بۆچی ئەوەندە بەلاتەوە گرنگە؟

هیچ گومانێک لە پەشۆکانی ڕاسکۆڵنیکۆفدا نەبوو.

– چیی تر؟ تازەبەتازە دەپرســــی بۆچی بەلامەوە گرنگە؟... ئێ، لە پارفێریمەوە بیست و ئەوانی تریش باسـیان دەکرد... وەلێ بە گشـتی بابەتەکەم لە زمانی پارفێرییەوە بیست.

– لە پارفێرییەوە؟

– ئەرێ، لە پارفێرییەوە.

ڕاسکۆڵنیکۆف بە ترسەوە پرسیی:

– دەی چیت بیست... چیی دەگوت؟

– ئـێ، لە نـووکەوە بـۆ نـووک بـۆی بــاس کـردم؛ لە ڕووی دەروونناسییەوە، وەک خۆی دەڵێ!

– خۆی بۆی ڕوون کردیتەوە؟ هەموو شتێکی پێ گوتی؟

– بەڵێ، کاکە گیان، هەموو شــتێ. دەی، خوا ئاگادارت! با بە تاقەت هەموویت بۆ باس دەکەم، بەس ئێســــتە زۆر ســــەرقاڵم. ئەو کاتانە هەڵدەکەوت کە... وام دەزانی... بەس ئیتر گرنگ نییە، با بۆ دوایی!...

ئێســـــته بۆ دەبێ بچم بۆ خواردنەوە؟ تۆ بەبێ هیچ مەســـــتت کردم، ڕۆدیا! من ئێستە مەستی مەستم! جارێ خوا ئاگادارت. زوو سەرت لێ دەدەمەوە!

ڕازومیخین چووە دەرێ و لە کاتی داگەڕان بە پلیکانەکاندا بە خۆی گوت: *ڕۆدیا لە یارۆ سەربەگێچەڵە سیاسییەکانە؛ خوشکیشی تێکەڵی مەســـەلەکە کردووە. ئەمەش لەگەڵ کەسـایەتیی دونیا خاتووندا یەک دەگرێتەوە، تەواو لەگەڵ کەسـایەتییدا تەبایە! پێکەوە بە نهێنی دیدار و گوتوبێژیان هەیە!... ئێســـته کە بیری لێ دەکەمەوە، دەبینم دونیا خۆیشـی ئاماژەیەکی پێ کردووە و قسـە و ئاماژەکانی مانادارن! ئیتر ئەم گێچەڵە چ ڕوونکردنەوەیەکی پێویســـتە؟ ئممممم... جا ئەوســـا من بیرم بۆ چی دەچوو... خوایە گیان! ئاخر ئەوە چ بیرکردنەوەیەک بوو کەوتبووە سەرمەوە؟ ئەرێ، نەخۆشییەک، شتێک کەوتبووە گیانم و ئێســـتەش قەرزاری ڕۆدیام کە خراپ بیرم لێ کردەوە! بەس خەتای خۆی بوو کە ئەو ڕۆژە لە ڕێڕەوەکە ئەو قســـانەی بۆ کردم! بیرێکی چەندە چەپەڵ و شووم و ناشیرینم کەوتبووە سەرەوە! ئێستەش ماڵی ئەم میکۆلایە ئاوا کە دانی پێدا نا... ئێستە ئیتر هەموو شتێ وەک ڕۆژ ڕۆشنە! نەخۆشییەکەی، هەڵسوکەوتی سەیروسەمەرەی، ئەرێ، لەو کاتانەشـــدا کە دەچووینە زانکۆ هەر خەمگین بوو ئەم کوڕە، دایمە بێزار و داتەمیو... بەس ئەی مەســـەلەی نامەکە چییە؟ ئەوەیان چی لێ بکەم؟ باشـــە کێ ئەو نامەیەی ناردووە؟ گومانم دەچێ بۆ... ئمممم! نا، وا نابێ؛ دەبێ بچمە بنجوبناوانی!*

هەرچیی لەبارەی دونیاوە دەزانی، هێنایەوە یاد و هەموو بیســـتراو و بیندراوەکانی خستنە پاڵ یەک و کتوپڕ دڵی بەستی. کەوتە ڕاکردن.

ڕازومیخین کە ژوورەکەی جێ هێشت، ڕاسکۆڵنیکۆف هەستایەوە و ڕووی کردە پەنجەرەکە و بە درێژایی ژوورەکەدا کەوتە هەنگاونان، وەک ئەوەی بیری چووبێتەوە ئەمپەڕ و ئەوپەڕی ژوورەکەی دوو

بستیش نابێت... دیسان لەسەر قەنەفەکە دانیشتەوە. هەستی دەکرد سەرلەنوێ لە دایک بووەتەوە و هەلێکی دیکەی ململانێکردنی بۆ رەخساوەتەوە! کەواتە ویڕای هەموو شتێک، هێشتا ڕێگەی هەڵهاتنی هەبوو! بەڵێ، وا دیار بوو ڕێگەیەک هەیە بۆ ڕاکردن! وەک ئەوە وابوو لە شوێنێکی تاریک و تەسک و دەرگەداخراودا گیری خواردبێ و وەخت بێت بخنکێ. ڕێک لەو کاتەوەی کە میکۆلای لە نووسینگەکەی پارفێریدا کردبوویە هەڵا، ڕاسکۆلنیکۆف هەستی کردبوو خەریکە دەخنکێ و لە کەشێکی تەنگ و داخراودا دیل کراوە. دوای دانپێدانانەکەی میکۆلای، هەر هەمان ڕۆژ و کاتی بەزمەکەی ماڵی سۆنیاش، دەرەقەتی کارەکە نەهاتبوو و تەنانەت نەیتوانیبوو دواجار بابەتەکە بەو جۆرە بشکێنێتەوە کە خۆی پێشتر بیری لێ کردبووەوە. بە هیچ شێوەیەک چاوەڕوانیی ئەم جۆرە هەڵسوکەوت و قسانەی لە خۆی نەدەکرد... کتوپڕ دواهەمین تۆزقاڵی تواناشی لە جەستەی دەرچووبوو؛ جا لە هەمان ئەو کاتە و هەر لەو شوێنەشدا! ئەوەش لە لایەک کە ئەو ڕۆژە خۆشی لەگەڵ سۆنیا ڕێک کەوتبوو و بە هەموو بڕوایەوە پەسەندی کردبوو کە ڕێی تێناچێ خۆی بە تەنیا دەرەقەتی ئەو بارە قورسەی سەر زەین و دڵی بێت! وەلێ ئەی ئەو کابرایە، سڤیدریگایلۆڤ، چیی لە گیانی دەویست؟ ئەویش لە خۆیدا مەتەڵێکی سەمەرە بوو... تەواو ڕاسکۆلنیکۆفی خستبووە دڵەڕاوکێوە، بەڵام ئەم دڵەڕاوکێیە لە توخمێکی دیکە بوو. بۆی هەبوو ناچار بێت ڕووبەڕووی سڤیدریگایلۆڤیش ببێتەوە. دەکرا ئەویش بۆی ببێتە ڕێگەیەکی هەڵهاتنی دی، وەلێ مەسەلەی پۆرفێری شتێکی دیکە بوو. کەواتە پۆرفێری بەتایبەت بابەتەکەی بۆ ڕازومیخین ڕوون کردووەتەوە، جا لە دیدگەی دەروونناسیشەوە! ئممم، هەمدیسان خەریکە سوود لەو دەروونناسییە نەفرەتییەی وەردەگرێ، پۆرفێری! بەڵام... پۆرفێری؟ یانی ئەو پارفێرییە تەنانەت بۆ ساتێکیش بێت بڕوا دەکات کە میکۆلای تاوانبارە؟ نا، نەدەچووە ئەقڵەوە؛ جا ئەوەش بە لەبەرچاوگرتنی ئەو

شـتانەی کە لە خەڵوەت و تا بەر لە دەرکەوتنی میکۆلای لەنێو ئەواندا ڕابردبوون و ئەمەش تەنیا و تەنیا دەکرا یەک مانای هەبێت (ئەو ڕۆژانە زۆربەی کات هەندێک بەشـی ئەو دیمەنە برووسـکەئاسـا بە زەینی ڕاسـکۆڵنیکۆفدا دەهاتن، وەلێ توانای بیرهێنانەوەی هەموو دیمەنەکەی نەبوو). ئەو ڕسـتانەی کە بە یەکدییان گوتبوون، جووڵەی دەست و لەشیان، نیگاکان و شێوازی سەیری قسەکردنیان بە جۆرێک بوو کە ڕێی تێنەدەچوو میکۆلای -پۆرفیری هەر بە یەکەمین سـەرنج و بەر لە دەمکردنەوەی ئەو، دەسـتیی خوێندەوە- بتوانێت بۆچوونی لێکۆڵەرەکە بگۆڕێت.

دە فەرموو، ئێسـتە ئیدی ڕازومیخینیش گومانی بۆ ئەو دەچوو! کەواتە هەڵسـوکەوتە نامۆکەی ئەوشـەوەی لە بەر ڕۆشـنای چرای ڕێڕەوەکەدا کاریگەرییەکی خراپی خستووەتە سـەر ڕازومیخین! هێندە خراپ کە ڕازومیخین بە هەڵەداوان چووەتە سـەروەختی پۆرفیری... بەڵام ئەو ناپیاوە بۆچی ویسـتوویەتی مەمکەمژە بخاتە دەمی ئەویشـەوە؟ لەبەر چ ئامانجێک ویسـتوویەتی لەڕێی میکۆلایەوە سـەرنجی ڕازومیخین بە لاڕێدا ببات؟ هەر دەبێت بەرنامەیەک، نەخشـەیەک، بیرێکی لە سـەردا بووبێت؛ مەبەسـتێک وا لە پشـت کارەکانییەوە، بەڵام تۆ بڵێیت چ مەبەسـتێک بێت؟ دواجار ماوەیەکی ئەوتۆ بەسـەر ئەو بەیانییەدا تێپەڕیبوو -ماوەیەکی زۆر زۆریش تێپەڕیبوو!- کەچی پۆرفیری هیچ دەنگێکی نەبوو و بە هیچ شـێوەیەکیش خۆی نیشـان نەدابوو. ئەمەش بە هیچ شـێوەیەک نیشانەیەکی باش نەبوو...

ڕاسـکۆڵنیکۆف کڵاوەکەی هەڵگرت و هەر وا تێفکرانە ژوورەکەی جێ هێشت. دوای ماوەیەکی زۆر ئەوە یەکەمین جار بوو کە هەستی دەکرد لانیکەم زەینی کراوە و ڕۆشـنە. لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *بەر لە هەر شـتێ دەبێ مەسـەلەی سـڤیدریگایلۆف یەکلایی بکەمەوە،*

*زۆر زوویش. وا بزانم خۆیشـــی چاوەڕێیە من بە پێی خۆم بچمە* خزمەتی. کتوپڕ شـەپۆلێکی بێزاریی هێندە سامناک هەڵی کوتایە سـەر دڵی تیاماوی کە ئەگەر دەســـتی بە ســـڤیدریگایلۆف یان پۆرفیری ڕابگەیشـــتبا، بۆی هەبوو یەکێکیان بکوژێت. لانیکەم هەســـتی پێی دەگوت ئەگەر ئێســـتەش نەبێت، بە دڵنیاییەوە هەر دواتر دەتوانێت دانەیەکیان بنێرێتە دۆزەخ. *جا دەشـــبینین، دەبینین!* ئەمەی چەندان و چەندان جار لەبەرخۆیەوە گوتەوە.

وەلێ هێشـــتا بە تەواوی دەرگەی ژوورەکەی نەکردبووەوە کە لە باداکەدا لووتی بە لووتی پارفێرییەوە تەقی، لێکۆڵەرەکە هـاتبووە دیدەنیی ئەو. ڕاسـکۆڵنیکۆف لە جێوە وشـک بوو و لە سـەرسـامیان زمان شکایە دەمی، بەڵام ئەم بارەی ساتێک زیاتری نەخایاند. لەوەش سـەیرتر ئەوە بوو کە بە بینینی پۆرفیری سـەرسـام نەبووبوو و هیچ ترسـێکیشـی لێی نەبوو. هەڵبەتە ڕاچەنیبوو، وەلێ زۆر زوو هەسـت و هۆشـیی کۆ کردنەوە و خزایە قەپێلکی بەرگرییەوە: *لەوانەیە ئەمە ئیتر کۆتاییەکەی بێ! وەلێ چۆنچۆنی هەروەک پشیلە، وا بێچرپە سەرکەوت کە من هیچم نەبیست؟ نەکا لە پشت دەرگەکەوە گوێی هەڵخستبێ؟*

– دەبینم چاوەڕێی میوان نەبوون، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچی ئازیز!

پۆرفێری بەدەم پێکەنینەوە کردیە هەڵا.

– دەمێک بوو بەتەمابووم ســـەریکتان لێ بدەم و ئێســـتەش کە خەریـک بووم بێرەدا ڕەد دەبووم، بە خۆمم گوت بۆ نەچم پێنج خولەکێ ببینم؟ بەتەمـای دەرەوە بوون؟ زۆر کـاتتـان نـاگرم، تەنیـا جگەرەیەک دەکێشم.

– فەرموون، پۆرفێری پیترۆڤیچ. فەرموون دانیشـــن. فەرموون دانیشن.

ڕاســـــکۆڵنیکۆف هێنده گەرموگوڕ و هاوڕێیانه میوانەکەیی داوەت کرده ژوور و فەرمووی دانیشتنی لێ کرد کە ئەگەر خۆی بیتوانیبا له دەرێرا ئەو دیمەنه ببینێت، بێگومان ســـەری لەو هەڵســـوکەتەی خۆی ســـوڕ دەما. ئیدی کۆتایی یارییەکە بوو. کەواته مەســـەلەکە ئەمەیه کە مرۆڤ گەر بکەوێته داوی ڕێگرانەوە، نیوکاتژمێرێک ترسێکی کوشنده ئەزموون دەکــات، بەڵام کە دواجــار چەقۆ دەخەنه قورقوڕاگەیەوە، دەبینێت هیچ ئاسەوارێک له ترس نەماوەتەوە. ڕاسکۆڵنیکۆف ڕۆیشت و ڕێک لەبەردەم پارفێریدا دانیشـــــت و بێ ئەوەی تەنانەت چاویش بتروووســـــکێنێت، لێی ڕاما. پۆرفێری چــاوەکــانیی زیــت کردنەوە و جگەرەیەکی داگیرساند.

*دەی ئیتر، بیڵێ! بیڵێ دەی!* دەتگوت ئەم وشــانه دەیانەوێ له ســنگی ڕاسکۆڵنیکۆفەوە دەرچن. *قسه بکه ئیترا دەی بۆچی، بۆچی هیچ ناڵێی؟*

## دوو

– ئاخ بەدەست ئەم جگەرەیەوە!

پۆرفیری پیترۆڤیچ دواجار کە جگەرەکەیی داگیرساند و مژێکی لێدا، ئەمەی گوت و لەسەری ڕۆیشت:

– دووکەڵ و هالاو ئافاتی گیانی مرۆڤن، وەلێ خۆ من هەر نەمتوانی واز لەم جگەرەیە بێنم. هەموو جارێ دەکەومە کۆکە، وا ئێستەش قورگم دەخورێ و بە ئاستەم هەناسە دەدەم! وەلێ بەینی خۆمان بێ ئازیز، من ترسنۆکم، ترسنۆک! ماوەیەک لەمەوبەر چوومە لای دکتۆر *ڤاتکین*[1]. ئەو لانیکەم بۆ هەر نەخۆشێ نیوکاتژمێر دادەنێ. ئێ، بە کورتییەکەی هەر کە چاوی پێم کەوت، دایە قاقای پێکەنین و گوێی بۆ دەنگی هەناسە و سنگم گرت و گوتی، *توتن ژەهرە بۆت! خەریکە سییەکانت وێران دەکا! هەویان کردووە!* بەس ئاخر چۆن وازی لێ بێنم؟ بۆ لەبری جگەرە شتێکی تر هەیە دەستی بۆ بەرم؟ پیاوی خواردنەوە و شتیش نیم. کێشەکەشم ئەوەیە! هاهاها! نا، هی ئەوە نیم! هەموو شتێ ڕێژەییە، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچی ئازیز، ڕێژەیی!

*باشە مەبەستی چییە؟ وا دیارە دیسان بەتەمای لێدانی هەمان فێڵ و تەڵەکە پیشەییەکانیەتی!* ڕاسکۆڵنیکۆف خەریک بوو بە بێزاری بیری دەکردەوە. کتوپڕ یەک بە یەکی کۆتاساتەکانی دیدارەکەیانی هاتنەوە بیر و هەمان هەستی ئەو ڕۆژە وەک شەپۆل دای بەسەر دڵیدا.

---

١. سێرگی ڤاتکین، ئەو دکتۆرەی کە نەخۆشییەکەی دۆستۆیڤسکیی دیاری کرد. «و. ف»

– چەند ڕۆژێ لەمەوبەر و ئێوارەیەکیان هاتم بتانبینم، پێیان نەگوتی؟

پۆرفێری چاوی بە ژوورەکەدا خشاند و درێژەی پێ دا:

– هاتمە ژوورەکەشـــتان. وەک ئەمڕۆ خەریک بووم بەم ناوەدا ڕادەبردم کە ئەوەم بە بیردا هات ســـەرێکتان لێ بدەم. دەرگەی ژوورەکەتان لەسەر پشت بوو، لەبەر ئەوە ئیتر ملم نا و هاتمە ژوور. چاوێکم لە دەوروبەرم کرد و چاوەڕێ مام و ئاخرییەکەی بێ ئەوەی خزمەتکارەکەشتان ببینم، ڕێی خۆمم گرت و ڕۆیشتم. ئێوە هەمیشە دەرگەی ژوورەکەتان داناخەن؟

ڕووخســـاری ڕاســـکۆڵنیکۆف ســـات دوای ســـات مۆنتر دەبوو و پارفێریش دەتگوت سۆسەی ئەوە دەکات کە ئەو بیری بۆچی دەچێت.

– هاتم تا بابەتەکەتان بۆ ڕوون بکەمەوە، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچی ئازیز! با ڕوونکردنەوەیەک بدەم و بڕۆم.

پۆرفێری نیوەبزە ناسـراوەکەیی کرد و تەنانەت نەرم و هێمنیش بە ئەژنۆی ڕاسکۆڵنیکۆفیدا کێشا. وەلێ کەم تا زۆر ڕووخساری بارێکی جددی و تێفکرانەی تێگەڕا و ڕاسکۆڵنیکۆف لەوپەڕی سـەراسـیمەییدا ئاسەوارێکی خەمی لە نیگایدا بەدی کرد؛ تا ئێستە پۆرفێری پیترۆڤیچی لە وەها بارێکدا نەدیبوو و هەرگیزیش بە بیریدا نەدەهات بەو شێوەیە ببینێت.

– ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ، دواهەمین جار کە یەکترمان بینی، هەڵسوکەوتێکی سەیرمان هەبوو. یەکەمین دیداریشمان جیاوازییەکی وای نەبوو هەڵبەتە، وەلێ ئەوکات... دەی، با لێی گەڕێین جارێ! دەمویست بڵێم من لەئاست ئێوەدا بە جۆرێ لە جۆرەکان تاوانبارم و خۆم باش ئەمە دەزانم، ئازیز گیان! خۆ بیرتانە ئەو ڕۆژە بە چ حاڵێکەوە لێک جیا بووینەوە؟ ئێوە بە پەستی و ئەژنۆی لەرزۆکەوە...

منیش خراپتر لە ئێوە! ئەو هەڵسـوکەوتە بە هیچ شـێوەیەک لە ئێمە نەدەوەشایەوە. ئێمە، هەرچییەک بێ، کەسانێکی شارستانیین و دەبێ ئەمەمان لە بیر بێ. خۆ بیرتانە ئەو ڕۆژە هەڵسوکەوتەکەمان چیی لێ کەوتەوە... بە هیچ شێوەیەک لەئاست ئێمەدا نەبوو!

*مەبەسـتی چییە لەم قسـانە؟ ئەسـلەن لای خۆیەوە منی بە چی زانیوە؟* ڕاسکۆڵنیکۆف دۆشداماو ئەمانەی لە خۆی دەپرسین. سەری هەڵبڕی و بە چاوانێکی زەقبووەوە لەتاو سەرسامی بە پارفێریدا واق بوو.

– من بەو ئەنجامە گەیشـتووم کە لەنێو ئێمەدا تەنیا ڕاسـتگۆیی بە کەڵک دێ...

پۆرفێری درێژەی بە قسـەکەی دا. تۆزێک سـەریی بەرز کردەوە و نیگـای بڕییە زەوی؛ وەک ئەوەی نەیەوێـت بە چـاوبڕینەچـاو، قوربـانییەکەی جـارانی ئـازار بـدات و وا دەردەکەوت ئێسـتە ئەو فڕوفێڵانەی جارانی لەئاست کەسایەتیی خۆیدا نابینێتەوە.

– بەڵێ دەی، ناکرێ ئەم گومانبردنە هەڵە و هەڵسـوکەوتانە تاهەتا درێژە بکێشـن. خوا میکۆلایمان بۆ بهێڵێ کە لەو کاتەدا هات و کاری بۆ ئاسـان کردین، گەرنا من لەلایەن خۆمەوە نازانم ئەم مەسـەلەیە چۆن دەشـکایەوە! ئەو کابرا چەرمچییەش[1] لە ژوورەکەی تەنیشـتمان دانیشـتبوو ئەو ڕۆژە، خۆ حـاڵی دەبێ چی دەڵێم؟ هەڵبەتە ئێوە ئاگادارن و منیش هەواڵیم هەیە کە کابرا دواتر هاتووە بۆ لای ئێوە. وەلێ ئێوە لەو کاتەدا بە هەڵە تێگەیشـتن، چونکە نە من ناردبوومە دوای کەسـێک و نە پێشـوەختەش بەرنامەیەکم هەبوو. لە نیگاتاندا دەیخوێنمەوە کە دەپرسـن بۆ نا؟ چۆن بیڵێم: دەتگوت بە گشـتی ئەم ڕووداوانە کتوپڕ داویانە بە سـەرمدا و گێژیان خسـتبووم. تەنانەت بە

١. چەرمچی: دەباخ: ئەو کەسەی کاری پاک و خۆشەکردنی پێستە.

هەزار حاڵێکیش ئەو قاپچییانەم بانگ کردن ئامادە بن و لام وایە لە کاتی چوونەدەرەوەدا، بینیتانن؟ لەو کاتەدا بیرێک وەک برووسکە بە مێشکمدا هات... دەزانن ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ، ئیتر هیچ گومانێکم بۆ نەمابووەوە. لەبەرخۆمەوە بیرم کردەوە، *خۆ هیچ لەدەست نادەی! خاڵێک دەدەی و لەبەرانبەردا شتێکی باشترت دەست دەکەوێ! دواجاریش نێچیرەکە هی خۆتە!* ئێوە زۆر زوو هەڵدەچن، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ. سرووشتتان وایە! ئەوەی ڕاستی بێ ئەم زووهەڵچوونەتان زۆر لەگەڵ لایەنەکانی تری کەسایەتیی ئێوەدا ناکۆکە، چونکە من ئەو شانازییەم پێ براوە کە وەک پێویست شارەزای ئێوە بم! ئەوە گومانی تێدا نییە کە من ئەوکات نەمدەتوانی بڕوا بەوە بکەم کە بەرانبەرەکەت هەستێ و زۆر بە سادەیی هەموو شتێ ئاشکرا بکا! جاروبار ئەوە ڕووی داوە کە بەرانبەرەکەت هەموو شتێ دەرخا، وەلێ هەمیشە وا نییە و، ئەگەر ڕوو بدا، دەبێ پێشوەختە بە تەواوی زەینی شپرزە بووبێ! من زۆر باش هەموو ئەم شتانەم دەزانین و بە خۆمم گوت، *دەبێ سەرەداوێکی گچکەت بە دەستەوە بێ! جا هەر شتێکی گچکەش بێ،* چونکە *ئەگەر هەر بە تەنیا سەرەداوی دەروونناسی بێ خۆ بێسوودە!* لەبەر ئەوەش بوو وای بۆ چووم ئەگەر بەرانبەرەکەم هەر بە ڕاستی تاوانبار بێ، دەکرێ شتێکی ڕێکوپێکی لێ دەربهێنی، کێ چووزانێ؟ تەنانەت دەکرێ چاوەڕوانیی ئەوەش بکەی بەسەر شتێکی سەرسوڕهێندا بچی! منیش ئەوکات پشتم بە سرووشتی زووهەڵچووی ئێوە قایم بوو و هەموو هیوایەکم بە خۆتان بوو!

– وەلێ بۆچی... بۆچی ئەم قسانە دەهێننەوە ناوەوە؟

دواجار ڕاسکۆلنیکۆفیش هاتە گۆ و سەرەڕای ئەوەی کە خۆیشی ڕێک نەیدەزانی پرسیار لە چی دەکا، ورتەورت ئەمەی گوت و بە بیرێکی ئاڵۆزەوە لە خۆی پرسی، *ئەمە چی دەڵێ، نەکا هەر بە ڕاستی وای زانیبێ من بێتاوانم؟*

– بۆچی ئەم قسانە دەهێنمە ناوەوە؟ دەی، هاتووم ڕوونکردنەوەیەک بدەم، چونکە ئەمە بە ئەرکی خۆم دەزانم! دەمەوێ هەموو بابەتەکەتان بۆ ڕوون بکەمەوە و پێتان بڵێم هەڵەتێگەیشـــتنەکە لە کوێوە ســـەری هەڵداوە! ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ، من ئێوەم زۆر ئەشـــکەنجە دا، بەس خۆ دێو نیم! باش دەزانم کە ئێوە چیتان کێشـا و بەرگەگرتنی ئەمە چەندە دژوار بووە، جـا بۆ مرۆڤێکی خەفەتبـاریش، بەس لووتبەرز و دەســـەڵاتویســـت کە زۆریش بێئۆقرەیە! بەهەرحاڵ بە بۆچوونی من، ئێوە کەسـێکی بەحورمەتن و نیشـانەگەلی گەورەیی لە کەسـایەتیتاندا هەن؛ گەرچی لە هەموو بیر و بڕواکانتاندا هـاوڕاتان نیم و ئەمەتان زۆر بە ڕاشـــکاوی و لە ناخی دڵەوە پێ دەڵێم، چونکە بە هیچ جۆرێ نامەوێ بتانخەڵەتێنم. من هەر لە دەســـتپێکی یەکترناســـینمانەوە، هۆگرتان بوومە. هەڵبەتە ڕەنگە پێکەنینتان بەم قســـەیەم بێ و مافی خۆشـتانە. دەزانم من هەر لە ســەرەتاوە نەچوومە دڵی ئێوەوە و هەر بە ڕاستیش هیچ هۆکارێک بۆ ئەوە نییە کە کەیفتان بە من هاتبێ. ئێوە چۆنتان پێ خۆشـە وای لێک بدەنەوە، وەلێ من ئەوپەڕی هەوڵی خۆم دەخەمە گەڕ تا ئەو ئاســـەوارەی ســـەرەتا لە زەینتاندا بســـڕمەوە و نیشـانی بدەم کە منیش هەســـت و ویژدانم هەیە! لە ناخی دڵەوە ئەمە دەڵێم.

پۆرفیری بە ســـەنگینی ئێســـتێکی کرد. ڕاســـکۆڵنیکۆف هەســـتی بە شـــەپۆلێکی نوێی ترس کرد و بیرکردنەوە لەوەی کە پۆرفیری ئەو بە بێتاوان دەزانێت، بەرەبەرە خەریک بوو ئازاری دەدا.

– پێویست ناکا هەر لە یەکەمین ساتەوە هەموو شتێ موو بە موو ڕوون بکەمەوە کە ئەسڵەن چی ئێمەی بەوێ گەیاند.

پۆرفیری درێژەی پێ دا:

– له بنەڕەتەوە کارێکی بێســـوودە و ئەرکێکی زیادە و لە توانای منیشـدا نییە. ئاخر هەر بە ڕاسـتی چۆن دەتوانم هەموو شـتێ ڕوون بکەمەوە؟ هەرچۆنێ بووە لە ســـەرەتاوە هەندێ دەنگۆ هەبوون. جا کەی و چۆن و لە زمـانی کێوە و... بۆچی ئەم دەنگۆیـانە کەوتنەوە گوێی من و نـاوی ئێوە برا، جـارێ بـا لێی گەڕێین. چونکە ئەوانەش پێویســـتییان بە گوتن نییە. زۆر بە هەڵکەوت کەوتمە گومانەوە، بۆی هەبوو ئەو پێشـــهاتە ڕوو نەدا و منیش گومان لە هیچ شـــتێ نەکەم! باشە ئێستە مەسەلەکە چی بوو؟ ئممم، ئەسڵەن ئەمەش پێویستیی بە گوتن نییە! هەرچۆنێ بووە دەنگۆکـان و ئەو پێشـــهـاتە، تۆوی گریمانەیەکی لە زەینی مندا چاند. بەڵێ، دانی پێدا دەنێم، چونکە ئەگەر بڕیار لەسـەر گوتن بێ، دەبێ هەموو شـتێ بە ڕاسـتی و بێ پێچوپەنا بگوترێ! ســـەرەتا من هێرشـــم کردە ســـەر ئێوە. ئەو کاغەزانەی کە پیرێژنەکە بۆ هەر بارمتەیەک دایبابوون و حســـێبەکانی و ئەم جۆرە شتانە، شتێکی ئەوتۆ نەبوو؛ بارمتەکەی ئێوەش لەنێو سەدان بارمتەی تـردا بـوو! وا هەڵـکەوت کە ڕووداوەکـانـی ئەو ڕۆژەی ئـێـوە لە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیســـــدا گەیشـــتنە گوێی من، جـا لە دەمی چیرۆکبێژێکیشـەوە کە زۆر باش هەموو شـتێکی گێڕایەوە و سـات بە ســـات هەموو دیمەنە ســـەیرەکەی ئەو ڕۆژەتـانی بە وردەکارییە جێســـەرنجەکەی وێنا کرد! خۆتان ئیدی پارچەکان بخەنە پاڵ یەکتری، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچی ئازیز! چۆن دەمتوانی بەر بە خۆم بگرم و فکرێک نەکەوێتە سەرمەوە؟ وەک ئەم ئینگلیزانە دەڵێن، مرۆڤ ئەسپێکی هەبێ لە سەد کەروێشک باشترە؛ سەد دانە گومانیش یەک بەڵگە ناهێنن! خۆ بێگومان بیســـتووتانە؟ هەڵبەتە بەم جۆرە تەنیا لۆژیکی بابەتەکە لە بەرچاو دەگرن، دەنا خۆ لێکۆڵەری داماویش دواجار وەک هەمووان مرۆڤێکە. دەبێ چی لەوە بکەی؟ لە لایەکیشـــەوە زۆر بیرم لەو گوتارەتان کردەوە کە لەو گۆڤارەدا بڵاو بووبووەوە. خۆ بیرتانە کە هەر لە هەمان دیدارەکەی ســـەرەتادا چەندە باســـیمان کرد؟ ئەوکات

دەســـتم کردە قەشـــمەری، وەلێ تەنیا مەبەســـتم بوو دنەتان بدەم. هەمدیسان دەیڵێمەوە، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ، کە ئێوە نەخۆشن و زۆریش بێسـرەوت. ئەوەی کە ئێوە بوێر و لووتبەرز و جددین و... زۆریش بە هەست و... لە ماوەیەک لەمەوبەرەوە ئەمانەم دەزانین. چاک دەرک بە هەســـتەکانتان دەکەم و کە ئەو گوتارەشـــم خوێندەوە، زۆر بەلامەوە ئاشـنا بوو. ئەو گوتارە بەرهەمی دونیایەک شـەونخوونی بوو؛ کاتێک کە دڵەخورپەتـان هەبووە و هەســـتتان پامـاڵ کراوە. ئەم هەســـتە لووتبەرزانە و پامالْکراوە گەلێک مەترســـیدارە! ڕاســـتە ئەو ڕۆژە بە جۆرێ لە جۆرەکان ســـەرم خســـتە ســـەرتان، وەلێ لێگەڕێن پێتانی ڕابگەیەنم کە من ئەم جۆرە ســـەرگەرمیانە زۆر پەســـەند دەکەم؛ ڕێک وەک دووکەڵ و تەمێـک کە لەنـاوییەوە دەنگی تـارێـک دێتە گوێ[1]. گوتارەکەتان دۆشداهێنەر و سەمەرە بوو، وەلێ لە هەندێک شوێنیشدا ڕاسـتگۆییەکی ڕووتی تێدا بوو؛ هەمان ئەو خۆپەســەندییە ناسـراوەی گەنجی و بێباکییەی کە لە دەستەوەسانییەوە سەرچاوە دەگرێت. زۆر ڕەش و قورس دەرچووە وتارەکەی ئێوە و باشییەکەشی هەر ئەمەیە. کە گوتارەکەی ئێوەم خوێندەوە و خســـتمە لاوە... خەریک بووم بیرم دەکردەوە، *ڕێگەی ئەم مرۆڤە لە هی ئەوانی تر ناچێ*. دەی، ئێســـتە لە خۆتـان دەپرســـم، دەکرا لە کـاتی هـاتنەئارای ئەو ڕووداوەدا و بەم پێشـگریمانانەوە، هەزار فکرم بە سـەردا نەیێن؟ خوایە گیان! ئەوە چی دەڵێم؟ خەریکی ســەلماندنی چیم بەم قسـانە؟ ئەوکات تەنیا بیرم لەوە دەکردەوە کە بەم قســانە چیمان دەســت دەکەوێ؟ هیچ! ئەم قســانە هیچیان تێدا نییە کە بەکەڵکی ئێمە بێ. هەر بە ڕاســـتی هیچ نییە. بە هیچ جۆرێکیش شیاو نییە لێکۆڵەر و شت جڵەوی خۆیان بدەنە دەست

---

١. ئاماژەیە بە برگەی کۆتایی *یادداشـتەکانی شـێتێک* کە بەرهەمی نیکۆلای گۆگۆلە. تیخامیرۆف لە شرۆڤەکەی خۆیدا، لای وابووە تا ڕادەیەک ڕاسکۆڵنیکۆف و پاڵەوانی *یادداشتەکانی شێتێک* لێک دەچن. «و. ف»

ئەم جۆرە هەڵچوون و بیرکردنەوانە، جا ئەوەش لە کاتێکدا کە هێشتا میکۆلایم لەبەردەستدایە بە کێویک لە بەڵگەی بەهێز و بڕواپێکراوەوە. بەڵێ، بەڵگە هەیە و ڕێکوپێکیشە! جا بەڕێزیان دەروونناسیی خۆیشیان هەیە، ناکرێ چاوی لێ بپۆشرێ، مەسەلەی مەرگ و ژیانە! ئێستە بۆچی خەریکم ئەم هەموو شتە بۆ ئێوە ڕوون دەکەمەوە؟ دەمەوێ لە هەمووی تێبگەن و لەو بەرکەوتنە خراپ و ئازاردەرانانەدا من بە تاوانبار نەزانن! دڵنیا بن دەستئەنقەست نەمدەویست ئازارتان بدەم، هەهەهەها! باشە ئێستە چۆنی بۆ دەچن؟ من ئەم ژوورەم نەپشکنیوە؟ با، چاکیشم پشکنیوە، هەهەهەها، لێرە بووم. کاتێ ئێوە بە نەخۆشی کەوتبوونە سەر تەختەخەوەکەتان، منیش لێرە بووم. بە شێوەیەکی فەرمی نا، وەک خودی خۆم نا، بەڵام بزانە کە لێرەبووم! هەموو شتێکی ئێرە هەر ئەو کات پشکنراوە، وەلێ بێسوود بوو! بە خۆمم گوت ئەم کەسە خۆی دێ بۆ لام، بە پێی خۆیشی دێ. ئەگەر تاوانبار بێ، زۆر زوو سەروسەکوتی دەردەکەوێ. بە دڵنیاییەوە دێ بۆ لام! خۆ گەر مرۆڤێکی تر بێ لەوانەیە نەیێ، وەلێ ئەم کەسە دێ. خۆ بیرتانە ئێتر، کە ڕازومیخین چۆن پەلەپەل سەری قسەی لەگەڵ کردنەوە؟ ئەوە پلانی ئێمە بوو کە دەمانویست بکەوێتە دڵەڕاوکێوە. چەند دەنگۆیەکی باشمان بڵاو کردنەوە تا ڕازومیخین بیانگەیەنێتەوە بە ئێوە و دڵنیاش بووین کە خۆی ناگرێ و بە ئێوەیان دەڵێ؛ ئەو دواجار مرۆڤێکە نازانێ پارێز و پشوودرێژی چییە و ناتوانێ تووڕەیی خۆیشی جڵەو بکا. بەڕێز زامیۆتۆفیش بە تەواوی لەو تووڕەیی و بێباکییە سەیرەتان تۆقیبوو. بیری لێ بکەنەوە! کەسێ بگەڕێتەوە ناوەڕاستی ڕێستۆرانت و بڵێ، *من کوشتم!* ئەمە بوێرییەکی زۆری دەویست و هەر بە ڕاستی ئازایەتیتان نواند! لەبەرخۆمەوە بیرم کردەوە، *گەر ئەم کەسە تاوانبار بێ، کەواتە دەبێتە جەنگاوەرێکی سەرسەخت!* لەو کاتەدا وام بیر دەکردەوە. چاوەڕێتان بووم و سەرەوتم لێ بڕابوو! وەلێ ئێوە جارێ هیچ نەبووبوو کە زامیۆتۆفتان

پلیشـــاندبووەوە... جا، بڕوانن کە کێشــە ســـەرەکییەکە لێرانەدایە: ئەم دەروونناسییە نەفرەتییە ڕێک وەک شمشێری دوودەم وایە! ئی، من بە دڵ و بە گیان چاوەڕێی ئێوە بووم و کتوپڕ خوا ئێوەی بۆ ناردم و... دواجار هاتن! دڵم خورپەی دەهات. ئاخ، بۆچی هاتن بۆ لام ئەو ڕۆژە؟ جا پێکەنینە ســەیروســەمەرەکەی ئەو ڕۆژەتان کە هاتنە لام، بیرتانە؟ دەتگوت بۆ من هەموو شــتێ وەک ڕۆژ ڕۆشــن بوو! وەلێ گەر ئاوها بە دڵ و بە گیــان چــاوەڕێتــان نەبــام، لە پێکەنینەکەتــانەوە هیچم هەڵنەدەکراند. ئەمە نیشــانی دەدا کە هێزی زەینی مرۆڤ چەندە زیادە. کــاتێ بیر لە بەڕێز ڕازومیخین دەکەمەوە کە دواتر... ئــاخ، بەڵێ! ئەو بەردەش هەیە، هەمــان ئەو بەردەی کە شــــمەکەکــانیــان لەژێریــدا شاردووەتەوە! وەک ئەوە وایە بتوانم بە چاوی خۆم ببینم، لە لایەکی بێســتانێکەوە، شــوێنێ... لام وایە گوتتان لە بێســتانێکدا، ســەرەتا بە زامیۆتۆفتــان گوت هەڵبەتە جا پاشـــــان بە خۆم. کاتێ لەگەڵ ئێوەدا گوتارەکەتانم شــی کردەوە، ڕوونکردنەوەیەکی چەندە شــازتان بۆ ڕێز کردین و دەکرا هەر وشەیەکی قسەکەتان بە دوو جۆر لێک بدرێتەوە؛ دەتگوت لەپشت هەر قسەیەکتانەوە مانایەکی شاراوە هەیە. بەم جۆرە بوو، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچی ئازیز، کە تا دواقۆناغ ڕۆیشــتم، ســەرم بەر بەرد کەوت و ئەوســـا ئەقڵم هاتەوە ســـەر خۆی. بە خۆمم گوت، *ئا بوەســــتە بزانم، ئەوە خەریکی چیی؟* وام لێک دایەوە دەکرێ هەر لە ســــەرەتای ســــەرەتاوە بە جۆرێکی تر لە بابەتەکە بڕوانین و لێکی بدەینەوە؛ لەوانەشە ئەنجامەکەی سرووشتیتر و باشتریش دەرچێ! بە کورتییەکەی ئەشــکەنجەیەکی ســەیر بوو! بە خۆمم گوت، *نا، باشــتر وایە کۆتایی پێ بێنی!*... بەس کە مەســــەلەی ئەو تاکزەنگەی بەردەم ئەپارتمانەکەم بیست، لە جێوە وشک بووم و تەنانەت لەرزم لێ نیشت. لەبەرخۆمەوە بیرم کردەوە، *ئەوەش بەڵگە، فەرموو، ئەوەتا!* زۆریش نەچوومە نێو وردەکارییەوە و بیرم لێ نەکردەوە، نەشــــمدەویســـت بیبەڵگێنم. پاشــــانیش ئامادە بووم هەزار ڕۆبڵ بدەم و ئێوە ببینم لە

کاتی ڕێکردنی شـــانبەشـــانتان بە درێژایی ســـەد هەنگاو لەگەڵ ئەو کاسبەدا، جا لە چ کاتێکیشدا، ڕێک دوای ئەوەی پێتاندا واق بووبوو و پێی گوتبوون بکوژ و ئێوەش بە درێژایی ئەو ســـەد هەنگـاوە نەتـانوێرابوو هیچی لێ بپرســـن. جـا ئەی ئەو لەرزین و تەزینەی ستوونی پشتتان؟ ئەی ئەو تاکزەنگانەی کاتی نەخۆشـی و وڕێنەتان؟ بەم پێیە، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچی ئازیز، بۆ دەبێ بەوە ســەرســام بن کە لەو جۆرە فڕوفێڵانەم لێ دەدا؟ باشــە ئەوە چی بوو کە لە کاتی خۆیدا دەرکەوتن؟ دەتگوت کەسێ دەستی گرتوون و ڕێک هێناونی بۆ ئەوێ! جا گەر میکۆلای نەهاتبا ناوەوە... خۆ میکۆلایتان بیرە؟ باش بیرتان مـاوە؟ چەخمـاخەیەک بوو ئەو کـابرایە، کە کتوپڕ لە نـاوجەرگەی هەورێکی ڕەشـەوە دایدا. جا سـەیری من کە چۆن بە گژیدا چوومەوە! هەڵبەتە بۆ ساتێکیش بڕوام بەو چەخماخەیە نەکرد! خۆ خۆتان ئاگادار بوون، چۆن دەمتوانی بـاوەڕ بکەم؟ تەنـانەت دوای ئەوەش کە ئێوە ڕۆیشـتن میکۆلای دەسـتی کردە وەڵامدانەوەی شـۆردن و سـڕین و ڕوونکردنەوەی هەندێ خاڵ و توانیی تەنانەت منیش ســەرســام بکا، لەگەڵ ئەوەشـــدا هەر باوەڕم بە چیرۆکەکەی نەکرد! بە خۆمم گوت، *هەر باسیشی مەکە! میکۆلای و ئەم تاوانە گەورانە!*

– خۆ ڕازومیخین دەیگوت ئێوە وای بۆ دەچن کاری میکۆلای بووە و خۆتان پێتان گوتووە کە گومانەکەتان ڕەویوەتەوە...

هەناســـەی ڕاســـکۆڵنیکۆف گیرا و نەیتوانی درێژەی پێ بدات. بە پەشـۆکانێکی وەسـفهەڵنەگرەوە گوێی بۆ قســەکانی پۆرفیری گرتبوو، پـارفیرییەک کە هەر لە ســـەرەتـاوە دەتگوت دەروونـی ئەوی خوێندبووەوە و تا ئەوپەڕی بوونیی بەرهەست کردبوو. دەترسا باوەڕ بە قسـەی ئەو بکات و باوەڕیشـی پێ نەدەکرد. چڵێسـانە لەو وشـە و ڕســـتە ناڕوونانەی لێکۆڵەرەکەدا، لەدووی شـــتێکی تۆکمە و بنجبڕ دەگەڕا.

بەم پرسیارەی ڕاسکۆڵنیکۆف، کە تا ئەو ساتە بێدەنگ بوو، دەتگوت دونیایان داوەتە پۆرفیری و لێکۆڵەرەکە خرۆشاوانە هاواری کرد:

– دە وا بڵێن، کەواتە جەنابی ڕازومیخین وایان گوتووە! هەهەهە! ئاخر ناچار بووم بە جۆرێ لە جۆرەکان دەمی جەنابی ڕازومیخین داخەم دەی! دەمویست دووبەدوو هەر خۆمان بین؛ کەسی سێیەم دەبێتە مووی لووت! دوای ئەوەش بەڕێز ڕازومیخین کەسێکی شیاو نییە بۆ ئەم بابەتە، یانی لەم مەسەلەیەدا، خۆمانە نییە. جا خۆتان لێکی بدەنەوە، بە هەڵەداوان هاتە لای من؛ ڕەنگیشی هەروەک گەچ سپی بوو... خوا ئاگاداری بێ، باشە ئێستە بۆچی بیهێنینە نێوانەوە؟ با بێینەوە سەر میکۆلایەکەی خۆمان، حەز دەکەن بزانن ئەم کوڕە چ جۆرە مرۆڤێکە و وەک بابەتیش چۆن لێی تێگەیشتووم؟ یەکەمین و گرنگترین خاڵ ئەوەیە کە ئەم کوڕەخاسەیە هێشتا دەمی بۆنی شیری لێ دێ؛ ناکرێ بڵێین ترسنۆکە، بەڵکە زیاتر دەچێتەوە سەر هونەرمەند و شت! بە جددیم بوو، بە بۆچوونەکەم پێمەکەنن! بە جۆرێ لە جۆرەکانیش پاک و زۆر هەستیار. دڵێکی میهرەبانی هەیە و هێزی خەیاڵیشی بەرفراوانە. حەزی لە سەمایە و تۆزە دەنگێکیشی هەیە، دەتوانێ باش چیرۆک بگێڕێتەوە و خەڵکی چواردەوری بەدەم گوێگرتن لە چیرۆکەکانییەوە دادەنیشن. لەو کەسانەیە کە دەچن بۆ خوێندنگە، وەلێ گەر کەسێ پەنجەی بەری بکەوێ، لەتاو پێکەنین دەبووریتەوە. لە لایەکەوە، دەتوانێ ئەوەندە بخواتەوە تا بە بێهۆشی بکەوێ، هەڵبەتە لەو خۆشگوزەرانانە نییە بەدمەستی بکا، بەس هەر دەڵێی منالە و کە فەرموویان لێ کرد، ناتوانێ بڵێ نا! لەو کاتەشدا بێ ئەوەی بزانێ خەریکی چییە، شمەکەکانی هەڵگرتوون. وەک خۆی دەڵێ *بۆ ئەگەر شتێکت دۆزییەوە و هەڵتگرتەوە، دەبێتە دزی؟* هەر بە ڕاست

دەتانزانی میکۆلای لە ڕاسکۆلنیکەکانە؟[1] نەک بڵێین بە تەواوەتی سەر بە ئەوان بێ، بەڵکە بە جۆرێ لە جۆرەکان لەو دەستەخوازانەیە. چەند کەسێک لە نزیکەکانیشان لە *ڕاکردووەکان* بوونە![2] خۆیشی ماوەی دوو ساڵێ لە گوندەکەیاندا مورید‌ی زاهیدێکی دوورەپەرێز بووە. هەموو ئەمانەم لە قسەکانی خودی میکۆلای و هاوشارییەکانییەوە دەست کەوتن. کۆتایی نەهاتووە! جا کوڕە هێشتا بەتەما بووە ڕوو لە کێو و دارستانیش بنێ! لە یارۆ دەمارگیرە تووشەکان بووە. شەوانە تا بەیانی لە بارەگەی خوادا دوعای کردووە و تەنیا ئەو کتێبە دێرینانەی خوێندوونەتەوە کە وەک دەڵێن، باسی هەقیان کردووە.[3] ئەوەندەشی خوێندووە و خوێندووەتەوە تا بە تەواوی شێت بووە. پیتەربورگ کاریگەرییەکی زۆری دەخاتە سەر، بەتایبەت شتی جوان و هەڵبەتە شەرابیش. میکۆلای ئێمەش لەبەر ئەوەی هەستیارە و زوو دەکەوێتە ژێر کاریگەرییەوە، ئیتر زاهید و موریدی و حەقیقەت و هەموو شتێکی بیر دەچێتەوە. بیستوومە گوایە هونەرمەندێ کەیفی بە میکۆلای هاتووە و زۆریش چووە بۆ لای و هەر لەو کاتەشدا ئەم بابەتە دێتە پێش. جا، ترساوە و ویستوویەتی خۆی لە دار بدا. لە

---

١. ڕاسکۆل: ڕەگی ناوی ڕاسکۆلنیکۆفە و مانای ورد و پەرتەوازە و کەرتبوو دەگەیەنێت و، لە شێوەی *ڕاسکۆلنیک*دا، واتایەکی وەک پەرتەوازەویست و دەستەخواز دەگەیەنێت. لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەیەم بەدوای چاکسازییە مەزهەبییەکاندا، پەیکەری ئەرتەدۆسکی ڕووسی تووشی چەندپارچەیی بوو و دەستەگەلی جیاوازی لێ جیا بوونەوە، لەنێویاندا باوەڕدارانی دێرین یان ڕاسکۆلنیکەکان. «و. ف»

١. ڕاکردووەکان بڕوایان وا بوو کە ئەنارشیستەکان دەستیان بەسەر دونیادا گرتووە و دەبێ لەبەر ئەوان بەرەو سارا و دارستانەکان هەڵبێیت و بڕوایان وا بوو بە ئازارکێشان و لەئەستۆگرتنی تاوانێک کە خۆت تووشی نەبوویت، دەگەیتە ڕزگاری و پیرۆزی. «و. ف»

٢. مەبەست لەو کتێبە ئایینیانەیە کە بەلای باوەڕدارانی دێرینەوە پیرۆز بوونە، وەک گوتەکانی جان کریستۆم. (٤٠٧-٣٤٧). «و. ف»

هەموو کەس هەڵدێ. ئاخر چۆن دەکرێ دیدگەی ئەم کەســـە لە سیستمی دادوەریی ڕووسیا بگۆڕی؟ هەندێک تەنانەت هەر بە بیستنی وشـەی *دادگایی*، یەکسـەر دەبووریتەوە! وەلێ تاوانی هیچ کەسێ نییە. جا دەبینین ئەم دادگە تازانە چ قوڕێ بەســــەر هەمووواندا دەکەن. تەنیا خوا بکا بە ڕێکوپێکی کاری خۆیـان بکەن! ئێ، وا دیـارە میکۆلای لە زینداندا پیرە پیرۆزەکەیی دێتەوە یاد و هەمدیسـان کتێبی پیرۆزیشــی بە دەسـتەوە دەبینرێتەوە! ئایا دەزانن، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ، ئەم وشـەی *ئازارە* چ هێزێکی مەزنی لەپشــــتەوەیە بۆ هەندێ لەم کەسـانە؟ نەک لەبەر بەرژەوەندی و چاکەی ئەوانی تر بێ، تەنیا و تەنیا لەبەر ئەوەی دەبێ مرۆڤ ئازار بچێژێ. جا ئەگەر پیاوانی دەوڵەت و دەسـەڵاتداران تووشــــی ئەم ئازارەی.بکەن ئەوە هەر زۆر باشــترە! لە ســـەردەمی خزمەتکردنی مندا زیندانییەکی زۆر ســــەرکز و هێمن و شـــەرمنمان هەبوو کە لە ســــووچی زینداندا یەک ســـاڵی تەواوی بە خوێندنەوەی ئینجیلەوە بەســــەر برد، شــــەوانە بەدیار کوانووەکەوە ماتی دەکرد و ئەوەندە ئینجیلی خوێندەوە و خوێندەوە تا شـــێت بوو. وای لێ هات ڕۆژێکیان کتوپڕ دەســـتی دایە پارچە خشـــتێک و گرتییە ســـەرۆکی زیندانەکە، لە کاتێکدا کە سەرۆکی زیندان هیچ خراپەیەکی بۆ ئەو شێتە نەبووبوو! هەڵبەتە خشتێگرتنەکەشی سەرنجڕاکێش بوو، دەسئەنقست پارچەخشتەکەی بەولاترییەوە نا، بۆ ئەوەی بەر سەری کابرا نەکەوێ! هەموومان دەمانزانی چی بەسـەر کەسێکدا دەهێنن کە وەک دەڵێن، بە چەک هێرش بکاتە ســـەر ئەفســـەرێک لە کاتی خزمەتکردندا. ئیتر ئەو زیندانییەش بەو ئازارە گەیشـت کە خۆی دەیویسـت. بە بۆچوونی من میکۆلایش دەیویســـت ئازاری خۆی دەســـت بکەوێ یان شـــتێکی لەو جۆرە. دڵنیام. من بەپێی پاســـاو و بەڵگە دەدوێم. بەس هێشـــتا بەوەی نەزانیوە کە دەســـتیم خوێندووەتەوە... باوەڕ بە پەیدابوونی ئەم جۆرە مرۆڤـانە نـاکەن؟ جـا لەنێو کۆمەڵێک عەوامی لادێیدا؟ پەیـدا دەبن و زۆریشـــن! هەمدیســـان ئامادەگیی ئەو پیرە زەقتر بووەتەوە، بەتایبەت

دوای مەسەلەی لەداردان و خۆکوژی! وەلێ دواجار میکۆلای ئازیزمان بە پێی خۆی دێتە پێش و هەموو شــتێکم پێ دەڵێ. وا دەزانن تا کەی دەتوانێ خۆی بگرێ؟ هەر ئەوەندە بەسە تۆزێ دان بە خۆماندا بگرین، خۆی لە قسەکەی پاشگەز دەبێتەوە. هەر ساتەو چاوەڕێم دەرکەوێ و شــایەتییەکەی بگۆڕێ. ئەم کوڕە ســەرنجی ڕاکێشــاوم، بە تەواوی چوومەتە بنج‌وبناوانی و دەمەوێ ســەر لە هەموو شــتێکی دەربکەم. ئێوە ڕاتان چییە لەسەری؟ هەهە! لەبارەی هەندێ شتەوە، وەڵامەکانی شــاز و جێباوەڕ بوون. دیار بوو بە جۆرێ لە جۆرەکان زانیاریی کۆکردووەتەوە و بە دەســتی پڕەوە هاتووەتە پێش. وەلێ هەندێ خاڵ هەن یان لە بەرچاوی نەگرتوون یان هەر لە بنەڕەتەوە ئاگاداریان نەبووە. هیچ شــتێ لەبارەیانەوە نازانێ و هەرگیز بە بیریدا نایێ کە شــتگەلێ هەبن و ئەو نەیانزانێ! نا، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچی ئازیز، ئەمە کاری میکۆلای نییە! بابەتی ئەم کوشــتنە زۆر لەوە ئاڵۆزترە، پڕە لە ڕاڕایی و وەهم و ڕەشــایی و ڕێــک لە توخمی ئەمڕۆی ئێمەیە، ئەمڕۆیەک کە دڵی مرۆڤەکان تاریک و ڕەش بووەتەوە و قسە لەسەر ئەوەیە بۆ تازەبوونەوە دەبێ خوێن بڕێژێ، ئەمڕۆیەک کە تێیدا هەموو شــتێ لە دیدگەی خۆشــگوزەرانی و ئارامییەوە لێک دەدرێتەوە. لەم دۆســییەیەی ئێمەدا ســەروکاریمان لەگەڵ خەونگەلێکدا هەیە کە لەنێو کتێبەکانەوە هاتوونەتە دەر و هەروەها لەگەڵ دڵێکدا کە تیۆرییەکان لە جێوە هەڵیان کەندووە! بڕیارێکی بەهەڵپە و تایبەت لەئارادایە؛ دەڵێی بکوژ ویســتوویەتی خۆی لە هەڵدێرێ یان تاوەری زەنگێکەوە هەڵداتە خوار. لە کــاتی ڕۆیشــتن بەرەو شــوێنی تــاوانەکەش، پێیەکــانی کەوتوونەتە لەرزین و نەیزانیوە بەتەمــایە لەوێ چی بکــا! تەنــانەت بیریشــی چووە بەدوای خۆیدا دەرگەکە پێوە بدا، کەچی هەر دەســت دەوەشێنێ و دوو کەس لەناو دەبا؛ لەبەر ئەو بۆچوون و تیۆرییەیەی! دوو کەســی کوشــت، کەچی نەیتوانی پارەکان هەڵگرێ و ئەو چوار وردەشــمەکەش کە توانیویەتی پڕیــان پێدا بکــا، بردوونی و لەژێر

بەردێکدا شاردوونیەتەوە. جا ئەو ئەشکەنجە و دڵەڕاوکێیەش کە دوای کوشتنەکە و لەپشت دەرگەکەوە تووشی بوو، کاتێ لەودیوەوە پاڵیان بە دەرگەکەوە دەنا و زەنگ دوای زەنگیان لێ دەدا، هەر دەڵێی بەسی نەبووە و دەبێ بێگومـان دواتر بە دۆخێکی نیوەوڕێنەکەرانەوە بگەڕێتەوە بۆ ئەو ئەپارتمانە چۆڵە تا بیرەوەریی ئەو زەنگلێدانەی بۆ نوێ ببێتەوە. ویستوویەتی هەمدیسان ئەو لەرزە بکەوێتەوە گیانی! ئەوە ڕاستە کە ڕەنگە بکرێ ئەمە بخەینە ئەستۆی نەخۆشییەکەی، وەلێ ئەی چی لەمە بکەین کە ئەو وێڕای ئەوەی بکوژێکە، کەچی خۆی بە مرۆڤێکی نەجیب دەزانێ و لەوانی تر بێزارە و وەک فریشتەیەکی ستەمدیدە و بریندار بەملا و بەولادا دەسووڕێتەوە. نا، ئەو کوشتنە کاری میکۆلای نییە، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچی ئازیزم.

چەند ڕستەیەکی کۆتایی قسەکانی پۆرفیری، دوای ئەو هەموو شتانەی کە پێشتر گوتران و دەتگوت نکۆڵیکردنی هەر جۆرە گومانێکە لە ڕاسکۆلنیکۆف، زیـاد لە ڕادە ڕاچڵەکێنەر و سامناک بوون. ڕاسکۆلنیکۆف بە چەشنێک هەڵلەرزی وەک ئەوەی زامدار بووبێت.

– ئەی... یانی کێیە... بکوژەکە کێیە؟

ڕاسکۆلنیکۆف ئیدی نەیتوانی خۆی کۆنترۆڵ بکات و بە هەناسەسوارییەوە ئەمەی پرسی و پۆرفیری وەک ئەوەی بە پرسیارەکەی ئەو سەراسیمە بووبێت، خۆی بەسەر کورسییەکەیدا دا.

– یانی چی کە بکوژەکە کێیە؟...

بە جۆرێک قسەکەی ڕاسکۆلنیکۆفی دووبارە کردەوە وەک ئەوەی باوەڕ نەکات کە ئەوەی بیستوویەتی ڕاستە.

– بکوژەکە ئێوەن ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچی ئازیز! بکوژەکە خودی ئێوەن.

پۆرفێری کەم تا زۆر بە ورتەوە ئەمەی بۆ زیاد کرد و شـــێوازی قسەکردنەکەی تەژی بوو لە بڕوا و دڵنیایی.

ڕاســـکۆڵنیکۆف لە جێگەکە دەرپەڕی و چەند ســـاتێک بە پێوە ڕاوەســـتا و، بێ ئەوەی ورتەی لێوە بێت، هەمدیســـان دانیشـــتەوە. ماسوولکەکانی ڕووخساری گرژ بووبوون و پرتەیان دەکرد.

– دیسان لێوتان کەوتووەتەوە لەرزین، ڕێک وەک ئەوکاتە.

پۆرفێری هاوخەمانە ئەو خاڵەی بیر هێنایەوە و دوای ئێســـتێکی کورت درێژەی پێ دایەوە:

– لام وایە باش لە مەبەستم تێنەگەیشتن، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ؛ هەر لەبەر ئەوەشە وا حەپەسان. من بەو مەبەستەوە هاتمە لاتان تا هەموو شتێ بڵێم و پەردەی سەر ئەم مەسەلەیە هەڵماڵم.

– من نەمکوشت!

ڕاســـکۆڵنیکۆف چون منداڵێکی ترســـاو کە لەکاتی خۆیدا بەســـەریدا چووبن، لەرزۆک و لەژێر لێوەوە ئەمەی گوت.

– نا، وا مەفەرموون، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ. کاری خۆتان بووە و هیچ کەسێکی تر لەنێواندا نییە.

چپاندنەکەی پۆرفێری بێڕادە جددی بوو و نیشـــاندەری بڕوایەکی قـووڵ و یەکـلاکەرەوە. هەردووکیـــان بێـــدەنـــگ بـــوون و لەپەڕی ســـەرســـامیدا بێدەنگی دە خولەکی خایاند. ڕاســـکۆڵنیکۆف ئەنیشـــکیی خســـتە ســـەر مێزەکە و پەنجەکانیی بەنێو ئەڵقەگەلی قژەکانیدا کردن. پۆرفێری بەدەم چـاوەڕوانییەوە، بێدەنـگ و ســـەرکز دانیشـــتبوو. ڕاســـکۆڵنیکۆف کتوپڕ بە بێزارییەوە نیگایەکی ســـووکایەتیئامێزی گرتە ئەو.

– دیسان چوونەوە سەر هەمان فێڵ و تەڵەکە ئاڵۆزەکانتان، پۆرفیری پیترۆڤیچ! دیسان هەمان ڕەوشە دێرینەکە! سەرم لەوە سووڕ ماوە چۆن خۆتان ماندوو نابن؟

– واز بێنن، کامە ڕەوش؟ خۆ گەر ئێستە کەسی لێرە با، ئەوەیان شتێکی تر بوو، بەس خۆ ئێمە بە تەنیا دەمەتەقێ دەکەین! خۆتان وا دەبینن من بۆ ئەوە نەهاتوومەتە ئێرە تا شوێنتان کەوم و بەگیرتان بێنم! ئێستە ئیتر دانپێدانانی ئێوە هیچ کەڵکێکی من ناگرێ، چونکە من گەیشتوومەتە باوەڕ و تەواو!

– دەی مادام وایە، بۆچی هاتن؟

ڕاسکۆڵنیکۆف بە تووڕەییەوە ئەمەی پرسی.

– هەمان پرسیارەکەی پێشترمتان لێ دەپرسمەوە: گەر بە بۆچوونی ئێوە من بکوژم، ئەی بۆچی دەستگیرم ناکەن و نامخەنە زیندانەوە؟

– ئۆو، ئای لەو پرسیارە! دەی، بە چەند خاڵیک وەڵامتان دەدەمەوە: یەکەم لەبەر ئەوەی گرتنی ئێوە بەم جۆرە هیچ سوودێکی بۆ من نییە.

– چۆن سوودی نییە؟ گەر دڵنیان من بکوژم ئەوا ئەرکتانە...

– گریمان دڵنیاش بم، ئەی دوای ئەوە؟ خۆ جارێ ئەمە تەنیا کۆمەڵێک خەیاڵاتی منن! جا بۆچی دەبێ هەستم و ئێوە بنێرمە شوێنێکی خۆش و بێوەی تا ئاسوودە ببن؟ خۆتان چاک دەزانن کە وا دەبێ و ئەمە لە بەرژەوەندیی ئێوەدایە، هەر لەبەر ئەوەشە دنەم دەدەن تا بتانگرم! گریمان ئەو کاسبەم هێنا و لەگەڵ ئێوەدا ڕووبەڕووم کردەوە. ئێوەش هەڵدەستن و پێی دەڵێن، چییە *سەرخۆشی؟ باشە کێ من و تۆی پێکەوە دیوە؟ من لام وایە تۆ تەواو سەرخۆش بووی و بە هەڵەشدا نەچووبووم!* دەی، من ئەوسا چیم بۆ دەمێنێتەوە بیڵێم؟

بەتایبەت لەبەر ئەوەی قســـەکەی ئێوە ڕێتێچووترە تا هیکەی ئەو کابرایە! شـایەتیی ئەو تەنیا لایەنێکی دەروونناسـیی هەیە و جا ئەو لە کوێ و ئەم جۆرە شتانە لە کوێ! ئاخر کابرا هەر بە ڕاستی ئالوودی خواردنەوەیە و ناویشـی زۆر بە خراپ ڕۆیشتووە. من خۆم تا ئێستە چەندان جار ڕێک و ڕاســت بە ئێوەم گوتووە کە دەروونناســی وەک شمشێری دوودەم وایە و هەمیشە دەمی دووەمی پیستر دەبڕێ و بە گشــتیش زیاتر بۆی هەیە ڕاســتتریش دەرکەوێ! بەدەر لەمانە، هیچ شــتێکی ترم لەدژی ئێوە لە بەردەســـتـدا نییە. هەڵبەتە ئەوە کاریگەرییەکی وای نییە و من دواجار ئێوە دەگرم، وەلێ هاتمە ئێرە تا بە پێچەوانەی هەموو یاســا و پێودانێکەوە، پێشــوەختە ئێوە ئاگادار بکەمەوە. هەمدیســـان بە پێچەوانەی هەمان ئەو پێودانانەوە وا زۆر ڕاســـتگۆیـانە پێتـان دەڵێم ئەمە لە بەرژەوەنـدیی منـدا نییە. ئەوە یەکەمیان، جا دووەم خاڵیش ئەوەیە کە من بۆیە هاتم بۆ لاتان...

– بەڵێ، بەڵێ، دووەمینی...

ڕاســکۆلنیکۆف هەروا هەناســەتەنگ گوێی بۆ قســـەکانی پۆرفیری دەگرت.

– بۆیە هـاتمە ئێرە... چونکە هەر بەو جۆرەی کە لە خزمەتتانـدا ڕامگەیاند، لام وایە ڕوونکردنەوەیەکتان قەرزارم. نامەوێ وەک دێوێک بێمە بەرچاوی ئێوە، چونکە لە دڵەوە خۆشـــم دەوێن. باوەڕکردن و نەکردنی بۆ خۆتان. ســـێیەمیان ئەوەیە هاتم تا زۆر ڕوون و ڕەوان پێشـــنیارتان بۆ بکەم خۆتان ڕادەســـت بکەن و دانی پێدا بنێن. بە دڵنیـاییەوە زۆر لە بەرژەوەنـدیتانـدا دەبێ و هەڵبەتە لە بەرژەوەنـدیی منیشدایە، چونە لەبارەی ئێوەوە بێخەم دەبم. دەی، ئێستە خۆتان بڵێن من هەڵسوکەوتم هاوڕێیانە بووە یان نا؟

ڕاسکۆلنیکۆف برێک بیری کردەوە.

– گوێ بگرن چی دەڵێم، پۆرفیری پیترۆڤیچ. هەر ئێستە دەتانگوت بەڵگەیەک، شتێکتان بەدەستەوە نییە بێ لە دیوی دەروونناسیی بابەتەکە، کەچی ئێستە کەوتوونەتە بەڵگاندن. ئێ، ئەی ئەگەر خۆتان لە جێیەک بە هەڵەدا چووبن؟

– نا، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ، هەڵەیەک لەئارادا نییە. تەنانەت بەڵگەش هەیە. هەر لە سەرەتاشەوە هاتە دەستم و خوا ناردی!

– کامە بەڵگە؟

– ناتوانم ئەوەتان پێ بڵێم، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ. بەهەرحاڵ، ئیتر لەمە زیاتر ناتوانم کارەکان دوا بخەم و دەبێ دەستگیرتان بکەم. کەواتە چاک بیری لێ بکەنەوە. بۆ من هیچ جیاوازییەکی نییە و تەنیا لەبەر خۆتانمە... لە منی وەرگرن ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ، بەم جۆرە زۆر بۆ ئێوە باشترە.

ڕاسکۆڵنیکۆف بزەیەکی بەدخوازانەی کرد:

– ئیتر لە گاڵتەپێکردن تێپەڕیوە و گەیشتووەتە بێشەرمی و سووکایەتی! گریمان من تاوانبارم... کە بە هیچ شێوەیەک وەها قسەیەک پشتڕاست ناکەمەوە... کاتێ خۆتان بە من دەڵێن زیندان بۆ من دەبێتە شوێنێکی ئاسوودە، ئەی بۆچی دەبێ بێم و دانی پێدا بنێم؟

– ئاخ، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچی ئازیز! ئەوەندە هیوا لەسەر وشەکان هەڵمەچنن! نەکا ڕۆژێ سەیرکەن زیندان شوێنێکی ئەوەندە بێوەی و ئاسوودەش نەبێ بۆ ئێوە. ئەمە لە خۆیدا تەنیا تیۆرییەکە و جا تیۆریی تایبەتیی منە! بۆ من چیم لە ئێوە زیاترە؟ لەوانەیە هەر ئێستەش خەریک بم شتێکتان لێ بشارمەوە. خۆ ناتوانم هەموو شتێ بخەمە ڕوو. هەهەهەها! دوای ئەوەش، ئەمە چ قسەیەکە دەیکەن کە کوێی بابەتەکە لە بەرژەوەندیی ئێوەدایە؟ یانی نازانن بە دانپێدانان چەندە لە

ســـزاکەتان کەم دەبێتەوە؟ بیرتان نەچێ ئێوە لە کاتێکدا دێنە پێش و دانی پێدا دەنێن، کە کەسێکی تر هەموو شتێکی خستووەتە سەر خۆی و بە گشـتی دۆسـییەکەی شـێواندووە! ئامادەم سـوێند بە خواوەندیی خوا بخۆم بە جۆرێ کـارەکـان ڕێـک بخەم کە دانپێـدانـانەکەی ئێوە ئێجگـار چـاوەڕوانینەکراو دەربکەوێ! دەروونناسـیـ و ئەم جۆرە شـتانەش کۆ دەکەینەوە و وەلای دەنێین. ناهێڵم هیچ ئاسـەوارێ لەو گومانە بمێنێتەوە، کە تا ئێسـتە لە ئێوەمان هەبوو؛ کارێ دەکەم وا دەربکەوێ کە کوشـتنەکە لە کاتی لاسـەنگبوونی باری دەروونی و تەنانەت لەبیرچوونەوەشـدا ڕووی داوە. ئاخر هەر بە ڕاسـتیش وا بووە! من قسەی خۆم دەبەمە سەر، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ.

ڕاسـکۆڵنیکۆف تازیەبارانە وسـکت بووبوو و ئێسـتە ئیدی بە خەمۆکی سـەری دانەواندبوو. تاوێکی بە بیرکردنەوەوە بەسـەر برد و دواجار بزەیەکی کرد، بەڵام بزە کاڵەکەی خەمگین و بێگیان بوو.

– نا!

پێدەچوو بڕیاری دابێ ئەو یارییە بخاتە لاوە و لەبەردەم پارفێریدا واز لە نواندن بهێنێت.

– واز لەم قسـانە بێنن! ئەوە ناهێنێ. سـووککردنی سـزاشـم بەلاوە گرنگ نییە!

– من هەر لەوە دەترسام!

پۆرفێری بێ ویستانە و بە گوڕوتینێکەوە هاواری کرد:

– دەترسـام سـووککردنی سـزاتان بەلاوە گرنگ نەبێ و هەر واشـم بەسەر هات!

نیگای ڕاسکۆڵنیکۆف لە پۆرفێری، خەمگین و مانادار بوو.

– ئاخر خۆ نابێ بەم جۆرە ژیان وەلا نێن!

بەلام پۆرفیری ئامادە نەبوو سەری بابەتەکە بنێتەوە.

– هێشتا ساڵەهای ساڵ ژیانتان لەبەردەمدایە! چۆن دەتوانن وا بە سادەیی بڵێن سووککردنی سزاتان ناوێ! ئەوەش بێئۆقرەییەکەتان!

– کتومت بفەرموون چی لەبەردەم مندایە؟

– ژیان! مەگەر ئێوە پەیامبەرن؟ بۆ چی دەزانن؟ تۆ بگەڕێ، خۆی دەردەکەوێ![1] لەوانەیە خوا هەر لەم نزیکانە چاوەڕێتان بێ و بیەوێ لەم ڕێیەوە ئێوە لە خۆی نزیک بکاتەوە. دەستبەسەرییش هەمیشەیی نییە و دواجار کۆتایی دێ...

– بەڵێ، سووککردنی سزا...

ڕاسکۆڵنیکۆف کەوتە پێکەنین.

– من تێناگەم ئێوە لە چی دەترسن؟ چییە، نەکا جۆرە شەرم و تەریقبوونەوەیەکی بۆرژوازیانە بێ؟ لەوانەشە بێ ئەوەی خۆتان بزانن سڵی لێ بکەنەوە، چونکە هێشتا زۆر گەنجن! وەلێ هەرچییەک هەیە، نابێ بترسن... لە خۆبەدەستەوەدان و دانپێدانان!

– گرنگ نییە بۆم!

ڕاسکۆڵنیکۆف دەنگیی نزم کردبووەوە و لەژێر لێو بە ڕق و سووکایەتیکردنەوە دەیورتاند. دەتگوت ناتوانێت بە دەنگی بەرز قسەی خۆی بکات. جارێکی دی، وەک ئەوەی نیازی ڕۆیشتنی هەبێت، بەلام بە بێهیواییەکی ڕوونەوە دیسان تیاماوانە لەسەر جێگەکەی دانیشتەوە.

– کێشەکە ئەوەیە جەنابی پایەبەرزتان بڕوای بە هەر کەس و هەر شتێ لەدەست داوە و لاتان وایە من لەخۆڕا چەنەتان بۆ دەدەم. وەلێ

---

١. ئاماژە بە برگەی حەوت لە *ئینجیلی مەتادا*: *بپرسن و وەلامتان دەدرێتەوە، بگەڕێن و دەستتان دەکەوێ، لێی بدەن و بۆتان دەکرێتەوە.* «و. ف»

ئێوە لەبارەی ژیانەوە چی دەزانن ئاخر؟ هەر بە ڕاستی چی لە ژیان تێگەیشتوون؟ ئایدیایەکتان بۆ خۆتان پێکەوە ناو و پاشانیش کە بەو جۆرە دەرنەچوو، تووشی دونیایەک شەرمەزاری بوون! جا دەریشکەوت دەستیدوو بووە ئەم ئایدیایە! باشە، ئەنجامەکەی نەشیاو بوو و هەر بە ڕاستیش مایەی شوورەیی، منیش ئەوەم قەبووڵە! وەلێ خۆ ئێوە مرۆڤێکی بەدفەڕ و بێئابڕوو نین؛ یانی هەر لە بنەڕەتیشەوە وا نین! خۆ هیچ نەبێ ئەوەندەی نەخایاند و زیاتر خۆتان گومڕا نەکرد، زۆر زوو حاڵی بوون. دەزانن ئێوە لە چاوی منەوە چ جۆرە مرۆڤێکن؟ بە بۆچوونی من ئێوە لەوانەن کە ئەگەر بڕوا بهێنن یان خوا بدۆزنەوە، بە دڵ و جەرگی دەرهێنراوەوە لەبەردەم جەلادی خۆیاندا سەر هەڵدەبڕن و بزە دەکەن. ئێوەش خوا بدۆزنەوە، یان بڕوا بە شتێ بێنن، تا بگەڕێنەوە بۆ ژیان. گۆڕانێکی ڕێکوپێکتان پێویستە. بە کەمیش لە ئازار مەڕوانن، زۆر کاری لەدەست دێ! ئازار! لەوانەیە میکۆلای ئەوەندەش بە لاڕێدا نەچووبێ کە بەدوای ئازاردا دەگەڕێ. دەزانم ئەم قسانە پەسەند ناکەن و ناچنە ئەقڵتانەوە، وەلێ ئەوەندەش بیری لێ مەکەنەوە و خۆتان ئازاد بکەن و دڵ بسپێرنە ڕەوتی ژیان و ئەسڵەن ترستان نەبێ! ئەم شەپۆلە ئێوە دەگەیەنێتە کەناری ئاسوودەیی و بێوەیی، لەسەر هەردوو پێی خۆتان! جا من نازانم کامە کەنار! تەنیا دەزانم کە هێشتا ژیانێکی زۆر لەبەردەم ئێوەدایە. چاک ئەوەش دەزانم کە لەبەرخۆتانەوە وا بیر دەکەنەوە من پێشوەختە ئەم قسانەم ئامادە کردبوون تا دەرخواردتانی بدەم! وەلێ ڕەنگە دواتر ئەم قسانەمتان بیر بێتەوە و، کێ چووزانێ، لەوانەیە بەکەڵکیشتان بێن. ئەسڵەن لەبەر ئەوەیە کە دەدوێم. هەر بە خێر گەڕا کە بەم ئایدیایەتان تەنیا ئەو پیرێژنەتان کوشت! خۆ ئەگەر ئایدیایەکی تر بکەوتبا ئەو کەللە پووچەتانەوە واوەیلا دەبوو، بۆی هەبوو کارەساتێ بێننە ئارا هەزار جار خراپتر لەمە! لام وایە دەبێ سوپاسگوزاریش بن کە خوا ڕەحمی پێ کردوون! کێ نالێ خوا ئێوەی بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکێکی تایبەتی

دانەناوە! دڵتان گەورە بێ و تۆزێ کەمتر بترسن! چییە؟ نەکا ترستان لەو ئەرکە گەورەترە هەبێ، کە لەبەردەمتاندا دەیبینن؟ نا، ئیتر ئەمەیان شوورەییە! بڕیار نییە بترسن. ئێستە کە وەها هەنگاوێکتان ناوە، دەبێ پشوودرێژیش بن! دادپەروەری ئەمەیە. دەبێ هەر کارێ دادپەروەری دەیخوازێ، ئەنجام بدرێ. دەزانم کە باوەڕتان نییە، وەلێ لەسایەی خواوە ژیان دەتانگەیەنێتە کەنار و ئێوەش دواجار تامی ژیانی ڕاستەقینە دەکەن. هەوای تازە... ئێوە تەنیا هەوای تازەتان دەوێ و هیچی تر! هەوای تازە!

ڕاسکۆڵنیکۆف واق بووبوو و لەلایەکیشەوە نەیدەتوانی بەر بە لەرزینی بگرێت.

– بەڵام ئێوە کێن؟ نەکا پەیامبەر و شت بن؟ لە بەرزایی کامە لووتکەی ئیمان و ئارامییەوە ئەم ڕستە حەکیمانانە دەردەبڕن؟

– من کێم؟ من مرۆڤێکم کە لای وایە ژیانی تەواو بووە و هیچ شتێکیشی لەبەردەمدا نییە. مرۆڤێک کە لەوانەیە هەستیار بێ و هاوخەمیی لێ بوەشێتەوە؛ مرۆڤێ کە لەوانەیە شتگەلێک بزانێ، بەس ئیتر ڕۆژگاری بەسەر چووە. بەس مەسەلەی ئێوە زۆر جیاوازە، ئێوە تازە لە سەرەتای ڕێگەدان. گەرچی کێ چووزانێ! لەوانەیە ژیانی ئێوەش لە تەپوتۆزدا تێپەڕێ و تەمەنتان ببێتە دووکەڵ و کۆتاییەکەشی هیچ بە هیچ! ئێستەش گەر تێکەڵی چینێکی تری کۆمەڵگە بوون خۆ ئاسمان لە زەوی نادا! کەسێکی وەک ئێوە باکی بە ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانی نییە، دڵنیام! گریمان تا ماوەیەکیش هیچ کەسێ لە هاوڕێ و خزمان چاویان بە ئێوە نەکەوت، ئەوەش گرنگ نییە. ئەسڵەن قسە لەسەر کات نییە، هەموو شتێ لەدەست ئێوەدایە. ئێوە ببنە خۆر تا هەموو دونیا بتانبینێ. خۆر هەر بە ڕاستی دەبێ خۆر بێ، نەک

شتێکی تر. دیسان بزە دەتانگرێ؟ لاتان وایە خەریکی شیلەراندنم[1]؟ گرەو دەکەم وا بیر دەکەنەوە کە منی پۆرفیێری خەریکی زمانلووسیم تا هەرچۆنی بووە مەمکەمژەتان لە دەم بنێم. با وا بێ! لەوانەشە، هەهەهە! ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ، ڕەنگە لە بەرژەوەندیتاندا بێ کە بڕوا بە هەموو قسەکانم نەکەن. لەوانەیە باشترین کار ئەوە بێ کە بڕوا بە یەک وشە لە قسەکانم نەکەن! منیش ئیتر ئاوهام و چارەم نییە؛ خۆشم پەسەندی دەکەم! یەک وشە و کۆتایی: ئێوە باشتر لە هەر کەسێ دەتوانن داوەری بکەن کە من مرۆڤێکی چەپەڵم یان بەحورمەت و جێی متمانە.

– ئێستە بەتەمان کەی دەستگیرم بکەن؟

– ئێ، دەتوانم یەک دوو ڕۆژێ دەرفەتتان بدەمێ تا بۆ خۆتان تۆزێ بگەڕێن! چاک بیر لە قسەکانم بکەنەوە، ئازیزی دڵ، دوعاشتان بیر نەچێ. ئەمە زیاتر لە بەرژەوەندیی ئێوەدایە، بڕوا بکەن!

– ئەی ئەگەر لەدەستتان ڕامکرد؟

ڕاسکۆڵنیکۆف بە بزەیەکی نامۆوە ئەمەی پرسی.

– نا، ڕاناکەن. گەر لادێیی و شێت یان یەکێ لەم دەستەخواز و دەمارگیرە پیسانەی ئەمڕۆ با، ئەوانەی کە کۆیلەی بیرکردنەوەی کەسێکی دیکەن، ڕێی تێدەچوو ڕابکا. ئەم جۆرە مرۆڤانە هەر ئەوەندەیان بەسە سەری پەنجەتیان نیشان بدەی بۆ ئەوەی تا کۆتایی تەمەنیان بڕوا بە هەر جۆرە درۆیەک بکەن؛ ڕێک وەک مەسەلەی ئەو *دیرکا*یە دەربەدەرە، خوێندکاری هێزی دەریایی، لە شانۆنامەی

---

١. شیلەراندن: لەبەرانبەر «شیلربازی»ی فارسیدا دامناوە، کە واتای شیعراندنی شیلەرئاسا دەدات.

*شـــــایی*ی گۆگۆڵدا![1] وەلێ ئێوە ئیتر بڕواتان بە ئایدیاکەشـــتان نییە، کەواتە لەبەر چ هۆکارێ دەتانەوێ ڕاکەن؟ جا گریمان ڕاشتان کرد، لە حەشـارگەکەتاندا بەتەمان چی بکەن؟ هەلومەرجەکە زۆر بۆتان دژوار دەبێ و زۆریش بوودەڵانە؛ جا بەتایبەت لە ئێستەیەکدا کە دەبێ بژین، دەبێ هەلومەرجێکی تـایبەتتـان هەبێ و بە دڵنیـاییەوە هەوایەکی شـیاویشـتان پێویسـتە. ڕاکردن کتومت بڕیارە چ هەوایەکتان بەنسیب بکـا؟ ئەگەریش ڕابکەن بە پێی خۆتـان دەگەڕێنەوە. *ئێوە بەبێ ئێمە ناتوانن بەردەوام بن.* وەلێ من گەر ئێوە لە قەڵایەکیشدا زیندانی بکەم، هەر مانگێکە، ئەوپەڕەکەی دوو مانگ، یان گریمان سێ مانگ... بیرتان نەچێ ئەم قســـەیەی من... هەر خۆتان دێنە گۆ و لام وایە ئەوســـا خۆشـــتان ســـەراســـیمە دەبن کە ئەوە چۆن ڕووی داوە! تەنانەت تا کاتژمێرێک پێشـــتریشـــی نازانن کە بڕیارە دانی پێدا بنێن. من وای بۆ دەچم کە ئێوە ئاخرییەکەی بە باوەشـــی ئاوەڵاوە ئازارەکەتان دەگرنە خۆ. وەلێ ناتانەوێ بە زۆر باوەڕ بە قسەکانی من بکەن، کە کاتی هات خۆتـان تێدەگەن. لەبەر ئەوەی ئـازار، ڕۆدیۆن ڕامـانۆڤیچی ئـازیز، پێگەیەکی بەرزی هەیە. باشـە، ئێسـتە پێویسـت ناکا وا سـەیری ئەم خێگە زلە و ڕووالەتە لەشـــەپەروەرانەیەی من بکەن! خۆم دەزانم! پێمەکەنن دەی، من هەر ئەوەندە دەزانم کە لەپشـــت ئازارکێشـــانەوە فکرێـک نووســـتووە. میکۆلای لەمەدا هەڵەی نەکردووە، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ، ئێوە بەرەو هیچ کوێ ڕاناکەن.

ڕاســـکۆڵنیکۆف هەســـتایەوە و کڵاوەکەیی هەڵگرت. پارفێریش لە جێگەکەی هەستا.

---

١. لە بنەڕەتدا مەبەست پیتوخوف‌ـە نەک *دیرکا*. بەم پێیە، لێرەدا پۆرفیری یان خودی دۆسـتۆیفسـکی لە ئاماژەکردن بە ناوی کەسـایەتیی شـانۆنامەی *شـایی*دا هەڵەیان کردووە. «و. ف»

– دەچن پیاسەیەک بکەن، وایە؟ عەسریکی خۆشە، تەنیا ئەگەر لێزمەیەک دانەکا! هەرچەندە گەر بارانیش بباریٚ، هەواکەشی سووک و تازە دەبێتەوە...

پۆرفیری ئەمەی گوت و ئەویش کلاوەکەی هەڵگرت.

– بڕوانن، پۆرفیری پیترۆڤیچ، تکایە لەبەرخۆتانەوە وا بیر نەکەنەوە کە من ئەمڕۆ لە بەردەمتاندا پێهاتووم...

ڕاسکۆڵنیکۆف بە جددییەتێکی تایبەتی پێی لەسەر دادەگرت.

– ئێوە مرۆڤێکی سەیرن و منیش لەبەر کونجکۆڵی بەدیار قسەکانتانەوە دانیشتم، نەک هیچ شتێکی تر. بەس خۆ هیچ شتێکم لە ئەستۆ نەگرت!...

– بەڵێ، دەزانم. بیریشم ناچێ. سەیری کە توخوا، سەراپای هەڵدەلەرزێ! نارەحەت مەبن باوان گیان، بە شێوازی خۆتان لێبخوڕن. بە دڵی ئێوە دەبێ. تۆزێ بگەڕێن، وەلێ ناکرێ زۆریش بگەڕێن. هەرچیش ڕووی دا، تکایەکم لێتان هەیە.

پۆرفیری دەنگی نزم کردەوە و درێژەی پێ دا:

– تکایەکی سەیر و هاوکات زۆر گرنگم لێتان هەیە. ئەمە دونیایە ئەگەر هەلومەرجێکی تایبەت هاتە پێش... گەرچی هەرگیز بڕوا ناکەم شتی وا ڕوو بدا و لام وا نییە ئێوە ئەو کارانەتان لێ بوەشێنەوە... بە کورتییەکەی گەر لە دوو ڕۆژی داهاتوودا بە خەیاڵتاندا هات بە جۆرێکی تر کۆتایی پێ بهێنن، بۆ نموونە بە شێوازگەلی ناماقووڵ و سەیر بتانەوێ خۆتان ڕزگار بکەن... دەزانم بیرکردنەوەکەم گاڵتەجاڕانەیە و ئێوە دەمبوورن... گەر کار گەیشتە ئەوە، یادداشتێکی کورت و بەسوودم بۆ جێ بهێڵن، تەنیا دوو دێڕ، بێگومان ئاماژە بە

بەردەکەش بکەن، چونکە بەم جۆرە شـــکۆمەندانەترە! دەی، بەهیوای دیدار... بەهیوای بیرکردنەوەی باش و بڕیاری ژیرانە!

پۆرفیری لە بـارێکـدا کە تۆزێـک چەمیبووەوە و نیگـای لە راسـکۆڵنیکۆف دەدزییەوە، چووە دەرێ. ڕاسـکۆڵنیکۆف ڕۆیشـتە بەرپەنجەرەکە و بێئۆقرە و تووڕە لەوێ ڕاوەسـتـا تـا بەپێی لێکدانەوەکانی خۆی، زانی کە پۆرفێری گەیشـتووەتە سـەر شـەقام و دوور کەوتووەتەوە. پاشان ئەویش پەلەپەل لە ژوورەکە چووە دەر.

## سێ

ڕاسکۆلنیکۆف بە هەڵەداوان بەرەو ماڵی سڤیدریگایلۆڤ کەوتە ڕێ. نەیدەزانی دەبێت چ چاوەڕوانییەکی لەو پیاوە هەبێت، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەو شتانەی کە لەنێوانیاندا بوو، سڤیدریگایلۆڤ دەسەڵاتێکی تەلیسماوی و نهێنیی بەسەر ئەودا هەبوو. ڕاسکۆلنیکۆف لەوەتەی بەمەی زانیبوو، سەرەوتی لێ بڕابوو و ئێستە ئیدی کاتی ئەوە بوو ڕووبەڕووی یەکدی ببنەوە.

لە ڕێگەدا پرسیارێکی تایبەت زۆر ئازاری دەدا: *تۆ بڵێی سڤیدریگایلۆڤ چووبێتە لای پۆرفێری؟*

هێندەی ئەقڵی ئەو بڕی دەکرد، ئامادە بوو سوێند بخوات کە ڕێی تێناچێ سڤیدریگایلۆڤ چووبێتە لای پۆرفێری. دووبارە و دووبارە هەموو شتێکی لە زەینیدا تاوتوێ کرد، وردەکاریی دیدارەکەیی لەگەڵ پارفێریدا هێنایە بەرچاوی. *نا، نەڕۆیشتووە. بێگومان نەڕۆیشتووە.*

بەڵام تۆ بڵێیت سڤیدریگایلۆڤ گەر تا ئێستەش نەچووبێتە لای پۆرفێری، ئەلەم کاتەدا بڕیاری ڕۆیشتن بدات؟

وای دەهاتە بەرچاو کە سڤیدریگایلۆڤ جارێ وەها هەنگاوێک نانێت. بەس بۆچی؟ نەیدەتوانی بۆچییەکە ڕوون بکاتەوە، بەڵام دیازیشی نەبوو هەر وا بە خێرایی زەینی بەم بابەتەوە قاڵ بکات. هەموو ئەمانە خراپ ئەشکەنجەیان دەدا، لەگەڵ ئەمەشدا لە لایەکی دیکەوە دەتگوت بەلای ئەوەوە تۆزقاڵێک بایەخیان نییە. فرە سەیر بوو —لەوانەش بوو هیچ کەسێک باوەڕ نەکات— بەڵام بارودۆخی هەنووکە

و داهــاتووی تەنیــا بە شـــێوەیەکی کــاڵ و دوور نیگەرانی دەکرد. کەڵکەڵەیەکی ئێجگــار گرنگتر هەبوو کە خراپ ئــازاری دەدا. هەڵبەتە تایبەتیش بوو بە خۆیەوە نەک هیچ کەسێکی دی، وەلێ جۆرێکی دیکە بوو و کاریگەریش دەهاتە بەرچاو. وێڕای ئەوەش، لە ڕووی ڕۆحییەوە هەتا بڵێیت ماندوو بوو، گەرچی ئەو بەیانییە لەچاو ڕۆژانی دواتردا زەینی خەریک بوو زۆر باشتر و ڕۆشنتر دەبوو.

ئێســـتە لەلایەکەوە، دوای هەموو ئەو شـــتانەی کە پێش هاتبوون، ئەوەی دەهێنا کە بەگژ ئەم بەربەســـتە تازە و لابەلایانانەدا بچێتەوە؟ بۆ نموونە ئەوەی دەهێنا خۆی تووشــی دونیایەک ســەرئێشــە بکات تا بەر بە ســـڤیدریگایلۆڤ بگرێت و نەهێڵێ بچێتە لای پۆرفیری؟ ئەوەی دەهێنــا دونیــایەک کنەکاری بۆ ســـــەردەرکردن لە کەســـێکی وەک سڤیدریگایلۆڤ بکات؟

ئاخ کە چەندە ماندوو و نەخۆش بوو بەدەست هەموو ئەم شتانەوە!

ســـــەرەڕای ئەمەش بە پەلە چوو بۆ ماڵی ســـڤیدریگایلۆڤ. ئایا چــاوەڕوانیی ئەوەی هەبوو کە شـــتێکی تــازەی لێوە ببیســـتێت؟ نیشــانەیەک، ڕێگەیەکی هەڵهاتن؟ ئاخ کە مرۆڤی نغرۆبوو چۆن دەست بۆ هەر پووشـــێک دەبات! دەســـتی چارەنووس بوو یــان هێزێکی دەروونی کە ئەو دووانەی لێک نزیک دەکردنەوە؟ لەوانەشـــە تەنیــا لەبەر شــەکەتیی لەڕادەبەدەر و بێهیوایی بێت؛ بۆی هەبوو پێویســتیی بە ســـڤیدریگایلۆڤ بێت و ئەســـڵەن ئاتاجی کەســـێکی دیکەش؛ جا ســـڤیدریگایلۆڤ خۆوبەخت لەســـەر ڕێگەکەی قووت بووبووەوە. ئەی ســۆنیا؟ بەڵام ئێســتە بۆچی دەشــیا بچێتە ســەروەختی ســۆنیا؟ بڕیار بوو لەوێ چیی دەست بکەوێت؟ هەمدیسان بە تکاوە دەیویست کچەکە فرمێسکی بۆ بڕژێت؟ بەڵام لە ســۆنیاش دەترسا. ســۆنیا بۆ ئەو ڕێک وەک حوکمێکی یەکلاکەرەوە و بێئەملاوئەولا بوو. بڕیــارێکی بێچەندوچۆن بوو. یان دەبوو بە ڕێگەی خۆیدا بڕوات یان ڕێگەی ئەو

بگریتە بەر. ئێستە کە زیاتر لە هەر کات توانای ڕووبەڕووبوونەوەی کچەی نەبوو، ئایا وا باشتر نەبوو بچێت بۆ لای سفیدریگایلۆڤ و شتێکی لێ دەربهێنێت؟ نەیدەتوانی نکۆڵی لەوە بکات کە هەر بە ڕاسی لەبەر هۆکارێکی ناڕوون پێویستیی بە بینینی ئەو کەسە هەیە و دەمێکیش بوو هەستی دەکرد پێویستە ڕووبەڕووی ببێتەوە. وەلێ ئاخر چ شتێک بە یەکدییەوە دەبەستنەوە؟ تاوان و خراپەکارییەکانی ئەم دووانە لە هی یەکدی نەدەچوون. جا ئەم کابرایە زۆر نەساز و بەدفەڕیش بوو، بێگومان گەندەکار و هەرزە و بە دڵنیاییەوە تەڵەکەچی و چەندڕوویش بوو و تەنانەت بەدخواز و بێئامانیش دەردەکەوت. جا قسەوقسەڵۆکێکیشی بەدواوە بوو! ئەوە ڕاستە کە بە حساب خەریک بوو وەک دۆستێک کارێکی هێژایانەی بۆ منداڵە هەتیوەکانی کاترینا ئیڤانۆڤنا دەکرد، بەڵام کێ دەیزانی ئامانجی چییە و دەیەوێت ئاخرییەکەی بە کوێ بگات؟ ئەم پیاوە دایمە پیلان و دەسیسەیەکی لەژێر سەردا بوو.

بەدەر لەمانە، لەم دواییانە فکرێکی دیکە هەر وا بە دەوری زەینی ڕاسکۆڵنیکۆفدا دەسووڕایەوە و بووبووە مایەی ئازاری گیانی. فکرێکی هێندە بەئازار بوو کە بە ئاشکرا هەوڵی دەدا وەلای بنێت و هەرچۆنێک بووە خۆی لێ ڕزگار بکات. هەندێک جار وای بە مێشکدا دەهات کە سفیدریگایلۆڤ هەنگاوبەهەنگاو چاودێریی دەکات؛ یان بە نهێنییەکەیی زانیوە و ئێستەش لە زەینیدا خەریکی کێشانی نەخشەگەلێکە بۆ دونیا. تۆ بڵێیت هەر ئێستەش پیلانێکی دانەنابێت؟ لە ڕۆژ ڕۆشنتر بوو کە مەسەلەکە ئەوەیە! تۆ بڵێیت هەر ئێستەش بە نهێنییەکەی ئەوی نەزانیبێت و بتوانێت بە ئاسانی داشی خۆی بەسەریدا سوار بکات، هەموو ئەمانە بکاتە چەکێک و لەپێناو دونیادا بەکاریان بهێنێت؟

ئەم بیر و خەیاڵە جاروبار لە خەونیشدا دەهاتە سەروەختی و ئەشکەنجەی دەدا، وەلێ هەرگیز وەک ئەمڕۆ کە خەریک بوو دەچووە

دیدەنیی سـفیدریگایلۆڤ، ڕوون نەبوو و بە هەموو شـێوەیەک بیرلێکردنەوەشـی ئەوی دەگەیاندە ترۆپکی ڕقێکی ڕەش. تەنانەت گەر کێشـەیەکی ئەوتۆش نەهاتبا پێش، ئەم بابەتە هەموو شـتێکی ئاوەژوو دەکردەوە، بگرە بە هەلومەرجەکەی ئەویشـەوە. بەڵێ دەی، بە ناچاری دەبوو دەسـتبەجێ لەبەردەم دونیادا دان بە هەموو شـتێکدا بنێ. تۆ بڵێیت لەپێناو ئەوەی کە نەکا دونیا بە سـەربزێوی هەنگاوێکی نەفامانە بنێت، ئەم ناچار بە خۆڕادەسـتکردن نەبێت؟ هەر بە ڕاسـت مەسـەلەی ئەو نامەیە چی بوو کە هەر ئەو بەیانییە بۆ دونیا هاتبوو؟ دونیا لە پیتەربورگدا کێی هەبووە تا نامەی بۆ بنێرێت؟ نەکا لەلایەن لوژنەوە بوو‌بێت؟ بە دڵنیاییەوە ڕازومیخین چاک ئاگاداری دونیا بوو، وەلێ خۆ ئەو هیچی لەبارەی ئەو دۆخە مەترسـیدارە هەنووکەییەوە نەدەزانی! ئەی ئەرکی برایەتیی ئەو وا ناخوازێت ڕازومیخین لەو بابەتە ئاگادار بکاتەوە؟ ڕاسکۆڵنیکۆڤ پەست و بێزار بیری لەم شتانە دەکردەوە.

*هەرچۆنێک بووە دەبێ تا زووە چاوم بە سـفیدریگایلۆڤ بکەوێ.* ئاخرییەکەی بڕیاری کۆتایی دا. *شوکر ئەم دیدارە کێشەیەکی تایبەتیی نییە و وردەکارییەکەشـی هیچ گرنگ نییە؛ هەر ئەوەندە هەیە دەبێ بچمە بنجوبنـاوانی بـابەتەکەوە! وەلێ ئەی ئەگەر سـفیدریگـایلۆڤ هەڵەیەکی لێ وەشابێتەوە... ئەگەر پیلانێکی بۆ دونیا هەبێ... ئەوسا...*

ڕاسـکۆڵنیکۆڤ لەژێر بـاری ئەوەی کە لە مـاوەی ئەم مـانگەی کۆتاییدا بەسەری بردبوو، هێندە شەکەت و بێبڕست بوو کە تەنیا یەک ڕێچاری بۆ ئەم جۆرە پرسانە هەبوو. لە چنگی ساردی دەسەوەسانیدا لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە، *گەر هەنگـاوێکی خواری نـابێ، دەیکوژم خوێڕیی وا.* هەسـتێکی نەناسـراو و چاوەڕوانینەکراو کتوپڕ توند دڵیی گوشی. هەر لەوێ لە ناوەڕاستی شەقامدا وشک بوو و دەستی کردە پشـکنینی چواردەوری، بۆ ئەوەی تێبگـات لە کوێیە و نیـازی کوێی هەبووە. لە شـەقامی تسـارسـکاسـیلسـکی بوو، سـی چل هەنگاوێک لە

دووریی سێنناپاوه كه لەوێوە ڕابردبوو. بینایەک لەلای دەستەچەپییەوە بوو و هەموو نهۆمی دووەمیان کردبووە مەیخانە. پەنجەرەکانی لەسەر پشت بوون و بە سێبەرە بزۆکەکانی پشتیانەوە دەکرا سۆسەی بکەیت کە ژوورەکان جمەیان دێ لە خەڵک. دەنگی گۆرانی و کلارینێت و ڤیۆلۆن و ڕمبەڕمبی تەپڵی توورکی بەرز بووبووەوە. ڕاسکۆلنیکۆف دەیتوانی هەر لەوێوە تریکە و قیژەی ژنان ببیستێت. دۆشداماو لەوەی کە ئاخۆ چی دەکات لە تسارسکاسیلسکیدا، بڕیاری دا بگەڕێتەوە، بەڵام کتوپڕ لە یەکێک لە پەنجەرەکانی ئەوپەڕدا چاوی بە سڤیدریگایلۆف کەوت کە سەبیللەدەم ڕێک لەپێش مێزێکی لای پەنجەرە کراوەکەوە دانیشتبوو. ڕاسکۆلنیکۆف خراپ ڕاچەنی و خەریک بوو لە ترساندا ببوورێتەوە. سڤیدریگایلۆف بێدەنگانە لەوی دەڕوانی و دەتگوت خستوویەتییە ژێر زەڕەبینەوە. ڕاسکۆلنیکۆف دەمودەست هەستی کرد سڤیدریگایلۆف بەتەمایە هەستێتەوە و بەبێ سەرنجراکێشان بۆی دەربچێت. ڕاسکۆلنیکۆفیش خۆی لە گێلی دا و وای نواند کە ئەوی نەدیوە و تەنیا خەریکە بە هۆشپەرتی لە شوێنێکی دیکە دەڕوانێت، هاوکات بە تیلەی چاو وریای جووڵەکانی ئەو بوو. دڵی شێتانە خۆی بە سنگیدا دەکوتی. دیار بوو کە سڤیدریگایلۆف نایەوێت هیچ کەسێک چاوی پێی بکەوێت. سەبیلەکەی بە دەمییەوە لابرد و بەنیاز بوو بڕوات و خۆی لە چاوان بشارێتەوە کە لەگەڵ هەستایەوە و کورسییەکەی کشاندە دواوە، کتوپڕ بەوەی زانی کە ڕاسکۆلنیکۆف چاوی پێی کەوتووە و وا سەیری دەکات. ئەم جارەشیان ئەوەی کە لەنێوانیاندا ڕابرد، وەک هەمان دۆخی جارەکەی پێشوویان بوو لە ژوورەکەی ڕاسکۆلنیکۆفدا؛ ئەو کاتەی کە ئەو لە خەو ڕاچڵەکیبوو. ڕووخساری سڤیدریگایلۆف بزەیەکی تەڵەکەچیانەی تێگەڕا و نەرمنەرمێک بەرینتر بوو. هەریەکەیان دەیزانی کە ئەوی دیکەیان دیویەتی و لەژێر چاودێرییدایە. دواجار سڤیدریگایلۆف دایە قاقای پێکەنین و هەر لە بەرپەنجەرەکەوە هاواری کرد:

– ئێ! گەر ئیشتان پێمە فەرمووونە سەرێ! من لێرەم!

ڕاســـکۆڵنیکۆف بەرەو مەیخـانەکە ســـەرکەوت و لە ژوورێکی بچووکی پشتەوەدا سڤیدریگایلۆڤی دۆزییەوە. ژوورەکە دیواربەدیواری سالۆنە سـەرەکییەکە بوو کە بیست دانە مێزێکی بچووکی تێدا بوو و بازرگان و کاســـب و فەرمانبەر و کەســـی هەمەجۆری دیکە بەدەم چاخواردنەوەوە دانیشـتبوون و گوێشـیان دابووە نەڕەی ناهەماهەنگی چەند گۆرانیبێژێک. لە دوورەوەش دەنگی تۆپی بلیارد دەهات. ســـەر مێزەکەی ســـڤیدریگایلۆڤ بتڵێکی هەڵپچڕاو و پەرداخێکی شـــامپانیای نیوەپڕی لێ بوو. ڕاسـکۆڵنیکۆف لە ژوورەکەدا چاوی بە دوو کەسـی دیکەش کەوت، کوڕیژگەیەکی ســـــازبەدەســـــت و کچۆڵەیەکی هەژدەساڵەی سووروسپیی خەپۆکە و سەرەحاڵ بە داوێنێکی چینچین و خەتخەت و کڵاوێکی پەڕداری مۆدێل تیرۆلییەوە کە قردێلەیەکیشی پێوە بوو. ســـەرەڕای کۆرســـی گۆرانیگوتنی ژوورەکەی تەنیشـــت، کچەکەش بە دەنگی کۆنترالتۆیەکی زیکنەوە لەگەڵ ســـــازی کوڕیژگەکەدا، گۆرانییەکی بێسەروبەری دەگوت.

– زۆر باشە، ئەوەندە بەسە.

سڤیدریگایلۆڤ لەگەڵ هاتنەژوورەوەی ڕاسکۆڵنیکۆفدا ئەمەی گوت و ئەویش دەســـتبەجێ گۆرانییەکەی بڕی و بە ڕێزەوە چاوەڕێ ما. کچۆڵەکە بە درێژایی ئەو مـاوەیەی کە پڕ بە قوڕگی خەریکی گوتنی ئەو نۆتـانە بوو، جددی بوو و بـارێکی ڕێزدارانە لە ڕووخســـاریدا دەبیندرا.

سڤیدریگایلۆڤ بە دەنگی بەرز بانگی کرد:

– هۆو! فیلیپ! پەرداخێکی دیکەش بێنە!

ڕاسکۆڵنیکۆف گوتی:

– من نامەوێ هیچ بخۆمەوە.

– بە دڵی خۆتان، بۆ ئێوەم بانگ نەکرد. فەرموو بخۆرەوە، کاتیا! ئەمڕۆ ئیتر ئیشم پێت نییە، دەتوانی بڕۆی.

سڤیدریگایلۆف پەرداخێکی پڕی بۆ کچۆڵەکە تێکرد و ئەسکەناسێکی زەردیشی خستە سەر مێزەکە. کاتیا پەرداخەکەی هەڵقوڕاند –وەک خووی هەمیشەیی ژنان بە دە قوم و بەبێ ئەوەی دایبگرێ– جا پارەکەشی هەڵگرت و دەستی سڤیدریگایلۆفی ماچ کرد. سڤیدریگایلۆفیش زۆر جددی مۆڵەتی دا ڕێوڕەسمی دەستماچکردنەکە ئەنجام بدرێت. کچۆڵەکە ژوورەکەی جێ هێشت و کوڕێژگەکەش بە سازەکەیەوە دوای کەوت. هەردووکیانیان لە شەقامەکەوە هێنابوونە ناو مەیخانەکە. هێشتا حەفتەیەکیشی نەخایاندبوو کە سڤیدریگایلۆف هاتبووە پێتەربورگەوە، کەچی هیچیهیچنەبوو، وەک دەڵێن شاهانە بۆی دەژیا و بۆ خۆی بووبووە خاوەنی پێگەیەک. لەگەڵ پێشخزمەتی مەیخانە، هەمان فیلیپدا، پەیوەندییەکی پتەوی هەبوو و ئەویش هەر وا پێیدا هەڵدەدا و دەوروخولی دەدا. دەرگەی ژوورەکە –کە دەچووەوە سەر سالۆن– قوفڵیشی هەبوو و سڤیدریگایلۆف بۆ خۆی لەوێ ئاسوودە بوو و پێدەچوو بتوانێت وەک ئەوەی لە ماڵی خۆیدا بێت، چەند ڕۆژێک لەوێ بەسەر ببات. ئەو مەیخانە شپرزەیە بۆگەنی لێ بەرز دەبووەوە و تەنانەت نەدەکرا حسێبی مەیخانەیەکی پلەدووشی بۆ بکەیت.

– نیازی بینینتانم هەبوو، یانی دەمویست بێم بۆ ماڵەکەتان.

ڕاسکۆڵنیکۆف بەم جۆرە سەری قسەی کردەوە و لەسەری ڕۆیشت:

– وەلێ نازانم چی بوو کە لە سێننایاوە خۆم بەم شەقامەدا کرد. هەرگیز هەڵنەکەوتووە لەم ڕێگەیەوە بڕۆم. دایمە لە سێننایاوە بەرەو

ڕاســت لا دەدەم. ئاخر خۆ ئەمە ڕێگەی ماڵی ئێوە نییە. هەر وا بەرەو ئێرە ملم نا و ئاه! سەیرم کرد ئێوە لێرەن!

– دەی یەکجار بفەرموون پەرجوویەک بووە!

– لەوانەشە مەسەلەکە تەنیا بەخت و هەڵکەوت بێ!

– سەیرە! ئەم خەڵکە شتێکیان لێ قەوماوە!

سڤیدریگایلۆڤ بەدەم پێکەنینەوە درێژەی دایێ:

– ئامادە نین بە زمانێکی خۆش دان بە پەرجوودا بنێن، تەنانەت گەر لە قووڵایی دڵیشــیاندا باوەڕیان پێی هەبێ، کەچی هەر نایێنە ژێر بار! مەبەســــتم ئەوەیە کە خودی ئێوەش دەفەرموون ڕەنگە هەموو شــتێ خۆوبەخت بووبێ! ئەم خەڵکە چەندە تەرســەزاڵن ئەو کاتەی کە باسی دەربڕینی بڕوا دێتە پێش! پیاو ناچێتە ئەقڵییەوە! ئێوەش ناتوانن وێنای بکەن، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ. مەبەستم ئێوە نییە! ئەسڵەن ئێوە بیر و بڕوایەکتان هەیە بۆ خۆتان و هیچ ترسێکیشتان لێی نەبووە و نییە! هەر ئەمەش بوو منی بەرەو ئێوە ڕاکێشا!

– تەنیا ئەوەندە؟

– بەس نییە؟ لام وایە ئەوە بەسە بۆ نزیککەوتنەوە لە کەسێک.

ســـڤیدریگایلۆڤ قســـەی بێســـەروبەری فڕێ دەدا و دیار بوو کە ســـەرخۆشـــە؛ هەڵبەتە زۆر کەم، چونکە تەنیا نیوپەرداخێک شـــەرابی خواردبووەوە.

ڕاسکۆڵنیکۆڤ بیری هێنایەوە:

– بەس لام وایە ئێوە کاتێ هاتنە دیدەنیی من کە هێشتا نەتاندەزانی من وەک خۆتان دەڵێن بیروبڕوای تایبەت بە خۆمم هەیە!

– ئێ، مەسەلەی ئەوەیان جیاواز بوو! ئیتر هەرکەسەو بەرنامەی خۆی هەیە. لەبارەی پەرجووشەوە مۆڵەت بدەن رایگەیەنم کە بە رای من ئێوە ئەم دوو سێ رۆژە لە خەودا بوونە. خۆم باسی ئەم مەیخانەیەم بۆ کردبوون و ئەوەش پەرجوو نییە کە ملتان ناوە و خۆتان بێرەدا کردووە. خۆم رێگەکە و ئەو کاتانەم پێ گوتن کە دەتوانن لێرە بمدۆزنەوە. بیرتان هاتەوە؟

راسکۆڵنیکۆف سەرسوورماو وەڵامی دایەوە:

– من هیچم بیر نایێتەوە!

– بڕوا دەکەم. وەلێ من دوو جاریش پێم گوتن. نائاگایانە ناونیشانەکەی لە زەینتاندا چەسپیوە و ئێوەش هەر نائاگایانە بەرەو ئێرە لاتان داوە و لە هەمان کاتدا هەنگاوبەهەنگاو بەپێی ئەو ناونیشانە هاتوون. هەڵبەتە خۆتان نەتانزانیوە خەریکی چین. ئەو کاتەی کە خەریک بووم باسی ئەم مەیخانەیەم بۆ دەکردن، بە هیچ شێوەیەک هیوام بەوە نەبوو تێبگەن کە خەریکی چ فلتەفلتێکم. ئێوەش خراپ سەرتان لە خۆتان شێواندووە ئیتر، رۆدیۆن رامانۆڤیچ. شتێکی دیکەش هەیە. من دڵنیام ئەو کەسانە ژمارەیان زۆرە کە لەم پیتەربورگە وێرانەدا بەدەم رێکردنەوە لەبەرخۆیانەوە قسە دەکەن. ئێرە شێتخانەیە! هەرچی دکتۆر و پارێزەر و فەیلەسووف و زانستمەندمان هەیە دەبێ لەسەر بنەمای پسپۆڕییەکەی خۆیان بێن و لەسەر پیتەربورگ لێکۆڵینەوەیەکی بەبایەخ بکەن. ئای کە بەرئەنجامی بەپێزیان دەست دەکەوێ! بە دەگمەن شوێنێ هەڵدەکەوێ وەک پیتەربورگ ئەوەندە رۆحی مرۆڤ تێیدا بکەوێتە ژێر کاریگەریی شتی سەیروسەمەرە و رەش و خەمناک و ئێجگار بەهێزەوە. هەر ئەم ئاووهەوایەی چی بە مرۆڤ ناکا! جا پایتەختی بەڕێوەبەریی رووسیایە و تایبەتمەندییەکانی لە سەرانسەری مەملەکەتەکەدا رەنگدانەوەی خۆیان هەیە. وەلێ مەبەستی سەرەکیی قسەکەی من ئەم شتانە نیین.

خاڵە گرنگەکە ئەوەیە کە من چەندان جار ئێوەم خستووەتە ژێر چاودێرییەوە. کە لە ماڵ دەردەچن، سەرتان هەڵبڕیوە، کە بیست هەنگاوێک دەنێن، سەرتان دادەنەوێنن و لەپشتیشتانەوە دەستەکانتان لێک گرێ دەدەن. ڕاستە کە لە دەوروبەر و بەردەمتان دەڕوانن، وەلێ هیچ نابینن. دواجار دەست دەکەنە لێوجووڵاندن و قسەکردن لەبەرخۆتانەوە. هەندێ جاریش دەستێ ڕادەوەشێنن وەک ئەوەی خەریکی تاراندنی ئەو بیرکردنەوەیە بن کە لە سەرتاندایە و پاشانیش لە ناوەڕاستی ڕێگەدا وشک دەبن. ئەم جووڵانە هیچ باش نین. بێ لە من، بۆی هەیە کەسێکی تریش بتانبینێ و ئەمەش بۆ ئێوە خراپ دەبێ. هەڵبەتە پەیوەندیی بە منەوە نییە و دکتۆریشتان نیم تا چارەسەرتان بکەم، وەلێ ئێوە خۆتان حاڵی دەبن چی دەڵێم.

– ئێوە کەسێکتان نەدیوە کە شوێن من کەوتبێ؟

ڕاسکۆڵنیکۆف ئەمەی بە نیگایەکی پەیجۆرەوە پرسی:

سفیدریگایلۆف دەتگوت سەراسیمە بووە:

– نەخێر، من چووزانم!

ڕاسکۆڵنیکۆف ناوچاوی بە یەکدا دا و لەژێر لێوەوە بۆڵاندی:

– باشە، کەواتە با لەمە زیاتر باسی من نەیێتە ناوەوە.

– زۆریش باشە، باسی ئێوە ناهێنینە ناو.

– باشتر وایە ئەمە ڕوون بکەنەوە: ئێوە کە دەڵێن هەمیشە دێنە ئێرە تا شتێ بخۆنەوە و دوو جاریش ناونیشانەکەتان داوەتە من تا سەرتان لێ بدەم، ئەی بۆچی هەر کە لە خوارەوە چاوم پێتان کەوت، خۆتان دزییەوە و دەتانویست بۆی دەرچن؟ نکۆڵیی لێ مەکەن، خۆم بینیم!

– هەهەهە! ئێستە ئێوە بفەرموون بۆچی کاتێ هاتبوومە بەردەرگەی ژوورەکەتان، هەر وا بە ڕاکشاوی لەسەر قەنەفەکە خۆتان تێک نەدا و واتان نواند کە خەوتوون؟ خۆ ئێوە بەئاگا بوون و من خۆم بینیم!

– پێدەچێ... هۆکاری خۆمم هەبووبێ... خۆ خۆتان ئاگادارن!

– دەی، منیش بە دڵنیاییەوە هۆکاری خۆمم هەبووە، کە ئێوە ئاگاداری نین و هەڵبەتە لێشی بەئاگا نابن!

ڕاسکۆڵنیکۆف ئەنیشکی دەستی ڕاستیی بە مێزەکەدا کوتی و چەناگەشی خستە سەر پەنجەکانی هەمان دەستی و نیگای زەقیی لە سڤیدریگایلۆڤ بڕی. یەک خولەکی تەواو ڕووخساری ئەوی خستە ژێر زەرەبینی نیگایەوە، سەروسیمای سڤیدریگایلۆڤ پێشتریش هەر وا سەرنجی ڕاکێشابوو. ئەو ڕووخسارەی بەردەمی سەیروسەمەرە بوو و دەمامکئاسا، سوور و سپی بە لێوێکی ڕەنگ گوڵاریی گەش و ڕیش و قژی بۆر و پڕەوە. چاوی بە جۆرێک لە جۆرەکان زۆر شین بوو و نیگای قورس و جێگیر. ئەو ڕووخسارە سەرنجڕاکێشە شتێکی ئێجگار ناخۆشی تێدا بوو کە پەرجووئاسا لەچاو تەمەنی خاوەنەکەیدا گەنجتر دەینواند. سڤیدریگایلۆڤ تەڕپۆش و جلێکی شیاوی هاوینی لە بەر کردبوو، کراسە تازەمۆدێلەکەی زۆر کەشخە بوو و ئەنگوستیلەیەکی پانیشی بە بەردێکی گرانبایی سەرییەوە لە پەنجەدا بوو.

– کەوتوومەتە ڕۆژگارێکەوە کە دەبێ لەم گێرەوکێشەیەدا تێکەڵی کەسانی وەک ئێوەش بکەم!

ڕاسکۆڵنیکۆف بێ پێشەکی ئەمەی گوت و بە پشووکورتی و توورەییەوە چووە سەر باسە سەرەکییەکە.

– ڕاستە گەر ئێوە نیازتان هەبێ، مەترسیدارترین کەسی سەر ڕێگەی من دەبن و دەتوانن تووشی نەهامەتییەکی گەورەم بکەن،

وەلێ من ئیتر ئامادە نیم لەمە زیاتر خۆم بخەمە وەها هەلومەرجێکەوە. نیشـــانتانی دەدەم بەو ڕادەیەش بەتەنگ خۆمەوە نیم، کە ئێوە بیرتان لێ کردووەتەوە. هاتووم بۆ لاتان تا زۆر ڕاشـکاوانە پێتان بڵێم ئەگەر هێشـــتا وەک جاران چاوتان بەدوای خوشـــکەکەی منەوەیە و هەر هەمان ئەو نەخشـــانەتان لە زەیندان و لەو بارەیەوە دەتانەوێ ئەو مەسـەلەیە بەکار بهێنن کە لەم دواییانەدا ئاشـکرا بووە، ئەوا من خۆم بەر لەوەی ئێوە بتوانن بمخەنە زیندانەوە، یەکجاریتان دەکەم! قسەکەم بە هەند وەرگرن و بەڵێنی شەرەف دەدەم کە دەیبەمە سەر! پاشانیش ئەگەر شتێ هەیە کە بتانەوێ بیڵێن –چونکە بە درێژایی ئەو ماوەیە وا هەسـت دەکەم ئێوە شـتێکتان هەیە پێمی بڵێن– زووتر تەواوی کەن و بڵێن بزانم چ گلاراوێکتانە! کات زێڕە و لەوانەیە درەنگ بکا!

سڤیدریگایلۆڤ کونجکۆلانە تەماشایەکی ئەوی کرد و گوتی:

– باشە، ئێستە ئەم هەموو پەلەپەلە لەپای چی؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕووگرژ و پشووکورت وەڵامی دایەوە:

– هەر کەسەو کاروبارێکی هەیە و دەبێ بچێ بەدەم ژیانی خۆیەوە!

– هەر ئێستە خۆتان خەریک بوون دەتانگوت پێویستە ڕاشکاو بین! کەچی خۆتان هەر لە وەڵامی یەکەمین پرســـیاردا دەرپ دەهاوێن[1] و وەڵامی چەوت دەدەنەوە!

سـڤیدریگایلۆڤ بەدەم بزەوە ئاماژەی بەم خاڵە کرد و درێژەی پێ دا:

– ئێوە لەبەرخۆتـانەوە واتـان زانیوە من بەدوای بەرژەوەنـدیی تایبەتی خۆمەوەم و بێگومان ئامانجێ شتێکم لەم نێوەندەدا هەیە؛ هەر لەبەر ئەوەشـە کە گومانم لێ دەکەن. هەڵبەتە ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە

---

١. دەرپهاویشتن: گزیکاری؛ کلاونانەسەر؛ فڕوفێڵکردن (دەربڕینێکی بازارییە).

لەو بارودۆخەی ئێوەدا ئاسـاییە. من زۆر حەز دەکەم ببمە هاوڕێتان، بەس ئەوەی ڕاستی بێ نامەوێ خۆم بەوەوە ماندوو بکەم کە بتانهێنمە سەر ئەو بڕوایەی کە من هیچ مەبەست و ئامانجێکم نییە. بە خوا ئەوە ناهێنێ خۆتی بۆ ماندوو بکەی. لەگەڵ ئەوەشـدا من نەمدەویست لەبارەی شتێکی تایبەتەوە قسەتان لەگەڵ بکەم.

– کەواتە بۆچی وازم لێ ناهێنن؟ بۆچی دایمە بە دەوروبەرمەوەن؟

– ئەوەندە مرۆڤێکی سـەرنجڕاکێش و بـابەتێکی شـیاون بۆ سـەرەتاتکێکردن، منیش کونجکۆڵ بووم و سـەرەتاتکێیەکی چاکم لەگەڵ کردن، هەر ئەوەندە! ئەوە دۆخە ئەقڵەبڕ و سەمەرەکەتان بوو کە دیلی کردم! ئەوەش لەلایەک کە ئێوە برای خـانمخـاسـێکن کە سـەروەختێک زۆر هۆگریان بووم و گەلێک بەلامەوە سـەرنجڕاکێش بوون؛ جا هەر لەو خانمخاسـەوە تاریفێکی زۆری ئێوەم بیسـتبوو. خانمخاس زۆر باسـی ئێوەی دەکرد و هەر ئەمەش وای کرد تێبگەم کە ئێوە کاریگەرییەکی چەندە گەورەتان بەسـەر ئەوانەوە هەیە. دەی، بە ڕای ئێوە ئەمەندە بەس نییە؟ هاهاها! هەڵبەتە نکوڵی لەوە ناکەم کە بە بڕوای من پرسـیارەکەتان زۆر ئاڵۆزە و زۆریشـم بە لاوە دژوارە کە وەلامێکی باش بدەمەوە! مۆڵەت بدەن نموونەتان بۆ بهێنمەوە! خۆ ئێوە ئێشـێ شـتێکتان لەم ناوەدا بە من نەبوو، ها؟ نا، تەنیا بەبۆنەی دەسـتکەوتنی شـتێکی نوێوە هاتوون! دەتانەوێ شـتێ ببیسـتن کە تا ئێستە باسی لێوە نەکراوە! ها؟ ڕاست ناڵێم؟

سـڤیدریگایلۆڤ بە بزەیەکی پڕ لە فڕوفێڵەوە لەسـەر ئەوە سـوور بوو کە ڕاستیی قسەکەی بسەلمێنێت.

– بـاشـە، ئێسـتە بیهێننە بەرچـاوتـان، ئەو کـاتە منیش لەنـاو شـەمەندەفەری پیتەربورگدا، بە درێژایی ڕێگە هیوام بە ئێوە بوو تا شـتێکی تازەم پێ بڵێن و کەچی دواجار کەمترین شـتیشـم لێتانەوە

دەست نەکەوت! جا تەماشا کەن من و ئێوە دۆخێکی چەندە شازمان هەیە!

– چیتان دەست بکەوێ؟

– چی بڵێم؟ چووزانم؟ وا بە چاوی خۆتان دەبینن کە لە چ کەلاوەیەکدا شەو و ڕۆژ ڕادەبووێرم! هەڵبەتە ناکرێ بڵێم چاک ڕادەبووری، بەس خۆ هەر دواجار دەبێ لە شوێنێکدا دانیشی، وا نییە؟ هەر ئەم کاتیا بێلانەیە! خۆ خۆتان بینیتان!... ئاخ ئەگەر یەکێک دەبووم لەو چڵێسە جلفانە یان لەوانەی کە لە ڕێستۆرانتە ڕاقییەکاندا لەنگەر دەخەن! بەس خۆ دەتوانم هەر جۆرە شەخەڵێ بخۆم، تەنانەت ئەمەش.

جا ئاماژەی بۆ مێزێکی بچووک کرد کە لە لایەکی ژوورەکەوە بوو و دەورییەکی تەنەکەییش بە پاشماوەی قیزەونی باریکە گۆشتی برژاو و پەتاتەوە بەسەرەوە بوو.

– بە ڕاست فراوێنتان خواردووە یان نا؟ من چەند پارووێکم خوارد و هەر ئەوەندەشم بەسە. حەزم لە شەرابیش نییە. بێ لە شامپانیا دەم بە هیچ خواردنەوەیەکی دیکەوە نادەم و ئەویش تەنیا یەک پەرداخ، جا بەو یەک پەرداخەش بە درێژایی شەو ژانەسەر دەمگرێ! ئێستەش سپاردم پێکێکم بۆ بهێنن تا بێمەوە سەر خۆم؛ چونکە بڕیار وایە بچمە شوێنێک و ئێوەش لە بارۆدخێکی زۆر سەیردا بەگیرتان هێناوم. ئەگەر هەر وەک منالی قوتابخانە خۆم شاردەوە، لەبەر ئەوە بوو کە دەترسام دوام بخەن و فریای ئیشەکەم نەکەوم. بەس لام وایە...

سفیدریگایلۆڤ کاتژمێرەکەی دەرهێنا.

– بەس لام وایە هێشتا کاتژمێرێکم بۆ ئێوە هەیە. ئێستە چوار و نیوە. باوەڕکەن بە هەر شتێ قایل بووم: موڵکدار بم، یان هەر باوکی خێزان، ئەفسەری سوارەی چەکدار، وێنەگر، ڕۆژنامەنووس... کەچی

هیچ نیم و هیچ پسپۆڕییەکم نییە. هەندێ جار هێندە وەڕەز دەبم کە لە باسدا نییە! هەر بە ڕاستی  وام دەزانی شتێکی نوێ هەیە و ئێوە پێمی دەڵێن.

– کەواتە ئێوە چکارەن؟ ئەی بۆچی هاتن بۆ ئێرە؟

– من چکارەم؟ خانەدانێک کە دوو سـاڵ لە سـوارەی چەکداری سوپادا خزمەتم کرد و پاشانیش بۆ ماوەیەک لەم پیتەربورگەی ئێوەدا بە سـەرگەردانی سـووڕامەوە. دواتریش مارفا پیترۆڤنام هێنا و لە گونددا نیشـتەجێ بووم. فەرموون، ئەوەش ژیانی کورت و پوختی من لە خزمەتتاندا!

– قومارچیشن، لام وایە؟

– نـا، قورمـارچیی چی؟ بە جۆرێ لە جۆرەکـان وەرەقبـازێکی ساختەچیم؛ بەس قومارچی نا.

– یانی وەرەقبازی ساختەچی بوونە؟

– بەڵێ، وەرەقبازیشم کردووە.

– دەی کەواتە ڕووی داوە لێدانیش بخۆن!

– جاروبار. جا چییە؟

– کەواتە دایمە ئەگەری ئەوە هەبووە کە دۆئیلیش بکەن... چەنـدە خرۆشێنەرە!

– نامەوێ ئەوەتان لە دەم بنێم، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ ئەزموونێکم لە فەلسـەفەڕێسـی و ئەم جۆرە شـتانەدا نییە. دانی پێدا دەنێم کە تەنیا لەبەر خاتری ژنانی پیتەربورگی هاتمە ئێرە.

– ئاخر خۆ تازە مارفا پیترۆڤناتان ناشتووە!

– بەڵێ، وایە.

سـىـڤيدريگـايلۆڤ بزەيەكی ئـاوێتە لە ڕاشـــكـاوييە لێهـاتوو و سەرنجڕاكێشەكەی خۆی كرد.

– باشـــە جا چييە؟ دەڵێی پێتـان خۆش نييە بەم جۆرە لە ژنـان دەدوێم؟

– مەبەستتان ئەوەيە كە من هەرزەييم پێ خۆشە يان چی؟

– ئەها، هەرزەيی! دەی بڵێن، دەتانويســـت بگەنە ئێرە! وەلێ من بە ڕێكوپێكی و يەک بە يەک وەڵامی پرسـيارەكانتان دەدەمەوە. سـەرەتا بە گشتی لەبارەی ژنانەوە. ئێستە كەوتوومەتە سەر هەوای فرەڕێسی! ئێوە بيڵێن، بۆچی بەدەم كەيف و ڕابواردنی خۆمەوە نەبم؟ بۆچی واز لە ژن و شـــت بێنم كاتێ كە تەنيا لای ئەوان چێژ لە ژيان دەبەم؟ ئەمەش لە خۆيدا كارێكە خۆ، بۆ خۆم سەرگەرميش دەبم.

– كەواتە تەنيا بۆ هەرزەيی هاتنە ئێرە؟

– گريمـان تەنيــا بۆ هەرزەيی هــاتبم! ئێوەش گرتووتــانە بەم وشەيەوە. وەلێ من كەيفم بە ڕاشكاوييەكەتان دێ. شتێكی ڕەنگدار و جێگير (وەک خۆتان دەڵێن) لەم هەرزەييەدا هەيە، چونكە لە بنەڕەتدا سرووشتی و خۆڕسكە نەک خەون و خەياڵی مرۆڤ. شتێكە هەروەک پشكۆی گەشاوە لە خوێنی مرۆڤدا تاوی سەندووە و بۆ هەميشە هەر دەسووتێ؛ بەم زووانەش ناكوژێتەوە. لام وايە ئێستە ئێتر پەسەندتان كرد كە ئەمەش كارێكە بۆ خۆی؟

– شـتێ نييە كە بتانەوێ بەم جۆرە چێژی لێ بەرن! نەخۆشـييە و نەخۆشييەكی مەترسيداريشە.

– كەواتە مەبەســتتان ئەمە بوو! هاوڕام كە نەخۆشـييە، وەک هەر شـتێكی تر كە لە ئاسـتی پێويســت دەربچێ. هەڵبەتە هەرزەييش وا دەخوازێ كە لە ئاستی پێويستی دەرچێ! وەلێ ڕاستييەكە ئەوەيە كە

هەر کەســـەو لە هەرزەییدا شـــێوازی خۆی هەیە و، دووەمیش، هیچ قســەیەک لەوەدا نییە کە دەبێ زیادەڕۆ نەبێ و ســنووری مەســەلەکە بزانێ. وەلێ ئێســـــتە من چیم لەدەســـــت دێ؟ خۆ ئەگەر ئەمەش لە ژیانمدا نەبا دەبوو بە گوللەیەک خۆم نەجات بدەم. قەبوولمە، مرۆڤ دەبێ بتوانێ بەرگەی بێتاقەتی و وەڕەزی بگرێ، بەس ئاخر...

– ئاخر لێتان دەوەشێتەوە دەستتان بچێتە خۆتان؟

– ئای لەو قسەیە!

سڤیدریگایلۆڤ بە بێزارییەوە خۆی لە پرسیارەکەی ڕاسکۆلنیکۆڤ لادا.

– تکایە بە هیچ جۆرێ باسی مەکەن!

بە پەلە ئەمەی بۆ زیاد کرد؛ ئیدی هیچ ئاسەوارێک لەو کرووزانەوە و شـێوازی قسـەکردنە لووتبەرزانەیە نەمابووەوە و تەنانەت دەتگوت باری ڕووخساریشی گۆڕانکاریی بەسەردا هاتبوو.

– خۆشـــم پەســـەندی دەکەم کە ئەمە خاڵێکی لاوازە و شـــیاوی لێبوردن نییە. وەلێ ناتوانم هیچی لەگەڵ بکەم. کەیفم بە مردن نایێ و تەنانەت حەز ناکەم باسیشی ببیستم. هەر بە ڕاست، زانیوتانە من بە جۆرێ لە جۆرەکان کەسێکی عارفناسام؟

– ئەها! دەرکەوتنی ڕۆحی مارفا پیترۆڤنا و ئەمانە! هێشـــتا دێتە سەروەختتان؟

– حەدی چییە! جارێ لە پیتەربورگدا نەهاتووەتە سـەروەختم! دەی نەفرەتی خوا لە خۆی و ڕۆحی و دەرکەوتنەکەشی!

سڤیدریگایلۆڤ بە دەنگێکی مەیلەو توورەوە هاواری دەکرد.

– نا؛ وا باشە باسی شتێکی تر بکەین... گەرچی... ئمممم! کاتم نییە و ناتوانم زۆر لە خزمەتتاندا بم، حەیف! شتی زۆر هەبووْ دەمەتەقێی لەبارەوە بکەین!

– ئێستە ژنی، شتی لە ژیانتاندا هەیە؟

– بەڵێ؛ ژوانم لەگەڵ ژنێکدا هەیە. وەلێ شـتێکی جددی نییە... نا، نەمدەویست باسی ئەمەیان بکەم.

– ئیدی چەپەڵکارییەکانتان کاریگەرییەکی ئەوتۆتان ناخەنە سەر! ئیتر دەسەڵاتتان بەسەر خۆتاندا ناشکێ تا بەریان پێ بگرن، وایە؟

– کەواتە ئێوە بانگەشەی دەسەڵات دەکەن؟ هەهەهە! ئەم جارەیان ئێوە ئیتر بە تەواوی مدتان سەراسیمە کرد، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ، گەرچی پێشوەختە هەر دەمزانی وای لێ دێ. تەماشا کێ بۆ من چووەتە سەر مینبەر و باسی هەرزەیی و جوانیناسی دەکا! ئێوە... خۆ ئێوە شیلەرێکن بۆ خۆتان... ئایدیالیستێکی تەواو! هەڵبەتە هەر دەبوو وا بێ و گەر بەدەر لەمە با جێی سەرسامی بوو؛ وەلێ کە لە واقعدا ڕووبەڕووی دەبیتەوە زۆر زۆر سەمەرەیە!... خوایە، ئاخر بۆچی کاتم نییە! هیچ کەسێکم نەدیوە لە ئێوە سەیروسەمەرەتر! بە ڕاست ڕاتان چییە لەسەر شیلەر؟ خۆشتان دەوێ؟ من خراپ شەیدایم!

– ئاخ ئێوە مرۆڤێکی چەندە ڕوواڵەتبازن!

ڤینێکی تایبەت لە دەنگی ڕاسکۆڵنیکۆفدا هەبوو.

– چیی تر؟ نا، وا نییە، سوێند دەخۆم!

سڤیدریگایلۆف لەتاو پێکەنین پێچی دایە خۆی.

– وەلێ نیازی مشتومڕم نییە لەگەڵ ئێوەدا. گریمان ڕوواڵەتبازیش بم، ئێ جا چییە؟ بۆچی نەبم، خۆ زیان بە هیچ کەسی ناگەیەنێ؟ من

حەوت ساڵی ڕەبەق لەگەڵ مارفا پیترۆڤنا لە گوندا ژیام، هەر لەبەر ئەوەشە کاتێ تووشی مرۆڤێکی زیرەکی وەک ئێوە دەبم خواخوامە لەگەڵی بکەومە چەنەبازی... هەڵبەتە زیرەک و سەرنجڕاکێش و خرۆشێنەر. جا ئێستەش نیو پەرداخ شامپانیام خواردووەتەوە و سەرم گەرم بووە. وەلێ سەرەڕای هەموو ئەمانەش خاڵە سەرەکییەکە شتێکی ترە، شتێ کە زۆر نارەحەتی کردم و ڕایچەناندم وەلێ جارێ... بە نەگوتراوی دەیهێڵمەوە. بەس... ئەی ئێستە بۆ کوێ دەچن ئاوها کتوپڕ؟

سڤیدریگایلۆڤ بە حەپەساوی ئەمەی پرسی.

ڕاسکۆڵنیکۆڤ خەریک بوو هەڵدەستایەوە تا بڕوات. هەستی دەکرد گۆشاری لەسەرە و وا دەخنکێ و تەنانەت تا ڕادەیەک لەوە نارەحەت بوو کە هاتبووە ئەو مەیخانەیەوە. ئیدی هیچ گومانێکی بۆ نەمابووەوە کە سڤیدریگایلۆڤ چەپەڵترین و بێنرخترین خوێڕیی تاوانبارە کە تا ئێستە دونیا بە خۆیەوە بینیبێتی.

– وای لە من! خۆ وا نابێ! دانیشن، لانیکەم تۆزێکی تر بمێننەوە!

سڤیدریگایلۆڤ پێی لەسەر مانەوەی داگرت.

– لانیکەم بڵێن فنجانێ چایتان بۆ بێنن. بمێننەوە تۆزێکی تر. منیش ئیتر قسەی بێسەروبەر فڕێ نادەم، یانی لەبارەی خۆمەوە چەنەبازی ناکەم! دەمەوێ شتێکتان بۆ بگێڕمەوە. گەر ویستتان دەتوانم بۆتان بگێڕمەوە کە جارێکیان ژنێک وەک ئێوە دەڵێن چۆن منی ڕزگار کرد. ئەمە لە بنەڕەتدا دەبێتەوە وەڵامی یەکەم پرسیارتان، چونکە ئەو ژنەی کە گوتم، خوشکی ئێوەیە. مۆڵەت دەدەن باسی کەم؟ هیچ نەبێ کاتەکەشمانی پێ دەبەینە سەر.

– بیڵێن؛ بەس هیوادارم کە...

– خەمتان نەبێ! ئەوەش لە لایەک کە دونیا خاتوون تەنانەت لە بوونی مرۆڤێکی چەپەڵ و بێنرخی وەک منیشدا دەتوانێ ڕێزێکی قووڵ و ڕاستەقینە بورووژێنێ.

# چوار

– لەوانەیە ئاگادار بن کە من... بەڵێ، خۆم بۆم باس کردن!

سڤیدریگایلۆڤ دەستی کردە باسی بەسەرهاتەکەی.

– بۆم باس کردن ئەو ســــاڵانە لەبەر ئەو قەرزەی کە بووبووم بەژێرییەوە کەوتمە زینـدان و بڕی قەرزەکەش لەوە زیـاتر بوو کە هیوای دانەوەیم هەبێ. پێویســــت ناکا بچینە ناو وردەکارییەکەیەوە و ئەوەی کە مارفا پیترۆڤنا چۆن و بە چ ئامادەکارییەک منی لە زیندان دەرهێنا. بیرتان لەوە کردووەتەوە کە هەندێ جار ژنان دەتوانن تا چ ڕادەیەک عاشــق بن؟ مارفا پیترۆڤنا ژنێکی ئاوڕوودار بوو و زۆریش ژیر و ماقووڵ، گەرچی دوو وشە خوێندەواریشی نەبوو. باوەڕ دەکەن کە هەر ئەم ژنە ئاوڕوودار و خانەگومانە دوای دونیایەک دەمەقاڵێ و هەرا و ســــەرکۆنە ڕازی بوو بەڵێننـامەیەک لەنێوانمـاندا هەبێ و بە درێژایی ژیانیشــــی پێیەوە پابەند بوو؟ تەمەنی زۆر لە هی من زیاتر بوو و دایمەی خواش گەڵا مێخەکێ، شــــتێکی لەناو دەمدا بوو و هەر تامی دەکرد. منیش ئەوەندە بەرازسیفەت بووم و هاوکاتیش بە جۆرێ لە جۆرەکان ئەوەندە ڕاشکاو کە ڕووی لێ بنێم و پێی بڵێم من ناتوانم تاهەتا پابەندی بم. پێهاتنەکەم شــێتی کرد، وەلێ وا دیار بوو ئەم ڕاشــکاوییە ڕەق و بێبەزەییانەیەم بۆ ئەو ســەرنجڕاکێش بوو و بیری کردەوە: *بەدەست خۆی نییە و بێگومان نایەوێ بمخەڵەتێنێ دەنا خۆی نەدەهات ڕووبەڕوو وەها قســــەیەکم پێ بڵێ!* لە منییەوە وەرگرن، بۆ ژنە خانەگومانەکان هیچ شتێ لەمە گرنگتر نییە! دوای دونیایەک ئاه و فرمێسک، هەردووکمان بە بەڵێننامەیەکی نەنووسراوەوە پابەند بووین.

یەک: بەڵێن بێ من هەرگیز واز لە مارفا پیترۆڤنا نەهێنم و بۆ هەمیشە مێردی بم. دوو: هەرگیز بەبێ مۆڵەتی ئەو شـــوێنبزر نەبم و نەچم بۆ هیچ شـوێنێ. سـێ: هەرگیز دۆسـتێکی جێگیرم نەبێ. چوار: لەبەرانبەر ئەمانەدا مارفا پیترۆڤنا دەســـتی منی بۆ پەیوەندییەکی تاوتاوی لەگەڵ خزمەتکارەکاندا ئاوەڵا دەکرد، هەڵبەتە دەبوو خۆیشـــی بە دزییەوە ئاگادار بێ. پێنج: خوا ئەو ڕۆژە نەهێنێ کە من عاشقی ژنێکی هاوچینی خۆمان ببم! شــەش: ئەگەر زمانم لاڵ، خوانەخواســته گەر هەســتێکی ڕاستەقینە و قووڵ لە دڵمدا بۆ کەسـێ بورووژێ و سـۆزێکی تایبەتیم بۆی ببێ، ئەوا دەبوو مەســـەلەکە لەگەڵ مـارفـا پیترۆڤنـادا بخەمە بەرباس. هەڵبەتە مارفا پیترۆڤنا هیچ کاتێ خەمی ئەم برگەیەی کۆتایی نەبوو. ئەو ژنێکی تێگەیشـتوو بوو و ئەقڵی بەوە دەشـکا کە عەشـقی ڕاســتەقینە لە منی ژنباز ناوەشــێتەوە. وەلێ ژنی تێگەیشــتوو و ژنی خانەگومان بە تەواوی لێک جیان! جا کێشـــەکەش هەر ئەمەیە. بەس هەندێک ئاوهـان و ئەگەر بتەوێ بەبێ دەمارگیری داوەرییان بکەی، دەبێ ســـەرەتا ئەو پێشـــزەمینە فکری و خووانە وەلا نێی کە بەپێی ئەوان بەر خەڵکی ئاســـایی و تەنانەت هەندێ شـــتیش دەکەوی کە لە باری ئاسـاییدا لە چواردەورتن. من لەبەر چەند هۆکارێ داوەرییەکەی ئێوەم زیاتر لە بۆچوونی هەر کەســـێ بەلاوە پەســـەندترە. لەوانەیە ئێستە گەلێک شـتی سـەیر و گاڵتەجاڕانەتان لەبارەی مارفا پیترۆڤناوە بەر گوێ کەوتبێ. دەی، هەڵبەتە زۆربەی کار و خووەکانی گاڵتەجاڕانە و ســـەیر بوون، وەلێ ڕاســـتگۆیانە لە خزمەتتاندا دەیڵێم کە لە ناخی دڵەوە بۆ هەموو ئەو ئاستەنگی و کێشانە بەداخم کە من هۆکارەکەیان بووم. دەی، بەســـە ئیتر؛ ئەوەش دەردەدڵی مێردێکی نەرمونیـان و دڵخواز لە ڕێوڕەسـمی کۆچی دوایی ژنە ئێجگار خۆشـەویسـتەکەیدا. Oraison funebre. کە دەبـووە شـــەڕمـان، مـن کـوڵـم دەدا و نەمدەهێشـــت بە ڕقدا بکەوێ. ئەم هەڵســوکەتە بەڕێزانەیەش زۆربەی کات بە چاک دەشـــکایەوە. جا هەر مەپرســـە کە چۆن دەکەوتە ژێر

کـاریگەرییەوە و چەنـد پێی دڵخۆش دەبوو. تەنـانەت هەنـدێ جـار شـــانـازیشـــی پێوە دەکردم. وەلێ چـاوی بە خوشـــکەکەی ئێوە هەڵنەدەهات. مارفا پیترۆڤنا بەرگەی دونیا خاتوونی نەدەگرت. ئاخر چۆن سـەرەڕای ئەو خووڕەوشـتە وەها ڕیسـکێکی کرد و هێشـتی ئەو شـــۆخە لەماڵەکەیدا ببێتە مامۆســـتای مناڵەکانی؟ هێندەی من بیزانم ڕوونکردنەوەکەی ئەوەیە کە مـارفـا پیترۆڤنـا -کە ژنێکی زۆر بەجۆشـوخرۆش بوو و زۆریش لەژێر کاریگەریدا- خۆیشـــی عاشـــق بوو، هەر بە جددی عاشـــقی خوشـــکەکەتان بوو. ئاخر خوشـــکەکەی ئێوەش توخمێکی دەگمەنە! عـاشـــقبوونی مـارفـا پیترۆڤنـاش جێی سەرسووڕمان نەبوو. من هەر چاوم بە دونیا خاتوون کەوت یەکسەر تێگەیشتم بۆنی گێچەڵی لێ دێ -دەتوانن وێنای بکەن؟- جا بڕیارم دا هیچ کاتێ چاوی لێ کلا نەکەم! وەلێ دونیا خاتوون خۆی هەنگاوی یەکەمی نا، باوەڕ ناکەن، وا نییە؟ شتێکی باوەڕپێنەکراوی تریش هەیە: چەقۆت لە مارفا پترۆڤنا بدابا خوێنی لێ نەدەهات، چونکە نەیدەزانی ئاخۆ بۆچی من هەر لە ســـەرەتاوە لەبارەی دونیا خاتوونەوە بێدەنگ بوومە و هیچ ناڵێم، یان بۆچی حسێب بۆ تاریف و پیاهەڵدانەکانی ئەو بۆ دونیا خاتوون ناکەم! هەر بە ڕاســتی خوا دەزانێ بەدوای چییەوە بوو ئەو ژنە! دەی، هەڵبەتە هەر لە سەرەتاوە، مارفا پیترۆڤنا سروترپی ژیان و ڕەوشتی منی خستە بەردەستی دونیا خاتوون. بەداخەوە ئەوە خووی بوو کە گرێی دڵی بۆ هەمووان بکاتەوە و چاوی بە هەر کەسێ بکەوێ، نهێنییەکانی ژیانمانی بۆ باس بکا و بەردەوامیش پرتەوبۆڵەی بێ و لەدەست من داد و بێدادی بێ. ئێستە وەها مرۆڤێ چۆن دەیتوانی چاو لە دەردەدڵ بپۆشـــێ لەگەڵ هاوڕێیەکی تازە و دڵگیر و شـــۆخی وەک دونیا خاتووندا؟ من دەڵێم ئەو دووانە تەنیا و تەنیا باســـی منیان دەکرد و دڵنیام هەرچی قســـەوقســـەڵۆک و نهێنیی ژێربەژێر دراوەتە پاڵ من بەر گوێی دونیا خاتوون کەوتووەتەوە!... ئامادەم سوێند بخۆم کە ئێوەش شتی واتان لەبارەی منەوە بیستووەتەوە.

– بەڵێ، بیســـتوومەتەوە. لوژن ئێوەی بەوە تۆمەتبار کردووە کە دەستتان لە مردنی منالێکدا هەبووە. ئەمە ڕاستە؟

– تکایە ئەم قسە فاتوفیتکەرانانە مەهێننە ناوەوە!

سڤیدریگایلۆڤ بە پەستی و بێزارییەوە خێرا ئەمەی گوت.

– گەر زۆر حەز دەکەن بزانن مەسەلەی ئەو بەسەرهاتە گەمژانەیە چی بووە، خۆم ڕۆژێ بۆتانی باس دەکەم. وەلێ ئێستە...

– بیستوومە خزمەتکارێکیشتان هەبووە کە خراپ هەڵسوکەوتتان لەگەڵ کردووە و بە جۆرێ لە جۆرەکانیش بەرپرسیارن لە مردنەکەیدا.

– تکا دەکەم واز لەم باسە بێنن!

سڤیدریگایلۆڤ هەمدیسان بە پشووکورتییەکی ئاشکراوە قسەی بە ڕاسکۆڵنیکۆڤ بڕی.

– ئەمە هەمان ئەو خزمەتکارەتان نییە کە بەر لە مەرگ هات سەبیلەکەتان بۆ داگیرسێنێ؟... خۆتان پێتان گوتم!

ڕقی ڕاسکۆڵنیکۆڤ سات بە سات زیاتر بڵێسەی دەسەند.

سڤیدریگایلۆڤ بە سەرنجەوە تەماشای ئەوی کرد و ڕاسکۆڵنیکۆڤ بۆ تاوێک وای هاتە بەرچاو کە بریقەی گاڵتەجاڕییەکی چەپەڵانەی تێدایە. وەلێ سڤیدریگایلۆڤ خۆی کونترۆڵ کرد و زۆریش شارستانی و بە ڕێزەوە وەڵامی دایەوە:

– بەڵێ، خۆیەتی. دەبینم کە ئێوەش زۆر ئەم بەسەرهاتەتان بە لاوە ســـەرنجڕاکێشـــە و بە ئەرکی خۆمی دەزانم لە یەکەمین دەرفەتدا تینوێتیی کونجکۆڵیی جەنابی پایەبەرزتان بشـــکێنم! ئەی نەفرەت لەم باســـەش! خۆشـــم دەزانم کە لە دیدی زۆر کەســـەوە وەک یەکێک لە کەســـانی نێو ڕۆمانەکان دێمە بەرچاو! ئیتر خۆتان وێنای بکەن کە

چەندە قەرزاری مارفا پیترۆڤنای کۆچکردووم کە ئەم هەموو چیرۆک و دەنگۆ تەلیسماوی و سەرنجڕاکێشەی لەبارەی منەوە خستووەتە بەردەستی خوشکەکەی ئێوە! خۆ ناوێرم بیر لەوەش بکەمەوە کە دونیا خاتوون چییان بە مێشکدا هاتووە! وەلێ هەرچییەک بوو، لە کۆتاییدا بە بەرژەوەندیی من تەواو بوو. سەرەڕای بێزاریی سرووشتیی دونیا خاتوون لە من و ڕووالەتی ناحەز و بێزراوم، دواجار دڵی خوشکەکەتان بە منی سەرگەردان سووتا؛ دڵسۆزی و بەزەیی ڕێگەیان بەرەو ڕۆحێک ون کردووە. جا وای لەو ڕۆژەی کە هەستی دڵسۆزی و بەزەیی لە دڵی ژنێکدا دەورووژێ، هەموومان دەزانین کە وەها ژنێ ئامادە دەبێ خۆی بخاتە بەر هەڕەشەی تۆقێنەرترین مەترسییەکانەوە تا ئەو پیاوە ڕزگار بکا، بیهێنێتەوە هۆش، لەناو قوڕدا دەریبهێنێ و بیگەیەنێتە تەشقەلانی ئاسمان، ژیانێکی تازەی پێ ببەخشێ و تەنانەت وا بکا بەسوود بێ و کەڵکی چواردەوریشی بگرێ؛ بە کورتییەکەی ئەلەم جۆرە خەون و خەیاڵانە. منیش سەیرم کرد کۆترەکەمان دەستەمۆ بووە و وا بە پێی خۆی دێتە ناو داوەکەوە، لەبەر ئەوە خۆم ئامادە کرد. چییە؟ دەڵێی ناوچاوتان دایەوە بە یەکدا، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ؟ پێویست ناکا بە هیچ شێوەیەک خۆتان نارەحەت بکەن، بەڕێز گیان. ئاگادارن خۆ... هەمووی بووە دووکەڵ و بە هەوادا چوو؛ دەک بە نەفرەت بی شەیتان! ئەمڕۆ خەریکە زۆر دەخۆمەوە! دەزانن چییە؟ من هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە، هەر لە سەرەتای سەرەتاکەیەوە، داخم لەوە خوارد کە خوشکەکەی ئێوە بەختەکەی نەیهێنا لە سەدەی دووەم یان سێیەمدا بێتە دونیا و کچی بەرپرس یان فەرمانڕەوایەک بێ لە ئاسیای بچووک یان لانیکەم کچی فەرمانداری. گومانم نییە کە دونیا خاتوون دەبووە یەکێ لەوانەی کە تا شەهیدبوونیش سڵ ناکەنەوە و ئەگەر پلایسی سوورەوەبووش بنێن بە سنگییەوە، هەر بزەی دێتێ. ئەسڵەن خۆی بە باوەشی کراوەوە بە پیرییەوە دەچوو. ئەگەریش لە سەدەی چوارەم یان

پێنجەمدا با، دونیا خاتوون بەڕێ دەکەوت و دەچوو بۆ بیابانی سینا و سی ساڵی ڕەبەق ڕەگی دڕک و خەیاڵات و ئیلهامی غەیبی و ئەمانەی دەکردە خۆراکی شەوانی. تێنوێتییەکی سەیری بۆ ئەوە هەیە کە لەپێناو کەسێکدا ئازار و ئەشکەنجە بچێژێ. ئەگەریش نەتوانێ بەو ئازارە بگا کە خۆی حەز بە پێگەیشتنی دەکا، دەچێ و سەراوسەر خۆی لە پەنجەرەوە هەڵدەداتە خوار. شتگەلێکم لەبارەی ڕازومیخینناوێکەوە بیستوون، کە مرۆڤێکی ژیر و مەنتیقییە و بنەماڵەکەشی گەلێ ناودارە. هەڵبەتە خوێندکاری زانستە ئایینییەکانیشە. دەی، باشتر وایە ئاگاداری دونیا خاتوون بێ! بە کورتییەکەی چاک خوشکەکەتانم ناسیوە و هەر بەو بۆنەیەشەوە شانازی بە خۆمەوە دەکەم. وەلێ دەی، ئەو ڕۆژانەی سەرەتا... خۆتان دەزانن ئیتر، مرۆڤ لە سەرەتاوە زۆر کەللەپووچ و گەمژانە لێی دەچێتە پێش، هەر دەڵێی چاوی باش نابینێ و دەکرێ هەڵەی زۆری لێ بوەشێتەوە. ئەی بە نەفرەت بێ ئەم بەختە، ئاخر بۆچی دەبێ ئەوەندە جوان بێ؟ ئەمەیان سووچی منی تێدا نییە! ئەوەی ڕاستی بێ لە لای منەوە هەموو شتێ بە سەرنجڕاکێشانێکی جەستەیی سەیر و بەرگەنەگیراو دەستی پێ کرد. دونیا خاتوون نموونەی نەجیبییە[1]، ئەسڵەن بە شێوەیەکی تۆقێنەر نەجیبە! سەرنج بفەرموون، من وەک حەقیقەتێک لەبارەی خوشکەکەتانەوە ئاماژە بەم خاڵە دەکەم؛ نەجیبییەکەی مەرگبارە، هیچ پەیوەندییەکیشی بەو ژیری و زەینە کراوەیەوە نییە، وەلێ لە جێیەکدا دەبێتە بەربەستی ڕێگەی. ئەوە هیچ کە سوودێکی بۆی نییە، هەمووشی زیانە! هەر ئەو ڕۆژانە و لە موڵکەکەی ئێمەدا کچێ بە ناوی *پاراشا*وە دەرکەوت، *پاراشا چاوڕەش*. من تا ئەو ساتە چاوم بەو پاراشایە نەکەوتبوو، خەڵکی گوندێکی تر بوو، زۆریش جوانکیلە بوو، وەلێ حۆل و گەمژە. کچەی حەپۆل دایە پرمەی گریان و شینێکی

---

١. نەجیبی: ئاکارباشی؛ داوێنپاکی.

نایەوە کە دەنگی هەموو ئەو ناوەی تەنییەوە و بە کورتییەکی تووشی شـــوورەییەک بووین کە هەر مەپرســـە. ڕۆژێ دوای فراوێن دونیا خاتوون لە باخەکەدا منی بەگیر هێنا. چاوانی ئاگریان لێ دەباری، سنگیی کردە قەڵغان و ورکی گرت واز لە پاراشای بێلانە بێنم. دەکرێ بڵێین ئەوە یەکەمین دەمەتەقێی تـایبەتیی ئێمە بوو. منیش خواخوام بوو هەلەکە بقۆزمەوە و بەوپەڕی حەزەوە فەرمانەکەیم جێبەجێ کرد —لە خۆیدا شـانازییەک بوو!— هەوڵم دا خۆم شـــەرمەزار و بە جۆرێ لە جۆرەکان تاســـاو نیشـــان بدەم و نواندنەکەشـــم خراپ نەبوو! بە کورتییەکەی پەیوەندییەکەمان شـــێوەی گرت؛ گوتوبێژی ژێراوژێری ئاڵۆز، هەموو جۆرە پەند و ئامۆژگارییەک، تکا و لاڵە و کڕووزانەوە و تەنانەت فرمێســـک... بڕوا دەکەن؟ کار گەیشـــتە گریانیش! ئیتر خۆتان تەماشاکەن گوڕوتینی ڕێنوێنی چی لە ژنان دەکا! منیش هەموو شتێکم نایە ئەستۆی چارە و بەخت و خۆمم وەک تامەزرۆیەکی ڕێگەی نوور و ڕۆشـنایی و ڕێی ڕاسـت نیشـان دا؛ دواجار دەسـتم دایە بەهێزترین چەکێک کە دەسەڵاتی بەسەر دڵی ژناندا دەشکێ. چەکێک کە گومان لە کارابوونی ناکرێ و کاریگەریش بەسـەر هەمووانەوە دادەنێ و قسـەی تێدا نییە. شێوازێکی ناسراویشە: مەراییکاری و زمانلووسی. لە دونیادا هیچ کارێ ئەوەندەی ڕاســتگۆیی دژوار نییە و هیچ کارێکیشــمان نییە لە زمانلووسی ئاسـانتر! هەر ئەوەندە بەسە نۆتەیەکی ناکۆک بکەوێتە حەقیقەتەوە! ئەوسا سـەرانسـەری هارمۆنییەتەکەی لەدەست دەچێ و مرۆڤ دەکەوێتە گێچەڵەوە. وەلێ گەر مەراییکاری سـەرانسـەریشـی ناکۆک بێ، هیچ کێشـەیەکی نییە. هەروەها خوازیارێکی باشـی هەیە و چێژ لە بیســـتنیشـــی دەبەن. لەوانەیە چێژێکی خەوشـــدار بێ، وەلێ هەرچۆنێک بووە، چێژی هەیە و ئاســـوودەیی دەبەخشـــێ. لەگەڵ ئەوەشدا، مەراییکاری هەرچەندەش سادە و هاکەزایی بێ، لانیکەم هەر نیوەی ڕاســـتوڕێک دێتە بەرچاو. ئەوەی کە گوتم هەموو چینەکانی کۆمەڵگە دەگرێتەوە و پەیوەندیشـــی بە خوێنـدەواری و ئەم جۆرە

شتانەوە نییە. ئەسڵەن حەز دەکەی یەکێ لە ڕاهیبەکانی پەرستگە بێنە، دەکرێ ئەویش بە مەراییکاری نەرم بکەی، چ جا کەسانی ئاسایی! خۆ ناتوانم بەر بە پێکەنینی خۆم بگرم هەر کات بەسەرهاتی لەخشتەبردنی ئەو خاتوونە بەڕێز و خێزاندارەم بیر دێتەوە! خاتوونێ بوو گەلێک پابەند و بەرپرسیار بوو لەئاست مێرد و مناڵەکانیدا و هەڵبەتە لەئاست بنەمای ئاکاری و پاکداوێنیش. ڕابواردنێکی باش بوو و هیچ زەحمەتێکیشـــــی تێ نەدەچوو، هیچ زەحمەتێ! ئەو خاتوونە هەر بە ڕاستی خاوەنی بنەما بوو؛ لانیکەم بەپێی بنەمای خۆی داوێنپاک بوو. جا سـەیری شـێوازەکەی من: زۆر بە سـادەیی لە هەر دەرفەتێکدا لەئاسـت داوێنپاکیی ئەودا وەک تەختبوویێک خۆم نیشـان دەدا؛ بە جۆرێ وەک ئەوەی لەژێر باری نەجیبیی ئەودا پلیشـابمەوە! ڕووهەڵماڵراوانە مەراییم بۆ دەکرد و هەر کە دەرفەتێ دەلوا و دەسـتگوشـینێ یان نیگایەکیم بەنسـیب دەبوو، دەمودەسـت خۆم نەفرەتباران دەکرد کە بۆچی وێڕای بەرگریی ئەو، هەر بە زۆر ئەوەم لێ ڕفاندووە و دەتگوت بەم هەموو خۆڕاگری و گیرییەی ئەو، گەر مکووڕیی من نەبا و پێداگریی نائەخلاقیم، نەکردە بوو ئەو نیگا یان دەستگوشینەم بەنسیب بێ. دەمگرت بەوەوە کە ئەو هێندە سادە و بێگەردە نەیتوانیوە لە مەبەسـتی چەپەڵی من تێبگا و نائاگایانە و بێ هیچ بیرکردنەوەیەک خۆی داوە بە دەستەوە و چی و چی. لە ڕاستیدا، من سەرکەوتم و بە خواستی خۆم گەیشتم. ئەو خاتوونەش گومانی لە بێگەردی و داوێنپاکیی خۆی و وەفاداربوونی بەرانبەر یەک بە یەکی ئەرک و بەرپرسـیارییەتییەکانی نەبوو؛ جا بڕوای وا بوو ئەم نەهامەتییەی تەواو بە هەڵکەوت و خۆنەخوازانە تووش بووە. ئای کە چۆن گڕی گرت کاتێ لە کۆتاییدا قسەی دڵمم بۆ کرد و پێم گوت هەر. بە ڕاستی بڕوام وایە ئەویش هێندەی من تاسەمەندی پەیوەندییەکەمان بووە و تەنیا بەدوای چێژەوەیە. مارفا پیترۆڤناش ئەوە مەراییکاری خاڵی لاوازی بوو. هەر بە ڕاسـتی گەر دڵم پێوە با دەمتوانی تا ئەو

کاتانەی کە زیندوو بوو ناچاری بکەم چی ماڵومولّک و سـامانی هەیە بە ناوی منییەوە بکا؛ خوایە! ئیتر وا خەریکە زیاد لە ڕادە دەخۆمەوە و چەنەبازی دەکەم! ئیسـتە لە بەردڵتان گران نەبێ، وەلێ نەرمەنەرمە خەریک بوو وەها کاریگەرییەکیشم دەخستە سەر دونیا خاتوون، بەس لەبەر گەمژەیی و شـپرزەیی خۆم بوو کە هەموو شـتێکم شـێواند. هەڵبەتە پێشـتر هەڵکەوتبوو کە دونیا خاتوون چەندان جار –بەتایبەت جارێکیان زۆر بە ڕوونی– ڕقی لە باری نیگای من ببێتەوە. باوەڕ دەکەن؟ بـا کورتی بکەمەوە، بڵێســـەیەک کەوتبووە نیگـامەوە کە دەیترسـاند و تا دەهاتیش سـووتێنەر و بێپەردەتر دەبوو؛ تا وای لێ هات ئیتر پەسـتی کرد. ناچمە ناو وردەکارییەکەیەوە، هەرچۆنێ بووە جیـا بووینەوە و هەر کەسـەو ڕێی خۆی گرتە بەر. دواتریش نەفامییەکی ترم لێ وەشـایەوە. کەوتمە گاڵتەپێکردنی و مەسـەلەی ڕێنماییکردن و ئامۆژگارییەکانیم بەرەو ڕێگەی ڕاسـت بردنە ژێر پرسـیارەوە؛ جا بە چەپەڵترین شـێوەیەکیش کە ڕێی تێ بچێ. جا پاراشـا هەمدیسـان هاتەوە نێو بەزمەکە و سـەد خۆزگە هەر ئەوە با! بەس بە کورتییەکەی فەرتەنەیەک نرایەوە! ڕۆدیۆن ڕامـانۆڤیچ، ئـاخ ئەگەر بۆ جارێکیش با دەتانبینی کە چاوەکانی خوشـکتان هەندێ جار چۆن بڵێسـە دەدەن! ئەم قسـەیە پەیوەندیی بە سـەرخۆشـیی من و ئەوەوە نییە کە یەک پەرداخی پڕ لە شـامپانیام هەڵقوڕاندووەتەوە؛ وا ڕاسـتییەکەی دەڵێم. بڕواتان هەبێ ئەو نیگایە دەهاتە خەونیشـم. لەو دواییانەدا ئیتر خشەخشی داوێنەکەشی بووبووە شتێکی بەرگەنەگیراو. هەر بە ڕاسـتی بڕوام بەوە کردبوو کە بۆی هەیە لە هەر سـاتێکدا بکەومە بەر هەڵمەتی بوورانەوە. بڕوام نەدەکرد بکەومە بـارێکی ئەوەندە شـێتانەوە. دەشـیا دەسـت هەڵگرم، وەلێ ئیدی کار لە کار ترازابوو و نەدەکرا. جا سۆسـەی بکەن کە چووم و چ هەڵەیەکم کرد! چ گەمژەییەک هەیە لە کەسـی شـێت نەوەشـێتەوە! هەرگیز لە کاتی شـێتیـدا هەنگـاو هەڵنەهێننەوە، ڕۆدیۆن ڕامـانۆڤیچ، هەرگیز!

لەبەرخۆمەوە بیرم کردەوە خۆ دونیا خاتوون دەستکورتە -ئاخ! من ببوورن، دەستکورت هەڵبژاردنێکی باش نەبوو... وەلێ خۆ مەبەستەکە دەگەیەنێ! - یانی بە ئاستەم سکی خۆت پێ تێر دەکرێ و بە جۆرێ لە جۆرەکان ئێوە و دایکیشی دەژێنێ. دەی بە نەفرەت بێ ئەم زمانە! خۆ دیسان ناوچاوتان بە یەکدا دایەوە! بە کورتییەکەی بڕیارم دا پێشنیاری دار و نەدارمی بۆ بکەم -هەر ئەو کاتیش سێ هەزار ڕۆبڵێک دەبوو- جا داوای لێ بکەم لەگەڵم هەڵبێ و بێینە ئێرە، پیتەربورگ. هەڵبەتە سوێندی عەشقی تاهەتایی و بەختەوەریشم بۆ دەخوارد و لەم جۆرە قسانە. بڕواتان هەبێ من ئەو کاتانە بە جۆرێ گڕم گرتبوو بۆ دونیا خاتوون کە ئەگەر بیگوتبا *مارفا خاتوون ژەهرخوارد بکەن یان سەری ببڕن تا زەماوەندتان لەگەڵ بکەم*، یەک و دووم لێ نەدەکرد و دەستبەجێ ئەنجامم دەدا! وەلێ لە کۆتاییدا ئەو کارەساتەی لێ کەوتەوە کە ئێوەش لێی بەئاگان. ئیدی خۆتان ببینن چۆن دەیری بووم، کاتێ بیستم مارفا پیترۆڤنا ئەو خوێڕییە کەڕووەی، هەمان لوژنە پارێزەرە بێنرخەی دۆزیوەتەوە و کەم تا زۆر خەریکە تاوی پەیوەندیی نێوان ئەو و دونیا خاتوون دەدا، خۆ هەر شێت بووم. کارەکەی ئەویش گەر بچییە بنجوبناوانی شتێکی وەک ئەم پێشنیارەی منە، وا نییە؟ وا لێتان دەپرسم وا نییە؟ هەر ئەوەیە دەی، ئەرێ؟ ئێ، ئێستە وا دەبینم هەموو هەست و هۆشتان لێرەیە... گەنجێکی سەرنجڕاکێشن ئێوە...

سڤیدریگایلۆڤ لە پەستیان مستێکی بە مێزەکەدا کوتی. بە تەواوی ڕەنگی سوور هەڵگەڕابوو. ڕاسکۆڵنیکۆف بە ڕوونی دەیبینی کە ئەو یەک یان لەوانەیە یەک و نیو پەرداخە شامپانیایەی کە سڤیدریگایلۆڤ بە شێنەیی و کەم تا زۆر نائاگایانە خواردبوویەوە، وا کاریگەرییە خراپەکەی خۆی دادەنێ و بڕیاری دا هەلەکە بقۆزێتەوە. هەڵسوکەوت و بەرکەوتنی سڤیدریگایلۆڤی زۆر گوماناوی دەهاتە بەرچاو.

– دەی، بەم قسانەی کە کردتانن، ئیتر سەد لە سەد بڕوام کرد پیلانێکتان بۆ خوشکم لەژێر سەردایە کە ئاوها هاتوونەتە پیتەربورگ.

ڕاسکۆڵنیکۆف بۆیە وا ڕاشکاوانە قسەکەیی کرد تا زیاتر سڤیدریگایلۆڤ تووڕە بکات.

– ئەی هاوار، بەسە ئەم قسە قۆڕانە!

وا دیار بوو سڤیدریگایلۆڤ دەیەوێ خۆی کۆ بکاتەوە.

– باشە نەمگوت ئەی...؟ جا خۆ ئێستە خوشکەکەی ئێوە چاوی بە سەروسەکوتی من هەر هەڵنایێ!

– بەڵێ، خۆم ئەوە دەزانم کە چاوی پێتاندا هەڵنایێ! بەس بابەتەکە ئەمە نییە.

– ئێستە ئێوە هەر بە ڕاستی دڵنیان کە چاویان بە ڕوومدا هەڵنایێ؟

سڤیدریگایلۆڤ چاوەکانیی لە کاسەدا سووڕاندن و بزەیەکی گاڵتەجاڕانەی کرد:

– ڕاست دەفەرموون، عاشقی چاو و برۆی من نین. وەلێ هەرگیز کەسی سێیەم ناتوانێ بە تەواوی و ڕێکوپێک بزانێ چی لەنێوان ژن و مێرد یان تەنانەت دوو خۆشەویستدا ڕابردووە. دایمەی خوا خاڵێکی داپۆشراو لە پەیوەندیدا هەیە کە وەک نهێنییەک لە چاوی دونیادا بەشاراوەیی دەمێنێتەوە و تەنیا ئەو دوو کەسە ئاگادارین. ئێستە ئێوە هەر بە ڕاستی دڵنیان کە دونیا خاتوون لە من جاڕز بووە؟

– بە لەبەرچاوگرتنی ئەو شتانەی کە لە کاتی گوتوبێژ و باسکردندا لە دەمی ئێوەوە دەرپەڕین، وا دێتە بەرچاو کە ئێستەش نەخشەگەلێکی گڵاو و شەیتانیتان بۆ دونیا هەیە و بەنیازن هەرچی زووتر جێبەجێیان بکەن.

– ئەوە چی دەڵێن، یانی وەها شتێ لە دەمی منەوە دەرپەڕیوە؟

سڤیدریگایلۆڤ بە پەشۆکانێکی ساویلکانەوە ئەمەی پرسی، وەلێ بە ڕووی خۆیدا نەهێنا کە ڕاسکۆلنیکۆڤ چۆن وەسفی پیلانەکانیی کردووە.

– دە فەرموون، وا ئێستەش هەر هەمان ئەو قسانەتان لە دەم دەردێن! مەبەستم ئەوەیە ترستان لە چی هەیە ئێوە؟ باشە چی قەوما ئێستە کە بەم جۆرە تۆقین؟

– من تۆقیم؟ من لە ئێوە ترسابم؟ ئەوە ئێوەن کە دەبێ لە من بترسن، هاوڕێ. باشە ئێستە ئەم هەڵێتوپەڵێتەمان لە چییە؟ قسەیەکی باشترمان نییە بیکەین؟... دەزانم، من تۆزێ سەرخۆشم. دیسان خەریکی قسەی نەشیاو بووم. ئەی نەفرەت لەم خواردنەوەیەش! هێی! ئاو بێنە بۆم!

سڤیدریگایلۆڤ پڕی بە بتڵە شامپانیاکەدا کرد و یەکسەر لە پەنجەرەکەوە فڕێی دایە دەرێ. فیلیپ ئاوی هێنا.

– ئای لەو قسە قۆڕانە!

سڤیدریگایلۆڤ خاولییەکی لە ئاوەکەدا خووساند و بە سەرییدا دا.

– من دەتوانم سووک و ئاسان بە وشەیەک وەڵامتان بدەمەوە و گومان و دوودڵییەکانتان بڕەوێنمەوە. بۆ نموونە ئێوە ئاگادار بوون کە من خەریکی ژنهێنانم؟

– پێتان گوتبووم.

– گوتبووم؟ بیرم نایێ. وەلێ ئەوکات سەد لە سەد نەبوو، چونکە هێشتا چاوم بە دەزگیرانەکەم نەکەوتبوو و تازە بەتەمابووم بیبینم. وەلێ ئێستە ئیتر دەزگیرانداری مەسەلەیەکی جددییە و قسەی

خۆشمانمان کرد. گەر ئێستە کارێکی پێویستم نەبا، دەمبردنە دیدەنیی، چونکە دەمەویێ لەبارەی خاڵێکەوە ڕاتان بزانم. ئاخ لەم دۆخە نەفرەتییە! سەیری ئەم کاتژمێرە سندانییەش، دە خولەکی ماوە تەنیا! وەلێ دەبێ بەسەرهاتی ئەمەشتان بۆ باس بکەم، چونکە زەماوەندەکەی من هەر بە ڕاستی بەسەرهاتێکی سەرنجڕاکێشی هەیە بۆ خۆی! بەرەو کوێ کەوتوونەتە ڕێ هەمدیسان؟ دووبارە دەتانەوێ بڕۆن؟

– نا، ئێستە ناڕۆم.

– یانی هەر وا دایدەکوتن؟ باشە دەی، دەتانبەمە دیدەنیی دەزگیرانەکەم، بەس ئێستە ناکرێ. چونکە ئێوە دەبێ زۆر زوو بڕۆن. ئێوە بە لای چەپدا دەڕۆن و منیش ڕاست. ئێوە ئەم ژنەتیوە، ڕێسلیخ، دەناسن، هەمان ئەو خاتوو ڕێسلیخەی کە من ژوورم لەلا بەکرێ گرت؟ ها؟ هۆشتان لە کوێیە؟ دەزانم بیرتان بۆ چی دەچێ. کاکە، ئەو ژنەی کە دەڵێن کچەکەی زستانێکیان خۆی لە ئاودا خنکاندووە. گوێتان لێمە؟ بە کورتییەکەی ئائەم ژنە هەموو شتێکی بۆ ڕێک خستم. سەرەتا هەستا و پێی گوتم، *بەم جۆرە وەڕەز دەبن و دواجار خۆ نابێ ناخۆش ڕاببوێرن.* من خۆ دەزانم، کابرایەکی ئێسکقورس و بێتاقەت و دڵمردووم. وا دەزانن دڵخۆشم؟ نا، زۆریش دڵمردووم. زیانم بۆ کەس نییە، هەر وا لە سووچێکدا مات دەکەم و سێ ڕۆژ بێ ئەوەی نقەم لێوە بێ لەوێ دادەنیشم. ئەو ڕێسلیخەش خوێڕییەکە بۆ خۆی، لە منی وەرگرن! دەزانم چی لەو مێشکەیدا دەگوزەرێ. لای وایە ئاخرییەکەی وەک ئەوەی لە خۆشیاندا هار بووبم، تاقەتم بەسەر دەچێ و دەست لە ژنەکەم هەڵدەگرم و بە ڕێی خۆمدا دەڕۆم. ئەوسا ئەویش دەچێتە سەروەختی ژنەکەم و دەیکا بەژێر کارەوە تا وەک دەڵێن نانی پێ پەیدا بکا. بە کورتییەکەی گوتی باوکی کچەکە فەرمانبەرێکی خانەنشینکراوە کە سێ ساڵە کەمئەندام بووە و

کەوتووەتە سـووچێک و لەسـەر کورسـییەکەی ناتوانێ جمە بکا. دایکیشـی هەیە کە خاتوونێکی ژیر و دانایە. جا کوڕێکیان هەیە کە لە شارستان خزمەت دەکا، وەلێ هیچ کەڵکیان ناگرێ! کچێکی دیکەشیان هەیە کە شـووی کردووە و سـەردانی ئەوان ناکا. دوو دانە منالی تریشـیان بە ملەوە بووە -برازا یان خوشـکەزایان- وەک ئەوەی خۆیان منالٚ و سـەرئێشـەیان کەم بێ! ئەم کچە بچووکەشـیان تازە لە قوتابخانە دەرهێناوە. نەیانهێشـتووە خوێندنەکەی تەواو ببێ، چونکە مانگێکی تر دەبێتە شـازدە سـالٚ و دەتوانن بە مێردی بدەن. بەلێ، ئەم کچەیان بۆ من دانابوو. چووینە مالٚیان. ئای لەو بەزمە گاڵتەجاڕانەیە! حیلکەحیلکی پێکەنین بوو. من خۆمم لە خزمەتیاندا ناساند: موڵکدارێکی ژنمردووی ناودار. هاوڕێ و ناسـیاوی بەکەڵکی زۆرم هەیە و پارەی پێویسـتیش. جا بە چی دەچێ؟ خۆ من پەنجا سـالٚمە و ئەو شـازدە سـالٚ. کێ بیری بەلای ئەم شـتانەوەیە؟ زۆر وەسـوەسـەکەرە هەلومەرجەکە، وا نییە؟ بە خوا وەسـوەسـەکەرە! هاها! بریا لەوێ بان و بتاندیبا چۆن مێشـکی دایک و و باوکیم دەشـتەوە؛ تەنانەت ئەوەی دەهێنا پارە بدەن و تەنیا لەو کاتەدا سـەروسیمای من ببینن! کچۆڵەکە هاتە ژوور، بەدەم کڕنۆش و خۆدانەواندن و ئەژنۆچەماندنەوە و ئەم شتانەوە! جا چیشی لە بەردا بوو. ناتوانن هەڵیبێنن! داوێنی کورت... بە کورتییەکەی لە یـارۆ خونچە نەپشـکواوەکـان! هەر وەک خۆری دەمەوئێوارانیش ڕۆشنایی پەخش دەکرد و سوور دەبووەوە؛ هەڵبەتە فێریان کردبوو. بە ڕاستی نازانم ئێوە ڕووخساری ئەو ژنەتان چۆن دێتە بەرچاو، وەلێ لە بەرچاوی مندا ئەو شـازدە سـالەیی و چاوە منالانە و شەرم و فرمێسکانە لە جوانی گرنگتر و بەرزتریشن، ئەوەش لە لایەک کە لە جوانکیلەییش بەری نییە و شـتێکی باشـە! ئەڵقەگەلی زەریفی ئەو قژە زێڕینە، لێوی پڕی گوڵەباخی و پێی ناسـک... دەی، پێک ناسـێنراین. پاشـانیش پێم گوتن بەبۆنەی هەندێ ئەرکی مالەوەوە پەلەمە و ڕۆژی دواتر، کە دەکاتە پێرێ، بە مۆڵەتی گەورەکان لێک

مارە کراین. ئێستە هەر کە گەیشتمە ئەوێ، لەسەر ئەژنۆم دایدەنیشێنم و دەیهێڵمەوە... ئەویش سوور هەڵدەگەڕێ و ڕووخساری دادەگیرسێ و منیش ماچبارانی دەکەم. هەڵبەتە ئەوە دایکەکەیە کە هەر وا لە بنگوێیدا دەخوێنێ ئەمە مێردەکەتە و ئیتر لەم جۆرە شتانە! سەرتان نەئێشێنم، هەتا دڵ حەز کا شتێکی خۆشە! هەر بە ڕاستی دەزگیرانداری لە خودی ژنومێردایەتییەکە خۆشترە. ئەسڵەن بە جۆرێ لە جۆرەکان دەکرێ بە *دەزگیراندار* بڵێی la nature la verite، هەمان مرۆڤی حەقیقەت و سرووشت![1] هاهاها! دووسێ جارێ قسەم لەگەڵ کردووە. بە هیچ شێوەیەک کچێکی گەمژەش نییە. هەندێ جار بە تەماشاکردنێکی نهێنیانە گڕم تێ بەردەدا! ڕووخساری گچکۆکەی شیرینی وەک هی *ماۆدنای ڕافائیلە*. دەزانن، ڕووخساری *مادۆنا* سیستین شتێکی زۆر نائاسایی تێدایە، کتومت وەک دەموچاوە خەمبارە سادەکان[2]. ئێوە سەرنجتان نەدابوو تا ئێستە؟ دەی، هەرچۆنێ بووە ئەم کچە بارگەلێکی لەو شێوەیەی تێدایە. بۆ بەیانیی مارەبڕینەکەمان کۆمەڵێ دیاریم بە نرخی هەزار و پێنجسەد ڕۆبڵ: سێتی ئەڵماس و مرواری و و قتوویێک ئارایشی زیوینی ئەمەندە گەورە کە هەموو شتێکی تێدایە، بۆ برد. جا بزانن چی بوو کە *مادۆنای* من تەنانەت ڕووخساریشی گەشایەوە. دوێنێ دامنیشاندە سەر ئەژنۆم و لام وایە زۆر سادە و سەرپێییش ئەمەم کرد، چونکە وەک چەوەندەر سوورسوور بووەوە و گریانیشی هاتێ، وەلێ نەیهێشت من فرمێسکەکانی ببینم. ئێمەیان بە تەنیا جێ هێشتبوو، ئەویش کتوپڕ خۆی لە ملم ئالاند... یەکەمین جاری بوو بە ئارەزووی

---

١. ئاماژەیە بە وەسفی *هاینریش هاینە* بۆ *ڕۆسۆ*: *پیاوی حەقیقەت و سرووشت*. «و. ف»

٢. دۆستۆیڤسکی ئەم بەرهەمە هونەرییە بە گەورەترین بلیمەتیی نێو مرۆڤایەتی دەزانی و بە گوتەی هاوسەری دووەمی، *ئانا گریگۆرییێونا*، لە پەژارەی قووڵی زەردەخەنەی مادۆنا دوابوو. «و. ف»

خۆی لەم کارانەی دەکرد... جا ئەو باسەکە گچکۆکە و ناسکانەی ئالاندنە ملم. منی ماچ کرد و سوێندی خوارد کە هاوسەرێکی ژیکەلانەی باش و وەفادار و گوێڕایەڵ بێ بۆم و بەختەوەرم بکا، هەموو ژیانی، سات بە ساتی، فیدای من دەکا. لەبەرانبەریشدا تەنیا و تەنیا ڕێزی لێم دەوێ، هیچی تری لێم ناوێ، هیچ، تەنیا ڕێز. خۆی ئەمەی گوت. ناتوانن نکۆڵی لەوە بکەن کە بیستنی وەها قسەیەک، جا لە خەڵوەتیشدا، لە دەمی فریشتەیەکی شازد ساڵەوە بە کراسی موسلین و ئەڵقەگەلی جوانی قژ و ئەو شەرمە کچانەیە و ڕوومەتی سوور و چاوی لێوڕێژ لە فرمێسکی تاسەوە، بێوێنەیە، وەسوەسەکەرە! توخوا وەسوەسەکەر نییە؟ نابێ چاوی لێ بپۆشی، ها؟ دەی... گوێ بدەنێ چی دەڵێم، بێگومان جارێ پێکەوە دەچینە دیدەنیی دەزگیرانەکەم... بەس ئێستە کاتی نییە!

– بابەتەکە ئەوەیە کە ئەم جیاوازییە نائاساییە و تۆقێنەرەی تەمەن ئێوەی وا خرۆشاندووە! جا هەر بە ڕاستی سوورن لەسەر ئەم جۆرە هاوسەرگیرییە؟

– بەڵێ سوورم! بۆچی نا؟ هەر کەسەو لە خەمی خۆیدایە و ئەو کەسەش کە باشتر خۆی دەخەڵەتێنێ، ئەوپەڕی چێژ لە ژیانی دەبا. هەهەهە! باشە ئێستە ئێوە بۆچی ئاوها پاکی و ئەخلاقتان کردووە بە چۆپیی دەستتان؟ دەی بەزەییەکیشتان بە منی تاوانباردا بێتەوە، ئەی باوکی پیرۆز! هەهەهە!

– بەس دواجار ئەوە ئێوە بوون کە دەستی یارمەتیتان بۆ مناڵەکانی کاترینا ئیڤانۆڤنا درێژ کرد. گەرچی... ئەوەش لە لایەک کە هۆکاری خۆتانتان هەبووە... ئێستە ئیتر لۆژیکی کارەکانتانم بۆ ڕوون بووەوە.

– من دایمە منالانم خۆش ویستوون و شەیدایانم!

سڤیدریگایلۆڤ ئەمەی گوت و پێکەنی.

– لێگەڕێن بەسەرهاتێکی ئێجگار سەرنجڕاکێشتان لەبارەی ئەم بابەتە و خۆشەویستیمەوە بۆ بگێڕمەوە، کە هێشتا هەر بەردەوامە! هەر کە هاتمە پیتەربوگ، سەردانی چەند پەناگەیەکی[1] جیاوازم کرد. جا سەردانی چی، دوای حەوت ساڵ بێئاگا چوومە سەروەختیان! لام وایە ئێوەش ئیتر لەوە تێگەیشتوون کە من ئەوەندەش تامەزرۆی بینینی دۆست و هاوڕێی دێرین و تازەکردنەوەی پەیوەندی نیم لەگەڵیان و ئەوەی ڕاستی بێ دەمەوێ تا پێم دەکرێ بێ ئەوان کارەکانی خۆم ڕاپەڕێنم. دەزانن، بە درێژایی ماوەی ژیانم لەگەڵ مارفا پیترۆڤنا لەو کاولبووەدا، بیر و خەیاڵی پەناگەکان و شوێنگەلێکی وا بووبووەوە خۆرەی گیانم و خراپ ئەشکەنجەی دەدام. مەگەر کەسێ زۆر فەحە بێ، ئەگینا گەر سەر بەو شوێنانەدا بکا دەتوانێ زۆر شت بەدەست بێنێ و چیی بوێ پێی دەگا. نەفرەت لە هەرهەموویان! خەڵکی بەدەم ڤۆدکاخواردنەوەوە دانیشتوون و گەنجە بروانامەدارەکانیش، کە هیچ ئیشێ نییە بیکەن، گەنجیی خۆیان بە خەیاڵگەلی ناواقعی و خەیاڵی سەیروسەمەرەوە بەفیڕۆ دەدەن و ئەم ئایدیا و تیۆریانە کەلەلایان کردوون! هەر خوا دەزانێ ئەم هەموو جوولەکەیە چۆن لەم شارەدا قووت بوونەتەوە! هەر واش خەریکی سەفتەکردنی پارەن و دەیئاخنن ژێر پشتییەکانیان! جا ئەوانی تریش، سەریان کردووەتە هەوەسبازی و خوێڕیگەری. هەر کە یەکەم خولەک هەنگاوم نایە پیتەربورگ، هەمان بۆگەنەکەی ساڵانی زووم بەر لووت کەوتەوە. ئێوارەیەکیان چوومە کۆڕی سەمایەکەوە. کونێکی تۆقێنەر و پیس بوو کە هەڵبەتە من دایمە پیسییەکەم بەلاوە چاکترە! بەهەرحاڵ سەمای کەنکەنیان[2] دەکرد؛ جا چ سەماکردنێکیش! خۆ لە سەردەمی ئێمەدا

---

١. پەناگە: لان؛ ساوێر؛ هرزین؛ شوێنی کۆبوونەوە؛ شوێنێک کە جاروبار برێک کەس، لەوێ وچان دەدەن و ڕادەبوێرن.

٢. کەنکەن: لەم ڕۆژانەدا ئەم وشەیە بۆ سەمایەکی تا ڕادەیەک سەختی نێو هۆڵە مۆسیقییەکان بەکار دێت. ئەم سەمایە لەلایەن گروپێک ژنەوە دەکرێت کە جلی

ئەم جۆرە ســــەمایانە نەبوون. بەڵێ، وا بزانم لەمەیاندا چاک پێش کەوتوون! لەوێ کتوپڕ چاوم بە کچۆڵەیەکی سـێزدە ساڵە و تەرپۆش کەوت کە لەگەڵ سەماکەرێکی تری زۆر شارەزادا ڕووبەڕوو سەمای دەکرد. دایکی لەوێ بوو، لەســەر کورســییەک دانیشــتبوو و پشــتی کردبووە دیوار. وەلێ ئیتر خۆتـان دەتوانن وێنـای بکەن کە چ جۆرە ســەمایەک بوو! کچۆڵەکە ســەرەتا تەریق بووەوە، پاشــان تا بناگوێ ســـوور هەڵگەڕا و دواجار لەبەر شــتێ زوێر بوو و دەســـتی کردە فینگەفینگ. ســەماکەرە هاوڕێکەی پێیەوە نووســا و بە دەوری خۆیدا سووڕاندییەوە و لە بەردەمیدا کەوتە خۆبادان. ئەوانەی چواردەوریش دەســـتیان کردە فیلەفیل. من عاشـــقی ئەم خەڵکەمانم، تەنانەت ئەم ســـەماکەرە کەنکەنبازەش! بە کورتییەکەی هەر پێکەنین و پێکەنین. هاواریان دەکرد، *هەقیەتی، ئیشــێکی چاکە! ئەوەی دەویســـت! خۆ باخچەی ســاوایان نییە ئێرە!* دەی، جا چ پەیوەندییەکی بە منەوە هەیە کە ئەوانە کارەکەیان ڕاســت بووە یان نا! تاکە ئیشــێ کە کردم ئەوە بوو شــوێنێکی باشــم بۆ خۆم هەڵبژارد و ڕێک چوومە لای دایکەکە دانیشــتم و دەســتم کردە چەنەبازی لە بناگوێیدا کە منیش غەوارەم و خەڵکی ئەم شــارە هیچ بنەچەیەکیان نییە و خراپ پەروەردە کراون و ناتوانن جیاوازی لەنێوان کەسی ماقووڵ و ناماقووڵدا بکەن و ڕێزێکی ڕێکوپێکی لێ بنێن. تێم گەیـانـد کە پـارەومـارەیەکی چـاکم هەیە و پێشنیاریشم کرد بە گالیسکەکەم بیانگەیەنمەوە ماڵێ. بە کورتییەکەی گەیاندمنەوە ماڵ و پێک ئاشـــنا بووین. تازە لە لادێوە هاتبوون و شوێنێکیشیان بۆ نیشتەجێبوون گرتبوو... جا سەد ڕەحمەت لە کەلاوە!

---

داوێندرێژ و ژێرپۆشــیان لەبەرە لەگەڵ گۆرەویی ڕەشــی درێژدا، ئەم شــێوازی جلپۆشــینەش بۆ ســاڵی ١٨٩٠ی میلادی دەگەڕێتەوە. تایبەتمەندییەکانی ســەمای کەنکەن بریتین لە بەرزکردنەوەی داوێن لەلایەن ســـەماکەرانەوە و ئەنجامدانی جووڵەی خێرا بە قاچەکان و هەروەها کردنی جووڵەی هەیەجانئامێز و خرۆشــێنەر. «و. ک»

دایکەکە گوتی خوا منی بۆ ناردوون. تێگەیشتم کە دەستکورتن و هاتوونەتە ئێرە تا لە فەرمانگەیەک شوێنێکدا لەسەر حسێبی دۆسییەیەکی یاسایی پارەیەکیان دەست بکەوێ. پێم گوتن کە درێغی لە خزمەت و پارە ناکەم. دەرکەوت بە هەڵە سەریان بە سالۆنی کەنکەندا کردووە، وایان زانیوە هەر بە ڕاستی شوێنی فێربوونی سەمایە! پێشنیارم کرد لە خوێندنی وانەی فەڕەنسی و خولی فێربوونی سەمای کچەکەیدا یارمەتییان بدەم. تامەزرۆ و دڵخۆش و وەک شانازییەک پێشنیارەکەیان پەسەند کردم و ئێستەش پەیوەندیمان شازە... جا گەر پێتان خۆش بوو، دەچینە دیداریان. بەس ئێستە کاتی نییە.

– بەسە ئیتر چی یادگاری و بەسەرهاتی پیس و چەپەڵتان هەیە بیستم! کەسێکی قێزەون و هەرزەن ئێوە!

– شیلەر! بەڵێ، ئێوە شیلەری ڕووسیی ئێمەن، (جا بە فەڕەنسی بۆی زیاد کرد) ئەی ئەم جارەیان فەزیلەت لە کوێ جێی دەبێتەوە؟[1] ئاخ کە هێنانە دەنگی ئێوە چەندە چێژبەخشە! خۆشە!

– بەڵێ دەی، هەر دەبێ وا بێ! لاتان وایە خۆم نازانم چەندە گاڵتەجاڕم بەم سەروسەکوت و دۆخەوە؟ هەر دەبێ ببمە مایەی پێکەنینتان!

ڕاسکۆلنیکۆف تووڕە و لەژێر لێوەوە وەڵامی دایەوە.

سڤیدریگایلۆڤ لە ناخی دڵەوە پێکەنی و دواجار فیلیپی بانگ کرد، حسێبەکەی دایێ و لە جێگەکەی هەستا.

– بەینی خۆمان بێ، خراپ گرتوومی! دەی، با بەس بێ چەنەدان! کاتێکی خۆش بوو!

---

١. گواستنەوەی کەم تا زۆر کتومتی گوتەی *والتەر* لەبارەی *مولیرەوە*. «و. ف»

– هەر دەبێ کاتێکی خۆش بووبێ!

ڕاسکۆلنیکۆف ئەمەی بە هاوارەوە گوت و هەستایەوە.

– قسەی تێدا نییە کە ئەوپەڕی خۆشی و چێژ بووە بۆ کەسێکی بێسەروبەر و هەرزەی وەک ئێوە، کە بەسەرهاتە چەپەڵ و شانازییە دزێوەکانی بەم جۆرە بگێڕێتەوە و هاوکات پیلانێکی پیسی تریشی لەژێر سەردا بێ، بەتایبەت لەم هەلومەرجە و لەبەرانبەر کەسێکی وەک مندا... هەر بە ڕاستی پیاو پەست دەبێ!

– ئێێێێ، گەر گەیشتوون بەوەی کە...

سڤیدریگایلۆڤ بە جۆرێک لە سەراسیمەییەوە لە ڕاسکۆلنیکۆف ورد دەبووەوە.

– ئەگەر قسەتان ئەوەیە کەواتە جەنابی پایەبەرزیشتان بەدبینێکی تەواون. یانی لانیکەم بۆ ئەوە پاڵنەرتان هەیە و چاکیش هەتانە! زۆر باش لە هەندێ شت تێدەگەن و... زۆر شتیشتان لێ دەوەشێتەوە. دەی، ئەوەش دەمەتەقێکەمان. لە ناخی دڵەوە بەداخم کە نەکرا دەمەتەقێیەکی زیاتر بکەین، بەس من وازتان لێ ناهێنم... تەنیا تۆزێ تاقەتتان هەبێ...

سڤیدریگایلۆڤ لە ڕێستۆرانتەکە چووە دەرێ و ڕاسکۆلنیکۆفیش بە دوایدا. سڤیدریگایلۆڤ بەو ڕادەیەش سەرخۆش نەبوو، خواردنەوەکە تەنیا چەند سات‌ێک کاریگەریی خستبووە سەری و ئێستە سات بە سات کاریگەریی کەمتر دەبووەوە. بیری بە شتێکی گرنگەوە قاڵ بوو و ناوچەوانی چرچی تێ کەوتبوو. پێدەچوو خرۆشاو و نارەحەت چاوەڕێی شتێک بێت. لەو چەند ساتەی کۆتاییدا، کتوپڕ شێوازی هەڵسوکەوتی لەگەڵ ڕاسکۆلنیکۆفدا گۆڕابوو و تا دەهات بێچاووڕووتر و گاڵتەجاڕانەتر لەگەڵی دەجووڵایەوە. ڕاسکۆلنیکۆف دەرکی بە یەک

به یەکی ئەم شـــتانە کردبوو و ئەویش بەگومان و بێســـرەوت بوو. ئێســـتە ئیدی خراپ لە ڕاســـکۆڵنیکۆف کەوتبووە گومان و بڕیاری دا بیخاتە ژێر چاودێرییەوە.

پێکەوە هەنگاویان نایە سەر پیادەڕێ.

– ئێوە بە لای ڕاســـتدا بڕۆن و منیش بە لای چەپدا، یان ئەگەر ویســـتتان پێچەوانەی دەکەینەوە! خواتان لەگەڵ، گەورەتان کردم، تا دیداری دوایی!

سڤیدریگایلۆڤ ئەمەی گوت و بە لای ڕاستدا و بەرەو سێننایا بای دایەوە.

## پێنج

ڕاسکۆڵنیکۆف بەدوای سڤیدریگایلۆڤدا کەوتە ڕێ.

سڤیدریگایلۆڤ سووڕایەوە و هاواری لێ هەستا:

– ئەمە یانی چی؟ بۆ نەمگوت کە...

– لەمەودوا ئیتر ناهێڵم یەک ساتیش لە بەرچاوم ون بن!

– چی بووە؟

هەردووکیان بێ جووڵە ڕاوەستابوون و واقووڕ تەماشای یەکدییان دەکرد، دەتگوت هەر یەکەیان خەریکە هێزی ئەوی دیکەیان هەڵدەسەنگێنێت.

ڕاسکۆڵنیکۆف پێیدا هەڵشاخا:

– بەو بەسەرهاتانەی کە بەدەم سەرخۆشییەوە گێڕاتاننەوە، ئیتر هیچ گومانێکم بۆ نەماوەتەوە کە هێشتا پیلانی پیستان بۆ خوشکەکەم هەیە و مکووڕانەتر لە هەر کاتێکیش بەدوای ئامانجەکەتانەوەن! ئاگادار کراومەتەوە کە خوشکەکەم ئەم بەیانییە نامەیەکی پێ گەیشتووە. بە درێژایی دیدارەکەی ئەمڕۆمان سەرەوتتان لێ بڕابوو... تەنانەت گەر توانیبێتتان لەم نێوەندەشدا ژنێ بۆ خۆتان بدۆزنەوە، هەر نابێتە بەڵگە؛ دەمەوێ خۆم ئەرخەیان ببم.

ڕاسکۆڵنیکۆف خۆیشی نەیدەتوانی ڕێکوپێک ڕایبگەیەنێت کە هەر بە ڕاستی چیی دەوێ و بەتەمایە لەبارەی چ بابەتێکەوە ئەرخەیان ببێت.

– چاک تووش بووین! کەواتە پۆلیس ئاگادار دەکەمەوە...

– فەرموون پۆلیس ئاگادار بکەنەوە!

•

هەمدیسان بۆ ماوەی خولەکێک ڕووبەڕوو بێ جووڵە ڕاوەستان. دواجار باری ڕووخساری سفیدریگایلۆف گۆڕا. ئێستە ئیدی کە دڵنیا بووبوو ڕاسکۆڵنیکۆف سڵ لە هەڕەشەکانی ناکاتەوە، بارێکی ئێجگار گەش و هاوڕێیانەی پەیدا کرد.

– باشە ئێوە چ جۆرە مرۆڤێکن! خۆ من دەسئەنقەست قسەی یارۆ مەسەلەکەتانم نەهێنایە ناوەوە، جا سەرەڕای ئەم کونجکۆڵییەش کە خەریکە هەناسەم لێ دەبڕێ! هەر بە ڕاستی لە خۆیدا مەسەلەیەکی سەیر و نائاساییە! دەمویست بیخەمە دیدارەکەی دواییمان، بەس هەر بە جددی ئێوە کارێ دەکەن مردووش بێتە دەنگ!... دەی، فەرموون با بڕۆین. تەنیا مۆڵەت بدەن پێشوەختە پێتان بڵێم کە سەرێکی کورت لە ماڵەوە دەدەم تا پارە هەڵگرم، پاشانیش دەرگەی ئەپارتمان کڵۆم دەدەم و بەرەو دوورگە گالیسکەیەک دەگرین. دەمەوێ عەسرەکەم لەوێ بەسەر بەرم. دەی، هێشتا حەز دەکەن شوێنم بکەن؟

– تەنیا تا ماڵەوە لەگەڵتان دێم. کارم بە ئێوە نییە، دەمەوێ بچمە دیدەنیی سۆنیا و داوای لێبووردنی لێ بکەم لەبارەی ئامادەنەبوون لە ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردندا.

– کەیفی خۆتانە، بەس سۆنیا خاتوون لە ماڵەوە نین. سێ منداڵەکەی هەڵگرتوون و بردوونی بۆ لای خانمێک. خانمێکی بەڕێز و پایەبەرزە و تەمەنیشی هەیە و لە ناسیاوە دێرینەکانی منە و لێرە و لەوێ چەند ناوەندێکی پەروەردەکردنی منالانی حەوت تا یازدە سالان بەڕێوە

دەبا. برێک پارەم بۆ خەرجیی هەتیوەکانی کاترینا ئیڤانۆڤنا لای ئەم خاتوونە بەساڵاچووە دانا و دڵیم بەدەست هێنا، جا وەک یارمەتی بۆ ڕێکخراوەکەشی برێکم پێ دا. چیرۆکی ژیانی سۆنیا خاتوونم مووبەموو بۆ باس کرد و هیچم لێ نەپەڕاند. کاریگەرییەکی خستە سەر کە ناتوانم بۆتانی وەسف بکەم! لەبەر ئەوەشە کە سۆنیا خاتوون ئەمڕۆ بانگهێشت کراوە بچێ بۆ هۆتێلێک کە خانمە بەساڵاچووەکەی ئێوە جارێ لەوێن.

– باشە، گرنگ نییە. هەرچۆنێ بووە تا ئەوێ دێم.

– کەیفی خۆتانە، بەس منی تیا نیم! باشە چ پەیوەندییەکی بە منەوە هەیە؟ فەرموون، ئەوە گەیشتین! هەر بە ڕاست لام وایە ئێوە بۆیە گومانتان لە من کردووە کە هەڵسوکەوتێکی فرە جوان و شیاوم نواند و هێشتا پەلپم پێ نەگرتوون و نەمداونەتە بەر پرسیار... خۆ لە مەبەستم تێدەگەن؟ هەر لەبەر ئەوەیە کە شتەکەتان زۆر سەیروسەمەرە هاتووەتە بەرچاو و ئاسایی نییە دۆخەکە! ئامادەم سوێند بخۆم کە ئەمەیە! دەی، ئێمە ئیتر تۆبەمان کرد لە جوانی و شیاوی!

– گوێهەڵخستن لەپشت دەرگەی ژووری خەڵکییەوە شتێکی وا نییە و تۆبەی ناوێ!

– ئەها، دە وا بڵێن دەی؟!

سڤیدریگایلۆڤ پێکەنی.

– ئەوەی ڕاستی بێ بەلامەوە سەیر دەبوو ئەگەر دوای ئەم هەمووو بەزمە بۆ ئەمەیان خۆتان لە گێلی بدابا! هاهاها! هەڵبەتە شتگەلێکم هەڵکڕاند لەبارەی کارەکانتان و ئەو تەڵەکانەوەی کە کردتانن و بۆ سۆنیا خاتوونتان باس دەکردن، وەلێ کتومت یانی چی

ئەم قسبـــانە؟ ڕەنگە من لە ســــەردەم جێ مابم و هەر لەبەر ئەم دواکەوتوویەش بێ کە لە هیچ تێناگەم! بۆ خـاتری خوا، کوڕە گیان، ڕوونی بکەنەوە مەســــەلە چییە، ئەم ئایدیا و بنەما تازانەم بۆ ڕوون بکەنەوە!

– هاشـوهووشـە! ڕێی تێناچێ هیچتان بیستبێ. دەتانەوێ دەستم ئاشکرا بکەن!

– مەبەســتم *ئەوەیان* نییە خۆ! جا لەوەش گەڕێن کە شــتوکەیەکم بیســـت ئەو ڕۆژە. نەخێر، قســـەی من لەســــەر بارودۆخی ئێوەیە و ئاهەلکێشانە نەبڕاوەکانتان! ئەو شیلەرەی ناختان تاوناتاوێ هەلدەچێ و دەردەکەوێ و ئەوسـا هەلدەسـتن و تەشـەر دەوەشـێنن کە لەپشت دەرگەوە گوێ هەلنەخەم! ئەگەر هەر بە ڕاســـتی وایە ئەوا بچنە لای پۆلیس و بلێن *بڕوانن بەڕێزان، نەهـامەتییەکی ســـەیر ڕووی تێ کردووەمە من، تیۆرییەکەم لە هەندێ شوێنەوە سەری نەگرتووە!* وەلێ ئەگەر بڕواتان وایە مرۆڤ نابێ گوێ هەلخا، بەس دەتوانن بە کەیفی خۆی پیرێژنەکان داپاچێ، ئەوا باشترە تەشریفتان بەرن بۆ ئەمریکا و زۆریش پەلەی لێ بکەن![1] ئەرێ، دەبێ دەســـــتوبردی لێ بکەن، ڕاکە پیاوی گەنج، ڕا کەن! لەوانەیە هێشــتا دەرفەتتان هەبێ و زۆر درەنگی نەکردبێ. لە ناخی دلەوە ڕاتان دەســـــپێرم! چییە، پارەومارەتان نییە؟ پارەی سەفەرەکەشتان لەسەر من.

– بە خەیالیش شتی وا ناکەم!

ڕاسکۆلنیکۆف بێزارانە پەڕییە نێو قسەکانی.

---

١. سەرباری ئاماژەکردن بە ڕۆمانی دەبێ چی بکەین؟ کە بەرهەمی چیرنیشفسکییە، ئاماژەیە بە پرسی کۆچکردنی ڕووسەکان بەرەو ئەمریکا لە دەیەی ١٨٦٠ و ١٨٧٠دا کە بە شێوەیەکی بەربلاو لە بلاوکراوەکانی ڕووسیادا دەخرایە بەر باس. «و. ف»

– تێدەگەم! وەلێ پێویسـت ناکا ئەوەندە خۆتان قەلس بکەن، گەر دڵتان پێوە نییە ئەوا هەر باسـیشـی ناکەین. چاک دەزانم گیرۆدەی چین. گیرۆدەی کۆمەڵێ پرسـیار و پرسـی ئاکاری، وایە؟ ئەرکی شـارسـتانی و ئینسـانی بۆ نموونە! تووڕ دەنە ئەم دوو شـتانە! ئێسـتە ئیتر ئەم شـتـانە چ کەڵکێکی ئێوە دەگرن؟ هـاهـاهـا! لەوانەیە بڵێن هەرچۆنێ بێ ئێوە هێشـتا مرۆڤن و شـارسـتانییەک. ئاخر گەر وا با نەدەچوون خۆتان لەم پیسـی و چەپەڵییەوە بگلێنن! مرۆڤ هەر نابێ تخوونی شتێ بکەوێ، کە دەرەقەتی نایێ. دەست بدە ئیشێ کە توانات بەسـەریدا دەشکێ! دەی، کەواتە گوللەیەک بنێن بە مێشکی خۆتانەوە، یان نەکا توانای ئەمەشتان نەبێ؟

– ئێوە دەڵێی دەسئەنقەست دەتانەوێ پەستم بکەن تا ناچار بم لە کۆڵتان ببمەوە و بڕۆم.

– ئەک سـلاوتـان لێ بێ کە ئەوەنـدە خۆشـن! دەی، ئەوەش پلیکانەکەی ئێمە.ماڵی خۆتانە، فەرموون، بەخێر هاتن! ئاسـوودە بن. گەیشـتینە ژووری سـۆنیا خاتوون. فەرموون: دەرگە داخراوە و لەوێ نین. بڕوا بە قسـەی من ناکەن؟ دەی لە کاپیرنائومۆف بپرسـن، چونکە سـۆنیا خاتوون کلیلەکە لای ئەو دادەنێ. ئەوەش خاتوو کاپیرنائومۆف خۆی. ها؟ چی؟ (کەڕن). چوونە دەرێ؟ کەی؟ بۆ کوێ چوون؟ دەی، خۆ خۆتان بیسـتتان. سـۆنیا خاتوون لێرە نییە و ڕەنگە تا شـەو نەگەڕێتەوە. دەی، فەرموون بچنە ژوورەکەی من. مەگەر ئەمڕۆ بەتەما نەبوون بێنە دیدەنیی من؟ ئەوە گەیشتین. خاتوو ڕێسلێخیش لێرە نییە. ئەمیش لەو ژنانەیە کە دایمە لە شـوێنێ دەسـتی گیراوە وەلێ لە منییەوە وەرگرن، ژنێکی بێوێنەیە... دەکرا زۆر بە کەڵکی ئێوە بێ؛ هەڵبەتە گەر جەنـابی پـایەبەرزتـان ژیرتر بـان و تۆزێ هەسـت و هۆشـتان کۆ بکردباوە. دەی، وەرن بە چاوی خۆتان ببینن! وا ئەم چەکە لەسـەدا پێنجییە لە دۆلابەکە دەردەهێنم، ئەوەتا، تەماشـا چەند

ســەفتەی ترم هەیە! بڕیارە ئەمە هەر ئەمڕۆ نەخت بکرێ. خۆ بینیتان؟ دەی، ئیتر لەمە زیاتر نابێ کات بەفیڕۆ بدەم. دۆلابەکە داخرا، دەرگەی ئەپارتمانەکەشــــم کلۆم کرد. هەمدیســــــان من و ئێوە و پلیکانەڕێ! گالیســـکە بگرین؟ من دەچم بۆ دوورگە. حەز دەکەن ئێوەش بگەیەنم؟ ئەوەش گـالیســـــکە، من بەمە دەڕۆم. نـاییێن؟ دەڵێی بێزارن، ڕەدی دەکەنەوە! وەرن کاکە گیان، خۆ شـــتێکی وا نییە، تەنیا ســـــوارییەکی ئاســــــاییە! وا بزانم بەتەمـایە بیکـاتە بـاران. کێشـــــە نییە، چەترەکە دەکەینەوە...

ســڤیدریگایلۆڤ بەدەم چەنەبازییەوە ســـەرکەوتە ناو گالیســـکەکە. ڕاسکۆلنیکۆفیش بەو ئەنجامە گەیشت کە بەدگومانییەکەی لانیکەم لەو ســـاتەدا نابەجێیە و بێ هیچ وەلامێک وەرســـوورِا و بەرەو ســـێننایا کەوتە ڕێ. هەر ئەوەنـدە بەس بوو ئـاوڕ بـداتەوە و تەنیـا جـارێـک ســـەیری دواوەی بکات تا ببینێت ســـڤیدریگایلۆڤ، کە هێشـــتا ســـەد هەنگاوێک دوور نەکەوتبووەوە، دابەزی، گالیســـــکەکەی بەڕێ کرد و خۆیشی لە پیادەڕێکەوە ڕۆیشت. بەلام ڕاسکۆلنیکۆف ئیدی لە سەری شـــــەقامەکەوە لای دابوو و ڕێی تێنەدەچوو هیچ ببینێت. شـــــەپۆلی بێزاری، ئەوی لە ســـڤیدریگایلۆڤ دەتاراند. خوێنەخوازانە هاواری کرد: *باشــــە چۆن تەنانەت بۆ ســــاتیکیش ئەوەم بە خەیاڵدا هات کە ئەم خوێرییە هەرزە و ژنبازە، ئەم پاتاڵە دەمپیسە، دەتوانی یارمەتیم بدا؟*

ئەو حوکمەی کە ڕاســـکۆلنیکۆف بەســــەر ســـڤیدریگایلۆڤیدا دا تا ڕادەیەک ســـــادەبینانە و بەهەڵپە بوو؛ نەدەکرا نکۆڵی لەوە بکەیت کە شـتێک لە دەروونی سـڤیدریگایلۆڤدا هەبوو وای دەکرد کەسـایەتییەکی شـــاز و تەنانەت تەلیســــماویشـــی هەبێت. وەلێ تا ئەو شـــوێنەی کە پەیوەنـدیی بە دونیـاوە هەبوو، ڕاســـکۆلنیکۆف دڵنیـا بوو کە ســـڤیدریگایلۆڤ وا بە ئاســـانی وازی لێ ناهێنێت، بەلام بیرکردنەوەی

بەردەوام لەم بابەتە و تاوتوێکردنی ئەم دڵەڕاوکێیانە لە زەینیدا، ماندووکەر و بەرگەنەگیراو بوو.

بەپێی خووی هەمیشەیی، هەر کە تەنیا مایەوە، دوای دە هەنگاو بیر و خەیاڵ بردییەوە. کە گەیشتە پردەکە، پاڵی بە سەکۆکەیەوە دا و چاوی بڕییە ئاوەکە. خوشکیشی شانبەشانی ئەو ڕاوەستابوو.

لە سەرەتای پردەکەدا تووشی یەکدی هاتبوون، وەلێ ڕاسکۆڵنیکۆف بێ ئەوەی ئەو ببینێت، بەلایدا ڕابردبوو. دونیا تا ئەو ساتە هەرگیز لە وەها بارودۆخێکدا ئەوی لە سەرشەقامدا نەدیتبوو و خراپ ترسا. وشک بوو. نەیدەزانی ئاخۆ براکەی بانگ بکات یان نا. کتوپڕ چاوی بە سفیدریگایلۆف کەوت کە پەلەپەل لە سێنتایاوە دەهات.

سفیدریگایلۆف بە جۆرێک لە جۆرەکان بە دزی و پارێزەوە دەهاتە پێش. کە گەیشتە پردەکە، نزیکتر نەکەوتەوە و هەر لەوێ لە قەراخ پیادەڕێکەدا ڕاوەستا؛ چیی لەدەست بهاتبا دەیکرد تەنیا بۆ ئەوەی ڕاسکۆڵنیکۆف چاوی بەو نەکەوێت. بەڵام زۆر زووتر چاوی بە دونیا کەوتبوو و بە ئاماژە بانگی دەکرد. دونیا وای لێک دەدایەوە کە وا خەریکە تکای لێ دەکات واز لە براکەی بهێنێت و سەرەتا بچێتە لای ئەو.

کچەش هەر وای کرد و بە دزییەوە بەلای براکەیدا تێپەڕی و چووە لای سفیدریگایلۆف.

– خێراکەن، دەبێ زوو لێرە بڕۆین!

سفیدریگایلۆف بە گوێی دونیایدا ورتاند.

– نامەوێ ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ سۆسەی دیدارەکەمان بکا. ئاگادار بن کە تا تۆزێ لەمەوبەریش پێکەوە لە مەیخانەیەکی ئەم دەوروبەرانەدا دانیشتبووین. لەوێ بەگیری هێنام و زۆر بە دژواری

توانیم خۆم لەدەستی ڕزگار بکەم. هەرچۆنێ بووە بەو نامەیەی زانیوە کە ئەمڕۆ من بۆ ئێوەم ناردووە و ئێستەش کەوتووەتە گومانەوە. بە دڵنیاییەوە ئێوە پێتان نەگوتووە، ئاخۆ دەبێ کێ بووبێ؟

دونیا پەڕییە نێو قسەکانییەوە.

– باشـــە دەی، لە پێچەکە تێپەڕیین... لێرە ئیتر براکەم نامانبینێ. منیش لەمە دوورتر شـــوێنتان ناکەوم. لێرە چیتان دەوێ بیڵێن. هەر قسەیەک بێ، دەکرێ لە سەرشەقامیشدا بیڵێن.

– یەکەم ئەمە بابەتێ نییە کە بکرێ لە سەرشەقامدا باسی بکەی! دووەمیش ئەوەیە کە دەبێ قسەی سۆنیا خاتوونیش ببیستن. جا سێیەمیشی هەیە! دەبێ بەڵگەیەکتان نیشان بدەم... دەی، گەر حەزیش ناکەن لەگەڵم مەیێن، وەلێ منیش لەم بارەدا بۆ پێدانی هەر جۆرە ڕوونکردنەوەیەک پاساوم هەیە و دەمودەست دەڕۆم. وەلێ تکا دەکەم بیرتان نەچێ کە نهێنییەکی زۆر دۆشـــداهێنەری هەیە براکەتان کە بە تەواوی لە بەردەستی مندایە!

دونیا خنەخنێکی کرد و نیگای پرسیارئامێزیی بڕییە سڤیدریگایلۆڤ.

سڤیدریگایلۆڤ بە هێمنی وریای کردەوە.

– لە چی دەترسـن ئێوە؟ شـار زۆر جیاوازە لە لادێ. تەنانەت لە لادێکەشماندا ئێوە زۆر خراپ هەڵسوکەوتتان لەگەڵ مندا دەکرد، خۆ من هیچ زیانێکم بە ئێوە نەگەیاندووە!

– پێشوەختە سۆنیاتان ئاگادار کردووەتەوە؟

– نا، هێشتا هیچم پێ نەگوتووە و دڵنیاش نیم کە ئێستە لە ماڵەوە بێ. وەلێ ئەگەری زۆرە لەوێ بێ. ئەمڕۆ ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنی زڕدایکی بوو و بە دووری دەزانم لە وەها ڕۆژێکدا بچێتە شـــوێنێ. جارێ لە ئێستەدا نامەوێ ئەم مەسەلەیە لەگەڵ هیچ کەسێکدا بخەمە

بەرباس و تەنانەت تا ڕادەیەکیش لەوە پەشـــیمانم کە بە ئێوەم گوت. کەمترین کەمتەرخەمی لەم جۆرە بابەتانەدا وەک ناپاکی وایە. لەوێیە مالّی من... ئەو بینایە. وا دەگەین. ئەوەش قاپچییەکەمانە، زۆر باش من دەناسیٚ. خۆ دەبینن، وا کڕنۆش دەبا. بینیی کە من لەگەلّ خاتوونێکدام و ئەوە نکۆلّیی لیٚ ناکریٚ کە ڕووخساری ئێوەشی چاک سپاردووەتە یـادگەی. ئەگەر لە من دەترســـن و گومـانتـان هەیە خۆ دەبیٚ ئەمە بێخەمتان بکا. ببوورن کە وا بەم جۆرە بێپەردە و هاکەزایی دەدوێم. نەکرا ئەپارتمانیٚ بگرم بۆ خۆم، لێرە تەنیا ژوورێکم هەیە. ژوورەکەی ســـۆنیا خاتوون دیواربەدیواری ژوورەکەی منە، هەڵبەتە ژوورەکەی ســـەر بە یەکەکەی تەنیشـــتە. هەموو ئەم نهۆمەشـــیان بە کریٚ داوە. ئێستە ئێوە بۆچی وەک منالّ دەترسن؟ من ئەوەندە تۆقێنەرم یانی؟

ســـڤیدریگایلۆڤ لێوەکانیی بە بزەیەکی شـــکۆمەندانە بزواندن، بەلاّم هەر بە ڕاســـتی لە بارودۆخێکدا نەبوو بیەوێت زەردەخەنە بکات و تاقەتیشـی نەبوو. دلّی خراپ دەترپا و بە دژواری هەناسـەی بۆ دەدرا. دەنگی هەلّبڕیبوو تا بەشـکووم هەیەجانەکەی بشـارێتەوە. وەلیٚ دونیا بە هەیەجانە نـامۆکەی ئەوی نەزانی، ئەوەنـدە هەیە لە تـانەکەی ئەو لەبارەی *ترســـنۆکبوون هەروەک منداڵ* و ئاماژەی گالّتەجاڕانەی بۆ *ترسناکبوونی خۆی* تووڕە بووبوو.

– من دەزانم کە ئێوە کەسـێکی حورمەتدار نین، لەگەلّ ئەوەشـدا بە هیچ شێوەیەک لێتان ناترسم. ئێوە پێش کەون!

شـێوازی قســەکردنی دونیا بە ڕووالّەت نیشـاندەری زالّبوون بوو بەسەر خۆیدا، وەلیٚ خراپ ڕەنگی پەڕیبوو.

سڤیدریگایلۆڤ لە بەردەرگەی ژوورەکەی سۆنیادا ڕاوەستا.

– مۆلّەت بدەن بزانم ســۆنیا خاتوون لەوێیە یان نا... نا، لەویٚ نییە. خوا بیبڕیٚ بەختی وا! ئەوەش لە بەدبەختییەکـانی ئێمەیە دەی! وەلیٚ

دەزانم کە هاکا دەرکەوت. ئەگەریش چووبێتە دەر، ویستوویەتی چاوی بە خاتوونێ بکەوێ بۆ قسەکردن لەسەر گرتنەخۆی مناڵە هەتیوەکانی زرِدایکی. دایکە مردووە... منیش دەسپێشخەریم کرد و وا خەریکی ڕاییکردنی کارەکانیانم. گەر سۆنیا خاتوون تا دە خولەکی تر دەرنەکەوت، دواتر خۆم دەیبێنم بۆ لاتان، تەنانەت گەر حەزیشتان لێ بوو هەر ئەمڕۆ. ئەوەش دوو ژوورەکەی من. ژوورەکەی تەنیشت هی خاوەنماڵەکەم، ئەم خاتوو ڕێسلیخەی خۆمانە. ئێستە تەماشای ئێرە بکەن تکایە، دەمەوێ ئەو بەڵگەیەتان نیشان بدەم کە باسم کرد. ئەم دەرگەیە لە ژووری خەوتنەکەی منەوە دەچێتەوە سەر دوو ژووری تر، کە بەتەمان بیاندەنە کرێ. ئەوەتانێ... دوو ژووری چۆڵ. دەبێ زیاتر سەرنج بدەن...

سڤیدریگایلۆف دوو ژووری مۆبیلەکراوی تا ڕادەیەک گەورەی لە بەردەستدا بوو. دونیا بێمتمانانە چاوی بە چواردەوریدا دەگێڕا، بەڵام هیچ شتێکی تایبەت لە قەنەفە و شێوازی ڕازاندنەوەی ژوورەکان یان شوێنەکانیان سەرنجیان ڕانەکێشا. هەڵبەتە ئەگەر ورد بباوە، یەک دوو خاڵی گرنگ سەرنجیان ڕادەکێشا، بۆ نموونە ژوورەکانی سڤیدریگایلۆف کتومت کەوتبوونە نێوان دوو ژووری خاڵییەوە و دەرگەکەشی ڕاستەوخۆ بە ڕووی ڕێڕەوەکەدا نەدەکرایەوە، بەڵکە دەبوو بە ژوورە کەم تا زۆر خاڵییەکانی خاوەنماڵدا ڕابووریت تا بتوانیت بچیتە ژوورەکەی ئەوەوە. سڤیدریگایلۆف قوفڵی دووەم دەرگەی ژووری خەوتنەکەیی کردەوە و ئەو دوو ژوورە چۆڵەی نیشان دا کە بۆ کرێ بوون. دونیا لە بەردەرگەکەدا ڕاوەستا، نەیدەزانی ئەو داوای لێ دەکات لە چی بڕوانێت. بەس سڤیدریگایلۆف یەکسەر کەوتە ڕوونکردنەوە:

– تەماشای ئەم ژوورەی دووەم بکەن، کە گەورەتریشە. ئەو دەرگەیە... ئەو دەرگەیان کلۆم کردووە. کورسییەکی لە پشتەوەیە،

یانی لەو دوو ژوورەدا تەنیا ئەم کورسییەمان هەیە. ئەم کورسییەم لە ژوورەکەی خۆمەوە هێناوە تا ئاسانتر بتوانم دانیشم و گوێ هەڵخەم! سۆنیا خاتوون لەپشت ئەم دەرگەیەوە، مێزەکەی خۆی داناوە. لەپشت ئەو مێزەوە لەگەڵ رۆدیۆن رامانۆڤیچ دانیشتبوون و قسەیان دەکرد. منیش دوو ئێوارە لەسەریەک لێرە دانیشتم و گوێم هەڵخست، هەر جارەو دوو کاتژمێر و، ئێ، هەڵبەتە شتگەلێکم دەست کەوت، بە رای ئێوە رێی تێناچێ؟

– دانیشتن و گوێتان هەڵخست؟

– بەڵێ، کتومت. ئێستە فەرموون بچینە ژوورەکەی من. خۆ ناتوانین لێرە دانیشین.

سڤیدریگایلۆڤ دونیای گەڕاندەوە بۆ ژووری دانیشتن، کورسییەکی هێنایە پێش و فەرمووی دانیشتنی لێ کرد. خۆیشی لەوبەری مێزەکەوە چەند هەنگاوێک دوورتر لە کچەکەوە دانیشت، وەلێ تا رادەیەک نیگای بریقەی هەمان ئەو ساتانەی تێدا بوو کە دونیای بێرادە ترساندبوو. دونیا هەڵدەلەرزی و جارێکی دی، بێ متمانە بەڵام بێ ئەوەی لەدەستی خۆیدا بێت، بە نارەحەتی چاوی بە چواردەوریدا خشاند. دیار بوو کە حەز ناکات بەم جۆرە جووڵانە دڵەڕاوکێکەی ئاشکرا بکات. بەڵام هەڵکەوتەی تایبەت و لەچاوشاراوەی ژوورەکەی سڤیدریگایلۆڤی تازە دەهاتە بەرچاو. دڵی پێوە بوو بپرسێ ئاخۆ خانمی خانەخوێ لە ماڵەوەیە یان نا، وەلێ لووتبەرزییەکەی مۆڵەتی پێ نەدەدا. سەرەڕای ئەوەش، لە دڵیدا دەردێکی گەورەتر هەبوو کە بە هیچ شێوەیەک بەو ترسە بەراورد نەدەکرا کە بۆ پارێزراویی خۆی هەیبوو. ئەو ئەشکەنجەیەی کە دەیکێشا ئیدی خەریک بوو لە سنووری بەرگەگرتنی ئەو دەردەچوو.

– ئەمە نامەکەی ئێوەیە.

دونیا نامەکەی خستە سەر مێز و سەری قسەی کردەوە.

– یانی ئەو شـتەی کە نووسـیوتانە ڕێی تێدەچێ؟ ئاماژە بە تاوانێ دەکەن کە گوایە براکەی من تووشی بووە. ئاماژەکەشتان زۆر ڕوونە و ناتوانن نکوڵیی لێ بکەن، کەواتە پاشـەکشـەی لێ مەکەن! هەروەها، باشتر وایە بزانن من پێشتریش ئەم باسە گاڵتەجاڕانەیەم بیستووە و باوەڕ بە یەک وشـەشـی ناکەم. وەها بەدوگومانییەک لە ڕۆدیا، زۆر قێزەون و گاڵتەجاڕانەیە. دەزانم مەسەلەکەش چییە و ئەوەی کە بۆچی و چۆن کەوتووەتە سـەر زاران. ڕێی تێناچێ بەڵگەیەکی تۆکمەتان هەبێ. بەڵێنتان دا قسـەکەتان بسـەلمێنن، دە فەرموون بیسـەلمێنن. مەبەسـتم ئەوەیە کە، قسـە بکەن! بەس وا ئاگادارتان دەکەمەوە، کە بڕواتان پێ ناکەم. نا؛ بڕوا ناکەم!

دونیا پەلەپەل و بە هەناسەبڕکێوە ئەم ڕستانەی بەدوای یەکدا ڕیز کردن و بۆ ساتێک سوورایی پەڕییە دەموچاوی.

– ئەگەر بڕوام پێ ناکەن، بۆچی خۆتان خسـتە بەر ئەو مەترسـییە و لەگەڵمدا هاتنە ئێرە؟ دەی بۆچی هاتن؟ قسە بکەن. دەی بیڵێن!

– گومان لەوەدا نییە کە ئێوە کچێکی بوێرن. هەر بە ڕاسـت، وام دەزانی داوا لەو بەڕێز ڕازومیخینەتـان دەکەن لەگەڵتـان بێ. وەلێ ئەوانتان لەگەڵ نین و تەنانەت لەم ناوەشـدا دەرناکەون! چاودێریم دەکردن. ئای لەو بوێرییە! دەرکەوت لە خەمی ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچدان و ناتانەوێ ئازار بچێژێ. ئێوە هەموو شتێکتان لە فریشتەکان دەچێ... لەبارەی برا بەڕێزەکەتانەوە، چیتان بۆ باس کەم ئاخر؟ خۆ خۆتان ئێستە بینیتان. بە ڕای ئێوە دۆخی چۆن بوو؟

– کەواتە ئەمەیە بنەمای ئەو قسـە و تۆمەتانە؟ هیچی ترتان لە بەردەستدا نییە؟

– نـا، وا نییە. بنەمـای کـارەکەی من قســـەکـانی خودی ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ بووە. دوو ئێوارە بەســەر یەکەوە بۆ دیدەنیی خاتوو سـۆنیا هاتە ئێرە. ئێستە نیشانم دان لە کوێ دادەنیشتن. براکەتان بە تەواوی لای ســـۆنیا خاتوون دانی بە هەموو شـــتێکدا نا. ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ بکوژە. هەســـتاوە و پیرێژنێکی کوشـــتووە. ژنە ســـووخۆر بووە و ئەویش چەند شـــتومەکێکی بە بارمتە لەلای بووە. لیزاڤێتای خوشـــکی پیرێژنەکەشی تەخت کردووە. وا دیارە خوشکەکەی دەستگێر بووە و لەو کاتەی کە ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ خەریکی کوشـــتنی پیرێژنەکە بووە، ئەو دەرکەوتووە. بە تەورێ کە پێی بووە، هەردووکیانی کوشـــتوون. ئەوان دەکوژێ تـا دزییـان لێ بکـا و هەر واش دەکـا. پـارە و هەندێ شتی بردوون... هەموو ئەمانە، وشە بە وشە، خۆی بۆ سۆنیا خاتوونی باس کردن. سـۆنیا خاتوون تاکە کەسـێکە کە نهێنییەکەی ئەو دەزانێ، وەلێ نە بە قسە و نە بە کردە دەستی لە تاوانەکەدا نەبووە. کە بیستی، ڕێـک وەک ئێســـتەی ئێوە تۆقی. خەمیشـــتـان نەبێ، ئەو براکەتـان نافرۆشێ.

– ڕێی تێناچێ...

دونیا بە لێوی ڕەنگپەڕیو و بێهەستەوە منگەمنگێکی کرد، هەناسەی بۆ نەدەدرا.

– ڕێی تێناچێ. ئاخر ناکرێ هیچ هۆکارێکی هەبووبێ کارەکەی... بۆچی... ئەمە هەمووی درۆیە، درۆ!

– بۆ دزی. پێویســـتیی بە پارەی پیرێژنەکە بووە. هۆکارەکەی ئەمە بووە. پارە و وردەواڵەکانی خیت کردوون ئیتر. هەڵبەتە ئەمە قســـەی خۆیەتی و ڕاستیشە کە پارە یان ئەو چەند شمەکەی خەرج نەکردوون و تەنیا چووە و لەژێر تلێکدا شـاردوونییەتەوە. ئێســـتەش هەر لەوێن. ئاخر ترساوە پارەکان خەرج بکا.

– ئاخر چۆن دەکرێ ڕۆدیا دزی بکا؟ ئەسڵەن چۆن ڕێی تێدەچێ بیری وەها کارێکی بکەوێتە سەر؟

دونیا لە جێگەکەی دەرپەڕی و هاواری دەکرد:

– ئێوە خۆتان دەیناسن، خۆ خۆتان ئەوتان دیوە! بە ڕای ئێوە ڕۆدیا لە دز دەچێ؟

دەتگوت خەریکە لە سفیدریگایلۆف دەپارێتەوە و بە تەواوی ترسەکەیی لە بیر کردبوو.

– لەم جۆرە بابەتانەدا هەزاران و ملیۆنەها پلەبەندی و ئەگەری ڕووداو هەن، دونیا خاتوون. دزی پیشەیی دزی دەکا و خۆشی دەزانێ کە مرۆڤێکی چەپەڵە، وەلێ من بەسەرهاتی نەجیبزادەیەکی زۆر بەڕێزم بیستووە کە بەسەر گالیسکەیەکی پۆستەوگەیاندندا دەدا! کێ چووزانێ ڕەنگە لەبەرخۆیەوە وای زانیبێ کارەکەی فرە ئاوڕوودارانە و ڕاست بووە! هەڵبەتە منیش گەر کەسێ بهاتبا و بۆی باس بکردبام، ڕێک وەک دۆخی ئێستەی ئێوە بڕوام پێ نەدەکرد، وەلێ خۆ بڕوام بە گوێی خۆم هەیە! ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ پاڵنەر و هۆکارەکانی خۆی بۆ سۆنیا خاتوون ڕوون کردنەوە، کەچی ئەویش سەرەتا نەیتوانی بڕوا بە گوێی و ئەو شتە بکا کە بیستوویەتی، گەرچی دواجار بڕوای بە گوێی کرد، چونکە ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ بە بەرچاوییەوە ڕاوەستابوو و بە ئاشکرایی دانی پێدا دەنا.

– چ پاڵنەرێ... کامە پاڵنەر ئاخر؟

– چیرۆکەکە دوورودرێژە، دونیا خاتوون. لێرە... چۆن بڵێم... لەم نێوەندەدا سەروکاریمان لەگەڵ ئایدیایەکدا هەیە کە منی شاز ئەگەر ئامانجەکەم بەرز بێ، ئەوا مۆڵەتم پێ دەدا بڕیار لەسەر ئەوە بدەم کە فڵانە کردەوە ڕێپێدراوە یان نا. کردەوەیەکی ناڕاستی بچووک و لەبەرانبەردا هەزاران هەزار چاکە بەدوایدا! ئەوەش لە لایەک کە وەها

گەنجێکی لێوەشـــاوە بەو خۆپەرســـتییە نەبڕاوەیەیەوە ســـرەوتی لێ دەبڕێ ئەگەر بزانێ بە ســـێ هەزار ڕۆبڵی بێبایەخ، دەکرێ پیشـــە و ژیان و داهاتووی بە تەواوی بگۆڕێ، بەس جەخار کە ئەو سێ هەزار ڕۆبڵەی نییە. خۆتان باری تووڕەیی و هەڵچوونی ســـەرچاوەگرتووی لە برســـییەتی و ژیان لەو کونەمشـــکە و ســـیپاڵەکەی بەرییەوە بۆ مەســـەلەکە زیـاد بکەن و هەروەهـا ئـاگـایی قووڵ لەبـارەی دۆخی کۆمەڵایەتیی درەوشاوە و جوانی خۆی و دایکی و خوشکەکەشی. جیا لە هەمـوو ئەمـانە، لووتبەرزی و خـۆپەســـەنـدی و ئەو هەمـوو خۆبەشتزانینە! گەرچی خواش دەزانێ، ڕەنگە هاوکات تایبەتمەندیگەلی ئەرێنیشـــی هەبێ... بەس وا مەزانن دەمەوێ بە تـاوانبـار لە قەڵەمی بدەم. تکایە وەها بیرێک مەکەنەوە؛ ئەسـڵەن چ پەیوەندییەکی بە منەوە هەیە؟ ئەو ئێوارەیە بـاس هـاتە ســـەر ئـایـدیـایەکی زۆر تـایبەت و بچکۆلەومچکۆلەی تریش. شـــتێکی وەک ئایدیا بوو دواجار، کە دەبێ مرۆڤەکان بەســـەر دوو دەســـتەدا پۆلێن بکەین، ئاســـایی و ڕیزپەڕ. ڕیزپەڕەکان لە ســـەرووی یاســـاوەن، چونکە گوایە بەرزترن و جا یاساش دیاری دەکەن بۆ خەڵکانی تر، خەڵکانێ کە تەنیا مێگەلن... یانی شـــەخەڵ. دەی، ئەم ئایدیایەش وەک تیۆرییە بچکۆلەومچکۆلەکانی تر. خۆ نـاپلیۆن بە تەواوی براکەی ئێوەی حەیران کردووە! یـانی زۆر کەوتووەتە ژێر کاریگەریی ئەم قســـەیەوە کە وەک دەڵێن زۆرێک لە بلیمەت و کەڵەپیاوانی مێژوو لە کاتی کارگەلی شـــەیتانیدا نەک هەر بە تەنیا دەست و دڵیان نەلەرزیوە، بەڵکە بە چاوی نووقاوەوە بەسـەریدا ڕابردوون و بەبێ هیچ بیرکردنەوە و دوودڵییەک ئاســت و ســنووری یاســایان بەزاندووە. وا دیارە بڕوای بەوە کردووە کە خۆشـی یەکێکە لەو بلیمەتـانە، لانیکەم تـا مـاوەیەک ئەمە بۆچوونی بووە. زۆر ئەشـکەنجەی بەدەسـت ئەم بابەتەوە کێشـاوە و هێشـتا هەر وا ئازار دەچێژێ، لەبەر ئەوەی بە جۆرێ لە جۆرەکان توانیویەتی لە زەینیدا گەشە بە ئایدیایەک بدا، بەس نەیتوانیوە بوێرانە یاسا پاشێل بکا و ئەو

دواهەمین هەنگاوەش بنێ، کەواتە بەو ئەنجامە گەیشتووە کە بلیمەت نییە. چی لەمە سووکایەتیئامێزترە بۆ گەنجێکی لووتبەرز کە زۆر خۆی بە بلیمەت و شت دەزانێ؟ جا ئەمەش لە ڕۆژگاری ئێمەدا...

– ئەی ویژدانی چیی بەسەر دێ؟ خەفەت، پەشیمانی، شتێ؟ یانی دەڵێن ئاکاری تێدا مردووە؟ هەر بە ڕاستی بووەتە وەها مرۆڤێ ڕۆدیا؟

– ئەی هاوار، دونیا خاتوون، خۆ لەم ڕۆژگارەدا ئیتر هیچ شتێ لە جێی خۆیدا نییە و هەمووی تێکەڵوپێکەڵە. هەڵبەتە مرۆڤ کە بیری لێ دەکاتەوە، دەبینێ تا ئێستەش هەموو شتێکمان ئەوەندە ڕێکوپێک نەبووە! ڕووسییەکان بە گشتی ڕۆحێکی گەورەیان هەیە، ڕێک وەک سەرزەمینەکەیان. هەر لە بنەڕەتیشەوە حەزیان بەلای خەیاڵات و هەموو شپرزەیی و گێچەڵەکاندا دەچێ! وەلێ، ئەوەی کە فکرت بەرفراوان بێ، بەس توانا و لێهاتووییەکی ئەوتۆت نەبێ، ئیتر دەبێتە چارەڕەشی. خۆ بیرتانە عەسران و لەدوای فراوێن، لە باخەکەدا چ گوتوبوێژێکمان لەبارەی ئەم باباتەوە دەکرد، کە لە هەیواندا دادەنیشتین، خۆ بیرتانە؟ ئێوەش کتومت هەر بەو بەرفراوانییەوە بیرکردنەوەی منتان سەرکۆنە دەکرد! کێ چووزانێ، ڕەنگە هەر لە هەمان ئەو کاتەی کە ئێمە خەریکی قسەکردن بووین، ئەویش لێرە دانیشتبێ و خەریکی داڕشتنی گەڵاڵەی نەخشەکەی بووبێ. دونیا خاتوون، چینی خوێندەواری ئێمە هیچ نەریت و باوەڕێکی بۆماوەیی پیرۆزیان نییە[1]. باشترین باری ئەوەیە کە یەکێ لە چینی خوێندەوار، بچێ و هەندێ شت لەنێو کتێبەکان و فڵانە بەسەرهاتی دێریندا

---

١. ڕەنگدانەوەی هزرەکانی *پیۆتەر چائادایێف*، فەیلەسووف و نووسەری ڕووسی، لە یەکەمین نامەی فەلسەفییدا (١٨٣٦). چائادایێف لەبەر ئەوەی لەم نامەیەدا سەلماندبووی کە نەتەوەی ڕووس هەستێکی مێژوویی لەبارەی ڕابردووی خۆیەوە نییە، بە شێت لە قەڵەم درا. «و. ف»

دەربێنێ. وەلێ تەنیا وەک دەڵێن پیاوخاسـان بەدوای ئەم شـتانەوەن. جا ئەوانیش ئەقڵیان تۆزی لێ نیشـتووە و بە جۆرێ لە جۆرەکان کۆنەپەرسـتن! مرۆڤێکی ئەمڕۆیی کۆمەڵایەتی لەڕووی نایێ لەم جۆرە کارانە بکا! خۆ ئێوە دەزانن بیروبڕوای من چۆنە. من هەرگیز پەنجەی تۆمەت بەرەو کەس درێژ ناکەم، دەسـتی خۆشـم ئالوودە ناکەم؛ زۆریش بڕوام بەمە هەیە. وەلێ لەبارەی ئەمانەوە پێشـتر و چەندان جار قسـەمان کردووە. ئای ئەوکاتیش چەندە بەوە دڵخۆش بووم کە توانیبووم سـەرنجی ئێوە بەلای بیروبڕواکانمدا ڕاکێشـم!... ئێوە زۆر ڕەنگتان پەڕیوە، دونیا خاتوون!

– من دەزانم مەسـەلەی ئەم ئـایـدیـایەی چییە! گوتـارەکەیم خوێندووەتەوە لەبارەی ئەو دەسـتە خەڵکەوەی کە بۆ کردنی هەر جۆرە کارێ ڕێپێدراون. ڕازومیخین ئەو گوتارەی بۆ هێنام.

– بەخ‌بەخ، بەڕێز ڕازومـیـخـیـنی خـۆمـان؟ ئەوان گـوتـارەکەی براکەتانیان بۆ هێنان؟ لە گۆڤاردا چاپ بووە یانی؟ یانی هەر بە ڕاستی وەها گوڤارێ هەیە؟ نەمدەزانی. دەبێ شتێکی سەرنجڕاکێش بێ. بەس ئێستە بۆ کوێ دەچن لەسەر خێر، دونیا خاتوون؟

– دەمەوێ چاوم بە سۆنیا بکەوێ.

دونیا بە کزی وشەکانی دەردەبڕین.

– لە کوێ بیدۆزمەوە؟ لەوانەشـە گەڕابێتەوە. دەبێ هەر ئێسـتە قسەی لەگەڵ بکەم. لەوانەیە ئەو...

دونیا نەیتوانی ڕسـتەکەی تەواو بکات؛ هەر بە ڕاسـتی هەناسـەی یاریدەی نەدەدا.

– سـۆنیا خاتوون تا شـەو ناگەڕێتەوە، لانیکەم من لام وایە زووتر ناگەڕێتەوە. یان دەبوو ڕاسـتەوڕاسـت و دەمودەست بگەڕاباوە ماڵێ،

یان ئێستە کە نەگەڕاوەتەوە، چووە بۆ شوێنێ و ئیتر دەبێ تا نیوەشەو چاوەڕێی بێ.

– ئەها! کەواتە هەمدیسان خەریکی درۆکردنن! وا ئێستە تێدەگەم... درۆتان کرد... هەر لە سەرەتاوە خەریکی درۆکردن بوون... ئیتر بڕوا بە قسەتان ناکەم. نا، بڕوا ناکەم!

دونیا بە گشتی کۆنترۆڵی خۆی لەدەست دابوو و هاواری دەکرد.

پاشانیش کەم تا زۆر بێهۆش بەسەر ئەو کورسییەدا کەوت کە سڤیدریگایلۆف دەستەپاچانە بۆی هێنابووە پێش.

– دونیا خاتوون، چی بوو؟ چیتان بەسەر هات کتوپڕ؟ خۆتان کۆ بکەنەوە! ها ئەوە ئاو. تۆزێ بخۆنەوە ئاخر...

سڤیدریگایلۆف چەند دڵۆپەئاوێکی بە سەر و ڕوویدا پرژاند. کچە توند ڕاچەنی و هاتەوە سەر خۆی.

*ئێ، هاتەوە سەر خۆی! ئای لەو ڕاچەنینە!* سڤیدریگایلۆف لەبەرخۆوە ئەمەی گوت و پاشان خۆی تێک دا:

– دونیا خاتوون، هێور بن و خۆتان کۆنترۆڵ بکەن! بڕواتان هەبێ براکەتان بێپشتوپەنا نییە. ڕزگاری دەکەین. حەز دەکەن بینێرینە دەرەوە؟ خۆ پارەم هەیە، دەتوانم بە سێ ڕۆژێکیش پێداویستیی سەفەرەکەی دەستەبەر بکەم. لەبارەی ئەو تاوانەشەوە کێشەیەک نییە! خۆ جارێ دەرفەت هەیە کاری چاک بکا و تاوانەکەی قەرەبوو بکاتەوە! ئێوە خۆتان بێتاقەت مەکەن. هێشتا دەرفەتی هەیە ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ تا ببێتە کەسێکی گەورە. ئێ چی بوو... ئێستە چۆنن؟ باشتر بوون؟

– ئێوە مرۆڤێکی چەندە دڵڕەق و بێبەزەیین! چۆن دەتوانن لەم هەلومەرجەدا گاڵتە بە من بکەن؟ ئا وازم لێ بێنن، دەمەوێ بڕۆم...

– دەتانەوێ بۆ کوێ بچن؟

– دەچمە لای ڕۆدیا. لە کوێیە ئێستە؟ ئێوە ئاگادارن؟ ئەی ئەم دەرگەیە بۆ کلۆم دراوە، ها؟ خۆ ئێمە هەر لەم دەرگەیەوە هاتینە ژوور، ئێستە بۆچی کلۆم دراوە؟ باشە چۆن پەرژانە سەر کلۆمکردنی؟

– خۆ نەدەکرا لێگەڕێم هەموو بیناکە ببیستن ئێمە وا باسی وەها بابەتێ دەکەین! جا، من کەی گاڵتەم بە ئێوە کردووە؟ بە هیچ شێوەیەک وا نییە. هەر ئەوەندە هەیە ماندووم لەم شێوازە قسەکردنە. بەس ئێوە بەم دۆخەوە بەتەمای کوێن ئاخر؟ دەتانەوێ بەم کارانەتان ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ پێوە بکەن ئاخرییەکەی؟ لە تووڕەییان شێتی دەکەن و ئەویش دەچێ و خۆی بەدەستەوە دەدا! لێگەڕێن با ئەمەش لە خزمەتتاندا ڕابگەیەنم کە ماوەیەکە خستوویانەتە ژێر چاودێری و بەدوایەوەن. بەم کارەتان دەستەنقەست چارەڕەشی دەکەن. تۆزێ دان بە خۆتاندا بگرن! من ئێستە بینیم و قسەم لەگەڵ کرد. هێشتا هیوایەک هەیە بۆ ڕزگارکردنی. ئێوە تۆزێ پشوودرێژتر بن... فەرموون دانیشن. با ئەقڵمان بنێینە پاڵ یەک. بۆیە داوام لێ کردن بێن تا پێکەوە بابەتەکە بخەینە بەر باس و شەنوکەوی بکەین. ئێوە تەنیا دانیشن، بە گوێم بکەن دەی!

– ئێوە چۆن دەتوانن ڕزگاری بکەن؟ ئەسڵەن ڕێی دەرچوونی بۆ ماوەتەوە؟

دونیا دواجار دانیشت و سڤیدریگایلۆڤیش کورسییەکەی تەنیشت ئەوی گرت.

– هەمووی لەسەر ئێوە وەستاوە، لەسەر ئێوە! تەنیا و تەنیا لەسەر خودی ئێوە!

چاوەکانی سڤیدریگایلۆڤ خرۆشاوانە بلێسەیان دەدا. تەنیا توانیی لەژێر لێوەوە ئەمانە بڵێت، هەم تەتەڵەی دەکرد و هەم لەتاو هەیەجان و هەڵچوونی هەستدا هەندێک لە وشەکانی دەخواردنەوە.

دونیا تۆقیوانە خۆی لەو کشاندەوە. سڤیدریگایلۆڤیش ئێستە ئیدی سەرتاپێی هەڵدەلەرزی.

– ئێوە... ئەوەندە بەسە کە ئێوە... یەک وشە بڵێن و براکەتان ڕزگاری ببێ. من... خۆم ڕزگاری دەکەم. پارەم هەیە، هاوڕێ و ناسیاوم هەیە! دەمودەست دەینێرمە دەرێ. پاسەپۆرتی بۆ دەردەهێنم، یانی دوو پاسەپۆرت دەردەهێنم، دانەیەک بۆ ئەو و دانەیەکیش بۆ خۆم. ناسیاوگەلێکی باشم هەن... کەسانێ کە پشتیان پێ دەبەسترێ... گەر حەزتان کرد، پاسەپۆرت بۆ ئێوەش دەردەهێنم... دەکرێ بۆ دایکیشتانی دەربهێنم... ئەو ڕازومیخینەتان بۆچییە؟ خۆ منیش عاشقتانم... ئێوەم زیاتر لە هەر کەس و شتێ دەوێ... با داوێنی کراسەکەتان ماچ کەم... مۆڵەت بدەن، ئاخ، مۆڵەت بدەن... ئەم دەنگی خشەخشەشم سەروزیادە، بەرگەی ناگرم. تەنیا بە یەک وشە بڵێن بیکە و هەمووشتێ جێبەجێ دەبێ. ئامادەم هەموو شتێ بکەم. هەموو نەکردەیەکتان بۆ دەکەمە کردە. هەر شتێ ئێوە بڕواتان پێی هەبێ، منیش بڕوام پێی دەبێ. ئامادەم هەر کارێ بکەم، هەر کارێ! مەکەن! بەم جۆرە سەیرم مەکەن! خۆتان دەزانن کە خەریکە گیانم دەکێشن؟...

سڤیدریگایلۆڤ بەرەبەرە خەریک بوو دەکەوتە باری وڕێنەکردنەوە... وەک ئەوەی کتوپڕ تێک چووبێ. دونیا لە جێگەکەی ڕاست بووەوە و فڕکەی کردە لای دەرگەکە.

– بیکەنەوە! ئادەی خێرا ئەو دەرگەیەم بۆ بکەنەوە!

هاواری دەکرد و پاڵی بە دەرگەکەوە دەنا و لە کەسانێک دەپاڕایەوە کە لای وا بوو دەشێت لەپشت دەرگەکەوە بن.

– هێێێێی، بیکەنەوە! کەسی لێیە؟

سڤیدریگایلۆڤ هەستایەوە و هاتەوە سەرخۆی. بەرەبەرە بزەیەکی گاڵتەجاڕانە و پڕ لە ڕق نیشتە سەر لێوە لەرزۆکەکانی.

– کەس لەماڵەوە نییە!

هێمن و بە جەختلەسەرکردنەوەیەکی زۆرەوە دەدوا.

– خاوەنماڵ چووەتە دەرێ. ئێوەش بەم قاووقیژە تەنیا کاتی خۆتان بەفیڕۆ دەدەن و بە خورتوخۆڕایی خۆتان تێک داوە.

– کوا ئەو کلیلە نەفرەتییە؟ هەر ئێســـتە دەرگەکە بکەنەوە... گوتم هەر ئێستە بیکەنەوە، بوودەڵەی چەپەڵی بێشەرەف!

– ئەی هــاوار، دەڵێی کلیەکەم ون کردووە؛ ئەو دوابڕاوەم بۆ نادۆزرێتەوە!

– ئەها! کەواتە دەتانەوێ ئازارم بدەن!

دونیا قیژاندی و ڕەنگی وەک هی مردوو ســـپی هەڵگەڕا. ڕایکردە دوورترین لای ژوورەکە و بە پەلەپرووزێ مێزێکی بچووکی کردە سەنگەر کە لە نزیکییەوە بوو. نەیدەقیژاند، بەڵام چاوی بڕیبووە چاوی جەلادەکەی و بە وردی چاودێریی جووڵەکانیی دەکرد.

ســـڤیـدریگـایلۆڤ، هەر لەوێ و لە لایەکی دیکەی ژوورەکەوە، لەبەرانبەر ئەودا ڕاوەستابوو. لانیکەم بە ڕووواڵەتیدا وا دەردەکەوت کە تەواو بەســـەر خۆیدا زاڵە، وەلێ ڕووخســـاری هێشـــتا وەک پێشـــتر ڕەنگپەڕیو بوو. ئەو بزە گاڵتەجاڕانەیەش هێشـــتا هەر وا بەســـــەر لێویەوە سەمای دەکرد.

– گوتتان دەتانەوێ ئازارم بدەن، دونیا خاتوون. باشـــە، گەر واش بێ، دڵنیا بن کە لە هەموو لایەنێکەوە بیرم لێ کردووەتەوە. ســـۆنیا خاتوون لە ماڵەوە نییە. کاپێرنائومۆفەکان ژووریان زۆر لە ژوورەکەی منەوە دوورە و پێنج دانە ژووری دەرگەداخراو لەنێوانماندا هەن! خۆ منیش لانیکەم دووهێندەی ئێوە بەهێزم و لەگەڵ ئەوەشدا دەسپارێزی ناکەم، چونکە ئێوە خۆ دواتر ناچن شـــکات بکەن! هەر بە ڕاســـت خۆ

ناتانەوێ ناپاکی لە براکەتان بکەن؟ هیچ کەسێکیش بڕوا بە قسەتان ناکا هەڵبەتە! باشە چۆن دەکرێ کچێ هەر وا مل بنێ و بە تەنیایی بێتە دیداری پیاوێکی تەنیا، لە دەرەوەش نا، کتومت لە ماڵی پیاوەکەدا! کەواتە گەر لەپێناو خۆشتاندا براکەتان پێوە بکەن، هەر ناتوانن هیچ بسەلمێنن. دەستدرێژیکردن هەر وا بە ئاسانی ناسەلمێنرێ، دونیا خاتوون.

– نارەسەنی چەپەڵ!

دونیا بە قینێکی زۆرەوە ئەمەی لەژێر لێوەوە گوت.

– هەڵبەتە کەیفی خۆتانە، وەلێ سەرنجتان لەسەر ئەوە بێ کە هەرچیم گوت هەموو گریمانە بوو. باوەڕی تایبەتیی من ئەوەیە کە ئێوە سەد لە سەد ڕاست دەفەرموون، دەستدرێژی و توندوتیژی، تا بڵێی چەپەڵانەیە. بۆیە ئەمانەم پێ گوتن تا تێتان بگەیەنم کە بە هیچ شێوەیەک پێویست ناکا خۆتان سەرکۆنە بکەن یان داخ بخۆن ئەگەر... ئەگەر ویستتان بە ڕەزامەندیی خۆتان براکەتان ڕزگار بکەن؛ پێشنیاری منیش ئەوەیە کە هەر ئەم ڕێیە هەڵبژێرن. کەواتە مانای وایە تەنیا و تەنیا هاتوونەتە ژێر باری هەلومەرجی ئێستەوە و ئەگەریش بێگومان پێویستە ئەو وشەیە بەکار بهێنین، لەبەردەم زەبروزەنگدا ملتان کەچ کردووە. بیری لێ بکەنەوە. چارەنووسی دایک و براکەتان لەژێر دەستی ئێوەدایە! من دەبمە خزمەتکاری ئەڵقەلەگوێی ئێوە... تا کۆتایی تەمەن... دەی، من لێرە بەدەم چاوەڕوانیتانەوە دادەنیشم.

سڤیدریگایلۆف لە دووریی حەوت هەنگاوێک لە دونیاوە لەسەر قەنەفەکە دانیشت. کچەکە ئێستە ئیدی تۆزقاڵێک گومانی لە ویستی ئاسنین و نەگۆڕی ئەو نەبوو؛ جا، دەمێکیش بوو ئەوی بە باشی

دەناسی. کتوپڕ دەمانچەیەکی بچووکی لە گیرفانی دەرهێنا، میلی هێنایەوە و هەروا چەکبەدەست، ئەنیشکیی خستە سەر مێزەکە.

سڤیدریگایلۆڤ لە جێگەکەی ڕاست بووەوە.

– ئەها! یانی وای لێ هات!

لە سەرسامیان هاواری لێ هەستابوو، بەڵام هاوکات بەدخوازانە بزەی دەکرد.

– دەی، ئەمە بە تەواوی ڕەوتی بابەتەکە دەگۆڕێ! هەر لە بنەڕەتەوە کاری منتان ئاسانتر کرد، دونیا خاتوون. ئەی ئەم دەمانچەیەتان لە کوێ هێنا؟ نەکا هەمووی لەژێر سەری ئەو ڕازومیخینە ئازیزەماندا بێ؟ ئەی هاوار! خۆ ئەمە دەمانچەکەی خۆمە! هاوڕێی چەندان ساڵەم! جا چەندە بەدوایدا گەڕام! لە هەموو شوێنێ چاوم بەدوایەوە بوو. کەواتە ئەو فێرکاریی نیشانەشکێنییەی پێشتر هەمانبوو، کە من شانازیی ئەو فێرکارییەم پێ برا، بە زایە نەچووە!

– دەمانچەی تۆ نییە! هی مارفا پیترۆڤنایە. تۆ ئەو ژنە داماوەت کوشت، نەفرەتی! ئەو ماڵە هیچ موڵکێکی تۆی تێدا نەبوو. کە بیرم کردەوە تۆ چ کارگەلێکی چەپەڵانەت لێ دەوەشێتەوە ئیتر هەڵم گرت.. هەر ئەوەندە بەسە هەنگاوێ بنێی... سوێند بێ گوللەیەکت بەقوربان کەم!

دونیا کەوتبووە بارێکی شێتانەوە.

– ئەی برا ئازیزەکەتان چی؟ لەبەر کونجکۆڵی دەپرسم!

سڤیدریگایلۆڤ هێشتا لە جێیەکەی جارانیدا ڕاوەستابوو و ئەمەی دەپرسی.

– پێت خۆش بوو بچۆ ڕۆدیا ئاشــکرا بکە! نەجووڵێی لە شــوێنت! نەیێیتە پێش! پێوەت دەنێم! خۆت ژنەکەتــت ژەهرخوارد کرد، من دەزانم. تۆ خۆشت بکوژی!

دونیا بە دەمانچەکە نیشانەی لێ گرتەوە.

– ئێســتە یانی هەر بە ڕاســتی لەوە دڵنیان کە من مارفا پیترۆڤنام ژەهرخوارد کردووە؟

– کاری تۆ بوو! خۆت هەندێ شــتت بە گوێدا دام... قســەی ژەهرت هێنایە ناوەوە... دەزانم کە ڕۆیشــتی و لە شــوێنێ دەســتت خســت... لە بەردەســــتتدا بوو.... کاری خۆت بوو. بێ لە تۆ دەکرێ کاری کێ بێ؟ ناڕەسەن! بکوژ!

– گریمان کە ڕاســت بێ و من مارفا پیترۆڤنام ژەهرخوارد کردبێ، جا خۆ هەمووی تەنیا لەبەر تۆ بووە!... هۆکارەکەی تۆ بووی لەمە تێبگە!

– درۆ دەکەی! هەمیشە ڕقم لێت بوو، هەمیشە... هەمیشە...

– ئۆهۆۆو، تەماشــا دونیا خاتوون! دەڵێی بیرتان چووە لە گەرمەی ڕێنمایی و گۆڕینی مندا، خۆشتان بەرەبەرە خەریک بوو شل دەبوون. لە چـاوەکـانتـانـدا دەمخوێندەوە! ئەو شــــەوەتـان بیر نییە، جا چ مانگەشەویکیش بوو! بولبولەکان چ چرپینێ دەیانچڕی!

– درۆیە!

تووڕەیی لە چاوانی دونیادا بڵێسەی دا.

– درۆ دەکەی! بوختان هەڵدەبەستی!

– درۆ دەکەم؟ بـا وابێ، مـادام ئێوە حەز دەکەن وا بێ، دەڵێین درۆیە. هەمووی قسەی خۆمە. نابێ ئەو جۆرە شتانە بیر خاتوونەکان بێنیتەوە!

سڤیدریگایلۆڤ بزەی کرد.

– دەزانم دەتوانی ئەو پەلەپیتکەیە بچرکێنی ئەی دڵڕفێنە سرگەکەم! دەی، دە بیتەقێنە ئیترا!

دونیا دەمانچەکەی بەرز کردەوە. ڕەنگپەڕیویەکەی مەرگاوی بوو. تەماشـــایەکی ســـڤیدریگایلۆڤی کرد، لە زەینیدا مەودای نێوانیانی پێوا، ڕێک نیشـانەی لێ گرتەوە و چاوەڕێی یەکەمین جووڵەی ئەو ما. لێوی خوارەوەی ســـپیی ســـپی بووبووەوە و دەلەرزی و چاوە ڕەشـــە گەورەکانی یەک پارچە ئاگر بوون. ســـڤیدریگایلۆڤ هیچ کاتێک ئەوی هێنـدە جوان نەدیتبوو. دەتگوت ئـاگری نیگـای کچەکە لە کـاتی نیشانەگرتنەوەدا، ئەوی کردە خۆڵەمێش و دڵی لەتاو ئازار و هەیەجاندا چڵی دا. هەنگـاوێکی نـایە پێش و بوم! دەنگی گوللە ژوورەکەی تەنییەوە. گوللەکە بەسەر پێستی سەری سڤیدریگایلۆڤدا چیخی کرد و بەر دیوارەکەی پشتی کەوت، ئەویش هەر وا ڕاوەستابوو و پێدەکەنی.

– دەڵێی شـەنگەسـوورە پێوەی دام! بەڵێ، خانمخاس نیشـانەیان لە سەرم گرتەوە! باشە ئەمە چییە؟ ئەی هاوار، خوێن!

سڤیدریگایلۆڤ دەسرەکەیی دەرهێنا تا ئەو دەزوولەخوێنە بسرێت کە بەســـەر لاجانگەکانیدا هاتبووە خوار. پێدەچوو گوللەکە پێســـتی سەریی بردبێت.

دونیا دەمانچەکەی داگرت و تەماشــایەکی ســڤیدریگایلۆڤی کرد. لە نیگایدا زیاتر لە ترس، جۆرێک لە تاســـان و وڕیی شـــێتانە شـــەپۆلی دەدا؛ دەتگوت نازانێت چیی کردووە و لە دەوروبەریدا چی دەگوزەرێت.

– دەی، ئەمەیان نەپێکا! هەمدیسان تەقە بکە، من چاوەڕێم!

شێوازی قسەکردنی سڤیدریگایلۆڤ نەرم و هێواش بوو و هێشتا بزەی بەسەر لێوەوە بوو، بەڵام پەژارەیەکیش لە دەنگ و زەردەخەنەکەیدا بوو.

– ئاوها خنەخنی لێ بکەن تا بەر لەوەی ئێوە دەرفەتی دووبارە میلهێنانەوەتان هەبێ، من لە دەستتانی دەربێنم!

دونیا جووڵەیەکی کرد و خێرا میلی دەمانچەکەی هێنایەوە و دیسان نیشانەی گرتەوە.

– مەجووڵێ، نزیک مەکەوەرەوە!

دونیا بێهیوا هاواری کرد.

– سوێند دەخۆم... پێوەت دەنێم... من... دەتکوژم!

– دەی، لە سێ هەنگاودا گەر جارێکی تریش نەمپێکن و نەتوانن من بکوژن بێوێنەیە بە ڕاستی! وەلێ ئەگەر نەمپێکن... ئەوسا...

ئەم جارەیان ئاگر لە چاوی سڤیدریگایلۆڤدا بڵێسەی دەدا؛ دوو هەنگاو هاتە پێش. دونیا هەمدیسان نیشانەی گرتەوە و... ئەم جارەیان گوللەکە چرووکی کرد!

– وا دیارە باش پڕتان نەکردووەتەوە! گرنگ نییە! گوللەیەکی تریشتان هەیە. لە کاتی خۆیدا پڕی بکەنەوە ئەم جارە، من دەرفەتتان دەدەمێ.

سڤیدریگایلۆڤ مکووڕ و بە ویستێکی دڕندانەی نێو نیگایەوە، دوو هەنگاوێک دوور لە کچەکەوە چاوەڕێ ما. بە گوڕوتینی کەڵلەڕەق و تادارانەی ناوچەوانییەوە لێی ڕامابوو. دونیا لە نیگایدا خوێندییەوە کە ئامادەیە بمرێت، بەڵام دەست لەو هەڵنەگرێت.

– بەڵێ... هاکا خانمخاس لە دووریی دوو هەنگاوەوە بوودەڵە داوێنپیسەکەی تەخت کردا

دونیا کتوپڕ دەمانچەکەی فڕێدایە لاوە.

– ئای لەوە، خۆ خاتوون دەمانچەکەی فڕێدایە سەر زەوی!

سڤیدریگایلۆڤ سەراسیمە ئەمەی گوت و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. دەتگوت بارێک بە کۆڵییەوە، نا، بەسەر دڵییەوە لابرابوو. لەوانەشە هەر بە تەنیا ترس لە مەرگ نەبوبێت، چونکە دوور بوو لەو ساتەدا وەها هەستێکی هەبێت؛ بەڵکە جۆرە ئازادبوونێک بوو لە هەستێکی جیا لە هی مەرگ، هەستێکی ڕەشتر و تاڵتر، کە خۆیشبی نەیدەتوانی بڵێت چییە. چووە لای دونیا و بە نەرمی باسکی بە دەوری کەمەریدا هێنا. کچە بەرگریی نەکرد، تەنیا وەک بی دەلەرزی و نیگای تکاکارانەی لەو بڕیبوو. سڤیدریگایلۆڤ هەوڵی دا شتێک بڵێت، وەلێ تەنیا لێوی تەکانێکی دا و نەیتوانی یەک وشە دەربڕێت یان تەنانەت دەنگێک لە دەمییەوە دەربکات.

– لێگەڕێ بڕۆم!

دونیا کەوتبووە پاڕانەوە.

سڤیدریگایلۆڤ لەرزی و دەنگی دونیا بە تەواوی گۆڕابوو.

– یانی بە هیچ شێوەیەک منت خۆش ناوێ؟

بە هێمنی ئەمەی لە دونیا پرسی و کچەش سەری بادا.

– هەروەها... بە هیچ جۆرێکیش ناتوانی خۆشت بوێم؟ یانی هیچکات؟

سڤیدریگایلۆڤ داماو و لەژێر لێوەوە پێی داگرت. دونیاش بە ورتە وەلامی دایەوە:

– هیچکات!

خولەکێک بە ململانێیەکی تۆقێنەر و ناڕوونی ناو دڵ و ڕۆحی سفیدریگایلۆڤەوە تێپەڕی. نیگایەکی لەوەسفبەدەری گرتە دونیا. کتوپڕ دەستێی کشاندەوە، توند ڕووەو پەنجەرەکە سووڕا و هەر لەوێ و پشت لە دونیا ڕاوەستا. خولەکێکی دیکەش تێپەڕی.

– ئەوەش کلیلەکە. ئەوەتانێ.

کلیلەکەی لە گیرفانی چەپی کۆتەکەی دەرهێنا و بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە یان سەیری دونیا بکات، خستییە سەر مێزەکە.

– خێرا کلیلەکە هەڵگرن! دەی! تا زووە بڕۆن! خێراکەن!

کەللەڕەقانە لە پەنجەرەکەوە تەماشای دەرێی دەکرد. دونیا چوو بۆ لای مێزەکە تا کلیلەکە هەڵگرێ.

– دەی خێراکە!

سفیدریگایلۆڤ جارێکی دیکە، بێ ئەوەی لا بکاتەوە یان تەنانەت بجووڵێت، ئەمەی دووبارە کردەوە؛ وەلێ قسەکەی جەختلەسەرکردنەوە و مانایەکی تایبەت و تۆقێنەری تێدا بوو.

دونیا دەرکی بە شێوازی قسەکردنی تۆقێنەر و نامۆی ئەو کرد، پەلاماری کلیلی سەر مێزەکەی دا، پرتاوی کردە لای دەرگەکە، بە پەلە کلۆمەکەی کردەوە و لە ژوورەکە هەڵهاتە دەر. ڕێک یەک خولەک دواتر، بێهۆشانە بە قەراخ ڕێژاوەکەدا بەرەو پردی ڤازنیسنسکی دەڕۆیشت.

سفیدریگایلۆڤ چەند خولەکێک لەوێ لەپشت پەنجەرەکەوە ڕاوەستا. دواجار بە هێمنی سووڕایەوە، چاوێکی بە دەوروبەریدا گێڕا و دەستی بە تەوێڵیدا هێنا. بزەیەکی غەریب ئەندامەکانی دەموچاویی وێک هێنایەوە، بزەیەکی جەرگبڕانە و کز و خەمگین، بزەیەک لەتاو

ناموراديدا. خوێنی زامەكەی ســـەری، كە ئیدی خەریک بوو وشــک دەبووەوە، دەســتیی پیس كردبوو. بە توورەیی تەماشــایەكی دەســتی كرد، پاشـــان خاولییەكی تەڕ كرد و لاجانگیی ســـڕی. دەمانچەكە، كە دونیا فڕێی دابوو، لە نزیک دەرگەكەوە كەوتبوو و كتوپڕ ســـەرنجیی ڕاكێشـــا؛ هەڵیگرتەوە و بە ســـەرنجەوە لێی ڕوانی. دەمـانچەیەكی بچووک و دێرین بوو و سێ گوللەی دەخوارد كە هێشتا دوو گوللە و یەک قەپاغی تێدا بوو. كەواتە هیچ كێشـــەیەكی نەبوو و دەكرا جارێكی دیكەش تەقەی پێ بكەیت. ســـڤیدریگایلۆڤ چەند ســاتێک لەبەرخۆوە بیری كردەوە، دەمانچەكەی خســتە گیرفانییەوە، كڵاوەكەیی هەڵگرت و لە ژوورەكە چووە دەرێ.

## شەش

ســـــڤیـدریگـایلۆڤ بە درێژایی ئەو شـــــەوە، تـا کـاتژمێر دە، لە سـەرپەنایەکەوە ڕووی لە سـەرپەنایەکی دی دەنا و یەک بەدوای یەک مەیخانەی دەگۆڕی. کاتیاش دەرکەوت و گۆرانییەکی ناخۆشـی دیکەی بەم سەربەندەوە[1] گوت:

بوودەڵەی زۆردار و ناقۆڵا

کاتیای دابووە بەر ماچ

سڤیدریگایۆلف، کاتیا و کوڕێژگە ژەنیارەکە و دەستەی گۆرانیگوتن و پێشـــخزمەت و دوو فەرمانبەری وردیلانەی داوەت کردن تا بە دڵی خۆیان بخۆنەوە. ئەو دوو فەرمانبەرە سـەرنجیان ڕاکێشـابوو، چونکە لووتی هەردووکیان لارووێر بوو، دانەیەکیان بە لای ڕاســتدا و ئەوی دیکەشیان بە لای چەپ. ئەم خاڵە زۆر سڤیدریگایلۆڤی خستبووە ژێر کاریگەرییەوە. دواجار ســـڤیدریگایلۆڤیان لەگەڵ خۆیاندا کێش کرد و بردیانە ســــەیرانگەیەک. ســـڤیـدریگـایلۆڤیش پارەی چوونەژووری هەموویـانی دا و خواردنەوەی بۆ کڕین. بـاخی ســـــەیرانگەکە تەنیـا کاجێکی باریکی سێ‌سـاڵەی تێدا بوو و سـێ دەوەن، لەگەڵ هۆدەیەکدا کە لە بنەڕەتدا شـــوێنی خواردنەوە بوو، بەڵام چایشــــی دەفرۆشـــت. تاکوتەراش مێزگەلێکی سـەوز لەگەڵ چەند کورسـییەکی دەوروبەریان کە لێرە و لەوێ دانرابوون. دەستەیەک گۆرانیبێژ بە دەنگێکی ناحەز و لیبووکێکی ئەڵمـانیی خەڵکی میونیخ بە لووتێکی ســــوورەوە، کە

[1] سەربەند: تەرجیعبەند (فەرهەنگی کاوە: فارسی-کوردی)

سـەرخۆش بوو و زۆریش خەمگین، هەمووانیان سـەرگەرم کردبوون. دوو فەرمانبەرە لووتخوارەکە لەگەڵ چەند فەرمانبەرێکی دیکەدا بووە مشـتومڕیان و پێدەچوو شـەڕێکی پیس بەڕێوە بێت. سـڤیدریگایلۆڤیان لەنێوان خۆیـانـدا کردە نـاوبژیوان و ئەویش یەک چـارەک گوێی لێ گرتن، بەس بە جۆرێک کردبوو یانە قیڕەقیڕ کە ڕێی تێنەدەچوو لێیان تێبگات. تاکە شـــتێکی ڕوون ئەوە بوو کە وا دیار بوو یەکێک لەوان شـتێکی خیت کردبوو و تەنانەت توانیبووشـی بیفرۆشـێتە یەکێک لەو جوولەکانەی کە بەو دەوربەرەدا دەخولانەوە، وەلێ ئێستە کە شتەکەی ساغ کردبووەوە، ئامادە نەبوو لە ماڵە دزیارییەکەدا بەشـی هاوڕێکانی بـدات. دواجـار بە جۆرێـک لە جۆرەکـان ڕوون بووەوە کە مـاڵە دزیارییەکە، کەوچکەچایەکی ئەو قاوەخانەیە بووە. لە قاوەخانەکەشـدا بە بابەتەکەیان زانیبوو و ئیدی بەرەبەرە خەریک بوو قسـە دەگەیشـتە ناسـکی کە سـڤیدریگایلۆڤ پارەی کەچکەچایەکەی دا، لە جێگەکەی هەسـتایەوە و سـەیرانگەکەی جێ هێشـت. نزیکەی کاتژمێر دە بوو. بە درێژایی ئەو مـاوەیە یەک دڵۆپە مەشـــــروبی نەخواردبووەوە و ئەگەرچی داوای چایشی کردبوو، تەنیا لەبەر ئەتەکێتی شوێنەکە بوو.

ئێوارەیەکی تاسـێنەر بوو. نزیکەی کاتژمێر دە، هەورگەلێکی ڕەش پانتایی ئاسمانیان داگرت. هەورەشریخەیەکی کرد و باران وەک تاڤگە دایکرد. باران نەبوو، لافاوێک بوو کە زەویی هەڵدەدەڕی. ئاسـمانیش خولەک دوای خولەک برووسـکەی دەدا و برووسـکەکانیشـی هەر جارەو لانیکەم پێنج چرکەیەکیان دەخایاند. سڤیدریگایلۆڤ، خوسـاو تا سـەرئێسـقان، چووەوە ماڵێ و دەرگەکەی بەسـەر خۆیدا کڵۆم کرد. چەکمەجەی دۆلابەکەی ڕاکێشـا، هەرچی پارەی هەبوو هەڵیگرت و دووسێ لاپەڕەشی لەت کرد. پاشان پارەکانی ئاخنینە گیرفانییەوە، جا ویستی جلەکانی بگۆڕێت کە لە پەنجەرەوە تەماشایەکی دەرێی کرد و گوێی بۆ دەنگی باران و هەورەشـریخە هەڵخست و پاشگەز بووەوە.

کڵاوەکەی هەڵگرت و لە ژوورەکە چووە دەرێ و دەرگەکەشـــی کڵۆم نەکرد. ڕاستەوڕاست چووە لای سۆنیا. بەڵێ، لە ماڵەوە بوو.

ســــۆنیا بە تەنیا نەبوو. چوار منداڵی کاپیرنائومۆفیی لەلا بوون و خەریک بوو چـای دەدانێ. لە بێدەنگییەکی پڕ لە ڕێزدا بەخێرهـاتنی ســـڤیـدریگـایلۆڤی کرد و نیگـایەکی پرســـیـارئـامێزی گرتە جلە خووســـاوەکانی، بەڵام هیچی نەگوت. منداڵەکانیش یەکســـەر تۆقیوانە ڕایانکردە دەرێ.

سڤیدریگایلۆڤ لەپشت مێزەکەوە دانیشت و داوای لە سۆنیاش کرد لەلایەوە دابنیشێت. کچەش سەرکزانە ئامادەی دانیشتن بوو.

– من لەوانەیە بڕۆم بۆ ئەمریکا، سۆنیا خاتوون.

سڤیدریگایلۆڤ سەری قسەی کردەوە.

– ڕەنگە ئەمە دواهەمین جار بێ چاوم بە ئێوە دەکەوێ و دەمەوێ هەندێ لە کـارەکـان ڕایی بکەم. ئەی ئەو خـاتوونە بەڕێزەتـان بینی ئەمڕۆ؟ دەزانم چیی پێ گوتوون، پێویســـت ناکا باســـی کەن. (ســـۆنیا نائاگایانە جووڵەیەکی کرد و پاشـان ســوور هەڵگەڕا.) ئەم کەســانە بۆ هەر کارێ ڕێوشـــوێنی خۆیانیان هەیە. هەرچۆنێک بووە داهاتووی خوشـــکەکان و براکەی ئێوە دابین بووە و من ئەو پارەیەی کە بۆ هەریەکەیانم لە بەرچاو گرتووە داومەتە دەستی کەسێکی متمانەپێکراو تا بێخەم بین. پسووڵەکەشتان دەدەمێ. لە دەستی خۆتان بێ باشترە، دونیـا هەزار شــــتە ئێتر، ئەگەری ڕوودانی هەر شـــتێ لەئـارادایە. فەرموون، ئەوەش پســـووڵەکەتان دەی، ئەم کارەش یەکلایی بووەوە. ئەوەش ســـێ ســــەفتە چەکی لە ســــەدا پێنجی لە خزمەتی ئێوەدا... فەرموون. هی ئێوەیە، تەنیا و تەنیا هی ئێوە نەک هیچ کەسی تر. بەس با هەر بەینی خۆمان بێ؛ هەرچییەکتان بەر گوێ کەوتەوە باســی ئەمە نەکەن و بـا کەس پێی نەزانێ. ئەم پـارەیە بەکەڵکتـان دێ، ســـۆنیـا

خاتوون. ئەو ژیانەی جاران ئیتر بۆ ئێوە باش نییە و ئێستە ئیتر پێویستیشتان پێی نییە.

– من تا بڵێی قەرزاری ئێوە و ئەوانی تر و زڕدایکی خوالێخۆشبووشمم...

سۆنیا پەلەپەل دەدوا.

– گەر تا ئێستەش ڕێکوپێک سوپاسم نەکردوون... تکایە وەک پێنەزانی لێکی مەدەنەوە...

– پێویست ناکا، بەسە!

– لەبارەی ئەم پارەیەشەوە، جەنابی سفیدریگایلۆف، زۆر زۆر سوپاسگوزارم، وەلێ ئێستە ئیتر پێویستیم پێی نییە. تکا دەکەم وا مەزانن پێنەزانم، وەلێ من بە جۆرێ لە جۆرەکان دەتوانم ژیانی خۆم ڕایی بکەم. گەر بەنیازی کاری چاکەن، دەکرێ ئەم پارەیە...

– ئەم پارەیە هی ئێوەیە، سۆنیا خاتوون. تەنیا و تەنیا هی ئێوە. تکا دەکەم با زیاتر لەسەری نەڕۆین. تا کەمتر بڵێین باشترە! منیش لەوە زیاتر دەرفەتم نییە. بەکەڵکتان دێ ئەم پارەیە. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ دوو ڕێگە زیاتری لەبەردەمدا نییە، یان گوللەیەک دەنێ بە مێشکی خۆیەوە، یان بە جادەی ڤلادیمیرۆفکایدا مل دەنێ. (دونیا تۆقیوانە تەماشایەکی کرد و کەوتە هەڵەرزین.) جا پێویست بە تۆقین ناکا! هەموو شتێکم لە زمانی خۆیەوە بیست و دەمشڕ و شتیش نیم، تا بچمە شوێنێک و دانیشم و باسی بکەم! ئامۆژگارییەکی باش بوو کە پێتان گوت بچێ و خۆی ڕادەست بکا و دان بە هەموو شتێکدا بنێ. ئەوە زۆر بۆ ئەو باشتر دەبێ. ئەگەریش نسیبی سیبیریا بێ، خۆ ئێوەش لەگەڵی دەڕۆن؟ دەی، کەواتە پێویستیتان بە پارە هەیە! من ئەم پارەیە بە ئێوە دەدەم، وەلێ وەک ئەوە وایە بەخشیبێتمە ڕۆدیۆن

ڕامانۆڤیچ! بەڵێنیشـــتان بە ئامالیا ئیڤانۆڤنا دا کە قەرزەکەی بدەنەوە، خۆم بیســـتم. چۆن دەت وانن ئەوەندە خۆشـــخەیاڵ و بێباک ئەو بەرپرسـیاریەتییە بخەنە ئەسـتۆی خۆتان، سـۆنیا خاتوون؟ قەرزەکە لەسـەر کاترینا ئیڤانۆڤنا بووە، خۆ لەسـەر ئێوە نەبووە. ئەسـڵەن نابێ حســـێب بۆ ئەو ژنەتیوە ئەڵمانییە بکەن. خۆ بەم جۆرە ناتوانن لەم دونیایەدا هەڵبکەن، سـۆنیا خاتوون. گەر لەبارەی منەوە شـتێکیان لێ پرسـین... چونکە سـبەی دووسـبەی دێن بۆ لاتان تا پرسـوجۆ بکەن... نەڵێن هاتبووە دیدەنیمان و پارەکەش نیشـانی هیچ کەسـێ مەدەن و لەلای هیچ کەسێکیش باسی مەکەن. دەی، جارێ خوائاگادارتان.

سڤیدریگایلۆڤ لە جێگەکەی هەستا و درێژەی پێ دا:

– سڵاوی تایبەتیی منیش بگەیەننە خزمەت ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ. هەر بە ڕاست، خراپ نییە جارێ ئەم پارەیە بدەنە بەڕێز ڕازومیخین بۆتان هەڵگرێ. خۆ بەڕێز ڕازومیخین دەناســـن؟ دەی دیارە کە دەیناســـن! کوڕێکی خراپ نییە، دەکرێ متمانەی پێ بکەی. بەیانی پارەکە بەرن و لەلای ئەوی دانێن... یان هەر وەختێ کاتی هات. تا ئەو کاتەش لە شوێنێکی باش بیشارنەوە.

سـۆنیاش هەسـتایەوە و بە پەشـۆکاوی لە سـڤیدریگایلۆڤ ڕاما. دەیویست قسەیەک بکات و شتێکی لێ بپرسێت، بەڵام بۆ چەند ساتێک زاتی نەبوو دەم بکاتەوە و هەر نەشـــیدەزانی لە کوێوە دەســـت پێ بکات.

– ئاخر چۆن... ئێستە، بەم بارانە، چۆن دەتانەوێ بڕۆن؟

– کەســـێ کە نیازی چوون بۆ ئەمریکای هەبێ باکی بە باران نییە! هەهەهە! ماڵئاوا، سۆنیا خاتوون، باوانەکەم! ئێوە دەبێ تەمەنێکی درێژ بژین، ئەوانی دیکە پێویســـتییان بە کەســـێکی وەک ئێوەیە. هەر بە ڕاست، سڵاوی من بە بەڕێز ڕازومیخینیش بگەیەنن. بێگومان پێی بڵێن

ئارکادی ئیڤانۆڤیچ ســـڤیدریگایلۆڤ ســـڵاوتان لێ دەکا! بێگومان پێی بڵێن، کتومت ئەمە بڵێن!

ئەمەی گوت و لە ژوورەکە چووە دەرێ و سـۆنیای لە نیگەرانی و حەپەسان و تەنانەت ترس و دڵەڕاوکێیەکی ناڕووندا جێ هێشت.

دواتر دەرکەوت کە هەر هەمان شـــەو، نزیکەی کاتژمێر دوازدە، ســـڤیدریگایلۆڤ دیدارێکی بێڕادە ســـەیر و چاوەڕوانینەکراوی دیکەی هەبووە. ڕەهێڵەی باران هەر بەردەوام بوو. سڤیدریگایلۆڤ، تەڕوتلیس هەنگاوی نایە ئەپارتمانی تەسک و ناخۆشی دایبابی دەزگیرانەکەیەوە کە دەکەوتە شـــەقامی ســـێیەمی دوورگەی ڤاســـیلییەوە لە بولواری بچووکدا. هەڵبەتە ماوەیەک لە دەرگەی دا تا لێیان کردەوە و، هاتنیشی بەو دۆخەوە، ســـەرەتا بووە مایەی دڵەڕاوکێ و هەموولانی نارەحەت کرد، بەڵام ســـڤیدریگـایلۆڤ گەر بیویســـتبـا دەیتوانی زۆر زۆر ســـەرنجڕاکێش و دڵگیر بێت و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی دەســـتبەجێ دایک و بـاوکە تێگەیشـــتوو و دونیـادیدەکە -کە وایـان زانیبوو ئەو زۆری خواردووەتەوە و ئێســـتە نازانێت خەریکی چییە- بێخەم بن. دایکەی نەرمونیان و تێگەیشـــتوو، باوکە پەککەوتەکەی بە کورســـییە تایەدارەکەیەوە هێنا تا چاوی بە زاواکەی بکەوێت و خۆشـــی وەک هەمیشـــە ســـەری قســـەی بە کردنی پرســـیاری یەک لەدوای یەک و جیاواز و ناپەیوەست کردەوە. دایکی بووکێ هەرگیز ڕاستەوخۆ هیچ شتێکی نەدەپرسی. بە زەردەخەنەوە دەستی پێ دەکرد و دەستەکانیی لێک دەســـوین و پاشـــان -وەک ئەوەی ڕوونبوونەوەی هەندێ پرس شتێکی سەرەکی بێت- بۆ نموونە دەیپرسی سڤیدریگایلۆڤ بەتەمایە کەی دەزگیرانەکەی بگوازێتەوە و لەم جۆرە قســـانە و، ئەوســـا، زۆر تاســـەمەندانە و تەنانەت تا ڕادەیەک بە هـانەهـان دەچووە ســـەر پرســـیارگەلێک لەبارەی پاریس و ژیانی خانەدانانەی ئەوێ و جا دواتریش -دەشکرا ئەوە پێش نەیێت- قسەی دەهێنایەوە سەر ژیانی

هەنووکەییان لە شەقامی سێیەمدا. ئەم شێوازی گوتوبێژە لە زۆربەی کـاتەکـانـدا کـاریگەرییەکی فرەشـــی دەبوو، وەلێ ئەم جـارەیـان سـڤیدریگایلۆڤ بە پێچەوانەی هەر کاتێکەوە پشـووکورت و بێتاقەت بوو و وڕکی گرتبوو بە هەر جۆرێک بووە دەبێت ئەلەو کاتەدا چاوی بە دەزگیرانەکەی بکەوێت، گەرچی هەر لە سەرەتاوە پێیان ڕاگەیاندبوو کە کچۆڵەکە خەوتووە. هەڵبەتە کچۆڵەکەش تۆزێـک دواتر هـات. سڤیدریگایلۆڤ بێ بەفیرۆدانی کات بە کچۆڵەکەی گوت کارێکی گرنگی بۆ هاتووەتە پێش و دەبێت تا ماوەیەک پیتەربورگ جێ بهێڵێت، هەر لەبەر ئەوەش پازدە هەزار ڕۆبڵی بۆ هێناوە و تکا دەکات کچۆڵەکە ئەم بڕە وەک دیارییەک بەبۆنەی هاوسـەرگیرییەکەیانەوە وەربگرێت، چونکە هەرچۆنێـک بووە نیـازی وا بووە بەر لە ڕێوڕەســـمی هاوســەرگیرییەکەیان ئەم دیارییە کەمبەهایەی پێشـکەش بکات. بەڵام لەم نێوەندەدا، پەیوەندیی مەنتیقیی نێوان دیارییەکە و سەفەری خێرای ئەو و ئەوەی کە بە پێویســـتی زانیوە بەو نیوەشـــەوە و لەو بارانە لافاوئاســـایەدا ســەریان لێ بدات و دیارییەکە پێشـکەش بکات، ڕوون نەبووەوە. لەگەڵ ئەمەشدا هەموو شتێک زۆر باش ڕایی بوو؛ تەنانەت دەربڕینی ســەرسـامی و جەخار و لەسـەرڕۆیشـتن لەگەڵ ئاخ و وای ئاســـایی و پرســـیارگەلی بە هەمان ڕادە مکووڕانەش بە شـێوەیەکی سەیر سنووردار و کەم بوون.

لەبەرانبەردا، پێزانین و ســـوپاســـگوزاریی پڕ لە گەرموگوڕی و خرۆشی تێکەیشتووترین دایکی دونیایان هەبوو کە فرمێسکەکانیشی بەڵگەیەکی ئێجگـار پتەو بوون بۆ ئەو ســـوپـاس و پێزانینە ڕاستەقینەیەی. سـڤیدریگایلۆڤ هەسـتایەوە و پێکەنی. دەزگیرانەکەی ماچ کرد و گۆنای لاواندەوە و دڵنیای کردەوە کە زوو دەگەڕێتەوە. بەڵام لە نیگای کچەکەدا سەرەڕای کونجکۆڵییەکی نیازپاکانەی منداڵانە، هاوکات پرسـیارێکی بێدەنگ و جددیی بینی؛ دیسـان ئەوی ماچ کرد و

لە دڵدا خۆی بە نەفرەت کرد، ئاخر دەیزانی دەبێت دەستبەجێ دیارییەکەی بە دەستی تێگەیشتووترین دایکی دونیا بخرێتە شوێنێکی کلۆمدراوەوە. ڕۆیشت و ئەوانی لە حەپەسانێکی سەیردا جێ هێشت. بەڵام دایکە نەرمونیان و دڵسۆزەکە دەمودەست ورتەورت هەندێک لە گرنگترین دڵەڕاوکێکانیانی ڕەواندنەوە:

– ئارکادی ئیڤانۆڤیچ لە سەرزلەکانە! هەمووان چاوی دوعایان لەوە و هاوڕێ و ئاشنای دەستڕۆیشتووشی زۆرە. کێ دەتوانێ بڵێ لەو مێشکەیدا چی دەگوزەرێ و بۆچی کتوپڕ دەکەوێتە سەرییەوە سەفەر بکا و بەر لەوەش پارەیەکی زەوەندە بە دیاری بدا؟ ئەسڵەن ئەوەش جێی سەرسامی نییە! هەڵبەتە مرۆڤ چاوەڕێ ناکا لە بەردەرگەی ماڵدا هەر وەک مشکی خووساو ئەو ببینێ، وەلێ بۆ نموونە ئینگلیزەکان لەمەش سەیروسەمەرەترن. کەسە گەورەکان وان ئیتر، بۆیان گرنگ نییە ئەوانی تر چۆن بیریان لێ بکەنەوە و گوێ بە ئەتەکیەتیش نادەن. لەوانەیە دەستەنقەست ئاوها کتوپڕانە هاتبێ تا بیسەلمێنێ کە لە ڕووی کەسدا دانامێنێ! لە هەمووشی گرنگتر ئەوەیە کە نابێ یەک وشە لەم مەسەلەیەی ئەمشەو بە هیچ کەسێ بڵێین دەنا هەر خوا دەزانێ لە پاشەملەماندا چی دەڵێن و چەندی تری پێوە دەلکێنن! دەبێ پارەکەش بخەینە شوێنێکی باشی داخراوەوە! بەختمان هەبوو کە فیدۆسیا لە موبەق نەهاتە دەر! هەر بە ڕاستی بە خێر گەڕا! لە هەموو ئەمانەش گرنگتر ئەوەیە کە نابێ یەک وشە بگاتەوە گوێی ئەو ژنەتیوە، خاتوو ڕێسلیخ!

جا دایکەی تێگەیشتوو هەر وا گوتی و گوتی و لەگەڵ باوکەکەدا تا دووی دوای نیوەشەو بەدەم چپەچپەوە بە بێداری دانیشت. بەڵام کچۆڵەکە فرە زووتر لەوان چووە جێخەوەوە و هەر وا سەراسیمە و تا ڕادەیەکیش خەمگین بوو.

سڤیدریگایلۆڤ لەم بگرەوبەردەیەدا، ڕێک نیوەشەو بوو کە لە ڕێی گەڕانەوەی دوورگەوە بۆ پیتەربورگ، لە پردی تۆچکۆڤ تێپەڕی. باران خۆشــــی کردبووەوە و لەبری ئەوە بـایەکی بەهێز و گڤێنەر هەڵکیردبوو. کەوتە هەڵلەرزین و بۆ ســاتێک چاوی بە ڕەشــایی ئاوی نێڤـای بچووک کەوت، کونجکۆڵییەکی تـایبەت لە نیگـایـدا هەبوو و تەنانەت دەتگوت پرســـــیارئامێزانەش لە ئاوەکەی دەڕوانی. وەلێ زۆر زوو لەوێ و لەتەک ئاوەکەوە لەشـــی تەزی و وەرســــووڕا و بەرەو بولواری گەورە کەوتە ڕێ. تا ماوەیەکی زۆر بەو شـــــەقامە درێژەدا هەر ڕۆیشـــت و ڕۆیشـــت، کەم تا زۆر نیو کاتژمێرێکی خایاند. چەند جارێکیش لە تاریکیی پیادەڕێ تەختەییەکەدا سـەرسـمی دا، بەڵام هەر وا بە لای ڕاستی شەقامەکەدا بەدوای شتێکەوە بوو. لەم دواییانە و لە کاتی تێپەڕین بێرەدا، میوانخانەیەکی تەختەیی سەرنجی ڕاکێشابوو، لە شـــوێنێکی کۆتـایی شـــــەقامەکەوە، کە تـا ڕادەیەکی بـاش گەورە و بەرفراوان بوو و ناویشـــی هێندەی ئەو بیری دەهات، *ئادریانۆپڵ*[1] بوو یان وەها شـــتێک. بە هەڵەدا نەچووبوو، ئەو میوانخانەیە بە چەشـــنێک لەو نـاوچە چەپەکەدا –کە کەمترین کەس ڕێی دەکەوتە ئەوێ!– دەدرەوشـــایەوە کە تەنانەت وێڕای تاریکیی ڕووتیش ڕێی تێنەدەچوو ســــەرنج ڕانەکێشــێت. بینایەکی بەرز و دووکەلاوی بوو، تەنانەت بەو کاتە درەنگەی شەویش پەنجەرەکانی ڕووناک بوون و دەکرا لە دەرێڕا نیشـــانەگەلی ژیانێکی بەجۆشـــی تێدا ببینیت. ســـڤیدریگایلۆڤ چووە ژوور و داوای ژووری لە کەسـێکی بژاوی شـرپۆش کرد کە لە دەرێ بینیی. کـابرا ســــەرنجی لە ســــڤیدریگـایلۆڤ دا، ژووژ بووەوە و دەمودەست پێش کەوت و ڕێیەکی درێژی بە میوانەکە بڕی تا گەیشتنە

---

[1] لە ســــالانی ١٨٦٠دا بەم نـاوەوە هیچ هۆتێلێک لە پیتەربورگدا نەبوو. *باریس تیخامیرۆڤ* باوەڕی وایە کە ئامانجی دۆســــتۆیفســــکی لە هەڵبژاردنی ئەم ناوەدا ئاماژەیەکی ڕەمزاوی بێت بۆ ئادریانووســــی ئیمپراتۆری ڕۆم و پێکبەراوردکردنی ئاقیبەتی ئەو لەگەڵ چارەنووسی سڤیدریگایلۆڤدا. «ف»

ژوورێکی بچووک و تــاســـێنەری ئەوپەڕ، کە لەژێر پلیکــانەکــانی ڕاڕەوەکە بوو. هیچ ژوورێکی دیکەیان نەبوو و هەموویان گیرابوون. شـــرپۆشـــەکە نیگایەکی پرســـیارئامێزی گرتە ئەو و ســـڤیدریگایلۆڤ پرسیی:

– چایشتان هەیە؟

– بەڵێ، قوربان.

– چیی تر هەیە بۆ خواردن؟

– گۆشتی گوێرەکە و ڤۆدکا و چەند جۆرێک مەزە، قوربان.

– چای و گۆشتی گوێرەکەم بۆ بێنە.

– هەر ئەوەندە؟ هیچی ترتان ناوێ؟

دیار بوو کابرا سەری سوڕماوە.

– هەر ئەوەندە! هیچی ترم ناوێ! هیچ!

شـــرپۆشـــەکە بە بارێکی ئێجگار واقوڕماوەوە چوو بەدەم ئیشـــی خۆیەوە.

*دەڵێی ئێرە شـوێنێکی باشـە!* سـڤیدریگایلۆڤ بیرێکی بە زەیندا هات. *ئەوە چۆنە کە من لە پەناگەیەکی ئەوەندە ئارام بێئاگا بوومە؟ لام وایە سەروسیمام لە هی کەسێ دەچێ کە لە کافێی شانتان*[1] *یان لەو جۆرە شـوێنانەوە هاتبێ و لەسـەر ڕێگەکەشـی تووشـی گۆبەنێک بووبێ! پێم خۆشە بزانم چ جۆرە کەسانێ لەم میوانخانەیەدا دەمێننەوە!*

---

١. کافێی شـــانتان لە مۆســـکۆ و پیتەربورگدا بە دیاردەیەکی نائاســـایی دادەنرا و سەرەڕای مۆسیقا، بەرنامەگەلی تەڕدەستی و سەمای کەنکەنیشی لەگەڵ بوو. «و. ف»

مۆمێکی داگیرساند و به سەرنجێکی زیاترەوە تەماشای ژوورەکەی کرد. بنمیچی ژوورەکە ئەوەندە نزم بوو کە سـ‍ـ‍ـڤیدریگایلۆڤ به حاڵ دەیتوانی خۆی قیت بکاتەوە. تەنیا یەک پەنجەرەشـی هەبوو. لەلایەکی ژوورەکەوە تەختەخەوێکی لێ بوو کە پیسیی لێ دەباری و کورسی و مێزێک کە به ڕەنگێکی سـ‍ـ‍ـادە بۆیە کرابوون و مەودای کەشـ‍ـ‍ـی ژوورەکەیـان داگیر دەکرد. دیوارەکـان دەتگوت لادارن و به بزمـار پێکەوە لکێندراون و کاغەزی دڕاو و پواویان بەسـ‍ـەردا کێشـراوە -بە چەشـ‍ـ‍ـنێک دڕاو و پیس و تۆزاوی کە نەخشـ‍ـ‍ـەکەی نەدەبینرا؛ بەڵام ڕەنگی زەردی سەرەکیی کاغەزەکە هێشتا دیار بوو- لەگەڵ ئەوەشدا لەژێر پلیکـانـدا بوو نەک ژووری ژێر بـانەلێژە، یەکێک لە دیوارەکـان لەبەر بەرکەوتن به لێژایی بنمیچەکە، وەک دیواری ژووری ژێر بانەلێژەکان کورت بوو. سـ‍ـ‍ـڤیدریگایلۆڤ مۆمەکەی دانـا، لەسـ‍ـ‍ـەر تەختەخەوەکە دانیشـ‍ـ‍ـت و فکر و خەیـاڵ بردییەوە. بەڵام دواجـار بۆڵەبۆڵێکی سـ‍ـەیر و بەردەوام لە ژوورەکەی تەنیشـ‍ـتەوە کە هەندێک جار تا ئاسـتی هاوار بەرز دەبووەوە، سـەرنجیی ڕاکێشـا. بۆڵەبۆڵەکە لەو سـ‍ـ‍ـاتەوەی کە ئەو هاتبووە ژوورەکەوە، کپ نەبووبووەوە. گوێی هەڵخسـ‍ـت: پیاوێک، دەتگوت بەدەم فرمێسـ‍ـکڕشـ‍ـتنەوە، ئەوی دیکەی سەرزەنشت دەکرد و دابوویە بەر جنێو و نەفرەت؛ وەلێ دەنگی ئەوی دیکەیان نەدەبیسـ‍ـترا. سـ‍ـڤیدریگایلۆڤ هەسـ‍ـتایەوە، دەسـ‍ـتی دایە بەر ڕووناکیی مۆمەکە و یەکسـ‍ـەر توانیی باریکەڕووناکییەک ببینێت کە لە کونی دیوارەکەوە دەهاتە دەرێ. ڕۆیشت و چاوی بە کونی دیوارەکەوە نا. ژوورەکەی تەنیشت تا ڕادەیەک لە ژوورەکەی ئەو گەورەتر بوو و دوو کەسـ‍ـ‍ـیشـ‍ـ‍ـی لێ بوون. دانەیەکیان، پیاوێک بوو بە تۆپەڵە قژێکی لوولی سـ‍ـ‍ـەیر و دەموچاوێکی داگیرسـ‍ـ‍ـاو و سـ‍ـ‍ـوورەوە و باری دەموچاویشـ‍ـ‍ـی بە جۆرێک بوو وەک ئەوەی گوتارێکی بەپێز بدات؛ کۆتەکەشی داکەندبوو و پێیەکانیشی بڵاو کردبوونەوە تا هاوسـەنگیی خۆی بپارێزێت. تەپەتەپ بە سـ‍ـ‍ـنگییدا دەکوتی و بەرانبەرەکەیی بە

توندوتیژی و تەنانەت شێتیی سەرکۆنە دەکرد کە بۆچی لە سوالکەرێک بەولاوە هیچی دیکە نییە و نەیتوانیوە پێگەیەک بۆ خۆی دەستەبەر بکات. پاشانیش ڕایگەیاند ئەوە لەسایەی ئەوەوە بووە کە فلانیش توانیویەتی لە زەلکاو نەجاتی ببێت و ئێستەش هەر کاتێک بیەوێت بە شووتێک فڕێی دەداتە دەرێ؛ جا تەنیا و تەنیا خوای گەورەش ئاگاداری هەموو شتێکە. ئەو کەسەش کە درابووە بەر جنێو و سەرکۆنە و سووکایەتی لەسەر کورسییەک دانیشتبوو و باری ڕووخساری کەسێکی هەبوو کە بیەوێت بپژمێت و کەچی نەتوانێت و ئێستەش خراپ تیا مابێت. جاروباریش ئاراستەی نیگای بەرخئاسای دەکردە گوتاربێژەکە، بەلام دیار بوو کە بە هیچ شێوەیەک تێناگات هاوڕێکەی چی دەڵێت و تەنانەت بە زۆریش دەنگی ئەو دەبیستێت. مۆمێک بەسەر مێزەکەوە دەسووتا؛ پەرداخی شەراب و یەک بتڵ ڤۆدکا (کە کەم تا زۆر چۆڕی لێ بڕابوو) و نان و خەیارشۆر بەسەر مێزەکەوە بوون، لەگەڵ فنجانگەلێک کە چای ماوەی بنیان زەرد دەچووەوە. سڤیدریگایلۆڤ کە چاک لە هەموو وردەکارییەکانی ئەو دیمەنەی ڕوانی، بێباک وەرسووڕا و لەسەر تەختەکەی دانیشت.

پێشخزمەتی شڕپۆش کە بە چایەوە هاتە ژوور، نەیتوانی بەر بە خۆی بگرێت و دیسان پرسیی بەڕێزی هیچی دیکەی ناوێت، کە ئەم جارەشیان وەلامەکە نەرێنی بوو، دواجار شڕپۆشەکە چوو بەدەم کارییەوە. سڤیدریگایلۆڤ خێرا فنجانێک چای خواردەوە تا گەرمی ببێتەوە، بەلام هیچی پێ نەدەخورا. دیار بوو کە بەرەبەرە خەریک بوو تای لێ دەهات. کۆتەکەی داکەند، پێخەفەکەی لە خۆیەوە پێچا و لەسەر تەختەکە ڕاکشا. توورە بووبوو. *هەر بە ڕاست! خراپ نەبوو ئەم جارەیان تەیار و ئامادە بام!* بەدەم زەردەخەنەوە لەبەرخۆوە بیری دەکردەوە. ژوورەکە تاسێنەر بوو و مۆمەکەش خراپ و کز دەسووتا و باش لە دەرەوە دەینەڕاند. لە سووچێکی ژوورەکەدا

دەنگی کرتەکرتی مشکێکی بیست. ژوورەکە بۆنی مشک و چەرمی لێ دەهات. سـڤیدریگایلۆڤ تووشـی بارێکی نیوەبێهۆشـانە بووبوو و خەیاڵ بەدوای خەیاڵی بە زەیندا دەهات. زۆری حەز لێ بوو بتوانێت زەینی لەسـەر دیمەنێک چڕ بکاتەوە. لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *لە خوارەوەی ئەم پەنجەرەیەوە، لەو دەرەوە، دەبێ خونچەیەک هەبێ. لە بادا دەنگ و هەرای درەختەکان دەبیسـتم. ئاخ، چەندە ڕقم لە دەنگی درەختەکانە لە شـەوانی زریانیدا، جا لە تاریکیی ڕووتیشـدا!* بیری هـاتەوە کە تۆزێـک لەوەوبەریش لە کـاتی تێپەڕین بەلای پـارکی پیترۆفسـکیدا، بەدەم بیرکردنەوە و ڕق لە دەنگی درەختەکان لە بادا، هەڵلەرزیبوو. پردی تۆچکۆف و نێڤای بچووکیشـی بیر هـاتنەوە و جارێکی دیکەش جەسـتەی تەزی، ڕێک وەک ئەو سـاتەی کە لەوێ لەسـەر پردەکە ڕاوەسـتابوو و بەسـەر ئاوەکەدا چەمیبووەوە. بەر لەوەی بیرکردنەوەیەکی سـەیر زەردەخەنەیەک بهێنێتە سـەر لێوی، لەبەرخۆیەوە گوتی: *هەرگیز چارەی ئاوم نەویسـتووە، تەنانەت لە نیگارەکانیشـدا دیمەنی ئاو پەسـەند ناکەم.* بزەی هاتێ: *لەم جۆرە سـاتانەدا ئیتر بیرکردنەوە لە سـەلیقە و پەسـەندکرن و ئاسـوودەیی مانای نییە، وەلێ خۆ من زیاتر لە هەر کاتێکی دی سـەختگیرتر و ئاسـتەمپەسـەندتر بوومە... ڕێک وەک گیانەوەرێ کە هەر دەگەڕێ و دەگەڕێ تا شـوێنی دڵخوازی خۆی بدۆزێتەوە... هەر چۆنێ بووە لەم هەلومەرجەدا دەشـیا بەرەو پارکی پیترۆفسـکی بگەڕێمەوە! وا دیارە زۆرم بەلاوە سـارد و تاریک بووە! هەهەهە! دەڵێی بۆ خۆشـی و ڕابواردن بەتەمـا بـووم بـڕۆم!... ئەی هـاوار، بـۆچـی مـۆمەکەم نەکوژاندەوە؟*

فووی لە مۆمەکە کرد. کە ڕوانیی لە دیواری ژوورەکەوە ڕووناکی نـایێـت، بیری کردەوە: *وا دیـارە ئەوانیش خەوتوون. دەی... مـارفـا پیترۆڤنا خاتوون، ئێستە سەرەی ئێوەیە تەشریفتان بێنن و دەرکەون.*

*تاریکی تاریکە، کەشەکەشی زۆر شیاوە و هیچ کاتێکیش لەمە باشتر نابێ! دە فەرموون، لە ئێستەیەکدا کە دەبێ بێن، دەرناکەون!*

دیار نەبوو بۆچی، بەڵام کتوپڕ بیری هاتەوە کە کاتژمێرێک بەر لە جێبەجێکردنی نەخشـــەکەی بۆ دونیا، ئامۆژگاریی ڕاســـکۆڵنیکۆفی کردبوو کە خوشـکەکەی بسـپێرێتە دەسـتی ڕازومیخین. *لام وایە هەر بە ڕاسـتی ئەو قسـەیە تەنیا تواندن بوو! ڕاسـکۆڵنیکۆفیش تێگەیشـت! باشـــە ئەم ڕاســـکۆڵنیکۆفە خوێڕییە چ زۆڵێکە! چ بارێکی بە کۆڵەوە بووە، بە چ گێچەڵێکدا تێپەڕیوە، زۆڵی وا! بە تێپەڕینی کات، کە ئەم هەڵیتوپەڵیتانەی لە کەللەدا دەرچوون فرەزانێکی چاکی لێ دەردەچێ، وەلێ جارێ دەیەوێ تۆزێکی تر بژی! ئەم گەنجە سـەرسـەریانەی ئەمڕۆ هەموویان هەر وان. بە دۆزەخ! چییان نەکردووە با بیکەن، بە من چی!*

خەوی لێ نەدەکەوت. شـــێوەی دونیا بەرەبەرە هاتە بەرچاوی و ئەندامی لەرزی لێ نیشت. *نا، وا نابێ. دەبێ واز لەم بیرکردنەوانە بێنم!* ئەمانەی بە زەیندا ڕابردن و هاتەوە سـەر خۆی. *دەبێ فکرم لەسـەر شـتی تر چڕ بکەمەوە. زۆریش سـەیر و گاڵتەجاڕانەیە، من هیچ کاتێ ڕقم لە کەس نەبووە، تەنانەت حەزیشـم لە تۆڵەکردنەوە و ئەم شـتانە نەبووە. ئەمە نیشـانەیەکی خراپە، نیشـانەیەکی زۆر زۆر خراپە! هیچ کاتێکیش شەڕەنگێز نەبووم و لە تووڕەییاندا هەڵنەدەچووم! ئەمەشیان نیشـانەیەکی خراپە. وەلێ ئەم جارەیان چ بەڵێنێکم بەو کچە دا... وای خوایە! کێ چووزانێ! بۆی هەبوو بتوانێ لە بنج‌وبناوانەوە بمگۆڕێ و مرۆڤێکی ترم لێ دروست بکا...*

بێدەنگ بوو و ددانەجیڕەی کرد، وەلێ هەمدیســـان وێنەی دونیای هاتەوە بەرچاو. ڕێک ئەو ســـاتەی دەدیت کە کچەکە، دوای یەکەمین تەقە، بە تۆقینێکی مەرگاوییەوە دەمانچەکەی داگرتبوو و مات و تاساو و بێهەســـت تەماشـــای ئەوی کردبوو. ســـڤیدریگایلۆڤ دەیتوانی بە

ئاسانی هەڵمەت بەرێتە سەر کچەکە و ئەویش، ئەگەر سڤیدریگایلۆڤ بیری نەهێناباوە، تەنانەت دەستیشی هەڵنەدەبڕی تا بەرگری لە خۆی بکات. بیری هاتەوە ڕێک لەو ساتەدا بە جۆرێک لە جۆرەکان دڵی بە کچەکە سووتابوو، وەک ئەوە وا بوو توند دڵیان گوشیبێت... *دەک هەموویان بە نەفرەت بن! وای بەدەست ئەم بیر و خەیاڵە سندانیانەوە! خۆ دیسان دەرکەوتنەوە! دەبێ وازیان لێ بێنم!*

لەرزینەکەی، تۆزێک دامرکابووەوە و خەریک بوو وەنەوز دەیبردەوە کە کتوپڕ دەتگوت شتێک لەژێر پەتۆکە و بەسەر دەست و پێیدا فڕکەی کردە خوارێ. خراپ ڕاچەنی. *دەک بە نەفەرەت بێ! مشک بوو لام وایە!* بە بیریدا هات: *لەبەر ئەو گۆشتی گوێرەکەیەیە کە لەسەر مێزەکە دامنا.* هیچ شتێک بۆ ئەو لە لادانی پەتۆکە و هەستانەوە لەو سەرمایەدا سەخت نەبوو، وەلێ دووبارە شتێکی مووچڕکەهێن بەسەر پێیدا تێپەڕی. پەتۆکەی لادا و مۆمەکەی داگیرساند. تادار بوو و لەرزیشی لێ هاتبوو. بەو دۆخە شڕەوە دانەوییەوە تا پەتۆکە بپشکنێت، هیچ دیار نەبوو. پەتۆکەی ڕاوەشاند و کتوپڕ مشکێک لە دەقەکەیەوە کەوتە سەر چەرچەفەکە. هەوڵی دا بیگرێت، بەڵام مشکەکە بەسەر چەرچەفەکەوە زیگزاگی لێ دەدا و ئامادە نەبوو جێخەوەکە چۆڵ بکات. بەنێو پەنجەکانی سڤیدریگایلۆڤدا تێدەپەڕی و بەسەر دەستیدا فڕکەی دەکرد، پاشانیش لەناکاو وەک گوللە خۆی بەژێر پشتییەکەدا کرد. سڤیدریگایلۆڤ پشتییەکەی فڕێدایە سەر زەوی، وەلێ کتوپڕ هەستی کرد شتێک خۆی بەژێر جلەکانیدا کرد و وەک برووسکە بەسەر لەشیدا تێپەڕی و چووە پشتی. لەرزێکی بە لەشدا هات و لە خەو ڕاچەنی. ژوورەکە تاریک بوو. هێشتا، پێچراو لە پەتۆ، لەسەر تەختەکە کەوتبوو. با لەژێر پەنجەرەکەوە دەیگڤاند و دەخرۆشا. *ئای کە چەندە پەستکەرە!* بە تووڕەیی ئەمەی لەبەرخۆیەوە گوت.

هەستایەوە و پشت لە پەنجەرە لەسەر لێواری تەختەکە دانیشت. لەبەرخۆیەوە گوتی: *ئەوەشمان نەویست کاکە! ئێمە و خەویان نەگوتووە!* بەڵام کزەیەکی سارد و شێدار لە پەنجەرەکەوە دەهاتە ژوور. بێ ئەوەی هەستێتەوە، پەتۆکەی کێش کردە سەر خۆی و توند لە خۆیەوە پێچا. بیری لە هیچ نەدەکردەوە و نەشیدەویست بیر بکاتەوە، وەلێ وێنا لەدوای وێنا بە بەرچاویەوە ڕیزیان دەبەست و پارچەگەلی فکر و خەیاڵی پچڕپچڕ و ناڕوون و بێسەروبەری بە زەیندا ڕادەبردن. دەتگوت خەریکە وەنەوز دەیباتەوە. بۆی هەبوو سەرما، یان ڕەشایی و شێ، یان ئەو بایە بێ کە خۆی بەژێر پەنجەرەکەدا دەکرد و دەیگڤاند و درەختەکانی دەشەکاندنەوە، کە کەللەڕەقانە ئەوی تامەزرۆی ئەو کەش و بارودۆخە نائاساییە و سەیرە دەکرد، بەڵام ئەوەی کە لە کۆڵی نەدەبووەوە و بەردەوام لە بەرچاویدا خۆی دەنواند، وێناگەلی گوڵ بوو. باخەگوڵێکی جوانی هێنایە بەرچاوی، ڕۆژێکی ڕۆشن و گەرم بوو؛ تەنانەت دەکرا بڵێیت زۆر گەرم. پێدەچوو ئەو ڕۆژە پشوو بێت. بەڵێ، ڕۆژی یەکشەممەی سیانەی پیرۆز بوو[1]. کووخێکی گوندیی دڵگیر و فرە ڕازاوە بە مۆدێلی ئینگلیزی کە ڕیز ڕیز گوڵی خۆشبۆ چواردەوریی گرتبوو. لە هەیواندا، ئەڵقەگەلی لاولاو لەو ناوە ئاڵابوو و سوورەگوڵ هەموو هەیوانەکەی

---

١. ڕۆژی دابەزینی ڕۆحئەلقودس بۆ لای حەوارییونی (یەکشەممەی پیرۆز، یان یەکشەممەی سیانەی پیرۆز یەکێک لە گرنگترین و پیرۆزترین بۆنە و ڕۆژەکانی کڵێسای مەسیحییە. شوێنکەوتووانی ئایینی مەسیحی و بەتایبەت ئەرتەدۆکسەکان بەپێی نەریتە باوەکان یادی ئەم ڕۆژە دەکەنەوە و ناوی بۆنەکەش لە بیرۆکەیەکی سەرەکیی ئایینی مەسیحییەوە سەرچاوەی گرتووە کە خودا تاک و تەنیایە، بەڵام لە بنەڕەتدا سێ پێکهاتەیە: باوک، کوڕ، ڕۆحی پیرۆز.) مەسیح و لە گرنگترین ڕۆژەکانی ڕۆژژمێری کڵێسای ئەرتەدۆکسی ڕووسیا کە بە ناوی پشووی سەوزیش بەناوبانگە، چونکە بەپێی نەریتە دێرینەکان، ماڵ و کڵێساکان بە گوڵ و سەوزایی و گەڵا و چڵی درەختەکان دەڕازێننەوە. «و. ف»

تەنیبووەوە. قالیگەلی گرانباییان لە پلیکانە ڕووناک و جوانەکاندا ڕاخستبوون و گیاگەلی دەگمەنیان خستبوونە ناو گوڵدانە چینییەکانەوە. سەرنجی سڤیدریگایلۆڤ بەتایبەت چووە سەر پەنجەرەکان و دەستەگەلی گوڵەنێرگزی ناسک و سپیی پشت پەنجەرەکان بەو بۆنە توندەیانەوە، بەسەر لاسکە ئەستوور و سەوز و بریقەدار و درێژەکانیانەوە ملیان کەچ کردبوو. نەیدەویست لە نێرگزەکان دابڕێ، وەلێ ڕێی پلیکانەکانی گرتە بەر و بەرەو ژوورێکی دانیشتنی کراوە و بنمیچبەرز کەوتە ڕێ. هەم ژووری دانیشتنەکە پڕ لە گوڵ بوو، هەم پشت پەنجەرەکان، هەم ئەو دەرگانەی کە بە ڕووی هەورەبانەکەدا دەکرانەوە و تەنانەت خودی هەورەبانەکەش. چیمەنێکی نوێ و خۆشبۆیان بەسەر ڕووی ژوورەکەدا پژاندبوو و پەنجەرەکانیش کرابوونەوە و هەوایەکی تازەی سووک و فێنک دەشنایە ژوورەوە. باڵندەگەلی ژێر پەنجەرەکان کەوتبوونە چرین و لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا، تابووتێک بەسەر مێزێکی داپۆشراو بە کفنێکی ساتنی سپییەوە بوو. لەناو تابووتەکەدا، ئاوریشمێکی ئەستووری سپی بە لێواری قاییمی تۆڕیی سپی و ئەڵقەگەلی گوڵ لە هەر چوار لایەوە هەبوو. لەنێو گوڵەکاندا، کچێک بە تۆڕێکی سپی، دەستی گوشراو بە سنگەوە، سڕەوتبوو و دەتگوت لە مەڕمەڕ دایانتاشیبوو. قژە کاڵەکانی کراوە و تەڕ بوون و ئەڵقەیەکیش لە سوورەگوڵ بە سەرییەوە بوو. ڕووخساری بە لادا جددی دیار بوو و ئەویش هەر دەتگوت لە مەڕمەڕ دایانتاشیبوو. لێوە ڕەنگپەڕیوەکانی زەردەخەنەیەکی تەژی لە داخێکی بێکۆتا و پەژارەیەکی گەورەیان بەسەرەوە بوو.

سڤیدریگایلۆڤ کچەکەی دەناسی. ئەوێ نە کۆتەڵی پیرۆزی لێ بوو و نە مۆمی داگیرساوی دەوری تابووت. هیچ دوعایەکیش لەئارادا نەبوو. کچۆڵەکە خۆی لە ئاودا خنکاندبوو. تەمەنی تەنیا چواردە ساڵ بوو، بەلام دڵی شکابوو و نەیتوانیبوو بەرگەی ئەو سووکایەتییە

بگرێت کە زەین و ڕۆحی منداڵانەی ئەوی هەراسان و سەراسیمە کردبوو؛ ئەو بێڕێزییەی کە ڕۆحی پاک و بێگەردی فریشتانەی ئەوی دابووە بەر لافاوی سووکایەتی و بێحورمەتی؛ سووکایەتییەک کە لە ناوجەرگەی تاریکیی سارد و شێداری شەودا، دواهەمین هاواری بێهوایی و نامورادیی لە سنگی ئەوەوە دەرهێنابوو و ئیدی نەبیستراوانە لە نەڕەی بادا ون بووبوو...

سڤیدریگایلۆڤ هاتەوە سەر خۆی، لەسەر تەختەکە هەستایەوە و چووە بەرپەنجەرە. کتوکوێرانە دەسکی پەنجەرەکەی دۆزییەوە و کردییەوە. با بە توورەییەکی ژەهراوی و گوژمەوە خۆی بە ژوورە بچووکەکەدا کرد و ڕووخسار و سنگی ئەویی کە تەنیا یەک کراسی لە بەر کردبوو، بە شەونمە بەستووەکانی تەزاند. لەژێر پەنجەرەکەدا، باخچەیەکی بچووکی لێ بوو، شتێکی وەک سەیرانگە. بێگومان لەوێش مێزگەلی چای و بەزمی گۆرانیگوتن بە درێژایی ڕۆژ بەردەوامە. ئێستە ئیدی دڵۆپەگەلی باران کە بەسەر درەخت و دەوەنەکانەوە بوو، لەگەڵ باکەدا خۆی بە پەنجەرەکەدا دەکرد. تاریکییەکی هێندە نووتەک بوو وەک ئەوەی سەدان مەتر لەژێر زەویدا بێت و سڤیدریگایلۆڤ تەنیا دەیتوانی ڕەشێتیی لەرزۆکی شتەکانی چواردەوری ببینێت. ئەنیشکەکانیی خستنە سەر لێواری پەنجەرەکە و دانەوی و پێنج خولەکێک لە ناوجەرگەی تاریکی ڕاما. لە دوورەدەستەوە تەقەیان کرد، سەرەتا تەقەیەک و دواتر دانەیەکی دی. شریخەی گوولەی ئاگادارکردنەوە[1] لە تاریکیی شەودا دەنگی دایەوە. سڤیدریگایلۆڤ بیری کردەوە: *ئەها، تەقەی ئاگادارکردنەوەیان کرد، ئەمە یانی ئاوی ڕووبار وا هەڵدەستێ! بەر لە داهاتنی بەیانی ئاو بە شەقامەکانی*

---

[1] سیستمێکی ئاڵۆزی ئاگادارکردنەوە هەبوو کە بە تەقاندنی گوللە نیشتەجێیانی پیتەربورگیان لە ئەگەری مەترسیی هەڵچوونی ئاو و هەستانی لافاو و... وریا دەکردەوە. «و. ف»

*خوارەوەدا هەڵدەســـتن و لافاو ئەمبار و ژێرزەمینەکان دەگرێتەوە. مشـــکی ژێرزەمینەکان بەدەم مەلەکردنەوە دەردەچن و خەڵکیش، لە کاتی گواســتنەوەی شـــەخەڵەکانیاندا بۆ نهۆمی ســـەرەوە، با و باران دەدەنە بەر نەفرەت. تۆ بڵێی کاتژمێر چەند بێ؟* هێشــتا فکری کاتژمێر و وەخت بە باشــی بە مێشــکیدا ڕانەبردبوو کە لەو نزیکانەدا، زەنگی کاتژمێر ســـێ لێدرا. *ئەها! یانی کاتژمێرێکی تر دونیا ڕۆشـــن دەبێ! کەواتە بۆچی ڕاوەســـتم؟ هەر ئێســـتە ڕاســـتەوخۆ دەچمە پارکی پیترۆفســـکی. دەوەنێکی گەورە و تەڕ دەدۆزمەوە، لەوانەی کە هەر بەری کەوتی دونیایەک دڵۆپەئاو بەسەرتدا دابکەن!*

خۆی کشـاندە دواوە، پەنجەرەکەی پێوە دا، مۆمەکەی داگیرسـاند و هێلەک و کۆت و کڵاوی پۆشــی و ژوورەکەی جێ هێشــت. ڕووی لە ڕێی ڕاڕەوەکە کرد تا بەشـکووم چاوی بە پێشــخزمەتە شـڕپۆشـەکە بکەوێت –کە ئێســـتە لە ئەمبارێکدا، لە شــــوێنێک و لە ناوەڕاســـتی کۆمەڵێک شـــەخەڵ و بنەمۆمی ســــووتادا، بێ گومان خەوتبوو– جا پارەکەی بداتێ و دواجار میوانخانە جێ بهێڵێت. *باشـــترین کاتە! هیچ کاتێکی لەمە باشترم بۆ ئەم مەبەستە دەست نەدەکەوت!*

ماوەیەک بە ڕاڕەوێکی تەســـک و درێژدا ڕێی کرد، بەڵام چاوی بە کەس نەکەوت و پێشـخزمەتەکەشـی نەدۆزییەوە، خەریکبوو بە دەنگی بەرز بانگی بکات کە کتوپڕ، لە ســــووچێکی تاریکی نێوان دۆڵابێکی کۆنە و دەرگەیەکدا، شـــتێکی نامۆ و گیانداری بەرچاو کەوت. مۆم بەدەست دانەوی و سەیری کرد ئەو شتە، کچۆڵەیەکی لەرزلێنیشتووە کە ئەوپەڕی پێنج ساڵ دەبێت و وا خەریکە دەگریێ، سەراپاشی وەک زەویشـــۆری ماڵ لە ئاودا خووســـاوە. پێنەدەچوو لە ســـڤیدریگایلۆڤ ترسابێت، وەلێ چاوە ڕەش و گەورەکانی بە ماتییەکی تەلیسماوییەوە لەویان دەڕوانی. جاروبار هەنســـکی دەدا، وەک منداڵانێک کە دەمێک بێت بگرین، بەڵام وا خەریکە ژێر دەبنەوە و، لە هەمـان کـاتـدا، بۆی

هەیە هەمدیســـــان لە پرمەی گریان بدەنەوە. کچۆڵەکە ڕەنگپەڕیو و ماندوو بوو و، لە سەرماندا، تەزیو و بێهەست کەوتبوو. *چۆن خزاوەتە ئەم ســووچەوە؟ بێ گومان لێرە خۆی شـــاردووەتەوە و بە درێژایی شــەویش نەخەوتووە.* سـڤیدریگایلۆڤ کچۆڵەکەی دایە بەر پرســیار. کچۆڵەکە کتوپڕ ژووژ بووەوە و بە خرۆش و زمـانێکی منـداڵانەوە، شـــتگەلێکی لەبارەی *دایە*وە گوتن و، ئەوەی کە *دایە* لێی دەدا، چونکە ئەو فنجـانەکەی شــــکـانـدووە. کچەکە هەر وا پەلەپەل دەدوا و سڤیدریگایلۆڤ تەنیا توانیی لەنێو قسەکانیدا سۆسـەی ئەوە بکات کە ئەو منداڵە بە شــێوەیەکی باش پەروەردە ناکرێت و دەســـتیان لێ بەرداوە و، دایکی، کە ڕەنگە چێشـتلێنەری سـەرخۆشـی میوانخانەکە بێت، بێگومان لەوی داوە و خراپ چاوترســـێنی کردووە. منداڵەکە، دوێنێ ئێوارە، فنجانێک کە هی دایکی بووە، دەشکێنێت و پاشـانیش بە جۆرێک ترسی لێ دەنیشێت کە بۆی هەڵدێ و تا ماوەیەک لە شوێنێکی دەرەوەی میوانخــانەکە و بە بەر بــارانەوە خۆی دەشـــــارێتەوە. دواجـاریش ڕێگەکەی دەدۆزێتەوە و دەگەڕێتەوە میوانخـانەکە، بەڵام لەپشـــت دۆڵابەکەوە دەگیرســـێتەوە و شــــەو لەوێ دەمێنێتەوە، جا ئەوەش بە ترســـاوی و گریان بەدەســـت تەڕیی جلەکانی و تاریکی و تۆقین لەو لێدانە پیسەی کە بڕیارە بیخوات. سڤیدریگایلۆڤ کچۆڵەکەی گرتە باوەش و گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی و لەسەر تەختەکەی داینیشاند. پاشـــانیش جلەکانی لە بەر داکەند. کچۆڵەکە گۆرەویی لە پێدا نەبوو و پێڵاوە دڕاوەکانی بە جۆرێک خووسابوون کە دەتگوت بە درێژایی ئەو مـاوەیە لە گۆمـاوێکدا بووە. کە جلەکـانی کچۆڵەکەی داکەندن، ئەوی لەسـەر تەختەکە ڕاکشــاند و پەتۆکەی لە ســەراپایەوە پێچا. کچۆڵەکە یەکســـەر خەو بردییەوە و ســـڤیدریگایلۆڤیش لە دونیای خەیاڵاتە وەڕەزکەر و خەمگینانەکانیدا ڕۆچوو.

*باشـە من بۆچی خۆم تووشـی ئەم گێچەڵە کرد؟* کتوپڕ هەڵچوو و چەپەڵانە بەو ئەنجامە گەیشت کە، *شـێتییەتی بەدوای شـێتییەتیدا! ئای لەو گەمژەییە!* لەو هەڵمەتی تووڕەییەدا مۆمەکەی هەڵگرت تـا هەمدیسـان بچێتە شـوێن پێشـخزمەتە شـرپۆشـەکە و زووتر فریای کـاری خۆی بکەوێت. *دەی بە نەفرەت بێ ئەم منـاڵە!* لەبەرخۆیەوە ئەمەی گوت و دەرگەی کردەوە تا بڕوات، بەڵام دیسـان گەڕایەوە تا بزانێت ئاخۆ کچەکە خەوتووە یان نا. بە شـێنەیی قەراخی پەتۆکەی بەرز کردەوە. منداڵەکە، باش و قووڵ خەوتبوو؛ لەشی لەژێر پەتۆکەدا چاک گەرمی بووبووەوە و گۆنا ڕەنگپەڕیوەکانی سـوورایییەکیان تێ گەڕابوو. وەلێ سەیر ئەوە بوو کە سوورایی کوڵمەکانی زەقتر بوو لە گوڵڕەنگیی ئاسـایی گۆنای منداڵان. سـڤیدریگایلۆڤ بیری کردەوە: *تای لێیە!* وەک ئەو پەڵە سـوورانە وا بوو کە دوای خواردنەوە بەسـەر گۆنـاوە دەردەکەون، دەتگوت یەک پەرداخی لێوانلێویـان دەرخواردی کچۆڵەکە دابوو. لێوەکانی گەرم و داگیرسـاو و سـوور بوون و بڵێسـەیان دەدا... بەڵام ئەی ئەمەیان چی بوو؟ وای هاتە بەرچاو کە برژانگی درێژ و ڕەشی کچۆڵەکە وا دەترووسکێن، دەتگوت پێڵووەکانی وا لێـک دەکرێنەوە و نیگـایەکی پڕ لە مەکر و فریو بە بریقەیەکی باڵقەوە سـەر دەردەهێنێت، وا دیار بوو کچۆڵەکە نەخەوتووە و ئەوە تەنیا نواندنێک بووە. بەڵێ، هەر ئەوە بوو! لێوەکانی خەریک بوو بە زەردەخەنەیەک لێک دەترازان و بە جۆرێک گۆشـەی لێوی دەلەرزی وەک ئەوەی بیەوێت بەر بە زەردەخەنەکەی بگرێت. بەڵام هەر لەو سـاتەدا، وازی لە بەرگریکردن هێنـا و هێڵی دەمی بە پـانتـایی ڕووخسـاری گۆڕا بۆ زەردەخەنەیەک؛ بە جۆرێـک کە ددانەکـانی دەرکەوتن. شتێکی بێشەرم و خرۆشێنەر لەو ڕووخسارەدا دەرکەوت کە ئیدی لە ڕووخسـاری منداڵێک نەدەچوو: بێحەیایی. دەموچاوی سۆزانییەکی لە بەرچاودا بوو، دەموچاوی شەرمشکاوی سۆزانییەکی

فەرەنسیی شەوگەڕ، دەتگوت خودی *کامیلیا*یە[1]. ئێستە ئیدی هەردووک چاوی کچە کرابوونەوە و نیگایەکی دنەدەر و بێشەرمی دەگرتە سڤیدریگایلۆڤ. نیگای شاد بوو و ئەوی بانگهێشت دەکرد... زەردەخەنە و ڕووخساری ناپاک و پیسی کچۆڵەکە شتێکی بێڕادە تۆقێنەر و هەژێنەریان تێدا بەدی دەکرا. *ئەوە چی دەبینم؟ ئاخر... منداڵی پێنجساڵە؟* سڤیدریگایلۆڤ بە تۆقینێکی ڕاستەقینەوە لەژێر لێو قسەی دەکرد. ئاخر یانی چی؟... کچۆڵەکە ئێستاکە بەرەو ئەو وەرسووڕابوو، ڕووخسارە بچووکەکەی یەک پارچە ئاگر بوو و دەستەکانیشی بەرەو ئەو درێژ...

*ئەی نەفرەتی!* سڤیدریگایلۆڤ ئەم جارەیان هاواری کرد و دەستی هەڵبڕی تا لە کچۆڵەکە بدات، بەس هەمان کات لە خەو ڕاچڵەکی.

هێشتا هەر لە هەمان جێخەودا بوو و هەمان پەتۆی لە سەرتاپێی خۆیەوە پێچابوو. مۆمەکە دانەگیرسابوو و ڕۆشنایی ڕۆژ شەپۆلشەپۆل لە پەنجەرەکەوە دەهاتە ژوور.

*بە درێژایی شەو مۆتەکەم دەبینی!* بە توورەییەوە لە جێگەکەی هەستا. لەشی کوترابوو و ئێسقانەکانی چڵیان دەدا. لە دەرەوە تەمێکی چڕ بوو و مەودای بینینی بڕی نەدەکرد. نزیکەی کاتژمێر پێنج بوو. خەوێکی باشی کردبوو! هەستایەوە و جلە شێدارەکانیی لە بەر کردن. لە گیرفانیدا دەستی بەر دەمانچەکە کەوت، دەریهێنا و پاشان دانیشت. دەفتەرۆکەیەکی لە گیرفانی هێنایە دەر و هەر لە لاپەڕەی یەکەم و لە شوێنێکدا کە بە تەواوی دیار بێت، بە خەتێکی گەورە چەند دێڕێکی نووسی. جارێکیش خوێندییەوە و لە هەمان باردا، بە ئەنیشکی پاڵدراو بە مێزەکەوە، فکر و خەیاڵ بردییەوە. دەمانچە و دەفتەرۆکەکە

---

[1]. ئاماژەیە بە کەسایەتیی ناسراوی ڕۆمانی *خاتوو کامیلیای ئالێکساندەر دوما*. «و. ف»

لەتەکییەوە بوون. چەند مێشـێکیش کە بێدار بووبوونەوە، سـوورێکیان دا و بەسـەر ئەو گۆشـت گوێرەکەیەوە نیشـتنەوە کە لە دوێنێشـەوەوە هەر وا بە دەسـتلێنەدراوی بەسـەر مێزەکەوە بوو. سـڤیدریگایلۆڤ بە مێشـــەکاندا وڕ ما و هەوڵی دا بە دەســـتەڕاســـتی کە ئازاد بوو، دانەیەکیان بگرێت. ئەوەندە تەقەللای دا تا ماندوو بوو، بەڵام نەیتوانی هیچکامیان بگرێت. دواجار، ڕاچەنی و بەوە سـەرسـام بوو کە چۆن لەو دۆخەدا بەبۆنەی وەها کارێکەوە خۆی دواخستووە. هەستایەوە و لێبڕاو لە ژوورەکە چووە دەر.

خولەکێک دواتر هەنگاوی نایە سـەر شـەقام. چڕەتەمێکی شـیرئاسـا بە هەورازی شـارەوە خۆی شـۆڕ کردبووەوە. سـڤیدریگایلۆڤ لە پیادەڕێ تەختەییە پیس و خزەکە تێپەڕی و بەرەو لای نێڤای بچووک ڕۆیشـت. ئاوی نێڤای بچووکی دەهێنایە بەرچاوی کە چۆن لە شـەودا هەڵکشـاوە و دوورگەی پیترۆفسـکی و ڕێگەگەلی تەڕ و سـەوزایی و درەخت و دەوەنە خووساوەکان... بەڵێ، دواجار، ئەو دەوەنەی خۆی... بە بێتاقەتی کەوتە سـەیرکردنی خانووگەلی چواردەور و هەوڵی دا بیری بە بابەتێکی دیکەوە قاڵ بکات. لە شـەقامەکەدا نە عەرەبانەچی دیار بوو و نە تەنانەت ڕێبوارێکیش تێدەپەڕی. دیمەنی خانووگەلی ڕێکوپێکی زەردی بریقەدار بەو پەردە داخراوانەیـانەوە، پیس و خەمگین دەردەکەوت. سـەرما و شـێ خەریکبوو هەموو لەشـیان دادەگرتەوە، کەوتە هەڵلەرزین. لە ڕێگەدا، جاروبار تووشی دوکانگەلێک دەبوو و نووسـراوی بان دەرگەکانیانی بە سـەرنجێکی تایبەتەوە دەخوێندەوە. دواجـار گەیشـتە ئەوپەڕی پیـادەڕێ تەختەییەکە و لەبەرانبەر ماڵێکی بەردینی گەورەدا ڕاوەسـتا. سـەگێکی پیس کە یەک بە یەکی ئێسـقانەکانی هەڵدەلەرزین، لەوبەری ڕێگەکەوە هاتە بەردەم سـڤیدریگایلۆڤ و کلکیشـی بە ناوگەڵیدا کردبووەوە. بەدمەسـتێک کە پاڵتۆیەکی پانوپۆڕی ناقۆڵای لە بەردا بوو، بە دەمدا کەوتبووە سـەر

پیادەڕێکە و لە مردوو دەچوو. سڤیدریگایلۆڤ تەماشایەکی کرد و درێژەی بە ڕێگەکەی دا. تاوەرێکی بەرز لە لای چەپییەوە بوو. *بەخبەخ!* لەبەرخۆوە بیری کردەوە: *خۆیەتی، باشترین شوێن ئەئێرەیە! بۆچی بڕۆم تا پیترۆفسکی؟ لانیکەم شایەتی فەرمیشم هەیە لێرە...* ئەم فکرە تازەیە، بزەیەکی هێنایە سەر لێوی و خۆی بە شەقامی سیژنسکایادا کرد کە ئەو خانووە گەورەیە بەو بورجە بەرزەیەوە[1] لەوێ هەڵکەوتبوو. لەبەردەم دەرگەی سەرەکیی ماڵەکەدا، کە داخرابوو، پیاوێکی وردیلانە ڕاوەستابوو و بە شان پاڵی بە دەرگەکەوە دابوو. کۆتێکی سەربازیی خۆڵەمێشیی پۆشیبوو و کڵاوخوودێکی برۆنزیی وەک هی ئەخیلیسی[2] کردبووە سەری. پاسەوان، نیگایەکی خەواڵووی قورس و خەمساردانەی گرتە سڤیدریگایلۆڤ. ڕووخساری هەمان باری ناڕەزایی و ژاکاویی تاهەتایی هەبوو کە زۆر تاڵ و ناحەز بە ڕووخساری جوولەکەکانەوە -یەک بە یەکیان- دەردەکەوێت. ئەو ئەخیلیسە و سڤیدریگایلۆڤ چەند خولەکێک لە بێدەنگیدا لێک ڕامان. دواجار ئەو ئەخیلیسە بۆی یەکلایی بووەوە کە بە هیچ شێوەیەک ئاسایی نییە مرۆڤێک کە بە ڕواڵەت سەرخۆشیش نییە، لە دووریی سێ هەنگاوێک لەوەوە ڕابوەستێت و واقووڕ تەماشای بکات و یەک وشەشی لە دەم نەیێتە دەر.

- ئێوە ئیشتان چییە لێرە؟

ئەخیلیس ئەمەی پرسی، وەلێ نە هاتە پێش و نە شێوازی ڕاوەستانەکەیی گۆڕی.

---

[1] بە گوتەی *ئانا گریگۆریێنا*، ئەم بینایە لە بنەڕەتدا بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسە لەلای ڕووباری نێڤا، فلکەی بولواری گەورە. «و. ف»

[2] Achilles: ئەخیلیس پاڵەوانی سەرەکیی ناو ئیلیادەی نووسەری بەناوبانگ «هۆمەر»ە، کە پاش ئەوەی پاژنەی بریندار دەکرێت، دەمرێت. «و. ک»

سڤیدریگایلۆڤ وەڵامی دایەوە:

– هیچ، براله! بەیانی باش.

– ئێرە شوێنی ئەوە نییە!

– بەنیازی فەرەنسام، براله.

– فەرەنسا؟

– ئەمریکا.

– ئەمریکا؟

ســڤیدریگایلۆڤ دەمانچەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و میلی هێنایەوە. ئەخیلیس برۆیەکیی هەڵبڕی.

– خۆ گوتم! ئێرە شوێنی ئەوە نییە! ئێرە شوێنی گاڵتە و شت نییە!

– بۆچی دەبێ ئێرە شوێنی ئەوە نەبێ؟

– لەبەر ئەوەی ئێرە شوێنی ئەوە نییە ئیتر!

– باشــە، براله، ئەوەی ڕاســتی بێ بەلامەوە گرنگ نییە. شــوێنێکی زۆر باشــیشــە. گەر لێتیان پرســی، تەنیا بڵێ گوتوویەتی وا دەڕۆم بۆ ئەمریکا.

سڤیدریگایلۆڤ دەمانچەکەی نا بە لاجانگی ڕاستییەوە.

ئەخیلیس هاواری چووە ئاسمان و وەک ئەوەی لە خەو ڕاچڵەکیبێت، چاوەکانی خەریکبوون لە کاسەوە دەردەپەڕین:

– ئاخر لێرە ناکرێ! شوێنی ئەوە نییە ئێرە!

سڤیدریگایلۆڤ پەلەپیتکەکەی چرکاند.

## حەوت

عەسری هەمان ڕۆژ، کاتژمێر لە شەش لایدابوو کە ڕاسکۆڵنیکۆف بۆ دیدەنیی دایک و خوشکی ڕۆیشت بۆ ئەو ئەپارتمانەی کە ڕازومیخین لە بینای باکالییفدا بۆ ئەوانی گرتبوو. پلیکانەڕێکە ڕاستەوخۆ لە شەقامەکەوە دەچووە سەرێ. ڕاسکۆڵنیکۆف بێتاقەت ڕێی دەکرد، وەک ئەوەی هەر لە بنەڕەتەوە دوودڵ بێت کە ئاخۆ بڕوات یان نا. بەڵام ئێستاکە ئیدی هیچ شتێک نەیدەتوانی ناچاری بکات بگەڕێتەوە و بڕیاری خۆی دابوو. بە زەینیدا ڕابرد: *خۆ ئەوان هێشتا هیچ نازانن و ئەوەشیان بۆ ئاسایی بووەتەوە کە وا بزانن من تەواو نیم و زۆر سەیر و نائاساییم!* سەروسیمای تۆقێنەر بوو، جلەکانی شڕ و پیس و بە بارانی شەو خووسابوون. ڕووخساری لەتاو شەکەتی و بەهۆی با و باران و کێشمەکێشی دەروونییەوە لە ماوەی بیستوچوار کاتژمێری ڕابردوودا، کرژ بووبوو. سەرانسەری شەوی ڕابردووی بە تەنیا بەسەر بردبوو و هەر خواش دەزانێت لە کوێ بووبوو. وەلێ هەرچۆنێک بووە توانیبووی بڕیاری خۆی بدات.

لە دەرگەی دا. دایکی دەرگەی کردەوە. دونیا لە ماڵەوە نەبوو و تەنانەت بە هەڵکەوت خزمەتکارەکەش لە دەرێ بوو. پولخێریا سەرەتا لە خۆشیان زمان شکایە دەمی و پاشان توند دەستی ڕاسکۆڵنیکۆفی گرت و کێشی کردە ژوورەکەوە.

– وای، ئەوە تۆی... ئەوە تۆی؟ یانی ئەوە خۆتی؟

پولخێریا لە خۆشیان زمانی گیرابوو، ئێستە کەوتبووە سەر هەوای قسەکردن.

– ڕۆدیا، بێتاقەت مەبە کە ئاوا گەمژانە بە فرمێسک و ئاهەوە پێشوازیم لێ کردی، باشە؟ تووڕەمە ئیترا خۆ ناگریم، ئەسڵەن وا پێدەکەنم، ئەوە فرمێسکی شادییە! وات زانی خەریکم دەگریم؟ نا، زۆریش دڵخۆشم و شادی شادم، وەلێ تووشی خووێکی گاڵتەجاڕانە بوومە هەر کە شتێ ڕوو دەدا، یەکسەر فرمێسک بە چاومدا دێتە خوار! لە کاتی مردنی باوکتەوە وام لێ هاتووە. لەو کاتەوە هەمیشە ئامادەی گریانم! هەرچی ڕوو بدا، فرمێسک بە چاومدا دێتە خوار! دانیشە، کوڕەکەم، باوانەکەم! ماندووی بێ گومان. ئەرێ، وا خۆم دەبینم کە ماندووی. ئۆو، ئۆو! چییە وا قوڕاوی بووی!

– بە درێژایی دوێنێ بە بەربارانەوە بووم، دایە...

ڕاسکۆڵنیکۆف ویستی لەسەر وەڵامدانەوەی دایکی بەردەوام بێت.

– نا، نا!

بەڵام پولخێریا هەراسان قسەی پێ بڕی.

– نەکا لات وابێ بەتەمام بەو شێوازە ژنانە و دەبەنگانەیەی خۆم یەک دووت لەگەڵ بکەم، ها؟ ترسای سەد دانە پرسیارت لێ بکەم. نا، خەمت نەبێ. تێدەگەم، چاک لە هەموو شتێ تێدەگەم. ئێستە ئیتر بە تەواوی لە نەریتی ئێرە حاڵی بوومە و قەبووڵیشی دەکەم کە دابونەریتێکی زۆر باشتریشە! دواتر توانیم تێبگەم: دەی ئاخر بۆچی دەبێ من سەر لە پلان و کارەکانی تۆ دەربکەم و لە ئامانجەکەت تێبگەم، یان بۆچی دەبێ چاوەڕوانی ئەوەت لێ بکەم کە بۆم ڕوون بکەیتەوە؟ تۆ هەر خوا دەزانێ کە چ کەڵکەڵە و بەرنامەیەکت هەیە، چ نەخشەیەکت بۆ داهاتووت کێشاوە و ئێستە وا چ بیرگەلێکی نوێ لە سەرتدا چەکەرە دەکەن. کەواتە من نابێ زۆرت بۆ بهێنم و هەر

بەســـەرتدا ببۆڵێنم تا بۆم باس کەی کە چی لە مێشــکتدا دەگوزەرێ. ئای خوایە! باشــە ئێســتە بۆچی وەک شــێت ئەملا و ئەولا دەکەم؟ بە ڕاســـت دەزانی ڕۆدیا گیان، وا خەریکم بۆ ســـێیەم جار گوتارەکەت دەخوێنمەوە کە لەو گۆڤارەدا چاپیان کردووە. دیمیتری پراکۆفیچ بۆی هێناوم. کە گوتارەکەتم بینی، دەمم بەش بووەوە. لەبەرخۆمەوە بیرم کردەوە، *فەرموو، خانمخاســـی گێژ!... کەواتە ئەو ســـەری لەناو ئەم جۆرە شــتانەدایە! دەی، ئیتر هەموو شــتێ ڕوون بووەوە. کەســانی خوێندەوار و تێگەیشــتوو وان. لەوانەیە ئێســتەش ئایدیاگەلێکی تازەی لە ســـەردا بێ و خەریکی ســـەنگوســـووککردنیان بێ، کەچی منیش بەگیرم هێناوە و ئەشـــکەنجەی دەدەم!* ئەرێ، خوێندمەوە باوانەکەم! هەڵبەتە سەرم لە زۆربەی دەرنەچوو. وەلێ دەی، خۆ ئەمە سەیر نییە! من کێم تا بمەوێ لەم جۆرە شتانە تێبگەم؟

– ئادەی ئەو گۆڤارەم بدەرێ، دایە گیان.

ڕاســـکۆڵنیکۆف گۆڤارەکەی وەرگرت و تەماشـــایەکی گوتارەکەی کرد. ســـەرەڕای ئەوەی نە تاقەتی هەبوو و نە کات و هەلومەرجەکەی گونجاو بوو، هەمان ئەو هەســـتە تاڵوشـــیرین و ســـەیرەی تێگەڕا کە نووســـەر لە کاتی بینینی یەکەمین بەرهەمیدا ئەزموونی دەکات؛ جا بەتایبەت گەر ئەو کەســـە تەمەنی بیســـتوســـێ ســـاڵیش بێت. بەڵام هەســـتەکەی لە چاوتروووســـکاندنێکدا شـــوێنبزر بوو. کە چەند دێڕێکی خوێنـــدەوە، دەموچـــاوی کرژ بوو و لەتـــاو دڵەڕاوکێ دڵی کەوتە خورپاندن. ململانێ دەروونییەکانی چەند مانگی ڕابردوویی هێنانەوە بیر و گۆڤارەکەی بە ڕق و تووڕەییەوە فڕێدایە سەر مێزەکە.

– هەموو قســـەی من ئەمەیە، ڕۆدیا: ڕەنگە من دەبەنگ بم، وەلێ وا دەبینم کە زۆر زوو دەبیتە یەکێ لە بیرمەندە گەورەکانی ڕووســیا، جا گەر گەورەترین و باشترینیشیان نەبێ! کەچی ئەو ماڵوێرانانەش وایان دەزانی تۆ شێت بووی! هەهەهە! تۆ نازانی، وەلێ ئەوان هەر بە ڕاستی

وای بۆ چووبوون. ئـای لەو کرمە قێزەونـانە کە بەو نـاوەدا لوول دەخۆن! ئاخر بۆ مەگەر خۆیان کێیان پێ دەڵێن تا بتوانن لێهاتوویی ڕاستەقینە و بلیمەتی دەستنیشان بکەن؟ ئەی دونیا... دونیاش خەریک بوو بـاوەڕی دەکرد کە تۆ شـــێت بووی، چی لەبـارەی ئەمەیـانەوە دەڵێی؟ باوکیشت دوو جار بابەتێکی بۆ گۆڤارەکان نارد. جاری یەکەم شـیعرەکانی ناردن. دەسـتنووسـەکەیم لایە هێشـتا. نیشـانتی دەدەم. جـارێکی تریشـــیـان ڕۆمـانێکی تەواو بوو. لێی پـاڕامەوە لێگەڕێ نووســـخەیەکی لەســـەر بنووســـمەوە. چ دوعا و نزایەکمان کرد تا پەســـەندیان بکەن... کەچی ئاخرییەکەشـــی پەســـەندیان نەکردن! هەر چەند ڕۆژێ لەمەوبەر بوو، ڕۆدیـا، کە خەریک بوو بە بینینی دۆخی خواردەمەنی و جلوبەرگ و بە گشـتی ڕەوشـی ژیانت لەخۆ دەچووم. وەلێ ئێســـتە وا تێدەگەم کە چەنـدە دەبەنـگ بووم، چونکە تۆ بەم زیرەکی و لێهـاتوویییەتەوە دەتوانی هەر پلە و پێگەیەکـت بوێ، پێی بگەی. ئێستەش کار و پیشە و پلە و ئەم شتانەت بەلاوە گرنگ نین و خۆت ناتەوێن، لەبەر ئەوەی بیرت بە پرسگەلێکی زۆر زۆر گرنگترەوە قاڵە!

– دونیا لەماڵەوە نییە، دایە گیان؟

– نا، لە ماڵەوە نییە. لەم دواییانەدا زۆر کەم دەیبینم، زۆربەی کات بە تەنیا جێم دەهێڵێ. وەلێ دیمیتری پراکۆفیچ کە خوا بیپارێزێ، دێ و ســـەرم لێ دەدا و دایمەش باســـی تۆ دەکا. زۆر خۆشـــتی دەوێ و ڕێزت لێ دەنێ، باوانەکەم. ناڵێم دونیا ئاگادارم نییە یان لە ئاســـتمدا کەمتەرخەمە. نا، هیچ گلەییەکیشـــم نییە. دەی ئێتر، کەســـایەتیی ئەو جۆرێکە و کەســـایەتیی منیش جۆرێکی تر. لەم دواییانەشـــدا دەڵێی کتوپڕ خـــاتوون نهێنیی تـــایبەت بە خۆی هەیە! خۆ من هیچم لەو دووانەتان نەشاردووەتەوە و هیچ نهێنییەکیشم نییە. هەڵبەتە دڵنیام کە دونیا لەوە ژیرترە و جا عاشـــقانەش من و تۆی خۆش دەوێ... بەس

نازانم هەموو ئەم شـــتانە ئاخرییەکەی بە چ لایەکدا دەشـــکێنەوە. زۆر زۆر دڵخۆشـــم کە ئێســـتە هاتی بۆ لام، وەلێ خوشـــکت بەو جۆرەیە دەی، ڕێک لە کاتە هەســـتیارەکاندا ون دەبێ! هەر کە پێی نایە ماڵەوە پێی دەڵێم *برا خۆشـــەویســـتەکەت لێرە بوو خاتوون، کەچی ئێوە لە دەرەوە بوون! باشـــە ئەوە لەوساوە لە کوێی، ها؟* تۆش پێویســـت ناکا ئەزیەت بکێشـــی و زۆر نازم بکێشـــی، ڕۆدیا. توانیت ســـەر بدە، خۆ خواخوامە! بەس گەر نەشـــتتوانی گوێی مەدەرێ. من دەتوانم دان بە خۆمدا بگرم و چاوەڕێت بم. گرنگ ئەوەیە من دەزانم خۆشـــت دەوێم و هەر ئەوەندەش بۆ من بەسە. هەرچی بنووسی دەیخوێنمەوە و ورد و درشتی کارەکانیشت لە زمانی هەر کەسێکەوە بێ دەبیستم. خۆشت دێی و سەرم لێ دەدەی. ئیتر چی لەمە باشتر؟ مەگەر ئێستە بۆ ئەوە لێرە نیی تا چاوت بە دایکت بکەوێ و دڵی هێور بکەیەوە؟ دەزانم هەر بۆ ئەوە هاتووی!

لەم بەشـــەی گوتوبێژەکەدا بوو کە فرمێســـک بە چاوی پولخێریادا هاتە خوار.

– ئەی هاوار، دیسان دەستم پێ کردەوە! تۆ بێتاقەت مەبە، دەبەنگم دەی! خوایە، بۆچی هەر وا بە خۆڕایی لێرە لێی دانیشتووم؟

پولخێریا هاواری لێ هەستا و لە جێگەکەی دەرپەڕی.

– قاوەشـــمان هەیە و هێشـــتا بۆم نەهێناوی. ئەمە خۆپەرســـتیی پیرێژنێکە ئیترا ئێستە بۆتی دەهێنم.

– دایە گیان، ئەرک مەکێشـــە تکایە. من دەبێ هەر ئێســـتە بڕۆم. خۆ بۆ قاوەخواردنەوە نەهاتووم. ئێستە تکایە گوێم لێ بگرە.

پولخێریا کەساسانە گەڕایەوە لای کوڕەکەی.

– دایه گیان، هەرچی ڕووی دا، لەبارەی منەوە هەرچیت بیستەوە، هەرچیت لەسەر من پێ بڵێن، هەر وەک ئێستە خۆشت دەوێم؟

ڕاسکۆلنیکۆف ئەمەی بێ پێشەکی و لە ناخی دڵەوە پرسی، دەتگوت بیر لە وشەکان ناکاتەوە و گرنگیشی بە سەنگوسووککردنیان نەدەدا.

– ڕۆدیا؟ ڕۆدیا، چی بووە؟ ئاخر ئەمە پێویستیی بە پرسیارکردن هەیە؟ کێ بەتەمایە لەسەر تۆ قسەم بۆ بکا؟ جا خۆ من بڕوا بە قسەی کەس ناکەم و ئەسڵەن ئامادە نیم گوێ لە قسەشیان بگرم!

– هاتم تا پێتان بڵێم کە لەوە بێخەم بن، من هەمیشە خۆشم ویستوون و ئێستەش دڵخۆشم کە بە تەنیاین؛ ئەسڵەن زۆر بەوە دڵخۆشم کە دونیا لە دەرەوەیە.

ڕاسکۆلنیکۆف لەژێر کاریگەریی هەمان ئەو شەپۆلی خرۆشانی هەستەدا درێژەی بە قسەکانی دا.

– هاتم تا ڕاشکاوانە پێت بڵێم گەرچی زۆریش خەمبار و بێتاقەت بووی، بەس باوەڕت هەبێ کوڕەکەت ئێستە دایکیی زیاتر لە خۆی خۆش دەوێ و لەبارەی منەوە هەر بیرێکی وەک ئەوەت کردبێتەوە کە من دڵڕەقم و خۆشم ناوێی، لە بنەڕەتەوە هەڵە بووە. هەرگیز، هەرگیز لە خۆشویستنت ناکەوم، هەرگیز... دەی، بەسە ئیتر. وام بە بیردا هات کە دەبێ ئەمە یەکەمین هەنگاوم بێ، دەبوو لێرەوە دەست پێ بکەم...

پولخێریا بێدەنگانە باوەشی بە کوڕەکەیدا کرد، سەری ئەوی بە سنگییەوە گوشی و بە هێمنی گریا.

– نازانم دەردت چییە، ڕۆدیا... بریا دەمزانی.

دایکەکە دواجار توانیی ئەمە بڵێت.

– بە درێژایی ئەم ماوەیە وام دەزانی مەسەلە ئەوەیە کە ئێمە پەستت دەکەین و بە تەواوی لێمان بێتاقەت بووی، وەلێ وا ئێستە

دەبینم بڕیارە خەم و خەفەتێکی گەورەتر بێتە سەرووەختت و هەر ئەوەشە کە بێچارەی کردووی. ماوەیەک دەبێ چاوەڕێی وەها ڕۆژێکم، ڕۆدیا! ببوورە کە وا ئێستە باسی دەکەم. بەردەوام ئەو بیرکردنەوەیەم بە مێشکدا دەخولێتەوە و شەوانە خەو ناچێتە چاوەوە. خوشکت دوێشەو بەدەم خەوەوە قسەی دەکرد و هەر لە تۆش دەدوا. شتگەلێکم بەر گوێ کەوت، وەلێ دەی، نەمتوانی باش سەری لێ دەرکەم. لە سەرلەبەیانییەوە تا ئێستە وەک ئەوە وایە بۆ لەداردانم بەرن، هەر چاوەڕێ بووم، هەستێکی نامۆم بۆ ئەوە هەبوو کە بڕیارە شتێ بقەومێ و... فەرموو! دڵم ڕاستی لەگەڵ کردم. ڕووی دا ئیتر. ڕۆدیا! ڕۆدیا، ئێستە بەتەمای کوێی؟ بۆ شوێنێ دەچی؟

– بەڵێ.

– دەمزانی! دەتوانم لەگەڵت بێم... ئەگەر بوونم یارمەتیت دەدا. دونیاش هەر وا. دونیا عاشقانە خۆشی دەوێی... سۆنیاش ئامادەیە، گەر ویستت ئەویش لەگەڵ خۆمان دەبەین. دەزانی، ئێستە ئامادەم بە خۆشحاڵییەوە وەک کچی خۆم باوەشی بۆ بکەمەوە... دیمیتری پراکۆفیچ ڕێکی دەخا هەمووومان پێکەوە بڕۆین. وەلێ.... ئاخر بۆ کوێ؟... ئەوە بۆ کوێ دەڕۆی؟

– ماڵئاوا، دایە گیان.

– چی بووە؟ یانی هەر ئەمڕۆ؟

پولخێریا بە چەشنێک هاواری لێ هەستا وەک ئەوەی بۆ تاهەتا لەدەستی بدات.

– ناتوانم دایە، هەر ئێستە دەبێ بڕۆم...

– ئەی من چی؟ ناتوانم لەگەڵت بێم؟

– نا، وەلێ بکەوە ســــەر ئەژنۆ و لە بارەگەی خوا دوعام بۆ بکە. لەوانەیە خوا دوعای تۆ گیرا بکا!

– لێگەڕێ با دوعای خێرت بۆ بکەم، لێگەڕێ خاچت بۆ بکێشــم. وا دەکەم... ئاە، خوایە! خەریکی چیین ئێمە؟

بەڵێ، راســـکۆلنیکۆف دڵخۆش بوو، زۆریش دڵخۆش بوو کە کەس لەوێ نییە و لەگەڵ دایکی بە تەنیان. دەتگوت دوای ئەو ماوە درێژە و تێپەڕینی ئەو مانگە تۆقێنەرانە، بۆ یەکەمین جار وا دڵی نەرم دەبوو. لەبەردەم دایکیدا کەوتە ســەر ئەژنۆ، پێیەکانی ئەوی ماچ کردن و هەر دووکیان لە باوەشـــی یەکدیدا کەوتنە گریان. پولخێریا ســـەرســـام نەبووبوو و ئەم جارەیان هیچیشی لێی نەپرسی. چەند ڕۆژێک دەبوو تێگەیشتبوو کە وا تووشی نەهامەتییەکی تۆقێنەر دەبێ و ئێستەش وا ئەو ساتە تۆقێنەرە گەیشتبوو.

– ڕۆدیای من، ئازیزەکەم، ئەی منداڵە نۆبەرەکەی من!

پولخێریا بەدەم گریانەوە وەهای دەگوت.

– ئێســـتە ڕێک وەک ئەو ڕۆژانە وای کە زۆر بچکۆلە بووی. ڕێک بەم جۆرە بەرەو لام ڕات دەکرد و لە باوەشــــت دەگرتم و ماچت دەکردم. ئەوسا باوکت هێشتا مابوو و ئێمە زۆر هەژار بووین، کەچی بوونی تۆ لەتەنیشـــتمانەوە ئارامی دەکردینەوە. کاتێکیش باوکت مرد، تۆ بڵێ چەند جار لەســەر گۆڕەکەی دەســت لە ملی یەک دانیشــتبین و گریابین، ڕێک وەک ئێســـتەمان؟ وا ئێســـتەش هەر فرمێســک دەڕێژم، ئاخر دڵی دایک پێشـــوەختە هەســـت بە گێچەڵ و نەهامەتیی منداڵەکەی دەکا! یەکەمین جار کە دوای ئەو هەموو ماوەیە چاوم پێت کەوت... خۆ بیرتە، مەبەســتم هەمان شــەوی یەکەمە کە تازە گەیشــتبووین... بە چاوانتدا تێگەیشـــتم شـــتێ لەئارادایە و هەر ئەو نیگایەت بۆ من بەس بوو. ئەو شەوە دڵم داخورپا و ئەمڕۆش هەر کە دەرگەکەم کردەوە و

چاوم پێت کەوت، بە خۆمم گوت دواجار ئەو ساتە چارەنووسسازە کەیشت! ڕۆدیا گیانم، ڕۆدیا! خۆ ئەمڕۆ ناتەوێ بڕۆی، ها؟

– نا، نا!

– هەمدیسان سەر دەدەیەوە؟

– بەڵێ... هەمدیسان سەر دەدەمەوە.

– ڕۆدیا، توخوا نارەحەت مەبە! نامەوێ بتدەمە بەر پرسیار و خۆ زاتی ئەوەشم نییە. دەزانم نابێ زۆرت بۆ بهێنم، وەلێ تەنیا بە دوو وشە وەڵامم بدەرەوە... ئەو شوێنەی کە بۆی دەچی زۆر دوورە؟

– زۆر زۆر دوورە.

– لەوێ چ باسە ئاخر؟ مەسەلەی کاروبار و شتە؟

– هەرچی خوا بیەوێ... تۆ تەنیا دوعام بۆ بکە!

ڕاسکۆڵنیکۆف بەرەو دەرگەکە ڕۆیشت، بەڵام پولخێریا توند دەستی ئەوی گرت و بێهیوایانە لە چاوەکانی ڕاما. تۆقین ڕەنگوبۆی بە ڕووخسارییەوە نەهێشتبوو.

– بەسە ئیتر، دایە!

ڕاسکۆڵنیکۆف ئێستە ئیدی خراپ لەوە بەداخ بوو کە هاتبووە ئەوێ.

– خۆ بۆ... بۆ تاهەتا نییە؟ خۆ هەمدیسان سەر دەدەیتەوە؟ ها؟ سبەی... سبەی سەر دەدەی؟

– سەر دەدەم، سەر دەدەم... خوا ئاگادارت.

ڕاسکۆڵنیکۆف دواجار توانیی خۆی لە چنگی دایکیدا دەربهێنێ و بۆی دەربچێت.

عەسـریکی گەرم بەڵام ڕۆشـن و خۆش بوو و ئاسـمان هەر لە بەربەیانەوە کراوە و ساماڵ. ڕاسکۆلنیکۆف بۆ ماڵەوە دەڕۆیشتەوە و زۆریش پەلەی بوو. دەیویسـت بەر لە ئـاوابوونی خۆر، هەموو کارەکانی ڕایی بکات. تا ئەو کاتەش حەزی نەدەکرد چاوی بە هیچ کەسێک بکەوێت. لە کاتی سەرکەوتن بە پلیکانەکاندا، بینیی ناستاسیا لەپشـت سـەماوەرەکەوە ڕاسـت بووەوە تا بتوانێت بە سـەرنجەوە تەماشای ئەو بکات و بە نیگاش شوێنی هەڵگرت. ڕاسکۆلنیکۆف کەوتە بیرکردنەوەوە، نەکا کەسـێک هاتبێتە دیدەنیم؟ وێنایەکی پڕ لە ڕق و قێزی پارفێریی هاتە بەرچاو. بەڵام کە دەرگەکەی کردەوە، چاوی بە دونیا کەوت. دونیا، نغرۆ لە دەریای بیر و خەیاڵدا، بە تەنیا دانیشتبوو و وا دیار بوو دەمێکە چاوەڕێیە. ڕاسـکۆلنیکۆف، پەشـۆکاو، لە ئاسـتانەی دەرگەکەدا وشـک بوو. دونیا خەمبارانە لەسـەر قەنەفەکە هەستایەوە و سوورپا و ڕووبەڕووی ئەو ڕاوەستا. لە نیگا ڕسیوەکەیدا، کە لە براکەیی بڕیبوو ترس و خەفەتێکی بێکۆتـایی دەدەڵا و ڕاسکۆلنیکۆف دەمودەست تێگەیشت کە دونیا هەموو شتێک دەزانێت.

— ئێ، ئێستە بێمە ژوور بۆلات یان بڕۆم؟

ڕاسکۆلنیکۆف ئەمەی بە ڕاڕایی و بێمتمانەییەوە پرسی.

— بە درێژایی ڕۆژ لای سـۆنیا بووم، هەردووکمان چاوەڕێی تۆ بووین. لامان وا بوو بە دڵنیاییەوە سەر دەدەی.

ڕاسـکۆلنیکۆف چووە ژوور و لەتاو ماندوویەتی لەسـەر یەکێک لە کورسییەکان بۆی کەوت.

— هەسـت بە لاوازی دەکەم، دونیا، زۆریش ماندووم؛ کەچی لەم ساتەدا بەتایبەت دەمەوێ بەسەر خۆمدا زاڵ بم.

بەبێ متمانە، تەماشایەکی خوشکەکەیی کرد.

– دوێنێشەو لە کوێ بووی تۆ؟

– ڕێک بیرم نییە. تەماشا خوشکێ، ڕاستییەکەی ئەوەیە کە دەمویست یەک جار بۆ ئەبەد بیرکردنەوەم ڕێکوپێک بکەمەوە. لەبەر ئەوە چەندان جار بە تەنیشت نێڤادا تێپەڕیم و تەنانەت ئەوەشم بە مێشکدا هات کە هەر لەوێ کۆتایی پێ بهێنم. بەس... بەس نەمتوانی بڕیارێکی یەکجاری بدەم.

ڕاسکۆڵنیکۆف بە ورتەورت ئەمانەی گوتن و دیسان نیگای بێمتمانەی لە خوشکەکەی بڕییەوە.

– خوایە، سوپاس بۆ تۆ! من و سۆنیاش ڕێک لەمە دەترساین. کەواتە هێشتا بڕوات بە ژیان هەیە، وایە؟ خوایە، سوپاست دەکەم!

ڕاسکۆڵنیکۆف بزەیەکی تاڵی هاتێ.

– نا، بڕوام پێی نییە! وەلێ هەر ئێستە خەریک بووم لە باوەشی دایەدا دەگریام. بڕوام نییە، کەچی داوام لێ کرد دوعام بۆ بکا. نازانم مەسەلە چییە دونیا، ئیتر خۆشم تێناگەم!

– تۆ... تۆ چووی بۆ لای دایە؟ پێت گوت؟

دونیا تۆقیوانە هاواری کرد.

– نا... ڕێی تێناچێ توانیبێتت وەها کارێ بکەی!

– نا، هیچم پێ نەگوت... یانی باسی شتی وام نەکرد، وەلێ خۆی سۆسەی زۆر شتی کردووە. بیستوویەتی تۆ بەدەم خەوەوە قسەت کردووە. دڵنیام ئێستەش بە نیوەچڵی گومانی بۆ شتگەلێ دەچێ. نازانم بۆچی ڕۆیشتمە لای. من کەسێکی چەپەڵم، دونیا.

– وەلێ ئامادەی بچی ئازار بکێشی! خۆ دەڕۆی، وایە؟

– بەڵێ، دەڕۆم. ئیتر کات بەفیڕۆ نادەم. ئەرێ، بۆ دەرچوون لەژێر باری ڕسوایی بوو کە بیرکردنەوەی خۆخنکاندنم بۆ هات، دونیا. بەس هەر کە سەیری ئاوەکەم کرد، بە بیرمدا هات منێک کە تا ئێستە خۆم بە بەهێز و تۆکمە زانیوە، ئێســــتەش نابێ لە ڕســــوایی و ئەم جۆرە شتانە بترسم.

پەلەپەل ڕستەکانی بەدوای یەکدا ڕیز دەکردن.

– ئەمە یانی حورمەت، دونیا؟

– بەڵێ، ڕۆدیا. یانی حورمەت.

ئاگرێک لە چاوی بێشەوقی ڕاسکۆلنیکۆفدا بڵێسەی سەند، دەتگوت بیرکردنەوە لەوەی کە هێشتا حورمەتێکی هەیە، دڵخۆشی دەکرد.

– خۆ تۆ وا بیر ناکەیتەوە کە من تەنیا لە ئاوەکە ترســــاوم و هیچ هۆکارێکی تری نەبووە، ها خوشکێ؟

ژارخەنــدێکی نــاحەزانەی کرد و نیگــای بڕییە ڕووخســــــــاری خوشکەکەی.

– ئاە، تۆش، ڕۆدیا! ئەسڵەن باسی ئەوە مەکە!

هاوارەکەی دونیا تاڵ بوو.

بێدەنگیی نێوانیــان دوو خولەکێکی خــایــاند. ڕاســــکۆلنیکۆف بە دانیشــــتنەوە چــاوی لە زەوی بڕیبوو؛ دونیــاش لەوبەری مێزەکەوە ڕاوەستابوو و پەشۆکاو چاودێریی ئەوی دەکرد. ڕاسکۆلنیکۆف کتوپڕ لە شوێنەکەی دەرپەڕی.

– درەنگە! دەبێ بڕۆم، کاتیەتی ئیتر! هەر ئێســــتە دەڕۆم و خۆم بەدەستەوە دەدەم. وەلێ نازانم بۆچی خۆم بەدەستەوە دەدەم!

دڵۆپەفرمێسکی درشت بە گۆناکانی دونیادا دەخزانە خوارێ.

– ئەوە دەگرییی، خوشکێ... وەلێ دەتوانی دەستتم بدەیتێ؟

– ئەوە چی دەڵێی ڕۆدیا، بۆ دەکرێ دەستمت نەدەمێ؟

دونیا باوەشی بە براکەیدا کرد.

– ئێستە کە ئازارکێشانەکەت هەڵبژارد، هەرچۆنێ بووە نیوەی باجی تاوانەکەت دەدەی ئیتر.

دەگریا و توند ڕاسکۆڵنیکۆفی لە باوەشیدا دەگوشی و ماچی دەکرد.

– تاوان؟ ئەی هاوار، کامە تاوان؟

لەناکاو ڕق بەرۆکی ڕاسکۆڵنیکۆفی گرت.

– ئەوەی ئەسپییەکی پۆخڵ و چەپەڵ و ژەهراویم کوشت کە خەریک بوو هەمووانی لەناو دەبرد، تاوانم کردووە؟ بۆ مەگەر ئەو کێ بوو؟ پیرێکی سووخۆری نەفرەتی کە کەڵکی هیچ کەسێکی نەدەگرت!... تەنانەت کوشتنیشی گوناهی چل تاوان دەشواتەوە![1] ئەو خەریک بوو خوێنی ڕەشوڕووتی دەکردە شووشەوە! کوشتنی وەها مرۆڤێ تاوانە؟ من تەنانەت بە شیاوی بیرلێکردنەوەشی نازانم! بیر لە باجدانی تاوان و پاککردنەوەی خوێن و ئەمانەش ناکەمەوە! هیچ ئەوەشم بەلاوە گرنگ نییە ئێوە هەرهەموو پێکڕا لە گشت لایەکەوە بەم تاوان تاوانەتان نەقیزەم دەدەن! *تاوان، تاوان!* وا ئێستە چاوم کراوەتەوە و خەریکم بە ڕوونی دەبینم کە ئەو ترسە گاڵتەجاڕانەیەم چەندە گەمژانە بووە! ئێستە کە بڕیارم داوە بچمە ژێر باری ئەم حەیاچوونە

---

١. ئاماژەیە بەو بڕوایەی فەرهەنگی سلاڤی کە کوشتنی یەک جاڵجاڵۆکە گوناهی چل تاوان دەشواتەوە و، هەروەها، ئاماژە بە ئەفسانەی ڕووسیی *گوناە و کەفارەت* کە نەک هەر بە تەنیا کوشتنی کەسێک کە خوێنی ئەوانی دی دەمژێت بە تاوان لەقەڵەم نادات، بەڵکە لای وایە تاوانەکانی ڕابردووی بکوژەکەش دەشواتەوە. «و. ف»

گەمژانەیەوە، دەبینم چ فەحەییەکم کردووە! من کەموکورتم و هیچ بەهرەیەکیشـــم نییە، هەر لەبەر ئەوەش وەها بڕیارێکم دا؛ لەوانەشـــە لەبەر ئەوە بێ کە وا لە بەرژەوەندیمدایە... ئەو خوێڕییە وای دەگوت، مەبەستم ئەو پارفیرییە ڕەبەنەیە!

– براکەم، برای خۆم! ئەوە تۆ چی دەڵێی؟ تۆ هەســـتای و خوێنی مرۆڤێکت ڕشت!

دونیا بێهیوایانە هاواری کرد.

– بۆ مەگەر ئەوانی تر خوێنیان نەڕشتووە؟

ڕاسکۆلنیکۆف شێتانە پەڕییە نێو قسەکانی.

– دونیایەک خوێنیان ڕشتووە و هەمیشە ڕووباری خوێن هەستاوە و هێشـــتاش هەر هەڵدەســـتێ... خەڵکی وەک ئەوەی ســـەری بوتڵە شـــامپانیا هەڵبپچڕن، خوێن دەڕژن! خۆیان لە پەرســـتگەی ژوپیتەردا تاجی شـــانازییان لە ســـەر دەنان و پاشـــانیش هەر بەوانەیان دەگوت پێشەواکانی مرۆڤایەتی! گەر باش لە مەسەلەکە بڕوانی، هەموو شتێکت بۆ ڕوون دەبێتەوە! منیش دەمویســـــت کارێ بۆ مرۆڤەکان بکەم و لەبەرانبەر ئەو تاکە نەفامییەدا، ئامادە بووم ســـەدان و هەزاران چاکە بکەم. نەفامیش نەبوو، تەنیا دەســـتوپێ‌ســـپییەتی بوو! ئایدیاکەشـــم ئەوەندە نەفامانە نەبوو و ئێســـتە لەبەر ئەوەی شـــکســـتی هێناوە، نەفامانە دێتە بەرچاو... لە بنەڕەتدا هەر شـــتێک شـــکســـتی هێنا، وەک خودی نەفامی وایە. من تەنیا دەمویســـت ســـەربەســـتیی خۆمم هەبێ و بتوانم یەکەمین هەنگاو بنێم، کەرەســـتەی پێویســـت بەدەســـت بهێنم و پاشـــانیش ئەو ســـوودەی دەســـتم دەکەوت ئێجگار زیاتر بوو، هەموو تاوانەکەی دەشـــاردەوە... وەلێ من... تەنانەت لە یەکەمین هەنگاویشـــدا دەرەقەت نەهاتم، چونکە من کەســـێکی ڕســـوا و ســـەرشـــۆڕم! ئەرێ، مەســـەلەکە ئەوەیە! بەس ئامادەش نیم وەک ئێوەومانان لە مەســـەلەکە

بڕوانم! ئەگەر سەر بکەوتبام، ئێستە تاجی شانازیم بە سەرەوە بوو، بەس لەبەر ئەوەی سەری نەگرت، وا گیرم خواردووە!

– بەس وا نییە! لە هیچ لایەنێکەوە ڕاست نییە! براکەم، خۆت دەزانی چی دەڵێی؟

– مەبەستت ئەوەیە شێوازەکەی ناڕاست دەرچووە؟ خەوشی جوانیناسیی هەیە! هەر بە ڕاستی ناتوانم تێبگەم بۆچی لە کاتی گەمارۆدانێکی بچووکدا، ئاگرباراندن بەسەر خەڵکیدا بە شێوازێکی باشتر و شکۆدارانەتر دێتە ئەژمار! ترس لە جوانی و شێوازی ڕووالەتی یەکەمین نیشانەی لاوازی و دۆشدامانە. ئێستە باشتر و ڕوونتر لە هەر کاتێکی تر لەوە تێدەگەم و هیچ کاتێ بابەتی تاوانەکەم ئاوا لە بەرچاودا کاڵ نەبووە! کامە تاوان ئاخر؟ خۆ تا ئێستە هەرگیز ئاوها بۆ کارێکی خۆم بەبڕوا و لێبڕاو نەبوومە!

سوورایییەک گەڕایە ڕووخساری هەڵبزڕکاو و بێڕەنگییەوە، وەلێ هەر کە ڕستەکانی کۆتایی دەربڕین، بە هەڵکەوت چاوی بە چاوی دونیا کەوتەوە و وەها ئازارێکی لە نیگای ئەودا بەدی کرد کە نائاگایانە نەیتوانی درێژەی بداتێ. هەستی دەکرد ئەگەر هیچیشی نەکردبێ، ئەم دوو ژنەی سیاچارە کردوون، ئەو بوو هۆکاری سەرلەبەری...

– ئاخ، دونیاکەم، ئەی ئازیزترینم! ئەگەر تاوانم کردووە، لێم ببوورە... گەرچی ئەگەر تاوانبار بم ئیتر لێبوردنێک لەئارادا نییە!... خوا ئاگادارت! بۆچی لەخۆڕا یەکتری بڕەنجێنین! کاتیەتی! ئیتر ناتوانم یەک خولەکیش بمێنمەوە. شوێنم مەکەوە! تکات لێ دەکەم! دەبێ سەردانی شوێنێکی تر بکەم... وەلێ تۆ زوو بڕۆرەوە ماڵ و لای دایە بە. ئەمە دواهەمین تکای منە لە تۆ. تکات لێ دەکەم، خوشکێ! هەرگیز بە تەنیا جێی مەهێڵە. من لە دۆخێکی خراپدا جێم هێشت، زۆر زۆر نیگەران و پەرێشانە و بە هیچ شێوەیەک ئامادەیی بیستنی ئەم بابەتەی نییە.

دەرەقەتی نایێ. یان جەڵدە لێی دەدا و دەمرێ، یان شێت دەبێ. لەلای بمێنەوە! ڕازومیخینیشتان لایە، قسەم لەگەڵ کرد... پێویستیش ناکا بۆ من بگرییێ. هەوڵ دەدەم تا کۆتایی تەمەن، با بکوژیش بم، پیاوانە و ڕاستگۆ بژیم! کێ چووزانێ، لەوانەیە ڕۆژێ بۆخۆم ناوێکیش دەربکەم. شەرمەزارتان ناکەم، جا دەشیبینی! دواجار دەیسەلمێنم... دەی، جارێ خوا ئاگادارت.

ڕاسکۆڵنیکۆف خێرا کۆتایی بە قسەکانی هێنا. لە نیگای دونیادا هەستی بە بارێکی سەیر کرد کە لە کاتی قسە و گوتەکانی کۆتاییدا دەرکەوتبوو.

– ئێستە بۆچی دەگرییێ؟ مەگرییێ! مەگریێ دەی! خۆ بڕیار نییە بۆ تاهەتا لێک دابڕێین! ئاخر، ئەرێ! بوەستە... بوەستە! خەریک بوو بیرم بچێ!

ڕاسکۆڵنیکۆف ڕۆیشت و لەسەر مێزەکە کتێبێکی ئەستوور و تۆزاویی هەڵگرت. کتێبەکەی کردەوە و لە ناوەڕاستیدا وێنەیەکی ڕەنگئاویی بچووکی دەرهێنا کە لەسەر عاج کێشابوویان. وێنەی کچی خاوەنماڵەکەی بوو، هەمان ئەو کچەی کە سەروەختێک بووبوونە دەزگیراندار و پاشان کچەکە بەهۆی تاوە گیانی دەرچووبوو، کچێکی سەیروسەمەرە کە حەزی دەکرد ببێتە ڕاهیبە. بۆ خولەکێک لە ڕووخساری ناسک و بێگەرد و هەستیاری دەزگیرانەکەی ڕاما، ماچی کرد و جا دایە دەست دونیا.

– لەبارەی ئەم شتانەوە زۆر قسەم لەگەڵ دەکرد، تەنیا و تەنیا لەگەڵ ئەو.

شێوازی قسەکردنەکەی ڕاسکۆڵنیکۆف تێفکرانە بوو.

– باسی زۆربەی ئەو شتە تۆقێنەرانەم بۆ کردبوو کە دواتر ڕوویان دا! ئیتر پێویست ناکا خۆت بێتاقەت بکەی!

ڕووی کردە دونیا.

– ئەویش هێندەی تۆ ترسابوو و ڕەتی دەکردەوە. دڵخۆشم کە ڕۆیشتووە و زیندوو نییە. گرنگ ئەوەیە کە هەموو شتێ لە ئێستە بەدواوە جیاوازە و سەرلەنوێ دەست پێ دەکاتەوە، ئەسڵەن دەبێتە دوو لەت!

کتوپڕ هاواری بەرز بووەوە، هەمدیسان گەڕابووەوە سەر ئازار و سیاچارەیی خۆی.

– هەموو شتێ خەریکە شەق دەبا و دەبێتە دوو لەت! هەموو شتێ! من... یانی من ئامادەیی ئەوەم تێدایە؟ یانی هەر بە ڕاستی ئەوەم دەویست؟ دەڵێن پێویستە ئازار بکێشم و ئەم تاقیکردنەوەیە ئەزموون بکەم! ئاخر ئامانج لەم تاقیکردنەوە بێمانایانە چییە؟ بڕیارە دوای بیست ساڵ بێگاری، کە وەک پیرەمێردێکی کووڕ و زووهان لەژێر باری مەینەت و دەبەنگیدا پلیشامەوە، باشتر دەرک بە ئامانجەکەی بکەم؟ باشە، ئەوسا ئیتر چیم هەیە تا بۆی بژیم؟ ئەی ئێستە چی، ئێستە بۆچی خەریکە دێمە ژێر باری ئەو ژیانە؟ ئاخ! سپێدەی ئەمڕۆ کە خەریکی سەیرکردنی نێڤا بووم، دەمزانی چەندە کەم و چەپەڵم!

دواجار هەردووکیان ژوورەکەیان جێ هێشت. ئەوە بە هیچ شێوەیەک بۆ دونیا ئاسان نەبوو، وەلێ براکەیی خۆش دەویست. لە براکەی دوور کەوتەوە، بەڵام کە پەنجا هەنگاوێک مەودا کەوتە نێوانیان، لای کردەوە تا هەمدیسان تەماشای بکات؛ ڕاسکۆڵنیکۆف لە سنووری نیگای ئەودا بوو. لە سەرسووچەکە ئەویش ئاوڕی دایەوە و بۆ دواهەمین جار نیگایان لێک ئالا. وەلێ ڕاسکۆڵنیکۆف کە بینیی دونیا هەر وا سەیری دەکات، پشووکورت و تەنانەت تووڕە بە دەست ئاماژەی بۆ کرد تا بڕوات و خۆشی خێرا بای دایەوە.

مرۆڤێکی نەگریسم، وا خۆم دەبینم ئیترا چەند ساتێک دواتر لەبەر ئاماژەکردنە توند و تووڕەکەی بۆ دونیا شـــەرمەزار بوو و ئەم بیرکردنەوەیەی بە زەیندا ڕابرد. وەلێ ئەمانە بۆچی هێندە خۆشـــیان دەوێم گەر هەر بە ڕاستی شیاوی سۆزیان نیم؟ ئاخ، خۆ چی دەبوو گەر تەنیای تەنیا بام، هیچ کەســـێکم نەبا، نە هیچ کەســـێ خۆشـــی بویستبام و نە منیش هەرگیز عاشقی هیچ کەسـێ ببام! ئەوسا ئیتر ئەمانە ڕوویان نەدەدا! وەلێ شـتێک جێی سـەرنجە! بەدووری دەزانم من لە ماوەی پازدە یان بیست ساڵیشدا ئەوەندە کۆڵەوار و کەساس ببم کە لەبەردەم خەڵکیدا خۆم کەم و بچووک بکەمەوە و کەمەر بچەمێنمەوە و ســـەر لەو زەوی بســـووم و لەگەڵ ڕەخســـانی هەر دەرفەتێکدا بڵێم من بکوژم! یانی ئەوە دەبێ؟ ئەها، بەڵێ! هەر ئەوەیە! خۆیەتی! هەر لەبەر ئەوە خەریکن من بنێرنە ئەوێ و دەیانەوێ بکەومەوە وەها ڕۆژگارێکەوە! توخوا ســـەیریان کە! چۆن بەم شەقامانەدا دەخوولێنەوە و یەک بە یەکیشیان پیس و نەگریسن و لە ناخیشدا، تاوانبار و، خراپتریش، بە تەواوی مانا گەمژەن! وەلێ ئەگەر من دوور نەخەنەوە، ئەوا دادپەروەرییەکەیان خراپ لەسەری دەکەوێ و دڵیان ئاو ناخواتەوە! ئاخ، چەندە دڵبەداخم لە هەر هەموویان!

بیرکردنەوەیەک خراپ زەینیی قاڵ کردبوو: یانی پێویستـــە من بە چ شێوازێ بجووڵێمەوە تا ئاخرییەکەی کەساس و سووک خۆم بخەمە بەرپێیان، نقەم لێوە نەیێ و نارەزایی دەرنەبڕم و ســەد لە ســەد خۆم بەدەســـتەوە بدەم و کارەکەم قاییلکەر بێ؟ وەلێ دەی، بۆچی نا؟ هەر دەبێ وا بێ. بەسەربردنی بیست ساڵ بە کۆت و زنجیرەوە بەس نییە بۆ ئەوەی بپلیشـــێنێتەوە؟ ئاو، بەرد کون دەکا! ئەی ئەو چارەڕەشـــە بۆچی دەبێ دواتر بە زیندوویی بمێنێتەوە؟ ئاخر ئیتر کامە ژیان؟ ئەســـلەن من ئیســـتە بۆچی دەڕۆم بۆ ئەوێ، کە دەزانم ئاخرییەکەی

*چییە. هەر دەڵێی تازە نووسراوە و خستوویانەتە بەردەمم و ناشکری بە جۆرێکی تر بێ!*

لە دوێنێ ئێوارەوە سەد جارێک دەبوو ئەمەی لە خۆی دەپرسییەوە، بەڵام هەرچۆنێک بوو ئەو ئیتر بەڕێوە بوو.

## هەشت

ئیدی تاریک بوو کە راسکۆلنیکۆف هەنگاوی نایە ژوورەکەی سۆنیاوە. سۆنیا بەدەم چاوەڕوانیی ئەوەوە، سەرانسەری ئەو ڕۆژەی لە دڵەڕاوکێیەکی کرۆژێنەر و تۆقێنەردا بەسەر بردبوو و دونیاشی لەلا بوو. دونیا قسەکانی ڕۆژی ڕابردووی سڤیدریگایلۆفی لەبارەی ئەوەی کە سۆنیا هەموو شتێک دەزانێت، لە گوێدا دەزرنگانەوە، لە بەیانییەوە هاتبووە لای ئەو. ناچینە ناو وردەکاریی دەمەتەقێ و دەردەڵ و فرمێسکەکانی دوو کچەکەوە و ئەوەی کە هاوڕێیەتییان تا چەندە قووڵ بووبووەوە. دونیا لەو گوتوبێژەدا کە کردیان، لانیکەم لە شتێک بێخەم بووبوو: براکەی تەنیا نەبوو و بڕیاریش نەبوو تەنیا بێت. راسکۆلنیکۆف یەکەم جار بۆ پێهاتن چووبووە لای سۆنیا و کاتێکیش پێویستیی بە هاوخەمێک بوو، ئەوی هەڵبژاردبوو. ئێستەش ئەوە سۆنیا بوو کە لەگەڵ ئەودا دەڕۆیشت، تا هەر شوێنێک کە چارەنووس راسکۆلنیکۆفی لەگەڵ خۆیدا دەبرد. پێویستی نەدەکرد دونیا لەو بارەیەوە هیچ بپرسێت و دەیزانی هەر وا دەبێت. بە نیگایەکی کەیل لە ڕێزەوە تەماشای سۆنیای دەکرد و هەر ئەمەش ئەوی دەستەپاچە و نارەحەت کردبوو. بەڵام سۆنیا هێندەی نەمابوو فرمێسکی بە چاودا بێتە خوار؛ ئەو، ڕێک بە پێچەوانەوە، تەنانەت خۆیشی بە شایەنی ئەوە نەدەزانی نیگای لە نیگای سۆنیا بئاڵێت. وێنەی دونیا لە یەکەمین دیداری ئەو ڕۆژەیان لە ژوورەکەی راسکۆلنیکۆفدا، کە بەوپەڕی بایەخپێدان و ڕێزەوە سەری بۆ

دانەواندبوو، لە زەینی ئەودا نەخشابوو و بووبووە یەکێک لە جوانترین و دەگمەنترین دیمەنەکانی ژیانی.

دونیا دواجار تاقەتی بەسەر چوو و لە ماڵی سۆنیاوە بەرەو ژووری براکەی کەوتە ڕێ تا لەوێ چاوەڕوانیی بکات؛ بیری گیرۆدەی ئەوە بوو کە ڕاسکۆلنیکۆف بە دڵنیاییەوە سەرەتا دەچێت بۆ ئەوێ. کە ئەو ڕۆیشت، ترس لەوەی کە نەکا ڕاسکۆلنیکۆف خۆی کوشتبێت، ئەشکەنجەی سۆنیای دەدا. دونیا ترسی لە ئەگەری خۆکوشتنی براکەی هەبوو. وەلێ دوو کچەکە بە درێژایی ڕۆژ هەوڵیان دابوو یەکدی قایل بکەن کە وەها شتێک ڕێی تێناچێ و تا ئەو کاتەی بە تەنیا نەمابوونەوە، دڵەڕاوکێیان کەمتر بوو. هەر کە لێک جیا بوونەوە، بیرکردنەوە لەمە زەینی هەردووکیانی تەنییەوە. سۆنیا بیری هاتەوە کە سڤیدریگایلۆڤ ڕۆژی ڕابردوو گوتبووی ڕاسکۆلنیکۆف دوو ڕێگە زیاتری لەبەردەمدا نییە: یان سیبیریا یان... کچە لەگەڵ ئەوەشدا چاک ئاگاداری خۆپەرستی و لووتبەرزی و بێئامانیی ڕاسکۆلنیکۆف بوو. *یانی دەکرێ تا ئێستە تەنیا ترس لە مەرگ ئەم مرۆڤەی بە زیندوویی هێشتبێتەوە؟ یانی لە ناخیدا هیچ شتێکی تر نییە؟* دواجار لە بێهیواییاندا ئەم فکرەی بە زەیندا هات. ئیدی خۆر لە ئاوابووندا بوو. سۆنیا، خەمگینانە لەپشت پەنجەرەوە ڕاوەستابوو و واقووڕ لە دەرەوەی دەڕوانی، وەلێ لە پەنجەرەکەوە بێ لە دیوارێکی بێپەنجەرە و لەترنەکراوی بیناکەی تەنیشت هیچ دیار نەبوو. دواجار، کاتێک کچەکە خەریک بوو دەگەیشتە ئەو بڕوایەی کە ڕاسکۆلنیکۆف خۆی کوشتووە، دەرگە کرایەوە و پیاوە گەنجەکە هاتە ژوور.

هاواری شادی لە سنگی کچەکەوە هاتە دەر، بەڵام کە بە سەرنجەوە سەیری ڕووخساری ڕاسکۆلنیکۆفی کرد، کتوپڕ گوناکانی ڕەنگیان پێوە نەما.

ڕاسکۆلنیکۆف بزەیەکی کرد و کەوتە دوان.

– بەڵێ، ڕاستە! هاتووم بچمە بەر سێبەری خاچەکانی تۆ، سۆنیا. لای خۆی ئەوە تۆ بووی کە پێت گوتم بچمە سەر چوارڕیان و پێبێم، ئەی ئێستە کە هەر بە ڕاستی کارم گەیشتووەتە ئێرە بۆچی وا لە ترسان خەریکە دەبووریتەوە؟

سۆنیا سەراسیمە تەماشای کرد. شێوازی قسەکردنی ڕاسکۆڵنیکۆفی بەلاوە نامۆ بوو و بە بیستنی دەنگی، سەرمایەکی تەزێنەر گەڕایە لەشییەوە. بەس هێندەی پێنەچوو کە سۆسەی کرد ئەو شێوازی دوان و هەڵسوکەوت و ڕستە سەیرانە دەستکردن. ڕاسکۆڵنیکۆف کاتی قسەکردن نیگای لە لایەکی دیکە بڕیبوو، دەتگوت دەستئەنقەست سەرنجی لە کچەکە دەدزێتەوە.

– تەماشا، سۆنیا، بڕیاری خۆمم دا، ئاوها زۆر باشترە و لە بەرژەوەندیی خۆمدایە. هەڵبەتە مەرجی تایبەتیشی هەیە... وەلێ چیرۆکەکەی دوور و درێژە و بۆچی سەری خۆمانی پێوە بێشێنین! بەلام دەزانی لەم نێوەندەدا چ شتێ دەیریم دەکا؟ ئەوەی کە کۆمەڵێ ئاژەڵ بەو سەروسیما دەبەنگانەیانەوە دەیانەوێ بە دەمی بەشکراوەوە پێمدا واق بێن و بە پرسیارە دەبەنگانەترەکانیان چارەڕەشم بکەن! چارەشم نییە و دەبێ وەلامیان بدەمەوە، چونکە پەنجەم بۆ ڕادەوەشێنن کە بڵێ، بڵێ... ئەی تف لە چڕوچاوی هەموویان! تەماشا، نامەوێ بچم بۆ لای پۆرفیری، پێی تێک دەچم. وام پێ باشترە بچمە لای هەمان هاوڕێکەی خۆم، جەنابی ڕاگری هەڵەشە. ئاخ چۆن دووکەڵ لە کەللەی بەرز دەکەمەوە و چ هەرایەک دەنێمەوە! وەلێ خراپ نییە تۆزێ ئارام بم و خوێنسارد؛ لەم دواییانەدا زۆر تووڕە بووم و زوو کەلەیی دەبم. ئاگادار نییت، هەر ئێستە خەریک بووم لە دوورەوە بە هەڕەشە مستم بۆ خوشکەکەم ڕادەوەشاند، باشە بۆچی؟ چونکە لای کردبووەوە تا بۆ دواهەمین جار سەیرم بکات. بەرازێکی

چەندە پۆخڵم لێ دەرچووە من! تەماشــا چیم بەســەر هاتووە! دەی، ئێستە کوان ئەو خاچانە؟

وا دیار بوو ڕاســکۆڵنیکۆف ڕێک نەیدەزانی چی دەڵێت و چی دەکات؛ بۆ ســاتێکیش نەیدەتوانی هێور ڕابوەســتێ یان بیری لەســەر شــتێکی تایبەت چڕ بکاتەوە. بیر دوای بیر لە زەینیدا پاش و پێشــیان دەکرد و لێک دەئاڵان. ناڕوون و پچڕپچڕ دەدوا و دەســتەکانیشــی دەلەرزین.

ســۆنیا بێدەنگانە ئەو دوو خاچەی لە دۆڵابەکەی دەرهێنان، دانەیەکیان تەختەیی بوو و ئەوی دیکەیان لە مس. خاچێکی بۆ خۆی و دانەیەکی بۆ ڕاسکۆڵنیکۆف کێشا و پاشانیش خاچە تەختەییەکەی کردە ملی ئەو.

– ئێ، لام وایە ئەمە نیشــانەی ئەوەیە کە منیش خاچی خۆم بە کۆڵەوە دەگرم؛ هەهەهە!

ڕاسکۆڵنیکۆف پێکەنی.

– وەک ئەوەی منی داماو تا ئێستە خۆم کەم ئازارم چەشتبێ! ئەم خاچە تەختەییە هی لادێیی و شــتە. ئەو مســییەم نیشــان بدە کە هی لیزاڤێتایە و خۆت دەتەوێ لە ملی بکەی! کەواتە... کەواتە ئەوســـا ئەمەی لە ملدا بووە، ها؟ دوو دانە خاچی دیکەی وەک ئەمانەم لە بیرە، دانەیەکی زیوی و یەکێکی بچووکتریش بە وێنەی پیرۆزەوە. هەر لەوێ بەســەر سـنگی ئەو دێوەزمەیەوە جێم هێشــتن. ئەوان زیاتر بۆ ئەم دۆخە شــیاون. بە ڕاســتمە، دەبوو ئێســتە ئەوان بکەمە ملم... خۆ هەمدیســان دەســتم پێ کردەوە! ئەوەندە هەڵیتوپەڵیت دەڵێم کە باســە ســەرەکییەکەم بیر دەچێتەوە؛ ئەسڵەن بە جۆرێ لە جۆرەکان هۆشــم لەســـەر خۆی نییە... بۆیە هاتمە ئێرە، ســۆنیا، تا پێت بڵێم و ئاگادار بی... هەر ئەوەندە! تەنیا بۆ ئەوە هاتم. ئممم! لام وا لەمە زیاتر

قســەمان بۆ یەکتری هەبێ! ئاخر، تۆ لەســەر ئەوە ســوور بووی کە برۆم. دەی، من ئەوا دەڕۆم سزای زیندانیبوونەکەم بکێشم و تۆش بە ئاواتی دڵت دەگەی. چییە، ئەی بۆچی دەگریێی؟ چاک تووش بووین! یانی تۆش؟ بیبڕەوە دەی! بەسە! ئاخ چەندە ڕقم لەم هەڵسوکەوتانەیە!

وێڕای ئەمەش، هەســتێک لە دڵیدا چەکەرەی کرد. لە ســۆنیای دەروانی، دڵی چڵی دەدا. لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە، *ئاخر بۆچی... ئەم کچە بۆچی خەفەت لە من دەخوا؟ من چیی ئەوم؟ بۆچی فرمێسک دەڕێژێ؟ ئەســڵەن بۆچی هۆشــی بەلای منەوەیە؟ بۆچی وەک دایە و دونیا ئاگای لە منە؟ ئاخرییەکەی ئەم کچە دەبێتە دایە گیانم!*

– خاچ بکێشن، ئێوەو خوا لانیکەم دوعایەک بکەن!

سۆنیا بە دەنگێکی شەرمۆک و شکاو، تکای لێ دەکرد.

– باشــــە، پێت خۆش بوو تا بەیانیش دوعا دەکەم! جا لە ناخی دڵیشەوە، سۆنیا، لە ناخی دڵەوە...

بەڵام قسەکەی ئەمە نەبوو و دەیویست شتێکی دی بڵێت.

ڕاسکۆڵنیکۆف چەندان جار خاچی کێشا. سۆنیا شاڵەکەیی هەڵگرت و لە ســەریی پێچاند. شــاڵێکی پۆپەشــمینی ســەوز بوو، بە ئەگەرێکی زۆر یارۆ ئەو شــــاڵەی کە مــارمیلادۆڤ گوتبووی *هی هەموومانە*. ڕاســـکۆڵنیکۆف هەر کە شــاڵەکەی بە ســــەری ســـۆنیاوە بینی، ئەم بیرکردنەوەیە وەک برووسکە بە زەینیدا ڕابرد، وەلێ هیچی نەپرسی. خۆیشی خەریک بوو هەستی دەکرد کە هۆشی لەسەر خۆی نییە و بە شــــێوەیەکی تۆقێنەر هەموو شــــتێک لە بیر دەکات و تووڕەییەکەی سامناکە؛ هەر ئەمەش تا سەر ئاستی مەرگ دەیترساند. کتوپڕ ئەوە لە زەینیدا پزیسکی دا کە سۆنیا دەیەوێت لەگەڵی بێت و دۆشی داما.

– چی بووە؟ ئەی تۆ بۆ کوێ؟ تۆ بمێنەوە! هەر لێرە بمێنەوە! من بە تەنیا دەڕۆم!

هاواری تووڕەبوونەکەی ترسـنۆکانە بوو و بە قیژێکی تەواوەوە بەرەو دەرگەکە چوو.

– یانی چی کۆمەڵێ کەس بخەمە شوێنی خۆم؟

ئەمەی بەدەم بۆڵەبۆڵ و لە کاتی چوونەدەرەوە گوت.

ڕاسکۆڵنیکۆف سۆنیای لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا جێ هێشت و تەنانەتماڵئاواییشی لێ نەکردبوو. بە گشتی دەتگوت لە بیری کردبوو و دڕدۆنگییەکی سەرکێش و ژەهراوی خەریک بوو لە دڵیدا هەڵدەقولا.

*یانی ئەمە ڕاستە؟ ڕێگەی ڕاست ئەمەیە دەی؟* لە کاتی داگەڕان بە پلیکانەکاندا، هەمدیسـان ئەمەی لە خۆی دەپرسـی. *یانی ئیتر زۆر درەنگی کردووە؟ ناتوانم هەر لێرە هەموو شـتێ ڕاگرم و بکشـێمە دواوە و... ئەسڵەن نەڕۆم؟*

بەڵام درێژەی بە ڕێگەکەی دا. کتوپڕ زۆر بنجبڕانە ئەوەی کەوتە دڵ کە نابێت بەردەوام خۆی بداتە بەر پرسـیاری بێهوودە، چونکە ئیدی سـوودێکی نییە. کاتێک خۆی بە شـەقامەکەدا کرد ئەمجا بیری هـاتەوە کە مـاڵئـاوایی لە سـۆنیـا نەکردووە و ئەوی بە شـاڵە سـەوزەکەیەوە لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا هەر وا جێ هێشتووە؛ کچە لە ترسـی هـاتوهـاواری ئەو نەیوێرابوو هەنگـاو هەڵبهێنێتەوە. ڕاسکۆڵنیکۆف بۆ سـاتێک شـەقاوی خاو کردەوە. هەر هەمان سـات، کتوپڕ بیرکردنەوەیەکی دیکەی کەوتە سـەر؛ دەتگوت ئەو بیرە بەدەم گەیشـتنی کاتێکی دیاریکراوەوە دانیشـتووە تا بەرۆکی بگرێت: *باشـە ئێسـتە من بۆچی هەسـتام و چوومە لای ئەو کچە؟ ئامانجم چی بوو ئاخر؟ پێم گوت ئێسـتە کاتییەتی و دەبێ ئەو کارە ئەنجام بدرێ! کامە*

*کار؟ ئەم هەموو هاتوچۆ و سەرئێشەیە هەر تەنیا لەبەر ئەو تاقە قسەیە؟ یان نەکا عاشقی بووبم؟ نا، وەها شتێ لەئارادا نییە! هەر ئێستە وەک سەگ تاساندم! جا نەکا هەر بە ڕاستی پێویستیم بە خاچەکانی بووبێ؟ ئاخ کە تووشی چ شوورەییەک بوومە من! نا، ئاتاجی فرمێسکەکانی بووم، دەمویست ترسی ببینم، دەمویست بینەری چلدانی دڵی بم! شتێکم دەویست پڕی پێدا بکەم و خۆمی لێوە بئاڵێنم... ئەرێ، شتێ کە ڕامبگرێ و ڕۆیشتنەکەم دوا بخا! دەمویست کات بەدەست بهێنم یان ئەوەی کە ڕووخسارێکی نەرمونیان لەبەردەممدا ببینم! زاتی ئەوەشم هەبوو بەو جۆرە باوەڕ بە خۆم بکەم، ئای لەو خەیالانە، ئای خوایە! من تەنیا شڕۆڵەیەکی سووکوچرووک و کۆلەوارم، سووکوچرووک و کۆلەوار! هەر ئەوەندە!*

بە درێژایی ڕێڕاوەکە ڕێی دەکرد و ئیدی هێندەی نەمابوو بگاتە شوێنی مەبەست، بەڵام کە گەیشتە پردەکە، ڕاوەستا و پاشان بەرەو سێننایا بای دایەوە.

تامەزرۆیانە بە لای ڕاست و چەپدا تەماشای دەکرد. بە سەرنجەوە لە هەر شتێکی سەر ڕێگەکەی ڕادەما، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەر نەیدەتوانی سەد لە سەد سەرنجی لەسەر شتێکی تایبەت ڕابگرێت؛ دەتگوت هەموو شتێک خەریک بوو لە دەستی دەردەچوو. *یەک حەفتەی تر، یان ئەوپەڕەکەی یەک مانگی تر، منیش بەم عارەبانانەی کە تایبەتن بە زیندانییەکانەوە، بەسەر ئەم پردەدا دەبەن بۆ دۆزەخێک! ئەوسا چۆن دەتوانم ڕێڕاوەکە ببینم! یانی دەبێ هەرچییەکی ئەم ناوە هەیە لە یادگەمدا گلی بدەمەوە؟* فکرگەلی لەم جۆرە لە زەینیدا پزیسکیان دەدا. *یان ئەم تابلۆیە بۆ نموونە، چۆن دەتوانم هەمدیسان ئەم پیتانە بخوێنمەوە؟ یەکێ لێرەدا نووسیویەتی شەریکە. باشە، لەو شتانەیە کە مرۆڤ دەبێ لە یادگەیدا گلیان بداتەوە. ئەو بزوێنەی دوای ش... مانگێکی تر بڕیارە ئەو پیتە لە چ دۆخێکدا ببینمەوە؟ لەو کاتەدا*

*چ هەســـتێکم دەبێ، یـانی بیر لە چی دەکەمەوە؟... ئەی خوایە، گاڵتەجاڕانەیە ئەم هەلیتوپەلیتە گەمژانانەی من، کۆمەڵێ کێشـمەکێشـی زەینیی هـاکەزایی و گـاڵتەجـاڕانە! هەڵبەتە لە خۆشـــیـدا گەلێـک ســـەرنجڕاکێشـــە... هەهەهە! ئەم بیرکردنەوە پڕوپووچانە چین بە سەرمدا دێن؟ هەمدیسان وا دەبمەوە بە منال! من وا خەریکم لەبەردەم خۆشـمدا نواندن دەکەم! ئێسـتە شـــەرم لە چی دەکەم؟ ئاه! ئامان لەم شانلێدان و پالپالێنە! ئەو زلحۆیە -لام وایە ئەلمانی بوو- کە خۆی لێ دام و پالیشی پێوە نام، باشە ئێستە دەزانێ پالی بە کێوە ناوە؟ ژنێکی لادێییش بە منالێکەوە لێرەدا خەریکی سـوالکردنە، ئەوە سـەنجڕاکێشـە ژنە لای وایە من لەو بەختەوەرترم! بۆ قەشـــمەریاتیش بێ، لەوانەیە شـــتێ بخەمە مشـــتییەوە! ئاخ، چ چێژێکی هەیە! بەخبەخ، گیرفانم پێنج کۆپیکییەکی تێدا ماوە... لە کوێم بوو؟*

– ها، ها... بیگرە، خاتوون گیان!

– خوا بتپارێزێ!

دەنگی کەساسانەی ژنە دێهاتییەکە هات.

ڕاســـکۆلنیکۆف چووە مەیدانی ســـێننایاوە. ئەوە هیچ کە دڵی پێی خۆش نەبوو، زۆریش بەوە پەســـت دەبوو کە خۆی بەنێو خەڵکی ئاســـاییدا بکات، کەچی لەگەڵ ئەوەشـــدا ڕێک چووە شـــوێنێک کە قەڵەباڵقیی زیاتر بوو. ئامادە بوو چیی هەیە بیبەخشـــێت تەنیا بەو مەرجەی کە تەنیـا بێت، وەلێ دەیزانی تەنـانەت بۆ یەک ســـاتیش بەرگەی ئەوە ناگرێت تەنیا خۆی بێت و خۆی. ســـەرخۆشـــێک لەنێو ئاپۆڕای خەڵکەکەدا بوو کە بە جووڵە و هەلسوکەوتی ناجۆر دەیویست سەما بکات و هەر وا پێشـی دەخلیسکا و دەکەوت. خەڵکیش دەوریان دابوو. ڕاســـکۆلنیکۆف بە گوشـــار دڕی بە قەڵەباڵقییەکە دادا و بەرەو پێش چوو، چەند ســـاتێک لە کابرای ســـەرخۆش ڕاما و کتوپڕ، زۆر

کتوپڕ و بە دەنگی بەرز پێکەنی، بەڵام تەنانەت خولەکێکیشــی پێنەچوو کە ئەوی لە بیر کرد و دەتگوت ئیدی ناشــیبینێت. دواجار لە کابرای ســەرخۆش و قەڵەباڵقییەکە دوور کەوتەوە. نەیدەزانی لە کوێیە؛ بەس کاتێک گەیشــتە ناوەڕاســتی گۆڕەپانەکە، لەناکاو شــەپۆلی هەســتێکی نامۆ گیانیی تەنییەوە، هەموو گیانی، جەستە و زەینی.

لەپڕ قســەکانی ســۆنیای بیر هاتنەوە: *هەر ئێســتە دەچی و لەســەر چوارڕیانەکە دەوەستی، دەکەویە سەر ئەژنۆ، سەرەتا ئەو خاکە ماچ دەکەی کە حورمەتیت نەگرت و پاشــانیش لەبەردەم هەموو دنیادا، ڕوو لە چوارقوڕنەی جیهان، ســەر دادەنەوێنی و بە هەموو خەڵکی دەڵێی: من بکوژم!* تەنانەت بە بیرهێنانەوەشــی ســەرتاپێی کەوتە لەرزین. ئەشــکەنجە و شــڵەژانی ئەو ماوەیە، بەتایبەت ئەم چەند کاتژمێرەی کۆتایی، بە چەشــنێک هەناســەی لە بەر بڕیبوو کە نەســرەوتانە پڕی بە بەختی ئەزموونکردنی ئەم هەســتە دەگمەن و پووخت و تەواوەدا کرد. هەستێکی دەگمەن کە کتوپڕ وەک هەڵمەتێکی دەماری یەخەی گرتبوو، دەتگوت ئەو پزیســکەی ناو ڕۆحی خەریکە ئاگر بەردەداتە هەموو گیانی. هەرچی لە دەروونیدا بوو، لەپڕ نەرم بوو و فرمێسکی بە چاوانیدا هێنا. ئیدی لە جێگەی خۆیدا کەوتە ســەر زەوی...

لە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکەدا کەوتە سەر چۆک، کڕنۆشی بۆ خاکەکە برد و، حەیران، بە چێژ و جۆشــێکی نیوەبێهۆشــانەوە ماچی کرد. سەری هەڵبڕی و دیسان سوژدەی بردەوە.

– ئەمەش ئیتر وا دەکەوێتە بازارەوە!

گەنجێک کە بە چواردەوریدا دەسووڕایەوە، ئەمەی گوت.

قاقای پێکەنینی کەسانی چواردەوری بەرز بووەوە.

– برایان، هاورێکەمان بە خێر دەچێ بۆ ئۆرشەلیم! وا ئێستەش خەریکە داوای گەردنئازادی لە کەسوکار و سەرزەوییەکەی دەکا! وا ماڵئاوایی دەکا. لەبەردەم هەموو دونیادا سەری دانەواندووە و وا خاکی پاکی پیتەربورگی گەورە و پیادەڕێکانی ماچ دەکا.

کرێکارێکی تا ڕادەیەک کەیفساز ئەمەی گوت.

کەسی سێیەم ئاماژەی پێ کرد:

– خۆ ئەمە تەمەنێکی وای نییە!

دانەیەکی دیکەیان جددی و هۆشمەند ڕای خۆی دەبڕی:

– بابە کابرا کەسێکی ماقووڵە!

– ڕۆژگارێکی تووشە کاکە! بۆ دەکرێ ماقووڵ و ناماقووڵ لە یەک جیا بکەیتەوە!

دەربڕینی سەرسامیی خەڵکی و بۆچوونی جیاوازیان وای کرد زمان بشکێتە دەمی ڕاسکۆڵنیکۆف و چەند وشەیەکی کلیلیی کۆتایی، *من بکوژم، مرۆڤم کوشتووە*، کە دەتگوت هاکا لە دەمی دەرپەڕین، لە جێوە وشک ببن. سەرەڕای هەموو ئەمانەش، پشوودرێژانە تانەکانی بە ئاسایی وەرگرتن و هیچی نەگوت؛ بێ ئەوەی تەنانەت سەیری چواردەوری بکات، خۆی بە شەقامێکدا کرد کە بەرەو خوار دەبووەوە تا دەگەیشتە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس. لە ڕێگەدا تووشی دیمەنێک هات کە هیچ سەرسامی نەکرد، دەتگوت هەستی کردبوو کە هەر دەبێ بەو جۆرە بێت. دووەم جار کە لە سێنناپادا کڕنۆشی بۆ خاک بردبوو، لە دووریی پەنجا هەنگاوێک و لەلای چەپییەوە، چاوی بە سۆنیا کەوت. کچە لەپشت یەکێک لە هۆدە تەختەییەکانی بازارەوە خۆی لەو شاردبووەوە. کەواتە سۆنیا لەو ڕێگە پڕ لە ئازارەدا شوێنی کەوتبوو! ڕاسکۆڵنیکۆف هەر لەوێ و بۆ ماباقیی تەمەنی تێگەیشت کە ئیدی

سۆنیا بە تەنیا جێی ناهێڵێت و تا ئەوپەڕی دونیاش دەکەوێتە شوێنی، تا هەر کوێ کە چارەنووس ئەوی لەگەڵ خۆیدا دەبرد. دڵی گوشـــرا... وەلێ ئیدی دوو هەنگاوێکی مابوو بۆ شوێنی مەبەست.

ڕاســــکۆڵنیکۆف، فرە لێبڕاو، دەتگوت هەنگاوی نەنا، بەڵکە فڕکەی کردە نێو گۆڕەپـانی بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیســــەوە. دەبوو تـا نهۆمی ســێیەم ســەربکەوێت. لەبەرخۆوە بیری کردەوە: *ســەرەتا دەبێ بەم هەزار پلیکانە سندانیانەدا مل بنێم و سەرکەوم!* هەستی دەکرد هێشتا لەو ساتە چارەنووسسازە دوورە و دەتگوت جارێ کاتێکی زۆری بۆ سەنگوسووککردنی هەلومەرجەکە و بڕیاردان لە بەردەستدا ماوە.

دیسان هەمان زبڵ و توێکڵە هێلکە و شتی سەر پلیکانە مارپێچەکان؛ دیسان یارۆ ئەپارتمانەکان بەو دەرگە کراوانە و مووبەقگەلی پڕ هاڵاو و بۆگەنەوە. ڕاســــکۆڵنیکۆف لە یارۆ ڕۆژەوە ئیدی نەهاتبووە ئەوێ. پێیەکانی بێهەســـت بوون و لەژێر کۆنترۆڵیدا دەر دەچوون، وەلێ هەر وا بەرەو پێش هەنگاوی دەنا. بۆ ساتێک ڕاوەستا تا هەناسەیەکی تازە بدات و خۆیشـی کۆ بکاتەوە؛ ئەوسـا وەک *ئادەمزاد* بچێتە ژوورێ. *جا بۆچی؟ بۆ نموونە تا چی ببێ؟ وەک ئادەمزاد* خۆی گرت و ئەمانەی بە زەینیدا ڕابردن. *ئەگەر بڕیارە ئەم جامی ژەهرە بخۆمەوە، ئیتر چ جیاوازییەکی هەیە؟ تا ناخۆشتریش بێ، باشترە!*

هاوکات قەڵافەتی ڕاگری هەڵەشـــــە، ئیلیا پیترۆڤیچ، هاتە بەرچاوی. *ئێستە کێ گوتوویەتی دەبێ بەبێ گومان هەر بچمە لای هەڵەشە؟ یانی کەســێکی تر شــک نابەم؟ ئەی نیکۆدیم فۆمیچ... ناتوانم هەر ئێســتە بگەڕێمەوە و بچمە ماڵەکەی و لەوێ چاوم پێی بکەوێ؟ لانیکەم بەم جۆرە دەکرێ بەتایبەتی بابەتەکە برێندرێتەوە... نا، نا! ڕاگری هەڵەشە! ئەو خۆی بۆ ئەم کـارە کراوە!* ئەگەر بڕیـار بـا جـامی ژەهرەکە بخواتەوە، دەبوو دەستبەجێ هەڵیبدات.

بە سەراپای تەزیو و تا رادەیەک هۆشیارەوە، دەرگەی بەڕێوەبەرایەتیی کردەوە. ئەم جارەیان ئەوێ لە چەند کەسێک زیاتری لێ نەبوو، قاپچیی بیناکە و یەک دوو لادێیی و کەسی ئاسایی. پاسەوانی بەردەرگەکە تەنانەت لەپشت تۆڕەکەشییەوە سەرەتاتکێیەکیشی نەکرد تا تازەهاتووەکە ببینێت. ڕاسکۆلنیکۆف لە دەرگەی سەرەکی تێپەڕی و چووە ژووری دواترەوە. *لەوانەیە ئێستەش ناچار نەبم هیچ بڵێم!* ئەم بیرکردنەوەیە وەک برووسکە بە مێشکیدا ڕابرد. بە ڕوواڵەت فەرمانبەرێک کە یۆنیفۆرمی لە بەردا نەبوو، خەریکبوو لەپشت مێزەکە جێگیر دەبوو تا شتێک بنووسێت. لە لایەکی دیکەی ژوورەکەوە فەرمانبەرێکی دی دانیشتبوو. زامیۆتۆف دیار نەبوو و هەڵبەتە نیکۆدیم فۆمیچیش لەوێ نەبوو.

– لێرە نین؟

ڕاسکۆلنیکۆف ئەمەی لە فەرمانبەرەکەی پێشتر پرسی.

– ئیشتان بە کێ هەیە؟

لەولاوە کتوپڕ دەنگێکی ئاشنای بەر گوێ کەوت:

– ئاااااە! پارساڵ هاوڕێ، ئەمساڵ ناسیاو! خێرە لەم ناوەدا! ئێوە لە کوێ و، ئێرە لە کوێ! بێ دەنگ، بێ ڕەنگ، بێ هەواڵ... بۆنی ڕووسی و شت... ئاخ، چی بوو دواتر وەک ئەو ئەفسانە ڕووسییە دەڵێ... بیرم چوو! لە خزمەتداین، قوربان!

ڕاسکۆلنیکۆف لەرزی لێ نیشت. ڕاگری هەڵەشە لەبەردەمیدا قوت بووبووەوە، هەر لەو ساتەدا لە سێیەمین هۆدەوە هاتبووە ژوور. ڕاسکۆلنیکۆف لەبەرخۆوە بیری کردەوە: *دە فەرموو، ئەوەش دەستی چارەنووس؛ قسمەتەکە ئەمەیە. باشە ئەمە چی دەکا لێرە؟*

– هاتوونەتە سەردانمان؟ چ فەرمانێکتان هەبوو، هاوڕێی دلۆڤان؟

ئیلیا پیترۆڤیچ دەنگی هەڵبڕیبوو. دیار بوو کە بە تەواوی کەیفکۆکە و تەنانەت تۆزێکیش خۆشجەو.

– ئەگەر کـاری فەرمـانگەتـان هەیە ئەوا زۆر زوو هـاتوون[1]، خۆوبەختیش منتان دەست دەکەوت... بەهەرحاڵ لە خزمەتتاندام. دەبێ ڕایگەیەنم جەنابی... ئێ، بەڕێز... ببوورن...

– ڕاسکۆڵنیکۆف.

– بەڵێ، بەڵێ! جەنـابی ڕاســـکۆڵنیکۆف. نەکا لاتـان وا بێ نـاوی شــــەریفتانم بیر چووە! من لە فەرامۆشـــکارەکان نیم... ڕۆدیۆن... ڕۆدیۆن ڕۆدیۆنۆڤیچ! ڕاستم گوت، وایە؟

– ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ.

– ئاخ، بەڵێ، بەڵێ! ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ! لەســـەر زمانم بوو! تەنانەت زۆریشـم پرسـی. بڕوا بکەن زۆر زۆر نارەحەتم کە... کە ئەو کاتە بەو جۆرە خراپە هەڵســـوکەوتم کرد... پاشـــان پێیان گوتم کە ئێوە ئەهلی قەڵەمن و... بڕوانـامەدار و زۆریش تێگەیشـــتوو، کە هیچی واتـان لە مـامۆســــتـا ڕاســــتەقینەکـان کەم نییە... دەی، وەک دەڵێن یەکەمین هەنگاوەکان... ئای خوای گەورە! کێ هەیە ئەهلی قەڵەم و زانســـت بووبێ و هەڵســـوکەوت و خووی تـایبەت بە خۆی نەبێ! من و هاوســـەرەکەم بێڕادە ڕێز و حورمەت بۆ ئەدەبیات دادەنێین؛ ئەوە خۆ ئەوان ســـەریان بۆی دەخورێ و دڵیان لێ دەدا بۆ ئەدەبیات! هونەر و ئەدەبیات! هەر ئەوەندە بەســـە ســـەروکاریت لەگەڵ کەسـێکی ماقووڵدا هەبێ، ئەوی دیکەی ئیتر لێهاتوویی و فێربوون و هەســـتی بەهێزی و بەهرەیە. بۆ نموونە کڵاو، باشە ئەسڵەن کڵاو چییە! چ گرنگییەکی هەیە

---

[1] لێرەدا پێدەچێت خودی دۆستۆیفسکیش لە بیری چووبێت کە کاتی خۆرئاوابوونە و کۆتا جار کە ڕاســـکۆڵنیکۆف ســـەردانی بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیســـی کرد، کاتژمێر دووی پاشنیوەڕۆ بوو و پێی ڕاگەیەندرا کە زۆر درەنگ هاتووە. «و. ک»

ئاخر کڵاو؟ زۆر بە ئاسانی دەکرێ کڵاو بکڕی، هەر لەم *زیمرمان*ـەی خۆمان، وەک ئەوەی بچی سـەموون بکڕی! وەلێ ناتوانی ئەوەی ژێر کڵاوەکە بکڕی! نەخێر، ئەو شتەی کە کڵاو دایدەپۆشێ هی کڕین نییە! تەنانەت ویسـتم بێم و داوای لێبووردنتان لێ بکەم، وەلێ گوتم ڕەنگە ئێوە... ئەی هاوار، هەر بیرم دەچێتەوە بپرسـم، ئێسـتە ئەمریکتان هەبوو؟ بیستوومە خێزانەکەشتان تەشریفیان هێناوەتە پیتەربورگ؟

– بەڵێ، دایک و خوشکم.

– شانازیی دیداری خوشکتانم بە نسیب بووە، زۆریش خۆشحاڵ بووم! خاتوونێکی چەندە سـەلارن، چەندە شـارسـتانی، چەندە سـەرنجڕاکێش! دانی پێدا دەنێم کە دواتر زۆر لەو توندوتیژییەم بەرانبەر بە ئێوە ناڕەحەت بووم، نەدەبوو لێگەڕێین ئەوە ڕوو بدا! دەی، تەواو بوو. ئێتر دووبارەش نابێتەوە! هەر ئەو بوورانەوە و بێهازییە دەمێنێتەوە، کە گوماناوی بوو بە ڕای من، ئەویش زۆر زوو ڕوون بووەوە هۆکارەکەی چی بووە! هەمووی بەرهەمی دەمارگیری و خورافاتە! دەزانم کە لە بەردڵتان گران بووە. ڕەنگە ئێسـتە کە خێزانەکەتان هاتوونەتە لاتان، بەتەمای گواستنەوە بن، ها؟

– نا... نا. تەنیا هاتم بپرسـم... یانی وای بۆ چووم بەڕێز زامیۆتۆف لێرە بدۆزمەوە.

– ئەها، بەڵێ! هەڵبەتە، هەڵبەتە! بیسـتم کە هاوڕێت پەیدا کردووە! دەی، بە داخەوە ئەوان لێرە نین، بەخت یارتان نەبوو ئەمڕۆ. بەڵێ، بەڕێز! لە دەسـتمان چوو زامیۆتۆف! لە دوێنێوە لامان نییە... ڕۆیشت و کاتی ڕۆیشـتنیش لەگەڵ هەمووان کردیە شـەڕ... تەنانەت گوێی بە ڕێزومێزیش نەدا! هەر وا مەزاجی و بێبار بوو، هەر وای لێ دێ! وا دەردەکەوت بکرێ پێیدا بپەرمیت، وەلێ خۆتـان دەزانن ئەم گەنجە زیرەک و لێهاتووانەمان چییان بەسەر هاتووە ئێترا دەتگوت لە شوێنێ

بەتەمای تاقیکردنەوەیە، وەلێ خۆ بە قســـە و پۆزی ناوبۆش بڕوانامە نادەنە دەست کەس! هەڵبەتە مەسەلەی ئێوە یان بەڕێز ڕازومیخین — هاوڕێ ئازیزەکەتان— زۆر جیاوازە. هەر چۆنێ بووە کاری ئێوە لە بواری توێژینەوە و ئەدەبیات و ئەم جۆرە شـــتانەدایە. بەخت و شکستیش ئێوە لە ڕێگەکەتان لا نادا. لە چاوی کەسانی وەک ئێوەوە، ئەم ژیانە هیچە، لەوانەشـــە ئێســـتە باقوبریقێکی هەبێ، وەلێ تەنیا ڕووالەتی بابەتەکەیە و لە بنەڕەتدا هیچ نییە. ئەســـلەن با بلێین ئێوە تەرکەدونیا و ڕاهیبن!... کتێب بگرن بە دەســـتانەوە، قەڵەمێکیش بخەنە پشـــت گوێتانەوە و گوتار و بابەت و توێژینەوە و ئەمانە بنووســـن... ئێوە مەراقتان ئەم شـــتانەیە! من خۆشـــم هەر بە ڕاســـتی وام!... ئەرێ سەفەرنامەی لیڤینگستۆنتان[1] خوێندووەتەوە؟

— نەخێر، نەمخوێندووەتەوە.

— دەی، من خوێندوومەتەوە. وەلێ لەم ڕۆژانەدا هەر نیهلیســـت و شـــتە و بە شـــان و کۆڵماندا هەڵدەگەڕێ و هەر وا بە چواردەورماندا دەخوولێنەوە، جێی سەرسامیش نییە هەڵبەتە. بە چاوی خۆتان ببینن کەوتووینەتە چ ڕۆژگارێکەوە ئاخر؟ وەلێ دەی، من و ئێوە... ئەرێ خۆ ئێوە نیهلیست نین؟ تکا دەکەم ڕاشکاوانە وەڵامم بدەنەوە، ڕاشکاو!

— نا، نیم.

— نا، ڕاشـــکاو بن لەگەڵ من، هەر زۆر ئاســـوودە بن! وەک ئەوەی لەگەڵ خۆتاندا دەمەتەقێ بکەن! ئەرک و بەرپرســـیارییەتیی پیشـــەیی مرۆڤ شـــتێکە وەلێ... ئەها! واتان زانیوە دەمەوێ بڵێم هـاوڕێیەتی شـــتێکی ترە؟ نـا، بە هەڵەدا چوون! هـاوڕێیەتی نـا، هەســـتی شارستانیبوون، هەستی ئینسانبوون، ئەسڵەن ئینسانیەت و عەشقی پەرستراوێ شتێکی ترە. من با وەک دەڵێن، پاســەوان و بەرئەرک و

[1] دیوید لیڤینگستون (۱۸۷۳-۱۸۱۳)؛ جیهانگەڕی ئینگلیزی. «و. ف»

فەرمانبەری دەوڵەت بم، وەلێ هەمیشــە ســەرەتا خۆم بە ئینســان و ئەندامی کۆمەڵگە دەزانم، ئەندامێک کە دەتوانێ هەســتێ و حســێب بۆ قســەی بکرێ... هەر ئێســتە ناوی زامیۆتۆفتان برد. ئەرێ، ئائەم زامیۆتۆفە هەر کە هەنگاوی نایە شــوێنگەلی ناوزڕاو و بەدپێشــینە، دوور نییە گەندەکارییەک و شــوورەییەک بهێنێتە ئارا. جا بە مۆدێلە فەرەنسییەکەشی! تەنیا بە یەک پەرداخ شامپانیا یان شەرابی دەن!... بەڵێ، زامیۆتۆف هەر بە تەنیا ئەوەی لێ دەوەشــێتەوە و هیچی تر! وەلێ من وەک دەڵێن کەســێکم ســەراپام تەژییە لە هەســتی بەرز و بەرپرسیارییەتی و، دەی، پێگەیەکیشم هەیە، پلەدارم، پۆستیان پێ دام دواجار! ژن و منالیشــم هەیە، هاولاتییەک و ئینســانێک چیی لە ئەستۆدایە، منیش لە ئەستۆم ناوە و ئەنجامی دەدەم. وەلێ –هەرچەند بێڕێزیشــە– زامیۆتۆف ئیتر چ کەرێکە! ئێوە خوێندەوارن و هەر ئەم خوێندەوارییەش بووە کە وای کردووە گەشە بکەن، فەرموون وەڵامی من بدەنەوە... یان بۆ نموونە گریمانەی ئەم مامانانە بکەن! ئاخر مەسەلە چییە! وەک مار و مێروو بەم شارەدا پژاون!

ڕاسکۆڵنیکۆف برۆیەکی پرسیارئامێزی هەڵبڕی. لافاوی ڕستەکانی ئیلیا پیترۆڤیچ، کە دیار بوو تازە لەسەر مێزی نانخواردن هەستاوە و ســکی پڕە، تەنیا دەنگێکی بێمانا بوو و بەســەر ئەودا دەڕژا؛ لانیکەم بەشــی هەرە زۆری. وەلێ دواجار لە بەشــێکی کەمی قســەکانی تێگەیشــت. هەر وا پرســیارئامێزانە لەوی دەڕوانی کە ئاخۆ بڕیارە ئاخرییەکەی ئەم قسە هەلەقومەلەقانە بە کوێ بگەن.

– ئەم زەعیفە تیتبڕاوانە دەڵێم ئیتر.

فرەڕێسیی ئیلیا پیترۆڤیچ سنووری نەبوو.

– من پێیان دەڵێم مامان! لاشــم وایە زۆر ئەم ناوەیان لێ دێ! هەهەهە! دەچنە قوتابخانەی پزیشــکی، توێکاری دەخوێنن بە ناخێری

گیانیان![1] یانی گەر من نەخۆش بکەوم، بڕیارە بنێرمە شوێن یەکێ لەم خاتوونانە تا تەشریف بێنن و چارەسەرم بکەن؟ هەهەهەهە!

ئیلیا پیترۆڤیچ دایە قاقای پێکەنین، زۆر کەیفی بە وردی و زیرەکیی خۆی هاتبوو.

– جۆرێک لە چلێسی و پەرۆشی بۆ فێربوون و ڕۆشنگەری و ئەمانە، باشە. وەلێ خۆ مرۆڤ دەبێ سنووری خۆی بزانێ. بۆچی ئەم هەلەی کە کەوتووەتە بەردەستتان، بە خراپی سوودی لێ وەردەگرن؟ بۆچی سووکایەتی بە کەسانی حورمەتدار و سەنگین دەکەن؛ کاریان وەک کاری ئەم زامیۆتۆف خانەی خۆمان وایە. ئاخر بفەرموون ئەوان بۆچی دەبێ سووکایەتی بە من بکەن؟ ها؟ یان ئەم هەموو خۆکوژییە! باوەڕ ناکەن چەندە ئاسایی بووەتەوە ئەم مەسەلەیە... هەڵدەستن سووک و ئاسان خۆیان دەکوژن! هەموو پارەکەیان خەرج دەکەن و پاشان خۆیان دەکوژن، ئەم مەسەلەیەش کچ و کوڕ و پیرەمێردی بۆ نییە... بۆ نموونە هەر ئەم بەیانییە هەواڵی خۆکوژیی ئەم تازەهاتووەیان هێنا، وا دیارە کەسێکی بەڕێزیش بووە و تازە هاتووەتە پیتەربورگ. *نیل پاولیچ*، گوێتان لێمە؟ ئەهۆۆۆۆو، نیل پاولیچ، لەگەڵ ئێوەمە! ئەو کەسە ناوی چی بوو کە دوێنێ لە دەوروبەری پیتەربورگدا خۆی کوشت؟

– سڤیدریگایلۆڤ.

دەنگێکی خەواڵوو لە ژوورەکەی تەنیشتەوە بێتاقەت و بێزار وەڵامی دایەوە.

ڕاسکۆڵنیکۆف خراپ ڕاچەنی و ڕاست بووەوە.

---

١. لە ڕووسیای سالانی شەستدا، ژنان دەیانتوانی لە ڕێکخراوی فێرکاریی باڵا دوو پسپۆڕیی دایەنی یان مامۆستایی بخوێنن کە تەنیا لە ئەکادیمیای پزیشکیی پەتەربورگدا وانەی بەشی دایەنییان دەگوتەوە. «و. ف»

– سفیدریگایلۆف! سفیدریگایلۆف بە گوللە خۆی کوشتووە!

– چی بوو؟ ئەم سفیدریگایلۆفە دەناسن؟

– بەڵێ... دەمناسی... تازە هاتبووە پیتەربورگ.

– بەڵێ، وایە. لەم دواییانە ژنەکەیی لەدەست دابوو. کەسێکی هەرزەش بووە کابرا. کتوپڕ گوللەیەکی بە سەرییەوە ناوە؛ جا فەرموون، ڕسوایییەکی باوەڕپێنەکراو... لە دەفتەرەکەشیدا چەن وشەیەکی لەبارەی خۆکوژییەکەیەوە یادداشت کردووە، کە لە بارێکی جێگیری ئەقڵیدا ئەم کارە دەکا و هیچ کەسێکیش لە مردنی بەرپرسیار نییە. وا دیارە دەوڵەمەندیش بووە... وا دەڵێن. ئەی ئێوە چۆن دەیناسن؟

– ئێمە... ئاخر چۆن بیڵێم، بە خێزان ناسیاوی یەکتری بووین... خوشکم لە ماڵەکەیاندا مامۆستا بوو.

– بەخ... بەخ! کەواتە دەتوانن بە جۆرێ لە جۆرەکان باسیمان بۆ بکەن! ئادەی، گومانتان لە هیچ شتێ نەکردبوو؟

– هەر دوێنێ بینیم... دانیشتبوو و دەیخواردەوە... من چووزانم!

ڕاسکۆڵنیکۆف هەستی دەکرد بارێکی قورسی بەسەردا کەوتووە و وا دەخنکێت.

– ئەی هاوار، خۆ هەمدیسان وەک گەچی دیوارتان لێ هاتەوە! ڕەنگتان بە ڕووەوە نەماوە. ئێرەش زۆر تاسێنەرە...

– بەڵێ، قوربان... بڕۆم باشترە.

ڕاسکۆڵنیکۆف بە زۆر لەژێر لێوەوە ئەمانەی فڕێ دان.

– ببوورن کە کاتم گرتن...

– نە بابە، لە خزمەتتاندام! کاتگرتنی چی... هەر کات حەزتان کرد سەردانمان بکەن. زۆر دڵخۆش دەبم بە دیدارتان! جێی شانازییە کە بڵێم...

ئیلیا پیترۆڤیچ تەنانەت دەستیشی بۆ ڕاسکۆڵنیکۆف درێژ کرد.

– ڕاستییەکەی تەنیا دەمویست... هاتبووم چاوم بە زامیۆتۆف بکەوێ.

– دەزانم... دەزانم. بەهەرحاڵ دڵخۆش بووم بە سەردانەکەتان.

– من... منیش زۆر دڵخۆش بووم... لای ئێوە خۆش...

ڕاسکۆڵنیکۆف بزەیەکیشی کرد.

دواجار چووە دەرێ. چەپ و ڕاستی دەکرد و سەری دەسووڕا و نەیدەزانی خەریکی چییە. دەستی ڕاستیی نا بە دیوارەکەوە تا بتوانێت بە پلیکانەکاندا داگەڕێت. وای هاتە بەرچاو وەرزێرێک کە دەفتەرێکی لە بنباڵدا بوو و بەرەو بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس سەر دەکەوت، خۆی بەودا کێشا و سەگێکیش لە نهۆمی خوارەوەدا بە دەنگێکی گوێکەڕکەر حەپاندوویەتی تا ئەوەی ژنێک تیرۆکەکەیی گرتووەتە سەری سەگەکە و قرووسکەی لێ هەستاندووە.

گەیشتە خوارەوەی پلیکانەکان و چووە ناو گۆڕەپانەکە. هەر لەوێ، لە نزیک دەرگەی سەرەکییەوە، سۆنیا، ترساو و ڕەنگپەڕیو، ڕاوەستابوو. سۆنیا نیگایەکی وێڵی گرتە ئەو. ڕاسکۆڵنیکۆف بێجووڵە لەبەردەم ئەودا ڕاوەستا. ئەشکەنجەیەکی بەسوێ و جگەرسووتێنی تێکەڵ بە بێهیوایی لە نیگای سۆنیادا دەباری. کچە دەستەکانیی لێک گرێ دان. لێوەکانی ڕاسکۆڵنیکۆف بە زەردەخەنەیەکی ناشیرین و بێمانا کرانەوە. بۆ خولەکێک هەر وا بەبێ جووڵە ڕاوەستا و ژارخەندێکی کرد. پاشان سووڕایەوە و سەر کەوت بۆ بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس.

ئیلیا پیترۆڤیچ ڕاوەستابوو و سەری لەسەر کۆمەڵێک کاغەز بوو و بەدوای نامە و شتدا دەگەڕا. یارۆ ئەو وەرزێرەی کە لە پلیکانەڕێکەدا

خۆی بە ڕاسکۆڵنیکۆفدا کێشابوو، دەفتەربەدەست لەبەردەم ئیلیا پیترۆڤیچدا ڕاوەستابوو.

– هاااا! ئەوە گەڕانەوە! شتێکتان جێ هێشتووە؟... ئادەی، چی بووە؟

ڕاسکۆڵنیکۆف، بە لێوی سپی و چاوانێکی دەرپۆقیوەوە، هێمن‌هێمنێک هاتە پێش. ڕاستەوخۆ چووە لای مێزەکە و دەستی خستە سەری؛ ویستی شتێک بڵێت، بەڵام نەیتوانی. تەنیا دەنگگەلێکی ناڕوون لە گەروویەوە دەهاتنە دەر.

– دەبێ حاڵتان تێک چووبێ! کورسی بێنن! فەرموون دانیشن لێرە، فەرموون! ئاو بێنن!

ڕاسکۆڵنیکۆف خۆی بەسەر کورسییەکەدا دا، وەلێ چاوی لە ئیلیا پیترۆڤیچی سەرسووڕماو کلا نەکرد. بۆ خولەکێک لە یەکدی ورد بوونەوە و هیچیان نەگوت. ئاویان هێنا.

– من بووم کە...

– ڕاسکۆڵنیکۆف بەم جۆرە دەستی پێ کرد.

– فەرموون تۆزێ ئاو بخۆنەوە!

ڕاسکۆڵنیکۆف بە دەست ئاوەکەی لادا و هێمن بەڵام ڕوون و ئاشکرا، برگەبرگە وشەکانی دەربڕین:

– من بووم کە ئەو پیرێژنە سووخۆرە و لیزاڤێتای خوشکیم بە تەور کوشتن و دزیم لێ کردن.

ئیلیا پیترۆڤیچ دەمی بەش بووەوە. هەر خەڵک بوو لە هەر لایەکەوە دەڕژایە دەوریان.

ڕاسکۆڵنیکۆف پێهاتنەکەی دووبارە کردەوە...

# کۆتایی

ئێره ســـیبیریایه. له قەراخ ڕووبارێکی دوورەدەســـت و بەریندا، شـــارێک بنیاد نراوه که به یەکێک له بنکەکانی بەڕێوەبەریی ڕووســـیا دادەنرێت. له ناوەڕاســـتی ئەم شـــارەدا قەڵایەک هەیه و له قەڵاکەشـــدا زیندانێک.[1] ئێسته له زینداندا وا بۆ نۆ مانگ دەچێت که سزادراوێک به ناوی ڕۆدیۆن ڕاســـکۆڵنیکۆفەوه به ســـزای پله دوو: دوورخرانەوه لەگەڵ بێگاریدا، زیندانی کراوه و وا ســـاڵ و نیوێک بەســـەر ماوەی زیندانیبوونەکەیدا تێدەپەڕێت.

له درێژایی دادگاییکردنەکەدا هیچ کێشـــەیەک نەهاته پێش. تاوانبار توند و ڕوون و ورد لەســـەر پێهاتنەکانی خۆی مایەوه. نه گۆڕانکاریی له وردەکارییەکاندا کرد، نه له بەرژەوەندیی خۆیدا هیچ شـــتێکی به پێچەوانەی ڕاستییەوه نیشـان دا و نه چاوپۆشـیی له بچووکترین خاڵ کرد. هەنگاو به هەنگاو به وردی تاوانەکەی ڕوون کردەوه و تەنانەت نهێنیی ئەو بارمتەیەشـی ئاشـکرا کرد، هەمان ئەو پارچه تەختەیەی که ڕووپۆشـێکی کانزایی هەبوو و له دەسـتی کوژراوەکەدا دۆزرابووەوه. به تێروتەســـەلی ڕوونی کردەوه که چۆن کلیلەکـانی پیرێژنەکەی هەڵگرتوون، ئەســـڵەن کلیلەکان چۆنچۆنی بوون، جانتای پیرێژنەکه و دۆلاب و شـتەکانی ناوی چی بوون. بابەتی کوشـتنی لیزاڤێتاشـی باس

---

[1] پێدەچێ ئەمه وەســفی شــاری ئومســک بێت که دەکەوێته خۆرئاوای ســیبیریا و کەناری ئەیرتیش، که دۆستۆیڤسکی چوار ساڵی له زیندانی ئەوێدا بەسەر برد. «و. ف»

کرد و ڕوونی کردەوە کە سـەرەتا کووخ و پاشـانیش ئەو خوێندکاری زانکۆیە لە دەرگەیان دابوو و وشـە بە وشـەش قسـەکانی گێڕانەوە. گوتی کە چۆن دواتر لە ئەپـارتمـانی پیرێژنەکەدا چووەتە دەر و بە پلیکـانەکـانـدا ڕایکردووەتە خوار و هـاتوهـاواری میکۆلای و میتریی بیسـتووە. پاشـان لەو ئەپارتمانە چۆڵەدا خۆی حەشـار داوە و دواجار چووەتەوە ماڵێ. لە کۆتایی پێهاتنەکانیشـدا ئاماژەی بە تلەبەرد و حەوشـەی چەپەکی پشت بولوار ڤازنیێ‌سنسکی کرد، کە کیفی پارەی پیرێژنە و خشـڵ و زەنبەر و چەند شـمەکێکی بارمتەی دیکەیان لەژێریدا دۆزییەوە. هەموو شتێک ڕوونی ڕوون بوو و یەک خاڵی لێڵ لەئارادا نەبوو. بەدەر لە خاڵگەلی دیکەی دۆسـییەکە، ئەم خاڵە کە تۆمەتبار کیف و شـمەکە بارمتەکانی لەژێر بەردەکەدا شـاردوونەتەوە و دەستی لێ نەداون، دادوەر و پارێزەرەکانی سەراسیمە کرد؛ تەنانەت لەوەش سەیرتر ئەوە بوو کە تۆمەتبار نەیدەتوانی بیر خۆی بهێنێتەوە کە کتومت بارمتەکان چین و بە گشـتی چەند دانە بوونە. نەدەچووە ئەقڵەوە کە بە هیچ شـێوەیەک کیفی پـارەکەی نەکردبێتەوە و هەر نەشـزانێت چەندە پارەی تێدا بووە. دەرکەوت کە سـێسـەد و حەڤدە ڕۆبڵی زیوی و سێ سکە لە کیفەکەدایە. چەند دانە ئەسکەناسی درشت کە لە سـەرەوە بوون، لەبەر ڕۆژانی دوورودرێژی مـانەوە لەژێر بەردەکەدا، بە تەواوی شـێیان هەڵهێنابوو. دادگە زۆری بۆ خۆی هێنا تا تێبگات تۆمەتبار –کە لەبارەی هەموو شـتێکەوە ڕاسـتییەکەی گوتووە و ڕاشـکاوانە پێهاتووە و تاوانەکەی لە ئەسـتۆ گرتووە– ئاخۆ بۆچی دەبێت لەبارەی مەسـەلەی کیفی پارەکەوە درۆ بکات. دواجار چەند کەسـێک، بەتایبەتی ئەوانەی کە سـەریان لە دەروونناسـیدا دەردەکرد، پشـتڕاسـتیان کردەوە کە هەر بە ڕاسـتی ئەگەری هەیە تۆمەتبار کیفەکەی نەپشکنیبێت و هەر لەبەر ئەوەش بە هیچ شێوەیەک ئاگاداری شتەکانی ناوی نەبووە و لەوپەڕی بێئاگاییدا لەژێر بەردەکەدا شاردوویەتییەوە. بەڵام لەگەڵ کرانەوەی ئەم باسەدا، دەمودەست بەو

ئەنجامە گەیشتن کە تاوانبارەکەدا تەنیا و تەنیا دەشێت لە کاتی شێتیی کاتیدا تووشـی ئەو تاوانە بووبێت، شـێتییەتیی کاتی لەژێر کاریگەریی ئـارەزووی لەڕادەبەدەر بۆ مرۆڤکوشـــتن و دزیکردن، نەک لەبەر ئامانجی ســـوودی ماددی. هەڵبەتە دواهەمین تیۆرییە مۆدێرنەکانیش لەبارەی شـــێتییەتیی کاتییەوە بەهـانـایـانەوە هـاتن. ئەم تیۆریـانە لە ســەردەمی ئێمە و لە دۆسـییە تاوانکارییەکان و پاسـاوبۆهێنانەوەیاندا زۆر بەکار دێن. لەگەڵ ئەوەشدا، چەندان شـایەتیش لەبارەی پێشینەی دووروودرێژی مـاڵیخولیـایی تـاوانبـارەوە لەگەڵ ئـامـاژەکردن بە وردەکارییەکان، شـایەتییان دا: دکتۆر زۆسـیمۆف، هاوڕێیانی دێرینی تاوانبار، خاوەنماڵەکەی و خزمەتکارەکەیان. هەموو ئەمانە ڕێیان بۆ بەئەنجامگەیاندنی کۆتایی خۆش کرد؛ ئەوەی ڕاسـکۆلنیکۆف بکوژ یان دزێکی ئاسـایی نییە و خاڵێکی دیکە لەم دۆسییەدا بوونی هەیە. کەچی تۆمەتبار بە زۆر هەوڵی دەدا بەرگری لە خۆی بکات و هەڵسـوکەوتی لە دادگەدا بە تەواوی لایەنگرانی تیۆریی شێتییەتیی کاتیی تووڕە کرد. تۆمەتبار هەر وا لە وەڵامی ئەم پرسـیارە چارەنووســـازەدا کە چ پاڵنەرێک ئەوی ناچار کردووە دەسـت بۆ کوشـتن ببات و بۆچی دزیی کردووە، زۆر بە ڕوونی –تەنانەت لەناو ڕاســتگۆییدا، بێشـــەرمانە– گوتی دۆخی نالەبار و هەژاری و بێچارەیی و داماوی هۆکار بووە و ئەوەی کە وای بیر کردووەتەوە بە یارمەتیی ئەو سـێ هەزار ڕۆبڵەی کە لای وا بووە لە ئەپارتمانی پیرێژنەکەدا دەســـتی دەکەوێت، ژیانی ڕێک بخاتەوە. سرووشتی پووچ و چەپەڵی ئەوی بەرەو تاوانکردن پاڵ ناوە، هەروەها نەبوونی پێداویستی و دەستکورتی و شکست لە ژیاندا ئەوی زیـاتر دنە داوە. لە وەڵامی ئەوەدا کە چی وای کرد دانی پێدا بنێت، گوتی پەشیمانی لە دڵەوە هۆکاری ئەوە بووە؛ هەمان ڕاشکاویی بێشەرمانە لە شێوازی قسەکردن و وشەکانیدا دیار بوو.

بەڵام سزاکەی لەوە سووکتر بوو کە چاوەڕوانیی دەکرا؛ هەڵبەتە لەبەر چۆنییەتیی تایبەتی ئەو تاوانە و لەوانەشە هەر بە ڕاستی لەبەر ئەوەی کە تۆمەتبار هەوڵی نەدابوو پاکانە بۆ کارەکەی خۆی بکات و تەنانەت حەزێکیشی نیشان دابوو تاوانەکەی گەورەتر نیشان بدات. هەموو لایەن و هەلومەرجە تایبەتی و سەیرەکانی ئەو دۆسییەیە لە بەرچاو گیران. لەبارەی دۆخی نائاسایی و جێداخ و هەژاریی تاوانبارەوە لە کاتی تووشبوونی تاوانەکەشدا هیچ گومانێک لەئارادا نەبوو. هۆکاری ئەوەش کە هیچ کەڵکێکی لە پارە دزراوەکە نەبینیبوو، درایە پاڵ پەشیمانبوونەوەی دواتری و ئەو بارودۆخە دەروونییە شپرزەیەی کە لە کاتی تاوانەکەدا تووشی بووبوو. کوشتنی بەرنامەڕێژی‌بۆنەکراوی لیزاڤێتاش لە خۆیدا بووە بەڵگەیەکی پتەو بۆ سەلماندنی دواهەمین گریمانەی بەرباسخراوی دادگە: پیاوێک تووشی دوو کوشتن دەبێت و بیری دەچێت دەرگەکەی دادڕیوە! لە کۆتاییشدا پێهاتنی تەواوەتی، جا ڕێک لە کاتی خۆیشیدا، لە کاتێکدا کە دۆسییەکە لەبەر شایەتیدانی درۆیینەی دەمارگیرێکی ماخولیایی –میکۆلای– کە خۆی بە بکوژ ناساندبوو، بە تەواوی شێوابوو، لە کاتێکدا کە هیچ بەڵگەیەک لە دژی بکوژی ڕاستەقینە لە بەردەستدا نەبوو و پۆلیسیش هیچ گومانێکی لە تۆمەتبار نەکردبوو –چونکە پۆرفیری تا کۆتایی لەسەر قسەی خۆی مایەوە– هەمووی دەستی دایە دەستی یەک تا دادگە سزاکەی بۆ سووک بکات.

هەڵبەتە هەندێک بابەتی دیکەی زۆر چاوەڕواننەکراویش لە بەرژەوەندیی تۆمەتباردا ئاشکرا بوون. ڕازومیخینی کۆنەخوێندکار، توانیبووی لە ڕێیەکەوە تێبگات و لە دادگەشدا بیسەلمێنێت کە ڕاسکۆڵنیکۆف لە سەردەمی زانکۆدا یارمەتیی یەکێک لە هاوپۆلە هەژارەکانی خۆی داوە کە سیلی هەبووە، تەنانەت تا شەش مانگ خۆی بە تەنیا خەرجیی کێشاوە و تا دواهەمین ڕۆبڵی خۆی لەودا

خەرج کردووە. بە مردنی خوێندکارە سـیلاوییەکەش، باوکە پیر و پەککەوتەکەی -کە کوڕەکەی لە سێزدە ساڵییەوە خەرجیی ئەوی داوە و تەنانەت پارووشی بە دەمەوە کردووە!- بێکەس دەکەوێ و هەمدیسان ئەوە ڕاسکۆڵنیکۆفە کە ئەو لە نەخۆشخانەیەکدا دەخەوێنێت و دوای مردنیشی خەرجی کفن و ناشتنەکەی دەدات. خاوەنماڵەکەی ڕاسکۆڵنیکۆف، خاتوو زارنیتسینای بێوەژن و دایکی کۆنە دەزگیرانەکەی ئەویش، شایەتیی دا کاتێک لە خانوویێکی دیکەی نزیک پێنجرپاندا نیشتەجێ بوونە، تاوانبار دوو منداڵی لە ئەپارتمانێکی گرتێبەربوودا ڕزگار کردوون و لە هەمان کاتدا دەست و باڵی خۆیشی سووتاوە. بەدواداچوونێکی تێروتەسەلیان بۆ مەسەلەی ئەو ئاگرکەوتنەوەیە کرد و چەند شایەتێکیشیان دەست کەوتن کە قسەی خاوەنماڵەکە پشتڕاست بکەنەوە. بە کورتییەکەی هەموو ئەمانە لە بەرژەوەندیی تۆمەتباردا تەواو بوون و کاریگەرییەکی ئەرێنییان لەسەر بڕیاری دادگە هەبوو. بەم پێیە، بە لەبەرچاوگرتنی پێهاتنی خۆخوازانە و ئەو هەلومەرجەی کە بۆ سووککردنی سزاکە لەئارادا بوو، ئەویان بە جۆری سزای پلەدوو، تەنیا بە هەشت ساڵ زیندانی بە بێگارەکارەوە سزا دا.

پولخێریا هەر لە سەرەتای دادگاییەکەوە نەخۆش کەوت. دونیا و ڕازومیخین وایان بە باش زانی تا کۆتایی دادگاییکردنەکە ئەو لە پیتەربورگ دوور بخەنەوە. ڕازومیخین شارێکی بچووکی لەسەر ڕێگەی هێڵی ئاسن هەڵبژارد کە هێندەش لە پتەربورگەوە دوور نەبوو، بۆ ئەوەی هەم بتوانێت ئاگاداری سەرلەبەری قۆناغەکانی دادگاییکردنەکە بێت و هەم بکرێت زیاتر چاوی بە دونیا بکەوێت. نەخۆشییەکەی پولخێریا کێشەیەکی دەروونی و دەماریی نامۆ بوو لەگەڵ جۆرێک لە شێتییەتیی کاتی. دونیا ئەو ڕۆژەی دوایی کە پاش دواهەمین دیدار لەگەڵ براکەیدا گەڕایەوە ماڵێ، سەیری کرد وا براکەی

نەخۆش کەوتووە و تـای لێ هـاتووە و ورێنە دەکـات. بۆ ئێوارەی هەمان ڕۆژ لەگەڵ ڕازومیخیندا بڕیاری دیداریان دانا تا بزانن ئاخۆ چ وەڵامێکی پرســـیـارە یەک بەدوای یەکەکـانی دایکی لەبـارەی ڕاســـکۆڵنیکۆفەوە بدەنەوە و لەبەر تەندروســـتیی دایکی چیرۆکێکیان پێکەوە نا کە ڕاسکۆڵنیکۆف دەبێ بەبۆنەی ئەرکێکی تایبەت بە کارەوە بچێت بۆ شوێنێکی دوورەدەست و سەرسنووری و ئەرکەکەشی پارە و پێشینەیەکی کاریی باشیی بۆ ئەو تێدایە. بەڵام پولخێریا هەرگیز، نە هەمان ئەو کاتە و نە دواتریش، هیچی نەپرسی و هەر ئەمەش ئەوانی بە تەواوی ســــەرســـــام کرد. پولخێریـا نەک هەر بە تەنیـا هیچی نەدەپرسی، بەڵکە ئەو چیرۆکی خۆی بۆ پێواربوونی کوڕەکەی هەبوو. بەدەم فرمێســـکڕشـــتنەوە بۆ دونیا و ڕازومیخینی گێڕایەوە کە ڕۆدیا هـاتووە مـاڵئاوایی لەو بکـات و گوتی تەنیا ئەوە کە ئاگاداری زۆر بابەتی گرنگ و پڕ لە نهێنی و ڕەمزە و ئەوەی کە ڕۆدیا دژمنگەلێکی فرە بەهێزی هەن و بە نـاچـاری دەبێـت لە شـــوێنگەلێکـدا خۆی بشــارێتەوە. لەبارەی داهاتووی پیشـــەیی ڕۆدیاشـــەوە پولخێریا هیچ گومـانێکی لەوەدا نەبوو کە ئەگەر دەســـتی هەندێک لە کـاریگەرییە چەپەڵ و نەرێنییەکان لە ژیانی ئەودا ببڕێن، داهاتوویێکی درەوشـاوەی دەبێت. ڕازومیخینیشـــی دڵنیا کردەوە کە کوڕەکەی ڕۆژێک دەبێتە ســـیـاســـەتمەدارێکی گەورە و گوتـار و لێهـاتوویە ئەدەبییە دەرەوشـاوەکەشـی بەڵگەی ئەم قسـەیەن. پولخێریا دایمە گوتارەکەی ڕاســـکۆڵنیکۆفی بە دەســـتەوە بوو و تەنـانەت بە دەنگی بەرز دەیخوێنـدەوە و هەر ئەوەنـدەی مـابوو لەگەڵ خۆیـدا بشـــیبـاتە جێخەوەکەوە، وەلێ لە بنەڕەتەوە لەبارەی ئەم پرسیارەی کە *ڕۆدیا لە کوێیە*، نقەی لێوە نەدەهـات و گەرچی ئەوانی دیکەش لەلای ئەو بە ئاشکرایی لە ئاماژەکردن بەم پرسیارە خۆیان بەدوور دەگرت و هەر ئەمەش لە خۆیدا بەس بوو تا فرمێسکی پولخێریا جۆش بدات. دواجار بێـدەنگیی غەریبی پولخێریـا لەمەڕ ئەو بـابەتە تـایبەتییەوە ئەوانی

ترساند. ئێستە ئیدی تەنانەت پرتەوبۆڵەی ئەوەشی نەدەکرد کە بۆچی ڕۆدیا نامەیەک نانێرێت، لەبارێکدا کە سـاڵانی ڕابردووی بە ئەوینی ئەو نـامـانەوە بەسـەر بردبوو کە لە کوڕە دڵخوازەکەیەوە پێی دەگەیشـتن. ئەم پرسـە هی ئەوە نەبوو بە هیچ شـێوەیەک پاکانەی بۆ بکرێت و لەڕادەبەدەر دونیاشـی دڵخورت کردبوو؛ بە جۆرێک وای بە زەیندا هات دڵی دایکیان هەواڵی داوە کە ڕۆدیا تووشـی ئاقیبەتێکی تۆقێنەر بووە، کەچی لە ترسـی ئەوەی کە نەکا لە وەڵامدا شـتێکی تۆقێنەرتر ببیسـتێت، پرسـیاری نەدەکرد. بەهەرحاڵ، دونیا دەیبینی کە ئەقڵی دایکی وا لەبەردەم مەترسـیدایە و ئەوەش هیچ گومانێکی تێدا نەبوو.

هەڵبەتە یەک دوو جارێکیش پولخێریا بە جۆرێک قسـەکەی بردەوە سـەر ئەو باسـە کە نەدەکرا بەبێ ئاماژەکردن بەوەی کە ڕۆدیا لە کوێیە، وەڵامی بـدەیتەوە و کـاتێکیش کە وەڵامێکی گومـانـاوی یـان نیوەچڵی دەدرایەوە، دەمودەسـت خەمنـاک و بێدەنـگ دەبوو و تـا مـاوەیەکی زۆر لەو بـارەدا دەمـایەوە. دونیـا دواجـار تێگەیشـت کە درۆپێکەوەنان و چیرۆکهەڵبەسـتن بۆ دایکی شـتێکی سـەختە و باشـتر وایە لەبـارەی هەنـدێک خـاڵی تـایبەتییەوە خۆی بێدەنـگ بکـات؛ وەلێ سـات دوای سـات زیاتر دەردەکەوت کە دایکە داماوەکە گومانی کردووە کە ڕووداوێکی تۆقێنەر ڕووی داوە. دونیـا بیری هـاتەوە کە براکەی گـوتـبووی دایکـیـان شـەوی بەر لە ڕۆژی مەرگبـاری دانپێدانانەکە، قسـەکانی ئەوی بەدەم خەوەوە بیسـتوون، یانی ڕێک دوای دیـدار و تێکگیرانی ئەو لەگەڵ سـڤیدریگـایلۆڤـدا. یـانی ڕێی تێدەچوو سـەری لە شـتێک دەرکردبێت؟ هەندێک جار ڕووی دەدا کە بەدوای ڕۆژان و حەفتەگەلێکی بێدەنگ و کەیل لە خەم و فرمێسکباراندا، پولخێریا قۆناغێکی پڕ لە خرۆشـی هیسـتریی بەسـەر ببات. لەم جۆرە کاتانەدا کتوپڕ دەستی دەکردە باسی کوڕەکەی و ئەو ڕۆژانەی کە بۆ

داهاتووی ئەوی دانابوون... ئەو خەون و خەیالانەی کە دەیرێســـان، هەندێک جار بێرادە سـەیروسـەمەرە بوون. ئەوانی دی دڵیان دەدایەوە و بۆ دڵخۆشـــیی ئەویش بێت بە رووالەت هاوڕایی خۆیان دەردەبڕی، گەرچی بۆی هەبوو خۆیشـــی لەوە تێبگـات کە ئەوە تەنیـا بۆ دڵخۆشـــکردنی ئەوە. لەگەڵ ئەوەشـــدا هەر لە باســـکردنی کوڕەکەی نەدەکەوت و نەدەکەوت.

ڕاســـکۆلنیکۆف پێنج مانگ دوای پێهاتنەکە، ســـزا درا. ڕازومیخین و دونیا هەر دەرفەتێکیان بۆ بڕەخسـابا دەچوونە دیداری. دواجار سـاتی دابڕان گەیشـــت. دونیا ســــوێندی بۆ براکەی خوارد کە ئەم دابڕانە هەمیشـــەیی نابێت و ڕازومیخینیش هەر وا. ڕازومیخین کە ســـەرڕێژ بوو لە تینوتاوی گەنجی، زۆر بە جددی ئەوەی کەوتبووە سەرەوە کە تا سێ‌چوار سالی داهاتوو سەرچاوەیەکی داهات دەستەبەر بکات کە بشێت پشتی پێ ببەستترێت و بڕێکیشی بۆ کۆچکردن بەرەو سیبیریا وەلا بنێت؛ بەرەو ناوچەیەک کە خاکەکەی لە هەر ڕوویێکەوە بەپیتە و پێویســـتیی بە هێزی کار و مێشـــکگەلی چالاک و ســـەرمایەیە. کەواتە هەر لەوێ، لە هەمان ئەو شارەدا کە بڕیار بوو ڕۆدیا تێیدا بمێنێتەوە، ژیان و ماڵیان پێکەوە دەنا و هەمووان بەیەکەوە دەستیان بە ژیانێکی تازە دەکرد. کاتی دابڕان، فرمێســـک بە چاوی هەموویاندا هاتە خوار. ڕاسکۆلنیکۆف ئەو چەند ڕۆژەی دوایی بە خەمۆکی و تێفکرین بەسەر بردبوو. دڵپەرۆشـانە هەر هەواڵی دایکیی دەپرسی و بۆ سـاتێک ئەوی لە خەیاڵ دەرنەدەچوو؛ دڵپەرۆشییەکەی ئەو بۆ دایکی گەیشتە ئاستێک کە دونیاش ترســـی لێ بنیشـــێت. ڕاســـکۆلنیکۆف کە بیســـتی دایکیان نەخۆش کەوتووە، زیاتر لە خۆیدا ڕۆچوو و خەمێکی قورس نیشـــتە سەر گیانی. بە درێژایی ئەم ماوەیە زۆر لەگەڵ دونیادا ساردوسڕ بوو و بە زۆر چەند قســـەیەکی لەگەڵدا کردبوو. ســـۆنیا لەمێژ بوو بەو پارەیەی کە ســـڤیدریگایلۆڤ بۆی دانابوو، ئامادەکاریی ســـەفەرکردنی

لەگەڵ ڕاسکۆڵنیکۆف و دەستەی زیندانیاندا بەرەو سیبیریا کردبوو. هیچ کامیان لەبارەی ئەم بەرنامەیەوە قسەیەکیان نەکردبوو، بەس هەردووکیان دەیانزانی کە کارەکە بەم جۆرە دەبێت. ڕاسکۆڵنیکۆف لە دواهەمین دیداریاندا بۆ ماڵئاوایی، لە وەڵامی وێناسازیی پڕ لە جۆشوخرۆشی خوشکی و ڕازومیخیندا لەبارەی ئەوەی کە دوای ئازادبوونی ئەو پێکڕا داهاتوویێکی بەختەوەرانەیان دەبێت، بزەیەکی غەریبی کرد و بە زەینیدا ڕابرد کە نەخۆشییەکەی دایکیان زۆر زوو بە کارەساتێک دوایی دێت. دواجار لەگەڵ سۆنیادا بەڕێ کەوتن.

دوو مانگ دواتر، دونیا لەگەڵ ڕازومیخیندا زەماوەندی کرد. هاوسەرگیرییەکی خەمگین بوو و زۆر بێدەنگانە، وەلێ پۆرفێری پیترۆڤیچ و زۆسیمۆفیان بانگهێشت کردن. ڕازومیخین بە درێژایی ئەو ماوەیە سەروسیمایەکی بێڕادە جددیی هەبوو. دونیا لە ناخی دڵەوە بڕوای بەوە هەبوو کە ڕازومیخین دەتوانێت پلانەکانیان جێبەجێ بکات و هەر بە ڕاستیش جا چۆن دەکرا بڕوای بە کەسێکی وەک ئەو نەبێت؟ ویستی بەهێزی ڕازومیخین و لێبڕاویی لە بڕیارداندا دیاردەیەکی دەگمەن بوو. دیسان لە زانکۆ دەستی کردەوە بە خوێندن تا بتوانێت بڕوانامەکەی بەدەست بهێنێت. هەر وا بۆ داهاتوویان خەریکی نەخشەدانان بوون، هەردووکیان وایان دانابوو کە تا پێنج ساڵی دیکە لە سیبیریادا خۆیان بگرن. تا ئەو کاتەش گشت هیوایەکیان بە سۆنیا بوو.

پولخێریا لەوپەڕی دڵخۆشیدا دوعای خێری بۆ تازەبووک و ڕازومیخین کرد، بەڵام دوای هاوسەرگیرییەکەی ئەوان زیاتر لە جاران خەمۆک و گیرۆدە بوو. ڕازومیخین بۆ ئەوەی پولخێریا دڵخۆش بکات، بۆی گێڕایەوە کە ڕاسکۆڵنیکۆف چۆن دەستی ئەو کوڕە خوێندکارەی زانکۆ و پاشانیش باوکەکەیی گرتبوو؛ هەروەها چۆن لە کاتی ڕزگارکردنی ئەو دوو منداڵەدا، دەست و باڵی سووتاوە و تەنانەت

دواتر نەخۆشـیش کەوتووە و ماوەیەک لە جێگەدا ماوەتەوە. ئەم دوو بەســـەرهاتەی کوڕەکەی، زەینی پولخێریایان گەیاندە ســـنووری شـــەیدایی کە خۆی لە بەرەبەری تێکچوونێکی ڕەهادا بوو. نەیدەتوانی باســی نەکات و تەنانەت لە شـــەقامیشـــدا لەگەڵ خەڵکانی نەناســراو سەری قسەی دەکردەوە و ئەو بەسەرهاتانەی بۆ دەگێڕانەوە، گەرچی دونیا هەمیشــە لەگەڵیدا بوو. لە وێستگە یان دوکانەکاندا، لە هەر کوێ کە بیسەرێکی دەست دەکەوت، قسەی دەبردەوە سەر کوڕەکەی خۆی و گوتارەکەی و ئەوەی کە چ یارمەتییەکی هاوڕێکەی زانکۆی دابوو و چۆن دەست و باڵی خۆی لە ئاگرکەوتنەوەکەدا سووتاندبوو و چی و چی! دونیا هەرچەندە بیری دەکردەوە، شتێکی وای بە زەیندا نەدەهات تا بتوانێت بەر بە دایکی بگرێت؛ سەرباری مەترسیی پەرێشانیی زەینی و هەیەجانی مەرگباری پولخێریا، ئەو مەترســـییەش لەئارادا بوو کە کەســێک ناوی ڕاسـکۆڵنیکۆفی بێتەوە یاد و باسـی دواهەمین دادگایی بکات. پولخێریا تەنانەت توانیبووی ناونیشـــانی دایکی ئەو دوو منداڵە دەسـت بخات کە کوڕەکەی ڕزگاری کردبوون و سـوور بوو لەسـەر ئەوەی بڕۆن و دایکی منداڵەکـان ببینن. دواجـار پەرێشـــانییەکەی ســـنووری تێپەڕاند. هەندێک جار کتوپڕ دەســـتی دەکردە گریان و زۆربەی کاتیش نەخۆش دەکەوت و تووشــی وڕێنەیەکی تادار دەبوو. بەیانییەکیان گوتی بەو جۆرەی کە ئەو حســـێبی کردووە، ڕۆدیا زۆر زوو دەردەکەوێت و ئەوەی کە بیری هاتووەتەوە ڕۆدیا کاتی ماڵئاوایی بەوی گوتبوو کە دەبێـت ســـەری مـانگی نۆ چـاوەڕێی هـاتنی بن. پولخێریا خۆی بۆ هـاتنەوەی کوڕەکەی تەیـار کرد، ژوورەکەی خۆی بۆ ئەو ڕازاندەوە، ناوماڵەکەی سڕییەوە و پەردەی تازەی هەڵواسی و کۆنەکانیشـــی شــۆردن. دونیا نیگەران بووبوو، وەلێ هیچی نەگوت و یارمەتیی دایکی دا تا ژوورەکە ئامادە بکەن. دوای ڕۆژێکی ماندووکەر کە هەر هەمووی بە خەیاڵپلاویی ســـەرخۆشـــانە و فرمێســـک و ئاه ڕابردبوو، پولخێریـا شـــەوەکەی بە نەخۆشـــی کەوتە جێگەوە. بۆ

بەیانییەکەی تووشـــی تا و ورێنە بوو و هەر باش نەبووەوە؛ دوو حەفتەی پێنەچوو پولخێریا مرد. بەدەم ورێنەوە شتگەلێکی دەگوتن کە نیشـانی دەدا زۆر لەوە زیاتر لەبارەی ئاقیبەتی تۆقێنەری کوڕەکەیەوە دەزانێت کە ئەوانی دیکە سۆسەیان دەکرد.

راســـکۆلنیکۆف تـا مـاوەیەکی زۆر لە مردنی دایکی بێئـاگـا بوو، گەرچی لەو کاتەوەی گەیشـتبووە سـیبیریا، زۆر بە ڕێکوپێکی نامەی لەگەڵ خێزانەکەیـدا دەگۆڕییەوە. هەڵبەتە لەم ڕووەوە ســـۆنیـا کاروبـارەکانی ڕایی دەکردن، هەموو مـانگێک نـامەی بۆ ڕازومیخین دەنارد و لە کاتێکی دیاریکراو و جێگیردا وەڵامی پێ دەگەیشـتەوە. لە ســـەرەتاوە، بە بۆچوونی دونیا و ڕازومیخین نامەکانی ســـۆنیا زۆر وشک بوون و ئەوەی کە دەیگوت بەس نەبوو، وەلێ دواتر خۆیان بەو ئەنجامە گەیشـــتن کە نەدەکرا نامەکان لەوە باشـــتر دەربچن، چونکە وێنـایەکی ورد و تەواوی ژیـان و هەلومەرجی ڕاســـکۆلنیکۆفیـان دەخستە بەردەست. نامەکانی سۆنیا پڕ بوون لە بابەتی لاوەکیی ژیانی ڕۆژانە و وەســـفی ســـادە و لە هەمان کاتدا هەتا بڵێیت ڕاشـــکاوانە هەلومەرج و ژینگەی ڕاسکۆلنیکۆفی سزادراویان دەخستە ڕوو. سۆنیا نە وشـــەیەکی لەبارەی هیوا و ئاواتەکانی خۆیەوە دەگوت و نە لەمەڕ داهاتووەوە خەیاڵپلاوی و ســـۆســـەی دەکرد. بە هیچ شـــێوەیەکیش هەستەکانی خۆی دەرنەدەبڕین. لەبارەی ڕاسـکۆلنیکۆفیشـەوە بە هیچ جۆرێک هەوڵی نەدەدا بـاری ڕۆحی و زەینی و هەســـت و دۆخی دەروونیی ڕوون بکاتەوە، بەڵکە تەنیا و تەنیا گرنگیی بەوە دەدا کە لە واقعدا هەبوو: قسـەکانی خودی ڕاسکۆلنیکۆف، ڕوونکردنەوەی وردی دۆخی تەندروستیی، ئەوەی کە لە دیدارەکانیاندا چیی لەو ویستووە و بەوی گوتووە چی بکات و ئەم جۆرە شـتانە. سـۆنیا یەک بە یەک ئەم جۆرە ڕاسـتیانەی ژیانی ڕۆژانەی بە شـێوەیەکی ئێجگار ورد و ڕوون باس دەکردن. وێنای برا سـنیاچارەکەی دواجار بە چەشـــنێکی تەواو

ڕوون و وردییەکی بێوێنەوە شـــێوەی گرت. هیچ هەڵەیەکیش لەئارادا نەبوو و نەشـدەکرا هەبێت، چونکە هەر بە تەنیا باسـی واقعیەت دەکرا و هیچی دی.

بەڵام دونیا و مێردەکەی، بەتایبەت لە سـەرەتاوە، بە دەسـتکەوتنی ئەم جۆرە هەواڵانە بە هیچ شـــێوەیەک دڵیان ئاوی نەدەخواردەوە. سۆنیا دەینووسی ڕاسکۆڵنیکۆف هەر وا تێفکر و داتەمیو دادەنیشێ و هیچ حەزێکی بۆ گوتوبێژ نییە و هیچ گرنگییەکیش بەو هەواڵانە نادات کە ئەو لە نامەکاندا پێی دەگەیەنێت. تەنیا جاروبار هەواڵی دایکی دەپرسـێت و سـۆنیاش کاتێک دەبینێت ئەو لەلای خۆیەوە سـۆسـەی هەندێک شـــتی کردووە، دواجار پێی ڕادەگەیەنێت کە پولخێریایان لەدەسـت داوە. بیسـتنی هەواڵی مردنی دایکی، هێندەش نەیشـڵەژاند و ئەمەش بە تەواوی سـۆنیای سـەراسـیمە کرد، لانیکەم لەبەر ئەوەی کوڕەکە بە ڕواڵەت خەفەتباریی خۆی نیشان نەدەدا. سـۆنیا بۆ دونیا و ڕازومیخینی نووسی کە ڕاسکۆڵنیکۆف گەرچی بە تەواوی لە خۆیدا ڕۆچووە و دەڵێـت لە هەموو دونیـا دابڕاوە و دەرگەی بە ڕووی هەمووواندا داخسـتووە، وەلێ زۆر بە سـادەیی ژیانە تازەکەیی پەسـەند کردووە؛ بە تەواوی ئاگاداری هەلومەرجی هەنووکەیەتی و داوای هیچ شتێکی زیادە ناکات، هیچ ئارەزووێکی نابەجێ و بێسەروبەریشی نییە -لە بارێکدا کە فرە ئاسـایی بوو گەر لەو دۆخەدا هەیبێت- سـەرەڕای ئەوەی کە هەموو شـــتێک لە دەوروبەریاندا تازە و نائاشـــنایە، هیچ شـتێکیش سـەرسـامی ناکات. سـۆنیا دەینووسـی کە ڕاسـکۆڵنیکۆف تەندروستە و خۆی لە کار نادزێتەوە، بەڵام لە کارکردندا زیادەڕۆییش ناکات؛ دەکرا بڵێین بایەخێکی وەها بە خواردەمەنی نادات، بەس بەدەر لە یەکشەممان و ڕۆژانی پشوو، خواردەمەنی ئەوەندە خراپ بووە کە دواجار خۆخوازانە پارەی لە سـۆنیا وەرگرتووە تا بتوانێت ڕۆژی جارێک چای بۆ خۆی دەم بکات. بەس لەبارەی شـــتەکانی دیکەوە لە

سۆنیای ویستووە ئەرک نەکێشێت و هەروەها گوتوویەتی کە ئەم هەموو هەڵاوهورایە لەبارەی ئەوەوە تەنیا پەستی دەکات و هیچی دی. سۆنیا دواتر بۆی نووسین کە ڕاسکۆڵنیکۆف لە ژووری گشتیی زینداندا دەمێنێتەوە. ئەو خۆی چاوی بە ناوەوەی شوێنخەوەکان نەکەوتووە، وەلێ تا ئەو ڕادەیە ئاگادارە کە شوێنخەوەکان قەڵەباڵق و ناخۆش و پیسن و ڕاسکۆڵنیکۆف لەسەر چەند لادارێک دەخەوێت کە خستوویاننەتە پاڵ یەک و نمەدیکیی ئەستووریش دەخاتە سەریان، بەڵام حەز ناکات لەوە زیاتر ڕێکی بخات. بەس بەبۆنەی بەرنامەیەکی پێشوەختەداڕێژراو و یان لەبەر مەبەستێکی تایبەت نییە کە بەو جۆرە کەساس و هەژارانە دەژی، بەڵکە تەنیا هۆکارەکەی کەمتەرخەمییەکی رووتە و هەر لە بنەڕەتەوە بۆ ئەو هیچ جیاوازییەکی نییە. سۆنیا سادە و ڕووڕاست گوتبووی کە سەرەتا و تەنانەت لە دیدارەکانیشیاندا لالووت بووە و لەوەش توورە دەبوو کە بۆچی سۆنیا دەچێتە دیدەنیی، نەیویستووە یەک قسە بکات و تەنانەت بێڕێزیشی کردووە. بەڵام دواجار دیدارەکە دەگۆڕێت بۆ جۆرێک لە ڕاهاتن و بگرە کارێکی پێویستیش لە ژیانی ئەودا، بە کورتییەکەی، تەنانەت واشی لێ دێت ئەو چەند ڕۆژەی کە سۆنیا نەخۆش دەکەوێت و ناتوانێت بچێتە دیداری، ڕاسکۆڵنیکۆفیش بە تەواوی شپرزە دەبێت. کچە، لە ڕۆژانی پشوودا ئەوی لەپشت دەرگەی سەرەکی یان لە ژووری پاسەوانەکەدا بینیوە، یانی لە ماوەی ئەو چەند خولەکەدا کە بۆ دیدار زیندانی دەهێننە ئەوێ. لە ڕۆژانی کاریشدا سۆنیا بۆ بینینی ئەو یان دەچووە کارگە یان کوورەی خشتسوورکردنەوە یان بۆ کووخەکانی قەراخ ئەیرتیش. هەروەها سۆنیا لەبارەی ڕۆژگاری خۆیەوە بۆیانی نووسی کە توانیویەتی لە شاردا هاوڕێ یان کۆمەڵێک مشتەری بۆ کاری بەرگدووری بدۆزێتەوە. جا چونکە لەوێ تاکوتەرا کراسدوور دەست دەکەوت، زۆرێک لە خێزانەکان بوونی سۆنیایان لەو ناوەدا بە کاری خوا دەزانی و خزمەتیان دەکرد؛ بەڵام نەیگوت لەبەر ئەو، بەرپرسانی

زیندان گرنگییەکی تایبەتییان بە ڕاسکۆلنیکۆف داوە و کارەکانیان بۆ سووکتر کردووە و لەم جۆرە یارمەتیانە. دواجار ئەو هەواڵەی کە پێشبینییان دەکرد، گەیشت. دونیا لە چەند نامەیەکی کۆتایی سۆنیادا سۆسەی ئەوەی کردبوو کە وەک بڵێیت ئەو بێتاقەت و ناڕەحەتە. ڕاسکۆلنیکۆف ئیدی خەریک بوو خۆی لە هەمووان بەدوور دەگرت، هاوبەندییەکانیشی چاویان بەودا هەڵنەدەهات و چەند ڕۆژێکی بەسەر یەکەوە لە بێدەنگییەکی ڕەهادا بەسەر دەبرد و ئیدی ڕەنگی بە ڕووەوە نەمابوو. سۆنیا لە دواهەمین نامەیدا نووسیی کە ڕاسکۆلنیکۆف خراپ نەخۆش کەوتووە و لە بەشی تایبەتی نەخۆشخانەی زیندانیاندا خەوێندراوە.

## دوو

ڕاسکۆلنیکۆف ماوەیەکی زۆری لە پێخەفی نەخۆشیدا بەسەر برد. ژیانی جاڕزکەری زیندان، کاری دژوار، خۆراکی خراپ، سەری تاشراو و جلی شڕ هۆکاری هاڕینی ئەو نەبوون. ئەمانە بۆ ئەو مایەی ئازار و مەینەت نەبوون. تەنانەت کاری تاقەتپڕووکێنیش بۆ ئەو جێی دڵخۆشی بوو. خۆ هیچ نەبێت لە سایەی ماندووبوونی جەستەییەوە لەژێر باری کاردا، دەیتوانی ڕۆژی چەند کاتژمێرێک بە ئاسوودەیی بخەوێت. خۆراکیش بۆ ئەو گرنگ نەبوو: ئەو ئاوە ڕووتەی کە ناوی شۆربای کەلەرم بوو و سیسرکەی تێ کەوتبوو، مەگەر چ کێشەیەکی هەبوو؟ خۆ لەو ڕۆژانەدا کە خوێندکاری زانکۆ بوو تەنانەت ئەم شتانەشی دەست نەدەکەوتن. جلێکی گەرمی لە بەردا بوو کە دواجار بۆ ژیانی هەنووکەیی شیاو بوو. کۆت و زنجیری دەست و پێشی بێزاریان نەدەکرد. بە هیچ شێوەیەکیش شەرمی لە سەری تاشراو و جلی دووڕەنگی تایبەت بە زیندانیانی پلەدوو نەدەکرد. ئاخر دەبێ لەبەر کێ شەرم بکات؟ لەبەر سۆنیا؟ چۆن ڕێی تێدەچوو شەرم لە سۆنیایەک بکات کە لە ڕاسکۆلنیکۆفی بکوژ دەترسا؟

بەڵام بۆچی شەرم نەکات؟ وێڕای هەموو ئەمانەش شەرمی لە سۆنیا دەکرد و هەر لەبەر ئەوەش بە هەڵسوکەوتی ڕەق و بێڕێزانە و سووکایەتیئامێز کچەی ئەشکەنجە دەدا. بەڵام سەری تاشراو و کۆت و زنجیرەکان بۆ ئەو مایەی سووکایەتی نەبوون، بەڵکە ئەو لە بنەڕەتدا زۆر خراپ حورمەتی شکێندرابوو. هەر ئەم حورمەتە شکاوەش نەخۆشی خستبوو. ئاه، چەندە باش بوو ئەگەر بیتوانیبا لەبارەی ئەو

شتانەوەی کە ڕوویان دابوو، خۆی بە تاوانبار بزانێت! ئەوە ئەوپەڕی بەختەوەری بوو! ئەوسا دەیتوانی بەرگەی هەر شتێک بگرێت، تەنانەت سووکایەتی و بێئاوڕوویش. بەس گەلێک سەختگیرانە کەوتبووە دادگاییکردنی خۆی و لەگەڵ ئەوەشدا ویژدانی بەبەردبووی هیچ هەڵەیەکی لە ڕابردوویدا نەدەدۆزییەوە، مەگەر هەندێک هەڵەی سادە کە دەکرا لە هەر کەسێک بوەشێنەوە. تەنیا و تەنیا لەوەدا هەستی بە سووکایەتی دەکرد کە وەها گەمژانە و دەستوپێبەستراو و وەک بلێیت نابینا، بە حوکمی کوێرانەی چارەنووس، تەفروتوونا کرابوو و، ئێستە، بۆ ئەوەی بتوانێت ئارامییەک بەدەست بهێنێت، دەبوو مل کەچ بکات و بچێتە ژێر باری سووکوچرووککەری بێمانای ئەم سزایەوە.

کاتی هەنووکەی بۆ بووبووە شێوانێکی بێمانا و بێئامانج. داهاتووش خۆهاڕینێکی بێکۆتا بوو کە بڕیار نەبوو دەستکەوتێکی تێیدا هەبێت. هەر ئەوەندە! ئەوە چ گرنگییەکی هەبوو کە لە کۆتایی هەشت ساڵی سزاکەیدا تازە تەمەنی دەبووە سیودوو ساڵ و دەیتوانی دەست بە ژیانێکی نوێ بکات! ئەو چیی هەبوو تا بیەوێت بۆی بژی؟ دەشیا چاوی هیوای لە چی بێت؟ بۆچی دەبوو بۆ زیندوومانەوە خۆی بپرووکێنێت؟ تەنیا بۆ ئەوە بژی تا بوونی هەبێت؟ بۆ ئەو هەمان ئەو مرۆڤە نەبوو کە پێشتر، هەزار جار ڕووی دابوو کە بیەوێت لەبەر خاتری بیرکردنەوەیەک و تروسکایی هیوایەک یان تەنانەت خەیاڵێکی خاویش دەست لە خۆی و ژیانی بشواتەوە؟ ژیانی ڕووت هەرگیز گرنگییەکی ئەوتۆی بۆ ئەو نەبوو، دایمە شتێکی زیاتری لە ژیان ویستبوو. لەوانەشە لەبەر خاتری هێزی مەزنی خواستەکانی بووبێت کە خۆی وەک مرۆڤێک بە بژاردەگەلێکی لە سەرووی ئەوانی دیکەوە و سەرپشک لە ئەنجامدانی هەر کارێکدا کە بۆ ئەوانی دیکە ڕێپێدراو نییە هاتبێتە بەرچاو.

ئاه کە ئەگەر چارەنووس، هەستی پەشیمان و جەخاری دەهێنایە ڕێی! پەشیمانییەکی سووتێنەر کە دڵی پارچەپارچە بکات و خەو لە چاوی بتارێنێت، پەشیمانییەک کە خودی ئەشکەنجە بێت و ئازاری تۆقێنەری دیمەنی قەنارە یان لەئاوداخنکانی بهێنێتە بەرچاو! ئاه کە ئازاری وەها پەشیمانییەک چەندە ئەوی دڵخۆش دەکرد! فرمێسک و ئازار و ئەشکەنجە لانیکەم هێمای ژیان بوون. بەس لە دڵی ڕاسکۆلنیکۆفدا هیچ ئاسەوارێک لە پەشیمانی و جەخار لەئارادا نەبوو.

ئەوپەڕەکەی ئەوە بوو کە ئێستە لە گەمژەیی خۆی پەست ببێت، ڕێک وەک پێشتر کە لە کار و هەڵە سەیروسەمەرە و گەمژانەکانی پەست دەبوو کە دواجار وایان کردبوو بکەوێتە زیندانەوە. بەڵام ئێستە لە زینداندا، کە وەک پێویست ئازادیی بیرکردنەوەی هەبوو، هەمدیسان لە زەیندا بە هەموو کردەوەکانیدا چووەوە و یەک بە یەکی کارەکانیی دانە بەر ڕەخنە. بەڵام ئێستە هەرگیز هێندە گەمژانە و ترسناک نەدەهاتنە بەرچاوی کە لەو ڕۆژە نەحسانەدا وای وێنا دەکردن.

لە خۆیی پرسی: *ئاخر بیرکردنەوەکەی من کوێی لەو لێشاوی ئایدیایانە گەمژانەتر بوو کە لە سەرەتای دونیاوە هەموو جێیەکیان تەنیوەتەوە و لێک دەئاڵێن؟ هەر ئەوەندە بەسە دیدگەیەکی کراوە و تەواو سەربەخۆت هەبێ و نەکەوێتە ژێر کاریگەریی بۆچوون و دەمارگیرییە لابەلاکانەوە تا ئایدیاکەی منت تەنانەت بەقەد سەرەدەرزییەکیش... سەیروسەمەرە نەیێتە بەرچاو. ئامان بەدەست فەیلەسووفانی پووچی گومانکەراوە! ئاخر بۆچی لە نیوەی ڕێگەکەدا پەکتان دەکەوێ؟*

لەبەرخۆوە درێژەی پێ دا: *باشە ئێستە بۆچی کارەکەی من لە بەرچاوی ئەمانەدا هێندە تۆقێنەرە؟ لەبەر ئەوەی تاوان بووە؟ باشە کتومت مەبەست لە تاوان چییە؟ خۆ من ویژدانم ئاسوودەیە. هەڵبەتە لە ڕووی یاساییەوە بە تاوان حسێب دەکرێ؛ یاسا خراوەتە ژێر پێ و*

*خوێن ڕێژراوە. باشە، لەبارەی پاشاشکێنییەوە، فەرموون ملی من لە موو باریکترە، ئەسڵەن سەرم ببڕن و... کۆتایی پێ بێنن. هەڵبەتە گەر وا بێ ئەوا گەلێک لە پێشەوایانی مرۆڤایەتی کە دەسەڵاتیان بە میرات لە باوکیانەوە بۆ نەماوەتەوە و بە جۆرێ لە جۆرەکان بەدەستیان هێناوە، دەبوو هەر لە سەرەتاوە سزا بدرێن. بەس چی ڕووی دا؟ ئەوان سەرکەوتن، کەواتە مافی خۆیان بووە و کارەکەیان ڕاست بووە، ئەوە منم کە تووشی نەهاتی بووم و شکستم هێنا، کەواتە مافی ئەوەم نەبووە وەها هەنگاوێ بنێم.*

ڕاسکۆڵنیکۆف تەنیا لەم ئاستەدا ئامادە بوو تاوانبوونی کردەوەکەی پەسەند بکات، لەسەر بنەمای ئەم ڕاستییە ڕوونەی کە نەیتوانیوە کارەکەی بە ڕێکوپێکی ئەنجام بدات و لەبەرانبەردا دانی پێدا نابوو.

پرسێکی دیکەش ئەشکەنجەی دەدا: بۆچی خۆی نەکوشتبوو؟ بۆچی هەر وا واقوور لەبەردەم ڕووبارەکەدا ڕاوەستابوو و لەبری ئەوە وای بە باش زانی دانی پێدا بنێت؟ ئایا ئارەزووی مانەوە ئەوەندە بەهێز بوو؟ یانی زاڵبوون بەسەر ئەم ئارەزووەدا هێندە ئاستەم بوو؟ ئەی چۆن سڤیدریگایلۆڤێک کە زۆریش لە مەرگ دەترسا، توانیبووی بەسەر ئەو حەزەدا زاڵ ببێت و کۆتایی بە خۆی بهێنێت؟

بەم پرسانە خۆی ئەشکەنجە دەدا و نەیدەتوانی تێبگات تەنانەت لەو ساتەشدا کە ڕاوەستاوە و سەیری ڕووبارەکەی کردووە، ڕەنگە زۆر بە لێڵی هەستی کردبێت کە خەوشێکی بنەڕەتی لە شێوازی بیرکردنەوە و باوەڕیدا هەیە. تێنەدەگەیشت کە ئەو هەست و خۆئاگاییە لەوانەیە دەروازەی خاڵی وەرچەرخانی ژیانی ئەو بووبێت کە هەستانەوەی ئەو و دیدگەی داهاتوویی بۆ ژیان دیاری کردبێت.

خۆی زیاتر وای بە باش دەزانی لەم نێوەندەدا هەموو شتێک بخاتە ئەستۆی باری گرانی حەزەکان، کە نەیدەتوانی ئەوە لەسەر شانی

خۆی لابەرێت، تەنیا و تەنیاش لەبەر لاوازی و بچووکیی. لە هاوبەندییەکانیی دەروانی و واقی وڕ دەما کە چۆن یەک بە یەکیان عاشقی ژیانن و بەهای دەزانن و خوازیارین. بە بۆچوونی ئەو زۆربەی زیندانیان ئێستە و لە زینداندا زیاتر بەهای ژیانیان دەزانی تا ئەو کاتانەی کە ئازاد بوون. کوێرەوەری و دەستکورتی و ئەشکەنجە نەمابوو نەیانکێشابێت، بۆ نموونە هەر ئەم بێکەسانەی کە لەنێویاندا بوو! یانی هەر بە ڕاستی ئەوەندە بەلایانەوە گرنگ بوو؟ بۆ نموونە تیشکی خۆر و لێرەواری پیر و چڕ و کانییەک بە ئاوی سارد و بەخوڕ لە خاڵێکدا کە کەمترین کەس چاوی پێی دەکەوت و فلانە ماڵبەکۆڵ سێ ساڵ لەوەوبەر ئەوی دیوە و دیاریی کردبوو و ئێستە بە چەشنێک دڵی بۆی لێی دەدا وەک ئەوەی بیەوێت چاوی بە ماشووقە شۆخەکەی بکەوێت و ئەسڵەن خەونی بە سەوزاییە تەروبڕەکانی دەوروبەری کانییەکەوە دەبینی و ئەو باڵندەیەی کە هەر لەوێ و بەسەر دەوەنەکانەوە دەچریکێنێت! تا زیاتر کات دەڕۆیشت و فرەتر لە دۆخیان ورد دەبووەوە، پتر نموونەگەلی سەراسیمەکەری لەم جۆرەی بەدی دەکردن کە هیچ ڕوونکردنەوە و پاساوێکی بۆیان نەبوو.

هەڵبەتە لە زینداندا زۆر شت هەبوون کە ئەو لێیان بێئاگا بوو و نەیدەبینین و نەشیدەویست بیانبینێت؛ سەری دانەواندبوو و بۆ خۆی دەژیا. هەر لە بنەڕەتەوە سەیرکردن و بینین بە ڕقیدا دەخست و توانای ئەوەشی لە خۆیدا شک نەدەبرد. وەلێ لە کۆتاییدا هەر ڕۆژەو شتانێکی زیاتری دەهاتنە بەرچاو کە ئەویان حەیران دەکرد. جا تا ڕادەیەک خۆنەخوازانە کەوتە سەرنجدان لە شتانێک کە پێشتر تەنانەت بیریشی لێ نەدەکردنەوە. لەم نێوەندەدا، لە هەمووی سەیرتر چاڵێکی ترسناک و ئەقڵنەبڕ بوو، کە مەودای دەخستە نێوان ئەو و دیترانەوە. هەر دەتگوت لە بنەڕەتەوە دوو توخمی جیاواز بوون، هەردووکیان بە

چاوێکی بێمتمانە و نەیارانەوە لە یەکدییان دەڕوانی. ڕاسکۆڵنیکۆف چاک هۆکارەکانی ئەم جودایی و جیاوازییەی دەزانی و دەرکیشی پێ دەکرد، وەلێ تا ئەو ساتە ئامادە نەبووبوو پەسەندی بکات کە ئەو هۆکارانە تا ڕادەیەک قووڵ و بەهێزن. لەنێو زیندانییەکاندا، چەند دوورخراوەیەکی پۆڵەندیش هەبوون، کە تاوانەکەیان ڕەشتر بوو. ئەم پۆڵەندیانە وەک ڕەعیەتگەلێکی بێزراو و ناحاڵی لە زیندانییەکانیان دەڕوانی و لە نیگای ئەوانەوە سووک و کەم بوون. بەڵام ڕاسکۆڵنیکۆف نەیدەتوانی بەم چەشنە لەوانی دیکە بڕوانێت. وەک ڕۆژ بۆی ڕۆشن بوو کە زۆرێک لەو ڕەعیەتە بە ڕواڵەت ناحاڵی و بێزراوانە، لە زۆر ڕووەوە لە پۆڵەندییەکان تێگەیشتووترن. هەڵبەتە ڕووسگەلێکیش هەبوون کە بە هەمان شێوەی پۆڵەندییەکان لە ڕەعیەتەکانیان دەڕوانی، لووتبەرزانە و پڕ لە سووکایەتییەکی بێکۆتایی؛ بۆ نموونە کۆنەئەفسەرێک و دوو خوێندکاری بواری ئایین. بە هەڵەداچوونی ئەوانیش شتێک نەبوو لە چاوی ڕاسکۆڵنیکۆفەوە دوور بێت.

ئەوە هەر هیچ کەسێک دڵی بە ڕاسکۆڵنیکۆف نەدەکرایەوە و یەک بە یەکی زیندانییەکان خۆیان لە ئەو دوور دەگرت؛ بەرەبەرەش هەستیان بەرانبەر بە ئەو گۆڕا بۆ ڕق و ڕاسکۆڵنیکۆف خۆیشی هۆکارەکەی نەدەزانی. تاوانبارانێک کە تاوانەکەیان سەد نمرە لە هیکەی ئەو ڕەشتر بوو، بە تاوانەکەی ئەو قەڵس دەبوون و تەنانەت گاڵتەشیان پێ دەکرد.

ڕاهاتبوون پێی بڵێن:

– باشە چۆن دەکرێ بەڕێزێکی وەک تۆ، دەست بداتە تەورێک و بکەوێتە گیانی خەڵکی! ئاخر ئەمە لەئاست پێگەی بەڕێزێکی وەک تۆدا نییە!

دووەمین حەفتەی مانگی ڕۆژوو ئەویش لەگەڵ ئەوانی دیکەدا چووە کڵێسا و دوعای کرد. ڕۆژێکیشیان کتوپڕ ئاژاوەیەک نرایەوە، تێنەگەیشت چۆن و بۆچی، بەڵام کتوپڕ دیتران بە گەلەکۆمەیەکی شێتانە دایان بە سەریدا و دەستیان کردە هاتوهاوار:

– تۆ کابرایەکی خوانەناسی! باوەڕت نییە! تۆ دەبێ بکوژرێی!

ڕاسکۆڵنیکۆف تەنانەت بۆ جارێکیش ڕێک نەکەوتبوو لەگەڵ ئەواندا باسی خوا و باوەڕ و بۆچوونەکانی بکات، کەچی ئەوان دەیانویست لەبەر کافربوون بیکوژن. لە وەڵامیاندا هیچی نەگوت. یەکێک لە زیندانییەکان بە بارێکی تەواو شێتانەوە هەڵمەتی بۆ برد. ڕاسکۆڵنیکۆف هێمن و بێدەنگ چاوەڕێی هێرشە شێتانەکەی ئەو ما. نە چاوی ترووسکاند و نە دەموچاوی تێک دا. بەڵام پاسەوانەکە توانیی خۆی بخاتە نێوان ئەو و هێرشبەرەکەوە و بەم جۆرە بەر بە خوێنڕژانێکی بێچەندوچۆن بگرێت.

پرسێکی دیکەش هەبوو کە ڕاسکۆڵنیکۆف نەیدەتوانی وەڵامێکی بۆ بدۆزێتەوە: ئەم کەسانە چۆن هەموویان شەیدای سۆنیا بوون؟ سۆنیا بە هیچ شێوەیەک بەدوای بەدەستهێنانی سۆز و پشتیوانیی ئەوانەوە نەبوو، زۆر درەنگدرەنگیش چاوی پێیان دەکەوت و تەنیا ئەو کاتانە نەبێت کە جاروبار بۆ ماوەی خولەکێک دەهات تا لەسەر کار چاوی بە ڕاسکۆڵنیکۆف بکەوێت. لەگەڵ ئەوەشدا، هەموان ئەویان دەناسی و دەیانزانی بۆ ئەوەی لەگەڵ ڕاسکۆڵنیکۆف بێت، تا ئەوێ شوێنی کەوتووە و تەنانەت چۆن و لە کوێش بژێویی ژیانیی دەست دەکەوێت. سۆنیا بۆ جارێکیش هەڵنەکەوتبوو بە دەستی خۆی پارەیان بداتێ یان کارێکی تایبەتییان بۆ بکات، تەنیا جارێکیان لە شەوی کریسمسدا نانی شیرینیی بۆ هەموویان نارد. بەڵام نەرمەنەرمە پەیوەندیی نێوان سۆنیا و زیندانییەکان نزیکتر بووەوە. نامەکانیانی دەنووسین و پۆستی دەکردن و زیندانییەکانیش لە کاتی سەردانیکردنی خزم و

کەسوکاریاندا، ئەوانیان ڕادەسپاردن ئەو پارە و شمەکانە لەلای سۆنیا دابنێن کە لەگەڵ خۆیاندا دەیانهێنان. هاوسەر و ماشووقەی زیندانییەکان ئەویان چاک دەناسی و سەریشیان لێ دەدا. هەر کاتێکیش کە سۆنیا لە وەختی کارکردندا سەری لە ڕاسکۆڵنیکۆف بدابا یان لە ڕێگەدا چاوی بە دەستەیەک لە زیندانییەکان بکەوتبا، هەمووان وەک ڕێزێک کڵاویان بە سەریانەوە هەڵدەگرت و دەچەمینەوە. ئەو سزادراوە ناقولا و بێڕێزانەی کە زوخاوی زیندانیان چەشتبوو، بەو بوونەوەرە ناسکە بچووکەیان دەگوت:

– دایە گیان، ئەی سۆنیا خاتوونی دڵسۆز و نەرمونیان!

سۆنیاش بزەی دەکرد و سەری بۆ دەلەقاندن و هەمووان بە بینینی زەردەخەنەکەی ئەو تەژی دەبوون لە شادی. تەنانەت شەیدای ڕێکردنیشی بوون و لایان دەکردەوە تا لە پشتڕا، بە چاوێکی ستایشکارانەوە تەماشای هەنگاونانی بکەن. ناسکی و وردیلانەبوونەکەشی ئەوانی ناچار بە ستایش دەکرد و بگرە واشی لێ هاتبوو کە نەیاندەزانی زیاتر ستایشی چیی بکەن. تەنانەت لە کاتی نەخۆشکەوتنیشدا، هەر لەلای سۆنیا هەواڵی دەرمانیان دەپرسی.

ڕاسکۆڵنیکۆف لە ناوەڕاستەکانی مانگی ڕۆژوودا کەوتە نەخۆشخانە و تەنانەت تا دوای جەژنی پاکیش[1] هەر نەخۆش بوو. کە حاڵی باشتر بووەوە، ئەو خەونانەی بیر کەوتنەوە کە بەدەم تا و وڕێنەوە دیتبوونی. لە پێخەفی نەخۆشیدا خەونی بینیبوو کە هەموو دونیا بە تاعوونێکی تازە و نامۆ کە لە ناوجەرگەی ئاسیاوە دزەی

---

١. جەژنی پاک یان هەستانەوە، گرنگترین ڕۆژە لە ساڵی مەسیحیدا کە دەکاتە یەکشەممەی نێوان ٢٢ی ئادار و ٢٥ی نیسان. مەسیحییەکان بڕوایان وایە لەمڕۆژەدا، عیسای مەسیح دوای ئەوەی کە لەخاچ درابوو هەمدیسان زیندوو بووەوە و هەستایەوە و هەر بەم بۆنەیەوە، لەم ڕۆژی یەکشەممە پیرۆزەدا، ئاهەنگ دەگێڕن. «و. ک»

کردبووە ئەوروپا، سزای مەرگی بەسەر سەپێندرابوو. جگە لە کەسانی ڕیزپەڕ، هەموو ئەوانی تر بە لادا دەهاتن و دەمردن. جۆرە میکرۆبێکی تازە کە پێشتر وێنەی نەبوو، بەر بووبووە جەستەکانەوە، بەڵام ئەم بوونەوەرە زەرەبینییە تازەیە، دەتگوت ڕۆحێکە و ئەقڵ و ویستی هەیە. کە لە جەستەی هەر کەسێکی دەدا، یەکسەر دەبووە هۆکاری شێتبوونی و دەستی بەسەر بوونیدا دەگرت. وەلێ بەنیئادەم تا ئەو ساتەش هێندەی ئەو نەخۆشانە لە خۆیدا هەستی بە هۆشیاری نەکردبوو و وەک ئەوان بە تەواوی دەرکی بە حەقیقەت نەکردبوو و تا ئەو ڕۆژە هەرگیز بەو ڕادەیە وەک ئەوان حوکم و بەرئەنجامە زانستی و باوەڕە ئاکارییەکانی بە بێخەوش و بەری لە هەڵە نەزانیبوون. هەموو گوند و شار و یەک بە یەکی مرۆڤەکان، گیرۆدە بوون و ئیدی شێتی سەری تێ نان. هەمووان سەریان لێ شێوابوو و تۆقیبوون و هیچ کەس لەوی دیکە تێنەدەگەیشت. هەر کەسەو وای دەزانی حەقیقەت لای ئەوە و بینینی ئەوانی دیکەی بە نەهامەتییەک دەزانی. هەموو کەسێک لە سنگی خۆی دەدا، فرمێسکی دەباراند و دەستی پەشۆکاویی هەڵدەگلۆفی. نەیاندەزانی چۆن داوەری بکەن و لە کێ بپێچنەوە، ئەسڵەن نەیاندەتوانی لەبارەی جیاکردنەوەی چاکە و خراپەشەوە بگەنە ڕێککەوتنێک. دیار نەبوو و نەیاندەزانی دەبێت چ کەسێک تۆمەتبار و کێ بەری بکەن. خەڵکی یەکتریان بە جۆرێک لە قین و دزێویی بێمان و ناماقووڵ دەکوشت. دەبوونە دەستە و لەشکرکێشییان دەکردە سەر یەکدی و سوپایان بەڕێ دەخست. بەڵام هەر لەگەڵ کەوتنەڕێدا، بەر دەبوونە گیانی یەکتری و دەستیان دەکردە لەتوکوتکردنی یەک، خاوەنپێگە و پلەدار پڕیان دەدایە یەکدی، هەموویان یەکتریان هەڵدەدڕی و قەپیان بە یەکدیدا دەکرد و دەخوارد. دەنگی زەنگی کڵێسا هەر لە بەرەبەیانەوە تا کۆتایی شەو لە شاردا دەزرنگایەوە، وەک ئەوەی هەمووان بانگهێشت بکەن، بەڵام ئەوەی کە کێ ئەوان بانگهێشت دەکات و بۆچی، دیار نەبوو و هەمووان

تۆقیبوون. کارە ئاسـاییەکان پەکیان کەوتبوو، چونکە هەر کەسـەو ئایدیای خۆی هەبوو و پێشـنیاری پێشـکەوتنێک لە زەینیدا بوو و ڕێچاری دەخسـتە بەردەسـت و هیچ کەسـێکیش لەگەڵ ئەوی دیکەدا کۆک نەبوو. زەوییەکـانیش هەر وا بەرەڵا کرابوون. لێرە و لەوێ ژمارەیەک دیداریان دەکرد و لەسەر خاڵێک ڕێک دەکەوتن و سوێندیان دەخوارد پشـتی یەکتری بەر نەدەن، کەچی لە کردەوەدا دەمودەسـت کارێکیان دەکرد کە بە گشتی لە پێشنیار و ڕێککەوتنی پێشوەختەیانەوە دوور بوو. ئیدی لەو کاتەدا بوو کە یەکتریان تۆمەتبار دەکرد و تێک دەگیران و کوشـتوکوشـتار دەهاتە ئارا. ئاگرکەوتنەوەی گەورە و سـامناک و قاتی هەرای دەکرد. هەموو شـتێک و گشـت کەسـێک دەسـتێکی لەم وێرانکارییەدا هەبوو. تاعوون، زیاتر و زیاتر تەشـەنای کرد. لە سـەرانسـەری جیهاندا تەنیا ئەگەری قوتاربوونی کەسـانێکی کەم هەبوو. ئەوانیش ئەو هەڵبژاردانە بوون کە چارەنووسـیان وا بوو وەچەی تازەی مرۆڤایەتی بخەنەوە و لەسـەر زەویدا ژیانێکی نوێ بهێننە ئـارا، گیـانێکی تـازە بە بەر خـاکدا بکەنەوە و چەپەڵییەکـانی ڕابماڵن، تا هەمدیسان زەوی پاک و بێگەرد ببێتەوە. بەڵام هیچ کەسێک ئەم مرۆڤە هەڵبژاردانەی نەدیتبوون و تەنانەت قسەیەک و دەنگیشیان بەر گوێی هیچ کەسێک نەکەوتبوو.

ڕاسـکۆڵنیکۆف ئەشـکەنجەی بەدەسـت ئەوەوە دەکێشـا کە وەها خەونێکی بێمانا وا بە زەقی لە زەینیدا ماوەتەوە و بەو جۆرە خەمناک و ئەشـکەنجەدەر لە هەزار توێی یادگەیدا زایەڵە دەداتەوە؛ دیار بوو بڕیـار نییە ئـاسـەواری خەونە تـادار و وڕێنـاوییەکـانی بەم زوویە دەسـتی لێ هەڵبگرن. دووەمین حەفتەی دوای ڕۆژی جەژنی پاکیش گەیشـت. ڕۆژانێکی بەهاریی گەرم و درەوشـاوەیان بەسـەر دەبرد. لە حەوشـەی زینداندا، پەنجەرەکان —کە هەڵبەتە محاجەرەیان هەبوو و پاسـەوانیش لەژێریاندا ئێشـکیان دەگرت— کرابوونەوە. لەوسـاوەی کە

ڕاســکۆڵنیکۆف کەوتە پێخەفی نەخۆشــییەوە، ســۆنیا تەنیا توانیبووی دوو جار ئەو ببینێت و لە هەر جارێکیشـــدا ناچار بووبوو مۆڵەتنامە وەربگرێت کە ئەوەش کارێکی دژوار بوو. بەڵام لەبری ئەوە زۆربەی ئێواران دەهاتە حەوشــەی نەخۆشــخانە، تەنیا بۆ ئەوەی یەک خولەک لەوێ ڕابوەســـتێت و ســـەیری ئەو پەنجەرانە بکات کە بەســـەر حەوشەکەدا دەیانڕوانی.

ڕاسکۆڵنیکۆف ئێوارەی یەکێک لەو ڕۆژانەی کە بەرەو باشبوونەوە دەچوو، خەو بردییەوە. کە هــایی بــووەوە، بە هەڵکەوت چــووە بەرپەنجەرە و کتوپڕ چاوی بە ســـۆنیا کەوت کە دوورتر و لە تەک دەرگەی سەرەکیی نەخۆشخانەوە ڕاوەستابوو. وا دەهاتە بەرچاو کە کچە چاوەڕێی کەسێک بێت. لەو ساتەدا بوو کە دەتگوت شتێک دڵی ڕاســـکۆڵنیکۆفی هەڵدڕی. شـــانی هەڵتەکاند و لە پەنجەرەکە دوور کەوتەوە. ســـۆنیا بۆ بەیانییەکەی نەهاتەوە و بۆ ڕۆژی دواتریش دەرنەکەوتەوە و ڕاســـکۆڵنیکۆف خۆی تێگەیشـــت کە چەندە بێئۆقرە چاوەڕێی هاتنیەتی. دواجار لە نەخۆشخانە دەریان کرد. کە گەیشتەوە زیندان، لە زیندانییەکانی دیکەوەی بیست کە سۆنیا نەخۆشە و لە ماڵدا کەوتووە و توانای جووڵانی نییە.

ڕاســـکۆڵنیکۆف خراپ کەوتە دڵەڕاوکێ و ناردی تا هەواڵێکی بۆ بپرسن و بزانن چۆنە و زۆر زوو تێگەیشت کە نەخۆشییەکەی کچە مەترسیدار نییە. سۆنیاش کە بیستی ڕاسکۆڵنیکۆف پەرۆشییەتی، بە چەند دێڕێک بۆی نووسی کە زۆر باشتر بووە و تەنیا سەرمابوونێکی کەم بووە و هەر بەم زووانە، یانی زۆر زۆر زوو، دێت تا لەســەر کار چاوی پێی بکەوێت. ڕاسکۆڵنیکۆف بەدەم خوێندنەوەی یادداشتەکەوە، دڵی بە ئازارێکی بەسوێوە دەخورپا.

ڕۆژێکی گەرم و درەوشاوەی دیکە گەیشت. سەرلەبەیانی، نزیکەی کاتژمێر شەش بوو کە ڕاسکۆڵنیکۆف بۆ کار چووە قەراخ ڕووبارەکە.

لەوێ کارگەیەک هەبوو بۆ وردکردنی بەردی گەچ و ئامادەکردنی لە کوورەدا. بۆ ئەم کارە تەنیا سـێ زیندانییان دەنارد. دانەیەکیان لەگەڵ پاسـەواندا ڕۆیشـت بۆ قەڵاکە تا کەرەسـتەی کار بهێنێت و ئەوی دیکەشیان چوو تا سووتەمەنیی کوورە ئامادە بکات. ڕاسکۆڵنیکۆف لە کارگە هاتە دەر و هەر لە کەنارەکە و لەسەر کۆما هێزمێک دانیشت و بە سـەیرکردنی ئەو چۆڵەوانییە بەرفراوانەوە سـەرقاڵ بوو. لە سـەرووی ڕووبارەکەوە دیمەنێکی بەرین لە بەرچاویدا والا دەبووەوە و دەنگی گۆرانییەکی نـاڕوون و دوور، لە لایەکی دیکەی قەراخ ڕووبارەکەوە بەر گوێی دەکەوت. لەو دەشتە بەرینەدا کە لەژێر تیشکی خۆرەتـاودا خەوتبوو، دەیتوانی پەڵەگەلی ڕەشـی لێڵ ببینێت کە لە بنەڕەتـدا خەیمەی کۆچەرییـان بوون. ئـازادی، لەوێ بوو. لەوێ خەڵکانێک دەژیـان کە لەگەڵ نیشـتەجێیانی ئەمبەری ڕووبـارەکە جیاوازییان هەبوو. لەوێ وەک ئەوە وابوو کات ڕاوەستابێت و خەڵکی هێشـتا لە سـەردەمی ئیبراهیمی پەیامهێن و شـوانکارەکاندا بژین. ڕاسـکۆڵنیکۆف هێشـتا هەر وا بەبێ جووڵە دانیشـتبوو و چاوی لە ڕووبـارەکە کلا نەدەکرد و خەریـک بوو بیرکردنەوە زووتێپەڕەکـانی دەگۆڕان بۆ خەونێک. بیری لە شـتێکی تـایبەت نەدەکردەوە، بەڵام خەمێک لە دەروونیدا هەبوو کە ئازاری دەدا و پەرێشانی دەکرد.

کتوپڕ، سـەیری کرد سـۆنیای لە تەنیشـتە. کچە بێدەنگ هاتبوو و لەوێ لەتەکییەوە دانیشـتبوو. جـارێ زۆر زوو بوو و فێنکـایی دەمەوبەیانیان هەر وا تەزێنەرانە بەر لەش دەکەوت. سـۆنیا هەمان کۆڵوانەی کۆنە و پواو و شـاڵە سـەوزەکەی لە بەردا بوون و هێشـتا ئازاری نەخۆشـی لە ڕووخسـاری ژاکاویدا بەدی دەکرا؛ لاوازتر و ڕەنگپەڕیوتر بوو. بزەیەکی گەرم و تەژی لە شـادیی بە ڕووی ڕاسـکۆڵنیکۆفدا کرد، وەلێ بە هەمان شـەرمنیی جارانەوە دەسـتیی بەرەو ئەو ڕاکێشا.

هەر لە بنەڕەتەوە بە دژواری ڕووی دەهات دەست بۆ ڕاسکۆڵنیکۆف درێژ بکات و هەندێک جار تەنانەت وەک ئەوەی بترسێت کە دەستی لابدات، بە گشتی چاوی لەم کارە دەپۆشی. ڕاسکۆڵنیکۆفیش هەمیشە دەتگوت دەستی ئەوی بە جۆرێک لە بێزارییەوە دەگرت و دایمەش بە بینینی توورە دەبوو و جارجارەش کەللەڕەقانە تا کۆتایی دیدارەکەیان نقەی لە خۆی دەبڕی. هەندێک جاریش ئەوە پێش دەهات کە کچە لەبەردەم ئەودا لەرزی لێ دەهات و بە خەمێکی قورسی سەر ڕۆحییەوە ئەوی جێ دەهێشت. بەڵام لەم ساتەدا دەستەکانیان لێک جیا نەبوونەوە و ڕاسکۆڵنیکۆف بە دزییەوە نیوەنیگایەکی خێرای گرتە دەموچاوی کچە و پاشان بێ ئەوەی هیچ بڵێت، چاوی لە زەوی بڕی. تەنیا بوون و هیچ کەسێک ئەوانی نەدەبینی. پاسەوانیش ماوەیەک دەبوو کە پشتی لە ئەوان بوو. خۆشی نەیزانی چۆن ڕووی دا، وەلێ دەتگوت شتێک کتوپڕ ئەوی لە جێوە هەڵکەند و خستییە بەرپێی سۆنیا. ڕاسکۆڵنیکۆف باسکەکانیی لە دەوری ئەژنۆی کچە ئاڵاندن. سۆنیا دەستبەجێ ترسێک پەشۆکاندی و ڕووخساری بە تەواوی ڕەنگی پەڕی. لە جێوە دەرپەڕی و لەرزۆکانە چاوی بڕییە ڕاسکۆڵنیکۆف. وەلێ هاوکات ئەویش لە هەموو شتێک تێگەیشت و بریقەی شادییەکی بێکۆتایی لە نیگایدا درەوشایەوە. لەودیو هەموو گومانێکەوە دەیزانی کە ڕاسکۆڵنیکۆف زیاتر لە هەر کەس و هەر شتێک ئەوی خۆش دەوێ و دواجار ئەو ساتە گەیشتووە!

دەیانویست قسە بکەن، کەچی نەیاندەتوانی. هەردووکیان فرمێسک زابووە چاوانیانەوە. هەردووکیان بێهاز و ژاکاو بوون و ڕەنگیان بە ڕووەوە نەبوو، بەڵام کازیوەی داهاتوویێکی نوێ درەوشابووە ئەو ڕووخسارە نەخۆش و بێڕەنگانەوە و ژیانێکی تازە چاوەڕوانیی دەکردن. عەشق، دڵی هەریەکەیانی کردبووە سەرچاوەیەکی بێکۆتایی ژیان بۆ ئەوی دیکەیان.

بڕیاریان دا دان بە خۆیاندا بگرن و چاوەڕێ بن. دەبوو حەوت ساڵی دیکە لەم دۆخەدا بەسەر بەرن و جا چ چەرمەسەرییەکی بێئامان و چ شـــادییەکی بێکۆتاییان لە بەردەمدا بوو! بەڵام ڕاســـکۆڵنیکۆف گەڕابووەوە بۆ ژیان و خۆشـــی دەیزانی و لە ســـەرانســـەری بوونیدا هەستی بەو نوێبوونەوەیە دەکرد. بەڵام سۆنیا؛ بۆ مەگەر ژیانی سۆنیا لە هی ئەو جیا بوو؟

عەســـری هەمان ڕۆژ، کە دەرگەی شـــوێنخەوی زیندان پێوە درا، ڕاســـکۆڵنیکۆف لەســـەر تەختە لادارییەکەی ڕاکشـا و بیری لە ســـۆنیا کردەوە. تەنـانەت بە درێژایی ئەو ڕۆژە بە خەیـاڵیـدا هـاتبوو ئەو ســزادراوانەی کە تا ئەو ساتە بە خوێنی ئەو تینوو بوون، ئیدی وا بە جۆرێکی دی لێی دەڕوانن. تەنانەت توانیبووشـــی ســـەری قســـەیان لەگەڵـدا بکـاتەوە و ئەوانیش بە شـــێوەیەکی هـاوڕێیـانە وەڵامیـان دابووەوە. ئێسـتە کە ڕاکشـابوو، ئەمانەی دەهاتنەوە بیر و لەبەرخۆوە بیری دەکردەوە کە دەبوو هەر وا بێت، بۆ مەگەر هەموو شـــتێک نەگۆڕابوو و نوێ نەبووبووەوە؟

سۆنیا بیری ڕاسکۆڵنیکۆفی بە خۆیەوە خەریک کردبوو. بیری لەوە کردەوە کە چۆن ئەوەندە کچەکەی ئازار داوە و دڵیی ئێشـاندووە. ئەو ڕووخســـارە ڕەنگپەڕیو و لاوازەی ســـۆنیاشـــی دەهاتە بەرچاو. وەلێ ئێســـتە ئەم جورە یادگاریانە زۆر کەم ئازاریان دەدا، چونکە چاک دەیزانی کە بڕیـارە بە عەشـــقێکی چەنـدە بێکۆتـاییەوە قەرەبووی ئازارەکانی کچە بکاتەوە.

جا بۆ مەگەر هەموو ئەو کەســـەر و ئازارانەی ڕابردوو چی بوون؟ هەموو شتێک، بگرە ئەو تاوانەش کە تووشی بووبوو و ئەو سزایەش کە بۆیان بڕیبووەوە لەگەڵ ســـەردەمی زیندانیبوونی لە تاراوگەدا، لەم یەکەمین لێزمەی هەســتەدا کە بەسـەریدا باریبوو، نامۆ و دوور لە ئەو دەهاتنە بەرچاوی، وەک ئەوەی کە ســـــەرلەبەری ئەو ڕووداوانە هیچ

پەیوەندییەکیان بە ئەوەوە نەبێت. وەلێ ئەو ئێوارەیە، تووشـی بارێکی دیکەش بووبوو؛ نەیدەتوانی بە جۆرێکی درێژخایەن بیری لەسـەر شـتێک چڕ بکاتەوە و لە لایەکیشـەوە، نەیدەتوانی ئاگایانە خۆی ناچار بە تاوتوێکردنی پرسـەکان بکات، تەنیا و تەنیا دەیتوانی هەسـت بکات. ژیان، خودی ژیان، شـوێنی بە ئایدیاکانی لێژ کردبوو و هەموو شـتێک بە جۆرێکی تەواو جیاواز خەریک بوو لە ویژدانیدا سەرپێ دەکەوت.

ئینجیلێک لەژێر پشـتییەکەیدا بوو. بێ ویسـت هەڵیگرت. هی سـۆنیا بوو، هەمان ئەو ئینجیلە بوو کە سۆنیا تێیدا چیرۆکی زیندووبوونەوەی عازری بۆ ڕاسـکۆلنیکۆف خوێندبووەوە. لە سـەرەتاکانی هاتنییەوە، ترسـی هەبوو کچە بە پرسـگەلی ئایینی ئەشـکەنجەی بدات و هەر لە *ئینجیل* و بەسـەرهـاتەکانی کتێبی پیرۆز بـدوێت. بەڵام لەوپەڕی سـەرسـامیدا، سـۆنیا تەنانەت بۆ جارێکیش ئاماژەی بەوە نەکردبوو و تەنانەت ئەویش پێشـنیاری پێدانی *ئینجیلەکە*ی بۆ ڕاسـکۆلنیکۆف نەکردبوو. ئەو خۆی تۆزێک بەر لە نەخۆشـکەوتنەکەی *ئینجیل*ی لە سـۆنیا ویستبوو و کچەش بێ هیچ قسـەوباسـێک بۆی هێنابوو، بەڵام ڕاسکۆلنیکۆف تا ئەو ساتە دەستی لە ئینجیلەکەی سۆنیا نەدابوو.

ئێسـتەش کتێبەکەی نەکردەوە، بەڵام بیرێک بە زەینیدا ڕابرد: *باشـە چۆن دەکرێ باوەڕی ئەو باوەڕی منیش نەبێ؟ لانیکەم هەسـت و ئاواتەکانی...*

سـۆنیاش ئەو ڕۆژەی لە تایەکی سـەیردا بەسـەر برد و شـەوەکەی هەمدیسـان کەوتە ناو جێگە، بەڵام هێندە شـاد و بەختەوەر بوو کە تەنانەت ئەو هەموو خۆشبەختییە ترساندی. حەوت ساڵ، تەنیا حەوت سـاڵ! لە یەکەمین سـاتەکانی خۆشـبەختییاندا هەردووک ئامادە بوون وەک حەوت ڕۆژ لەو حەوت سـاڵە بڕوانن. ڕاسـکۆلنیکۆف نەیدەزانی ئەو ژیانە تازەیەیان بە خۆڕایی نەبەخشیوەتە ئەو و تێنەدەگەیشت کە

دەبێت بە گیانی خۆی بەهایەکی قورســـی بۆ بدات، بە بەهای ئەرک و هەوڵێکی بێڕادە لە داهاتوودا...

بەڵام ئەمە دەســـتپێکی چیرۆکێکی دیکەیە؛ چیرۆکی گۆڕانی پلەبەپلەی مرۆڤێـک؛ چیرۆکی لەدایکبوونەوەی دووبـارەی ئەو و تێپەڕینی لە جیهـانێکەوە بۆ جیهـانێکی دی؛ چیرۆکێکی ئـاشـــنـا بە حەقیقەتێکی تازەوە کە تا هەنووکە بە نەناســراوی مابووەوە. دەکرێت ئەمە ببێتە بابەتی چیرۆکێکی نوێ، بەڵام چیرۆکە هەنووکەییەکەی ئێمە گەیشتووەتە کۆتا.

١٨٦٦

# دۆستۆیڤسکی بە گێڕانەوەی میریسکی[1]

## ١. سەرچاوە و تایبەتمەندییەکانی ڕۆمانی ڕیالیستیی ڕووسی

ڕۆمانی ڕیالیستی (لەوانەیە ئەم زاراوەیە لەچاو ڕۆماندا بەو شێوازە باوەیەوە، بۆ شێوازگەلی گێڕانەوەی کورتتر و کەمبابەتتر لە بەرچاو گیرابێت) نزیکەی ساڵی ١٨٤٥ تا ١٩٠٥ بەسەر ئەدەبیاتی ڕووسیدا فەرمانڕەوایی کرد، لە بارێکدا کە بە تەواوی هەموو ژانرە ئەدەبییەکانی دیکەی خستبوونە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە. بۆ زۆربەی خوێنەرانی ناڕووسی، ڕۆمانی ڕیالیستی سەرنجڕاکێشترین دەقێکە کە بە زمانی ڕووسی نووسرابێت و سپاردەیەکی مەزنی ڕووسیایە کە نەک هەر بە تەنیا لە ئەدەبیاتی میلیی وڵاتە ئەورووپییەکاندا، بەڵکە لە ئەدەبیاتی هەموو جیهاندا ڕەنگی داوەتەوە و ڕێک دەڵێیت بە هەمان ئەندازەش هی خەڵکی سەرانسەری ئەورووپایە. ڕۆمانی ڕیالیستیی ڕووسی بە *ئاکساکۆف* و *تورگنیف* دەست پێدەکات و تا *چیخۆف* و

←

---

١. ئەم بابەتە وەک دەستپێکێک بۆ ناسینی دۆستۆیڤسکی و شرۆڤەکانی تاوان و سزا هەڵبژێردراوە، لە بنەڕەتدا هەڵبژاردەیەکە لە دەروازەگەلی پەیوەست بە ڕیالیست و دۆستۆیڤسکی لە کتێبی *مێژووی ئەدەبیاتی ڕووسیا*دا. کتێبی ناوبراو ئێستاکە لە بواری خۆیدا بە کارێکی گرنگ و کلاسیک دێتە ئەژمار و لەوانەیە لەنێو ئەو کتێبانەی کە لەسەر مێژووی ئەدەبیاتی ڕووسیا نووسراون، پڕخوێنەرترین کتێب بووبێت. سەلیقەی دروست و دیدی قووڵی میتریسکی و داوەرییە ویژدانداراانە و تەواو پشتئەستوور بە بەڵگەکانی، لە تایبەتمەندییە ڕەسەنەکانی ئەم بەرهەمەن. «و. ف»

تەنانەت گۆرکی، بونین[1] و نووسەرانی پەیڕەوی دوای ئەوان و هاوسەردەمانی ئێمەش بەردەوامیی هەیە. ئەم ڕۆمانە تەنانەت بۆ نموونە لە درامای سەردەمی ئیلیزابیسیش یەکپارچەترە و دەکرێت و دەشبێت وەک یەک فەرهەنگی ئەدەبیی یەکانگیر لێی بکۆڵرێتەوە. هەر بە سرووشت لە ناوەڕۆکی خودی ئەو شێوازەدا (ڕۆمانی ڕیالیستی) تەوژمگەلێک هەبوون و چەند گۆڕانکارییەکیش هاتنە ئارا. هەر لەبەر ئەوەشە کە بۆ نموونە بەرهەمی چیخۆف و بونین لە زۆر ڕووەوە لە بەرهەمی نووسەرانێکی وەک *ئاکساکۆف* و *گۆنچارۆف* جیاوازن، وەلێ بە گشتی هەر لە بازنەی هەمان سەلیقە و پێوەر و ڕۆڵی هونەر و هونەرمەندندا دەخوولێنەوە. ئەمە لە بارێکدایە کە بەرهەمەکانی پووشکین و *گۆگۆل* لە دەورانی سەرەتای ڕیالیزم و هەروەها بەرهەمەکانی *ڕیمیزۆف* و *ئاندری بیلی* لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، بە دیدێکی دیکە ئافرێندراون و، بەم پێیە، دەبێت بە پێوەرگەلی دیکە هەڵبسەنگێندرێن.

ڕیالیستی ڕووسی لە سالانی چلی سەدەی نۆزدەیەمدا سەری هەڵدا، وردتر بڵێین لە سالانی ١٨٤٦-١٨٤٧دا. سەرچاوەی ئەم دیاردەیەش کتومت ئاشکرا نییە. لە بنەڕەتەوە ڕیالیست بەرهەمی لێکموتوربەبوونی نەیچرالیزم (سرووشتگەرایی)ی هەجوویی گۆگۆل و ڕیالیزمی هەستگەرایی (سێنتیمێنتەڵ)ی کۆنە کە لە سالانی سی و چلدا گیانێکی تازەی بە بەردا هاتبووەوە و کاریگەریی قووڵی ژۆرژ *ساندری* پێوە دیار بوو. لە بنەڕەتدا ژۆرژ و گۆگۆل، باوانی ڕیالیزمی

---

٢. Ivan Bunin: یەکێکە لە ئەدیبە هەرە گرنگ بەڵام گومناوەکانی ڕووسیا، لە سالی ١٨٧٠ لەدایک بووە و لە سالی ١٩٥٣دا کۆچی دوایی کردووە. لە پاڵ ئەمانەشدا بونین شاعیرێکی مەزن بووە و لە ناوەڕاستی هەشتاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا، یەکەمین دیوانە شیعری خۆی چاپ کردووە و جیا لەمەش، لە سالی ١٩٣٣دا خەڵاتی نۆبلی بەدەست هێناوە. «و. ک»

ڕووســـی و مامۆســـتای قۆناغه ســـەرەتاییەکانی بوون. هەڵبەتە نووســـەرانی ناڕووســـیی دیکە، بەتایبەت *بالزاک*، ڕۆڵێکی کاریگەریان هەبوو. ڕیالیســـتی کلاســـیکیی پووشـــکین و *لێرمانتۆف* ڕۆڵێکی بەرچـاویـان لە ئەدەبیـاتی ڕووســـیـدا گێڕا و لەنێو ئـاوێتەبوونی ناهاوئاهەنگی ئەم کاریگەرییە جیاوازانەدا، بێوگێنی *ئانێگین* و *پاڵەوانی سەردەمی ئێمە* لە سەرووی هەموو کاریگەرییەکانی دیکەوە بوون. لە کۆتاییدا، کامڵبوونی ئەڵقە ئەدەبییەکانی مۆسکۆ لە ساڵانی سی و چلی ســـەدەی نۆزدەیەم و ئەو شـــێوەیەی ئاخری لە دەیەکانی ســـەدەی بیســـتەمـدا -کە کەمـاڵگەرایی تێیـدا ڕەنگی دابووەوە- لە ڕۆمـانی ڕووسـیدا پێگەیەکی گرنگی لە هێنانەئارای تایبەتمەندیی ئایدیالیستی و شـارســتانیبووندا هەبوو. بەبێ زیادەڕۆیی، بلینســکیش لەم نێوەندەدا ڕۆڵێکی کاریگەری گێڕا. ئەوە نووسـینە ڕەخنەییەکانی سـاڵانی ١٨٤١-١٨٤٥ی ئەو بوون کە بە کردەیی و گشتی چارەنووسی ئەو بزووتنەوە ئەدەبییەیان دیاری کرد. تا ئێستە نموونەیەکی دیکەی وەها نەبووە کە ڕێبازێکی ئەدەبی بەو بەرفراوانییەی خۆیەوە ئاوها بە وردی پابەندی چاوەڕوانییەکانی ڕەخنەگرێکی دیار بێت.

... ڕیالیزمی ڕووسـی لە شـێوازی کۆتاییدا، لەگەڵ شـێوازی گۆگۆڵدا جیـاوازە. لە بـارێکدا کە نەیچراڵیزمی گۆگۆڵ تەنیـا کـاری لەســـەر نیشـــاندانی لایەنی ناشـــیرینی ژیان لە دڕندانەترین و زیادەڕۆیانەترین باری ئەودا دەکرد، ڕیالیســـتەکانی دیکە لەم تاکلایەنییە ئازاد بوون و دەسـتیان کردە نیشـاندانی ژیان بە سـەرلەبەری تایبەتمەندییەکانییەوە، نەک بە تەنیا کەموکوڕی و خەوشـــەکانی. ئەوان دەســـتڕاگەیشـــتن بە شێوازگەلی پەسەندکراوی ڕیالیستییان بۆ وەسفکردنی ئاکارە ناوەندی و بالاکانی مرۆڤ، بەریەککەوتنی چاکە و خراپە لە دەروونی ئەودا و، بە کورتی، وەســـفکردنی مرۆڤی باویان -کە وەک بوونێکی مرۆڤیی دەرکی پێ دەکرێت نەک تەنیا کاریکاتێرێک لە مرۆڤ- کردە ئەرکی

خۆیان. گۆگۆل، بە وەسفکردنێکی سێنتیمێنتەڵیانەی ژیانی خانەدانی و کۆنەموڵکداران و پەیوەندییە مرۆییەکان –بە دەربڕینی ئەو سەردەمە– لەڕێی مرۆڤێکی بچووک و گاڵتەجاڕەوە لە بەرهەمە بەناوبانگەکەی خۆیدا *پاڵتۆ*، لەم بارەیەوە گەلاڵەیەکی خستبووە بەردەست. پەیوەندیی مرۆیی لە سایەی ژرژ ساند (هەروەها تا ڕادەیەک چارلز دیکنز)ەوە بەهێز بوو، بەڵام پووشکین و لێرمانتۆف کاریگەرییەکی زەوەندەیان لەسەر ڕیالیزمی ئازادبوو لە هەجووی ڕووت دانا. ئەمەش نەک لەبەر ئەوەی کە لە بەرهەمەکانیاندا جۆرێک لە سێنتیمێنتەڵیزمی[1] مرۆیی هەبوو، بەڵکە لەبەر هەبوونی پەیوەندییەکی مرۆیی تەواو چوونیەک و یەکسان لەگەڵ هەموو کەسایەتییەکاندا. پەیوەندیی مرۆیی لە شێوەی سێنتیمێنتەڵی لە سالانی چلدا هێندە درێژەی نەکێشا، وەلێ ناوەڕۆکی ئەم پەیوەندییە، یانی دەستەبەرکردنی پەیوەندییەکی سۆزدارانە لەگەڵ مرۆڤدا، نەک بە تەنیا جیا لە پابەندییەکانی چینایەتیی تاک، بەڵکە دابڕاو لە بەها ئاکارییەکانی ئەو، بووە تایبەتمەندیی سەرەکیی ڕیالیزمی ڕووسی. مرۆڤەکان نە باشن و نە خراپ، ئەوان کەم تا زۆر چارەڕەشن و شایەنی هاوخەمین، دەکرێت هەر لە تورگنیفەوە هەتا چیخۆف ئەمە بە فۆرمۆڵێک بزانین بۆ هەموو ڕۆماننووسانی ڕووسی.

بە گشتی، ڕیالیزمی ڕووسی هاوبەشییەکی کەمی لەگەڵ گۆگۆلی مامۆستایدا هەیە. ڕیالیزم تەنیا و تەنیا چەند شتێکی لە گۆگۆلەوە بە میرات بردوون: یەکەم سەرنجێکی مکووڕانە لەسەر وردەکاری بە شێوەیەکی زیندوو و کارا. ئەم سەرنجە نەک هەر بە تەنیا بە وردەکاریی ژینگە و هەلومەرجەوە، بەڵکە بە وردەکاریی ڕوواڵەت و هەڵسوکەوتی فیزیکیی کەسایەتیشەوە پەیوەستە. لەم ڕووەوە، تۆلستۆی یەکێک بوو لە پەیڕەوانی گۆگۆل، گەرچی لە لایەنی دیکەوە پێکچوونێکی لەگەڵ ئەودا نەبوو، ئاخر ئەویش لە نووسینەکانی

---

[1]. سێنتیمێنتەڵیزم: هەستگەرایی

دواتریدا (پاش ساڵی ١٨٨٠) یەکەمین کەسێک بوو کە دژ بە درێژدادڕیی ناپێویست هاواری لێ هەستا، بەڵام دووەمین میراتی گۆگۆڵ: ئەوە ڕیالیستەکانی دوای ئەو بوون کە بە شێوازەکەی ئەو درێژەیان بە لەدژوەستانەوەی تابوو دا و سەربەستانە لایەنی دڕندانە، ناشیرین، ناخۆش و قێزەونی ژیانیان هێنایە ناو ئەدەبیاتەوە، بەس ئەوان پێشی گۆگۆلیان نەدایەوە و تابووەکانی دیکەیان نەشکاندن و شێوەگەلی وەک لایەنی فیزیکیی پەیوەندیی جنسی، نەخۆشی و مەرگ هەر وا بە شاراوەیی مانەوە. گەرچی ڕێساکانی بێدەنگی لە ئەدەبیاتی ڕیالیستیی ڕووسیدا هەمان ڕێسا ڤیکتۆریاییەکانی[1] ئینگلیز نین، کەچی ئەم ئەدەبیاتە هەر بە سرووشت وەک ڕۆمانە ڤیکتۆریاییەکان نەدرکێن و پەردەپۆشە. دەورەی تازەی تابووشکێنی نیو سەدە دواتر لە لایەن گۆرکی و تۆلستۆیەوە (هەڵبەتە لە نووسینەکانی پاش ساڵی ١٨٨٠) دەستی پێ کرا، بەڵام سێیەمین شت کە ڕیالیستەکان وەک میرات لە گۆگۆڵەوە بۆیان بەجێ ما، گرتنەبەری ڕێچاری هەجوونامێز بوو بۆ گرفتە هەنووکەییەکانی ژیان. ئەم پرسە بە پێچەوانەی دوو خاڵەکەی سەرەتاوە، تایبەت نەبوو بە ڕەوتی ڕیالیزمەوە، بەڵکە بە شێوەیەکی گشتی ڕێچاری هەجوونامێز بۆ ژیانی ڕۆژانەی کۆمەڵایەتی دزەی کردبووە ناو ڕۆمانە ڕووسییەکانی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمەوە.

---

١. Victorian Literature: لە ساڵی ١٨٣٧ دا شاژنە ڤیکتۆریا بووە شاژنی بەریتانیا و بەردەوام بوو لەسەر دەسەڵات، کە بە درێژترین ماوەی دەسەڵات لە مێژووی بەریتانیادا دادەنرێت کە تا ساڵی ١٩٠١ درێژەی کێشا. ئەم سەردەمەش بە سەردەمی ڤیکتۆری ناوبرا و هاوکات لەم سەردەمەدا بەریتانیا لە بوارەکانی ئەدەب و فکردا گەیشتە ترۆپکی گەشانەوەی خۆی، هەر بۆیەش هەموو ئەو ڕۆمان و کارە ئەدەبییانەی کە لەو سەردەمەدا نووسراون، دەچنە قاڵی ئەدەبی ڤیکتۆریاییەوە. «و. ک»

تایبەتمەندییەکی دیکە کە بکرێت نەک هەر بۆ هەموو ڕیالیستەکان، بەڵکە لانیکەم بۆ ڕەوتی ڕیالیزم بە شێوەیەکی گشتی ئاماژەی پێ بدەین، خەمساردبوون لەئاست پێکهاتە و پەرژانە سەر گێڕانەوە و چڕکردنەوەی سەرنج لەسەر لایەنی سەرنجڕاکێشی بەدەر لە بابەت، چڕکردنەوەی سەرنج لەسەر کەسایەتییەکان و جۆرێک لە خۆکۆڵی (خۆشیکاری) و خۆئاشکراکردنە. ڕۆمانی ڕووسی بەم مانایە – بەتایبەت لای تۆڵستۆی– زۆر لە ڕۆمانی خۆرئاوایی سەردەمی خۆی پێش کەوت و تەنیا کەسانی دواتری وەک *هێنری جەیمس*، *مارسێل پرۆست* و *جەیمس جۆیس* توانییان تا ڕادەیەک پێی ڕابگەنەوە. یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندییە گرنگەکانی ڕیالیزمی ڕووسی کە ڕاستەوخۆ بۆ گۆگۆڵ دەگەڕێتەوە، سادەیی شێوازەکەی (ستایل) و هەوڵدانیەتی بۆ کاڵکردنەوە و وەلانانی شێوازی نووسین. ڕیالیستەکان خۆیان لە ڕازاندنەوە و ناسکی بەدوور دەگرت. لە دیدگەی ئەوانەوە، پەخشانی باش، پەخشانێک بوو کە ڕێک هاوتای بابەتی وەسفکراو بێت و هاوشانی ئەو واقعیەتە بێت کە لێی دەدوێت، بە کورتییەکەی دەبێت ڕوون بێت. پەخشانێک بێت کە خوێنەر ئەسڵەن سەرنجی لەسەر خودی ئەو چڕ نەبێتەوە. ئەم ئەنتیتێزە ڕاستەوخۆ شێوازی گۆگۆڵ و تا ڕادەیەکی زۆر سەرمەشقی چون پووشکین و لێرمانتۆف و، بەتایبەتیش لێرمانتۆف بوو. وێڕای ئەمەش، ڕیالیستەکان بە ئەرکی خۆیان دەزانی کە بابەتی بەرهەمەکانیان تەنیا لەنێو ژیانی هاوچەرخ یان کەم تا زۆر هاوچەرخی ڕووسیدا هەڵبژێرن. لەو سەردەمەدا، ئەم ڕەوشە، یانی قسەکردن لەسەر ئەوەی کە بە باشی دەیناسیت، تەنیا بە ویستێکی تاکەکەسی دانەدەنرا، بەڵکە هەلومەرجی کۆمەڵایەتیی ئەدەبیات لە ڕووسیای ناوەڕاست و کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا وای دەخواست. چاوەڕوانی دەکرا کە ڕۆماننووس کاردانەوەیەکی ورد و پڕمانای لە هەمبەر ڕووداوەکانی ژیانی نەتەوەییەوە هەبێت. ئیدی لەبەر ئەمە ڕۆمان کەوتە ژێر سانسۆرێکی توندەوە و دەکرێت بڵێیت

ڕۆمان –کە لە ساڵانی چلەوە بوونی خۆی نواند– گۆڕا بۆ باشترین شێوەی ڕوونکردنەوەی ڕای کۆمەڵایەتی. هەمووان بە سەرنجەوە گوێیان بۆ پەیامەکەی دەگرت و ڕەخنەگر چاوەڕوانیی لە ڕۆماننووس هەبوو هەر بەرهەمێکی تازەی، بەبێ هەڵاواردن هەڵگری شتێک بێت کە شیاوی تێفکرین بێت و پێویستە لە دیدگەی پرسە کۆمەڵایەتییەکانی ڕۆژەوە شیکارییەکی هەبێت. ڕۆماننووسانیش زۆر جددی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ئەم بابەتانەدا دەکرد و هەمیشە دەیانخستنە پێڕستی بنەماکانی خۆیانەوە و ڕەچاویان دەکردن.

ڕەنگوبۆی شارستانی و کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی گشتی یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی ڕۆمانی سەدەی نۆزدەیەمی ئەورووپا، بەس لە هیچکوێ وەک ڕووسیا تا ئەم ڕادەیە تۆخ نییە. هەر لەبەر ئەوەیە کە ئەدەبیاتی ڕووسیی ئەو سەردەمە خاوەنی جۆرێک لە تایبەتمەندیی ڕۆژنامەوانییە و ئەم وەسوەسەیە دەهێنێتە کایەوە کە لەبارەی مێژووی ڕووسیاوە، لەڕووی ڕای کۆمەڵایەتییەوە وەک سەرچاوەیەکی زانیاری لێی بکۆڵینەوە. نووسەرانی ڕووسی و ناڕووسی چەندان جار کتومت دوای ئەم ئامانجانە کەوتوون، گەرچی ڕوونیشە کە ڕەوشێکی هێندە باش نییە. تەنیا کەسانێک کە هیچ شتێک لەبارەی ناوەڕۆکی ئەدەبیات و تایبەتمەندیی دراوە مێژووییەکانەوە نازانن، دەشێت نیازیان بێت وەک سەرچاوەیەکی مێژوویی سوود لە ڕۆمان وەربگرن، لەوانەیە بەدەر لە نموونەگەلێکی بەڵگەی ئەدەبی، کە سەرچاوەی نائەدەبی کامڵ و پشتئەستوور دەکەن، گەرچی لەو بارەشدا پەرژانە سەر ئەدەبیات دەبێتە شتێکی زیادە.

## ٢. بەرهەمە سەرەتاییەکانی دۆستۆیڤسکی

یەکەمین ڕۆمانی دۆستۆیڤسکی، *ڕەشوڕووت (هەژاران)*، لە ڕەوتی تازەی ئەدەبیدا بووە ئەوەڵین سەرکەوتنی ئەو. لەم بەرهەمە و ڕۆمان و چیرۆکە سەرەتاییەکانی ئەودا (بەر لە ساڵی ١٨٤٩)، وەک چەند بەرهەمێکی ڕیالیزمی تازە، زۆر بە ئاشکرایی کاریگەریی گۆگۆڵی پێوە دیار بوو. هەر لەبەر ئەوەش، هەمیشە وا باو بووە کە لە دۆستۆیڤسکیدا باسی ڕیالیستەکان کورت و پوخت بکرێتەوە. لە لایەکی دیکەوە، بەرهەمەکانی دواتری ئەو، یانی زنجیرەی بەرهەمەکانی دیکەی کە بە *یادداشتە ژێرزەمینییەکان* دەستی پێ کرد و بە *برایانی کارامازۆف* دوایی هات، پێش سەردەمەکەی خۆیان کەوتوون و بە چەشنێک گرێدراوی ڕووداوەکانی داهاتوون و بۆ خوێنەری ئاسایی ناڕوونن کە نابێت بەر لە بەرهەمی کەسانی وەک ئاکساکوف و گۆنچارۆف باسیان لێوە بکرێت. هەر لەبەر ئەوە لە مێژووی گشتیی ئەدەبیاتی ڕووسیدا، پێویستە بەرهەمەکانی دۆستۆیڤسکی بەسەر دوو سەردەمدا پۆلێن بکەین. ئەم پۆلێنکارییە لەبەر ئەو وەستانە درێژخایەنەیە کە لە چالاکیی ویژەیی ئەودا هەیە و هۆکاری ئەم وەستانەش دەستبەسەرکردن و دوورخستنەوەی ئەوە لە ساڵی ١٨٤٩دا...

فیۆدۆر میخایلۆڤیچ دۆستۆیڤسکی لە ٣٠ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٨٢١ لە مۆسکۆدا هاتە دونیا. باوکی دکتۆر بوو و لە یەکێک لە نەخۆشخانە گەورەکانی شاردا کاری دەکرد. بنەچەی خێزانەکەی ئەو دەچووەوە سەر سەرزەمینی باشووری خۆرئاوا (ڤالینی) و تەنانەت بۆشی هەیە لە خانەدانەکان بووبێت. لە بەڵگەنامەیەکی چەرخی حەڤدەیەمدا زۆر ناوی ئەوان بەرچاو دەکەوێت. چەند نوێنەرێکی ئەو بنەماڵەیە کە ڕێبازی خۆیان نەگۆڕیبوو و نەبووبوونە کاسۆلیکی، قەشە بوون. باپیری دۆستۆیڤسکی قەشە بوو و دایکیشی کچی

بازرگانێکی مۆســـکۆیی. بەم پێیە، لە دەمارەکانی دۆســـتۆیڤســـکیدا، هاوکات خوێنی ئۆکرانیایی و مۆسکۆیی دەگەڕا.

بەپێی گوتەی کچەکەی دۆســـتۆیڤســـکی لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناونیشانی *لەبارەی ژیانی باوک*ـــەوە، بنەچەی لیتوانیایی خێزانەکەی ئەوان تەنیا لەم ئاستەدا بوو کە تا ساڵی ١٥٦٨، ڤالین، ئەو شوێنەی کە بنەچەی خێزانەکەی دۆستۆیڤسکی سەر بە ئەوێ بوو، بە بەشێک لە پاشـــاياتيی ليتوانی دەهاتە ئەژمار. دۆســـتۆیڤســـکیی باوک، وەک پێویست ساماندار بوو و توانیبووی بە داهاتەکەی ماڵومولکێک پێکەوە بنێت، بەڵام بەبێ ڕەنجبەر (ڕەعیەت)، لەبەر ئەوەی مولکەکەی کەڵکی ئـاوەدانکردنەوە و تێدانیشـــتەجێبوونی نەبوو. فیۆدۆر و میخـاییلی براگەورەی (هاوپشـکی داهاتووی ئەو لە گۆڤاردا) زۆر زوو شـەیدا و تامەزرۆی خوێندنەوە بوون. دۆسـتۆیڤسـکی لە هۆگربوونی خێرای بە خوێندنەوەوە، چووەوە ســـەر پووشـــکین و ئەم تایبەتمەندییە گەلێک زوو لە ئەوشیدا دەرکەوت و کەوتە سەر پێ. برایەکان تا ساڵی ١٨٣٧ لە پانسیۆنێکی[1] تایبەتیی مۆسکۆدا خەریکی خوێندن بوون. دوای ئەوە فیۆدۆر گواسـتییەوە بۆ پیتەربورگ و لە قوتابخانەی باڵای سـەربازی و ئەندازیاریدا وەرگیرا. چوار سـاڵی لەوێ بەسـەر برد، بەڵام مەیلێکی وەهـای بۆ کاروبـاری ئەندازیـاری نەبوو و حەز و ئـاواتی ئەو وەک ڕابردوو هەر ئەدەبیات و خوێندنەوە بوو. ئەو نامانەی کە لە سەردەمی زانکۆدا بۆ براکەیی ناردن، پڕ بوون لە پرسی ویژەیی.

دۆســـتۆیڤسـکی لە سـاڵی ١٨٤١دا پلەی ئەفســـەریی وەرگرت، وەلێ ســـاڵێکی دیکەش لە زانکۆدا مایەوە. دوای ئەوە، لە بەشـــێکی بواری ئەندازیاریدا پیشـەیەکی دەسـت کەوت. لەبەرانبەر پێنج سـاڵ خوێندندا، بەرئەرک بوو دوو ســـاڵ لە ســـوپـادا خزمەت بکـات، بەڵام دوای

---

١. پـانســـیۆن: نـاوەنـد یـان ڕێکخراوێکی بەکرێ بۆ مـانەوە، کە نـان و چـا و خزمەتگوزاریشی تێدا دابینە. وشەکە فەڕەنسییە.

تەواوبوونی ماوەی بەرئەرکییەکەی ئیدی وازی لە خزمەت هێنا و ساڵی ١٨٤٤ لە سوپا کشایەوە. دۆستۆیڤسکی هەژار نەبوو، باوکی برە میراتێکی بۆ خێزانەکەی جێ هێشتبوو، بەس دۆستۆیڤسکی کاڕزان و دەستپێوەگر نەبوو و لەبەر ئەوەش چەندان جار نەداری بەرۆکی گرت. دوای کشانەوەی لە سوپادا، بڕیاری دا خۆی بۆ ئەدەبیات تەرخان بکات و لە زستانی ١٨٤٤ تا ١٨٤٥ *ڕەشوڕووتی* نووسی. گریگۆرۆڤیچ، ڕۆماننووسی تازەکاری ئەو ڕێبازە تازەیە، ئەوی ڕاسپارد بەرهەمەکەی نیشانی *نیکراسۆف*[1] بدات، کە سەردەمانێک نیازی بوو ساڵنامەی ئەدەبی بڵاو بکاتەوە. نیکراسۆف دوای خوێندنەوەی *ڕەشوڕووت* شاگەشکە بوو و ڕۆمانەکەی بردە لای *بلینسکی* و کە هەنگاوی نایە ماڵەکەیەوە، هاواری کرد: *گۆگۆلی دووەم لە دایک بووە!* بلینسکی لە وەڵامدا گوتی: *گەر بە ئێوە بێ هەموو ڕۆژێ وەک قارچک گۆگۆل هەڵدەتۆقێ.* لەگەڵ ئەوەشدا کتێبەکەی وەرگرت و تا کۆتا خوێندییەوە. ڕۆمانەکە بە هەمان ڕادەی نیکراسۆف کاریشی خستە سەر ئەو. لە ئەنجامدا دیدارێک لەنێوان دۆستۆیڤسکی و بلینسکیدا ڕێک خرا. بلینسکی هەموو جۆشوخرۆشی خۆی بەم ڕستەیە گەیاندە نووسەر: *باشە ئێوە خۆتان دەزانن کە چیتان نووسیوە؟* دۆستۆیڤسکی کە دوای سی ساڵ ئەم دیدارەی بیر هاتووەتەوە، گوتبووی ئەو ڕۆژە باشترین ڕۆژی ژیانی بووە. لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٨٤٦دا *ڕەشوڕووت* لە بەرهەمڤۆکی[2]

---

١. Nikolay Nikrasov: نیکۆلای ئەلیکسیڤیچ نیکراسۆف (١٨٢١–١٨٧٨)، نووسەر و شاعیر و ڕەخنەگرێکی دیاری ڕووسی بوو. دۆستۆیڤسکی زۆر سەرسام بووە بەو شیعرانەی نیکراسۆف کە بەسەر هەژار و ڕەشوڕووتاندا نووسیونی و، هەر ئەم شیعرانەش نیکراسۆفیان کردە پاڵەوان لەناو لیبراڵ و ڕادیکاڵەکانی ئەو سەردەمەدا. «و. ک»

٢. بەرهەمڤۆک: کۆلیکسیۆن؛ ژمارەیەک شتی سەر بە یەک (یان بەرهەمی هونەری) کە بۆ لێکۆڵینەوە، سەرگەرمی یان ڕانان کۆ کراونەتەوە.

پیتەربوگیی نیکراسۆفدا هەلی چاپکرانی بۆ ڕەخسا. بلینسکی و ڕەخنەگرانێکی دیکە کە لەبارەی ڕێبازە تازەکەوە هاوهەڵوێست بوون، ڕەخنە و لێکدانەوەیەکی دلۆڤانانەیان لەسەر کتێبەکە نووسی و ئیدی خەڵکیش پێشوازییەکی گەرموگوڕیان لێ کرد. دۆستۆیفسکی هەر وا خاکەڕایانە بەلای سەرکەوتنەکەیدا ڕانەبرد، بەڵکە لووتبەرز بوو و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە چەندان چیرۆکی گاڵتەجاڕانە لەبارەی ناوبانگپەرستیی بێڕادەی ئەوەوە بکەوێتە سەر زاران. سەرکەوتنی گەورە، هێندەی نەخایاند. *هاوزا* دووەمین ڕۆمانی دۆستۆیفسکی کە هەر لە هەمان ساڵدا چاپ کرا، کاردانەوەیەکی ساردوسڕانەی لەبەرانبەردا نوێندرا. پەیوەندییەکانی نووسەرەکەی ئێمەش لەگەڵ بلینسکی و هاوڕێیانیدا ئیدی بەو گەرموگوڕییەی جاران نەمانەوە. ئەو قسە لووتبەرزانانەی کە لەبارەی ڕۆمانی یەکەمییەوە کردبوونی، زیاتر ئەم پەیوەندییەیان بەرەو ساردوسڕی برد، چونکە بە دووەمین بەرهەمی هەر بە یەکجاری هیوابڕاوی کردبوون. لەم نێوەندەدا، تۆرگنێف سەری دەخستە سەری و گاڵتەی پێ دەکرد، هەر لەبەر ئەمەش دۆستۆیفسکی ئیدی پەیوەندیی خۆی لەگەڵ ئەودا پچڕاند. دۆستۆیفسکی هەر وا بەرهەمی تازەی بڵاو دەکردەوە، وەلێ بەدەمەوەچوونێکی ئەوتۆیان لەلایەن خوێنەوەرەوە نەبوو. دۆستۆیفسکی گەرچی پەیوەندیی لەگەڵ کۆڕە ئەدەبییە پێشەنگەکاندا پچڕا، بەڵام هەر وا وەک خۆرئاواگەرایەکی[1] ڕادیکاڵ[2] مایەوە و بووە بەشێک لە گرووپی *پیتراشفسکی*؛ گرووپێک کە بۆ خوێندنەوەی بەرهەمی فوریە، گوتوبێژ لەبارەی سۆسیالیزم و ڕەخنەگرتن لە حکوومەتی ئەوساوە کاتی تەرخان کردبوو، بەڵام سەنگەرگرتن لە

---

١. خۆرئاواگەرایی: هۆگری و شوێنەڕایی لە شێوازی ژیان، بایەخی فەرهەنگی یان ڕوانگەی ڕامیاریی خۆرئاوا.

٢. بنیادخواز؛ لایەنگری گۆڕانکاریی بنەڕەتی، شێواز یان پێکهاتەگەل.

حکوومەتی تزاری بە شۆڕشی ١٨٤٨ی فەڕەنسا، نەگبەتییەکی گەورە بوو بۆ گرووپی پیتراشفسکی. لە نیسانی ساڵی ١٨٤٩دا هەرهەموویانیان گرتن و دۆستۆیفسکیشیان ماوەی هەشت مانگ لە قەڵایەکدا زیندانی کرد تا ئەو کاتەی کە دادگەی سەربازی لێکۆڵینەوەکانی خۆی تەواو بکات و سزا و چارەنووسی پیلانگێڕان دیاری بکات. دواجار سزاکە ڕاگەیێندرا و دۆستۆیفسکی بە تۆمەتی بەژداریکردن لە کۆبوونەوەی ناپاکانەدا، بەخشینەوەی نامەکەی *بیلینسکی بۆ گۆگۆل* کە پڕ لە وشەی بێشەرمانە بوو بەرانبەر کڵێسای ئۆرسۆدۆکس و حکوومەت، هەروەها بە تۆمەتی چالاکیی لە نووسینی وتاری دژەحکوومەتی بە هاودەستیی تۆمەتبارانی دیکە و بڵاوکردنەوەیان لەڕێی ئامێری چاپکردنی ناوماڵ، بە تاوانبار درایە قەڵەم و سزای هەشت ساڵ زیندانیان بە بێگارەکارەوە بۆ بڕییەوە. ئیمپراتۆر ماوەی سزادانەکەی ئەوی بە چوار ساڵ کەم کردەوە، بەڵام دەبوو دوای ئەم ماوەیە وەک سەربازێک بنێردرێت بۆ خزمەتکردن. بەس بابەتەکە بەم جۆرە بوو: لەبری ئەوەی بە سادەیی ئەو سزایەیان پێ ڕابگەیەندرێت کە بەسەریاندا سەپێندرابوو، سەرەتا نمایشێکی تراژیدی-کۆمیدیی دڕندانەیان بۆ ڕێک خستن: سزای گوللەبارانکردنی تاوانباران خوێندرایەوە و هەموو ئامادەکارییەکی تۆقێنەریش بۆ گوللەبارانکردنە کرا، وەلێ تەنیا ئەو کاتە سزا ڕاستەقینەکە خوێندرایەوە کە دەستەی یەکەمیان بە ستوونەکانی گوللەبارانکردنەوە بەستنەوە. ڕوونە کە هەموو تاوانبارکراوان سزای گوللەبارانکردنەکەیان بەهەند وەرگرتبوو و تەنانەت یەکێکیشیان لە ترسی گیانی دەمودەست ئەقڵی لەدەست دا. دۆستۆیفسکی هەرگیز ئەو ساتەوەختەی لە بیر نەکرد و دواتر، هەم لە گەمژە و هەم لە *یادداشتەکانی نووسەردا* لێی دەدوێتەوە. ئەم کارەساتە لە ساڵی ١٨٤٩دا ڕووی دا و دوو ڕۆژ دواتر دۆستۆیفسکییان ڕەوانەی سیبیریا

کرد؛ ئەو شـوێنەی کە دەبوو لەوێ ماوەی سـزاکەی تەواو بکات. بەم پێیە، ئەو بۆ ماوەی نۆ ساڵ لە ئەدەبیات دابڕا.

ئیدی ڕوونە کە بەرهەمە سەرەتاییەکانی ئەو جیاوازییەکی ئەوتۆیان لەگەڵ بەرهەمەکانی داهاتوویدا هەیە. بە ئاسـتەم دەتوانین نووسـەری *یادداشتە ژێرزەمینییەکان و شەیتانەکان* و ئەوەی کە بەدوای ئەمانەدا نووسـیین، لە *ڕەشـووڕووت* و بەرهەمە سـەرەتاییەکانی دیکەیدا بناسـینەوە. لە بەرهەمە سـەرەتاییەکانیدا، کەم تا زۆر هیچ کەسایەتییەکی هاوشانی ئافرێندراوانی وەک *سڤیدریگایلۆف*، *کیریلۆف* یان *کارامازۆفی باوک* لەئارادا نییە. هەر لەبەر ئەمە، ڕاسـتتر وایە کە دۆستۆیڤسکیی گەنج وەک نووسەرێکی سەربەخۆ و جیا بخوێندرێتەوە و شـرۆڤە بکرێت، نەک وەک هەمان ئەو کەسـەی کە ڕۆمانی گەمژەی نووسـیوە. هەڵبەتە دۆسـتۆیڤسـکیی گەنج لەچاو ئەو نووسـەرەی کە ڕۆمـانی گەمژەی نووسـی گرنگییەکی کەمتری٠ هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا بە هیچ شـێوەیەک نووسـەرێکی بچووک نییە و تـایبەتمەنـدییەکی بە نـاوی ڕەسـەنییەوە هەیە و ئەمەش لەنێوان هاوسەردەمانیدا پێگەیەکی باشی بە ئەو بەخشیبوو.

تـایبەتمەنـدییەکی سـەرەکی کە دۆسـتۆیڤسـکیی گەنج لە ڕۆماننووسانی دیکەی سالانی چل و پەنجای سەدەی نۆزدەیەم جودا دەکـاتەوە، نزیکیی ئەوە لە گۆگۆڵەوە. ئەو بە پێچەوانەی ئەوانی دیکەوە، بەر لە هەر شـتێک لە خەمی شـێوازی نووسـیندا بوو، ڕێک وەک گۆگۆڵ. شـێوازی ئەو وەک هی گۆگۆڵ نووسـینێکی پتەو و پڕمـانـایە، گەرچی دایمە هەر وا بێـخەوش و دەقـاودەق نـییە. دۆستۆیڤسکی لە *ڕەشووڕووت*دا وەک ڕیالیستەکانی دیکە هەوڵ دەدات بە زیادکردنی تووخمگەلی هاوخەمی و هەسـتی مرۆڤانە، کاریگەریی نەیچراڵیزمی تەواو هەجوویی گۆگۆڵ کاڵ بکاتەوە. وەلێ هەمان ئەو کـاتەی کە ئەوانی دیکە هەوڵیـان دەدا ئەم کێشـەیە بە ڕاگرتنی

هاوســـەنگیی نێوان هەجووی زیادەڕۆیانە و ســـێنتیمێنتەڵیزم چارە بکەن، دۆســـتۆیفســـکی هاوتەریبی ڕۆحی ڕاســـتەقینەی قوتابخانەی گۆگۆل، دەڵێی خەریکی درێژەپێدانی نەریتی *پاڵتۆیە* و دەکۆشـــێت هەجووی زیـادەڕۆیـانەی نەیچراڵیزم لەگەڵ هەســـتە بەهێز و ســـێنتیمێنتەڵەکاندا ئاوێتە بکات. ئەم دوو توخمە تێکەڵی یەکدی بوون، بەبێ ئەوەی تایبەتمەندیی ســـەربەخۆی خۆیان لەدەســـت بدەن. لەم نێوەندەدا، دۆســـتۆیفســـکی شـوێنکەوتووی ڕاســتەقینە و لێوەشـاوەی گۆگۆڵە، بەس لەبارەی *ڕەشوڕووتەوە*، دەبێت بڵێین لە ڕاستیدا ئایدیای ئەم ڕۆمانە گۆگۆڵی نییە. لەم بارەیەوە هیچ ڕق و کینەیەک لەبەرانبەر مـایەپووچیی ژیـانەوە لەئـارادا نییە و ئەوەی کە هەیە ئـازار و هاوخەمییەکی قووڵە بۆ ئەو مرۆڤانەی کە پامال کراون و کەم تا زۆر لە کەسـایەتی خراون و کراونەتە گاڵتەجاڕ. *ڕەشـوڕووت* لە ڕاسـتیدا ترۆپکی ئەدەبیاتی مرۆڤانەی ســاڵانی چلی ســـەدەی نۆزدەیەمە. لەو بەرهەمەدا، جۆرێک لە پێشـــئاگایی ئەو بەزەییە وێرانکەرە بەرچاو دەکەوێت کە دواتر لە ڕۆمانە گەورەکانی دۆســـتۆیفســـکیدا ئاوها تراژیدی و شـــووم دەرکەوت. ئەم ڕۆمانە بە شـیوازی نامەگۆڕینەوە نووســـراوە. کچێک کە خەریکی ژیانێکی نالەبارە، لەگەڵ فەرمانبەرێکدا بە ناوی *ماکار دیێوشـکین*، پاڵەوانی ئەو ڕۆمانەن. ڕۆمانێکی درێژە و ئەم شـێوازی نووســـینە پڕ لە دڵەڕاوکێیەش، وا دەکات درێژتر ببێت. شـێوازی نووسـینی ئەم بەرهەمە، وەک شـێوازی گۆگۆل، بێخەوش و تەواو نییە، بەڵام ڕۆمانێکی هونەرمەندانەیە، بە سەرنج و هۆشیارییەوە کاری لەسەر کراوە و بە چەشنێک دەست بۆ هەموو وردەکارییەکانی براوە کە یارمەتییەکی زیاتری ســـەرانســـەری بەرهەمەکە دەدات بۆ ئەوەی کاریگەرتر دەربکەوێت.

دووەمـیـن بەرهەمـی بـڵاوکـراوەی ئەم نـووســـەرە *هـاوزایە*. ژێرناونیشانی بەرهەمەکە (ژێرناونیشانێک کە لە *حەشاماتی مردووی*

بەرهەمی گۆگۆڵیشـــدا بەرچاو دەکەوێت) لە نیشـــانە و شـــوێنپێکانی گۆگۆڵن. *هاوزا* لە بەرهەمی یەکەمی ڕەســـــەنترە. ئەم چیرۆکە کەم تا زۆر بە وردەکارییەکی هاوشـــێوەی ڕۆمانی *یولیســـس* (ڕۆمانی ناســـراوی جەیمس جۆســـی نووســـەری ئێرلەندی کە بە یەکێک لە شـــاکارەکانی ئەدەبیاتی تازە دادەنرێت) دەگێڕدرێتەوە و لە شـــێوازی نووســـیندا تـایبەتمەندیی هـاودەنگی و ئـاهەنگین دیـارە. چیرۆکەکە بەسـەرهاتی کەسـێکە کە لای وایە لەلایەن کەسـێکی دیکەوە پێگەکەی زەوت کراوە و ئەم بیرکردنەوەیەش دێوانەی دەکات. ئەم نووسراوەیە، گێڕانەوەیەکی ئـازاردەر و بەرگەنەگیراوە. لە کـاتی خوێنـدنەوەیـدا بە تەواوی خوێنەر هەراسـان دەکات. نووسـەر بە دڵڕەقییەکەوە کە دواتر میخاییلۆفســـکیی ڕەخنەگر بە تایبەتمەندیی دۆســـتۆیڤســـکیی لە قەڵەم داوە، بە هەموو توانای ســـووکایەتیکەری خۆیەوە، جەخت لەســـەر ســـووکایەتیکران بە کەســـایەتیی مرۆیی بەڕێز گۆلیادکین دەکاتەوە. وەلێ هاوکات لەگەڵ ناخۆشـی و ئازاردەرییەکەیدا، بە جۆرێک خوێنەر بەدووی خۆیدا ڕادەکێشـێت کە ناتوانرێت ڕۆمانەکە بە یەک دانیشـتن نەخوێنـدرێتەوە. *هـاوزا* گەرچی وەک ڕۆمـانێکی پڕ لە دڵڕەقیی ســـتەمکارانە دێتە بەرچاو (ڕەنگە لەبەر ئەو هۆکارەی کە نووســـەر ســـووره لەســـەر بەگاڵتەجارنیشـــاندان)، بەڵام بەرهەمێکی تەواو هونەرییە. ســـێیەمین بەرهەمی دۆســـتۆیڤســـکی کە ســـەیرترین و ناوازەترینە، ناونیشانەکەی *بەڕێز پرۆخارچین*ـــە (١٨٤٧) کە هەڵبەتە پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ *هاوزا*دا هەیە. وڕێنەیەکی تەلیســـماوی کە دەســـتەنقەســـت هەندێک لە بەشـــەکانی ناڕوون و نهێنیئامێزن، دەبێتە بنچینەی بەســـەرهاتی مەرگی کابرایەکی پیســـکە کە هەرچیی هەبووە پاشـــەکەوتی کردووە، کەچی خۆیشـــی لە گەڕەکێکی پیســـوپۆخڵ و قێزەوندا ژیان بەسەر بردووە.

لەنێو بەرهەمەکانی دیکەی سەردەمی چالاکیی ئەدەبیی فیۆدۆر دۆستۆیفسکیدا، *خاتوونی خاوەنماڵ* (١٨٤٩) و *نیێتۆچکا نیزڤانۆڤنا* (١٨٤٩) زیاد لە هەموویان شیاوی سەرنجلێدانن. یەکەم دانەیان بە شێوەیەکی چاوەڕوانینەکراو ڕۆمانتیکە. گوتوبێژەکانی کە بە شێوازێکی ڕەوان و بەشکۆ نووسراون، دەڵێی خەریکی هاوشێوەسازیی چیرۆکە میلییەکانن و زۆریش *تۆڵەی تۆقێنەری* گۆگۆڵ بەبیر خوێنەر دەهێننەوە. ئەم بەرهەمە ناگاتە سێ بەرهەمەکەی پێشتر، وەلێ تێیدا زیاتر دەتوانین دۆستۆیفسکیی داهاتوو بەدی بکەین. پاڵەوانە ژنەکەی، پیدەچێت هێڵکاری یان پێشزەمینەیەک بێت بۆ ژنانی ئەهریمەنیی ڕۆمانە گەورەکانی دۆستۆیفسکی، بەڵام هەم لە شێواز و هەم لە پێکهاتەدا، هێشتا تۆزێک وابەستەی گۆگۆڵ و هۆفمان[١] و بەلزاکە. بەسەرهاتی *نیێتۆچکا نیزڤانۆڤنا* لەچاو بەرهەمەکانی ڕابردوویدا درێژتر بوو و تێفکرینێکی زیاتریشی دەویست. بەهەرحاڵ، کارکردن لەسەر *نیێتۆچکا نیزڤانۆڤنا* لەبەر دەستگیرکردن و سزادرانی دۆستۆیفسکی ڕاوەستا، ئەم بەرهەمە هەر وا بە تەواونەکراوی وەک بڕگەیەکی تەلیسماوی و بەهێز مایەوە کە تەژییە لە هەمان ئەو سەرنجڕاکێشییەی کە بۆ ڕۆمانەکانی گەمژە و *برایانی کارامازۆف* ئاشنایە. پاڵەوانێکی ژن، کە منداڵی و هەرزەکاریی دەستمایەی ئەم نووسینەیە، زڕکچی مۆسیقارێکی هەژارە کە لە ماڵێکی خانەداندا پەروەردە کراوە؛ بە یەکەمین ژنەپاڵەوانی لووتبەرزی دۆستۆیفسکی و وەچەی دونیا (لە *تاوان و سزا*)، ئاگلایا (لە *گەمژە*) و یێکاترینا ئیڤانۆڤنا (لە *برایانی کارامازۆف*)دا دێتە ئەژمار.

---

١. Heinrich Hoffmann: نووسەر و پزیشکێکی دەروونیی ئەڵمانییە، زیاتر بەوە ناسراوە کە کتێبی منداڵانی نووسیوە. لە ساڵی ١٨٠٩ لە فرانکفۆرتی وڵاتی ئەڵمانیا لە دایک بووە و هەر لەوێش لە ساڵی ١٨٩٤ کۆچی دوایی کردووە. «و. ک»

## ٣. دۆستۆیڤسکیی دوای ١٨٤٩

دۆستۆیڤسکی لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٨٥٠ تا ئاداری ١٨٥٤ی لە ئۆردوگای کاری زۆرەملێی ئومسکدا بەسەر برد. بە درێژایی ئەم ماوەیە تەنیا ئینجیلی هەبوو بیخوێنێتەوە و تەنانەت بۆ ساتێکیش خەلوەتی نەبوو. لەم ساڵانەدا دۆستۆیڤسکی لە قەیرانێکی قووڵی دینیدا دەژیا. وازی لە بیروباوەڕە پێشکەوتنخوازانە کۆمەڵایەتییەکانی سەردەمی گەنجیی هێنا و ڕووی کردە ئایینی خەڵکی ڕووسیا، بەڵام ئەو بۆیە بڕوای هێنا، چونکە نەتەوەی ڕووسیا بڕوای هەبوو. لە لایەکەوە، چوار ساڵ بێگاری تەندروستیی لەنێو بردبوو و نۆرەی فێکانی توندتر بووبوون و زووزوو تووشیان دەبوو.

دوای تێپەڕاندنی سەردەمی سزادراوی لە ئۆردوگادا، بووە سەربازی سوپای پیادە و لە سیمی پالاتینسکی ئەیرتیشدا گیرسایەوە. لە ماوەی ساڵ و نیوێکدا (تشرینی یەکەمی ١٨٥٥) پلەی ئەفسەرییەکەی بۆ گەڕێندرایەوە. لەوەودوا مافی هەبوو بنووسێت، نامە وەربگرێت و تەنانەت لە چالاکیی ئەدەبیشدا بەشدار بێت. لە ساڵی ١٨٥٦دا کاتێک لە کۆزنێتسک دەژیا، زەماوەندی لەگەڵ بێوەژنێکدا (ئەیسایۆڤا) کرد. ئەمە یەکەمین زەماوەندی شکستخواردووی ئەو بوو. دۆستۆیڤسکی تا ساڵی ١٨٥٩ لە سیبیریادا مایەوە. لە ماوەی ئەم پێنج ساڵەدا بەدەر لە چیرۆکەکانی، ڕۆمانی *بێگانە* (بڵاوکراوەی ساڵی ١٨٥٩) و سەرەتاکانی *یادگارییەکانی یانەی مردووان*ی نووسی. لە ساڵی ١٨٥٩دا مۆڵەتی گەڕانەوەی بەرەو بەشی ئەورووپایی ڕووسیا پێ درا. ماوەیەک دواتر و هەر لە هەمان ساڵدا، دواجار گەڕایەوە بۆ پیتەربورگ و دەستبەجێ تێکەڵی گێژەنی ڕۆژنامەنووسی بوو. لەگەڵ میخائیلی برایدا ئامادەکارییان بۆ گۆڤاری (سەردەم) کرد، کە لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٨٦١دا بڵاو بووەوە.

لە دوو ساڵی سەرەتادا، ڕۆمانی *سووک و ڕسواکراوەکان* و *یادگارییەکانی یانەی مردووانی* (هەڵبەتە بەدەر لە ژمارەیەکی زۆری گوتار) لە گۆڤاری *سەردەم*دا چاپ کرد. بەبۆنەی ئەو هەڵوێستەوەی کە دۆستۆیفسکی هەیبوو و هاوکات لەگەڵ ویستی هیچ حیزبێکیشدا نەدەهاتەوە، گۆڤارەکەیان ڕاگیرا. ئەوان مەرامێکی وەک جۆرێک لە نەتەوەگەرایی کۆدڕێژانەیان هەبوو. مەرامی ئەوان بەدوای ئەوەوە نەبوو کە خەڵکی بە چاولێکردنی نموونە خۆرئاوایی و پێشکەوتووەکان بەختەوەر بکات، بەڵکە ئەوان هەوڵی ئەوەیان دەدا خەونە نەتەوەییەکان بە دەروونی بکەن. بەم جۆرە بوو کە ستراخۆفی ڕەخنەگریان بە پاڵپشتێکی بەبایەخ زانی بۆ خۆیان. پاڵپشتێکی دیکەی ئەوان، کە گریگۆری بێف بوو، لەو سەردەمەدا نەدەکرا هێندە بەسوود بێت، چونکە لە ئەنارشیستیترین و شپرزەترین قۆناغی ژیانیدا بوو. دۆستۆیفسکی خۆی شەیدایانە کاری دەکرد و تەنانەت هەندێک جار لە شەکەتیان بڕستی لێ دەبڕا. سەرکەوتن و حەز بۆ ململانێ هەمدیسان ئەویان دنە دەدایەوە. لە ساڵی ١٨٦٢دا بۆ یەکەمین جار لە سنوورەکانی ڕووسیا دەرچوو؛ ڕۆیشت بۆ ئینگلیزستان، فەڕەنسا و ئەڵمانیا و کاریگەرییەکانی ئەم سەفەرەی خۆرئاوای لە *ڕامانە زستانییەکان لە خەمە هاوینییەکان*دا باس کرد. ئەم بەرهەمە لە یەکەمین ژمارەکانی گۆڤاری *سەردەم* لە ساڵی ١٨٦٣دا چاپ کرا. دۆستۆیفسکی لە *ڕامانە زستانییەکان لە خەمە هاوینییەکان*دا لە خۆرئاوای دا و لە دیدگەیەکەوە بێخوایی شارستانیەتی بۆرژوازیی سەرکۆنە کرد، کە هاوکات، هەم لەگەڵ گێرتسێن و هەم لەگەڵ سلاڤییەکاندا کۆک بوو. لە ساڵی ١٨٦٣دا زۆر کتوپڕانە و وەک هەورەبرووسکەیەک لە ئاسمانی ساماڵدا، گۆڤاری *سەردەم* ڕاگیرا و هۆکارەکەشی گوتارێکی ستراخۆف بوو لەبارەی پرسی فینلەندییەکانەوە کە کەم تا زۆر دەستەی سانسۆر بە هەڵە تێی گەیشتبوون. زۆر زوو هەڵەتێگەیشتنەکە ڕەوێندرایەوە و دۆستۆیفسکی

مۆڵەتی پێ درا لە کانوونی دووەمی ١٨٦٤وە درێژە بە بڵاوکردنەوەی گۆڤاری *سەردەم* بدات، بەڵام بە ناونیشانێکی تازەوە (*دەوران*). بەس ئەو ڕاگرتنە زیانێکی دارایی فرەی پێ گەیاند کە تا هەشـــت ســـاڵی دیکەش هەر نەیتوانی قەرەبووی بکاتەوە. لەم کاتەدا، ئەو کەوتبووە تەنگژەیەکەوە کە گەلێک لە تەنگژە ئایینییەکەی سیبیریای گرنگتر بوو. ســـاڵانی ١٨٦٢–١٨٦٣ گرنگترین ڕووداوی عـاشـــقانەی ژیـانی، عاشقبوونی بە ئاپالیناریا سۆسلۆڤا ڕووی دا. دوای داخرانی *سەردەم*، دۆستۆیفسکی لەگەڵ ئەودا بەرەو دەرەوەی ڕووسیا گەشتی کرد و ئەم گەشـــتەش دۆڕانێکی زەوەندەی لە یاریی ڕۆلێتدا بەدواوە بوو. پاکیزە ســـۆســـلۆڤا (کە پاشـــان لەگەڵ ڕۆزانۆفی گەورەنووســـەردا زەماوەندی کرد)، هەتا بڵێیت دڵڕەق و بێبەزەیی بوو. هەر دەڵێیت ئەم ژنە بوو کە دیوە تاریکەکەی ژیانی بۆ دۆستۆیفسکی ئاشکرا کرد.

گۆڤاری *دەوران* لە ســەروەختی شــوومترین نیشـانەکانی مێژووی ڕووســـیادا کەوتەوە بڵاوکردنەوە. پلەداران نەیـانهێشـــت هەواڵی بڵاوکردنەوەی لە کاتی خۆیدا ڕابگەیەندرێت و خودی گۆڤارەکەش نەیتوانی پاڵپشتیی بەژداربووانی *سەردەم* بەدەست بهێنێت. دەستبەجێ پاش بڵاوبوونەوەی دەوران، هاوســـەرەکەی دۆســـتۆیفســـکی کۆچی دوایی کرد و ڕێک بەدوای ئەویشـــدا میخائیل دۆســـتۆیفســـکیش مرد. مردنی گریگۆری ییفیش لە پاییزی هەمان ســـاڵدا گورزێکی دیکەی لە پەیکەری ئەم بڵاوکراوە تازەپێگرتووە دا. دۆستۆیفسکی لەگەڵ خێزانی براکەیدا کە بەرپرسیاریەتیانی کەوتبووە سـەر شـان، بە تەنیا مایەوە. دوای پازدە مانگ و هەوڵوکۆشـــشـــی قارەمانانە و پڕ لە گوڕوتین، دواجـار ملی دا و دانی پێدا نـا کە نـاتوانێت *دەوران* ڕزگـار بکـات. بڵاوکراوەکە ڕاگیرا و دۆســـتۆیفســـکی مایەپووچ بوو. لەم ســـاڵە تۆقێنەرەدا (١٨٦٤) ئەو نـاوازەترین بەرهەمی خۆی (یـادداشـــتە ژێرزەمینییەکان)ی نووسی.

دۆستۆیڤسکی بۆ ئەوەی قەرزە زەوەندەکانی بداتەوە، دەستی کردە نووسینی ڕۆمانگەلی قەبارەگەورە و لە سالانی ١٨٦٥–١٨٦٦دا *تاوان و سزای* نووسی. مافی چاپی هەموو بەرهەمەکانیی لەبەرانبەر بڕەپارەیەکی گاڵتەجاڕانەدا (سێ هەزار ڕۆبڵ–پێنجەسەد دۆلار) بە ستیلۆفسکیی بلاوکەرەوە فرۆشت. لە گرێبەستەکەی نێوانیاندا هاتبوو کە وێڕای خاوەنداریەتیی هەموو بەرهەمە چاپکراوەکان، دۆستۆیڤسکی بەرئەرکە تا تشرینی دووەمی ساڵی ١٨٦٦ ڕۆمانە بڵاونەکراوەکەشی بداتە ستیلۆفسکی. بۆ ئەوەی بەڵێنەکەی بباتە سەر، دەستی کردە نووسینی *قومارچی* و بۆ ئەوەی لە کاتی خۆیدا تەواوی بکات، خێرانووسێکی بە ناوی *ئانا گریگۆریۆنا سنیتکینا* دامەزراند. لەسایەی یارمەتیی بەرچاوی ئەم خاتوونەوە، *قومارچی*، لە کاتی خۆیدا گەیشتە دەستی بڵاوکەرەوە. چەند مانگێک دواتر (شوباتی ١٨٦٧) دۆستۆیڤسکی لەگەڵ ئەم خێرانووسەدا زەماوەندی کرد.

ئانا گریگۆریۆنا ژنێکی ئێجگار چاک بوو و سەرئەنجام لەسایەی وەفاداری و لێهاتوویی ئەوەوە (هەروەها توانای زۆری لە کارکردندا) دۆستۆیڤسکی قەرزەکانی لە کۆڵ کردنەوە و دە ساڵی کۆتایی تەمەنی تا ڕادەیەک خۆشگوزەران ژیا، بەڵام ساڵانی سەرەتای ژیانی هاوبەشی ئەوان بەئازار بوو. دەمودەست دوای زەماوەندکردن، دۆستۆیڤسکی ناچار بوو ڕووسیا جێ بهێڵێت و چوار ساڵ لە دەرەوەی سنوورەکانیدا بەسەر بەرێت تا نەکەوێتە چنگی خاوەنقەرزەکانەوە. دۆخەکە کاتێک نالەبارتر بوو کە لە هاوینی ساڵی ١٨٦٧دا هەمدیسان دەستی بە قومار کردەوە. پلەبەپلە و بە کاری قورس و بێوەستان لەسەر ڕۆمانەکان و هەروەها بە یارمەتیی ئانا گریگۆریۆنا دووبارە توانیی لەسەر پێی خۆی بوەستێتەوە و لە ساڵی ١٨٧١دا بگەڕێتەوە بۆ ڕووسیا. ساڵانی نێوان ڕاگیرانی بڵاوکراوەی

سەردەم و گەڕانەوەی بۆ ڕووسیا دوای پێواربوونێکی[1] چوار ساڵەیی، لەڕووی کەم و باشییەوە، پڕبەرترین ساڵەکانی تەمەنی دۆستۆیفسکی بوون. *یادداشـــتە ژێرزەمینییەکان*، *تاوان و ســـزا*، *قومارچی*، *گەمژە* (١٨٦٩)، *هەمیشەمێرد* (١٨٧٠) و *شـەیتانەکان* (١٨٧١) هەمووی سـەر بەم قۆنـاغەن. تەنـانەت گەڵاڵەی *ژیـانی گەورەتـاوانبـاریش* کە تۆوی *برایانی کارامازۆفـی* تێدا شاردراوەتەوە، هەر سەر بەم قۆناغەیە.

کاتێک دۆســـتۆیفســـکی گەڕایەوە بۆ پیتەربورگ، هێشـــتا هەموو ئاسـتەنگەکان کۆتاییان نەهاتبوو، وەلێ بەرەبەرە ژیان بۆ ئەو باشـتر دەبوو. بڵاوبوونەوەی ڕۆمانی *شـــەیتانەکان* وەک کتێبێکی ســـەربەخۆ (بڵاوکردنەوەی لەســـەر ئەرکی خودی نووســـەر لە ســـاڵی ١٨٧٣) سـەرکەوتنی بەدەسـت هێنا. هەر لە هەمان سـاڵدا دۆسـتۆیفسـکی بووە سـەرنووسـەری حەفتەنامەی *هاوڵاتی* کە شـازادە مێێشـرسـکی بڵاوی دەکردەوە. ئەم هەل و پێگەیە داهـاتێکی جێگیری بۆ ئەو تێدا بوو. لە ســـاڵی ١٨٧٦دا خۆی *یادداشـــتەکانی نووســـەری* بڵاو کردەوە کە ســـوودێکی زۆری هەبوو. ئێســـتە ئیدی، بۆچوونە ســـیاســـییەکانی دۆســـتۆیفســـکی زیاتر لەگەڵ ڕۆحی ســـەردەمەکەدا کۆک بوون و کاریگەرییان ڕووی لە زیادبوون کرد. شـــەپۆلێک لە هاوســـۆزی و تێگەیشــتن ئەوی گرتبووە خۆی. خۆشـــەویســـتبوونی لە ســـاڵی پێش مەرگیـدا، یـانی ئەو کـاتـانەی کە *برایـانی کـارامـازۆف* بڵاو بووەوە، گەیشتبووە ترۆپکی خۆی. ئەم خۆشەویستبوونە لە کاتێکدا بوو کە لە مۆسکۆ و لەسەر مەزاری پووشکین، لە بەرواری هەشتی حوزەیرانی ســـاڵی ١٨٨٠دا گوتارە بەناوبانگەکەی خۆی خوێندەوە. ئەم گوتارە وەها جۆشوخرۆشێکی هێنایە ئارا کە لە مێژووی ئەدەبیاتی ڕووسیدا وێنەی نییە. وەلێ بۆ زستانی داهاتوو، بە سەختی نەخۆش کەوت و لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٨٨١دا کۆچی دوایی کرد.

---

١. پێوار: غایب

دۆســــتۆیڤســــکی هەم لە دیوە مێژووییەکەوە و هەم لە دیوە دەروونناســــییەکەوە کەســــایەتییەکی ئاڵۆزە و پێویســــتە نەک تەنیا جیاوازی لەنێوان ســــەردەمە جیاوازەکانی ژیان و هێڵە جۆراوجۆرە فکرییەکانی، بەڵکە دەبێت جیاوازی لەنێوان ئاســــتە جۆراوجۆرەکانی کەسایەتیشیدا بکەین. بالاترین یان ڕاستتر بڵێین، قووڵترین ئاستەکان تەنیا لە بەرهەمەکانی حەڤدە ساڵی کۆتایی تەمەنیدا ئامادەگیان هەیە کە بە *یادداشتە ژێرزەمینییەکان* دەست پێدەکەن. ئاستگەلی نزمتر یان ڕووکەشیتر لە ســەرانســەری بەرهەمەکانیدا بەدی دەکرێن، بەڵام لەو گوتــارانەدا کە بۆ گۆڤــار نووســــیونی و هەروەهــا لە بەرهەمە ئەدەبییەکانی بەر لە ساڵی ١٨٦٤دا دیارترن. دۆستۆیڤسکیی قووڵفکر یەکێکە لە گرنگترین و شــوومترین ڕووخســارەکانی ســەرانســەری مێژووی فکری مرۆڤــایەتی؛ یەکێــک لە بوێرترین و وێرانکەرترین دیــاردەکــانی کــایەی دۆزینەوە پێشــــکەوتووە دەروونییەکــان. وەلێ دۆستۆیڤسکیی ڕووکەشبین کوڕی سەردەمی خۆی بوو و دەکرێت لەگەڵ ڕۆمــاننوســــانی دیکە و ڕۆژنــامەنووســــانی ســــەردەمی ئالێکســاندەری دووەمدا بەراوردی بکەیت و ئەم بەراوردەش دایمە لە بەرژەوەندیی ئەودا نییە. لەنێوان ئەم نووســــەرانەدا، فکر و بۆچوونە ســــەرەتاییەکانی ئەو ڕکابەری زۆریان هەیە. بە هیچ شــــێوەیەک ناتواندرێت ئەم دۆستۆیڤسکییە بخرێتە سەرووی گێرتسین، گریگۆری یێف یان لیۆنتی یێفەوە. دۆستۆیڤسکییە قووڵفکرەکەی دیکە، لە ڕووی قووڵی، ئاڵۆزی و گرنگیی ئەزموونە دەروونییەکانەوە لە سەرانسەری ئەدەبیاتی ڕووســــیادا تەنیا دوو ڕکابەری هەیە، ڕۆزانۆف و بە دڵنیاییەوە تۆلســــتۆی کە پێدەچێت هەر بۆ ئەوە هاتبێتە دونیا تا ڕکابەری دۆستۆیڤسکی بێت.

پێکبەراوردکردنی تۆلســتۆی و دۆســتۆیڤســکی ساڵەهای ســاڵ بۆ ڕەخنەگرانی ڕووســــی و ناڕووســــی بووە بابەتێکی جێســــەرنجی

باسەکانیان. زۆر لەبارەی ئەرستۆکراتی، ماددیگەرایی (ماتریالیزم) و غرووری شەیتانی دانەیەکان و، بازاڕیبوون و ملکەچی و ڕازیبوونێکی مەسیحیانە و مەعنەویی ئەوی دیکەیانەوە دواون. ئایا گوتنی ئەمە خالێکی گرنگە کە لە سەرەتی سالانی ١٩٠٠ (سەدەی بیست)ـەوە ئەم بەراوردە هەمیشە لە بەرژەوەندیی دۆستۆیفسکیدا بووە؟ هۆکارەکەشی ئەوە بوو کە بزووتنە مۆدێرنەکانی ڕووسیا، لەبەرانبەر تۆلستۆیدا بە ڕۆحی دۆستۆیفسکییاندا هەڵدەدا و پشتگیرییان دەکرد. بە چاوپۆشین لە پێگەی کۆمەلایەتی و ئاستی خوێندەواری، جیاوازیی بنەڕەتیی نێوان ئەم دووانە ئەوە بوو کە تۆلستۆی تەرکەدونیا بوو و دۆستۆیفسکی هێماخواز. بەو واتایەی کە بۆ دۆستۆیفسکی هەموو بەها ڕێژەییەکان پەیوەندیدارن بە بەها ڕەهاکانەوە و پەیوەستە بەوەی کە چۆن ئەم بەها ڕەهایانە بنوێنرێنەوە، ئیدی ئەرێنی یان نەرێنی لێک بدرێنەوە، بەلام بە لای تۆلستۆیەوە ڕێژەیی و ڕەهاییبوون دوو جیهانی جیاوازن و ڕێژەیی لە خۆیدا بە خراپە دێتە ئەژمار. ئەوەی کە تۆلستۆی فرەچەشنیی مێژووی بێکەڵکی مرۆیی بە پووچ دەزانێت و، هەروەها، فکری بە سرووشت مێژوویی دۆستۆیفسکی کە ئەو بە پایەبەرزترین نوێنەرانی فکری ڕووسییەوە گرێ دەدات (بە کەسانی وەک چائادایێف، سلاڤییەکان، گێرتسێن، گریگۆری یێف، لیۆتنی یێف و سالایۆف)، لێرەوە سەرچاوە دەگرێت. دۆستۆیفسکی یەکێکە لەو بیرمەندانەی کە هەمیشە ئەندێشەیەکی مێژوویی هەیە. تەنانەت لەو پرسانەشدا کە بە پووختترین شێوەی ڕۆحانی دەیانخاتە بەرباس، هەر سەروکارییان لەگەڵ یاسایەکی نەمر و جێگیر و نەگۆڕدا نییە، بەڵکە لە درامێک دەدوێن کە هێزە بەرزترەکانی جیهان لە دەقی مێژووی مرۆڤایەتیدا ڕۆلی تێدا دەگێڕن. هەموو ڕاستییە مێژوویی و کولتوورییەکان بۆ دۆستۆیفسکی ڕوون بوونەتەوە و بەهایەکی ڕوونی، ئەرێنی یان نەرێنییان هەیە. پەیدۆزی، ئالۆزی و چەندڕەهەندبوونی فکری ئەو لە پێگەی بەراوردکردنی بە هزری

وشک، ئەندازیاری و ڕێکوڕاستی تۆلستۆی، ڕەگەکەی لەم بابەتەدایە. تۆلستۆی (سەرەڕای هەستیاریی لەئاست لاوەکیترین وردەکارییەکانی ژیان) لە فەلسەفە ئاکارییەکەیدا، جا لە ئاستە بەرزتر (وەک *دانپێدانان*) و ئاستە ئێجگار نزمترەکەشیدا، واتە لە لایەنی وەک خۆگرتنەوە لە خواردنەوە و ڕاگەیاندنی گیاخۆرییەکەیدا، دەڵێی ئیقلیدسی[1] پێوەرە ئاکارییەکانە. دۆستۆیڤسکی سەروکاریی لەگەڵ پێوەرە فریودەرە ئاکارییە پەیدۆز و شلەکاندا هەیە. هەر لەبەر ئەمەیە کە ستراخۆف، ئاوها بە خۆشحاڵی، پوختەیی دەداتە پاڵ تۆلستۆی و دەکرێت بڵێین تێکەڵی و ناپووختی دەداتە پاڵ دۆستۆیڤسکی. دۆستۆیڤسکی هەرگیز هەقی بەسەر لایەنە جێگرەکانەوە نەبوو، ئەو سەرقاڵی ڕەوتە پەیدۆز و شلەکان بوو کە بە زۆری وەک ڕەوتی لەناوچوون و داڕزان دەهاتنە بەرچاو.

لەڕووی دۆخی کۆمەڵایەتی-مێژووییەوە، گرنگە سەرنج بدەین کە لەو سەردەمەدا، هەر بەو جۆرەی کە تۆلستۆی سەر بە خانەدانان و (ئەو تایبەتمەندییەی کە لەنێو ئەدیبە هاوسەردەمەکانیدا ئەوی جیا دەکردەوە) لەڕووی فەرهەنگییەوە هاوئاستی شارستانییەتی فەڕەنسا و شارستانییەتی سەدەی هەژدەیەمی خانەدانانی ڕووسیا بوو، دۆستۆیڤسکیش هەڵقوڵاو لە هەناوی خەڵک و هەتا سەر مۆخی ئێسقان دیموکرات بوو. ئەو سەر بەو تانوپۆیە مێژووییە بوو کە بلینسکی، نیکراسۆف و گریگۆرییێفی پەروەردە کردبوو. ئەمەش دەبێتە هۆی لەناوچوونی هەرجۆرە ناسکی و نەرمییەک لە دیوی دەرەوە و ناوەوەی بەرهەمەکانیدا کە لەگەڵ درێژدادڕی، ناهەماهەنگی

---

١. Euclid: ئیقلیدس، ئیقلید، یاخود یوکلید، لە دایکبووی ساڵی ٣٠٠ی پ.ز. یەکێک بووە لە بیرکاریزانە مەزنەکانی یۆنان و بە باوکی ئەندازە ناسراوە. کتێبەکەی کە هەڵگری ناونیشانی توخمەکانە، یەکێکە لەو کتێبانەی کە زۆرترین کاریگەرییان لەسەر مێژووی زانستی بیرکاری داناوە. «و. ک»

و کەموکوڕیی زیادلەڕادە و زیانگەیێن، بووەتە بەشێک لە تایبەتمەندیی بەرهەمەکانی ئەو. دواهەمین ڕۆمانە گەورەکانی دۆستۆیفسکی، ڕۆمانگەلێکی ئایدۆلوژن. ئایدیای ڕۆمانەکان لە مانا ئەدەبییەکانیان جیا نییە و هەروەها ناتواندرێت ئایدیاکە لەو چیرۆکە جیا بکرێتەوە کە دەگێڕدرێتەوە؛ هەر بەو جۆرەی کە ناتواندرێت گێڕانەوە لە ئایدیا جیا بکرێتەوە، بەڵام ئەم بابەتە لەبارەی ڕۆمانەکانی سەردەمی ناوەڕاستی چالاکییە ئەدەبییەکانی ئەوەوە (١٨٥٧-١٨٦٩) ڕاست نییە، چونکە ڕۆمانگەلێکن زیاتر بە بەرهەمە سەرەتاییەکانی ئەوەوە (١٨٤٥-١٨٤٩) پەیوەستن نەک ئەوەی مۆژدەدەری ئەو شتە بن کە لەدوای خۆیانەوە دێت. هێشتا چاڵە قووڵەکانی ئاگایی ئەو لەم بەرهەمانەدا دیار نین، بەڵام ئەم بەرهەمانە چەند جیاوازییەکیشیان لەگەڵ بەرهەمەکانی سالانی ٤٠یدا هەیە؛ بۆ نموونە تێیاندا کاریگەریی گۆگۆل و ئەو شێوازە شپرزەیەی کە لە *ڕەشوڕووت* و *هاوزا*دا بەکار براوە، بەرچاو ناکەوێت. گرنگترین بەرهەمەکانی ئەم سەردەمە بریتین لە *بێگانە* (١٨٥٩)، *سووک و ڕسواکراوەکان* (١٨٦١) و *یادگارییەکانی یانەی مردووان* (١٨٦١-١٨٦٢). ڕۆمانی *سووک و ڕسواکراوەکان* لە ڕووی شێواز (ستایل) و ئاهەنگ (لحن)ـەوە ئێجگار لە ڕۆمانە کۆمەڵایەتییە هاوسۆز و ڕۆمانتیکە فەڕەنسیی و هەروەها بەرهەمەکانی کۆتایی دیکنزەوە (کە تەنزێکی کەمتریان تێدایە) نزیکە. ڕێبازی خەمگینی و هاوسۆزی کە زیاتر بە هەستی میلۆدرامی سنووردار دەبێت، لەم بەرهەمەدا بە ناوازەترین شێوە دەربڕدراوە و هێشتا پرسگەلی سەردەمی کۆتایی چالاکییە ئەدەبییەکانی دۆستۆیفسکی ئاڵۆزیان نەکردووە. ناوەڕۆکی *سووک و ڕسواکراوەکان* تەماوی و میلۆدرامە و تێیدا کەمکەم نالەباری و تاریکی و گرژیی *تاوان و سزا* و کەمژە بەرچاو دەکەوێت، بەڵام هیچ ئاسەوارێکی لە پەرۆشیی پڕ لە گوڕوتینی ڕۆشنبیرانەی ڕۆمانەکانی کۆتایی دۆستۆیفسکیی تێدا نییە.

لە *بێگانە*دا نە پەرۆشیی ڕۆشنبیرانە هەیە و نە ئەو دەوڵەمەندییەی بەرهەمەکانی دواتری دۆستۆیڤسکیش، بەڵام لە لایەنەکانی دیکەوە یەکێکە لە باشترین بەرهەمەکانی ئەو. هەموو بەرهەمەکانی زیاتر لە شێوەی شانۆنامەدا نووسراون تا گێڕانەوە، بەم پێیە بە ئاسانی و بێ دەسکارییەکی تایبەت دەتواندرێت بکرێنە شانۆنامە، بەڵام *بێگانە* لە هەموویان دراماتیکترە. هەر لە بنەڕەتەوە دەڵێیت لە شێوەی شانۆنامەدا گەڵاڵەڕێژیی بۆ کراوە، بەس بێ گومان بۆ شانۆ گەلێک دوورودرێژە. ئەوەش کە چۆن دڵڕەقیی دۆستۆیڤسکی (بە دەربڕینی میخائیلۆفسکی) لە دێڕەکانی ئەم ڕۆمانەدا بە تەواوی دەردەکەوێت، گەلێک شیاوی سەرنجلێدانە.

بابەتی *بێگانە* ئەمەیە کە سەربارێکی مەراییکار بە ناوی *فۆما ئۆپیسکین*ەوە، چۆن سەرهەنگ ڕۆستانێفی خانەخوێی خۆی بە شێوەیەکی بەرگەنەگیراو دەکاتە گاڵتەجاڕ و ئازار بە ڕۆح و ڕەوانی دەگەیەنێت. ئەو خاکەڕایی و سادەییە دەبەنگانەیەی کە سەرهەنگ دەینوێنێت، دەستی ئەو بۆ خۆسەپاندن بەسەر ئەو و کەسانی چواردەوریدا (بە هاوڕێ و خزمەتکارەکانیشییەوە) واڵا دەکات. لێهاتووییە لادەرانەکانی ئۆپیسکین کە هەتا بێت زیاتر و زیاتر درۆ دەکات و، هەروەها لێهاتووییە تازەکەشی لە سووکایەتیکردن بە قوربانییەکەی، هەرهەمووی ئازارێکی زۆر و نزیکەی هاوئاستی ئازارێکی فیزیکی بۆ خوێنەر دەهێنێتە ئارا. فۆما ئۆپیسکین کە ڕووخسارێکی تەلیساوییە و دەرخەری ئەوپەڕی خراپەکارییەکی نەگریسانە و بێئامانج و نابەرپرسیارانە و هاوکات خاڵی لە هەر چێژێک کە بە تایبەتمەندییەکانی گرۆتێسک (پێکەنین-گریان) گەڵاڵەڕێژی کراوە؛ کەسایەتییەکە لەگەڵ *پۆرفێری گالاولیێف سالتیکۆف-شیدرین و پیریدانۆف سالاگۆب*دا سێکۆچکەیەک پێک دەهێنن کە لە ئەدەبیاتی ئەورووپادا وێنەی نییە. *بێگانە*، وەک

چیرۆکێکی گەمەئـامێز بە ڕەنگوبۆیەکی داشـــۆرین (هەجوو)ەوە گەڵاڵەڕێژی کراوە (داشـــۆرینێک کە نووکی تیژی ڕمەکەی وا دیارە ڕووی لە گۆگۆڵە، هەر بەو جۆرەی کە لە *نامە بۆ هاوڕێیان*دا ئەمە ئاشـــکرا دەکات)، بەڵام دەبێت بیرمان بێت کە ئەگەرچی بە دڵنیاییەوە تێیدا تەنز ئـامـادەیی هەیە، بەس تەنزێکە تەنیا کەســـــانێکی تـایبەت دەهێنێتە پێکەنین.

ئەو *دڵڕەقی*یەی دۆسـتۆیڤسـکی لە شـێوازێکی جوان و وردتریدا، لە ڕۆمانێکی تایبەتتری ئەم ســــەردەمەدا، یانی لە *نووکتەی بێتام* (یان *ڕووداوێکی گاڵتەجاڕانە*) (١٨٦٢)دا ئامادەگیی هەیە. دۆستۆیڤسکی لەم بەرهەمەدا بە وردەکارییەکەوە کە *هاوزا*مـان بیر دەهێنێتەوە، وێنـای ئازار و ئەشـکەنجەی فەرمانبەرێکی پلەبەرز دەکات کە خاوەنی پێگەی خۆیەتی و ئێسـتاکە تاکێکی سـووکبووە: ئەو بێ ئەوەی بانگهێشـت کرابێت دەچێت بۆ ئاهەنگی هاوسەرگیریی یەکێک لە فەرمانبەرانی ژێر دەســتی خۆی، لەوێ بە شـــێوەیەکی گـاڵتەجـاڕانە و دەبەنگـانە هەڵســـوکەوت دەکـات، زۆر دەخواتەوە و ســـەرخۆش دەبێـت و خەرجییەکی زەوەندە دەهێنێتە سەر فەرمانبەرە داماوەکەی خۆی.

*یادگارییەکانی یانەی مردووان* (١٨٦١–١٨٦٢) کە تا دۆسـتۆیڤسـکی لە ژیاندا بوو بەناوبانگترین بەرهەمی ئەو بوو، لەنێو ڕۆمانەکانی ئەم ســـەردەمەیدا شـــازە. چیرۆکی ئەم بەرهەمە، لەبارەی بێگارەکاری سـیبیریاوەیە و لە زمای سـزادراوێکەوە دەگێڕدرێتەوە کە ســـەر بە چینی خوێنـدەوارە. *یـادگـارییەکـانی یـانەی مردووان*، پشـــتی بە دەستمایەی ژیاننامە ئەستوورە. وەک هەموو ئەو بەرهەمانەی دیکەی دۆســتۆیڤســکی کە پێش ســاڵی ١٨٦٤ نووســراون، ئەم بەرهەمەش هێشـــتا پەیوەســـتە بە ســـەردەمی تاراوگەوە، بەڵام ئەنجامی کۆتایی کتێبەکە هاوخەمییەکی گەشـــبینانەیە بۆ مرۆڤ. تەنانەت بە جۆرێک وێنەی داڕووخانی ئاکاریی تاوانبارە پیســـەکانیش نەکێشـــراوە کە

خوێنەر بڕوای بە مرۆڤ نەمێنێت. ئەم بەرهەمە بەر لە هەر شتێک ناڕەزایەتییەکە لەدژی سزا و ئەشکەنجە دڕندانەکان. سەرەڕای بەش و وردەکاریی سووکایەتیئامێز، چەپەڵ و تۆقێنەری خراپەکاری و شەرەنگێزی، *یادگارییەکانی یانەی مردووان* دواجار بەرهەمێکی ڕۆشن و سادە، گەڕانە بەدوای لایەنی بەرزدا کە بە تەواوی لەگەڵ ئایدیالیزمی گەشبینانەی کۆمەڵایەتیدا دێتەوە. هەوێنی سەرەکیی کتێبەکە، تراژیدیایەکی نامۆیە کە لەنێوان سزادراوانی خوێندەوار و خەڵکانی ئاساییدا بوونی هەیە، تەنانەت ئەو کاتەش کە سزای گیرەرەوە دەگاتە کۆتایی، ئەو خۆی بە ڕەدکراوەی نێو ڕەدکراوەکان دێتە بەرچاو. ئەو کە لە هەر جۆرە مافێکی ڕووالەتیی کۆمەڵایەتی بێبەش بوو و بووبووە هاوئاستی چەندسەد مرۆڤێکی سادەی ڕووسی، دەرکی پێ دەکات کە ئەوانیش (خەڵکانی ئاسایی)، ئەو ڕەد دەکەنەوە و بۆ هەمیشە لەلایەن ئەوانەوە بێزراوە؛ هۆکارەکەشی تەنیا ئەوەیە کە سەر بە چینی خوێندەواری دوور لە داخوازییەکانی خەڵکە. ئەم جۆرە تێفکرینە، *یادگارییەکانی یانەی مردووان* بە بابەتە ڕۆژنامەگەرییەکانی دۆستۆیڤسکییەوە گرێ دەداتەوە.

چالاکییە ڕۆژنامەنووسییەکانی دۆستۆیڤسکی بەسەر دوو قۆناغدا پۆلێن دەکرێن: گوتارەکان (١٨٦١–١٨٦٥) کە بۆ بڵاوکراوەی *سەردەم* و *دەوران* نووسراون و *یادداشتەکانی نووسەر* (١٨٧٣–١٨٨١). فەلسەفەی سیاسیی ئەو بە گشتی دەکرێت بە شێوەی سلاڤیزمی دیموکرات یان نەتەوەگەرایی کۆدڕێژانە ڕوون بکرێتەوە. لەم مەرامەدا، خاڵگەلی هاوبەشی لەگەڵ گریگۆری یێف و سلاڤییەکان و، هەروەها لەگەڵ گێرتسێن و نەتەوەپەرستاندا هەیە. زیاتر ئایدیاکەی ئەوەیە کە کۆمەڵگەی خوێندەواری ڕووسیا ڕزگاری دەبێت ئەگەر هەمدیسان لە خەڵک و نیشانەکانی ئایدیالی مەزهەبی، یانی مەسیحییەتی ئەرسەدۆکس نزیک ببێتەوە. دەکرێت بڵێین لە بەرهەمە

ڕۆژنامەگەرییەکانی ساڵانی شەستدا، تووخمگەلی دیموکراتی و نەتەوەپەرستانە زاڵن، لە هەمان کاتدا، وەک ساڵانی حەفتا لەژێر کاریگەریی زیدەی سۆسیالیزمی شۆڕشگێڕانەدان و تێیاندا حەزی زاڵبوون بەسەر تووخمگەلی ناسیۆنالیستی و کۆنەپارێزی بەدی دەکرێت، بەڵام بەرهەمی ڕۆژنامەنووسیی دۆستۆیفسکی، لە ناوەڕۆکدا هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی گۆڕانکاریی بەسەردا نایێت و بە یەکپارچەیی دەمێنێتەوە. ڕێبازی ئەو ئەرسەدۆکسە، هۆکارەکەشی ئەوەیە کە خەڵکی ڕووسیا بڕوای بەم ڕێبازە هەیە. پەیامی ئەم ڕێبازەش، ڕزگارکردنی جیهانە لەڕێی ڕێنماییەکانی مەسیحییەتەوە. مەسیحییەت لە ڕێبازەکەی ئەودا هێندەی هێمای بەخشش و هاوسۆزییە، ئەوەندە ڕەمزی ڕزگاری و پاکی نییە. ئەمە هەمووی بە ڕوونی بە ئایدیاکانی گریگۆر یێف و ڕێنماییەکانییەوە لەبارەی جوانییەوە گرێ دراون'و بەتایبەتیش، لەگەڵ ئەم پرسەدا کە دەبێت ڕووسیا بە جیهان بناسێندرێت. ئەتایست (بێباوەڕ)ـە توندڕەوەکان، سۆسیالیستەکان و هەموو هێزە بێخواکانی شارستانیەتی ئەتایستی خۆرئاوا، بە دژمنانی دۆستۆیفسکی دێنە ئەژمار. سەرکەوتنی ڕووسیای مەسیحی بەسەر بێخوایی خۆرئاوادا، بڕوای سیاسی و مێژوویی ئەو بوو. گرتنی قوستەنتینیە (ئەستەنبوولی ئێستە)، وەک هێمایەک کە پشتیوانیی لە جیهانیبوونی ئەرکی ڕووسیا دەکرد، لە ڕێبازی نووسەرەکەی ئێمەدا بە خاڵێکی گرنگ دێتە ئەژمار.

*گوتاری پووشکینی* دۆستۆیفسکی، لەبەر حەزی تایبەتی و بەهێزی چەپگەرایانە، بە بەناوبانگترین و گرنگترین چالاکیی ڕۆژنامەنووسیی ئەو دادەنرێت. لەم گوتارەدا، دۆستۆیفسکی لەبەر مرۆڤانەبوون ستایشی پووشکین دەکات و ئەم تایبەتمەندییە بە بەخششی دەرک و پەسەندکردنی هەموو نەتەوە و شارستانیەتەکان دەزانێت. مرۆڤانەبوون، هەمان تایبەتمەندیی گرنگی نەتەوەی ڕووسیایە و

یەکیەتیی مرۆڤایەتیش هەمان پەیام و ئامانجی جیهانیی ڕووسیایە. ئەم گوتارە، پێشبینییەکی سەیر بوو لەبارەی نێونەتەوەیی سێیەم و بە پێچەوانەی ئەوەوەی کە پێشتر نووسیبووی، ئاوارەکانی ڕووسیا (کە دۆستۆیفسکی بەردەوام لە قسەکانیدا ناوی دەبردن)، یانی هەمان شۆڕشگێڕ و پێشەنگەکانیان، ستایشی ئەم گوتارەیان کرد. دۆستۆیفسکی لەواندا کەڵکەڵەی ئایینیی ڕاستەقینەی دۆزییەوە کە ئەوەندە هەبوو بەپێی ڕابردنی کات و بە وەسوەسەی سۆسیالیزمی ئاتیستی تاریک و ڕەش بووبوو. ئەو لەگەڵ دەربڕینی بۆچوون لەبارەی کۆچەرەکانەوە، قسەگەلێکی هاوشێوەی ئانارشیستیی کۆدرپێژانەی کردن و بانگی نائاکاریبوونی زۆرەملێ و سزای دا و، بەم پێیە، لەبارەی نەبوونی بەرگری لەبەرانبەر شەڕدا، بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو پێش ڕێنمایی و بۆچوونی تۆلستۆی کەوتەوە. *گوتاری پووشکین* بۆ ئاشتبوونەوەی توندڕەوەکان لەگەڵ دۆستۆیفسکیدا گەلێک کاریگەر بوو.

یەکێک لە سەرنجڕاکێشترین تایبەتمەندییەکانی دۆستۆیفسکیی ڕۆژنامەنووس ئەلەم گوتارەدا بەدی دەکرێت و ئەویش توانای نائاسایی ئەوە لە حاڵلێهاتن و خرۆشاندا کە بەشێکی زۆری ئەم هەستەش ڕووی لە پووشکینە. ئەو بە تامەزرۆیی و جۆشێکی بێوێنەی لەم جۆرەوە، لەبارەی ڕاسینیشەوە دەدوێت. لە مێژووشدا وێنەی ئەم جۆرە نرخاندنە نەجیبانەی ئەدەبیاتە ڕابردوویی و دژەسیاسییەش (کە دۆستۆیفسکی لە گوتاری بەخاکسپاردنی نیکراسۆفدا بەجێی هێنا) فرە بە دەگمەن بەرچاو دەکەوێت.

شێوازی ڕۆژنامەنووسیی دۆستۆیفسکی بە دڵنیاییەوە ئێجگار تایبەتە و لەم بارەیەوە ناکرێت هاوەڵ و نزیکی بۆ بدۆزرێتەوە، بەڵام ئەویش وەک هەموو ڕۆژنامەنووسانی ئەو سەردەمە، لێڵ و بەبێ فۆرم قسە دەکات. ئاهەنگی توندوتیژ، تووڕە و دەنگی لەرزۆکی

دۆستۆیڤسکی لە ڕۆمانەکانیدا، ئەو کاتەی کە پێویست دەکات لەبارەی خۆیەوە بدوێت، بە خەوشـــەکانی ئەو دادەنرێن وەک نووســـەرێک. گوتوبێژ و خۆدوێنی لە ڕۆمانەکانی دۆستۆیڤسکیدا، لەو بەرهەمانەدا کە لەسەر زاری یەکێک لە کەسایەتییەکانەوە نووسراون، ڕێک وەک ئافرێنەرەکەیان، هەڵچوو و تووڕە و بێئۆقرانەن (تەنانەت هەندێک کات دەگەنە سنووری شێتبوون). ئەوان گشتیان دەڵێیت بە زریانێک لە هەناسەساردی و ژاکاویی تامەزرۆیی ڕۆحی و شپرزەیی، پەرێشان بوونە، زریانێک کە لە قووڵایی نائاگایی دۆستۆیڤسکییەوە هەڵدەستێت. وێڕای لێکچوونی بنەچەیی هەموو کەســـــایەتییەکـانی، کەچی ئەو گوتوبێژ و خۆدوێنیانەی کە بۆی نووســـیون لە ڕووی هونەری پەرجووئاســـــای تایبەت و بەتایبەتمەندکردنەوە، هاوشـــانی نییە. لە دونیای بچووک و تەنگی پاڵەوانەکانی دۆســـتۆیڤســـکیدا، تاکایەتی بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنی فرەجۆرە.

دۆستۆیڤسکی لەو ڕۆمانانەیدا کە پاش سەردەمی دوورخرانەوەی نووسیونی (لە *یادداشتە ژێرزەمینییەکان*ەوە هەتا *برایانی کارامازۆف*) ئاستەمە بتواندرێت ئایدۆلۆژیا تێیاندا لە-چەمکی ئەدەبی جیا بکرێتەوە. ئەم دووانە، بە شێوەیەکی نەپچڕاو ئاوێتەی یەکدین. پێشتر گوتمان کە ئەمانە ڕۆمانگەلێکی *ئایدیادارن* و کەســـــایەتییەکانی نێو ئەم ڕۆمانانە ســــەرەڕای زیندووبوون و ڕیزپەڕییان، هیچ شـــتێک نین بێ لە گەردگەلێک کە بە ئایدیا پڕوزە کراونەتەوە. کەســـێک لەبارەی دۆســتۆیڤسـکییەوە گوتوویەتی کە ئەو هەستی بە *ئایدیا* دەکرد، وەک چۆن ئەوانی دی هەست بە سەرما و گەرما و ئازار دەکەن. هەر ئەم بابەتەشــــە وا دەکات کە ئەو لەنێو هونەرمەندەکانی دیکەدا شـــــاز دەربکەوێت. تەنیا لەلای چەند بیرمەندێکی گەورەی وەک *پاول*، *ئاگوســـتین*، *باســـکل* و نیچە دەکرێت توانای *هەســـتکردن بە ئایدیا* بدۆزینەوە.

دۆستۆیڤسکی بە ڕێدۆزێکی[1] دەروونناسی ڕۆمان دەنووسێت و و سەرەکیترین شێوازی دەربڕینی ئەو شرۆڤە و شیکردنەوەیە. لەم ڕووەوە، دەتوانین ئەو بە هاوزا و ئاوێنەی تۆلستۆی بزانین، بەڵام هەم کەرەستە و هەم ڕەوشی شرۆڤەکردنی ئەو لەگەڵ هی تۆلستۆیدا جیاوازە. تۆلستۆی ڕۆح بەسەر بەشە زیندووەکانیدا دابەش دەکات و لە بنەڕەتی فیسیۆلۆژیکی فکر، کردەوەکانی نائاگایی ویستی مرۆیی و ئەتۆمە کاراکانی کەسی دەکۆڵێتەوە. کاتێک دەگاتە بەرزترین ئاستی ئەزموونە دەروونییەکان، ئیدی وا دەردەکەوێت ئەم ئەزموونانە لە دەرەوەی سنوورەکانی ژیاندان، هیچ سنوور و ئاستێکیان نییە و بە تەواوی لەگەڵ ئەزموونەکانی تاکێکی ئاساییدا بەرانبەرن، بەڵام دۆستۆیڤسکی، بە پێچەوانەوە، تەنیا لەو زەمینە دەروونناسیانەدا کار دەکات کە تێفکرین و ویست تێیاندا پەیوەندییەکی بەردەوامیان لەگەڵ شوناسی بەرزی ڕۆحیدا هەیە و ڕەوتی ئاسایی ئەزموون بەردەوام لەژێر کاریگەریی بەها ڕەهاکاندایە و هەرگیز پەرێشانییە دەروونییەکان کپ نابنەوە. بەراوردکردنی ئەم بابەتەی کە چۆن تۆلستۆی و دۆستۆیڤسکی هەردووکیان یەک هەست ئەزموون دەکەن کە هەستی دەستەوەسانی ئازاردەرە، بە شتێکی سەرنجڕاکێش دێتە بەرچاو. ئەوان هەردووکیان ئازار دەکێشن، بەڵام بە لای تۆلستۆیەوە ئەم هەستە بە تەواوی کۆمەڵایەتییە، ئاگایی لەبارەی کاریگەریی زیانبەخش کە ڕووالەتی مرۆڤ و هەڵسوکەوتی دەیخەنە سەر خەڵکانێک، تاکوو کەسەکە بە شێوەیەکی باش نیشان بدەن. هەر لەبەر ئەوەشە کاتێک لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە گەیشتە سەربەخۆییەک و هیوا و ئاواتە کۆمەڵایەتییەکانی هاتنە دی، ئیدی ئەم بابەتە هێندە بیری ئەوی قاڵ نەدەکرد. دۆستۆیڤسکیش بەدەست دەستەوەسانییەوە ئازار دەچێژێت. ئەم ئازارە، بەهای ڕەها و کۆتایی مرۆڤێکە کە مرۆڤەکانی

---

١. ڕێدۆز: ڕێچار؛ قۆناغی سەرەتایی گەیشتن بە ئامانج.

دیکە بریندارییان کردووە، تێی نەگەیشـــتوون و ســـووکایەتییان پێ کردووە. لەبەر ئەم هۆکاری دڵڕەقییە دۆستۆیفسکی لە شەنوکەوکردنی دەروونی برینـدار و زویری مرۆییـدا، وا بەتـایبەت بە قەبـارەیەکی بەرفراوانی چـالاکییەوە دەردەکەوێت. بە بڕوای تۆڵســـتۆی، ئـازارە خۆئاگاییەکان دەبێت تایبەتمەندییەکی کۆمەڵایەتییان هەبێت، گەر نا، هێزی کارایییان لەدەســت دەدەن، بەڵام بە بۆچوونی دۆســتۆیفســکی، ئاگایی، ئایینی و میتافیزیکییە و هیچ کاتێک لەنێو ناچێت. لێرانەدایە کە هەمدیســـــان پرســـــی داوەریکردن لەبارەی *پوختەیی* تۆڵســـــتۆی و *ناپوختەیی* دۆســـتۆیفســـی دەخرێتەوە بەرباس. تۆڵســـتۆی دەتوانێت بەســـەر هەموو کاڵییەکانی خۆیدا ســـەر بکەوێت و هەروەک مرۆڤێکی ڕووت لەبەرانبەر ئەبەدیەتدا دەربکەوێت، بەڵام ڕۆحی دۆســتۆیفسـکی خۆی بە شـــێوەیەکی دانەبڕاو لە تۆڕە نەکراوە و ســـیمبولییەکانی واقعیەتی ڕێژەییدا گیر دەخوات. هۆکاری ئەوەی کە تۆڵســـتۆی دواتر وردەکارییە زیادەکانی ڕیالیزمی (کە کاریگەرییەکی بەســـەر پرســـە ســـەرەکییەکانەوە نەبوو) مەحکوم کردن و دۆســتۆیفسـکیش هەرگیز نەیتوانی لە سنووری پرسە کاتی و نارەهاکان تێپەڕێت، هەر ئەمەیە.

شـێوازی شـیکاریی دۆسـتۆیفسـکی لەگەڵ هی تۆڵستۆیدا جیاوازە. ئەو نـاگرێ بە وردەکـارییەوە، بەڵکە هەمـدیســـــان دەئـافرێنێتەوە. تۆڵسـتۆی هەمیشــە دەپرســێت بۆچی؟ بەڵام دۆسـتۆیفسـکی پرسـیار دەکات: چی؟ هەر بە یارمەتیی ئەمەشـــە کە لە زۆربەی ڕۆمانەکانیدا توانیویەتی بەبێ شـــەنوکەوکردنی ڕاســـتەوخۆی هەســـتەکان کارەکە بەرەو پێش ببات و لەڕێی هەڵوسوکەوت و قسەی کەسایەتییەکانییەوە ژیانی دەروونییان دەربخات، ئاخر ئەم کەســـایەتیانە هەرچییان لە دەروونـدا بێت، ناچار لە ئاوێنەی قســـە و هەڵســـوکەوتیاندا ڕەنگ دەداتەوە. ئەمە بابەتێکی سیمبولیستییە کە پەیوەندییەکی ڕاستەقینە و نەگۆڕ لەنێوان ئەوەی کە ڕێژەییە (واتە هەڵســـوکەوت) و ئەوەی کە

ڕەهایە (واتە کەسایەتی) ڕادەگەیەنێت، ئەمە لەبارێکدا کە هەڵسوکەوت بۆ شێوازی تێفکرینی زاهیدانەی تۆلستۆی، تەنیا پۆشەنێکە و بەسەر گەوهەری هەر تاکێکدا دراوە.

*یادداشتە ژێرزەمینییەکان* بەرهەمێکە کە لە ڕووی مێژووییەوە، بۆ یەکەمین جار دۆستۆیڤسکی وەک شارەزا و هەڵکەوتەیەک دەخاتە بەرچاو و لە خۆیدا هەڵگری سەرلەبەری جەوهەری ئەو منی نووسەرەیە. ناتوانرێت بە سادەیی لە بەرگی بەرهەمێکی ئەدەبیدا ئەم ڕۆمانە لێک بدرێتەوە. لەو کتێبەدا ئەدەبیات لە فەلسەفە زیاتر نییە. *یادداشتە ژێرزەمینییەکان*، ڕەنگدانەوەی تویێکی قووڵ و گرنگتری کەسایەتیی دۆستۆیڤسکییە و خۆ ئەگەر وا نەبا، زۆر بە سادەیی دەکرا ئەو بەرهەمەی بخەینە ڕیزی کارە ڕۆژنامەنووسییەکانییەوە. ئەم بەرهەمە لەنێو بەرهەمەکانی ئەودا ڕۆڵێکی تەوەرەیی دەگێڕێت. لێرانەدایە کە تێگەیشتنی تراژیدیی ئەو بۆ ژیان لەگەڵ هیچ شتێکدا کۆ ناکرێتەوە، بە دڵڕەقییەکی تەواوەوە دەردەکەوێت، سنووری هونەر و وێژە تێدەپەڕێنێت و دەچێتە ڕیزی دۆزینەوە عیرفانییە گەورە مرۆییەکانەوە. باوەڕ بە بەهای بڵندی کەسایەتیی مرۆیی و ئازادیی ئەو، بڕوا بە بنیادی نائەقڵانی، ئایینی و تراژیدیی دونیای مانا، لە سەرووی ئەقڵەوەیە و جیاکەرەوەی چاکە و خراپەیە (ئەمەش لە خۆیدا واتە ماهیەتی هەموو ئایینە کۆدرێژکراوەکان)، لەم بەرهەمەدا بە شێوەیەکی چاوەڕوانینەکراو، دژیەک و تەواو بێویست ڕادەگەیەندرێن. نیچە و ڕۆزانۆف بۆ یەکەمین جار ئاماژەیان بەم خاڵە کرد کە *یادداشتە ژێرزەمینییەکان*، لە بەرهەمەکانی دۆستۆیڤسکیدا و هەروەها لە کارەکانی شێستۆفدا (گەورەترین شرۆڤەکاری ئەو) ڕۆڵێکی تەوەرەیی هەیە. لە ڕووی ئەدەبیشەوە ئەم بەرهەمە ڕەسەنترین بەرهەمی دۆستۆیڤسکییە، گەرچی لەنێویشیاندا بە دڵڕەقانەترین و ئازاردەرترینیان دێتە ئەژمار. لەسەر بنەڕەتی *یادداشتە*

ژێرزەمینییەکان بوو کە میخایلۆفسکی، تێزەکەی خۆی لەبارەی دڵڕەقییەوە، وەک یەکێک لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی دۆستۆیفسکی تاوتوێ کرد. ئەو کەسانەی کە توانای بەرگەگرتنی ئەم کتێبەیان نییە یان بێتاوانییان لە ئاستێکدا نییە کە پێی ئاڵوودە نەبن، ئەوا باشتر وایە خۆیان لە قەرەی ئەم بەرهەمە نەدەن؛ چونکە وەک ژەهرێکی چڕ و کاریگەر وایە و هەر بە ڕاستی دەبێت خۆیانی لێ بەدوور بگرن.

*خەونی پیاوی گاڵتەجاڕ*، گەلێک لە یادداشتە ژێرزەمینییەکانەوە نزیکە. ئەم بەرهەمەش بە شێوازی تاکگۆیی نووسراوە و هەمدیسان، بە هەمان ڕادەی ئەدەبیات پەیوەستە بە فەلسەفەوە. ئەم بەرهەمە دوای ساڵی ١٨٧٦ بووە بەشێک لە کتێبی *یادداشتەکانی نووسەر*. لەنێو بەرهەمە هونەرییەکانی دیکەدا کە لەنێو ئەم یادداشتە ڕۆژنامەنووسییانەوە هەڵقوڵاون، دەکرێت ئاماژە بە چیرۆکی *نازەنین* بکەین کە گوتوبێژێکی دراماتیک[1] و تەواو دەروونناسانەیە، هەروەها بوبوک کە باسی هاودەمیی دوو مردووی لە باری داڕزان لە گۆڕەکانیاندا دەگێڕێتەوە، کە وێنایەکی تۆقێنەر و خەمناک و گاڵتەجاڕانەی مەرگی دووەم و کۆتاییە.

ڕۆمانەکانی دیکەی ئەو، *قومارچی* و *هەمیشەمێرد* و *هەرزەکار* وەک چوار ڕۆمانە گەورەکەی فەلسەفی نین. *قومارچی* لەو ڕووەوە سەرنجڕاکێشە کە هەر دەڵێیت جۆرێکە لە خۆئاشکراکردن و باسی تامەزرۆییە بۆ قومار و، لە شێوەی *پالینا*دا، وێنای دەستەی ژنە لووتبەرز و شەیتانییە دڵخوازەکانی دۆستۆیفسکی دەکرێت کە وا دیارە شێوەی سۆسلۆڤای ڕاستەقینەی تێدا دەبیندرێت. *هەمیشەمێرد*، یەکێکی دیکەیە لە بەرهەمە دڵڕەقانەکانی دۆستۆیفسکی. لێرانەدا

---

١. شانۆنامە یان فیلمنامەیەک کە هەر چەشنە ڕووداوێکی خەمگین یان پێکەنیناویی تێدایە، بێ ئەوەی شێوەی تراژیدی یان کۆمیدی بدات. «و. ک»

هەموو شتێک بە دەوری برینێکی دەروونیی سارێژنەبوودا کە پیاوێک لەلایەن دۆستی ژنەکەیەوە تووشی دەبێت و تۆڵەی پلەبەپلەی مێردەکە لە دۆســـتی ژنەکەی کە بۆ هەردووک لایان مایەی ئەشـــکەنجەیە، دەخـولـێتەوە. *مەرزەکـار* (١٨٧٥) لەنـێو هەمـوو بەرهەمەکـانـی دۆستۆیفسکیدا لە *یادداشتەکانی نووسەر* و ئایدۆلۆژیاکەیەوە نزیکترە، گەرچی لەچاو ڕۆمانە گەورەکانیدا بە بەرهەمێکی لاواز دادەنرێت.

*تاوان و ســـزا* (١٨٦٦)، گەمژە (١٨٦٩)، *شـــەیتانەکان* (١٨٧١) و *برایانی کارامازۆف* (١٨٨٠) چوار ڕۆمانی گەورەی دۆستۆیفسکین کە وا دێتە بەرچاو ئەڵقەیەک پێک بهێنن. پێکهاتەی هەموویان دراماتیک و گەلاڵەی ســەرەتاییان تراژیکە و گشــتیان بایەخێکی فەلســەفییان هەیە. هەر یەکێک لەوانە بەرهەمێکی ئێجگار ئاڵۆزە. باســـەکە هەر ئەوە نییە کە گەلاڵەی چیرۆکەکە لە فەلســـەفەکەی تەنـدرابێـت؛ بەڵکە لەم فەلسەفەیەدا، دۆسـتۆیفسـکیی ڕەسـەن -کە لە بێخەوشـترین باریدا لە *یادداشـــتە ژێرزەمینییەکاندا دەردەکەوێت*- بە شـــێوەیەکی دانەبڕاو ئاوێزانی ئەو ڕۆژنامەنووســـە دەبێت کە *یادداشـــتەکانی نووســـەری* نووسـیوە. هەر لەم ڕووەوەیە کە دەتوانین لانیکەم سـێ خوێندنەوەی جیـاواز بۆ ئەم ڕۆمـانـانە بکەین. یەکەم، ئەو خوێنـدنەوەیەی کە هـاوســـەردەمانی هەیانبوو و بەو پرســـانەیانەوە گرێ دەدان کە کۆمەڵگەی ڕووســـیا و خوێنەرانی ئەو ســـەردەمە، یانی ١٨٦٥-١٨٨٠ پێیـانەوە خەریـک بوون. دووەمین ڕێـدۆز ئەوەیە کە دەکرێـت لەم ڕۆمانانەدا، بەرەبەرە دەرک بە مەســـیحییەتێکی تازە بکەین. ئەم ئایینە تازەیە لە کەسایەتیی زۆسیما و ئالیۆشا کارامازۆف (کەسایەتییەکانی دواهەمین ڕۆمـانی ئەو)دا، دەگـاتە دواهەمین شـــێوەی جێگیربووی خۆی. تێگەیشتنی سێیەم، ئەم ڕۆمانانە بە *یادداشتە ژێرزەمینییەکان* و ڕۆحی تراژیکیی ئەزموونە مەعنەوییەکانی نووســـەرەوە پەیوەســـت دەکات. ســـەرئەنجام، هاوســـەردەمانی ئێمە چوارەمین تێگەیشـــتنیان

لەبارەی ئەم ڕۆمانەوە خستووەتە ڕوو: خوێندنەوەیان بەبێ سەرنجدان لە کرۆکی فەلسەفیان و تەنیا لە شێوەی ڕۆمانگەلێک کە لەبارەی ڕووداوگەلی میلۆدرامەوە دەدوێن.

هاوسەردەمان، وێڕای بەهەندوەرگرتنی خوێندنەوەی یەکەم بۆ بەرهەمەکانی دۆستۆیفسکی، ئەویان بە نووسەرێکی هەر بە سرووشت بلیمەت، بەڵام هەڵگری سەلیقەیەکی جێگومان و هەستێکی هونەری دەزانی کە وەک پێویست نییە. بە بۆچوونی پێداگرانەی ئەوان دیدی ئەو بۆ پرسە کۆمەڵایەتییەکان ڕەسەن بوو و توانای ئەوەی هەبوو کە مرۆڤگەلی زیندوو لە کەسایەتییەکان بئافرێنێت. بەدسەلیقەیی دۆستۆیفسکی و ئەو وێنایەی ژیان کە بە شێوەیەکی گرۆتێسک بەلاڕێیدا دەبرد و دەیخستە بەردەست و هەروەها لێهاتوویی لە هێنانەئارای کاریگەریی جەنجاڵی، هاوسەردەمانی سەرسام دەکرد. لە هەمان کاتدا، ئەوان لەتاو ئەو دەرکەی کە ئەو بۆ مرۆڤە نەخۆشەکانی هەبوو و لێهاتوویی لە شەنوکەوکردنی دەروونیاندا شاگەشکە دەبوون. کۆنەپەرستان دانیان بە ڕاستیی وەسفی ئەو بۆ نیهیلیستەکاندا دەنا و ڕادیکاڵەکانیش بەوە سەرسام بوون کە چۆن مرۆڤێکی هێندە بەرزەهیمەت کە لەڕێی سیاسەتدا ئەشکەنجەی کێشاوە، توانیویەتی تا ڕادەی یەکگرتن دابەزێتە ئاستی کۆنەپەرستانی پۆخڵ.

نەوەی دواتری خوێنەرانی دۆستۆیفسکی، وەک دەرکەوتنی مەسیحییەتێکی تازە بەدەم بەرهەمەکانی ئەوەوە چوون. بە بۆچوونی ئەوان ئەم بەرهەمانە دەپەرژێنە سەر پرسگەلی تاهەتایی چاکە و خراپە، نووسەر تەنانەت تا سنووری چارەکردنی ئەم پرسانەش هەنگاو دەنێت و، بە شێوەیەکی گشتی، ڕێبازێکی تازە و تەواو و گشتیی مەعنەویەتی مەسیحی دەهێنێتە ئارا.

نامورادیی تراژیدیی هەوڵەکانی راسکۆڵنیکۆف لە بەیانکردنی ئاکایەتیی خودی *بەبێ بوونی خودا*، نەفامیی پیرۆزی شازادە میشکین، وێنای فکربزوێنی سۆسیالیزمی بێخودایی لە *شەیتانەکان*دا و، رووخساری پاکی ئالیۆشا کارامازۆف و گوتارەکانی زۆسیما، هەرهەمووی وەک سرووشی دابەزیوی ئایینە تازەکە وان لە دواهەمین شێوەیدا. ئەم جۆرە بۆچوونە لەبارەی دۆستۆیفسکییەوە کە لە سالانی سەرەتای سەدەی بیستەمدا باو بوو، هێشتاش لایەنگری زۆری هەیە. دۆستۆیفسکی بۆ ئەوان پەیامبەری رێکخستنێکی تازە و بەرزی جیهانێکی نوێ بوو کە بەسەر هەموو پەرتەوازەیی و تراژیدیاکانی مرۆڤایەتیدا سەر دەکەوێت و کۆتایی بە هەموویان دەهێنێت و ئاشتی بەرپا دەکات.

بەڵام راستییەکە ئەوەیە کە ناتواندرێت تراژیدیاکانی دۆستۆیفسکی لەنێو ببرێن، بەدوای رێچارێکدا بگەڕێیت بۆیان یان کپیان بکەیتەوە و، هەڵبەتە، گرنگیی تایبەتیی دۆستۆیفسکی وەک دیاردەیەکی دەروونیش هەر لەمەدایە. هارمۆنیای کرانەوەکانی ئەو، لە ئاستێکی ئێجگار خوارتری کێشمەکێشە تراژیدییەکانیەوەن. تێگەیشتن لە دۆستۆیفسکی، واتە پەسەندکردنی تراژیدیاکانی وەک تراژیدیاگەلێکی بێچارە و رانەکردن لێیان بە یارمەتیی فێڵگەلی *منی گچکەی دۆستۆیفسکی*. مەسیحییەتی ئەو، بە شێوەیەکی تایبەتی، بە جۆرێک لە جۆرەکان ئاوێتەی گومانە. نابێت ئەوە لە بیر بکرێت کە مەسیحیەت بۆ ئەو رێچاری کۆتایی نەبوو و ئایین دژەی نەکردبووە قووڵایی رۆحییەوە. مەسیحییەت کەم تا زۆر بەشێک بوو لە توێژەکانی رۆحی دۆستۆیفسکی و ناکرێت لەگەڵ مەسیحییەتی راستەقینەدا یەک حسێبی بۆ بکرێت، بەڵام سەرلەبەری ئەم پرسانە، هێندە ئاڵۆز و ناڕوون و جێی تاوتوێکردنن کە لەم کتێبەدا دەرفەتی پەرژانە سەریان ئاستەمە و تەنیا ئاماژەپێکردنێکیان بەسە.

تایبەتمەندیی ئایدۆلۆژیی ڕۆمانەکانی دۆستۆیفسکی لە خۆیدا بۆ جیاکردنەوەی ئەو لە ڕێبازی ڕیالیزمی ڕووسی بەسە. بە تەواوی ڕوونە کە کرۆکی ئەم ئایدیایانە وەک ئایدیا کۆمەڵایەتییەکانی تۆرگنێف یان گانچارۆف نین. لێرانەدا هەڵوێستوەرگرتن بە تەواوی جیاوازە. لە کارەکانی دۆستۆیفسکیدا، دەستمایە فەلسەفی و هونەرییەکان بە تەواوی پەیوەستن. گوتوبێژەکان ناتوانن پەیوەندییان بە باسەکەوە نەبێت، ئاخر ئەوان خودی ڕۆمانەکەن (هەر بەو جۆرەی شەنوکەوکردن بۆ تۆلستۆی یان ئەتمۆسفێر لە کارەکانی تۆرگنێفدا، ناتوانن بە باسەکانەوە ناپەیوەست بن). لەژێر کاریگەریی ڕاستەوخۆی دۆستۆیفسکیدا، ڕۆمانگەلی لەم جۆرە بە خامەی ڕۆماننوسانی ڕێبازی سیمبولیزم نووسران، بەڵام لەنێو ئەوانەدا تەنیا *ئاندرێی بێلی* لە ڕووی داهێنانەوە ڕەسەن بوو.

تایبەتمەندییەکی دیکە کە دۆستۆیفسکی لە ڕیالیستەکانی دی جیا دەکاتەوە، حەزی ئەوە بۆ کێشمەکێشە ئاڵۆز و خرۆشێنەرەکان. لەم ڕووەوە، ئەو قوتابیی ڕاستەقینەی بالزاک، قوتابخانەی فەرەنسی و دیکنزە. ڕۆمانەکانی ئەو هەرچەندەش بە ئایدیا و فەلسەفە ئاوسابن، لە ناوەڕۆکدا کۆدرێژانەن. دۆستۆیفسکی دەسەڵاتێکی باشی لە تەکنیکی ئەم ڕۆمانانە و دەستێکی زێڕینی لە درێژکردنەوەی پەرێشانی لە ڕۆماندا هەبوو. هەمووان نهێنیی کوژرانی کارامازۆفی باوک و یاریی مشکوپشیلەی پۆرفیریی لێکۆلەریان لەگەڵ ڕاسکۆلنیکۆفدا لە یادە. بێدەنگی، یەکێکە لە ڕێدۆزەکانی دیکە کە لە کەمژەدا بەکار هاتووە، بێدەنگی لەبارەی هەموو ئەوەی کە لە ژیانی شازادە میشکین، ڕاگۆژین و ناستاسیا فیلیپۆڤنا لە مەودای بەشەکانی یەکەم و دووەمی ڕۆمانەکەدا ڕووی داوە؛ ئەو کاتەی ئەوان هێشتا هەموویان لە مۆسکۆن، ئەگەرچی لەم بارەیەوە بە زۆری ئاماژە هێمائامێزەکان بە شێوەیەکی پشوودرێژانە دێن و هەر دەڵێیت

دەیانەوێت پەیوەندیی داهاتووی ئەوان ڕوون بکەنەوە. کەشـــی ڕۆمانەکە هێندە گرژ و پەرێشـــانە کە بێزاریی بەدوادا دێت. ئامادەکاریی ئەم جۆرە بارودۆخە بە یارمەتیی ڕێچاری لاوەکی دەســـتەبەر دەبێت کە بۆ یەک بە یەکی خوێنەرانی ڕۆمانەکانی دۆســـتۆیڤســـکی ناســـراوە و بە ئاســـانی بنەماگەلێکی یەکســـان ڕادەگەیەنێت. لە ڕووی ئەدەبییەوە، ئاوێتەکردنی تووخمگەلی هەســـتی و ئایدۆلۆژی، دۆشـــداهێنەرترین تایبەتمەندیی شـــێوازی ئەدەبیی کاملبووی دۆستۆیڤسکییە.

دۆســتۆیڤســکی لەڕووی ئارەزوویەوە بۆ پرســە کۆمەلایەتییەکانی ڕۆژ، هاوسۆزی مرۆڤدۆستانەی لەگەڵ ئینسانی سووکایەتیپێکراو و چەوســاوە و، لە هەمووشـــی گرنگتر، ئەو ژینگانەی کە بۆ گێڕانەوەی بەرهەمەکانی هەڵیان دەبژێرێت و ئەو وردەکارییە ڕێکە ڕیالیستییانەی کە لە نووســـینی بەرهەمەکانیدا پەیڕەوییان دەکات، ســـەر بە ڕێبازی ڕیالیزمە، بەلام گەر بمانەوێ وەک ڕەنگدانەوەی ژیانی ڕووســـیای ســـەردەمی ئالێکســـاندەری دووەم لە بەرهەمەکانی بکۆڵینەوە، ئەوا بە هەڵەدا دەچین؛ هۆکـارەکەی هەر بە تەنیـا ئەوە نییە کە شـــتێکی مەترسیدارە بەرهەمی ئەدەبیی ڕیالیزمی بە ڕەنگدانەوەی ژیان بزانین، بەڵکە هۆکـارەکەی ئەوەیە کە دۆســـتۆیڤســـکی لەڕووی گرنگیی بەرهەمەکانییەوە، کەمتر لە نووســـەرانی ئەو ســـەردەمە ڕیالیســـتە. ئاکســـۆکۆف، تورگنیف، گانچارۆف و تۆلســـتۆی هەتا بۆیان کراوە، هەوڵیان داوە بەو جۆرە وێنای ڕووســـیا بکەن کە دیویانە، بەلام دۆســـتۆیڤســـکی وەهـا کـارێکی نەکرد. ئەو هەوڵی دا ئەزموونە دەروونییەکانی خۆی -کە بێ گومان ئیجگار بەسوود بوون- ئاوێتەی بەرهەمانی بکات و گرنگییان پێ بدات. ئەو تەنیا بەرگی ڕیالیســـتی تازەی بە بەردا کردوون و نیشانەگەلێکی ڕووداوەکانی ڕووسیای ئەو ســـەردەمەی تێکەڵ کردوون؛ دەنا بۆ نموونە پلۆشـکین گۆگۆل چەندە

شـێوەی ڕاسـتەقینەی کەسـێکی پیسـکە و نموونەیی بوو ڕۆمانی *شەیتانەکان*یش هەر ئەوەندە وێنای تیرۆرستیی سالانی شەستە. ئەمە هەمـان ئەو ئـامـادەگیبەخشـییەیە بە «من»ی نووسـەر. ئەو پەیامبەرڕەنگییە شـاراوەیەی کە لە سـەرتاسـەری بەرهەمەکانیدا بەرچاو دەکەوێت هەر لێرانەوەیە. بە ڕوونی دیارە کە پەیوەندیی نێوان ئەم بەرهەمانە و واقعیەتی ڕووسیای ئەو سەردەمە هەر لە بنەڕەتەوە لە ئاسـتێکی دیکەدا بووە. ڕاسـتە کە ڕۆمانی *شـەیتانەکان* لەبارەی پیلانی تیرۆریستییەوە نووسراوە، بەلام بە هیچ شێوەیەک لێکچوونی لەگەڵ بزوتنەوەی توندوتیژی ئەو ڕۆژگـارەدا نییە. ڕووسـیـای دۆستۆیفسکی بە هەمان ئەو ڕادەیە ڕووسیای ئالێکساندەری دووەمە کە دەشێت کەسایەتییەکانی ڕۆمانی *بەرزاییەکانی وزرینگ* ناسێنەری خۆرئاوای ڕاسـتەقینەی دەسـتپێکی سـەدەی نۆزدەیەم بن. ئەم کەسایەتیانە سەر بە ڕۆژگاری خۆیانن و نوێنەری سەردەمی خۆیانن، بەلام سـەر بە ڕێکخسـتنێکی دیکەی دیاردەکانن. لە ڕۆمانەکانی دۆستۆیفسکیدا، بابەتە بنەڕەتییەکە کەسایەتییەکانن و ئەو لەم ڕووەوە بە تەواوی شـوێنپێهەڵگری نەریتی ڕۆماننووسـیی ڕووسـیایە. هەمان ئەو نەریتەی کە بەر لە هەر شـتێک ڕۆمـاننووس بە ئـافرێنەری کەسـایەتی دەزانێت. کەسایەتییەکانی دۆسـتۆیفسکی تەژین لە مانا و ئاماژەگەلی میتافیزیکی، بە هێماگەری پەروەردە کراون و، لە هەمان کاتدا، بە شـێوەیەکی باوەڕپێنەکراو سـەربەخۆن. دۆسـتۆیفسـکی وەک لێهاتووییش بۆ تایبەتسـازی کەسـایەتییەکان، هیچی لە تۆلستۆی کەم نییە، بەلام سـرووشـتی تایبەتسـازیی ئەو جیاوازە. پالەوانەکانی تۆلستۆی لە گۆشت و خوێن و ڕووخسـارگەلی بەرهەست دروست کراون، هەر دەڵێیت کەسـایەتی و ژن و پیاوەکانی ئەو لە ناسـیاوانی خۆمـانن، گەرچی دەتوانین لە ژیـانی ڕۆژانەدا ئەوان ببینین، کەچی ئاسـایی و لە هەمان کاتدا دووبارەنەبووەوەن، بەلام ئەوان لەلای دۆسـتۆیفسـکی مرۆڤ نین، بەڵکە تارمایین. تەنانەت ئارەزووباز و

هەرزەترین تاوانبارەکانی ئەو هەر لایەنە ڕۆحییەکەی بوونیان بەسەر منـــە ماددییەکەیاندا زاڵە. جەستە، جەستەی ڕاستەقینە و ماددی، لە دونیای دۆســـتۆیڤســـکیدا ئامادەیی نییە، وەلێ لەبری ئەوە ئایدیا و لایەنی ڕۆحیی بوون هێزی خۆیان دەنوێنن و هەر لەبەر ئەوەشـــە کە دەکرێت لە دونیای ئەودا ڕۆح لە قەڵەمڕەوی ڕۆحانیی خۆیدا بکەوێتە ژێر هەڵمەتی جەستەوە. ئەم پوختە ڕۆحیانەی بوون لە ترسناکترین و سەرسامکەرترین ئافرێندراوەکانی دۆستۆیڤسکین و تا ئێستە هیچ کەسێک نەیتوانیوە کەسایەتییەک بئافرێنێت کە لەڕووی نەگریسی و ناپاکییە کاولکەرەکەیەوە لە کارامازۆفی پیر نزیک بووبێتەوە.

دەستەی ئەو ڕووخسارانەی کە دۆستۆیڤسکی ئافراندوونی، گەورە و هەمەجۆرە. ناکرێت یەک بە یەکیان بژمێرین و شـــیکاریکارییەکی کورتیـان لەبـارەوە بخەینە ڕوو، لەبەر ئەوەی هەرهەموویـان گەلێک زیندوو و ڕاستەقینە و ئاڵۆزن و ژمارەشیان زۆرە. ئەم کەسایەتیانە لە یەک بە یەکی ڕۆمانە گەورەکانی دۆســـتۆیڤســـکیدا (هەروەها لە بەرهەمەکانی دیکەشـــیدا) خەریکی ژیانێکی نامۆ و نەخۆشـــانە و نائاسـاییین. ئەوان یان شـەیتانگەلێکی سـامناکن لە پێستی مرۆڤدا یان تارماییگەلێکی زیندووی ترســـناک بە زیانەخرۆییە دەروونییەکەیان و (ئەم وشەیە لە توخمی هەمان وشەی کۆمپلێکس یان گرێی فرۆیدییە) زامەکـانیـان، بەو چۆنـایەتییە پڕ و ئـاخێنـدراوەی دەروونیـانەوە، سەربەخۆیی ئێجگار زۆر، ناکارایی و بێتوانایی، هەروەها لووتبەرزییان (بەتایبەت ژنە پاڵەوانەکانی دۆستۆیڤسکی گەلێک لووتبەرزن)، ئاگاییان لەبـارەی چـاکە و خراپەوە و، لە کۆتـاییـدا، بەو ڕۆح و دەروونە ئازارکێش و دەردەدارەیانەوە کە هەرگیز داناسەکێت. لە *شەیتانەکان*دا، بەراورد بە بەرهەمەکانی دیکەی دۆسـتۆیڤسـکی زۆرترین کەسـایەتی ئامادەیی هەیە. لەم ڕۆمانەدا، سێ کەسـایەتی لە سـەرەوەی پێڕسـتی پاڵەوانەکانیدان: دانەیەکیان ڕووخســـاری ســـامناک، تەلیســـماوی و

پووچی ســـتاڤرۆگین؛ ئەوی دیکەیان کیرللۆفی ئاتیســـتی دڵســـۆز و، سەرئەنجام، پیۆتەر ویرخاوێنسکی، ئەو جاسووسە لێهاتووە چەپەڵە و ئەو زمـانلووســـە بەڵێبەڵێکەرە بکوژەی کە هیچی لە ئەجنـدەیەکی تۆقێنەر کەمتر نییە و دەکرێت بڵێین ئەم کەســـایەتییە دوای پاڵەوانی ڕۆمـانی *یـادداشـــتە ژێرزەمینییەکـان،* قوولترین پـاڵەوانێکە کە دۆستۆیڤسکی ئافراندوویەتی. هەر ئەم سێ کەسایەتییە بۆ ئەوە بەسن تا تێبگەین کە ئێمە ڕووبەڕووی نووســـەرێکین کە لە توانای داهێناندا ڕکابەری نییە.

دۆســـتۆیڤســـکی وێڕای ئەوەی ڕۆژنامەنووســـێکی کاریگەر بوو، هەمیشـە بە نووسـەرێکی دیاریش دەهاتە ئەژمار (هەڵبەتە زیاتر دوای نووســینی *ڕەشــوڕووتەکان* و یادگارییەکانی یانەی مردووان). ئەو لە ماوەی ژیانیدا باش نەناســرا و ئەمەش بە تەواوی شــتێکی ئاســاییە، چونکە بیرکردنەوەی پەیـامبەرانە بوو و لەڕووی مێژووییەوە لەگەڵ سـەردەمەکەیدا یەکی نەدەگرتەوە؛ سـەردەمێک کە موژدەی شـۆڕشـی نوێی دەدا. دۆستۆیڤسکی یەکەمین و مەزنترین نیشانەی پەرتەوازەیی ڕۆحی ڕووسییە لە بەرزترین ئاستیدا کە دواجار بە لێکهەڵوەشانەوەی ڕووسیای تزاری کۆتایی دێت.

کاریگەریی ئەو لە ماوەی ژیانی و لە ســـاڵانی هەشـــتاکاندا هێندە جێبایەخ نەبوو و ســـەرەڕای وروژاندنی بابەتگەلێکی زیندووی وەک سـۆز، ئازار و هەروەها شـیکاریی دەروونە نەخۆشـەکان -کە لەنێوان ڕۆماننووسە پلەدووەکاندا باو بوو- سنووردار بوو. تەنانەت دواتریش کـاریگەریی ئەدەبیی بەســـوودی ئەو هێنـدە بەرفراوان نەبوو. بە واتـایەکی پڕپێک، تەنیـا دەکرێت ژمـارەیەکی کەم لە نووســـەران بە شــوێنکەوتووی ئەدەبی ئەو بزانین، وەلێ ناتواندرێت وەک دیاردەیەک کاریگەریی ئەدەبیی دۆســـتۆیڤســـکی هەڵبســـەنگێندرێت. نەوەی بەر لە شـۆڕشـی تشـرینی یەکەم، بەتایبەت ئەو کەسـانەی کە لە ماوەی نێوان

ســـالآنی ١٨٦٥ و ١٨٨٠دا هاتنە دونیا (ئەمەش ڕێککەوتێکی ســـەیرە لەنێوان مێژووی بڵاوبوونەوەی یەکەمین و دواهەمین ڕۆمانی گەورەی ئەو)، کردەییانە بە ئایدیا و فکرەکانی دۆســـتۆیفســـکی گۆش کران. لەوسا بەدواوە، نەوەی دواتر هۆگرییان بۆ ئەو کەمتر بووەوە. هەڵبەتە مەزنیی ئەو نەکەوتووەتە ژێر پرســـیارەوە، بەرهەمەکانیشـــی هەر وا وەک جـاران دەخوێنـدرێنەوە، بەڵام هەر دەڵێیت جەســـتەی ئێمە دژەژەهرێکی بۆ ژەهری دۆسـتۆیفسـکی دروسـت کردووە، ئەم ژەهرە لە ئێمەیە و لە خۆمـاندا هەزمـان کردووە. نموونەییترین شـــێوەی هاوســـەردەمانی ئێمە کاتێک بەر دۆســـتۆیفســـکی دەکەون، ئەو بە نووسەرێکی دڵخواز و جێسەرنجی ڕۆمانە ڕووداوئامێزەکان لە قەڵەم دەدەن. تەنـانەت گەنجـانی ئێمە دوور نییە ئەو بخەنە ڕیزی *دواوە* و ئەمەش بە دڵنیاییەوە تێگەیشتنێکی ئێجگار سنووردارە لە تایبەتمەندی و نـاوازەیی دۆســـتۆیفســـکی، بەڵام ئەمە جێی داخ نییە، چونکە دۆســـتۆیفســـکی، خۆراکێکە کە تەنیا ئەو کەســـانە دەتوانن بە ئاســـانی ئەزمی بکەن کە لە ژیانیاندا بەر ئازارگەلی ڕۆحیی قووڵ کەوتوون.

١٩٢٦

# لەســەر تاوان و سزا

دیمیتری ئاخشارۆمۆف

گومان لەوەدا نییە کە ڕاسـکۆلنیکۆف لەمێژ بوو لە دیوی جیاوازی تیۆرییەوە بیری *لەو بابەتە تایبەتە* کردبووەوە. بەڵگەکەشـی ئەو گوتارەیە کە دوو مانگ بەر لە ڕووداوەکە نووسـیبوی و بابەتە سـەرەکییەکەشـی تاوان بوو. هەر لەم گوتارەدا بوو کە تا ئاسـتی بەئەنجامگەیشتنێکی مەترسیدار بەرەو پێش چوو و توانیی بیسەلمێنێت کە:

مرۆڤی ڕیزپەڕ ئەو مافەی هەیە، جا مافێکی دەروونیش نەک یاسـایی، کە ویژدانی خۆی بکاتە بنەما و هەندێ بەربەرسـتی تایبەت وەلا بنێ، هەڵبەتە تەنیا و تەنیا ئەگەر بۆ بەکردەییکردنی ئەندێشـەکانی پارمەتییەکی بدەن (چونکە لەوانەیە ئەندێشـەکانی ئەو مرۆڤـایەتی ڕزگـار بکەن). گوتتـان من بە تێروتەسـەلی بابەتەکەم نەکردووەتەوە، باشـە، من ئامـادەم بۆتـانی ڕوون بکەمەوە! لام وایە بە لاڕێدا نەچوومە و ئێوەش خۆتان دەتانەوێ باسەکەمتان بۆ ڕوون بکەمەوە. زۆر باشە، قوربان! بە بۆچوونی من ئەگەر لەبەر فلان و فیسارە هۆکار، بڕیار بووبا داهێنانەکانی کێپلەر و نیوتن بە نەنـاسـراوی بمێننەوە، تەنیـا مەگەر بەو مەرجەی کەسـێک یان دە یان سـەد کەس یان تەنانەت زیاتریش ببنە قوربـانی، نیوتن ئەو مـافەی هەبوو، یـانی نەک هەر مـاف،

بەرئەرک بوو ئەو دە یان سەد کەسە لەسەر ڕێگەکەی ڕامالّن تا مرۆڤایەتی لە داهێنانەکەی ئەو سوودمەند بێ.

ئەم بابەتە هێندە نوێ نییە و تێگەیشـتنیشـی ئاوەز و زیرەکییەکی تایبەتیی ناوێ و مرۆڤێک کە زەینێکی هۆشـیاری هەبێت، دەتوانێت خۆی بە سـادەیی تێبگات کە فریو و پشـێوی لە کوێی ئەم پرسـەدا شاردراوەتەوە. لەبەر ئەم هۆکارە باشتر وایە تۆزێک دواتر و لە کاتی خۆیدا بپەرژێینە سەر شەنوکەوکردنی و ئێستە بزانین هەر بە ڕاستی چی ڕووی دا:

نابێ بە هیچ شێوەیەک وا لێک بدرێتەوە کە نیوتن بۆی هەبوو بە کەیفی خۆی بەناو کەوێ و ڕاست و چەپ مرۆڤ بکوژێ یان ڕۆژانە لە بازاردا شـت بدزێ. پاشـانیش هێندەی بیرم بێ لە گوتـارەکەدا ئەوەم شـی کردووەتەوە و گوتوومە کە هەموو یاسـادانەر و ڕابەرەکان... بۆ نموونە لۆکۆرگەس، سـۆلۆن، ناپلیۆن، موحەممەد و... یەک بە یەکیان تاوانکار بوونە! بۆچی؟ هەر بە تەنیا ئەو بەلّگەیە بەسـە کە لەبەر ئەوەی یاسـایەکی تازەیان هێنابوو، یاسـا کۆنەکەیان پاشـێل کرد گەرچی بۆ پێشـینانیان پیرۆزیش بوو و جا لە هەر کوێ کە خوێنڕێژی لە بەرژەوەندییاندا بووبا، سـلّیان لە ڕشـتنی خوێنی ئەو خەلّکە بێتاوانە نەدەکرد کە هەولّی پاراسـتنی یاسـا کۆنەکەی دەدا. شـیاوی باسـە کە زۆربەی ئەم خودان و ڕابەرانەی کۆمەلّگەی مرۆڤایەتی خوێنڕێژ بوونە.

جا لە ئەنجامدا:

زۆربەی مرۆڤە گەورەکان و تەنانەت ئەوانەش کە تۆزێ لە سـەرووی خەلّکە ئاسـاییەکەوەن و لانیکەم قسـەیەکیان بۆ گوتن هەیە، تاوانکاری لە سرووشـتیاندایە، هەلّبەتە کەم و زۆر. گەر وا نەبێ ئەی چۆن دەیانەوێ بە پێچەوانەی ئاراسـتەی ئاوەوە مەلە بکەن؟ هەر سرووشـتیان بەرگەی ئەوە ناگرێ ئەو ڕێگەیە بگرنە

بەر کە ئەوانی تر دەیبڕن! گەر لە من بپرسی دەڵێم ئەرکەکەیان وا دەخوازێ بە پێچەوانەی ئاراستەوە ڕێ بکەن.

ئەم جۆرە ئەنجامگرییە زۆریش بێوێنەیە، لەبەر ئەوەی پیشانمان دەدات کە شێوازی تێفکرینی ئەو هۆگری چ گۆشە و ئاراستەیەکە. هەرچەندە ئەم بابەتە بۆ خودی ڕاسکۆڵنیکۆفیش ڕوون و لە ئاستی تێگەیشتندا نەبێت، بەڵام بۆ ئێمە بە تەواوی ڕوونە. ڕاسکۆڵنیکۆف لە بەرزایی ناتەباییە مێژووییەکانەوە، کە بۆ ئەو لە شێوەی کەسانی وەک ناپلیۆن و کەسایەتییە گەورە مێژووییەکانی دیکەدا بەرجەستە بوونە، بە شێوەیەکی خۆڕسک هەوڵ دەدات بگاتە کەسایەتییەکی تەواو ناڕوون کە دواهەمین دەستکەوتەکانی چالاکیگەلی کۆمەڵگە و خەڵکانێک کە سنووریان تێپەڕاندووە، لەو کەسایەتییە بێژمارانە جیا بکاتەوە کە دووجەمسەر و ناڕوونن. هەوڵ دەدات ئەوانەی کە تەنیا تۆزێک لە چوارچێوە دەرچوونە و تەنیا تا ڕادەیەک توانای کردنی قسەی نوێیان هەیە، لەوانە جودا بکاتەوە کە بە تەواوی لە چوارچێوە و سنوور دەرچوونە و زۆریش وردیی دەوێت تا تێبگەیت کە ئایا هەر بە ڕاستی لەبەر سرووشتیان لە چوارچێوە و سنوور دەرچوونە یان مەسەلە ئەوەیە کە لەبەر هۆکاری دیکە لە هێڵ لایان داوە.

دەبێت چی بکەیت؟ لە کوێ و کەی و چۆن؟ ئایا هەر بە ڕاستی ئەو سەر بە پۆلی ئەوانەیە کە بۆ ئامانجێکی باڵا بتوانن مۆڵەتپێدانێکی لەو جۆرە بۆ ویژدانیان بە ڕەوا بزانن؟ ئەی هەر بە ڕاستی کوا ئامانجە باڵاکەی ئەو؟ باشە کوا هێزی کێشکردنی نیوتن و لە کوێیە دۆزینەوەگەلی وەک ئەوانەی کێپلەر؟ ئەی کتومت کێیە ڕێگەی لەو گرتووە و لەبەردەم بوونە چاکەکار و بەچاکسازبوونی خەڵکیی ئەودا بووەتە بەربەست؟... هەموو ئەمانە بە شێوەیەکی تۆقێنەر کار و هێزی فکریی ئەویان لە هێڵ لاداوە و گێژ و ونیان کردووە. لێرانەدا، ئەوە پێویستییە کە قامچیی کزێنەری خۆی بە ناوشانی ئەودا دەکێشێت،

وەک ئەو ئەســـپە ترســـاوەی کە چەند هەنگاویک لێیەوە دوورە و نایەوێت قامچیکاریی بکەن. راســـکۆلنیکۆف تا کۆتاییەک کە ڕێی تێدەچوو، هەنگاوی نا و ئیدی جێگەیەک نەمابووەوە بۆ پێشـــڕەوی. ئێوە دەزانن ئەوە یانی چی کە مرۆڤ جێگەیەکی نەبێت ڕووی تێ بکات و هیچ چارەیەکی دیکەشی نەبێت؟ وەها کەسێک دەبێت تا چەندە خۆخۆر و دوورەپەرێز و لەخۆدارۆچوو و دەورەدراو بە دیوار و تا چ ڕادەیەک دوور و دابڕاو بێت لە هەوای تازە؟ ئەی دەبێت فکری ئەم مرۆڤە بە چ بێقەراری و تینێکەوە خۆی بە دار و دیواردا دابێت تا دەلاقەیەک یان ڕێی هەڵهاتن و پەناگەیەک بدۆزێتەوە؟ دەزانن کە خەون و خەیاڵەکانی وەها مرۆڤێک دەبێت تا چ ڕادەیەک بە شێوازێکی نەخۆشانە ورووژابن؟ دەبێت چ خەونگەلێک شالاویان بۆ هێنابێت و چ هەستگەلێک ئەشکەنجەیان دابێت و دەشێت چەندە ئاسان بە پلتۆکێک کەوتبێتە نێو وەهم و خورافاتێکەوە کە هێزێکی وەهماوی و مەستکەر و ڕەشـــی لە خۆیدا هەڵگرتووە! دەبێت مرۆڤ لەگەڵ هەر ئاماژەیەکی دەرەکی و لاوەکیترین ڕووداودا -کە تەنانەت بە شـــێوەیەکی خەڵەتێنەریش بێت، بۆ فکرێکی شـــپرزە و ملکەچبوو دەبنە پەناگە- چ هەســـتگەلێکی جەبری (زەبرەکی) و ناچارکەر ڕوویان تێ کردبێت! ئەمانە هەمووی چین؟ پرســـیارگەلێکن کە تەنیا لەنێو ڕۆمانەکەدا وەلامێکمان دەست دەکەوێت بۆیان.

بەم جۆرەیە کە ســـەرئەنجام لە تەریکیی کارگەی زەینیی راســـکۆلنیکۆفدا و لە درێژەی ڕەوتی ئەشـــکەنجەداری بیرکردنەوەدا، یەکەمین تۆوی کردار، ڕێک وەک جوچکەیەک کە لە هێلکەدا دەردێت و یەکەمین بۆچوونی ڕۆشـــن کە دەبێت بۆ کوێ بچم و کتومت دەبێت چی بکەم، ڕووی خۆی دەنوێنێت. ئەندێشـــەی تینوو و برســـی بە چلێســـی و نەوســـنییەکی دانەمرکاوەوە دەســـتی بۆ ئەم تاقە خۆراکە وەڕەزکەرە برد و وێڕای ئەوەی کە لەم کاتەدا بەردەوام لە باری

هێلنجداندا بوو، کەچی دەڵێیت ئەم خۆراکە، ویست و ئازادیی تەواوەتیی بەو دەبەخشی. جا ئەمە چ نەهامەتییەکە! ئاخر خۆ هێشتا کردەوەیەک لەئارادا نەبوو و تەنیا و تەنیا هەڵسەنگاندن و پێشبینییەکی سادە بوو کە هەرگیز ئەوی ناچار بە ئەنجامدانی کارێک نەدەکرد. لە ویستی ئێمەدا هەمیشە دووڕیانی بیکەم *یان* نەیکەم بوونی هەیە، بەڵام ئەگەر راسکۆڵنیکۆف دوای ماوەیەک گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە پێویستە *ئەو کارە* بکات، ئەی بۆچی هەر لە سەرەتاوە هەڵی نەسەنگاند؟ ئیدی لەبەر ئەمە بوو کە ئەو لەوێوە دەستی کردە هەڵسەنگاندن و ئاگادار نەبوو کە لەم هەڵسەنگاندنەدا، هێزێکی بەرچاو خۆی مات داوە کە ئاستەمە لەبەرانبەریدا بتوانێت خۆی کۆنترۆڵ بکات. ڕەوتی داهێنەری ئەندێشەیەک کە کردارێکی بەدوادا دێت، هەستپێنەکراو و نائاگایانە دەست پێ دەکات، بەڵام بە تێپەڕینی کات و نزیکتربوونەوەی کردەوە و کەوتنەسەر ڕێرەوی، ئیدی وابەستەیی کردەوە بە ئەندێشەوە کەمتر دەبێتەوە، تا وای لێ دێت کە ئیدی ناتواندرێت ڕابگیرێت و هەر بە تۆوی لەنێو ببرێت. تۆوەکە شێوە پەیدا دەکات، بە شێنەیی هەراش دەبێت و سەرلەبەری وزەی دایکەکە بۆ خۆی دەبات و، سەرئەنجام، ئیدی وەک دیاردەیەکی سەربەخۆ و جیا لە بەدیهێنەرەکەی، خۆی دەنوێنێت و دەبێتە خودانی دایکی و بە تەواوی ملکەچی خۆی دەکات. کەم تا زۆر شتێکی وەک ئەم ڕەوتە بوو کە هاتە بەردەم ڕاسکۆڵنیکۆف. کونجکۆڵیی هەرزە و ئارەزووبازانەی، پێویستی و لەدەستدانی کار و پیشە ئەویان ناچار کرد کە لە سەرەتاوە لەگەڵ تۆوی ئەندێشەکەدا بکەوێتە یاریکردن و ڕێک لە کاتێکیشدا کە ئەرخەیان بوو ئەمە تەنیا یاری و سەرقاڵییەکە و بیرکردنەوەی ڕووت هیچ کردەوەیەکی لێ ناکەوێتەوە، ئیدی وای لێ هات هێندە قووڵ ڕۆچووە ناخ و کاکڵی یارییەکەوە کە ئیدی دەستهەڵگرتن لەو یارییە بووە شتێکی نەکردە. سەرئەنجام هەستی کرد ڕۆڵەکان گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووە و ئەوەی کە تەنیا

ســـەرقاڵییەک بووە بۆ زەینی، جڵەوی ئەوی گرتووەتە دەســـت و ئەو بەرەو خۆی ڕادەکێشـــێت و دەیخاتە ژێر گوشـــار و، لە کۆتاییشـــدا، تێگەیشـــت کە ئەو لەم ڕۆڵگۆڕانەدا، خۆی بووەتە یاریچەی دەســـتی ئەندێشـەکەی. کتومت لەو کاتەدا بوو کە تاسـا و چاوەکانیی داپۆشـین تا *ئافرێندراوەکەی* خۆی نەبینێت، بەڵام ئەم دیاردەیە لە ناخی ئەودا بوو و بەردەوام و لە هەر ســـاتێکدا دەیبینی و نەیدەتوانی خۆی لێ هەڵە بکات. ئافرێندراوەکەی ئەندێشەی، گەشەی کرد و ئەندامەکانی بە تەواوی هەراش بوون و ئـامـادەی ئەنجـامـدانی کردەوە بـوو. ڕاســـکۆڵنیکۆف خۆی بووە هۆکاری بەدیهاتنی و هەر خۆی بوو کە بیری لە هەموو شـــتێک کردەوە و دەمێک لەوەوبەر ئامادەی کردبوو. تەوری وەک کەرەســـتەی تـاوانەکە هەڵبژاردبوو و تەنـانەت بیری لەوەش کردبووەوە کە لە کوێ هەڵیبگرێـت. هەروەهـا بیری لەوەش کردبووەوە کە لە دیوی ناوەوەی پاڵتۆکەیدا، لە بنباڵی دەســـتە چەپیدا ئەڵقەیەک بۆ تەورەکە دروســـت بکات تا بشـــاردرێتەوە و بە ئاســـانی هەڵیبگرێـت؛ لەمێژبوو داو و دەرزی بۆ دوورینەوەی ئەڵقەکە بە ئـامـادەکراوی لە دەقی پـارچەکـاغەزێکـدا خرابووە نێو چەکمەجەی مێزەکەوە. پێشوەختە بارمتەیەکی درۆییەنە تەیار کرابوو و لە بۆشایی کەمی نێوان قەنەفە و ڕووی زەوییەکەدا شـــاردرابووەوە. کارەکە تا ئەو شـــوێنە بەرەو پێش چووبوو و گەلاڵەڕێژیی بۆ کرابوو کە ئیدی نەدەکرا زیاد لەوە خۆ فریو بدەیت و ڕاسـکۆڵنیکۆف بەوپەڕی ترس و تۆقینەوە دڵنیا بووەوە کە ئەم پرســـە ئیدی تەنیا خەیاڵێکی سـادە نییە، بەڵکە ویســـت و نیازێکی ئێجگار هەتەر لەئارادایە. ویســـت و نیاز یان هەر شـــتێـک کە بوو، ڕاســـکۆڵنیکۆفی بێزار دەکرد، بەڵام ئیـدی نەیدەتوانی بۆ ماوەیەکی درێژ چاو لە ئاســـتیدا بنووقێنێت. نەیدەتوانی ئەو ویســـتە لە خۆی دوور بخـاتەوە و تەنیـا جـاروبـار بە خەیـاڵی ئەوەوەی کە نایبینێت و شـاردراوەتەوە، هەوڵێکی دەدا و لە دوودڵی و

لەرزۆکی و گومانێکی ئەشکەنجەباردا نغرۆ دەبوو، دەترسا و لەرزی لێ دەنیشت...

ڕێک لێرانەدا بوو کە وێرای ئەوەی هەستی دەکرد بەرەو تاوانەکە دەکشێت، دەستی دایە کۆششێکی بێهیوایانەی دیکە. کەم تا زۆر بەبۆنەی هەڵپەکاری و وڕێنەوە، لە پیترۆفسکی و لەنێو دەوەنگەلێکدا کە شەوی ڕابردوو ڕێی کەوتبووە ئەو شوێنە، چاومان بە ڕاسکۆلنیکۆف دەکەوێت: *بەرەو ماڵێ ملی ڕێگەی گرتە بەر، وەلێ هێشتا نەگەیشتبووە دوورگەی پیترۆفسکی لەتاو ماندوویەتی بڕستی لێ بڕا، لە ڕێگەی سەرەکی لای دا و لەنێو چەند دەوەنێک و لەسەر سەوزاییەک بێهەپوکۆ خەو بردییەوە...* مۆتەکەیەکی سامناک کە بە بێداریش بە زەینیدا دەگوزەرێت. سەرلەبەری ئەو ترسەی کە چاوەڕێیەتی، کتوپڕ لە بەرچاویدا خۆی دەنوێنێت و لەناکاو ئەم بیرەی بە مێشکدا دێت کە ڕێی تێناچێت وەها شتێک ڕوو بدات و هەرگیزیش پێش نایێت... وای بە بیردا دێت کە هێشتا دەکرێت لەم ئەفسوون و سیحر و فریو و وەهمانە ڕزگاری ببێت. ئیدی دواهەمین هێزی خۆی کۆ کردەوە و شکۆدارانە لە گشت ئەو ئەندێشانە دوور کەوتەوە کە دەوریان دابوو و بە هەستێکی ئارامیبەخشەوە بەرەو ماڵەوە کەوتە ڕێ، کە کتوپڕ، تەواو خۆنەویستانە، لە بازاڕی سێنایادا خۆی بینییەوە. ئەم بابەتە، ڕاسکۆلنیکۆفی سەراسیمە کرد، ئاخر بازاڕی سێننایا لەسەر ڕێگەی ماڵەوەی ئەودا نەبوو و، تۆقین شوێنی سەراسیمەیی گرتەوە ئەو کاتەی کە لەناکاو و تەواو چاوەڕوانینەکراو لەو گوتوبێژەوە کە بە هەڵکەوت دوو وردەواڵەفرۆشەوە بیستی، تێگەیشت کە سبەی کاتژمێر حەوتی شەو، لیزاڤێتا، خوشکی پیرێژنەکە و تاکە هاوماڵی، لە ماڵەوەدا نابێت و لە ئەنجامدا، پیرێژنەکە کتومت کاتژمێر حەوت لە ماڵەوە بە تەنیایە. هەر دەڵێیت ئەم ڕووداوەی کە لە خۆیدا شتێکی بێبایەخ و لاوەکییە، وەک بڕیارێک بەسەر ڕاسکۆلنیکۆفدا

ســـەپا و بـووە چـارەنـووســـــی... گەڕایەوە بـۆ مـالـێ. وەک مەرگبەسـەرداسـەپێندراوێک چووە ژوورەکەیەوە، بیری لە هیچ شـتێک نەدەکردەوە و هەر نەشـــیدەتوانی بیر بکاتەوە، بەڵام کتوپڕ بە هەموو بوونییەوە هەســـتی کرد کە ئیدی نە ئازادیی بیرکردنەوەی هەیە و نە ئازادیی کردار و هەموو شـــت لەپڕێکدا بڕێندراوەتەوە. تەنانەت بە لەبەرچاوگرتنی ئەو نەخشـەیەش، ئەگەر ساڵەهای ساڵی یەک لەدوای یەکیش ناچـار بـا چاوەڕوانیی دەرفەتێکی شـــیاو بکـات، هەر ڕێی تێنەدەچوو بەم جۆرە لە سەرکەوتنی کارەکەی دڵنیا بێت:

> هەڵبەتە ئەگەر سـاڵ تا سـاڵیش چاوەڕوانیی کاتێکی گونجاوی بکردبا و نەخشـــەکەشـــی ئامادە با، هەر بڕوای نەدەکرد کە وەها هەلێکی شـــازی بۆ جێبەجێکردنی نەخشـــەکەی بۆ بڕەخســـێت. هەرچۆنێک بووە، دژوار بوو ڕێک ڕۆژێک پێشـتر، بەو وردییەوە و بەوپەڕی ریســـککردنەوە، بەبێ پێویســـتکردن بۆ لێکۆڵینەوە و پرســـیارکردنێکی گومانبزوێن، لەوە دڵنیا بێتەوە کە ســـبەینێ، لە فلانە کاتژمێر، فلانە پیرێژن کە پیلانی کوشتنی دانراوە، لە ماڵەوە بە تەنیا دەبێت.

ئەمە کرۆکی شـــەنوکەوکردنی دەروونشـــیکـارانەیە. حەقیقەتی ڕاســـکۆڵنیکۆف لە نـاخی کەســـــایەتییەکی زینـدووی واقعیەتێکی بەرهەسـتدا، هەواڵی ڕوودانی پێشـهاتێک ڕادەگەیەنێت و هەر ئەمەشـە کە ســـیمایەکی ڕوونی ڕاســـکۆڵنیکۆف دەخاتە بەردەم ئێمە، کە هەر دەڵێیت بە ســەرنجێکی ئەندازیاریانە کێشـراوە. سـیمای ڕاسـکۆڵنیکۆف بەم جۆرەیە: گەنجێکی سیسەڵە، بە شێوەیەکی نەخۆشانە هەستیارە و زوو دەکەوێتە ژێر کـاریگەرییەوە، بە تونـدی وا لەژێر گوشـــــاری هەلومەرجی جۆراوجۆردا، لەژێر کـاریگەریی ئەنـدێشـــەیەکی ئەشـکەنجاوی و ســـەیردا کە خۆی بە بلیمەت و بوونەوەرێکی ناوازە دێتە بەرچـاو و لە هەر هەنگـاوێکـدا کە دەینێـت، بە شـــێوەیەکی خۆڕسکانە و خۆنەویستانە هەست بە هەڵەکەی خۆیشی دەکات، بەڵام

ئەو توانایەی نییە کە لەژێر کۆنترۆڵە جادووییەکەیدا خۆی ئازاد بکات. یەکەمین جووڵەی زەینی بەخۆناز و بەفیز و پەشێوی ڕاسکۆڵنیکۆف دوورکەوتنەوەیە لە کۆنەپەرستی و دواکەوتوویی و لە ئەوەڵین هەنگاوەکانیدا بەرەو گەشەکردنێکی سەربەخۆ، لە بازنەیەکی سنوورداردا گیرۆدە و نغرۆ دەبێت، بازنەی سنوورداری تیۆرییە ناتەباکەی، کە تا کۆتاییش ناتوانێت لێی دەربچێت و ئەم کۆتە لە ملی خۆی بکاتەوە. گەر سەیرێکی تیۆرییەکەی ڕاسکۆڵنیکۆف بکەین، دەبینین هەتا بڵێیت سنووردارە، کەواتە بۆ ئاگاداربوون لە چەندوچۆنیی کاتێکی زۆرمان لێ نابات.

یاسای سرووشت بە گشتی مرۆڤەکانی کردوون بە دوو دەستەوە، دەستەی عەوام کە وەک دەڵێن چییەتییەکی ماددی و ڕووەکییان هەیە و تاکە ئەرکیشیان خستنەوەی وەچەیە، دەستەی دووەمیشیان مرۆڤە ڕاستەقینەکانن کە توانا و لێهاتووییەکیان هەیە و قسەیەکی تازەیان پێیە بۆ گوتن. لەنێو ئەم دوو دەستەیەوە دەکرێت هەزاران دەستەی بچووک جیا بکەینەوە، وەلێ جیاوازییە سەرەکییەکانی ئەو دوو دەستەیە زۆر ڕوونن. گەر بە گشتی لێی بڕوانین، دەستەی یەکەم ئەوانەن کە پارێزکارن و پابەندی یاسا، بە درێژایی تەمەنیان بەرفەرمانن و چێژ لەم بەرفەرمانییە دەبەن. بە ڕای من ئەوان ناچاری ئەم ژێرفەرمانییەن، چونکە وەک ئەوە وایە کە هۆکاری بوونیشیان هەر ئەمە بێ و بە هیچ شێوەیەکیش لە پێگەیان کەم ناکاتەوە. وەلێ دەستەی دووەم ئەوانەن کە بە ئاسانی یاسا ژێرپێ دەنێن، یان وێرانکەرن یان ئارەزووی وێرانکردنیان هەیە، جا ئەوە پەیوەندیی بە توانا و لێهاتووییانەوە هەیە. ئەو تاوانانەی کە دەیانکەن ڕێژەیین و چەندان جۆری جیاوازیان هەیە و زیاتریش بە ڕێگەگەلی جیاواز خوازیاری لەناوبردنی ئێستەن لەپێناو داهاتوویێکی باشتردا. وەلێ ئەگەر ناچار بن لەبەر خاتری بیروبڕواکەیان بەسەر تەرمی کەسێکدا هەنگاو بنێن یان تەنانەت لافاوی خوێن هەستێنن،

باکیان نییە و چاکیش ئەم کارەیان لەدەســـت دێ، یانی لە ناخیانەوە و لە قوولایی بوونیاندا مۆڵەتی ڕامالینی بەربەستەکانی سەر ڕێگەیان بە خۆیان دەدەن.

ڕاسـکۆڵنیکۆف مرۆڤەکانی بەســەر دوو دەســتە (مرۆڤە ڕیزپەڕ و مرۆڤە ئـاســـاییەکـان)دا پۆلێن کردوون، لە بنەڕەتـدا مرۆڤەکـان و نامرۆڤەکان (شــتێکی هاوشــێوەی ماددە): دەســـتەی یەکەم فکر و ئایدیاگەلێکیان هەیە و دەســـتەی دووەم تەنیا لە خزمەت دەســـتەی یەکەمدا بوونیان هەیە، وەک ماددەی خاو؛ ماددەیەکی پێویســـت و ناچارانە بۆ خســـتنەوەی دەســـتەی یەکەم. ئەم پۆلێنکردنە، ســـەیر و ئێجگار ڕووکەشـــییە، بەڵام ئەو ئەنجامەی کە لێی دەکەوێتەوە زۆر ســەیرترە. ئەگەر ڕاسـکۆڵنیکۆف بڕیاری بدابا دەبێت دەسـتەی یەکەم بۆ خۆیان بژین و دەســـتەی دووەمیش بۆ یەکەم دەســـتە، ئەوســـا ئەنجـامەکە تـا ڕادەیەک لەئـاســـت ڕوونکردنەوەدا دەبوو، بەڵام ئەنجامگیرییەکەی ئەو سەد لە سەد پێچەوانەی ئەم بابەتەیە. دەستەی یەکەمی ڕاسکۆڵنیکۆف بۆ دەستەی دووەم دەژین و بۆیەش مرۆڤن و لە نـامرۆڤەکـان جیـان کە ئەو توانـا و پێگەیەیـان هەیە کە خودان و چاکسازی کۆمەڵایەتی و چاکەکاری دەستەی دووەم بن.

دوای ئەمە، ڕاســـکۆڵنیکۆف بە هاتنەناو مەیدانی هەق و ماف، ئەو چەمکەی کە لە بەرچاوی گرتووە، وەک خۆراک و تفاق بەسەر خەڵکیدا دەبەخشـێتەوە، جا ئەمەش بێباکانە و بە شـێوەیەکی سـەرانسـەری و گشتی. لە بابەتگەلی گفتوگۆکەشدا بە زانست دەپەرژێتە سەر پرسەکە. لەو شــوێنەی کە ژمارەی کەســەکان زیاترە، ماف شـتێکی ئەرێنی و ڕاستەقینەیە و، لەو شوێنەی کە ژمارەکە کەمترە، چەمکی ماف نەرێنی و وەهمی و خەیاڵی دەبێت و، هەر لەبەر ئەمەش، لە ڕاســـتیدا بوونی نییە. بە گشـــتی، دەکرێت ئەم هەموو قســـانە لە چوارچێوەی چەند وشـەیەکدا سـنووردار و پوخت بکەین: هەوڵدان بۆ ئەوەی سـیسـتمی

هاورێژەیی حیســــاب و بیرکاری بێنێتە ناو کایەی حەقیقەتی ئاکاری، بەڵام ئەم هەوڵەی نەکردەیی و ئەنجامنەدراوە، لەبەر ئەوەی چەمک پۆلێن ناکرێت. مافی کەسێکی دوورەپەرێز لەگەڵ مافی ملیۆنان کەسی دیکەدا چونیەکە، ئاخر لێرانەدا خۆ دوو ماف بوونیان نییە، تەنیا یەک ماف بوونی هەیە و ناکرێت لە لایەکەوە ئەو مافە بە کەسێک بدەین و لە لایەکی دیکەوە بەوانی دیکەی نەدەین. دژیەکیی ڕاسکۆڵنیکۆف بەر لە هەر شــــتێک ئەبەم *پۆلێنەکراوییەی* چەمکـــــــەوە گرێ دراوە. ڕاسـکۆڵنیکۆف سـەد جار بۆ خۆی پرسـێک دەخاتە بەر باس و هەر ســـەد جارەکەش کتومت دەکەوێتە بازنەیەکی داخراوەوە کە ناتوانێت لێی دەرچێت: کەوتنە نێو ئەندێشـــەگەلێکی لێکدژەوە. لە خەیاڵیدا، ناپلیۆنەکان ڕادەبوورن کە ڕێگەکەیان بە خوێن خۆش کراوە، بیر لەو تاجانە دەکاتەوە کە نراونەتە ســـەریان، بەڵام ئەمە تەنیا لایەنێکی باســـەکەیە. لە لایەکی دیکەوە، ئەو خوێندکارێکی ئێجگار هەژارە بە ناوی ڕاســـکۆڵنیکۆف کە تەنانەت بە فەرمی ئەو مافەشـــی پێ ڕەوا نابینین کە پیرەژنێکی تەڵەکەچی و بێنرخ بکوژێت، گەرچی ئەو بەڵێن بە خۆیشی دەدات بە چاکەکاری قەرەبووی ئەو یاسابەزاندنە هیچەشی بکاتەوە. باشـە، ئەی لێرانەدا دادپەروەری چیی بەسـەر دێت؟ بەڵێ، وا دیارە لێرانەدا دادپەروەرییەک لەئارادا نییە و ئێمەش ناتوانین ببینین کە ڕاســـکۆڵنیکۆف ناکۆکی و دژبەری لە چیدا دەبینێت. نە لەوەدا کە ناپلیۆنەکان کردوویانە و نە لەوەشـــــدا کە خۆی ئەنجامی داوە، دادپەروەری و ویژدان لەئارادا نییە. ئەوە خەڵک بوو کە تاجی لە سەری ناپلیۆنەکان نا و هەر لەبەر ئەو کارەش ڕاسکۆڵنیکۆف بە کەم و ســووکایەتییەوە لەو خەڵکە دەڕوانێت. ئەی ئەگەر خەڵکی بهاتبان و لەبەر ئەو قسە ڕەقانەی تاجیان لەسەر بنابا، ئایا ئەمە دەبووە هۆکاری کەمبوونەوەی ســووکایەتیپێکران؟ یان ئەوەی کە ئەو هەر بە ڕاســتی لای وایە ئەو تاجەی کە نراوەتە سەری بلیمەت و مرۆڤە ڕیزپەڕەکانی مێژوو لەبەر خاتری کۆمەڵێک چاکەکاری بووە کە لەبەرانبەر خەڵکیدا

کردوویانە؟ ئەمە گەلێک ساویلکانەیە و ئێمە گەرچی ڕاسکۆلنیکۆف بە بوونەوەرێکی سنووردار دەزانین، بەڵام وا دەر ناکەوێت تا ئەم ڕادەیەش ساویلکە بێت.

ئەوەی کە گوتمان، ڕاپۆرتێکی یەکپارچە و پێکپەیوەست بوو لەبارەی ئەوەی کە ڕاسکۆلنیکۆف لە چ ڕێگەیەکەوە گەیشتە کردار و بە داخەوە لە ئامادەکردنی وەها شێوەڕاپۆرتێکدا نەماندەتوانی ئاماژە بە هەموو بابەتەکانی بەردەست بکەین، ئاخر قەبارەیان گەورەیە و شەش بەشی بەرهەمەکەی دۆستۆیڤسکی لە خۆ دەگرن. بەر لە هەر شتێک بە لەبەرچاوگرتنی زنجیرەییبوون و پێکپەیوەستیی بابەتەکە دەبوو شتێک هەڵبژێرین کە بەپێی بۆچوونی ئێمە زیاتر لە حەقیقەتەوە نزیک بێت و بەو ئەگەرەی کە تا دەکرێت کەمتر لە یەکانگیریی بابەتەکەدا بەر لێکدژی بکەوین. بە تووشبوونی ئەم کردەوە بێباکانەیە، بەبێ هیچ نەرمینواندنێک دەبێت دووبارەی بکەینەوە کە دیدگەی نووسەر لەمەڕ مەتەڵە دەروونشیکارییە جێمەبەستەکەی، لە ڕەگە قووڵەکانی خۆیدا، دیدگەیەکی دروستە و دوای ئەوە، ئەم مافە بە خۆمان دەدەین کە پاش نرخاندنی وردی هەموو زانیارییەکان، هەمدیسان بێ هیچ مەرج و باکێک ئەو گومانانە ڕابگەیەنین کە بۆمان دەمێننەوە.

ئێمە هەرگیز نابێت ناکۆکییە تیۆرییەکان بێنینە ناو ڕاپۆرتەکەی خۆمانەوە. کەم نین ئەو جۆرە بیرکردنەوانەی کە بە مێشکدا دێن و هەرگیز ناشتوانرێت بەو ڕاستییەوە گرێ بدرێن کە لەئارادایە. نموونەگەلێک نووسراون کە لە تێکەڵوپێکەڵی و ئاڵۆزییەکی ئەوتۆدا نغرۆن و هەرگیز نەبوونەتە بەرچاوڕوونییەک. بەم پێیە، بە ئاسانی دەتوانین لەوە تێبگەین کە چۆن ڕاسکۆلنیکۆف هێشتی ئەو زیانە گەورەیە بەر ئەندێشەی بکەوێت و پیادەی بکات، بەڵام هێندە ڕوون نییە کە چۆن ئەم شاعیرهەست و هاملێتڕەنگە، ئەم خەیاڵپڵاوە

ترسنۆک و هەڵەشەیە، توانیی لە خۆیدا ئەو توانا پتەوە بدۆزێتەوە و بەرگی واقعیەت بە بەر ئەندێشەکەیدا بکات. ڕاسکۆلنیکۆف بە تەواوی ئاگاداری هەموو لایەنە ترسناکەکانی سەر ڕێگەی بوو، هەروەها باش ئاگاداری ئەوپەڕی ناشیرینی و چەپەڵیی کردەوەکەشی بوو. تەنانەت بیرکردنەوەی خێراش لەوەی کە چۆن تەورەکە بە دەستەوە دەگرێت و بەسەر سەری پیرێژنەکەیدا دەهێنێتەوە، پیس ئەوی دەشێواند و ئەشکەنجەی دەدا. ڕاسکۆلنیکۆف خۆی سەد جار دانی پیدا دەنێت کە پێشوەختە دەیزانی بەکردەییکردنی وەها ئایدیایەک تا چ ڕادەیەک لە دەرەوەی سنووری توانای ئەودایە و تەنانەت ئێمەش بڕوای پێ دەکەین و وای بۆ دەچین کە ئەنجامدانی وەها کردەوەیەک لە دەرەوەی توانای ئەودا بێت. ئەو مرۆڤانەی کە گیرۆدەی ئەو جۆرە بۆچوونە ئاگرین و هەستیارییە نەخۆشانانەیەن، بە زۆری تامەزرۆیی و ویستێکی لاوازبوویان هەیە. ئەوان هەمیشە پێشوەختە بە جۆرێک لە جۆرەکان ئەم هێزی تامەزرۆییە بە وەهمەکانی خۆیانەوە بەفیڕۆ دەدەن کە ئیدی لە کاتی کرداردا شتێکی وایان بۆ نەماوەتەوە. ئایا ڕاسکۆلنیکۆف کتومت مرۆڤێکی لەو چەشنە بوو، هەمان ئەو کەسەی کە لە سەرەتاکانی وەرزی یەکەمەوە بینیمان، ئێمە نەک هەر لە بوونی ئەودا ئاماژە و نیشانەگەلی دووجەمسەربوونمان نەدی، بەڵکە وەک مرۆڤێکی ڕاشکاو و لێبڕاو هاتە بەرچاومان؟ ئەم جۆرە تۆقین و لەهۆشخۆچوونە، ئەم بەراورد و هەڵسەنگاندنە قووڵ و ورد و شاعیرانە و تەنانەت لە هەندێک شوێندا تەنزاوییە و هەموو ئەو شتانەی کە بەسەریدا هاتن، لە کوێوە بەسەر ئەم مرۆڤەدا باریون؟ ئەوە کوشتن نییە کە بە هەموو نەگریسیی ئاشکرانەبووی خۆیەوە ئەوی کردە شاعیرێکی لەو چەشنە و، تەنانەت گەر پێچەوانەکەشی وێنا بکەین، ئەوە شاعیرێک نییە کە دەگاتە ئەو ڕادەیە لە نەگریسی. چەقبەستوویی ئەو بیرۆکە سنووردارە، زەینی پڕ لە گوڕوتین و دابڕاو، دەمارگیری و خوڕافەپەرستییەک کە هەموو حەز و تاسەی

خۆی لە بلێسەی ئایدیایەکی چەقبەستوودا چڕ کردووەتەوە، هەموو ئەمانە، دەیانتوانی ببنە سەرچاوەگەلی کوشتن و لادان و بەو جۆرەی کە دەبێت و دەشێت بابەتەکە بۆ ئێمە ڕوون بکاتەوە. لێرە و لەوێی دەقەکەشدا ئاماژە و نەرێساتیی (کینایە) زۆر هەن، بەڵام ئەمە سەرلەبەری بەسەرهاتەکە نییە و هەر بەو جۆرەی کە بە ڕووالەتی پرسەکەشدا دیارە، هەموو شتێک ڕوون نییە. تاکە خاڵێکی ڕوون کە دایمە بەری دەکەوین و کەم تا زۆریش ناکرێت ڕێ بە زەینمان بدەین گومانی لێ بکات، ئەوەیە کە ڕاسکۆڵنیکۆف شاعیرە. ئەمە تاکە تایبەتمەندییەکە کە هەموو لایەنەکانی دیکەی ئەوی خستوونەتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە و فەرمانڕەواییان بەسەردا دەکات. با جارێکی دیکەش ئەو خەونە بهێنینەوە بیر خۆمان کە شەوی بەر لە کوشتنەکە بینیبووی، با ئەو سیماگەلە درەوشاوە و تەلیسماویانە بیر بهێنینەوە کە وێنەی ئەو دۆخە بەرچاوە دەکێشن و ئەو گفتوگۆیەش لەگەڵ زامیۆتۆفدا و ئەو تەنزە وردەی کە لەڕێیەوە گاڵتە بە هەڵەکانی خۆی دەکات. خەونەکەی ڕاسکۆڵنیکۆف ڕاپۆرتێکی دروست و ڕاستەقینەیە لەبارەی هەستەکانی و ئەوەی کە لە چ بارێکدایە و، دواجار، هەڵسەنگاندنی وردی خۆڕسک (غەریزی) و بێخەوشی ئەوە لەبارەی مرۆڤەکانەوە هەر لە یەکەمین سەرنج و لە یەکەمین قسەدا. ئەرێ، ئەگەر هەموو ئەمانە بهێنینەوە یاد و جارێکی دیکەش بە سەرنجەوە لێیان بڕوانینەوە، بەم ئەنجامە دەگەین کە ڕاسکۆڵنیکۆف شاعیر بووە و، شاعیرێکیش، کەمتر لە هەر کەسێکی دیکە توانای ئەنجامدانی کردەوەیەکی هێندە توندوتیژانەی هەیە. ئەو هەستشاعیر و ستراتیبێژێکی عاشقە. لێرانەدایە کە پرسیارێک دێتە پێشەوە: ئەی ڕاسکۆڵنیکۆف چۆن توانیی خۆی لە وەها زەلکاوێکدا بگەوزێنێت و سەرەڕای تۆقێنەریی ئەو کردەوەیە -کە زیاتر لە هەر کەسێک بۆ خۆی ڕوون بوو- کەچی نەک هەر تەنیا توانیی گەلاڵەڕێژیی بۆ بکات و بڕیاری لەسەر بدات، بەڵکە هەر بە ڕاستی جێبەجێشی بکات؟ ئایا

ڕاسکۆڵنیکۆف ماوەیەک بەر لە ڕووداوەکە شێت بووبوو و دوای ئەوە بوو کە تا ڕادەیەک ئەقڵی هاتەوە شـــوێنی خۆی؟ یەکەم ئەوەیە کە، ئێمەی تەماشـــاڤان، تەنانەت بۆ یەک خولەکیش بەر لە تووشـــبوونی کوشـــتنەکە یان لە کاتی کردەوەکەدا، ئەومان لە بارێکی نائاگایانەدا نەبینیوە. دووەمیش ئەوەیە کە، ئەگەر پرســـی ئەنجامدانی کردەوەکە پەیوەندیی بە شێتییەوە هەبووبا، خۆ ئەوسا نووسەری ڕۆمانەکە لەم بارەیەوە هیچ گومانێکی بۆ ئێمە نەدەهێشـــتەوە. نەخێر، نووســـەری ڕۆمـانەکە وەهـا بۆچوونێکی نییە و چەنـد دێڕێکی بەشـــی کۆتـایی کتێبەکەش ئەم بابەتە پشـــتڕاســـت دەکەنەوە؛ بەوەی کە بە ئاشـــکرا تیۆریی بـاوی شـــێتی و دێوانەیی پچرپچڕ (کـاتی) دەداتە بەر گاڵتەجاڕی. جیا لەمانە، مانا و چییەتیی ســـەرەکیی بەشـێکی گەورەی ڕۆمان و یەکێک لە هۆکارەکانی ئەستووریی، ئەوەیە کە دۆستۆیڤسکی ویستوویەتی تاوانبارەکە هەتا قۆناغی پەشیمانی پەلکێش بکات. کەواتە گەر ڕاســـکۆڵنیکۆف شـــێت بووبێت نەک تاوانبار، ئەوا ســـەرلەبەری ئەمانە بێســـوود و زیادە دەردەکەون و تەنانەت بەری لە واتاش. بەم پێیە، هەرگیز نابێت بکەوینە نێو ئەم گێژاوەوە. دوای ئەمە، تەنیا یەک خـاڵی ڕێتێچوو لە بەرچـاوی ئێمەدا دەمێنێتەوە. دەبێت ئەگەری ئەوە دابنێین کە نووســـەر تا ئەو ڕادەیە تووشـــی هەڵە بووە کە نەیتوانیوە تـایبەتمەنـدییە ئـاشـــکراکـانی خۆی بە شـــێوەیەکی تەواوەتی لە ئافرێندراوەکەی –ڕاســـکۆڵنیکۆف– جیا بکاتەوە. دۆســـتۆیڤســـکی هەر بەو جۆرەی کە لە ڕووســـیای ئەو ســـەردەمەدا دەیانگوت، هێندەش بێنیاز و مەرام نەبوو. کەسـایەتیی خودی ئەو لە هەندێک شـوێندا بڵند و شـــــاعیرانەیە و لە برێـک جێـدا بە شـــێوەیەکی تەنزاویی دووبـارەنەبووەوە لە ڕاســـکۆڵنیکۆف و کردەوەکـانی دەڕوانێـت. تایبەتمەندییە کەسییەکانی نووسـەر دەڵێیت لەبەر گوڕوتینی شـەیدایی بۆ بەرهەمەکەی، هەستپێنەکراوانە لە جەستەی *دۆستۆیڤسکی*یەوە جیا بوونەتەوە و خزاونەتە جەســـتەی *ڕاســـکۆڵنیکۆف*ـــــەوە و لەگەڵ

رووداماڵراوی و بێباکیی تایبەتی ڕاســـکۆڵنیکۆفدا دەگۆڕێت بۆ ئەو، یانی نووسەر خۆی دەگۆڕێت و دەبێتە کەسایەتیی بەرهەمەکەی. ئەوە شـتێکی بەسـوودە بۆ تێگەیشـتنێکی باشـتر لە کەسـایەتییەکە، هەر بەو جۆرەی کە باوە و دەیڵێین، خۆمان بخەینە شـــوێنی ئەو، بچینە دۆخی ئەوەوە و بە دڵی خۆمان هەســـت بە هەلومەرجی ئەو بکەین و لەو هەستانەدا بژیین، بەڵام ئاخر، خۆ هەموو دڵێکیش ئەو دڵە نییە! ئەوەی کە هەسـتشـاعیرێکی وەک بەڕێز دۆسـتۆیڤسـکی هەسـتی پێ دەکرد، ئەگەر کتوپڕ بە جادوویێک بخرابا ناو باروودۆخەکەی ڕاســـکۆڵنیکۆفەوە، ئەوا ڕاسکۆڵنیکۆفی ڕاستەقینە ئاستەم بوو بتوانێت تەنانەت دەرک بە ڕەنگوبۆی ئەو هەستەش بکات و هەر نەشیدەتوانی دەرکی پێ بکات، خۆ ئەگەر بیتوانیبا ئەوا هەرگیز تووشی ئەو شوورەیی و ڕووقایمییە نەدەبوو. ئەمە هەڵە بوو، هەڵەیەکی بنەڕەتی، جا ئەگەر بۆ جارێکیش سـەلمێندرا، ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە چ ئاقیبەتێکی دەبێت، شـتێکی ئاسـتەم نابێت. شــرۆڤەکە، لە قووڵاییدا ڕاســتە، بەڵام بوولێڵێکی درۆیینەشـی تێکەڵ بوو و هەر ئەم بوولێڵە درۆیینەیەش فریشـتەیەکی پاسەوانی ڕەنگپەڕیوی بەسەر سەری ڕاسکۆڵنیکۆفەوە دانیشاندووە کە بە هیچ شـێوەیەک لە ڕووخسـاری ئەم مرۆڤە ناچێت. ئەو هەر بە ڕاستی چ جۆرە مرۆڤێک بوو؟ لە بنەڕەتدا، دەرککردنی پرسەکە هێندە سـەخت نییە و هەر ئەوەندە بەسـە دووسـێ تایبەتمەندیی ئەو بۆ خۆمان دووبارە بکەینەوە و بیر خۆمانی بهێنینەوە. بیر خۆمانی بهێنینەوە کە بۆ نموونە ئەو لەبەردەم پۆلیسـدا چۆن سـووکایەتیی پێ دەکرێـت یـان لانیکەم ئەمە بیر بهێنینەوە کە بە درێژایی مـاوەی لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون تەنانەت یەک جاریش بەوە دڵگران نەبوو کە بەبۆنەی ئەوەوە کەسانێکی بێتاوانیان گرتوون و ئەوان لە ترساندا چەندین جار تا لێواری مەرگ ڕۆیشـتوون و ئەوەی کە ڕێی تێدەچێت زۆر بە سـادەیی بیاننێرن بۆ ئۆردوگای کاری زۆرەملێ. بە بۆچوونی ڕاسـکۆڵنیکۆف، ئەم پرسـانە، ئاسـایی بوون و تەنانەت ئەو پێشـیان

دڵخۆش بوو و تەنیا ترسی ئەوەی هەبوو کە ڕاستیی پشت ڕووداوەکە ئاشکرا ببێت و هیچی دی، بەڵام هەر ئەم کەسەیە کە هێشتا کاتێکی وا بەســەر ئەو جۆگەخوێنەدا تێنەپەڕیوە کە ڕشــتوویەتی، کتوپڕ ســەر هەڵدەهێنێت و لە بەرزاییەکی دەســـتپێەڕانەگەیشـــتووەوە لە هەموو شتێک دەڕوانێت. لە دڵیدا خەفەتێکی گیانسووتێن و بەسەر زمانییەوە هەجووێکی چزوودار هەیە. ئەمە ئیدی کوڕیژگەیەک نییە کە خوێندنەکەی بە نیوەچڵی مابێتەوە و لەتاو برســـییەتی بلەرزێت و لە چەپەڵیدا شــــەیتانی بەزاندبێت. ئەو دەبێتە هاملێت یان فاوســـتێکی هۆشــیار و کامڵ، کە لە دیدگەی جوانیناســییەوە بە تەواوی گەشــەی کردووە.

بەڵام بــا واز لە جوانینــاســـی بهێنین و بگەڕێینەوە ســـەر ڕۆمانەکەمان.

لە *تاوان و سـزا*دا، سـزایەک چاودێریی پاڵەوانەکە دەکات. ئەری، *چاودێری*، جا قەبارە و توانای ئەم وشـــەیە گەلێک کەمە، لەبەر ئەوەی هەرگیز لەئاسـت ئەو پەیوەندییە نزیکەدا نییە کە نووســەری ڕۆمـانەکە لەنێوان هەردووک لایەنی پرســـەکەدا خســـتوویەتییە بەردەم خۆی. بۆچی؟ چونکە ســـزاکە بەر لە ئەنجامدرانی تاوانەکە دەســـتی پێ کردووە. ســـزاکە لەگەڵ هاتنەئارای ئەودا زا و لەگەڵ ئەودا هەر بە تۆوی گەشــــەی کرد و هەراش بوو، بێ وەســـتان لەگەڵیدا هەنگاوی نا و لەگەڵ ئەو یەکەمین ئایدیایانەی کە لەبارەی تاوانەکەوە پەروەردەی کردن، شــانبەشــانی ئەو بە شــەقامەکانی پیتەربورگدا ڕێی دەکرد. ئەو ئازارانەی کە ڕاسکۆڵنیکۆف کێشـانی، دواجار، کاتێک کە ئیدی کار لە کار ترازابوو، لەچاو هێزی لاوازی ئەودا هێندە قورسـتر بوون کە ئێمە سـەرمان لەوە سـوور دەمێنێت کە باشــــە ئەو چۆن توانیی بەرگەیان بگرێت. هەر جۆرە ســـزا و

گوللەبارانێک لەچاو ئەم ئازارانەدا هیچ نییە. ئەمە سەدان جار لە گوللەبارانکردن خراپترە، ئەوە زووخاوی ئەشکەنجەیە و بەزەبرترینی ئێش و ئەشکەنجەکانە –ئێش و ئەشکەنجەی ئاکاری– جا چەندان جاریش زووخاو و ئەشکەنجە دەگاتە ئاستێک کە ئیدی بەرگەی نەگرێت و دەچێت تا خۆی ئاشکرا بکات و دانی پێدا بنێت، تا بەشکووم ئازارەکە کۆتایی پێ بێت، بەڵام بەسەرهاتەکە بە هەڵکەوت درێژە دەکێشێت.

کتوپڕ ئاراستەی بەسەرهاتەکە دەگۆڕێت. لە یەکێک لەو خولەکە ترسناکانەدا، کاتێک کە ڕاسکۆڵنیکۆف خراپ لە ژیان بێزار بووە، هەست دەکات لە مرۆڤەکانەوە دوور و نامۆیە –وەک ئەوەی بە مقەستێک ڕایەڵی پەیوەندیی ئەویان لەگەڵ هی هەمووان بڕیبێت و ئەویان جیا کردبێتەوە– جا ناتوانێت تەنانەت لەبەرخۆشییەوە ئەوە وێنا بکات کە بۆی هەیە لەنێوان ئەو و مرۆڤەکاندا شتێکی هاوبەش دەربکەوێت، ئەری، ڕێک لە یەکێک لە خولەکەکانی هەژاری و داماویدا، ناسیاوێک کە دوای ماوەیەکی کورت بە خێزانەکەشی ئاشنا بووە، یەکێک لە ژێ زیندووەکانی دەروونی دەهێنێتە دەنگ و ڕاسکۆڵنیکۆف چاکەیەک دەکات. چاکەیەکی بچووک کە ئەسڵەن بایەخێکی ئەوتۆشی نییە، بەڵام وەک تنۆکە ئاوێک دەچکێتە سەر لێوی وشکەوەبوو و تینووی تاوانبارە چارەڕەشەکە و چیرۆکەکەش ئەم خولەکانەی بە وردەکارییەوە بۆ وەسف کردووین. منداڵێکی پاک، کچۆڵەیەکی بێگەرد، لە پلیکان و باداکەکەدا خۆی دەگەیەنێتە ئەو، بە قسەگەلێکی ناپەیوەست و بێسەروبەر و منداڵانە، بەدەم نووزە و فرمێسکڕشتنەوە، بە چەند وشەیەک پێزانینێکی قووڵ و ڕاستگۆیانەی بۆ دەردەبڕێت و دەستە لاوازەکانی لەو دەئاڵێنێ و ماچی دەکات... ماچ... ئەو ماچ دەکات! بکوژ ماچ دەکات! ئەمانەش

کتوپڕ بە شـــێوەیەکی دۆشـــداهێنەر ڕۆح و گیانێکی تازە بەو دەبەخشـــنەوە. ئەمە یەکەمین خولەکی ئۆخژن –ئۆخژنێکی ڕاستەقینە– و یەکەمین ئاماژەیەک بوو بۆ ئەوەی کە هێشتا هەموو شـــتێک بۆ ئەو کۆتایی نەهاتووە، ئەوەش کە هێشـــتا لە ژیاندا شتگەلێک هەن کە تێیاندا هاوبەشە و جارێ بە تەواوی لە مرۆڤەکان دانەبڕاوە؛ ئای لەم هەســـتە بچووکانەی کە لەو خولەکانەدا لەودا دەورووژێن، چەندە پاک و چەندە باشن!

ڕێک دوای ئەمە، فریشـــتەیەکی دیکە بە ســـەکۆی نمایشـــەکەدا دەفڕێت! فریشـــتە، جەخار بۆ ئەو فریشـــتەیە! فریشـــتەیەک بە مۆڵەتنـامەی زەردەوە! ئەم فریشـــتەیەش، ســـۆنیـای بێوەی و میهرەبانە. دوای ڕاسکۆڵنیکۆف و لەسەر بنەمای چەمکی گێڕانەوە، ڕۆڵی یەکەمی ڕۆمانەکە بێ گومان هی ســـۆنیایە. ئەویش منداڵێکی چارەڕەشـــە، بەڵام ســـنگفراوان و دڵئاوا کە بۆ یارمەتیدانی خێزانە کڵۆڵەکەی خۆی دەفرۆشـێت. سـیمای خێزانەکەی مارمیلادۆف لە ڕیزی باشـترین برگەکانی ســـەرانســـەری ســـەردەمی نووســـەریی دۆستۆیفسکیدایە و بە تەواویش پەسەند کراوە و پشتئەستوورە بە بنەمای سەلیقەی ئەو.

ســـەرەڕای دیمەنی تۆقێنەری دۆخی مارمیلادۆفەکان و شـێوەی ئەشـــکەنجەدەری پەیوەنـدیی نـاتەبـای تـاکەکـانی ئەم خێزانە، کاریگەریی گشـــتیی ئەوان هێندە توند و پاکە و، ئەو هەوایەی کە لەم کاریگەریی و یادگارییەوە جێ دەمێنێت، هێندە ڕاســـتەقینەیە و دەرکێکی ئەوەنـدە قووڵی لەبـارەی حەقیقەتی مرۆڤەوە لێوە هەڵدەهێنجێندرێت و لەوێدا وەها عەشقێک بۆ مرۆڤ شـەپۆلانیەتی، کە دەکرێت بە بوێرییەوە بڵێین، خوێنەر، بەراورد بەو تاســـان و ترس و بێهیواییەی کە نووســـەر ناچاری کردووە لە باقیی ئەو

کاتەی ڕۆمانەکەدا تێیدا ویڵ بێت، لەو خولەکانەدا کە مارمیلادۆفەکان ئامادەن (تەنانەت بەو دیمەنانەشەوە کە ئەوپەڕی هەناسەساردیی ئەوانن) بە ئاشکرا چێژ دەبات و ئاسوودەیە. کاترینا ئیڤانۆڤنا ژنەپاڵەوانێکی ڕاستەقینەیە؛ شتێکی وای لە نموونەییبوون کەمتر نییە و وزەی ڕاستەقینەی ژن بەدەر لە بوونی ئەودا ناتوانێت ئاوها خۆی واقعیتر و بەرز و ڕوونتر بنوێنێت. چارەڕەشیی ئەوان داماوییەکی ناچارانە و هەناسەساردانەیە، بە مانای نەبوونی هەر پاڵپشتی و پشتیوانی و هەر جۆرە دڵنەوایی و هاوخەمییەک. ئەمە ململانێیە، ململانێیەکی هەرڕۆژە و لە هەر کاتژمێرێکدا، بەبێ خولەکێک ئێست و پشوودان، بەبێ هیواداربوون بە تۆزێک یارمەتی یان سەرکەوتن، ململانێیەک بەبێ پێشڕەوی یان پاشەکشێ، ململانێیەک تا دواهەمین هەناسە و تا دواهەمین ترپەی دڵ! ئایا کەسێکی وەک ڕاسکۆڵنیکۆف دەبوو هەستێکی تێدا بورووژێت کاتێک ڕووبەڕووی وەها ژنێک بووەوە؟ ئایا نەدەبوو لەبەرانبەر ئەو ژنەدا لە شەرمان ببێتە دڵۆپێک ئاو و لەئاست ئەودا خۆی وەک دەسرێکی چڵکن بێتە بەرچاو؟

لەبەرانبەر کاترینا ئیڤانۆڤنادا، مێردەکەی ئەومان هەیە کە توخمێکی تەواو جیاواز و ناکۆکە. باشە مارمیلادۆف چ نموونەیەکە و نووسەر لە کوێ ئەم بوولێڵ و ڕەنگانەی هێناون تا بتوانێت ئەویان پێ وەسف بکات؟ دوای ئەو هەموو هەوڵە درەوشاوانەی کە نموونەگەلێکی تەواویان ئافراند و دوای هەموو ئەوەی کە ئێمە خۆمان لە ژیان و ئەدەبیاتدا دیومانە، وا دیارە هەرگیز تا کاتی ڕۆمانەکەی دۆستۆیڤسکی، هەمیشەمەستێکی ڕاستەقینەمان بەرچاو نەکەوتبوو و هەرگیز نەماندەزانی دەکرێت مرۆڤ لەم ڕێگەیەدا ئاوها ڕۆبچێت و هاوکاتیش نەبێتە ئاژەڵێکی ڕاستەقینە و هەر

ڕۆحە هێژاکەی خۆی بپارێزێت و لە زەینیدا بیری ڕاســـتەقینەی مرۆڤانە تاو بدات، بەڵام دەبێت لەبارەی ســـۆنیاوە چی بڵێین؟ ڕووخساری ئەو بە تەواوی نموونەییە و پرس و کەڵکەڵە و پەیامی ئەم جۆرە نموونەیە بە شـێوەیەکی وێنانەکراو ئاسـتەمە، بەم پێیە، ڕەنگە تا ڕادەیەک ڕۆڵگێڕانی سـۆنیامان بەلاوە لاواز بێت. گەلاڵەی کەسـایەتیی سـۆنیا لە سـەرەتاوە باش و سـەرنجڕاکێش بوو، بەڵام ئەو کەموکوڕیی جەسـتەیی هەیە و وێڕای ئەوەی لە بەرچاوی ئێمەدایە، هەر دەڵێیت لەبەر هۆکارگەلێک ئەو نابینین. هەموو ئەو شـــتانەی کە لەبارەیەوە دەیانڵێن، بەپێز و پڕکاکڵن و زۆر زیاتر لەوەی کە خۆی لەبارەی خۆیەوە دەیڵێت، ئەو نیشـــان دەدەن و دەیناسـێنن. پەیوەندیی ئەم نموونە تایبەتە لەگەڵ ڕاسـکۆڵنیکۆفدا بە تەواوی ڕوونە. سـۆنیا تاکە کەسـە لەنێو کەسـانی چواردەوری ڕاسـکۆڵنیکۆفدا کە ئەو دەوێرێت لەبەرانبەریدا دەمامکەکەی لاببات، تاکە کەس بوو کە ڕاسکۆڵنیکۆف دەیتوانی لە دەروونیدا پاڵپشتییەک پەیدا بکات و پەناگەیەکی تێدا بدۆزێتەوە. هەڵبەتە ڕاسـکۆڵنیکۆف زۆر زوو توانیی دەرک بکات تا چ ڕادەیەکی ئاشـکرانەبوو ئەم ژنە لە گشـت لایەنێکەوە لە سـەرووی ئەوەوەیە. ڕاسـکۆڵنیکۆف لە بارێکدا کە هەر وا بەرەو پێش دەچین، دەرک بەوە دەکات و ئەو کاتەش کە تێدەگات ئەم ژنە کێیە، ئیدی لەبەردەمیدا دەکەوێتە سـەر ئەژنۆ و بۆ تاهەتا ڕۆحی دەسپێرێتە ئەو.

بەڵام هەموو ئەمـانە لە ڕۆمـانەکەی بەردەممـانـدا، لەچـاو تایبەتمەندییە بەهێز و ڕەسـەنەکانی بەشـگەلی دیکەی گێڕانەوەکەدا گەلێک لاواز و بێهێز و ژاکاو و ڕەنگپەڕیو دێنە بەرچاو، گەرچی لە خۆشیاندا درەوشاوەن. ئەمەش یانی بابەتی نموونەییبوون چووەتە جەســـتە و خوێنی ڕۆمـانەکەوە و هەر وا بۆ ئێمە لە تەم و

تاریکییەکی دووردا ماوەتەوە. با بە شێوەیەکی پوختتر بڵێین، هەموو ئەوەی کە باس کرا، شتێکی کاڵ و هەستپێنەکراوی لێ دەرچوو.

تەنیا رووخسارێک دەمێنێتەوە کە لە هەموویان درەنگتر لە سەکۆکەدا دەردەکەوێت، بەڵام سەرەڕای بوونی خەرمانەئاساشی، رووخسارێکی سەرنجڕاکێشیشە: سڤیدریگایلۆف. لەبارەی ئەم کەسایەتییە نامۆیە و ئافراندنییەوە ناتوانین هاوەڵناوی کاڵ و هەستپێنەکراو بەکار ببەین. ئەو بە پێچەوانەی کەسایەتییەکانی دیکەوە، ئێجگار تۆخ و جۆراوجۆر و لە ئاستێکی بەرزدا تایبەتە. تاکە داخی ئێمە ئەوەیە کە نووسەر، زۆر بە پەلە وێنەی سڤیدریگایلۆفی کێشاوە و بە تەواوی رۆڵێکی لاوەکیی داوەتێ. سڤیدریگایلۆف زۆر خشکە و کەنارگیر دێتە ناو رۆمانەکەوە؛ دەروونی ئەو مەتەڵگەلێکی زۆری تێدایە و تەنانەت واقعیەتی پەیوەندیی لەگەڵ دونیای خوشکی راسکۆڵنیکۆفدا، هێندە روون نییە. هەستی ئەو بۆ ئەم کچە تا کۆتایی رۆمانەکە بۆ ئێمە ناڕوون و سەیر دەمێنێتەوە، دیار نییە کە ئایا ئەوە تەنیا کەفوکوڵێکی وشک و ئاژەڵسیفەتانە بووە یان ئەوەی کە شتێکی لەوە پاکتر لەئارادا بووە؟ هەڵبەتە گریمانەی پەیوەندییەکی قووڵ و پاک زیاتر رێی تێدەچێت، چونکە پەردەی سەرزەنشت لەسەر بارودۆخی زیادەڕۆییتێداکراوی سڤیدریگایلۆف لادەچێت و تەنانەت سیمایەکی مرۆڤانە دەدرێتە ئەو دەموچاوە نامرۆڤانەیە. دیمەنی رووبەڕووبوونەوەی ئەو لەگەڵ خوشکی راسکۆڵنیکۆفدا، کاریگەرییەکی هاوتوخمی میلۆدرامی هەیە، بەڵام لێرانەشدا سووچی ئەو نییە. گەر دیمەنێکی زیندووتر بخرابا شوێنی ئەم وێنانە، ئەوا هەموو شتێ: باشتر و سەرکەوتووئامێزتر دەردەچوو.

زۆربڵێی سڤیدریگایلۆف لە دیدارەکانی نێوان ئەو و ڕاسکۆڵنیکۆفدا فرە باش شـــێوەی ئەوی ئاشـــکرا کردووە و بەو هەموو پانتاییە ســـەیرەیەوە بە خاســـی ئاوێتەی ڕۆمانەکەی دەکات و ئێمەی خوێنەران لەم خولەکانەدا کە ڕاســـکۆڵنیکۆف هۆشـــی پەرپیوە و پەستە، پشووێک دەدەین. هێز ڕوو لە هەر لایەک بکات، ئیدی هێزە و ناتوانین بە تەواوی نکۆڵیی لێ بکەین؛ نەک ئەوەی بێین و لەگەڵیدا ببینە هاوخەم و هاوسرووشت، بەڵکە بە شێوەیەکی خۆنەویستانە ڕێزی لێ دەنێین. سڤیدریگایلۆفی تەڵەکەچی و بەدخواز کە خۆی بە پیرێژنێک دەفرۆشـــێت، دوای ئەوەی پیرێژنەکە کۆنترۆڵ دەکات، ئیدی ئامادەیە هەر گەنجی و چالاکی و تازەییەک لەنیو بەرێت. ڕاســـکۆڵنیکۆف دەبێت تا چ ڕادەیەک لە دیدی ئێمەوە نزم بێت کە ئێمە نەک هەر لە ســـڤیدریگایلۆف بە چەپەڵتری بزانین، بەڵکە لەو جاڕزکەرتریش بێتە بەرچاومان. چەنەبازییەکانی ئەو لەبارەی جوانیناسییەوە لە کاتی دواهەمین گوتوبێژیدا لەگەڵ سڤیدریگایلۆف و ئەو شێوازە بێشەرمانە و نیوەتەنزییەی کە سڤیدریگایلۆف لەگەڵ ئەودا بەکاری دەبات، هەمووی پڕە لە تەنزێکی بێخەوش و ڕەســـەن... تایبەتمەندییە خوڕافییەکان لە وەها کەســـایەتییەکدا بە تەواوی لەئاســـتی تێگەیشـــتندان، لە کەســـایەتیی ئەودا دڵئاواییش دەبینین و دەرک بەوەش دەکەین کە ئەو مرۆڤێکە جـارووبـار دەتوانێت سەرگەرمکەر بێت. ئاخر هەر لە بنەڕەتەوە لای وا نییە کە ئەو کەسـێک بێت جگە لە خراپە و چەپەڵی هیچ شـتێکی دیکەی لێ نەوەشـــێتەوە، بەڵام ئەوەی کە بە ناڕوونـی دەمێنێتەوە، خۆکوشتنەکەیەتی. مەسەلە ئەوە نییە وەها ڕووداوێک بە ڕێتێنەچوو بزانین، بە پێچەوانەوە زۆریش ئەگەری وەها شـــتێک هەیە، بەڵام لەنێوان ئەو و کەســـــایەتییەکانی دیکەدا مەودایەک هەیە کە ئەم بۆشـــاییە هەرگیز پڕ نابێتەوە. ئێمە تەنیا دەمانتوانی لای خۆمانەوە

سۆسە بکەین کە سڤیدریگایلۆف چۆن دەگاتە قۆناغی خۆکوشتن، بەلام نووسەر هیچ بەلگە و سەرچاوەیەکی نەهێشتووەتەوە کە پالپشتیی سۆسەکانی ئێمە بکات و یارمەتیمان نادات، بەم پێیە، هیچ پێویستیش ناکات ئەم خالە تایبەتییە ڕوون بکەینەوە و بگەینە ئەنجامێک.

١٨٦٧

# فەلسەفەی دەسەڵات لە تاوان و سزادا

ییکاترینا پۆستنۆکاڤا، زانکۆی ماگنیتاگۆرسک

چەمک و ئایدیای دەســـەڵات دیارترین چەمکی نێو ڕۆمانی *تاوان و سـزا*یە. پاڵەوانی ســەرەکیی ڕۆمانەکە، ڕۆدیۆن ڕاسـکۆڵنیکۆف، دیلی ئایدیای دەســـەڵاتە. هیگڵ لە فەلســـەفەی ســـەدەی نۆزدە و لە کتێبی *دیاردەناســـیی ڕۆح*دا[1] (١٨٠٧) بەرجەســـتەترین تیۆریی دەســـەڵات دەخـاتە بەر بـاس. وەرزی چوارەمی ئەم بەرهەمە تـایبەت کراوە بە توێژینەوە لە پەیوەندیی لێکدژی نێوان ئاغا و کۆیلەوە. بەپێی ئەوەی کە هیگڵ دەیڵێت، مرۆڤ هـاتە دونیـا و لە مێژوودا یەکەمین ململانێ ســەری هەڵدا و دەرەبەگ و کۆیلەی هێنایە ئارا. ئەمە یانی مرۆڤ لەو مێژووە بەدواوە یان دەرەبەگ بووە یان کۆیلە و ئینســانەکان تەنیا لە کات و شــوێنێکدا باســی لێوە دەکرێت کە مشــتومڕی ئاغا و کۆیلە لەئارادا بێت. مێژووی مرۆڤ، مێژووی هەڵســوکەوتی ئینســـانەکان لەگەڵ یەکدی و کار و کاردانەوەی ئەوانە لەگەڵ ســـرووشـــتدا، لە

---

١. *دیاردەناســـیی ڕۆح* یان *دیاردەناســـیی هۆش* لە گرنگترین بەرهەمەکانی هیگڵە. دەکرێت ئەم بەرهەمە بە یەکەمین کتێبی هیگڵیی هیگڵ ناو ببەین کە تێیدا بە تەواوی لە چوارچێوەی هزری پێشـــینانی، بەتایبەت *کانت* و *شـــلینگ* دەرچووە و وەک فەیلەســـوفێکی خاوەنڕێباز ئەو نیشـــان دەدات. *دیاردەناسـیی هۆش* هەڵگری وەها سیستەمێکی فەلسەفیی قووڵە کە تەنانەت ئەگەر هیگڵ، بێ لەوە، هیچ کتێبێکی دیکەی نەنووســـیبا، ئەم کتێبە ئەو بایەخە ئەوتۆیەی هەبوو کە هیگڵ بکاتە فەیلەســـوفێکی گەورە. «و. ف»

راســــتیدا مێژووی پەیوەندیگەلی کۆیلە ڕەنجبەرەکانە لەگەڵ ئاغا شەڕانییەکاندا.

فەلســـــەفەی هیگڵ کاریگەرییەکی قووڵی لە پێکهاتنی فەلســـــەفە و هزری ســـیاســـی-کۆمەڵایەتیی ڕووســـیدا هەبووە. ســـەرەڕای ئەمە، بێداری و خۆئاگایی نەتەوەیی ڕووسی، هاوکاتە لەگەڵ ئەو سەردەمەدا کە ڕووسەکان پەییان بە فکری هیگڵ برد. بە دڵنیاییەوە دۆستۆیڤسکی ئاگاداری ئایدیا فەلسەفییەکانی هیگڵ بووە و هەندێک لە بەرهەمەکانیی بە زمانی یەکەم خوێندبوونەوە و، لە لایەکی دیکەوە، هاوڕێ نزیکەکانی ئەو، کەسانی هیگڵیی وەک *ستراخۆف*یان تێدا بوو. لێکۆڵەران لەســـەر بنەمای ئەم بەڵگانە ئەوە پشتڕاست دەکەنەوە کە ناکرێت دۆستۆیڤسکی (گەر ناڕاستەوخۆش بێت) ئاگاداری ئەو تیۆرییەی هیگڵ نەبووبێت کە لە *دیاردەناسـیی هۆش*دا پەرژاوەتە ســـەری. وەرن با ئەم لێکدژییەش بخەینە بەر باس کە تەنانەت گەر دۆســـتۆیڤســـکیش ئاگاداری تیۆریی دەســـــەڵاتی هیگـڵ نەبووبێـت، ئەوا هەر نـاکرێـت ڕاســـکۆڵنیکۆفی خوێنـدکـاری پێگەویســـــت و دەســـــەڵاتخوازی زانکۆی پیتەربورگ، ئاگاداری نەبووبێت؛ وەک چۆن لێکۆڵەر پۆرفیری پیترۆڤیچیش دەرک بەمە دەکات. چەمکی لێکدژیی ئاغا-کۆیلە هێڵی پەیوەســـتە بە چەمکی بنیادیی *خەڵکی ئاسایی* و *مرۆڤە ڕیزپەڕە سەرپشکەکانی* تیۆرییەکەی ڕاسکۆڵنیکۆفەوە.

لە ســیســـتمی فەلســـەفیی هیگڵدا، دەرەبەگ و کۆیلە، دوو دەســـتەی دژبەری ئاگایین، لە *دیاردەناسیی ڕۆح*دا دەخوێنینەوە:

> ئەم دووانە، دوو شـــێوەی دژبەر لە ئاگایی ڕوون دەکەنەوە: دانەیەکیان ئاگاییەکی جودا کە شـــوناســـێکی ســـەربەخۆ و ئەوی دیکەیان ئاگاییەکی وابەســـــتە کە شـــوناســـی لە ژیان و بوونی ئەوی‌دیکەدا مـانـا پەیدا دەکـات: یەکەمینیان ئـاغـا و دووەمیـان کۆیلەیە.

گرنگترین جیاوازیی نێوان ئاغا و کۆیلە ئامادەبوونە بۆ خستنەمەترسیی خودەوە لەپێناو بەدەستهێنانی کەسایەتیدا. لەگەڵ ئەمەشدا، کەسێک کە توانای سەرکەشیکردنی نییە، تەنیا بە شێوەیەکی وابەستە دەکرێت ببێتە خاوەنی کەسایەتی. تاکێک کە ژیانی ناخاتە مەترسییەوە، کەسایەتیی هەیە، بەڵام شایەنی پێرەوابینینی مانای راستەقینەی ئەم وشەیە نییە و ناکرێت وەک بوونێکی سەربەخۆ و خۆئاگا بناسرێت. هەر کەسێک دەبێت تا ئەم ئاست و رادەیە ئەوانی دیکە بەرەو مەرگ ببات و لەم رێگەیەدا ژیانی خۆیشی بخاتە مەترسییەوە، ئاخر ئەوی‌دی هێندەی خۆی بۆ ئەو گرنگ نییە.

چییەتیی وجوودیی کۆیلە، ترسانە لە گیانی خۆی. لەم بارەیەوە لای هیگل دەیخوێنینەوە:

> بەڵام کۆیلە بە ئاگاییە وابەستەکەی، تەنیا لەبەر ئەم یان ئەو هۆکارە تایبەتییە و لەم یان لەو قۆناغە جیاوازەی کاتدا ترسی ئەزموون نەکردووە، بەڵکە بە حوکمی سرووشت و چییەتیی خۆی ترسی چەشتووە، ئاخر سرووشتی ئەو، لە مەرگ -وەک خودانێکی رەها- ترقیوە. ئەو لەتاو ئەم ترسە لە ناوەوەدا لێک هەڵدەوەشێ، رەگوریشە و بنیادی بوونی و هەر شتێک کە لەودا پتەو و جێگیر بووە، دەکەوێتە لەرزین.

لەجێی خۆیەتی چەند تایبەتمەندییەکی ئەو دوو دەستەیە بهێنینەوە یاد کە پاڵەوانەکەی دۆستۆیفسکی مرۆڤایەتیی بەسەردا پۆلێن کردوون:

> دەستەی یەکەم ئەوانەن کە پارێزکارن و پابەندی یاسا، بە درێژایی تەمەنیان بەرفەرمانن و چێژ لەم بەرفەرمانییە دەبەن. بە رای من ئەوان ناچاری ئەم ژێرفەرمانییەن، چونکە وەک ئەوە وایە کە هۆکاری بوونیشیان هەر ئەمە بێ و بە هیچ شێوەیەکیش لە پێگەیان کەم ناکاتەوە. وەلێ دەستەی دووەم ئەوانەن کە بە

ئاســـــانی یاســـــا ژێرپێ دەنێن، یان وێرانکەرن یان ئارەزووی وێرانکردنیان هەیە، جا ئەوە پەیوەندیی بە توانا و لێهاتووییانەوە هەیە. ئەو تاوانانەی کە تووشیان دەبن ڕێژەیین و چەندان جۆری جیاوازیـان هەیە و زیـاتریش بە ڕێگەگەلی جیـاواز خوازیـاری لەناوبردنی ئێســـتەن لەپێناو داهاتوویێکی باشـــتردا. وەلێ ئەگەر ناچار بن لەبەر خاتری بیروبڕواکەیان بەســـەر تەرمی کەســێکدا هەنگاو بنێن یان تەنانەت لافاوی خوێن هەســتێنن، باکیان نییە و چـاکیش ئەم کارەیـان لەدەســـــت دێ، یانی لە نـاخیـانەوە و لە قوولایی بوونیاندا مۆڵەتی ڕامالینی بەربەستەکانی سـەر ڕێگەیان بە خۆیان دەدەن. هەڵبەتە ئەوەشـــتان لەبیر بێ کە پەیوەندیی بە ئەندێشە و ڕەهەند و گرنگییەکەیەوە هەیە.

بەم پێیە ڕاسکۆلنیکۆف نیشانەگەلی سەرەکیی کۆیلایەتی –کە هەر کۆیلەیەک دەبێت هەلگریـان بێت– دیـاری دەکـات، لە بـارێکدا بەپێی فکری هیگل، ئەم جادوولێکراوانەی ترس لە مردن (کۆیلەکان)، ژیانێکی ڕووەکی (کۆیلانە) هەڵدەبژێرن، یانی *بوونیان* لە جۆری ڕووەکییە و ئاغاکانیش، کە بە بۆچوونی هیگل بۆ بەدەســـــتهێنان دەســـــەلات و ناوبانگ ژیانیان دەخەنە مەترسـییەوە، دایمە هەم ئامادەی کوشـتنن و هەم ئامادەی کوژران. دووەمین دەســـتە پەیوەســـتن بە دەســـەلاتەوە. ئەوان دەســـــەلاتـدارەکـانن (یـان وەک هیگـل دەڵێـت: خواکـان)ن. ڕاسکۆلنیکۆف دەڵێت:

*نا کاکە، وا دیارە ئەوان لە توخمێکی ترن! بە هەموو مانایەک خودان، کە بێ کۆت و بەنـد مـافی کردنی هەر کـارێکیـان هەیە، تولو تالان دەکا، لە پاریســـدا دەیکاتە کوشـــتوبڕ، ســـوپاکەی لە میسردا جێ دەهێڵێ، کە لەشکرکێشی دەکاتە سەر مۆسکۆ، گیانی نیو ملیۆن خەڵک دەکێشێ و ئاخرییەکەشی لە ویلنۆ هەموو شتێ بەدەم پێکەنینەوە ڕایی دەکـا و جـا دوای مردنیشـــی بە یـادی ئەوەوە چەندان پەیکەر قوت دەکەنەوە! کەواتە هیچ نکۆڵیکردنێکی*

*تێدا نییە کە هەموو شتێ بۆ ئەوان ڕێپێدراوە! نا، هەر دەڵێی ئەم مرۆڤانە لە گۆشت و خوێن نین، ئەوان لە برۆنز دروست کراون!*

لێرانەدایە تێدەگەین کە ئایدیای دەسەڵات، ڕاسکۆڵنیکۆفی خستووەتە نێو چنگی خۆیەوە و پاڵنەری سەرەکی و هۆکارەکەشی بۆ کوشتن هەر ئەوەیە. ڕاسکۆڵنیکۆف خۆی لە گوتوبێژەکەیدا لەگەڵ سۆنیا دەرک بەم بابەتە دەکات، بیرمان نەچێت گوتوبێژێکە لە بۆچییەتیی کوشتنێک دەکۆڵێتەوە کە ڕاسکۆڵنیکۆف لێیەوە گلاوە: *چۆن ڕێگەتان بە خۆتان دا وەها کاری بکەن؟*

ئەم پرسیارە چەند وەڵامێکی ناکۆکی بەدوادا دێت، بۆ ئەوە کوشتم پێویستم بە *پارەکەی بوو*، لەبەر ئەوەی *دەمویست ببمە ناپلیۆن*، لەبەر ئەوەی *نیازم بوو یارمەتیی دایکم بدەم*، لەبەر ئەوەی *بڕیارم دا ببمە* خاوەنی *پارەی پیرێژنەکە و هیچ نەبێ چەند ساڵێکی ئەوەڵی زانکۆ بێ* نیگەرانکردنی *دایکم* بەسەر بەرم، بەڵام هەموو ئەم پاساوانە ڕەد دەکرێنەوە: *ئەمە هەمووی هەلیتوپەلیتە! هەلیتوپەلیتی ڕووت! نا، سۆنیا، وا نییە.*

لە کۆتایی ئەم گوتوبێژەدا، گرنگترین و تاکە هۆکاری ئەم تاوانە ئاشکرا دەبێت: *دەسەڵات*. ڕاسکۆڵنیکۆف تیۆرییە ڕەشەکەی کە بنەمای *ژیانی* بوو، ڕادەگەیەنێت:

*ئەمە یاسای سرووشتی مرۆڤە، سۆنیا... یاسایە! ئێستەش چاک دەزانم هەر ئەوەندە بەسە کە ڕۆح و زەینت بەهێز بن تا بتوانی بیانبەزێنی! کێ بوێرە ئەو کاکە و سەروەرە! ئەو کەسە دەکەنە یاسادانەری خۆیان، کە حسێب بۆ مرۆڤایەتی ناکا. دایمەش ئەو کەسە لەسەر هەقە کە زات و بوێریی زیاترە! لەوەتی دونیا دونیایە هەر وا بووە! مەگەر کەسێک کوێر بێ ئەم شتانە نەبینێ... سۆنیا، لەو ساتەدا بوو کە بۆم یەکلایی بووەوە دەسەڵات تەنیا و تەنیا هی کەسێکە کە دەوێرێ بچەمێتەوە و*

*بەسەر زەوییەوە بیرفێنی. پێویستیش ناکا هیچی تری هەبێ! نە تایبەتمەندییەکی بەرجەستەی دەوێ، نە لێهاتوویەتییەکی دەگمەن... تەنیا دەبێ بوێریت هەبێ!*

کێشمەکێشەکەی ڕاسکۆڵنیکۆف (ئایا منیش سەرپشکم یان سەر بە دەستەی یەکەم) لەم پرسیارەدا دەمەیێت: *لە خۆمم دەپرسی باشە تۆ هەر لە بنەڕەتەوە ئەو مافەت هەیە کە دەسەڵات بگریتە دەست؟*

لەبارەی ئەوەی کە دواهەمین ئەگەری بەرباسخراو لە زاری خودی پاڵەوانەکەوە –بە هەستێکی کاڵەوە– هۆکاری ڕاستەقینەی تووشبوونی تاوانەکەیە، ئەمە دەخوێنینەوە:

*ئاراستەی نیگای ڕاسکۆڵنیکۆف لە سۆنیا بوو، بەلام ئیدی بەلایەوە گرنگ نەبوو کە ئاخۆ هەر بە ڕاستی لە قسەکانی تێدەگات یان نا. سەرتاپێی لە تادا دەسووتا و لە لایەکیشەوە کەوتبووە بارێکی هەناسەساردانەی نێوان هۆشیاری و بێهۆشییەوە.*

ڕاسکۆڵنیکۆف، خۆی ئاشکرا دەکات: ئایدیای دەسەڵات یەخەی گرتووە، جادووی لێ کردووە و بەسەریدا زاڵ بووە. ئەو دەسەڵاتی دەوێت تا وەختێک کە بەلای ئەم هەموو پیسی و چەپەڵییەدا تێدەپەڕێت، *لێی بچێتە پێش و لەقەیەک بکێشێ بە هەموو شتێکدا و قڵپی بکاتەوە.*

با بگەڕێینەوە سەر تیۆرییەکەی هیگڵ؛ ئاماژە بەوەش بکەین ئەو تێگەیشتنەی کە لێی دەکەوێتەوە، بەرئەنجامی ڕاستەوخۆی ئەم تیۆرییەیە:

لەبەر ئەوەی پێشوەختە دیاری نەکراوە کێ لە ڕۆڵی ئاغادا فەرمان بکات و کێش لە ڕۆڵی کۆیلەدا ملکەچ بێت، کەواتە هەر کەسێک لەوەدا سەرپشکە کە کامەیان هەڵبژێرێت.

هەر مرۆڤێکی تیفکر دەتوانێت لە فەلسەفەی هیگلیشدا ئەم ئەنجامە هەڵبهێنجێنێت. ڕاسکۆڵنیکۆفیش کە خۆسەرانە و بەوپەڕی ئازادییەوە لە شەوانی سامناکی پیتەربورگدا سەرقاڵی ئەزموونکردنی تیۆرییەکەی خۆیەتی، هەر بەم ئەنجامە دەگات. بە بۆچوونی ئێمە، بەسەرهاتی ڕاسکۆڵنیکۆفی خوێندکار، بەسەرهاتی هەوڵدانی ئەوە بۆ بوونە ئاغا و لە پێگەی ئاغاشدا بە فەرمی بناسێندرێت.

پاڵەوانەکەی دۆستۆیفسکی بڕوایەکی پتەوی بەوە هەیە کە ڕەچەڵەکی مرۆڤ بەسەر دوو دەستەدا پۆلێن دەکرێت و هەر لەبەر ئەم هۆکارەش، لە ڕێگەی بەدەستهێنانی شوناسی خۆی و شوێنگرتن لە یەکێک لەم دەستانەدا، تووشی ئەشکەنجەیەکی بەسوێ دەبێت. کەواتە ئەو کامەیانە؟ کۆیلە یان ئاغا؟ پاڵەوان بە درێژایی ڕۆمانەکە، خەریکی زۆرانبازییە لەگەڵ پاڵەوانەکانی دیکەدا؛ وەک ئەوەی بەدوای ڕکابەرێکی بەهێزدا بگەڕێت بۆ خۆی. پەیوەندیی لەگەڵ کەسایەتییە سەرەکییەکانی دیکەدا، لەسەر بنەمای دەسەڵاتە و بە زاراوەی جەنگی و ستراتیژی وەسف دەکرێت؛ زاراوەگەلێک کە بە جۆرێک لە جۆرەکان پەیوەستن بە چەشنێک لە دەسەڵات، ڕابەری و پێگەوە.

با بەر لە هەموویان بپەرژێینە سەر زۆرانبازیی ڕاسکۆڵنیکۆف لەگەڵ لوژنی دەسەڵاتویستدا. ئەم جەنگە خۆی لە نیشانەگەلی دەسەڵات و دۆخ و کاردانەوەگەلێکی دەسەڵاتویستانەدا پیشان دەدات کە هەردووک نەیارەکە هەر لە یەکەمین بەرکەوتنیان لە کونەمشکەکەی ڕاسکۆڵنیکۆفدا دەیاننوێنن. ڕاسکۆڵنیکۆف بە ئاشکرا بە چاوێکی کەم لە کەسایەتیی بەرجەستەی لوژن دەڕوانێت:

> ڕاسکۆڵنیکۆف کە ورد و بەبێ شەرم و ئەتەکیەت لە ڕووخساری بەڕێز لوژنی ڕوانی، بزەیەکی ناحەزانەی کرد و هەمدیسان کەوتەوە سەر پشت و وەک جاران چاوی لە بنمیچەکە بڕی.

جا تەنیا پرســـیارێکیش کە لە لوژنی دەکات و بۆ ئەو لە هەر پرسیارێکی دیکە گرنگترە:

کەواتە راســـت بووە... راســـتیان پێ گوتووم کە جەنابی پایەبەرز، هێشـتا کاتژمێرێک بەســەر ئەریگوتندا تێنەپەڕیوە، بە دەزگیرانەکەتت گوتووە دۆخە شرە ماددی و سەرسواڵکەرانەکەی تەواو دڵخۆشت دەکا، چونکە وا باشترە مرۆڤ ژنێکی بێپاشتیلانە و پێزان بخوازێ و لە هەزاری دەریبهێنێ تـا خۆی هەمیشـــە لەســـەرەوە بێ و بتوانێ جڵەوی بکا و بەردەوامیش بیخاتە ژێر منەت و بە ڕوویدا بداتەوە کە ئەو نانبدەیەتی، ها؟...

راســـکۆلنیکۆف دوای زانینی پاڵنەری نهێنیی لوژن، ئامادەیە هەمان ئەو هەڵسـوکەوتەی لەگەڵدا بکات کە هەمیشـە لەبەرانبەر سـاختەچییە دەســـبرەکاندا دەکرێت: *یەک جاری تر... گەر تەنیا یەک جاری تر بێشـــەرمیی وا بکەی... لە پلیکانەکانەوە لنگاوقووچ هەڵت دەدەمە خواری!*

لوژن کە بانگەشـــەکارێکی نوێی دەســـەڵاتە لە خێزانە تازەکەیدا، بەرگەی هەبوونی پیاوێکی دیکە ناگرێت و داوا لە دونیا دەکات لەنێوان ئەو و براکەیدا یەکێکیان هەڵبژێرێت. لێرانەدا ململانێ لەســـەر عەشـــق نییە، بەڵکە لەســـەر دەســـەڵاتە و تەنانەت ڕێی تێدەچێت لە لایەکەوە راســـکۆلنیکۆفیش -کە عاشـــقانە خێزانەکەیی خۆش دەوێت- لەنێو خێزانەکەیدا چاوی بە پیاوێکی دیکەدا هەڵنایێت. هەر بەو جۆرەی کە بیرمانە، ئەوە راسـکۆلنیکۆفە کە لە ململانێکەدا ســـەردەکەوێت. لوژن دوای هەوڵێکی تۆڵەکردنەوەی شـــکســـتخواردوو (بوختانکردن بۆ سۆنیا)، ناچار دەبێت پاشەکشێ بکات.

لە درێژەی ڕۆمانەکەدا، راسـکۆلنیکۆف داوەتی پۆرفیری پێترۆڤیچی لێکۆڵەر پەســـەند دەکات و ئەم جۆرە بیرکردنەوانەی بە مێشـــکدا رادەبوورن:

*بســـــرەوێننە بناگوێم، تەنیا یاریی مشــــک و پشــــیلەم لەگەڵ مەکەن... ئەو خەریکە پەستم دەکا. دەیەوێ پێوەم بکا.*

پۆرفیری دان بە هێزی ڕاسـکۆڵنیکۆفدا دەنێت: *نەیارێکی بەهێزی لێ دەردەچێ؛ دەبێ سڵی لێ بکەیتەوە!* لێکۆڵەری بەئەزموون دەمودەست گومان دەکات کە دەســــەڵات، تایبەتمەندیی دیاری ئەوە: *مرۆڤێک کە تووشـــــی نەهاتی بووە، لووتبەرز و دەســــەڵاتویســــت کە زۆریش بێئۆقرەیە!*

بەڵام پۆرفیری پیترۆڤیچ هێندە ڕانەهـاتووە لەبەرانبەر *گومانلێکراو* و *فریشــتە باڵخوێناوییەکاندا* مل بدات. دەســتبەجێ ڕاســکۆڵنیکۆف لە قاڵب دەداتەوە تا تێی بگەیەنێت لێرانەدا کێ سەرۆکە:

> پۆرفیری ئەم جارەشیان ورتەورت قسەی دەکرد، بەڵام ئیدی باری پیرێژنە لادێییە ڕووخۆش و خەمخۆرەکان لە ئارادا نەبوو، بە پێچەوانەوە، خەریـک بوو فەرمـانی دەکرد، جـددی و بە دەموچـاوی گرژەوە، بە جۆرێک وەک ئەوەی کە بە ئاماژەیەک هەموو ناڕوونی و نهێنییەکانی ڕەواندبنەوە و ئاشــــکرای کردبن. وەلێ ئەمە یەک خولەکیشی نەخایاند.

تا ئەو کاتەی کە پاڵەوانەکان خەریکی زۆرانبازین، دۆخەکە هەر وا بە چەقبەســــــتوویی دەمێنێتەوە. پۆرفیری تەنیا ئەو کاتە دەتوانێت لە چارەنووســی ڕاسـکۆڵنیکۆفدا ڕۆڵێک بگێڕێت کە لە ڕووبەڕووبوونەوە و ململانێـدا وەک ئـاغـایەک لەبەرانبەر ئـاغـایەکی دیکەدا (واتە ڕاسکۆڵنیکۆف) پاشەکشە دەکات و لە شێوەی مرۆڤێکدا دەردەکەوێت کە پەیوەندیی لەگەڵ مرۆڤێکی دیکەدا بەستووە.

پەیوەندییەکانی ڕاســکۆڵنیکۆف لەگەڵ ســڤیدریگایلۆفیشــدا ئاســایی نین. پاڵەوانەکەی ئێمە هەر دەڵێیت خۆبەخۆ بەرەو ئەو دەکشێت:

ڕاسکۆڵنیکۆف بە هەڵەداوان بەرەو ماڵی سڤیدریگایلۆف کەوتە ڕێ. نەیدەزانی دەبێت چ چاوەڕوانییەکی لەو پیاوە هەبێت، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەو شتانەی کە لەنێوانیاندا بوون، سڤیدریگایلۆف دەسەلاتێکی تەلیسماوی و نهێنیی بەسەر ئەودا هەبوو.

سڤیدریگایلۆف کە دەستبەجێ لە ڕاسکۆڵنیکۆفدا شتێکی هاوشێوە و نزیک لە خۆی بەدی دەکات (باشە، باشە، خۆتان بڵێن، خراپم گوت کە من و ئێوە لە یەک توخمین؟) وەک هەرزەکارێک هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکات، هەوڵ دەدات بیخەڵەتێنێت، جڵەوی لەدەست بگرێت و بەسەریدا زاڵ ببێت، بەڵام وێڕای هەموو ئەمانەش، بەر لە مردنی، لەودا ڕکابەرێکی لێهاتوو دەبینێت، ئاغایەک لە داهاتوودا:

*ئەم ڕاسکۆلنیکۆفە خوێڕییە چ زۆڵێکە! چ بارێکی بە کۆڵەوە بووە، بە چ گێچەڵێکدا تێپەڕیوە، زۆڵی وا! بە تێپەڕینی کات، کە ئەم هەڵیتوپەڵیتانەی لە کەللەدا دەرچوون فرەزانێکی چاکی لێ دەردەچێ، وەلێ جارێ دەیەوێ تۆزێکی تر بژی!*

لە بوونی ڕاسکۆڵنیکۆفدا، تین‌وتاو و نیگەرانییەکی ناوەکی هەیە، جۆرێک لە گەڕانی تاکەکەسی بەدوای حەقیقەتدا و هەمووشیان پێیان زانیوە و هەر لەبەر ئەوەشە کە دەبێت تۆزێک زیاتر بژی. سڤیدریگایلۆف هەستێکی لەو جۆرەی نییە. خاڵی هاوبەشیشیان ئامادەییانە بۆ تووشبوون و ئەزموونکردنی تاوان.

ڕاستە کە پاڵەوانی سەرەکی لە کوشتنەوە گلاوە، بەڵام هێشتا هێڵی سووری نەبەزاندووە و هەر وا لەمبەرییەوە ڕاوەستاوە، ئەمە لە بارێکدا کە سڤیدریگایلۆف هێڵی سووری تێپەڕاندووە و لەبەرانبەر ئەودا ڕاوەستاوە.

لە جێی خۆیدایە ئاماژە بەوە بکەین هیچکام لەو پاڵەوانە پیاوانەی کە لەم ململانێ دەروونییەدا لەگەڵ ڕاسکۆڵنیکۆفدا بوون، لەودا

نیشانەی ئاغایان نەدەبینی. تەنانەت سڤیدریگایلۆفیش بەو ڕادەیەی کە ئەگەر و توانای *بوونە ئاغای* لە داهاتووی ئەودا دەبینی، لەودا ئاغای هەنووکەیی بەدی نەدەکرد، بەڵام هەموو یان بە جۆرێک لە جۆرەکان لە تیۆرییەکەی ڕاسکۆڵنیکۆفدا بەشدارن: *چاک دەرک بە هەستەکانتان دەکەم و کە ئەو گوتارەشم خوێندەوە، زۆر بەلامەوە ئاشنا بوو.*

ئەگەری زۆرە ئەم بابەتە پەوەسـت بێت بە کردەگەریی پیاوانەی دەسـەڵاتویسـتانە و هێرشـبەرییەوە کە زۆربەی کات بەرۆکی خودی دۆسـتۆیفسـکیشـی دەگرت. لە لایەکەوە، هەر بەو جۆرەی کە دەردەکەوت، هیچ کەسێک لە بوونی ڕاسکۆڵنیکۆفدا شێوەی ئاغا بەدی ناکات، چونکە خودی نووسـەر نایەوێت پاڵەوانەکانی دیکە ببنە کۆیلە. بۆ دۆسـتۆیفسـکی دابەشـکردنی جیهان بەسـەر هەردووک دەسـتەی ئاغای و کۆیلەدا، بێمانا و نائاشنایە.

دەسـەڵاتویسـتیی پیاوانە، بەتایبەت لە پەیوەندیدا لەگەڵ ژنان دەردەکەوێت. لوژنی دەسـەڵاتخواز، ئاشـکرا و بێ پەردەپۆشـی لەم بارەیەوە بۆچوونی خۆی دەخاتە ڕوو، بە جۆرێک کە دەبینین خودی *قوربانییەکان*یش سەریان سوور دەمێنێت:

> پیۆتەر پیترۆڤیچ، دەڵێی هەر بە ڕاسـتی بڕواتان وایە دەبێ ئێمە گوێڵەمسـتی ئێوە بین!... ئێوەش بە جۆرێ دەنووسـن هەر دەڵێی یاسـا بۆ من دەردەکەن! یانی ئێسـتە دەبێ ئێوە هەرچیتان ویست، ئێمە وەک یاسایەک لێی بڕوانین؟

پەیوەندیی نێوان ژن و پیاو، لە وەها هەلومەرجێکدا بەرئەنجامەکەی ئەوە دەبێت کە *ژن لەسـایەی پیاوەوە هەمیشـە بە کۆیلەیی دەمێنێتەوە و پیـاو، بە ڕەهـایی و بەبێ سـنوور، فەرمـانڕەوایی دەکـات.* سـڤیدریگایلۆف کە چاک شـارەزای ئاکاری پێگەویسـتانەی دونیایە، هەوڵ دەدات بە بەڵێنی بوونە ئاغا لە داهاتوودا فریوی بدات: *من دەبمە خزمەتکاری ئەلقەلەگوێی ئێوە... تا کۆتایی تەمەنم...* بەڵام هەر حەزی

خۆی بۆ زاڵبوون بەسەر دونیادا –لە ئێستەدا و تەنانەت گەر بە زۆریش بوو بێت– ناشارێتەوە. ئەو بە گوێی دونیایدا دەداتەوە کە دواتر چۆن دەتوانێت لەبەردەم ویژانیدا خۆی پاک بکاتەوە: *مانای وایە تەنیا و تەنیا هاتوونەتە ژێر باری هەلومەرجی ئێستەوە و ئەگەریش بێگومان پێویست بکا ئەو وشەیە بەکار بێهێنین، لەبەردەم زۆردا ملتان کەچ کردووە.*

سڤیدریگایلۆف پێشنیاری ڕۆڵی ئاغا و خواخاتوونێک دەخاتە بەردەم دونیا کە فەرمان بەسەر پیاوەکەیدا دەکات، کەچی لە لایەکی دیکەوە وای پێ باشە گەر بتوانێت، لەڕێی زۆریشەوە بێت، کاری خۆی جێبەجێ بکات. دونیاش سۆسەی ئەوە دەکات: *ئەها! کەواتە دەتانەوێ ئازارم بدەن!*

لە بەسەرهاتی ئەویندارانەی نێوان سۆنیا و ڕاسکۆڵنیکۆفدا، بابەتێک خراوەتە ڕوو کە بایەخێکی جیهانیی هەیە، کە بەرکەوتنی کردەی پیاوانە و ژنانەیە لە ژیاندا. ڕاسکۆڵنیکۆف بانگەشەی ئەوە دەکات کە ڕۆڵی ڕێنوێنیکەر دەگێڕێت بۆ سۆنیا، لە ڕێگەیەکی ڕاستەوە و لەگەڵ خۆیدا، ئەو بەرەو ئامانجێکی تایبەت دەبات: *ئێمە هەردووکمان نەفرەتلێکراوین و پێکەوە دەڕۆین!* ئەمە سۆنیا دەترسێنێت. نازانێت کتومت بۆ کوێی بانگهێشت دەکەن: *بۆ کوێ بچین؟ جا نائاگایانە لە ترساندا هەنگاوێک کشایە دواوە.*

ڕاسکۆڵنیکۆف لە سۆنیادا بەدوای هاودەست و لایەنگر و بەرفرماندا دەگەڕێت. هەوڵ دەدات ئەو بهێنێتە سەر ڕێبازی خۆی و تیۆرییە ڕەشەکەی خۆی بۆ باس و شی بکاتەوە. بەم بەڵگەیەش دەتوانین هەستی سەرکەوتنی ڕاسکۆڵنیکۆف لە دیمەنی شەڕکردن لەگەڵ لوژندا ڕوون بکەینەوە:

ســــۆنیا چاوێکی بە ژوورەکەدا گێڕا. نیگاکەلی تۆقیو و لێوانلێو لە قیزی ئامادەبووان بەودا واق بووبوون. ســەیری ڕاســکۆڵنیکۆفی کرد... ڕاسکۆڵنیکۆف دەستلەسەرسنگ لای دیوارەکەوە ڕاوەستابوو و بە چاوانێکی بڵێســەدارەوە لەوی دەڕوانی... ڕاسکۆڵنیکۆف لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *ئیتر دەبێ منیش بڕۆم! دەی، ســـۆنیا خاتوون، با بزانین ئێستە چی دەڵێی!*

سۆنیا دەبوو بۆی بسەلمێت کە لەم دونیایەدا، گەر ئاغا نەبێت، ئەوا دەبێتە کۆیلە و ئەگەریش نەخۆیت، ئەوا دەخورێیت. کەواتە یان دەبێت ببێتە ئاغا (ڕێچاری پیاوانە) یان بگەڕێیت و ئاغایەکی بەهێز بۆ خۆت بدۆزیتەوە (ڕێچاری ژنانە). بۆ ڕاسکۆڵنیکۆف گرنگ بوو دانپێدانان لە ســـۆنیا وەربگرێت، هەمان دانپێدانانە ناســـراوە هیگڵییەکە، دانان بە *ئاغابووندا*، ئەو شـــتەی کە ڕاســـکۆڵنیکۆف هەوڵی دەدا لە ســـۆنیای بســـتێنێت، بەلام ســـەرکەوتوو نەبوو. هەڵبەتە هۆکارێکی دیکەش لەئارادایە، ئەوەی ڕاســـکۆڵنیکۆف لە بنەڕەتدا ســـۆنیای بۆچییە؟ *پێویســـتیم پێتە و هەر لەبەر ئەوەش هاتووم بۆ لات*. ڕاســـکۆڵنیکۆف هەر تەنیا بەدوای تێگەیشـــتن و ئۆقرەگرتنەوە نەبوو، بەڵکە بۆی هەیە بەدوای شـــتێکی گرنگترەوە بووبێت: دانپێدانان. شـێوازی قســـەکردنی فەرماندەرانەی ئەو لەگەڵ ســـۆنیا و لە یەکەمین دیداردا، ئەلێرەوە ســـەرچاوە دەگرێت: *بیخوێنەوە دەی!* کتوپڕ جددی و بە فەرمانەوە هـاوار دەکـات: *بیخوێنەوە! من دەمەوێ بۆم بخوێنیتەوە*. بەم جۆرە لەسەر داخوازییەکەشی سوور دەبێت.

ڕاسـکۆڵنیکۆف لە دووەمین دیداری لەگەڵ سـۆنیادا، کتوپڕ هەسـت بە ترس و لاوازی دەکات، چونکە بڕیارە پەیامی تیۆرییەکەی بگەیەنێتە سۆنیا و پێشوەختەش هەست بە شکستخواردن دەکات. سەرەتا هەوڵ دەدات ڕۆلی داوەر و دیاریکەری چارەنووسی سۆنیا بگێڕێت:

سۆنیا بە بێدەنگی لە میوانەکەی ڕوانی کە خەریک بوو بەوپەڕی سەرنج و ڕووداریییەوە چاوی بە ژوورەکەی ئەودا دەگێڕا. دواجار وەک ئەوەی لەبەردەم داوەری کردەوەکانیدا ڕاوەستابێت و لۆمەکردنی لەدەستی ئەودا بێت، لە ترسان کەوتە هەڵلەرزین.

دوای ئەوەیە کە ڕاسکۆڵنیکۆف لە دووەم دیداردا، هەوڵ دەدات ڕۆڵی داوەر بخاتە ئەستۆی سۆنیا:

دەی، ئێستە ئەگەر تەنیا و تەنیا پەیوەست با بە بڕیاری تۆوە کە ئەوان زیندوو بمێنن یان لوژن، یانی لوژن زیندوو بمێنێ و هەر درێژە بە کارە گڵاوەکانی بدا یان لەبری ئەو کاترینا ئیڤانۆڤنا؟ چۆن بڕیارت دەدا کامەیان بمرن و کامەیان بمێنن؟ لەگەڵ تۆمە!

ڕاسکۆڵنیکۆف بە خستنەبەرباسی وەها پرسیارێکی دژوار بۆ سۆنیا، بە دڵنیاییەوە چاوەڕوانیی وەڵامێکی لێی هەیە کە بتوانێت لەڕێیەوە خۆی پێ پاک بکاتەوە. سۆنیا بڕیارە هاوکات داوەری ئەوانی دیکە و پارێزەری ئەو بێت، وەلێ خۆی لە گێڕانی ئەو ڕۆڵە دەپارێزێت:

باشە من کوا لە قەدەری خوا بەئاگام؟... بۆچی شتێ دەپرسن کە هی پرسین نییە و ناشکرێ وەڵام بدرێتەوە؟ ئەسڵەن ئەم پرسیارە پووچ و بێمانایانە سوودیان چییە؟ بۆ دەکرێ وەها شتێ پەیوەندیی بە بڕیاری منەوە هەبێ؟ ئاخر من چیم تا ببمە داوەری مان و نەمانی خەڵکی؟

بەم پێیە، سۆنیای باوەڕدار، بیر ڕاسکۆڵنیکۆفی دەخاتەوە کە کێ داوەری ڕاستەقینەی ئەم جیهانەیە و لە ڕاستیدا کێ جیهانی لەژێر ڕکێفدایە.

خاڵی جێسەرنج ئەوەیە کە وێڕای ئەمەش، نووسەر لە کۆتاییدا مافی ڕادەربڕین و حوکم دەداتە سۆنیا، حوکمێک کە —لە بیرمانە—

ڕاسکۆڵنیکۆف سەرەڕای ئەوەی کە لەگەڵیدا ناکۆکە و تێی ناگات، دواجار ناچار دەبێت جێبەجێی بکات:

هەر ئێستە دەچی لەسەر چوارڕیانەکە ڕادەوەستی، دەکەویە سەر ئەژنۆ، سەرەتا ئەو خاکە ماچ دەکەی کە حورمەتیت نەگرت و پاشانیش لەبەردەم هەموو دونیادا، لەئاست چوارقوڕنەی جیهاندا، مل کەچ دەکەی و بە هەموو خەڵکی دەڵێی: *من بکوژم!* ئەوسا خوا هەمدیسان ژیانت پێ دەبەخشێتەوە. خۆ دەڕۆی، ئەری؟ دەڕۆی؟

وا دیارە لە ڕۆمانەکەدا، سەرئەنجام دەسەڵات دەکەوێتە دەستی کەسێک کە زیاتر لە هەموویان ڕەدی دەکاتەوە و فەرمانڕەوایی ملهووڕانە نانرخێنێت.

لە *تاوان و سزا*دا، هەوڵدانی پیاوان بۆ سەپاندنی دەسەڵات بەسەر توخمی *لاواز*دا ئاشکرایە و، لە لایەکەوە، دەسەڵاتی ژنان بەسەر پیاواندا –بە بڕوای دۆستۆیڤسکی– کەمتر دیارە، بەڵام کزتر نییە. ئەم دەسەڵاتەیان جۆرێکی دیکەیە، لە توخمی هەست و سۆزە. ڕێی تێدەچێت هۆکاری سەرەکیی بێهیوابوونی ڕاسکۆڵنیکۆف لە تیۆرییەکەی ئەوە بێت کە دوو ژنی بەرجەستەی نێو ژیانی تێی نەگەیشتن و بەرهەڵستیان کرد، دانەیەکیان دونیای خوشکی و ئەوی دیکەشیان سۆنیای ئەڤینداری. ژنەکان تیۆرییەکەی ڕاسکۆڵنیکۆف تێک دەشکێنن، بەڵام نەک بە بەڵگەهێنانەوەی ئەقڵی، بەڵکە بە چاوانی عاشق و پڕ لە ئازار و سۆزیان.

سووراییەک گەڕایە ڕووخساری هەڵبزڕکاو و بێڕەنگییەوە، وەلێ هەر کە ڕستەکانی کۆتایی دەربڕین، بە هەڵکەوت چاوی بە چاوی دونیا کەوتەوە و وەها ئازارێکی لە نیگای ئەودا بەدی کرد کە نائاگایانە نەیتوانی درێژەی بداتێ.

چـاوی ئەم ژنـانە، کە بەبۆنەی ئەوەوە ئـازار دەچێژن، وەک ڕێسایەکی پتەوی ئاکاری وایە کە دەسەلاتێکی بێهاوتای بەسەر ئەودا سەپاندووە و کێشی دەکاتە سەر جولجولتای[1] خۆی:

گەیشـتە خوارەوەی پلیکانەکان و چووە ناو گۆڕەپانەکە. هەر لەوێ، لە نزیک دەرگەی سـەرەکییەوە، سـۆنیا، ترسـاو و ڕەنگپەڕیو، ڕاوەسـتابوو. سـۆنیا نیگایەکی وێلی گرتە ئەو. ڕاسکۆلنیکۆف بێجووڵە لەبەردەم ئەودا ڕاوەستا. ئەشکەنجەیەکی بەسوێ و جگەرسـووتێنی تێکەڵ بە بێهیوایی لە نیگای سـۆنیادا دەباری. کچە دەستەکانیی لێک گرێ دان. لێوەکانی ڕاسکۆلنیکۆف بە زەردەخەنەیەکی ناشـیرین و بێمانا کرانەوە. بۆ خولەکێک هەر وا بەبێ جووڵە ڕاوەستا و ژارخەندێکی کرد. پاشان سووڕایەوە و سەرکەوت بۆ بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس.

دەسـەلاتی ژنان بەسـەر پیاواندا لە ڕۆمانەکەی دۆسـتۆیڤسـکیدا، لەمەدا کورت دەبێتەوە کە پیاوی عاشـق ناتوانێت نەیێتە سەر باوەڕی ژن. هەر لەبەر ئەوەیە کە سـڤیدریگایلۆف لە لووتکەی تاسـە و پەرۆشـیدا دەڵێت: *هەر شـتێ ئێوە بڕواتان پێی هەبێ، منیش بڕوام پێی دەبێ.*

ڕاسـکۆلنیکۆفی پەشـیمانی لەدایکبووەوە، لە تاراوگەدا، *ئینجیل* دەکـاتەوە و لەبەرخۆیەوە بیر دەکـاتەوە: *چۆن دەکرێ لەم دۆخەدا باوەڕی ئەو باوەڕی منیش نەبێ؟ لانیکەم هەست و ئاواتەکانی...*

کەواتە تێگەیشـتین کە هیچکام لە پاڵەوانەکان ئامادە نین لە بوونی ڕاسـکۆلنیکۆفدا ئەو ئاغایە ببینن، بەلام هیچ کەسـێکیش ڕۆڵی کۆیلە ناخاتە ئەسـتۆی ئەو. جەنگی دەسـەلات و کۆیلەیی هەر بە تەنیا لە

---

١. جولجولتا: گلگتا: ناوی ئەو تەپۆلکانەیە کە مەسـیحیان لەسـەر لە خاچ دا. مانا نەرێساتی (کینایی)ـەکەی ئەزموونێکی بەسوێ و پڕ لە ناسۆرییە. «و. ک»

دونیای دەرەوەدا نییە، بەڵکە بە هەمان ڕادەش لە دونیای ناوەوەی پاڵەوانەکانیشدا لەئارادایە. بە سەرنجدان لەو بابەتانەی کە هیگڵ دەیانخاتە بەرباس، دەکرێت بڵێیت ئاغای دەروونی ڕاسکۆڵنیکۆف -کە هەمان تاکایەتیی ئەوە- هەنگاو دەنێتە کردەوە و ترس لە مردن لەنێو دەبات، سەرکەشی دەکات و لە لایەکیشەوە کۆیلەکەی دەروونی سەرەڕای ئەوەی لە مردن دەترسێت، دەتوانێت بە پێچەوانەی غەریزە و ویستی ئارەزووەکانییەوە بجووڵێتەوە. کاتێک دەسەڵات لەودا چەکەرە دەکات کە خۆی دەخاتە مەترسییەوە و ترس لە مردن فەرامۆش دەکات و لە کوشتنەوە دەگلێت و لەگەڵ *دژمنەکان*دا دەچێتە مەیدانی *ململانێ*وە. ئەو دژمنانەی کە ململانێیان لەگەڵدا دەکات، پیاوە پاڵەوانەکانی دیکەی ڕۆمانەکەن (لوژن، پۆرفیری پیترۆڤیچ و سڤیدریگایلۆف). سرووشتی کۆیلەییش کاتێک لە بوونی ئەودا بەرچاو دەکەوێت کە دواهەمین تۆزقاڵی تواناشی لەدەست دەدات، بە ئاگاداربوونەوە لە دەسەوەستانی و بێتوانایی خۆی ئازار دەچێژێت، لە سەرووی نیڤاوە ڕادەوەستێت و تەنانەت توانای خۆکوشتنیشی نییە.

ئەو جۆرە ئاگاییەی کە نووسەری ڕووسی *تاوان و سزا* بە ئافراندنی ڕاسکۆڵنیکۆف بە ئێمەی نیشان دەدات، فەیلەسووفی ئەڵمانی بە ئاگایی *دوولەت* یان *ناموراد* ناوی دەبات. هیگڵ لە *دیاردەناسیی هۆش*دا دەنووسێت:

> ئاگایی *دوولەت*، ئاگاییە لە خۆ، وەک بوونێکی دوودانەیی، بەڵام ناکۆک... ئەم ئاگاییە لەناو خۆیدا دەبێتە دوودانەیی و لەبەر ئەوەی دژبەرە وجوودییەکەی بۆ خۆی ئاگاییەکی سەربەخۆیە، سەرئەنجام دایمە هەر ئاگاییەک لە ناخی خۆیدا، ئاگاییەکی دیکەی هەڵگرتووە. بەم پێیە تەنیا کاتێک هەست بە یەکانگیری و هێمنی و سەرکەوتن دەکات، کە یەکێک لەم دوو ئاگاییە مەیدانەکە چۆڵ بکەن.

شــرۆڤەكارانی هاوســـەردەم دەڵێن لە بوونی ڕاســـكۆڵنیكۆفدا، ئەم دووپارچەییە زیاتر لە شــێوەی دژبەریی نێوان ئایدیا و ســرووشـــتدا دەردەكەوێت.

بەو جۆرەی كە دۆستۆیڤسكی بە ئێمەی نیشان دەدات، ئەم ئاگاییە ناموراد یان دووپارچەیە، بەرئەنجامی كردەوەی سەرەڕۆیانەی مرۆڤی هاوچەرخە لە دژی خۆ و دنیا. پاڵەوانەكەی دۆستۆیڤسكی، بە دەستی خۆی، خۆی دەخاتە داوێكی دەروونناســـییەوە: ئاغا/كۆیلە، كۆیلە/ئاغا، خەڵكی ئاسایی/مرۆڤە ڕێزپەڕەكان، مرۆڤە ڕیزپەڕەكان/خەڵكی ئاسایی و جا بە هیچ شــێوەیەك ســۆســەی ئەوە ناكات كە كۆیلە و ئاغا هەر یەكێكن. لە بوونی ڕاســـكۆڵنیكۆفدا شــۆڕش لە دژی دەســـەلاتی ژیان دەگۆڕێـت بۆ حەزی دەســـــەلات بەســــەر جیهـانـدا. پـاڵەوانەكەی دۆستۆیڤسكی هەوڵ دەدات لەدەست دەسەلاتی جەبر ڕزگاری ببێت و خۆی جڵەو بكات، كەچی زیاتر وابەســـــتە دەبێت و پەتی كۆیلایەتیی ئایدیای هێز و تینوێتیی دەسەلات دەكرێتە ملییەوە. بەرەبەرە دەگۆڕێت بۆ ملهووڕی و ئەوســـــا ســـتەم لە خۆی و كەســـانی نزیكی دەكات. ڕاســـــكۆڵنیكۆف بە لاوازی و بچووكیی و ئەو تینوێتییەی كە بۆ دەســەلات و زاڵبوون هەیەتی، ســتەم لە ئاگایی خۆی دەكات. ئەو هەر لە بنەڕەتەوە بیر لەوە دەكاتەوە كە ئازادی چییە؟ بە ئەگەرێكی فرە زۆر دەكرێت بڵێین نا! لە زەینی ئەودا و بۆ خۆی، تەنیا دوو جەمســەر هەن: ئاغا و كۆیلە، خەڵكی ئاســایی و مرۆڤە ڕیزپەڕەكان، وەك ســەر و خوار، ژیان و مردن.

لەوانەیە بكرێت بڵێین ئاگایی ڕاســـكۆڵنیكۆف، ئاگایی مرۆڤی تازەی ســەدەی نۆزدەهەمە، مرۆڤێك كە بە فەلســەفەی خۆرئاوا، لە چەشــنی ئەوەی هیگڵ، پەروەردە كراوە. *بیردیاییف*ـــــی فەیلەسووفی ڕووسی، سەردەمانێك دوای هیگڵ دەنووسێت:

هیگڵ بە *دیاردەناسـیی هۆش* فکرگەلێکی سـەرنجڕاکێش لەبارەی ئاغا و کۆیلەوە دەخاتە بەرباس، بەڵام ئەم چەمکە بە مانا سۆسیالیستییەکەی بەکار ناهێنێت، بەڵکە لە بابەتێکی قووڵتر دەدوێت: پرس، پرسی پێکهاتەی ئاگاییە... هیگڵ، هەر لە بنەڕەتەوە شارەزای ئازادیی ئەمڕۆیی نییە.

بیردیاییف کە هاوڕای هیگڵ نییە، دەڵێت:

من مرۆڤ بەسەر سێ دەستەدا پۆلێن دەکەم، سێ پێکهاتەی ئاگایی کە دەکرێت بە *ئاغا، کۆیلە* و *ئازاد* ناویان ببەین. ئاغا و کۆیلە پەیوەستی یەکدین و بەبێ یەک بوونیان نابێت، بەڵام ئازاد، هەر لە خۆیـدا بوونی هەیە و تـایبەتمەنـدییەکەی ئەوەیە کە پێویسـت ناکات لەگەڵ دژبەرەکەیدا پەیوەندییەکی ناتەبای هەبێت و پێیەوە گرێ بدرێت.

دوور نییە لێکۆڵینەوە و لێکـدانەوەی ئەدەبیـاتی ڕووسـی (بەرهەمەکانی دۆستۆیفسکی و تۆلستۆی) یارمەتیی بیردیاییفی دابێت بۆ تەواوکردنی پۆلێنکارییەکەی هیگڵ.

بە بۆچوونی دۆسـتۆیفسـکی، مەسـیحییەت، ئایینی ئازادییە، ئازادیی خودا و فێرکاریی مەسیح. دۆستۆیفسکیی مەسیحیی باوەڕدار، لەسەر باسـی دەسـەڵات، شـێوازی بیرکردنەوەی هەر لە بنەڕەتەوە لە هی هیگڵ جیاوازە. لەلای ئەو دەسـەڵات هەر بە تەنیا لە پەیوەندیی نێوان ئاغا–کۆیلە لە جیهانی دەرەوەدا کورت نابێتەوە، بەڵکە دەسـەڵات بەر لە هەر شـتێک زاڵبوونە بەسـەر نەفسـدا. لەم بارەیەوە کتێبی پیرۆز چیرۆکێکی سەرنجڕاکێشی تێدایە، لەوێدا کە خواوەند بە قابیل دەڵێت:

بۆچی هەڵچوویت؟ ئەی بۆچی سـەری خۆتت دانەواند؟ ئەگەر چاکەت بکردبا، ئایا پەسـەند نەدەکرای؟ خۆ ئەگەر چاکەشـت نەکرد، تاوان لە بەردەرگەدا کەمینی داناوە و تامەزرۆتە، وەلێ تۆ بەسەریدا زاڵ دەبیت![1]

---

١. گەشتی پەیدابوون، وەرزی چوار، ٧. «و. ف»

دۆستۆیڤسکی کاتێک دەسەڵات بە ڕێپێدراو و لەئاست تێگەیشتندا دەزانێت کە تەنیا بۆ زاڵبوون بەسەر نەفسدا بێت، زاڵبوون بەسەر خۆدا و بەسەر وەسوەسەی ستەمکردن لە هاوتوخمان. بەم پێیە، دەکرێت بڵێین دۆستۆیڤسکی نەک هەر بە تەنیا هیگڵ کامڵ دەکات، بەڵکە لە پرسی دەسەڵات و کەسایەتی و مەسیحییەتدا دەبێتە ڕکابەرێکی بەهێز و شیاو و هاوشانی ئەو.

٢٠١٢

# سنووربەزاندن: دوو جۆر ئازادی لە تاوان و سزادا

ڕیچارد ئاورامنکۆ، زانکۆی ویسکانسین - مەدیسن

نیکۆلای بیردیاییف لە بەرهەمە ناوازەکەیدا لەبارەی دۆستۆیڤسکییەوە دەنووسێت: *بۆ دۆستۆیڤسکی پرسی سرووشتی مرۆڤ و چارەنووسی، لە یەکەمین قۆناغدا، پرسی ئازادیی مرۆڤە و هەر ئەم ئازادییەیە کە چەقی جیهانی بەرهەمەکانی پێک دەهێنێت. ئازاری شاراوەی وجوودیی ئەو، ئازاری ئازادییە*[1]. زۆربەی خوێنەرانی بەرهەمەکانی دۆستۆیڤسکی ئاگاداری ئەم خاڵەن. پرسی ئازادی لە یەکەمین ڕۆمانییەوە (ڕەشـوڕووت)، هەتا شاکارەکەی (برایانی کارامازۆف) بە ڕوونی کرۆکی نووسینەکانی بووە، بەڵام تێگەیشتنی کامڵتربووی ئەو بۆ ئازادی، پرسە ناڕوونەکەیە. ئەگەر ئازادی کرۆکی چەقی کارە سەرەتایی و پێشسیبیریاییەکانی ئەو بێت (ئەو سەردەمەی کە سۆسیالیست و شۆڕشگێڕێک بوو)، ئەوا توخمەکەی لەگەڵ ئەو ئازادییەدا چوونیەک نییە کە لە کارە پوختەکانیدا دەیبینین. هەمیشە لە بەئاگاهاتنەوەی ئایینیدا بۆ هزری کامڵبووی دۆستۆیڤسکی

---

١. دۆستۆیڤسکی نیکۆلای بیردیاییف، لەوانەیە گشتگیرترین بەرهەم بێت کە بیرۆکەوانێکی سیاسیی هاوچەرخ لەبارەی بەرهەمی دۆستیۆڤیسکییەوە نووسیبێتی و ئەم بیرکردنەوەیەش لەودا ڕەنگی داوەتەوە: *بێ گومان دۆستۆیڤسکی بە تەواوی مانا هونەرمەند بوو، بەڵام وا دێتە بەرچاو هەرگیز هونەرەکەی بۆ هونەر نەبوو. لە هەموو شتێک گرنگتر، ئەو بە پەرۆشییەوە خەریکی ململانێیەکی هەمەلایەنە بوو بۆ ژیان لە حەقیقەت و ئازادیدا. هەڵبەتە تا ئەو شوێنەی کە مرۆڤ و جیهان و خودا، بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە هەن، هەلی بۆ بڕەخسێنن.* «و. ف»

دەگەڕێن، جۆرێک لە بەئاگاهاتنەوە کە ئەو لە *یادداشتەکانی نووسەردا* باســـی دەکـات[1]، بەڵام کێشــــەی ئەو جۆرە دیـدگەیە ئەمەیە کە بەرپرســـیارییەتیی دۆســـتۆیفســـکی بۆ ئازادی، بە چاوپۆشـــین لە بیروبـاوەڕە پتەوە دینییەکانی، بە جێگیریی دەمێنێتەوە. مەبەســـتی سەرەکیی گوتارەکە ئەوەیە سەرنجی خوێنەر بۆ دوو جۆر لە ئازادیی نێو بەرهەمەکانی دۆســـتۆیفســـکی ڕابکێشــێت. بە دەربڕینێکی وردتر، لەڕێی شــرۆڤەکردنی *تاوان و ســزاوە* بەڵگە دەهێنینەوە کە دوو جۆر ئازادی هەیە و ناویانمـان ناون *ئازادیی بەرپرســـیارانە* و *ئازادیی نابەرپرسیارانە*.

## ١

## ئازادیی نابەرپرسیارانە

*تاوان و ســزا* ڕێک وەک *یادداشــتە ژێرزەمینییەکان* دژەپاڵەوانێکی هەیە، خوێندکارێکی بســـتوســـێ ســـاڵە بە ناوی ڕۆدیۆن ڕۆمانۆڤیچ ڕاسکۆڵنیکۆف، کە سەر بە خێزانێکی هەژارە. لەژێر فشاری کەمدەستی و ســـنووردارییی ســــەرچاوەگرتوو لەوەوە، ڕاســـکۆڵنیکۆف واز لە خوێندنی یاسـا دەهێنێت. چەندان مانگ ڕاسـکۆڵنیکۆف بە شـەقامەکانی پیتەربورگـدا دەســـووڕێتەوە و فکر لە بیرۆکەیەکی نێو مێشـــکی دەکاتەوە. برســـی، جلی کۆنەی لە بەردایە و دواهەمین سـامانی خۆی لەلای پیرریژنێکی ســـــووخۆر (ئالیۆنا ئیڤانۆڤنا) بە بارمتە دادەنێت. دیلبوون لە هەژاریدا، کرۆکی دووبارەبووەوەی بەشـــی ســـــەرەتای

---

[1]. فیۆدۆر دۆستۆیفسکی؛ *یادداشتە ڕۆژانەییەکانی نووسەر* (لەندەن؛ کاسل، ١٩٤٩). بە شێوەیەکی دیار بەشکەڵێکی بیرهێنەرەوەی ماریێ لادێیی ص. ٢١٠. «و. ف»

ڕۆمانەکەیە. ڕاسکۆڵنیکۆفی نەخۆش بەدەست برسییەتییەوە، بەنێو سۆزانی و مەیخانەگەلێکی بۆگەن و پڕ لە پیاوانێکدا دەخولێتەوە، کە دواهەمین سکەی خۆیان لە خواردنەوەدا بەفیڕۆ دەدەن. ئەو بەر کچێکی گەنجی سەرخۆش دەکەوێت کە زۆر زوو دەبێتە قوربانیی دەستدرێژی و هەر لە یەکێک لەم مەیخانە بۆگەنانەدا مارمیلادۆف دەناسێت، باوکی چوار منداڵ کە بەبۆنەی مەیخواردنەوە کارە میرییەکەیی لەدەست داوە. چەقی ئەم بەرکەوتنە بەردەوامانە، دیداری ئەوە لەگەڵ سۆنیای کچە گەورەی مارمیلادۆفدا (تاکە منداڵی ئەو لە یەکەمین ژنی)، کچێکی هەژدە ساڵە کە بۆ دابینکردنی خەرجیی زڕدایک و سێ خوشک و برا زڕەکەی، چووەتە ژێر باری سۆزانیبوونەوە. بە کورتییەکەی، ڕۆمانەکە پڕە لە کەسانێک کە دیلی دەستی هەژارین.

دیلبوون لە هەژاریدا، هەم لە ڕووی جەستەیی و هەم لە ڕووی دەروونییەوە کاریگەری دەخاتە سەر ڕاسکۆڵنیکۆف. ئەو کاتێک بە شێوەیەکی خراپ بریندار دەبێت کە لەلایەن دایکییەوە نامەیەکی بۆ دێت و تێیدا نووسراوە بڕیارە خوشکەکەی لەگەڵ پیاوێکی خۆپێگە*یاندوو*دا زەماوەند بکات و ئەم پیاوەش دوای ڕێوڕەسمی بووکێنی لەڕووی ماددییەوە یارمەتیی خێزانەکە دەدات. لە دیدی ڕاسکۆڵنیکۆفەوە، بڕیاری خوشکەکەی وەک بڕیارەکەی سۆنیا وایە: جۆرێک لە سۆزانیبوون. ئەو کە پەرێشانە و تووشی وڕێنەکردن بووە، بە بازاڕی کۆنەفرۆشیدا دەسووڕێتەوە و وا بیر دەکاتەوە تاکە کارێک کە لەدەستی دێت، جێبەجێکردنی ئەو نەخشەیەیە کە لە مێشکیدایە: کوشتنی پیرەژنەی سووخۆر و دزینی پارەکانی. بەم پێیە، ئیدی دەتوانێت خۆی، دایک و خوشکی و هەر کەسێک کە بکرێت، لە کۆتی دەستکورتی ڕزگار بکات. ئەو بە هەڵکەوت و وەک ئەوەی چارەنووس بڕیاری لەسەر دابێت، لە بازاڕی کۆنەفرۆشیدا لە دەمی

پیاوێک و لیزاڤێتای خوشــــکی کەمئەقڵی پیرێژنە ســــووخۆرەکەوە دەبیستێت و ئاگادار دەبێتەوە کە لیزاڤێتا و ئەو پیرێژنە سبەی کتومت لەو شـــوێنەدا دیداریان هەیە. کەواتە هەلێکی ناوازە بۆ جێبەجێکردنی نەخشەکەی ڕەخساوە.

دەچێتە مەیخـانە و خەریکی پێداچوونەوەی نەخشـــەکەیەتی کە گوتوبێژێکی دیکە دەبیســـتێت، ئەم جارەیـان لەنێوان ئەفســـەر و خوێنـدکارێکی گەنجـدا کە کەم تـا زۆر هـاوتەمەنی خۆیەتی. ئەوان خەریکن باســـی ئالیۆنا ئیڤانۆڤنا و لیزاڤێتا دەکەن. ڕاســـکۆڵنیکۆف بە بیســـتنی ئەم گوتوبێژە ســـەرســـام دەبێت، ئاخر خۆیشـــی کەمێک لەوەوبەر لە مـاڵی ئەو پیرێژنە هـاتووەتە دەر. هێنـدەش تـامەزرۆی بیستی ئەم گوتوبێژە نییە کە کتوپڕ خوێندکارە گەنجەکە دەڵێت، *ئامادە بووم ئەو قرچۆڵە پیرە بکوژم و هەرچیی هەیە بیدزم و دڵنیا بن کە بەبێ تۆزقاڵێک پەشـــیمانی ئەم کارەم دەکرد.* ڕاســـکۆڵنیکۆف بە وردییەکی زیـاترەوە گوێ بۆ قســـەکـانی خوێنـدکـارەکە دەگرێـت. خوێنـدکـارەکە ئەو شـــتە ڕوون دەکـاتەوە کە من بە ئـازادیی نابەرپرسیارانە ناوی دەبەم:

> لێگەڕێ با پرسـیارێکی جددیت لێ بکەم. هەڵبەتە ئێستە گاڵتەم دەکرد، دە ئـاخر هەر خۆت بڵێ، لە لایەکەوە ئەم پیرەســـەگە دەبەنگە بێســـوودە پیس و چەپەڵ و پەککەوتەیەمان هەیە، جا ئەوە هیچ کە کەڵکی کەس نـاگرێ، بگرە بۆ هەمووانیش زیانبەخشـە! خۆیشـی نازانێ بۆچی زیندووە و هەناسـە دەدات و ئەسڵەن هاکا ئەمڕۆ یان سبەی بە لادا هات و مرد... لە مەسەلەکە تێدەگەی؟... لەولاشـــەوە ســـەیری هەر لایەک دەکەی ژیان و بەختەوەریی هەزاران لاو کە هیچ کەســـێ یـارمەتییـان نـادا و پشـــتیـان نـاگرێ، بەفیڕۆ دەچێ! بەو پـارەیەی کە بۆ ئەو پەرستگەیەی تەرخان کردووە دەکرێ سەد و بگرە هەزار کاری چاکیش بکەی! دەکرێ سەد و بگرە هەزار کەسیش بخەیتە سەر

ڕێگەی ڕاست، چەندان خێزان لە سواڵ و جیابوونەوە و خراپە و چارەڕەشـــی ڕزگار بکەی تا نەخۆشـــیی داوێنپیســـی نەبێتە چارەنووســـیان... دەکرێ بە پارەی ئەم پیرێژنەتیوە هەموو ئەم کارانە بکەی! هەر بۆ ئەوە باشـــە بیکوژی و پارەکەی هەڵگری و بیخەیتە خزمەت مرۆڤـایەتی و کـارگەلێکەوە بۆ بەرژەوەنـدیی گشـــتی. ڕات چییە؟ یانی هەزار کاری چاک و دروســـت ناتوانێ تاوانێکی بێبایەخ بشـــواتەوە؟ بەڵێ دەی، ژیانێک تیا دەچێ، وەڵێ هەزاران ژیانی تر لە فەوتان ڕزگار دەبن. مەرگێک لەجێی ژیانی دووبارەی هەزاران کەس! یەک کەرەت دوو یەکسانە بە چوارێکی سادەیە! باشە ژیانی ئەم مشەخۆرە پیرە چەپەڵ و دەبەنگە لەنێو بوونەوەرانـدا چ بـایەخێکی هەیە؟ خۆ لە ژیـانی ئەســـپییەک، قالۆنچەیەک شـــتێک زیاتر نییە. تەنانەت ئەوەندەش بایەخی نییە، ئەم ژنەتیوە هێندە بێبەزەییە.

ئەگەر بمـانەوێ زۆر بە کورتی و پوختی بیڵێین، خوێنـدکـارەکە خەریکی بەیانکردنی ئەو جۆرە لە ئازادییە کە دۆســـتۆیڤســـکی لە دژی دەجەنگێـت. هەمـان ئەو جۆرە ئـازادییەی کە دزەی کردبووە گیـانی پیاوە ژێرزەمینییەکەشـەوە؛ بەشـی ئەوەندە پارەی بە میرات بۆ بەجێ ماوە تا دەست لە پێگەکەی (کارمەندی میری) بکێشێتەوە. ئەو دەزانێت کە *ئازادی* تەنیا کاتێک مانای دەبێت کە ژیانی لەڕووی ئابوورییەوە بنرخێندرێت یان ئەوەی بتوانێت ژیان هەڵبســـەنگێنێت و بە *ئامار* و *ژمارەی* بیرکاری ســـنووورداری بکات. بۆ دۆســـتۆیڤســـکی، لە جیهانی ئیقلیدسیی خۆرئاواخوازاندا، سۆسیالیستەکان، ئەتایستەکان (یان هەر جۆر کە ئەوانی پێ وەســـف کردوون)، دەکرێت بۆ *ئازادیبەخشـــین* پاکانە بۆ وەها کردەوەیەک بکرێت، وەک ئەوەی پرسی بوونی مرۆڤ تەنیا ئـامـار و ژمـارە بێـت، بەڵام ئەو جۆرە خەمڵانـدنەی ئـازادی

ئەبستراکتە[1] و بە ڕادەیەکی زۆر چاو بە ڕووی ئەو جۆرەدا دادەخات کە بەرپرسیارانە دیارە. لەم بابەتە تایبەتەدا، خەملاندنی کەسایەتیی چیرۆکەکە چاو لەئاست ئەم پرسە بێچەندوچۆن ماددی و بەرهەستە دادەخات کە بۆ ئازادکردنی ئەوانی دی، دەبێت مرۆڤێک بکوژێت. وا دێتە بەرچاو ئەم جۆرە خەملاندنە ئەبستراکتە بۆ ئازادی، لەگەڵ ئازادیی بەرپرسیارانەدا ناکۆک بێت. ئەوان ئازادی دەگۆڕن بۆ پرسێکی نابەرپرسیارانە. ئەو شتەی کە لێی دەدوێن، ئازادیی نابەرپرسیارانەیە.

دەکرێت وەڵامدانەوەی ئەفسەرەکە بە وەڵامی خودی دۆستۆیڤسکی بزانین بۆ ئەم بۆچوونە، گەرچی وەڵامی ئەفسەرەکە سادە و کورتە (شتێک کە لەئاست کەسایەتیی دۆستۆیڤسکیدا نییە). ئەو دەڵێت: بەڵام بیرت نەچێت *ئێمە سەروکاریمان لەگەڵ مرۆڤێکدا هەیە*. بەس خوێندکارەکە ئەم قسەیە پەسەند ناکات و لە پرسی ئازادیی نابەرپرسیارانەدا زیاتر سنوور دەبەزێنێت: *تەنانەت دەکرێت چارەی سرووشتی مرۆڤیش بکەیت و بیخەیتە سەر ڕاستەڕێ*. ئەوەی کە ڕاستگۆیانە نایڵێت ئەمەیە کە دەبێت هەمیشە بە ئەندازە خەڵکی فێری ئەم جۆرە ئازادییە بکەیت، بە زۆریش لە سیبیریا یان ئۆردوگاکانی دیکەی کاری زۆرەملێدا، بەڵام ڕاسکۆڵنیکۆف ئەرک ناکێشێت تا کۆتایی گوێ لە گوتوبێژەکە بگرێت، تا ئەو شوێنەی کە ئەفسەر لە خوێندکارەکە دەپرسێت ئایا خۆی ئامادەیە پیرێژنەکە بکوژێت و خوێندکارەکەش دەڵێت: *دەی دیارە کە ئامادە نیم! من باسی دادپەروەرانەبوونی ئەم کارەم دەکرد، نەک ئەوەی کە خۆم بیکەم!* ڕاسکۆڵنیکۆف لەبری گوێگرتن لەم قسەیە، لەبەرخۆیەوە بیر دەکاتەوە، *بەڵام بۆچی دەبێت ئەو، جا بەتایبەتیش کتومت لەو کاتەدا، ئەم*

---

١. ئەبستراکت: خەیاڵی و بیکردەوە. ڕەها، دەرهەست و ناپەیوەست بە واقعەوە. دابڕاو لە واقعیەت.

*گوتوبێژ و ئەم ئایدیایە ببیستێ... ڕێک لە کاتێکدا کە خەریک بوو ئەم بیرکردنەوەیە لە زەینی خۆیشیدا شێوەی دەگرت!* ئەو گوتوبێژە وا دەکات کتومت باوەڕ بکات کە وەک *بڵێی ئەمە بڕیاری* چارەنووس بێت کە *ئەو لێرە بێت و ئەمەش جۆرە هێمایەک بێت.*

ئەو ڕووداوانەی کە دوای ئەم گوتوبێژە ڕوو دەدەن بۆ هیچ کەسێک شاراوە نین. ڕاسکۆڵنیکۆف پلانەکەی جێبەجێ دەکات. شەوی دواتر ئایدیاکەی خۆی لەبارەی ئازادییەوە پیادە دەکات و تەورێک دەچەقێنێتە تەپڵەسەری پیرێژنەکە. ئەو پێشوەختە هەموو قۆناغەکانی کوشتنەکەی بەرنامەڕێژ کردبوون، بەردەوام سوودی لە بەڵگە و لۆژیک وەرگرتبوو و دەکرێت بڵێین تاوانەکەی ئەویش تا ئەو شوێنەی کە دەکرێت هەر کوشتنێک سەرکەوتوو بێت، سەرکەوتووە. کردەوەی کوشتنەکە چەندان ڕووداوی بەهەڵکەوتی لەگەڵدا بوو، لەنێویاندا هاتنی لیزاڤێتا کە باجی هاتنە ناوەختانەکەی خۆی دا و، لە ئەنجامدا، تەورێک چەقییە تەپڵەسەری ئەویشەوە. ڕاسکۆڵنیکۆف بە شێوەیەکی تەواو پەرجووئاسا و بێ ئەوەی بناسرێت شوێنی کوشتنەکە جێ دەهێڵێت. هەرچی لە پارە و گەوهەراتی دەست دەکەوێت لەگەڵ خۆیدا دەیباتەوە بۆ ئەپارتمانەکەی، شوێنێک کە دوای ئەو ساتە مەزنەی ڕزگاربوون لە هەژاری، جا تێدەگات کە وەک *تابووت* وایە.

بەشی سەرنجڕاکێشی بەسەرهاتەکە ئەوەیە کە دۆخی زەینیی ڕاسکۆڵنیکۆف بەر لە بیرکردنەوەی ئەلەم تاوانە بەم جۆرە وەسف دەکرێت: *بیری لە هیچ شتێک نەدەکردەوە و توانای بیرکردنەوەشی هەر نەبوو؛ پڕاوپڕ هەستی دەکرد کە ئیدی نە جڵەوی ئەقڵ و نە لۆژیکی لەدەستدایە و نە ئازادیی ویستیش. دەتگوت هەموو شتێک دواهەمین بڕیاری لەسەر دراوە و بڕێندراوەتەوە.*

ئەو بە تەواوی *شــــەیدای کردەوە* بووبوو و توانای بیرکردنەوەی نەبوو، وەک *ئەوە وابوو* چمکێکی *جلەکەی گیرابێتە پێچکی*[1] *مەکینەیەک و ئێســـتەش* خەریک بێت *کێشــــی بکاتە ناو خۆی.* مەبەســـتی دۆســــتۆیفســــکی ئاشـــکرایە: هۆگربوون بە ئایدیا ســـیاســــییە ئەبستراکتەکانەوە، مرۆڤ لە کات و شوێنی ئێستە جیا دەکاتەوە. ئەم جۆرە ئایدیایانە ناهێڵن مرۆڤ لێکەوتە ئاکارییەکانی کردەوەکەی خۆی لە جیهانی بەرپرســیارانەی چواردەوریدا لەبەرچاو بگرێت یان هەر لە بنەڕەتەوە بۆی گرنــگ بێــت. بۆ نموونە، ڕاســــکۆڵنیکۆف بەپێی حســــێبکاریی لۆگاریتمیی ئایدیاکەی جووڵایەوە. بڕیار دەدات *لە هەلومەرجێکی یەکســان و لەســەر بنەمای هەموو ڕێســا بیرکارییەکان پلانەکەی جێبەجێ بکات*، بەڵام لە کاتی جێبەجێکردنی پلانەکەیدا هەر واز لە چاوپۆشین لەو حەقیقەتە ناهێنێت کە ئازادیی نابەرپرسیارانە لە باشترین باری خۆیدا بۆ مرۆڤ، هەڵبەتە لە پێگەی ئینسانیدا، نەشیاوە. ڕازومیخین ئاگاداری ئەم خاڵەیە، دەڵێت:

> ئەوپەڕیشی دەگاتە ئەوەی کە هێندە هەموو شتێ داببەزێنن تا بگاتە ئاستی خشتنانەسەرخشت بۆ ژوورگەل و ڕاڕەوی بینای هاوبەشــــی ســــۆســــیالیســــتەکان! دەی، فەرموو، گریمان بینای هاوبەشیش ئامادەیە! وەلێ قسەکە ئەوەیە کە سرووشتی مرۆڤ ئامادە نییە بخزێتە نێو بینای هاوبەشــی ســۆســیالیســتەکانەوە. مرۆڤ هێشتا ژیانی دەوێ و هێشتا ڕەوتی ئاسایی پەرەسەندنی نەبڕیوە! جارێ زووە بۆ ئەوەی بچێ لە ناوجەرگەی گۆڕســـتاندا بخەوێ! ناکرێ بە لۆژیک ســرووشــتی مرۆڤ بخەڵەتێنی، ناکرێ، کاکە گیان! لۆژیک تەنیا دوو ســـێ گریمانە لە بەرچاو دەگرێ، بەس ملیۆنان ئەگەری دیکەش هەیە! کەواتە چی بکەین ئێســـتە؟ نەکا پێویست بێ ملیۆنەها گریمانە بخەینە لاوە و تەنیا خۆمان بۆ پرســــی خۆشــــگوزەرانیی مرۆڤ یەکلایی بکەینەوە؟ بەڵێ، بە

---

١. پێچک؛ تەگەرە؛ لر؛ خر: بازنەئاسایەک کە بە دەوری خولگەیەکدا دەسووڕێتەوە.

ڕووالەت زۆر سادە و شیاوی تێگەیشتنە! سادەییەکەی هێندە وەسوەسەکەرە کە مرۆڤ شوێن خۆی دەخا! خۆ بیرکردنەوەی ناوێ ئیتر! مەسەلە سەرەکییەکە هەر ئەمەیە، تەنانەت پێویست ناکا بیرت بخەیتە کار! فەلسەفەی گشتی و ڕەمز و ڕازی ژیان چووە نێو دوو پەڕەکاغەزەوە و تەواو!

لە ڕۆمانەکەدا کەسایەتیی دیکەشی هەن کە ئاگاداری خەوشداربوونی ئەم ئایدیایەن، بەڵام ڕاسکۆڵنیکۆف بەهەندیان وەرناگرێت. ئەو ئەرخەیانە کە ئایدیا و پلانەکەی بۆ ئازادی، ڕاستە و تەنیا پێویستی بەوەیە کە لۆژیکی و بەپێی ڕەچەتە بیرکارییەکان جێبەجێی بکات. دڵنیایە کاتێک بەسەر ئەو لەمپەڕەدا زاڵ بوو کە ناوی سرووشتی مرۆڤە، دەتوانێت ئازادی بە مرۆڤەکانی دیکەش ببەخشێت و *هەزاران کردەوەی چاک* ئەنجام بدات.

ناکۆکیی دۆستۆیفسکی لەگەڵ ئەم جۆرە بەڵگەهێنانەوەیەدا کاتێک دەردەکەوێت کە ڕاسکۆڵنیکۆف لەگەڵ ویژدانیدا دەکەوێتە کێشمەکێش. ویژدان لەلای دۆستۆڤیسکی بەشێکە لە مرۆڤبوون کە دەکەوێتە سنووری ئەقڵەوە. بەم پێیە، کاتێک ویژدان دێتە سەروەختی ڕاسکۆڵنیکۆف، ئیدی تێدەگات هەموو ژیانی مرۆڤەکان، وەک ئەوەی کە پیاوی ژێرزەمینی دەیڵێت، هەر وا بە سادەیی *دوو کەڕەت دوو یەکسانە بە چوار* نییە. ئەو سوێند دەخوات کە نەکەوێتە ژێر کاریگەریی پەشیمانی، بەرژەوەندیی ئاکاری و بیرکردنەوەی دیکەی نالۆژیکییەوە:

*بەسە ئیتر! با بەس بێ ئیتر ئەو هەموو سەراب و وەهم و خەیاڵ و تۆقینەی سەری تێ ناوم!... ژیان لە شوێنی خۆیدایە. بۆ من ئائێستە زیندوو نیم؟ کەواتە یانی ژیانم لەگەڵ پیرەژنەکەدا لەناو نەچووە! خوا ڕەحمەت پێ بکا، دایە گیان، مێمن بخەوێ! ئیتر کاتی ژیری و ڕۆشنایییە و... کاتی ویست و هێز... جا با ببینین!*
وەک ئەوەی نیازی ململانێی لەگەڵ هێزێکی ناو تاریکیدا هەبێ، لە

دڵدا بۆی زیاد کرد: *جا تاقیی دەکەینەوە! کەچی منیش قایل بووبووم کە لەو بستە زەوییەدا بژیم!...*

بە بۆچوونی ئەو، کردەوەکانی ڕاست بوونە و پێویست بەوە ناکات هیچ وەڵامێکیان لەبارەوە بداتەوە. تاکە کارێک کە دەبێت بیکات ئەمەیە کە بەڵگاندنەکەی خۆی بپارێزێت و، بەم پێیە، *ئازادی و مێزیش. مێزێک لە سەرووی مێزی ئەوانی دیکەوە. مێزێک لە سەرووی ئافرێنراوە لەرزۆک و تۆپەڵە مێروولەکانەوە. ئەو شتە* بەدەست دەهێنێت کە *ئامانجمانە*. هەڵبەتە دواتر ڕاسکۆڵنیکۆف دان بە شکستی خۆیدا دەنێت، بەڵام بەر لەوە، بە بەڵگاندن و پاساودان هەر باسێک دەخاتە ڕوو کە لە بەرژەوەندیی ئازادیی نابەرپرسیارانەدایە. بە هەڵکەوت نییە ئەو مەیخانەیەی کە یەکەمین جار ئایدیای کوشتنی پیرێژنەکەی تێدا درکێندرا ناوی *کۆشکی بلوورین*ـە[1]. کۆشکی بلوورین بۆ دۆستۆیڤسکی لە هێمایەکی دووبارەبووەوە دەچێت کە بۆ یەکەمین جار لە *ڕامانی زستانی لە خەمە هاوینییەکان*دا (ئەو بەرهەمەی کە وەسفی ڕۆژنامەنووسیی سەفەری ئەو بوو بۆ پێشانگەی جیهانیی لەندەن لە ساڵی ١٨٦٢دا) باس دەکرێت. ئەو لە کاتی بەسەرکردنەوەی یادگاریی سەفەرەکەیدا دەنووسێت *کاتێک کۆشکەکەم بینی لەبەر دیمەنی مۆزەخانە گشتییەکە حەپەسام و پەرێشان بووم، ئاخر هەر لەگەڵ بینینیدا، وێنای جۆرێک لە بەرئەنجام، وێنای ڕزگارییەکی قووڵ و خەمی حەقیقەتێکی کامل زەینمی تەنی کە لە دژیدا هەر جۆرە بەڵگاندنێک بێسوودە*. لە دیدی ئەوەوە، ئەو مۆزەخانەیە لە ڕاستیدا نیشاندەری ئازادیی بیرمەندانی ئەقڵانییەت بوو، ئەو شتەی کە دەشێت پیاوی ژێرزەمینی بەم جۆرە لێکی بداتەوە. بۆ دۆستۆیڤسکی دیمەنی کۆشکەکە *مێزێکی تۆقێنەری* زیندوو کردەوە و ئەم هەستەی تێگەڕا

---

١. لە تاوان و سزادا چوار جار ئاماژە بە کۆشکی بلوورین (کریستاڵ پالاس) کراوە. «و. ف»

*که دەڵێیت لەم شوێنەدا دەستکەوتێک هەیە و سەرکەوتن و ڕزگارییەک لەئارادا بووە. وەسفەکانی ئێجگار تەزێنەرن:*

ئایا به بۆچوونی ئێوه دەکرێت ئەم شوێنە دواهەمین دەستکەوتی دۆخی نموونەیی بێت له جیهاندا؟ ئەمە کۆتاییەکەیەتی؟ ئەمە هەر به ڕاستی ڕووداوێکی کامڵ و بێخەوشە؟ ڕەنگە پێویست بکات پەسەندی بکەین که ئەمە تاکە حەقیقەتێکه و دەبێت دەست له هەر بزووتنەوەیەکی دیکە هەڵبگرین؟... مرۆڤەکان تەنیا به یەک بیرکردنەوەوە دێنە ئێره و زۆر هێمن و کەللەڕەقانە بەدەوری ئەم شوێنە شکۆدارەدا هەنگاو دەنێن و ئێوه وا هەست دەکەن ئەو شتەی که لێره بەدەست هاتووه، یەکلاکەرەوەیە و له سەرووی هەر شتێکی دیکەوەیە؛ شتێکی کامڵ و کۆتاییهاتوو. هێمایەکی ئینجیلییە، جۆرێک له پێشبینیی ئاخیرزەمان که وا له بەرچاوتاندا ڕوو دەدات. هەست دەکەن که نەریتێکی کۆن و دەوڵەمەند له باری لەدەستچوون دایه و پێویست به نارەزایەتی دەکات ئەگەر بمانەوێت لەبەرانبەر بتسازیدا له *بەعل* خۆمان بەدەستەوه نەدەین، ئەوەی که ئێمەش وەک ئەوانی دیکە نەکەوینە ژێر کاریگەریی و ستایشی نەکەین، یانی دونیای ئێستە له شوێنی دونیای خوازراودا...

دۆستۆیفسکی له بەشێکی نێو ڕۆمانی *یادگارییەکانی یانەی مردووان*دا، که له نوسخە چاپکراوەکەدا نەهاتووه، باس له ترسەکانی خۆی دەکات:

هەر به ڕاست ئەم نانه چییە! خەڵکی نان دەخۆن بۆ ئەوەی به زیندوویی بمێننەوه، بەڵام خۆ ئەمە ژیان نییە! باشە بچن و کۆشکێک دروست بکەن! جا به بەردی مەرمەڕ و بابلۆ و ئاڵتوون و باڵندەگەلی بەهەشتی و باخاتی هەڵواسراو و هەر شتێک که به مێشکتاندا دێت، بڕازێننەوه... ئەوسا بچنه ناوییەوه. هەڵبەته بۆی هەیە ئیدی دوای ئەوه ئامادە نەبن جێی بهێڵن! بۆشی هەیە هەرگیزاوهەرگیز لێی نەیێنه دەر! ئەوێ واتە هەموو شوێنێک! بێ

لەمە ئیدی چیتان دەوێت! بەڵام کتوپڕ، هەموو شتێک لە بەرچاودا گەمژانە دەردەکەوێت: *دیوار چواردەوری کۆشکەکەتانی داوە و پێتان دەڵێن هەمووی هی ئێوەیە، چێژی لێ ببەن! هەر ئەوەندە هەیە کە ناتوانن لێرە دوور بکەونەوە!* باشە، ڕێک ئەلەم کاتەدایە کە حەز دەکەن بەهەشتەکەتان جێ بهێڵن و بەسەر دیوارەکەدا ئاودیو ببن. لەمەش گرنگتر، هەموو ئەم جوانکاری و ئاڵووالاییە، سەرلەبەری ئەم خۆشگوزەرانییە دەبێتە هۆکارێک بۆ ئەشکەنجەکێشانی زیاترتان. ئەم جوانکارییە، تەنیا نامورادترتان دەکات.

کۆشک (هێمای بڵندی ئازادیی نابەرپرسیارانە)، نیشاندەری جۆرە بەهەشتێکە لەسەر زەوی، بەڵام لە کۆتاییدا، دەبێتە زیندانێک کە تێیدا بە مرۆڤ دەگوترێت: ١) دەبێت بچنە ناوی. ٢) دەبێت هەر لەوێ بمێننەوە. بە دەربڕینێکی دی، ئەم ئازادییەی کە بە نان و خۆشگوزەرانیی هەموو مرۆڤەکانی دەزانین، ئەم ئازادکردنەی ئەوانی دی لە هەژاری و ئازار، خەونێکی *جوان* و *بڵندە*، بەڵام ئەگەر لایەن یان تایبەتمەندیی بەرپرسیارانەی ئازادی لە بەرچاو نەگرین، دەبێتە هۆی ئازارگەیاندن بە تاکەکان. ئازادیی نابەرپرسیارانە بە جیاکردنەوەی تاک، لەو دەخوازێت ئازادیی بەرپرسیارانەی خۆی لەدەست بدات. بەم پێیە، کۆشکی بلوورین دەبێتە زیندانێک[1] و لە

---

١. پیاوە ژێرزەمینییەکەی دۆستۆیفسکی بە باشی لەم بابەتە تێدەگات. ئەو، ئەو کەسانە دەداتە بەر گاڵتە کە شوێنکەوتووی ئازادیی نابەرپرسیارانەن و بە تانەوە پێیان دەڵێت: *بەڕێزان! ئێوە دەڵێن پەیوەندیی تازەی ئابووری بەڕێوەیە و بە تەواویش ئامادەیە و هەموو حسێبە بیرکارییەکانیشی بە سەرنجەوە کراون و تێیدا هەر پرسیارێک بە چاوترووسکاندنێک لەنێو دەچێت؛ چونکە پێشوەختە وەڵامەکەی دۆزراوەتەوە و ئامادەیە. یانی ئەو ساتەیە کە کۆشکێکی بلوورین بۆ مرۆڤایەتی قووت دەکرێتەوە و، بە کورتییەکەی، بەختەوەری دێتە ئارا.* (یادداشتە ژێرزەمینییەکان، فیۆدۆر دۆستۆیفسکی) «و. ف»

مەیخانەیەکی کۆشـــکی بلوورین‌ناودایە کە بیرۆکەی ئەبســـتراکتی ڕاسکۆڵنیکۆف بۆ ئازادی، لە زەینیدا دەبێتە واقعیەتێک.

دۆسـتۆیفسـکی کێشـەی لەگەڵ کۆشـکی بلوورین و سـاڕێژبوونی ئێشـــی فیزیکیدا نییە، تەنیا کێشـــەی لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا هەیە کە مرۆڤەکـان وەک بوونەوەرگەلێکی لۆژیکی بـاوەش بۆ ســـەمەرە بەڵێن‌لەســەردراوە تەکنەلۆژییەکان، یانی باوەش بۆ شـارێکی خەیاڵیی بەریی لە برســـییەتی و ئـازار بکەنەوە. ئەو دژی ئەو دیـدگەیە دەوەســـتێتەوە کە مادام مرۆڤ پێشـــکەوتوو و بەئاگایە و *یاســـای ســـرووشـــت لە ســـەرروویەوەیەتی، کەواتە هیچ کردەوەیەکی ئەو بە ویستی خۆی نییە، بەڵکە خۆبەخۆ و بەپێی یاسـای سـرووشـت ڕوو دەدات*[1]. لەلای دۆســـتۆیفســـکی ئەوە ئـازادیی ئەبســـتراکـت و لەژێرخاکدەرهێندراو و شـوێنگۆڕکێ‌پێکراو نییە کە ڕاستەوخۆ قسەی دڵی مرۆڤەکان دەکات، بە پێچەوانەوە، ئەوە ئازادییەکە کە دژی بنەمای بەرژەوەندییە. ئەم ئازادییە –کە سۆنیا و خوشـکی ڕاسـکۆڵنیکۆف لە کتێبەکەدا هێمـای ئەون– لە یەکەمین قۆنـاغـدا دژی ســـوود و بەرژەوەندیی کەسیی هەر مرۆڤێکە. هەر بەو جۆرەی کە دۆستۆیفسکی وەســـفی دەکات بە *درێژایی ئەم هەزاران ســـاڵە کەی ڕووی داوە کە مرۆڤ تەنیا بەپێی بەرژەوەندیی کەســـیی خۆی جووڵابێتەوە؟*[2] ژیان شـــتگەلێکی گرنگتر لە بەرژەوەنـدیشـــی تێـدایە. لەوانەیە لە بەرژەوەندیماندا بێت کە مرۆڤایەتی لە کۆتی هەژاری ڕزگار بکەین، بەڵام ڕاســـکۆڵنیکۆف بەشـــی ئەوە هۆشـــیـارە کە بزانێت ئەمە ســەرەتاییترین جۆری بەڵگاندنە و دەکرێت لە کۆتاییدا هیچ شـتێکی لێ نەکەوێتەوە بێ لە کوشـــتن و دزی. بەم پێیە، ئەو لێکـدانەوەیەکی ئاڵۆزتری لەبارەی ئەم بابەتەوە لە زەینیدایە. ڕاسکۆڵنیکۆف بەر لەوەی

---

[1] فیۆدۆر دۆستۆیفسکی، یادداشتە ژێرزەمینییەکان.

١. فیۆدۆر دۆستۆیفسکی، یادداشتە ژێرزەمینییەکان.

ناچار بێت واز لە زانکۆ بهێنێت، گوتارێکی بە ناونیشـــانی *لەبارەی کوشتن*ـــەوە نووسیوە و لەم گوتارەدا بانگەشە دەکات هەمیشە گلان لە کوشتنێکەوە نەخۆشیی لەگەڵدایە. پۆرفیرێی لێکۆڵەر پێی دەڵێت ئەو بە گشـــتی لە گـوتـارەکەدا بـیـرۆکەیەکـی تـازەی پـێـیـە، بەڵام ســەرنجڕاکێشــترین بەشــی بانگەشــەکەی بەم جۆرە نییە. پۆرفیرێ دەڵێت:

زۆر زۆر داهێنەرانەیە ئەم پرسەی ئێوە، وەلێ... وەلێ بەشێکی تری گوتارەکەتان زۆر زیاتر ســەرنجی منی ڕاکێشـــا، بەشـــی کۆتای... یانی ئەو تیۆرییەی کە لە کۆتایی گوتارەکەدا دەیخەنە بەربـاس. بەس حەیف کە تەنیـا ئـامـاژەیەکتـان پێ کردووە و تێروتەســەل نەتانکردووەتەوە. بە کورتییەکەی گەر بیرتان بێ، لە کۆتایی گوتارەکەدا کورتەئاماژەیەک بە مرۆڤانێکی تایبەت دەکەن کە دەتوانن... یانی دەتوانن ئاسانە، بە جۆرێ لە جۆرەکان لەوەدا ســـەرپشـــکن کە دەســـت بدەنە هەر کردەوەیەکی نائاکاری و تەنانەت تاوان و جا گوتبووتان ئەم کەســـانە لە ســـەرووی یاساوەن.

ڕاسکۆڵنیکۆف قسەی لێکۆڵەرەکە ڕاست دەکاتەوە و دەڵێت:

من تەنیا کورتەئـامـاژەیەکم بەوە کرد کە مرۆڤی ڕیزپەڕ ئەو مافەی هەیە، جا مافێکی دەروونیش نەک یاســـایی، کە ویژدانی خۆی بکاتە بنەما و هەندێ بەربەرســـتی تایبەت ڕابماڵێ، هەڵبەتە تەنیا و تەنیا ئەگەر بۆ بەکردەییکردنی ئەندێشـەکانی یارمەتییەکی بدەن (چونکە لەوانەیە ئەندێشەکانی ئەو مرۆڤایەتی ڕزگار بکەن).

ئـایدیـاکەی ئەو ئـاڵۆزە و کـات بە ڕوونکردنەوەیەوە دەکوژێت. بە لێکۆڵەرەکە دەڵێت گەر بۆ نموونە داهێنانی کەســـانی گەورەی وەک نیوتن و کێپلەر لەبەر ئەگەری دادگـاییکردن نەگەیشـــتبـانە خەڵکی، ئەوســـا، ئەم پیاوە دەگمەنانە مافی خۆیان بوو یان باشـــترە بڵێین

*ئەرکیان بوو کە ئەو دە یان سەد کەسە لەسەر ڕێگەکەیان ڕامالن تا مرۆڤایەتی لە داهێنانەکانیان سوودمەند بێ.* ئەم کەسە دەگمەنانە هەرگیز مافی ئەوەیان نییە بێ هۆکار کەسێک بکوژن یان شتێک بدزن، بەڵام مۆڵەتی لادان لەو یاسا کۆنانەنیان هەیە کە لە باوباپیرانیانەوە بە میرات بۆیان ماوەتەوە و خەڵکی بەرزیان دەنرخێنن. ئەو ڕوونی دەکاتەوە هەمیشە بەم جۆرە بووە و ئاماژە دەکات کە لیکۆرگۆس، سۆلۆن و ناپلیۆن نموونەی گەورەپیاوانێکن کە ناچار بوون بۆ گەیاندنی ئایدیاکانیان مرۆڤ بکوژن. ڕاسکۆلنیکۆف درێژەی پێ دەدات:

دەستەی دووەم ئەوانەن کە بە ئاسانی یاسا ژێرپێ دەنێن، یان وێرانکەرن یان ئارەزووی وێرانکردنیان هەیە، جا ئەوە پەیوەندیی بە توانا و لێهاتووییانەوە هەیە. ئەو تاوانانەی کە تووشیان دەبن ڕێژەیین و چەندان جۆری جیاوازیان هەیە و زیاتریش بە ڕێگەگەلی جیاواز خوازیاری لەناوبردنی ئێستەن لەپێناو داهاتوویێکی باشتردا. وەلێ ئەگەر ناچار بن لەبەر خاتری بیروبڕواکەیان بەسەر تەرمی کەسێکدا هەنگاو بنێن یان تەنانەت لافاوی خوێن هەستێنن، باکیان نییە و چاکیش ئەم کارەیان لەدەست دێ، یانی لە ناخیانەوە و لە قووڵایی بوونیاندا مۆڵەتی ڕامالینی بەربەستەکانی سەر ڕێگەیان بە خۆیان دەدەن. هەڵبەتە ئەوەشتان لەبیر بێ کە پەیوەندیی بە ئەندێشەکە و ڕەهەند و گرنگییەکەیەوە هەیە. منیش تەنیا لەم ڕووەوە بووە کە لە گوتارەکەمدا گوتوومە مافی تاوانکردنیان هەیە، چونکە بیرتانە کە باسەکە لە لایەنی یاساییەوە دەستی پێ کرد. بەهەرحاڵ، ئەمە نیگەرانیی ناوێ، چینوتوێژ بەوە ڕازی نابێ کە مرۆڤە ڕیزپەڕەکان وەها مافێکیان هەبێ و سزایان دەدا یان لە داریان دەدا (کەم تا زۆر هەر وا دەبێ) جا بەم کارانەش پەیامی وجوودیی پارێزکارانەی خۆی دەگەیەنێ. وەلێ نەوەی دواتر، وەک ڕێزلێنان پەیکەری ئەم تاوانبارانە قوت دەکاتەوە و دەیپەرستێ. دەستەی یەکەم، مرۆڤەکانی کاتی ئێستەن، دەستەی دووەمیش کەسانی داهاتوو. دەستەی یەکەم بە دڵ و بە گیان پارێزگاری لە دونیا دەکەن و

هەمیشــــە قەڵەبالقی دەکەن، دووەمینیش دونیا دەبزوێنن و دەیگەیەننە ئامانجێک.

ئەو بیســەرانی دڵنیا دەکاتەوە ئایدیاکەی بەو جۆرە مەترسیدار نییە کە بەرچاو دەکەوێت، لەبەر ئەوەی گرۆی خەڵکی بە دەگمەن لە مافی ئەو کەســــە تایبەتانە بۆ تێپەڕاندنی ئەو بەربەســـتانە تێدەگەن و، بەم پێیە، لەو ئەگەرە کەمەشــدا کە کەســێکی تایبەت لەســـەر زەوی پەیدا دەبێت، زۆربەی کات یان لە داری دەدەن یان سەری دەبڕن.

پۆرفیری یەکەمین کەســــە کە لەگەڵ ئەم ئایدیایەدا ناکۆکە. ئەو لە ســـەرەتاوە دەڵێت دەکرێت لەنێو خەڵکی ســـەر بە دەســـتەی یەکەم هەڵەتێگەیشتنێک بێتە ئارا و کەسێکی سەر بەو دەستەیە وای بۆ بچێت کە سەر بە دەستەی دووەمە، بەم پێیە، دەست دەکات بە لەنێوبردنی بەربەســـتەکانی ســـەر ڕێگەی. پرســـی دووەمیش ئەوەیە کە ئەو لە ڕاسکۆڵنیکۆف دەپرسێت: *بە ڕای ئێوە ژمارەی ئەو کەسانە زۆرە کە فەرمووتان مافی ڕەشـــەکوژکردنی ئەوانی تر بە خۆیان دەدەن؟ من ئامادەم لە بارەگەیاندا ســـەری کڕنۆش دانەوێنم، وەلێ ناتوانن نکوڵی لەوە بکەن کە ئەگەر ژمارەیان ڕوو لە زیادبوون بکا، هەلومەرجەکە مەترسیدار دەبێ، ڕاستە؟*

ڕاســـکۆڵنیکۆف ڕوونی دەکاتەوە لەبارەی پرســـی یەکەمەوە، ئەمە دەکرێت تەنیا لەنێو کەســـانی ئاســـاییدا ڕوو بدات و تەنانەت لەو دۆخەشـــدا ناتوانن زۆر لێی بچنە پێش. لەوانەیە ئەم کەســـانە لەبەر ئایدیاکانیان جڵەو لەدەســـت بدەن و لەوانەشـــە لەو دۆخەدا پێویســـت بکات هەندێک جار ئەم جۆرە کەســانە ســزا بدەین، بەڵام بەزۆری ئەم جۆرە گرفتانە خۆیان خۆیان لەناو دەبەن. *ئەوان خۆیان کەســـانێکی بەویژدانن و لەنێوان خۆیاندا کەسانێ هەڵدەکەون کە ئەو ئەرکە بگرنە ئەســـتۆ، ئەوەش لەلایەک کە هەندێکیان هەر بەتایبەت خۆیان خۆیان تەمبێ دەکەن... جا جۆرەها تۆبە و کەفارەت بە بەرچاوی خەڵکییەوە*

***هەم شـــتێکی جوانە و هەم پەندئامێز. بە کورتییەکەی ئێوە بە هیچ شـــێوەیەک خەمتـان نەبێ... چونکە لێرە یـاســـــایەکی لەو جۆرە فەرمانڕەوایە.***

ڕاسکۆلنیکۆف لەبارەی دووەم پرسیشەوە پۆرفیری دڵنیا دەکاتەوە کە مرۆڤی بلیمەت هەمیشـــــە دوای ئەوەی کە هەزاران ملیۆن کەس لەسەر زەوی دێنە دونیا و دەڕۆن، جا پەیدا دەبێت.

ئەم بۆچـوونە، تەنـانەت دوای ئەو نـاکۆکیـانەش کە لە دژی ڕاگەیێندران، ڕازومیخین قایل ناکات. ئەم قسـانە بۆ ئەو نە نوێن و نە شیاوی پەسەندکردن؛ دەڵێت:

> هەڵبەتە ڕاســتت گوت کە ئەمە بابەتێکی نوێ نییە و وەک ئەو بابەتانە وایە کە هەزار جار بیســــتوومانن و خوێندوومانن‌تەوە. وەلێ لەنێو قسـەکانتدا خاڵێک هەبوو کە تەنیا تۆ بۆ یەکەمین جار وا دەیخەیتە بەر باس و هەر ئەوەشـە کە خراپ منی ترسـاند. تۆ خەریکیت بە ناوی ویژدان و پێوەری تاکەکەســــییەوە، ڕەوایەتی بە خوێنڕێژی دەدەی و، زۆر داوای لێبوردن دەکەم، جا بە وەها دەمـارگیرییەکیشــــەوە! من وای لێک دەدەمەوە کە دەبێ خـاڵی سەرەکیی گوتارەکەی تۆش هەر ئەوە بێ! وەلێ بە بۆچوونی من ئەوەی کە لەڕێی ویژدانەوە مافی هەســــتاندنی خوێنت هەبێ، لە دەرکردنی مۆڵەتی فەرمیی ڕەشەکوژیش تۆقێنەرترە...

ناکۆکیی دۆستۆیفسکی لەگەڵ ئایدیاکەی ڕاسکۆلنیکۆفدا لەم پرسەدا شاردراوەتەوە کە مرۆڤەکان، تا ئەو کاتەی کە شتێک لە مرۆڤبوونیان تێدایە، بە هیچ شێوەیەک ناتوانن بەبێ ویژدانێکی نیگەران وەها پلانێک جێبەجێ بکەن، تەنانەت گەر ئەم پلانە بەشـێک بێت لەو شـتەی کە بە گوتەی ڕاسـکۆلنیکۆف بۆ مرۆڤی ڕیزپەڕ پێویسـت بێت. ڕوونە کە وا دۆسـتۆیفسـکی ئایدیای مرۆڤی باڵای نیچە ڕەد دەکاتەوە؛ ئەو شـتەی کە لە زمانی ڕووســـیدا بە خوامرۆڤ دەناســـرێت. ئەو زیاتر لە هەر

شتێک خەریکە ڕادەی حەزی مرۆڤ بۆ خۆدوورخستنەوە لە جیهانی دەوروبەری ڕەد دەکاتەوە. ڕاسکۆڵنیکۆف بۆ ئەوەی نەخشەکەی سەر بگرێت، بە دڵنیاییەوە دەبێت خۆی لە خەڵکی داببڕێت. دۆستۆیڤسکی لە قۆناغی یەکەمدا، لە دیدگەیەکی خواپەرستانەوە ئەم ئایدیایە ڕەد دەکاتەوە. ئەوەی کە کەسێک نابەرپرسیارانە بجووڵێتەوە یانی هەموو ئەو ئۆرگانیکەی کە ناوی جیهانە و خوا بە ئێمەی بەخشیوە، پەسەند ناکات. بۆ دۆستۆیڤسکی ئەم پرسە تەنیا هەڵبژاردنی بژاردەیەک نییە لەجێی دانەیەکی دی، ئەو بڕوای وایە ڕەدکردنەوەی جیهانی ئۆرگانیکی کە لەگەڵ مەسیحییەتی ئەرسەدۆکسدا بووەتە یەک، پێویستی بە خۆئاگاییەکی تەواو جیاواز هەیە. ئیڤانۆڤ چاک ئەم جیاوازییە وەسف دەکات: بڕوابوون بە خوا و ڕەدکردنەوەی بوونی خوا *لە جیهاندا دوو مانای جیاواز نین، بەڵکە هەر لە بنەڕەتەوە دوو جیهانی جیاوازی ڕۆحن، کە لەتەک یەکدییەوەن، وەک جووڵەی زەوی و جووڵەی کۆمەڵەکەی، هەر کامەیان لە بازنەی دیاریکراوی چالاکییەکانی خۆیدا درێژە بە ژیانی خۆی دەدات. بەم پێیە، خواسازی لە خۆ، پاڵپشتیکردنی نامرۆڤانەبوونی خۆیە و وێنای خوا و نەمری لە مرۆڤ دەستێنێتەوە.* وەک چۆن بیردیاییف لە بەرهەمی دۆستۆیڤسکیدا دەرک بەم پرسە دەکات: *ڕەدکردنەوەی نەمری واتە ڕەدکردنەوەی بوونی چاکە و خراپە لە جیهاندا.* واتە تاک خۆی لە سەرووی تایبەتمەندییە بەرپرسیارانە سنووردارەکانی جیهانی مرۆڤەکانەوە ببینێتەوە. واتە ڕەدکردنەوەی یەکێک لە دێرینترین دیدەکان لەبارەی دۆخی مرۆڤەوە: باش نییە مرۆڤ تەنیا بێت.

بەم پێیە، سێیەمین بەڵگاندنی ڕاسکۆڵنیکۆف ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە خواسازیی مرۆڤەوە، کە پێشتر ئاماژەی پێ درا. لە بارێکدا کە خەریکی باسکردنی گوتاری *لەبارەی تاوان* و ئایدیای مرۆڤی ڕیزپەڕ و مرۆڤی ئاساییەوەن، پۆرفیری دەپرسێت *یانی ڕێی تێدەچێ ئەگەر لە*

*ژیانی ئاساییاندا تووشی کێشەیەک شتێک ببن... یان تەنانەت گریمان ئامانجەکەشستان خزمەتکردن بێ بە مرۆڤایەتی، بڕیاری ڕامالّینی بەربەستەکانی سەر ڕێگەتان بدەن و بۆ نموونە خۆتان دەست بدەنە دزی و کوشتار؟* بەر لەوەی زیاتر ئەم بابەتە بکەینەوە، پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە بە وەرگێڕانی ئەم ڕستەیە بەشێک لە مانا سەرەکییەکە ون دەبێت. وشەی سنووربەرزاندن (پێلێڕاکێشان) بە ڕووسی و بە وەرگێڕانە وشەبەوشەییەکەی دەبێتە *تێپەڕین*. گرنگیی ئاماژەکردن بەم بابەتە لەوەدایە کە وشەی ڕووسیی تاوانیش کەم تا زۆر شتێکی لەم بابەتەیە: سنووربەزاندن. زانینی ئەم خاڵە، وا دەکات مرۆڤی ڕیزپەڕ ئەو مافەی هەبێت کە مۆڵەتی تێپەڕین لە هەندێک بەربەست بە خۆی بدات، تا مانایەک پەیدا بکات. هەر لە بنەڕەتەوە گەر کەسێک ویژدانی هەبێت، لە کاتی تووشبوونی تاواندا بە ئەگەرێکی زۆر لەو بارەدا تووشبوونی تاوان یەکسانە بەوەی کە مۆڵەت بە ویژدانی بدات تێبینییە ئامارییەکانی ئەو جۆرە کردەوەیە لە بەرچاو نەگرێت؛ دەبێت *مرۆڤایەتی* چاو لەئاست ویژدانیدا بپۆشێت. هەڵبەتە ئەم سنووربەزاندنە، یانی نکۆڵیکردن لە مرۆڤبوون و هەرچی کە پێیەوە پەیوەستە، وەک ئەگەری تاوان، هەڵە و سنوورداریی مرۆڤانە. بە دەربڕینێکی دی، سنووربەزاندن بەر لە هەر شتێک، لە دیدگەی مەسیحییەتەوە، جووڵەیەکە هەر لە بنەڕەتەوە لە لووتبەرزییەوە سەرچاوە دەگرێت. لە دونیای دۆستۆیفسکیدا، لووتبەرزی نەک هەر بە تەنیا سنووربەزاندن، بەڵکە دەرچوونە لە پەیوەندییە بەرپرسیارییە مرۆڤانەکان. لووتبەرزی، خۆخستنە دەرەوەی پێکهاتە سیاسییە مرۆڤانەکانە، هەر بەو جۆرەی کە *کیللوف* لە *شەیتانەکان*دا نیشانی دەدات، شتێک نییە لە توخمی هەڵکشان، بەڵکە ڕەگەکەی لە خووێکی ئاژەڵانەدایە.

ڕازومیخین تێدەگات کە ئەم پرسـەیە، خاڵی سـەرەکیی ئازادیی جیـسـەرنجی ڕاسـکۆڵنیکۆفە و دەڵێت، *دەیانەوێ مرۆڤ هیچ کەسـایەتییەکی تایبەت بە خۆیی نەبێ و بە جۆرێکیش کراس لەسـەر ئەمە دەدڕێنن کە هەر مەپرسـە! دەیانەوێ خۆیان نەبن، تا پێیان دەکرێ لە خۆیان نەچن. ترۆپکی پێشـکەوتن لەمەدا دەبیننەوە، ئەو بەڕێزانە!* ڕازومیخین دەڵێت پێشـکەوتن و ئازادیی نابەرپرسـیارانە، هەردووکی لە ئایدیای دروسـتکردنەوەی مرۆڤدا هەر لە جووڵەدان تا ئەو شـوێنەی کە هەنگاو دەنێنە سـەرووی سـنووردارێ و ئەو بوونەوەرە داماوانەی کە خوا لەسـەر زەوی ئافراندوونی. بکوژی خوا، کە لە سەریدا خەریکی پەروەردەکردنی ئازادیی نابەرپرسیارانەیە، ئەو بەربەسـت و سـنوورداریيەتیانە تێدەپەڕێنێت کە نەریتە ئاکارییە باوەکان دروسـتیان کردوون و هەر وا پەیڕەوییان لێ دەکرێت. کاتێک خودا دەکوژرێت، بەربەسـت لادەچێت. بۆ ڕاسـکۆڵنیکۆف و ئەو کەسـانەی کە بۆچوونی ئەم جۆرە ئازادییە جادووی لێ کردوون، بەربەسـتی مرۆڤـایەتی شـتێکی ڕێژەییە. ڕێچـاریش ئـازادییەکی نابەرپرسیارانەیە.

## ٢

## ئازادیی بەرپرسیارانە

ئەگەر ڕاسکۆڵنیکۆف لە کۆشکی بلووریني ئازادیی نابەرپرسیارانەدا زینـدانی کراوە، ئەوە تەنیـا سـۆنیـایە کە دەتوانێت کلیلی ئـازادیی بەرپرسـیارانەی بداتێ. لە ڕۆمانەکەدا کەمێک پێشـتر، ڕاسـکۆڵنیکۆف دوای کێشـمەکێش لەگەڵ ویژدانیدا، داوا لە سـۆنیا دەکات ئەزموونی تاقیکردنەوەیەکی فکریی لەگەڵدا بکات. ئەو لە سـۆنیا دەپرسـێت ئەگەر

مۆڵەتی هەبا لەنێوان لوژنی ئارەزووباز و ژنە کۆسـتکەوتووەکەی مارمیلادۆفدا دانەیەکیان هەڵبژێرێت، ئەوا دەبوو لەنێوان ئەم دووانەدا کامەیان بمردبان؟ پرسیارەکە بە جۆرێک دەخرێتە بەرباس کە ناکرێت هیچ وەڵامێکی بـدرێتەوە... دەبێـت لەنێوان ئەو دووانەدا یەکێکیـان بمرێت. لەوانەیە وەڵامەکەی سـۆنیا یەکەمین بەرسـیڤی دۆسـتۆیفسـکی بێت بۆ بەڵگاندنەکانی ئازادیی نابەرپرسیارانە. سۆنیا دەڵێت:

> باشە من کوا لە قەدەری خوا بەئاگام؟... بۆچی شتێ دەپرسن کە هی پرسـین نییە و ناشـکرێ وەڵام بدرێتەوە؟ ئەسـڵەن ئەم پرسـیارە پووچ و بێمانایانە سـوودیان چییە؟ بۆ دەکرێ وەها شـتێ پەیوەندیی بە بڕیاری منەوە هەبێ؟ ئاخر من چیم تا ببمە داوەری مان و نەمانی خەڵکی؟

ڕاسکۆڵنیکۆف بۆیە دەتوانێت وەڵامی ئەم جۆرە پرسـیارانە بداتەوە کە خۆی بە مرۆڤێکی ڕیزپەڕ دەزانێت، مرۆڤێک کە لە مرۆڤایەتی جیا بووەتەوە، بەڵام دوای وەڵامەکەی سـۆنیـا، ڕاسـکۆڵنیکۆف تەنیـا دەبۆڵێنێت، *باشـە، گەر بتەوێ بابەتی قەدەری ئیلاهی بێنیتەوە نێو باسـەکە ئیتر قسـەیەک نامێنێتەوە!* بەڵام بۆ ڕاسـکۆڵنیکۆف خوا نەهاتووەتە نێو بابەتەکەوە. خوا مردووە. تاکە پرسـیاری ڕێتێچوو ئەمەیە کە ئایا ڕاسـکۆڵنیکۆف دەتوانێت مۆڵەت بە خۆی بدات بەسـەر لاشـەی مرۆڤەکاندا تێپەڕێت یان نا. پرسـەکە ئەوە نییە کە ئایا وەها بڕیارێک ڕێپێدراوە یان نا، ئەوە گرنگە کە ئایا ئەو، هەمان ئەو کەسەیە کە هێڵەکە تێدەپەڕێنێت یان نا. ڕاسـکۆڵنیکۆف کە لەگەڵ ئەم پرسـەدا کێشـمەکێشـیەتی، دانی پێدا دەنێت کە حەز دەکات ببێتە ناپلیۆن. وەک چۆن خۆی بە وردەکارییەکی زیاترەوە دەیڵێت:

> ئەمە یاسـای سـرووشـتی مرۆڤە، سـۆنیا... یاسـایە! ئێسـتەش چاک دەزانم هەر ئەوەندە بەسـە کە ڕۆح و زەینت بەهێز بن تا بتوانی بیانبەزێنی! کێ بوێرە ئەو کاکە و سـەروەرە! ئەو کەسـە

دەکەنە یاســــادانەری خۆیان، کە حســــێب بۆ مرۆڤایەتی ناکا. دایمەش ئەو کەسە لەسەر هەقە کە زات و بوێریی زیاترە! لەوەتی دونیا دونیایە هەر وا بووە! مەگەر کەســێک کوێر بێ ئەم شــتانە نەبینێ... سۆنیا، لەو ساتەدا بوو کە بۆم یەکلایی بووە دەسەڵات تەنیا و تەنیا هی کەســـێکە کە دەوێرێ بچەمێتەوە و بەســــەر زەوییەوە بیرفێنێ. پێویســـتیش نــاکــا هیچی تری هەبێ! نە تــایبەتمەنــدییەکی بەرجەســـتەی دەوێ، نە لێهــاتوویەتییەکی دەگمەن... تەنیا دەبێ بوێریت هەبێ! پاشــــان بۆ یەکەمین جار بیرکردنەوەیەکم بە زەیندا هات کە پێشتر بە زەینی هیچ کەسێکدا نەهاتبوو، هیچ کەس! وەک ڕۆژ بۆم ڕۆشـــن بووەوە کە ئاخر چۆن کەسێک نەبووە و نییە لەم دونیا شێتەدا لێی بچێتە پێش و لەقەیەک بکێشــێ بە هەموو شــتێکدا و قڵپی بکاتەوە؟ دەمویســت بوێری بنوێنم... ســۆنیا، دەمویســت لەنێو ئەم هەمووەدا من بوێر بم و هەر لەبەر ئەوە بوو پیرێژنەکەم کوشــــــت! ئەمە بوو پاڵنەرەکەم!

ئەم دانپێدانــانە بۆ تێگەیشــــتنی ئــایــدیــای ئــازادی لە دیــدی دۆســــتۆیڤســــکییەوە زۆر گرنگە. نیشــــانی دەدات ڕاســـکۆڵنیکۆف بە تێکەڵنەکردنی خودا لەگەڵ بابەتەکەدا، ئازادە و بەم پێیەش، ئارەزووی لە هەر کارێک بێت دەیکات. ئەو ئازادە لە دانی بڕیارێکدا کە ســــۆنیا ئامادە نییە بێتە ژێر بارییەوە. ئەو وەک خوامرۆڤێک دەتوانێت بڕیار بدات کێ بە زیندوویی بمێنێتەوە و کێ بمرێت. لەگەڵ ئەمەشــــــدا، لە دیدی دۆستۆیڤسکییەوە، ئەو ئازادییەی کە ڕاسکۆڵنیکۆف بە کوشتنی ئەبســــتراکتی خوا پێی دەگات، هیچ شـــتێک نییە بێ لە ئــازادیی سنووربەزاندن یان گلان لە تاوانەوە. بەم پێیە، ئەنجامی لۆژیکیی *دوو کەڕەت دوو یەکسانە بە چواری* پیاوە ژێرزەمینییەکە تاوانە، نە کەمتر و نە زیاتر. ئەم ئازادییە دەگۆڕێت بۆ ستەمکاری، شوێنی تەورێک وا بە تەپڵەســــەری پیرێژنێکەوە و دونیا هەر لە بنەڕەتەوە هەمان ئەو

ئازادییە گشـتی و ئەبسـتراکتە نییە کە ئامانجی ڕاسـکۆلنیکۆف بوو. ڕاسـکۆلنیکۆف دوای کوشـتنەکە دەرک بە ئەگەری بەهەڵەداچوونی خۆی دەکات و لای سۆنیا دانی پێدا دەنێت:

– سـۆنیا، تۆ وس بە! خۆم هەموو شـتێ دەزانم و تێدەگەم. لەو تاریکی و تەنیاییەدا، زۆر بیرم لێ کردووەتەوە و بە خۆمم گوتووە. وردترین خاڵەکانیم شـەنوکەو کردوون و بەسـەر بچووکترین شتیشدا تێنەپەڕیوم. خۆم لە هەموو شتێ تێدەگەم و بە پێچوپەناکەی ئاشـنام! نازانی چەندە لەو سـەردەمە پووچە ماندوو بووم! دەمویست هەموو شتێ لە بیر بکەم و سەرلەنوێ دەست پێبکەمەوە، سۆنیا. دەمویست بیرکردنەوە وەلا بنێم. پێم بڵێ، خۆ تۆ وات نەزانیوە من وەک گەمژە کەللەپووتەکـان بە پێخواسـی بەناو کەوتووم، ها؟ نا، بەوپەڕی ئەقڵدروسـتییەوە هاتمە ناو ئەم یارییەوە و هەر ئەوەش تەفروتووناى کردم. نەکا لات وابێ نەمـدەزانی! لە خۆمم دەپرسـی باشـە تۆ هەر لە بنەڕەتەوە ئەو مافەت هەیە کە دەسـەڵات بگریتە دەسـت؟ بە دڵنیـاییەوە ئەو مـافەم نەبوو! یـان دەمپرسـی بە بۆچوونی تۆ مرۆڤەکـان ئەسـپێن یـان نـا؟ کەواتە بۆم ڕوون دەبێتەوە کە مرۆڤەکان ئەسـپێ نین. چونکە بەلای ئەو کەسـەوە مرۆڤەکان ئەسـپێن کە بێ پرسـکردن بەرەو ئامانجەکەی مل دەنێ و هیچ بیرێکیش نـاکـاتەوە. منێ کە بە درێژایی ئەو ڕۆژانە هەر لە بەیانییەوە تا شـەو بیرم دەکردەوە و لەگەڵ خۆمدا کێشـمەکێشـم بوو کە ئەگەر ناپلیۆن لەجێی مندا با چیی دەکرد، یانی خۆمم بە ناپلیۆن نەدەزانی... چ ئەشکەنجەیەکم کێشا بەدەست ئەم هەموو بیر و خەیاڵەوە و دواجاریش هەموو ئاواتم بووبووە ئەوە کە تەنیا خۆم لەو ئەشـکەنجەیە ڕزگار بکەم! دەمویسـت بێ هیچ هۆکار و لۆژیکێک دەسـت بدەمە ئەو کردەی کوشـتنە، سـۆنیا؛ لەبەر خۆم، تەنیا لەبەر خۆم! نەمدەویسـت تەنانەت درۆ لەگەڵ خۆشمدا بکەم! بۆ یارمەتیدانی دایکم نەبوو کە مرۆڤم کوشت. نا،

ئەمە درۆیە! چاوم بەدوای دەســەڵاتەوە نەبوو تا لەڕێیەوە چاکە لەگەڵ کەسێکدا بکەم! ئەمە هەمووی درۆیە! زۆر بە سادەیی لێم دا و کوشتم، تەنیا لەبەر خۆم. لەو ساتەشدا بەقەد سەرەدرزییەک بۆم گرنگ نەبوو کە بڕیارە چاکەیەک لەگەڵ کەسێکدا بکەم، یان تا کۆتایی تەمەنم وەک جاڵجاڵۆکەیەک دانیشـــم و خەڵکی بخەمە داوەوە و شلەی گیانیان بمژم!... پارەشم نەدەویست، سۆنیا؛ یانی لەو کاتەی کە نیازی کوشتنیم هەبوو، شتێکی ترم بە لاوە گرنگ بوو... ئەوە ئێســـتەیە کە تێدەگەم چ حاڵێکم هەبوو. هەوڵ بدە دەرکی پێ بکەی. لەوانەیە گەر هەمدیســـــان ئەو ڕێگەیەم بگرتبا بەر، لە کوشـتنەوە نەگلابام. لەو سـاتەدا شـتێکی تر بەرەو پێش پاڵی پێوە دەنام و دەبوو سەر لە شتگەلێ دەربکەم؛ دەبوو تێبگەم کە ئاخۆ دواجار منیش وەک ئەوانی تر ئەسـپێم یان مرۆڤ؟ ئایا دواهەمین هەنگاو بنێم؟ زاتم هەیە دانەوێم و ئەو شتە هەڵگرمەوە کە دەمەوێ، یـان نـا؟ منیش یەکێکم لەو کۆیلە ترســـنۆک و لەرزۆکانە، یان سەرپشک و خاوەنمافم...

سۆنیا دەستی پێکدا کێشا:

– خاوەنماف بن کە مرۆڤ بکوژن؟

ڕاسکۆلنیکۆف بە تووڕەیی هاواری کرد:

– ئاخ، سۆنیا!

دەتگوت بەتەمایە نارەزایی دەرببڕێت، وەلێ تەنیا لە ڕقاندا بێدەنگ بوو و کەمێک دواتر درێژەی دایێ:

– قســـەم پێ مەبڕە، ســـۆنیا، تەنیا دەمویســـت ئەوەت بۆ بسەلمێنم کە دەتگوت لەو ساتەدا شەیتان چووەتە بنکڵێشەمەوە و ئەوە ئەو بوو کە پاڵی پێوە دەنام. جا کە لە کارەکەش بوومەوە، تێی گەیـانـدم مـافی ئەوەم نەبووە بچمە ئەوێ، چونکە منیش ئەسپێیەک بووم وەک ئەوانی تر! شەیتانیش دواتر قەشمەریی پێ کردم و ئەوەتـا ئێســـتەش بێرە گەیشـــتووم! بەخێرهـاتن لە

میوانەکەتان ناکەن؟ ئەسپییەکم و هاتوومەتە ئێرە بۆ لای تۆ، وا نییە؟

بەڵام وەها دانپێدانانێک لەوەوە سەرچاوە ناگرێت ئەو پەسەندی کردووە کە ناوەڕۆکی ئایدیاکەی هەڵەیە. بەڵکە ڕاسکۆڵنیکۆف تەنیا بەم ئەنجامە گەیشتووە کە شێوەی کارەکە کێشەی هەبووە؛ ئەو هەمان ئەو کەسە نەبووە کە دەبوو سنوور ببەزێنێت. وەک چۆن خۆی دەڵێت، *شێوازەکەی ناڕاست دەرچووە؟ خەوشی جوانیناسیی هەیە!* بەر لەوە لەبارەی ناپلیۆنەکانی دیکەوە دەڵێت: *ئەوان سەر کەوتن، کەواتە مافی خۆیان بووە و کارەکەیان ڕاست بووە، ئەوە منم کە تووشی نەهاتی بووم و شکستم هێنا، کەواتە مافی ئەوەم نەبووە وەها هەنگاوێ بنێم.*

بەڵام دۆستۆیفسکی شێوەی ئەنجامی کارەکە -کە بە تەپڵەسەردا چەقاندنی تەور کارێکی چەپەڵانەیە- ڕەد ناکاتەوە، بەڵکە بنەڕەتی ئەم ئایدیایە پەسەند ناکات. بەرهەڵستیی ئەو، هەر بەو جۆرەی کە لە زۆربەی بەرهەمەکانیدا دیارە، لە زاری ئەندامانی نزمترین چینی کۆمەڵگەوە دەردەخرێت: مرۆڤە سەرخۆشەکان، گاڵتەجاڕ و شێتەکان. لە *تاوان و سزادا*، ئەم دەنگە بەخشراوەتە سۆنیای سۆزانیی چیرۆکەکە. ڕاسکۆڵنیکۆف کە هێشتا لای وایە کارەکەی لەڕووی جوانیناسییەوە کێشەی هەیە، لەو دەپرسێت:

بۆ مەگەر خۆت بێ لەمە هیچی ترت کردووە؟ تۆش توانیت هەنگاوی کۆتایی بنێیت، هەنگاوێکی درێژتر بنێیت و توانای ئەوەشت لە خۆتدا بینی. تۆ دەستت چووە ژیانی خۆت و هەرچۆنی بووە ژیانێکت لەنێو برد، *ژیانی خۆت*، هەر ئەوەیە دەی، جیاوازیی نییە! دەتتوانی ژیانێکی مەعنەوی و لەسەر بنەمای ئەقڵ و لۆژیکت هەبێ، وەلێ ئێستە ئاقیبەتەکەت دەبێتە سوورانەوە بە سێنایادا... نا، تۆ ناتوانی بەرگە بگری و ئەگەر بە تەنیا بمێنیتەوە، ڕێک وەک من شێت دەبی. خۆ هەر ئێستەش کەم

شــێت نیی! کەواتە دەبێ پێکەوە و بە یەک ڕێگەدا بڕۆین. وەرە، وەرە با پێکەوە بڕۆین!

بەڵام سـۆزانییەتیی سـۆنیا لە کارەکەی ڕاسـکۆڵنیکۆف ناچێت. ئەو سـەربەسـتانە ژیانی خۆی لەپێناو ئەوانی دیکەدا کردووەتە قوربانی. کوشتنی پیرێژنەکە بە هیچ شێوەیەک وەک لەخۆبردووییەکەی سۆنیا نییە؛ ئەو شتەی کە تێهەڵکێشیکی ئاشکرای قوربانیدانەکەی مەسیحە. بۆ دۆسـتۆیڤسـکی، ئازار و لەخۆبردوویی سـۆنیا کتومت سـەرچاوەی ئازادیی بەرپرسیارانەیە. سۆنیا بە گرتنەبەری ڕێگەی مەسیح، ئەوەش کە نابێت بڕیار بدات دەبێت کێ زیندوو بێت و کێش بمرێت و تەنیا لەخۆبردوو بێت، ڕێگە بۆ ئازادیی بەرپرسیارانە خۆش دەکات. هەر بە هەمان شێوە خوشکەکەی ڕاسکۆڵنیکۆف لەبارەی زەماوەنکردنەکەیەوە لەگەڵ لوژندا دەڵێت، *گەر بڕیار بێ لەم نێوەندەدا کەســێ بفەوتێ، ئەو کەســە تەنیا منم، نەک هیچ کەســێکی تر... خۆ پیاوم نەکوشــتووە!...* ئەویش ئامادەیە ئازادانە لەپێناو ئەوانی دیکەدا خۆی بکاتە قوربانی، بەڵام لەم پرســـەدا، بڕیارەکەی بۆ ئازادکردنی هەموو مرۆڤەکان نییە. شتێکی خۆویستانە و نابەرپرسیارانە لە کارەکانیدا بوونی نییە و تەنیا دەیەوێت یارمەتیی دایکی و خوشـــکەکەی بدات، یارمەتیی کەســـانی نزیک و ئازیزی.

لەخۆبردوویی دونیا تا ڕادەیەک جیاوازە لەگەڵ کارەکەی سـۆنیادا. ســـۆنیا بەو کارەی خۆی لەنێو بردووە، خۆ ئەگەر لە ئاقیبەتدا وا نەبێت، ئەوا لە ڕۆژگاری هەنووکەییدا وایە. ئەو بۆ نموونە لە کۆڕە شــیاو و شــکۆدارەکاندا بێزراوە و زۆربەی خەڵکی بە چاوێکی سووکەوە تەماشـای دەکەن. سـەرەڕای ئەم شـتانەش، ئەو پەیوەندیی خۆی لەگەڵ زڕدایکی، برا و خوشـــکە زڕەکانی و تا ڕادەیەکی زۆر لەگەڵ ڕاسـکۆڵنیکۆفدا لەســـەر بنەمای عەشـــق پاراســـتووە. لە خۆی بێگانە بووە، بەڵام تەنیا نییە. لەخۆبردووییەکەی گەلێک هاوشـــێوەی قوربانیدانەکەی مەســـیحی نێو کتێبی پیرۆزە، لەلای دۆســـتۆیڤســـکی

هەرگیز ئەو زیندووبوونەوەیە دوای تووشـــبوونی تاوان نایێتە پێش، بەڵکە لەبری ئەوە، ئەوە سزایە کە دێتە پێش. تاوانی ڕاسکۆڵنیکۆف لە پلەی یەکەمدا ئەوەیە کە بە گۆڕان بۆ خوامرۆڤێک خۆی لە مرۆڤایەتی جیا دەکاتەوە. گەر بمانەوێ گوتەکەی خۆی بەکار بهێنین، ئەو *لە بستە* زەوییەکدا زیندانی کراوە. ژیانی ســەرزەوی بۆ ڕاسـکۆڵنیکۆف بووە بە دۆزەخێک، ئاخر ئەو وەک خوامرۆڤێک هیچ شـــوێنێکی نییە بۆی بچێت. ئەویش بە گلان لەم تاوانە کارەســاتبارە و، لەوەش گرنگتر، بە خواســـــازی لە خۆی، خۆی لە کۆمەڵگە دابڕیوە. هیچ ڕێگەیەک بۆ هەڵهاتن لەئارادا نییە، ئەو لە جیهانی خۆیدا تەنیای تەنیایە: تەنیا لە جیهانێکدا کە بەر لە کوشتنەکە بڕوای وا بوو دەگۆڕێت بۆ بەهەشتێکی سەر زەوی. ئەو بە شـەقامەکانی پیتەربورگدا بێئامانج دەسووڕێتەوە، هەم خوازەیی و هەم نەرێســـــاتی (کینـایی)، *لەم دواییـانەدا* جۆرە *دڵەڕاوکێیەکی دیکە یەخەی گرتبوو. شتێک نەبوو کە ئازارێکی ئەوتۆی بدات یان لە ناخەوە بیســووتێنێت، بەڵام بە جۆرێک لە جۆرەکان وای هەسـت دەکرد کە دەشـێت دوایی نەیێت. دەتگوت بڕیار وا بوو تاهەتا بەردەوام بێت، جا ســاڵیش دوای ســاڵیش بیرهێنەرەوەی پەشـێوییەکی تاڵی بێکۆتا و دڵتەزێن بێت، لە هەمان ئەو بستە زەوییەدا.*

دابڕانی ئەو لە مرۆڤایەتی، بە تەنیا وێڵی دەکات و خۆشــەویســتیی بۆ مرۆڤەکانی دیکە نابزوێت و هەست بە خۆشەویستییان ناکات. ئەو لەبری بەهەشتەشار، دۆزەخی ساز داوە[1].

هەڵبەتە ئەم هەستە کاریگەرییەکی بەسـەر ڕاسکۆڵنیکۆفەوە نییە و هێشــتا بڕوای وایە کە ئایدیاکەی بەبۆنەی ڕووداوێکی باشــەوە کە لە داهــاتــوودا ڕوو دەدات، ڕاســــت دەردەچــێـت. ئەو ئــازادیــیە

١. لێرانەدا قســـەکەی باوکی زۆســـیمامان بیر دێتەوە: دۆزەخ چییە؟... ئازارێکە و کاتێک سەرچاوە دەگرێت کە تاک هەست دەکات توانای خۆشویستنی نییە.
هەروەها: ئەوانەی کە مرۆڤەکانیان بە شـێوەیەکی گشـتی خۆش دەوێن، هەمیشـە بە شێوەیەکی تایبەتی ڕقیان لێیانە.

نابەرپرسـیارانەیەی کە ئەو بۆ مرۆڤایەتیی پێشـنیار دەکات لەو تاوانە بچووکە جێبســـەرنجترە کە کردوویەتی، جا گەر تێبگات کە هەر بە راســـتی مافی ســـنووربەزاندنی نەبووە، گەر تێبگات کە رۆحی بە سـزادانێکی تاهەتایی گیرۆدە بووە، هێشـتا هەر جیاوازییەکی ئەوتۆی نابێت، چونکە ئامـادەیە بە نـاوی چاکەی رووتی مرۆڤایەتییەوە ئەم دۆخە پەسـەند بکات. ئەمە یەکێکە لەو هزرانەی کە بۆ نووسـینی *تاوان و ســزا* و زۆربەی رۆمانە پاشـســیبیریاییەکان بووە ئیلهامبەخشــی دۆسـتۆیفسـکی، ئەو بۆچوونەی کە ئەگەرچی دەکرێت راسـکۆڵنیکۆف بەنەفرەت کرابێت، بەڵام هەر دەکرێت خۆی لە تاوانەکەی پاک بکاتەوە. راســـکۆڵنیکۆف کە بە هەڵە لەم خۆپاککردنەوەیە تێگەیشـــتووە، بەم جۆرە رروونی دەکاتەوە: *من تەنیا ئەســـپێیەکم کوشـــت، ســـۆنیا. ئەســـپێیەکی بێکەڵک و قێزەون کە بوونی مایەی زیان بوو.* جا بیر دەکـاتەوە: *لەوانەیە هەڵە ســـەرەکییەکەی من پیرێژنەکە بێ، وەلێ مەســـەلەکە لە بنەڕەتدا لەســـەر ئەو نییە! ئەو پیرێژنە تەنیا میکرۆبێک بووە و هیچی ترا... من هەڵپەم بوو تا لە هێڵەکە تێپەڕم... ئەوەی کە من کوشـــتم مرۆڤ نەبوو، من رێســـایەکم لەناو بردا ئەرێ، لەوانەیە بنەما و رێســـایەکم کوشـــتبێ، کەچی نەچوومە ئەودیو هێڵەکە و هەر لەمدیو مامەوە!...*

ئەو هەر دانی پێدا نانێت کە تووشـــی تاوانێک بووە و هێشـــتا لای وایە لە واقعیەتێکی ئاکاریی بەرزتردا رۆڵی هەیە. بەم پێیە، رزگاری بۆ راسکۆڵنیکۆف نەکردەیە و ونرێی وەک شـەهیدبوون هەڵدەبژێرێت؛ ئەوەی کە دۆسـتۆیفسـکیمان دەخاتەوە یاد: لە سـاڵی ١٨٤٩دا بە داری گوللەبارانەوە بەستراوەتەوە و چاوەڕێ و ئامادەیە لەبەر پابەندبوونی بە ئازادیی نابەرپرسیارانەوە بمرێت.

هەر بەو جۆرەی کە گوترا، رزگاری بەدوای تاوانکاریدا نایێت، سزا شـــوێنەکەی دەگرێتەوە، بەڵام راســـکۆڵنیکۆف ئامادەیە ئەمە پەســـەند بکات، لانیکەم تا ئەو کاتەی کە لەو قســـەیە تێدەگات کە مارمیلادۆڤ

(باوکی سۆنیا) لە سەرەتای ڕۆمانەکەدا پێی دەڵێت. مارمیلادۆف لە سەرەتای ڕۆمانەکەوە لێی دەپرسێت، *خۆ لە مەبەستم حالی دەبن، کاکە گیان؟ لەوە تێدەگەن کە مرۆڤ شوێنێکی نەبێ ڕووی تێبکا یانی چی؟!* ئەوە تەنیا دوای کوشتنەکەیە کە ڕاسکۆڵنیکۆف دەتوانێت وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە. واتاکەی ئەوەیە کە دەبێت لە جیهانی جەستەییدا ئامادەییت هەبێت، بەڵام وەک مرۆڤێک دەبێت لە جیهانێکدا بژییت کە بە تەواوی لە مرۆڤایەتی جودایە. لە بارێکدا کە ئەو لای وا بوو دەبێتە کەسێکی وەک ناپلیۆن یان پیاوێکی گەورە و تەنانەت خوامرۆڤێکیش، کە دەتوانێت جیهان بۆ مرۆڤەکان بکاتە دونیایەکی بەهەشتی، کەچی لە کۆتاییدا تەنیا تاوانێکی لەدژی ئەو خەڵکە کرد کە لای وابوو ئەو خەریکی ڕزگارکردنیانە. هەر بەو جۆرەی دەکرێت ڕووسگەلی بەرهەمەکانی دۆستۆیفسکی بیڵێن، کردەوەکەی ئەو ستەمکردن لە خەڵک و تاوان بوو لەدژی *نیشتمانی دایک*.

کتومت هەر لەبەر ئەمەیە کە سۆنیا پێی دەڵێت ئەو دەبێت لەگەڵ نیشتمانی دایک، خەڵکی ڕووسیا و لەگەڵ خۆیشیدا ئاشت ببێتەوە، ئەو دەبێت:

> هەر ئێستە دەچی لەسەر چوارڕیانەکە ڕادەوەستی، دەکەویە سەر ئەژنۆ، سەرەتا ئەو خاکە ماچ دەکەی کە حورمەتیت نەگرت و پاشانیش لەبەردەم هەموو دونیادا، لەئاست چوارقوڕنەی جیهاندا، مل کەچ دەکەی و بە هەموو خەڵکی دەڵێی: *من بکوژم!* ئەوسا خوا هەمدیسان ژیانت پێ دەبەخشێتەوە. خۆ دەڕۆی، ئەرێ؟ دەڕۆی؟

بەلای سۆنیاوە –هێمای سەرەکیی ئازادیی بەرپرسیارانە– ڕاسکۆڵنیکۆف تەنیا کاتێک دەتوانێت ئازاد بێت کە ئەوە پەسەند بکات کە بەرپرسیارانە ڕەگی داکوتیوە و مرۆڤانەیە. بکوژ تەنیا کاتێک دەتوانێت ببێتە بەشێک لە مرۆڤایەتی، کە باوەش بۆ ئەو عەشقە بکاتەوە کە ئاوها سەربەستانە سۆنیا و دایکی نیشتمان بەویان

بەخشی، بەڵام ڕاسکۆڵنیکۆف ناتوانێت وەها مۆڵەتێک بە خۆی بدات، چونکە ئامادە نییە بزانێت ژیان لە بەستەزەوییەکدا واتە چی؟ ئەمە دیوی ئاوەژووی کارگەلێکە کە وەک فریادڕەسێک کردوونی. پیرێژنەکەی بە ناوی ئازادییەوە کوشتووە، کەچی بە کردنی ئەم کارە نەک هەر نەیتوانیوە ئازادییەکی زیاتر ببەخشێتە مرۆڤێک، بەڵکە ئازادیی خۆشی لەنێو بردووە. ئەمە کارەسات و پارادۆکسی ئازادیی نابەرپرسیارانەیە.

پۆرفیری، ئەو لێکۆڵەرە پۆلیسەی کە بەدواداچوون بۆ کوشتنەکان دەکات، هیچ گومانێکی لەوەدا نییە کە ڕاسکۆڵنیکۆف تاوانبارە، بەڵام ناتوانێت بیسەلمێنێت. ئەو بە هەندێک لە قسەکانی ڕاسکۆڵنیکۆف و خوێندنەوەی گوتارەکەیدا زانیویەتی ڕاسکۆڵنیکۆف تاوانبارە و، لە ئەنجامدا، ئاشنای ئەو تیۆریانە بووە کە ڕاسکۆڵنیکۆف بڕوای پێیان هەیە. ئەو دەزانێت پاڵنەرەکانی ڕاسکۆڵنیکۆف چین و لەم بارەیەوە دەڵێت: *هەر بە خێر گەڕا کە بەم ئایدیایەتان تەنیا ئەو پیرێژنەتان کوشت! خۆ ئەگەر ئایدیایەکی تر بکەوتبا ئەو کەڵلە پووچەتانەوە واوەیلا دەبوو، بۆی هەبوو کارەساتێ بێنە ئارا هەزار جار خراپتر لەمە!* بیرکردنەوە لەوەی کە ئاخۆ چ شتێک لە تەورچەقاندنە تەپڵەسەری پیرێژنەکە خراپترە، گەلێک سەختە، بەڵام دۆستۆیڤسکی شتێکی ئێجگار ڕوونی لە زەیندایە. ئەو کەم تا زۆر دەتوانێت وێنای ئەو بێسەروبەرییە کارەساتبارە بکات کە دەکرێت بە ناوی ئازادیی نابەرپرسیارانەوە لە ئەورووپا و ڕووسیادا سەر هەڵبدات. کێشەی ئازادی کتومت لە ڕاستێنەگەیشتنی دوو جۆر ئازادیدایە، کە جۆرە ئازادییەکیان مرۆڤ تێیدا خۆی لە مرۆڤەکانی دیکە و پەیوەندییەکانیان دادەبڕێت و، جۆرە ئازادییەکەی دیکەش، بە عەشق و یەکتربینین و لەخۆبردوویی پشتئەستوورە.

٢٠١٣

# ئیمان و ئینسانۆستیی[1] دۆستۆیڤسکی

ڤیکتۆر بیرافییێف

(هەڵبژێردراو)

شوێنکەوتووانی فکری دۆستۆیڤسکی لە سەرەتای چەرخی بیستەمدا، تەنانەت لیبراوتر لە ڕێنوێنیکەرەکانیشیان، جەختیان لەسەر سوودی ئیمان دەکردەوە. سێرگی بۆڵگاکۆفی فەیلەسووفی ڕووسی، ئایدیایەکی پلەبەپلە پەرەسەندووی بنیاد نا کە هەڵوێست و هەر لە بنەڕەتەوە جیهانبینیی خودی دۆستۆیڤسکیی بیر دەهێنایەوە. بۆڵگاکۆف، لە بنەڕەتەوە ئامانجی پەرەسەندووی مێژوویی لە باوەڕی مەسیحی و باوەڕە ئیلحادییەکان پێک بەراورد کردن تا ڕوون ببێتەوە کامەیان وەک دەڵێن بەسوودترە. ئەو لە باوەڕی ئیلحادیدا زۆر ویژدانارانە ئەوەی بەدی کرد کە ئامانجەکەی بەختەوەریی نەوەی دوایی و هاوسەردەمی خۆی بوو؛ نەوەیەک کە بەسەر ئێسکوپرووسک و خوێنی پێشینانەوە ئاهەنگێکی ساز داوە، بەڵام لەلایەن خۆیەوە لە چنگی دوورەدەستی چارەنووسی مەرگ و نەماندا دیلە (جا گەر نەهامەتییە ئاساییە ڕێتێچووەکانیش بخەینە لاوە و لە بەرچاویان نەگرین)، بەڵام باوەڕی مەسیحی باوەڕ بە هەستانەوەی سەرتاسەری، زەوییەکی نوێ و ئاسمانێکی نوێ بوو، ئەو کاتەی کە خوا هەموو

---

[1] ئینسانۆستی: هیومانیزم؛ مرۆڤخواز؛ مرۆڤهۆگر (هۆگر بە مرۆڤەوە): ١. هەر چەشنە بنەمایەکی کرداری یان فکری کە تەنیا بیر لە قازانجی مرۆڤ دەکاتەوە. ٢. لایەنگری لەو بیروبۆچوونانە کە دەبنە هۆی پەرەسەندنی فەرهەنگی مرۆڤایەتی. «و. ک»

شـــتێکە و لە گشـــت شـــتێکدایە. ســـێرگی بۆڵگاکۆف لە درێژەی ئەم بەراوردکـــردنەدا بەو ئەنـــجـــامە دەگـــات کە، ئەوە ڕوونە هـــیـــچ ماکســـــیمالیزمێکی (درێژدادڕی) ئیلحادیی ئەرێنی لە باوەڕی خۆی و تەنانەت لە دوورترین دیدی خۆشـــییەوە لە فێرکارییە مەســـیحییەکان نزیک نابێتەوە.

دەزانین کە بەخششـەکانی مەسـیحییەت —نەمری و ژیانی تاهەتایی و هیتر— دایمە لە دۆخێکدا نین کە ڕۆحی فاوستیـ[1]ـی تاکی ئەورووپا شەیدای خۆیان بکەن، تاکایەتییەک کە وەها کەڵکەڵە و خۆسەلماندنێک بۆ خۆی دادەهێنێت کە لەبەرانبەریدا، خود، لە ســـەراســـیمەبوونێکی بێدەنگدا جووڵەی لێ دەبڕێت و تەنانەت ئامادەشـــە لەپێناویدا هەموو ژیانی ئەودونیای خۆی بکاتە قوربانی. دۆســـتۆیڤســـکی چاک لەمە تێگەیشتبوو. بە هەڵکەوت نەبوو کە *پیاوە گاڵتەجاڕەکەی*[2] ئەو سووک و ئاســـان لەو خەونە فەلســـەفییەیدا بە ژەهری شـــیرینی تاکگەرایی نیشـتەجێیانی ئەو هەسارە بەختەوەرە پاک و هێژایەی پەلکێش کردنە نێو گەندەڵی و فەوتانەوە.

ســـەرلەبەری بەرهەمی ســـەردەمی کامڵبوونی دۆســـتۆیڤســـکی لە بنەڕەتدا ململانێیەکی بێوەســـــتانە لەنێوان دوو بنەمـا و ڕێســـــادا:

---

١. لە دیدگەی شپنگلەرەوە ڕۆح یان سیمای فاوستی، تایبەتە بە مرۆڤێک کە خاوەنی کەڵکەڵە و تامەزرۆییەکی تێرنەبووە بۆ تێگەیشـــتن لە حەقیقەت و خاڵی بەرانبەری مرۆڤی ئەفلاتوونیی یۆنانی کەونارایە. ســـیمای نەریتفاوســـتی، ناونیشـــانی گرنیەستێکی نەریتی ئەورووپایی بوو کە لە ساڵەکانی سەرەتای سەدەی بیستەمدا، شپنگلر لە خۆرئاوای ئەورووپادا (١٩١٨) خستییە بەردەست. ئەو یەکێک لە هەشت ستوونەکەی فەرهەنگ و نەریتی ئەورووپای ناو نا فاوستی، چونکە دکتۆر فاوست، کەســـایەتیی بەناوبانگی ئەفســـانەی ئەڵمانی، بە ڕوونی تایبەتمەندییەکانی مرۆڤی ئەورووپایی نیشان دەدا. «و. ف»

٢. ئاماژەیە بە یەکێک لە باشترین کورتەچیرۆکەکانی دۆستۆیڤسکی (خەونی پیاوی گاڵتەجاڕ)، کە کەســـایەتیی ســـەرەکی و گێڕەرەوەی چیرۆکە فەلســـەفییەکەش هەر هەمان «پیاوە گاڵتەجارەکە»یە. «و. ک»

دانەیەکیان، بنەمای تاکگەرایی، بەو فریوە گەورانەیەوە بۆ پەرەسەندنی ئاگایی کە بە هەموو رەوشە رێتێچووەکان ئارەزووی لە خۆسەری و خۆدەربڕینە و لەوەدا چێژێکی تایبەت دەبات کە ئایدیالی مادۆنا (یان هەمان وێنای حەزرەتی مریەم) تاریک و لێل دەکات. ئەوی دیکەیان سەرچاوەی باوانی و بنەچەییە کە بە رۆشنایی ئایدیالی ئایینی رووناکە، ئەم سەرچاوەیە قوربانیدانی خۆخوازانە و تاسەمەندانە دەخوازێت، قوربانیدان بە ناوی هاوتوخمی خۆوە، قوربانیدان لە محرابی ئەودا لەپێناو رزگاربوونی مرۆڤ. ئەمەیە پارادۆکسی بێخەوشی مەسیحییەت!

هەڵبەتە دۆستۆیڤسکی چاوی بەشوێن سەرکەوتنی دووەمین بنەما و سەرچاوەوەیە. ئەو لەبەرانبەر سنووربەزاندن و دەستدرێژیی رووداماڵراوانەی تاکگەرایی مرۆڤدا، لایەنی توخم و وەچەی مرۆڤایەتی دەگرێت، لەگەڵ ئەوەشدا چاک لە بەرزەفڕی و خۆپەسەندییەکانی مرۆڤی پێشکەوتوو دەگات و وەک دەڵێن زۆر باش پێچوپەنا ئەوروپییەکانی ئینسان دەناسێت؛ پێچوپەناگەلێک کە رێی تێناچێت بەسەریاندا تێبپەرێت. لەخۆڕا نییە کە دۆستۆیڤسکی لە *گوتاری پووشکین*دا دەڵێت:

> راستەقینەبوون و رۆشنبوونەوە، لەوانەیە یەکسان بێت بە بوونە برا لەگەڵ هەموو مرۆڤەکاندا، یان بە دەربڕینێکی دی، ئاوێتەبوون بێت لەگەڵ هەموو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا. سەرلەبەری ئەم سلاڤیدۆستی و خۆرئاواخوازییەی ئێمە، سەرەڕای ئەوەش کە ناچارانە و مێژووسازە، بەڵام بڕواتان هەبێت لە هەڵەتێگەیشتنێکی گەورە بەولاوە هیچی دیکە نییە. بۆ رووسێکی راستەقینە، ئەورووپا و هەموو سەرزەمینی تیرەی گەورەی ئاریایی، وەک خودی رووسیا و رێک چون خاکی نیشتمانەکەی ئازیزن، ئاخر خاک هی هەموو جیهانە و دەستکەوتێکی جیاکراوە نییە. خاکی ئێمە، گیانی برایەتی و کردوکۆششی ئێمەیە بۆ ئەوەی مرۆڤەکان بگەیەنینە یەکیەتییەک.

ئــاه، گەر نەتەوە ئەوروپییەکــان بزانن لەلای ئێمە چەنــدە خۆشــەویســـتن! بڕوام وایە کە ئێمە، هەڵبەتە نەک خودی ئێمە، خەڵکانی داهــاتوو و نەوەی ئـاینـدەی ڕووس هەتـا گەیشـــتنە یەکیەتییەک هەوڵ دەدەن؛ ئـاخر ڕووســـیبوون و ڕووســـیی *ڕاســـتەقینە*، واتە ڕەواندنەوەی ناکۆکی و هێنانەئارای ئاشــتی لە ئەورووپادا، واتە کۆکردنەوەی هەموو برایانی ئێمە لە ئەورووپا بە عەشقێکی دڵئاوایانەوە.

ئەلەم نزیکییە هـاودڵ و خۆمـانەییەی هەردووک ســـەرچاوەکە و لێتێگەیشـــتنیـانـدایە کە کەشـــی مەعنەویی تـایبەتی ڕۆمـانەکـانی دۆســـتۆیفســـکی پێک دێت. ســـەرەڕای ئەمە، ئەم نزیکییە، بووە زەمینە پەیدابوونی پێکهاتەی فرەدەنگیی ڕۆمانەکانی دۆســـتۆیفســـکی کە بۆ یەکەمین جار باختین ئەمەی بۆ هەمووان کردەوە، بەڵام لە دیدگەیەکی ســـەختگیرانەوە، وا باشـــتر بوو ڕۆمانەکانی دۆســـتۆیفســـکی بە پێشفرەدەنگی ناو ببرێن، چونکە فرەدەنگیی ڕەســـەن یانی پەیوەندیی چونیەک لەگەڵ هەر دەنگێکی هەراشـــی بەرهەمەکەدا و ئەوەش بە شێوەیەکی سەربەخۆ، بەڵام لە ڕۆمانەکانی دۆستۆیفسکیدا ئێمە زیاتر خەیاڵی فرەدەنگیمان هەیە کە بە هێزی یەکســـانی دەنگەکان هاتووەتە ئارا؛ دەنگگەلێک کە مافی چونیەک بۆ ئامادەگی شـــک نابەن. لەگەڵ ئەمەشـــدا، گەر بمانەوێ بە شـــێوەیەکی گشـــتی لەم خاڵە بکۆڵینەوە، دەبێت بڵێین خەیاڵی فرەدەنگی شـــتێک نییە لە خودی فرەدەنگی جیا بێت. چالاکتربوونی بنەما و ســـەرچاوەی ســـەرەکیی کەســـی یان تاکایەتی هەلومەرجێک دەهێنێتە ئارا تا نۆرمە[1] ئینســـاندۆســـتییەکان تێپەڕێندرێن. لێرانەدا لەبارەی ســـنووری ســـزانەدراوی ئەم لادان و تێپەڕاندن و خەوشـــەوە پرســـیارێک دێتە پێش. ئەمە پرســـێکە کە دۆســـتۆیفســـکی لە گشـــت ڕۆمانە گەورەکانی و بەر لە هەموویان لە *تاوان و ســـزا*دا تاوتوێی دەکات. لە *تاوان و ســـزا*دا دووجەمســـەریی

---

١. نۆرم: ڕێسا، پێوەر، بنەما

پاڵنەری تاوانەکەی راسکۆڵنیکۆف سەرنجی ئێمە رادەکێشێت. لەلایەکەوە راسکۆڵنیکۆف بڕیاری تاوانکردن دەدات، لەبارێکدا کە دیدێکی کردەیی مرۆڤدۆستانەی لە بەرچاوی خۆیدا راناوە: یەکەم، بە جۆرێک لە جۆرەکان یارمەتیدانی دایک و خوشکی بۆ رزگاربوون لەو دۆخە هەژارانەیەی کە تێیدا نغرۆن و دووەمیش توانای بەردەستکردنی چاکە و سوودێکی مرۆڤانەی هاوبەش. لە لایەکی دیکەوە، راسکۆڵنیکوف ئاماژە بە ئامانجێکی دیکەی تاوانەکەشی دەکات. با سەرنج لەو گوتوبێژە بدەین کە ئەو دوای تاوانەکە لەگەڵ سۆنیادا دەیکات:

بە درێژایی ئەو رۆژانە هەر لە بەیانییەوە تا شەو بیرم دەکردەوە و لەگەڵ خۆمدا کێشمەکێشم بوو کە ئەگەر ناپلیۆن لەجێی مندا با چیی دەکرد، یانی خۆمم بە ناپلیۆن نەدەزانی... ئەشکەنجەیەکم کێشا بەدەست ئەم هەموو بیر و خەیاڵەوە و دواجاریش هەموو ئاواتم بووبووە ئەوە کە تەنیا خۆم لەو ئەشکەنجەیە رزگار بکەم! دەمویست بێ هیچ هۆکار و لۆژیکێک لە کوشتنەوە بگلێم، سۆنیا؛ لەبەر خۆم، تەنیا لەبەر خۆم! نەمدەویست تەنانەت درۆ لەگەڵ خۆشمدا بکەم! بۆ یارمەتیدانی دایکم نەبوو کە مرۆڤم کوشت. نا، ئەمە درۆیە! چاوم بەدوای دەسەڵاتەوە نەبوو تا لەرێیەوە چاکە لەگەڵ کەسێکدا بکەم! ئەمە هەمووی درۆیە! زۆر بە سادەیی لێم دا و کوشتم، تەنیا لەبەر خۆم. لەو ساتەشدا بەقەد سەرەدرزییەک بۆم گرنگ نەبوو کە بڕیارە چاکەیەک لەگەڵ کەسێکدا بکەم، یان تا کۆتایی تەمەنم وەک جاڵجاڵۆکەیەک دانیشم و خەڵکی بخەمە داوەوە و شیلەی گیانیان بمژم!... پارەشم نەدەویست، سۆنیا؛ یانی لەو کاتەی کە نیازی کوشتنیم هەبوو، شتێکی ترم بەلاوە گرنگ بوو... ئەوە ئێستەیە کە تێدەگەم چ حاڵێکم هەبوو. هەوڵ بدە دەرکی پێ بکەی. لەوانەیە گەر هەمدیسان ئەو رێگەیەم بگرتبا بەر، لە کوشتنەوە نەگلابام. لەو ساتەدا شتێکی تر بەرەو پێش پاڵی پێوە

دەنام و دەبوو سەر لە شتگەلێ دەربکەم؛ دەبوو تێبگەم کە ئاخۆ دواجار منیش وەک ئەوانی تر ئەسپێم یان مرۆڤ؟ ئایا دواهەمین هەنگاو بنێم؟ زاتم هەیە دانەویم و ئەو شـــتە هەڵگرمەوە کە دەمەوێ، یان نا؟ منیش یەکێکم لەو کۆیلە ترسنۆک و لەرزۆکانە، یان سەرپشک و خاوەنمافم...

خوێنەری ئەم دێڕانە، مافی خۆیەتی گومان لە ڕاســتیی وشــەکانی بکات. پاسـاوهێنانەوەکەی یەکەم، دووەم پاسـاو یان بەڵگە لە ڕێسـاکە جیا ناکاتەوە و هەروەها بە پێچەوانەشـــەوە. بەدەر لەمەش، ئەمانە هێندە بە شێوەیەکی ئۆرگانیک ئاوێتەی یەکدی بوونە کە هیچ گومانێک لەم کوشـــتنە دووانەیی و دووجەمســـەرییەدا نامێنێتەوە. هەوڵەکانی ڕاســـکۆڵنیکۆف لەوەدا چڕبوونەتەوە کە پێگەی ســـوودبەخشـــی بۆ مرۆڤ و چاکەکاری مرۆڤایەتی بەدەســـت بهێنێت، خواســـتێک کە هاوکات پێگەویســـتانەیە و ئینســـاندۆســـتانەش. پێکەوەژیانی هێمن و بێوەی ئەم چەمکە ناهاوئاســـت و ناهاوتوخمانە لە جۆری کەسـایەتیی ئەوروپییدا دیاردەیەکی باو و ئاساییە، بەڵام دایمە لەئاست لێتێگەیشتن و ناسینەوەدا نییە. تاوان دێت و پێکەوەژیانی بێکێشەی پێگەویستی و ئینسـاندۆسـتی دەشـێوێنێت. ڕاسـکۆڵنیکۆف ئەو کاتەی کە سـنووری نیازە پێگەویستانەکەی خۆی ئاشکرا کرد، هەم لەنێو چوو و هەم بەبێ گومـان ڕزگـاری بوو. گەر بۆ نموونە ئەو بهاتبا و لە هەنگـاوەکـانی دواتریدا لەســـەر پاســـاوهێنانەوە مرۆڤدۆســـتانەکانی ســـوور با و لەســـەریان بڕۆیشـــتبا، لە ئەنجامدا ململانێی لەگەڵ خواخاتوونانی تۆڵەدا[1] پێشبینینەکراو دەبوو. دۆستۆیفسکی دواتر لە نامەکانیشدا بەم جۆرە هۆکاری تۆڵە یان سزاکەی ڕاسکۆڵنیکۆف ڕادەگەیەنێت:

---

١. ئەرینوس (یۆنانی) و فوریا (لاتینی) خواخاتوونی دادپەروەری و سزا و نوێنەری ئـایـدیـاگەلی تەواو کەونـاراییی تۆڵە و هەڵقێکردنەوەن. خواخـاتوونـانی تۆڵە، قوربانییەکانی خۆیان تووشی شێتی دەکردن. «و. ف»

لەبەرانبەر بکوژەکەدا پرســـیارگەلێکی بێوەلام خۆیان قوت دەکەنەوە و هەســـتگەلێکی کتوپڕانە و چاوەڕوانینەکراو دڵی دەژاکێنن. یاســـای زەمینی داوای هەقی خۆی دەکات و ڕاســـکۆلنیکۆف کۆتاییەکەی بە ناچاری خۆی ئاشـــکرا دەکات و ناچار دەکرێت ســـەرەڕای تەفروتوونابوون لە ئوردوگای سزادراواندا، هەمدیسان بچێتەوە نێو مرۆڤەکان؛ هەستی بێپەنایی و بێباکی و دوورەپەرێزی و دابڕاوی لە مرۆڤەکان کە لە ساتی تووشبوونی تاوانەکەدا لەگەڵی بوو، ئەشکەنجەی دەدا. تاوانکار، خۆی بڕیار دەدات باوەش بۆ ئازارەکان بکاتەوە و باجی کردەوەکەی خۆی بدات.

لە دیدی دۆستۆیڤسکییەوە بڕ و ئەندازەی سزای کەسێک کە ڕێسا ئینساندۆستانەکانی پاشێل کردوون، لەســەر بنەمای ئەندازەی ئەو ناکۆکییەی نێوان کردەوە و سرووشتە مرۆییەی تاک دیاری دەکرێت کە پاڵەوانەکە بەرەو پەرتەوازەیی و دووجەمســـەرییەکی ناوەکیی بەرگەنەگیراو پەلکێش دەکات.

دەبێت بیرمان بێت کە لە بیروبۆچوونی دۆســـتۆیڤســـکیدا لەبارەی ســـرووشـــتی مرۆڤەوە، میتافیزیکێکی بێچەندوچۆن و بیندراو بوونی هەیە. لەگەڵ ئەمەشدا، ئەم پرسە وا ناکات بە ئاراستەی ڕەدکردنەوەی ئـاســـــاییبوونی پەرتەوازەیی و دووجەمســـەربوونی دەروونیی ڕاسکۆلنیکۆفدا بچین. بە پێچەوانەوە، وەک ئەوە وایە ئێمە بڕوامان بە هەر جووڵە و بزووتنێکی دەروونیی ڕاســـکۆلنیکۆف هەبێت. ئێمە بە شەریکبوون لە ئازارەکانی ڕاسکۆلنیکۆف و خۆبەهاوبەشزانین تێیاندا خەریکین بەشـــداری لە پەیوەندیی شـــێوەیەکی دیاریکراو لە نەریتدا دەکەین کە چەمکە ئاکارییەکانی خۆی بەرهەم هێناون. ئێمە تەنانەت بە ڕەدکردنەوەی بۆچوونی میتافیزیکی لەبارەی ســـرووشـــتی مرۆڤ وەک جەوهەر و کرۆکێکی بمێنی ئەزەلی–ئەبەدی، دەتوانین باســـی جۆرێـک لە پێکهـاتەی دیـاریکراوی مرۆڤ بکەینەوە کە لە ڕەوتی پەرەســـەندنی فەرهەنگی و مێژووییدا پێک هاتووە و جێگیر بووە. ئەم

پێکهاتەیە، هەڵبەتە لە گێڕانەوەی مەسحیانەی سرووشتی مرۆڤ شل و پەیدۆزترە، بەڵام بۆ وەستانەوە لەبەرانبەر بەزاندنی یەکپارچەیی ئەم پێکهاتەیە، بەشی پێویست پتەو و بەهێزە. لێرەدا بەو ئەنجامە دەگەین کە *فەرمەنگ*، پێدەچێ *تاکە گرێنتیکەری ئاکاری ئێمە بێت* و گرنگە ئاماژە بەوەش بکەین کە لە خاڵی بەرانبەری ڕاسکۆلنیکۆفدا، پیۆتر *ڤێرخاوینسکی*مان هەیە لە ڕۆمانێکی دیکەی دۆستۆیڤسکیدا (شەیتانەکان)، کە سووکوئاسان شاتۆفی کوشتووە و لە دەرەوەی سنوورەکانی نیشتمانەکەیدا خۆی شاردووەتەوە. ئێمە وەک تاکێکی ترسناک و ڕێسابەزێن لە ئەو دەڕوانین و چون تەمبەڵێکی ناڕەسەن و شەڕەنگێز دژی نۆرمە ئاکارییەکانی فەرهەنگەکەمان بەری دەکەوین.

دیمیتری میریشکۆفسکی، لە کتێبە گرنگەکەی خۆیدا، *تۆلستۆی و دۆستۆیڤسکی*، لە باسێکی دەربارەی *تاوان و سزا*دا، پەشیمانییەکەی ڕاسکۆلنیکۆف پەسەند ناکات و بڕوای وایە کە بەشی کۆتایی ڕۆمانەکە لە بنەڕەتدا وەک پاشبەندێکی دەستکرد وایە کە وەک دەمامکێک خۆبەخۆ لە دەموچاوێکی زیندووەوە دەکەوێت. میریشکۆفسکی بە لەبەرچاوگرتنی تیۆرییەکەی ڕاسکۆلنیکۆف لەبارەی دوو دەستەی سەرەکیی مرۆڤەکان و تایبەتمەندییە جیاوازەکانیان، گرنگی خوامرۆڤیی ڕاسکۆلنیکۆف لە شێوەی فەرمانڕەوا یان شالیاردا ستایش کرد. میریشکۆفسکی بە جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی کە ئەنجامی ئاکاریی کۆتایی خودی دۆستۆیڤسکی لە سەرتاسەری تراژیدیاکەیدا، کتومت لەم وشانەی ڕاسکۆلنیکۆفدا شاراوەتەوە کە *ویژدانم ئاسوودەیە*، هەوڵی دا نووسەری *تاوان و سزا* بەرەو ڕاسکۆلنیکۆف پاڵ پێوە بنێت. بەم پێیە، لە دیدی میریشکۆفسکییەوە ناونیشانی کتێبەکە فریودەرە. گەر لە ڕۆمانەکەدا، تاوانێک هەیە، ئەوا تاوانەکە لەوەدایە کە ڕاسکۆلنیکۆف بەرگەی نەگرت و دانی پێدا نا و کتومت ئەم بیرکردنەوەیەیە کە بە ئەنجامگیریی بەشی کۆتایی بەهێز کراوە. بنەڕەت و سەرچاوەی کەسی

و تاکایەتی، هەر بە سرووشت دژ و زیادەڕۆیە و حەزی لە دەسەڵات و زاڵیەتی و سنووربەزاندنە. نەک تەنیا کەللەڕەقی و هۆشی نەوەی مرۆیی، بەڵکە ئەوە ئارەزووی مرۆڤە بۆ جیهانبینییەکی یەکپارچە و ئاویتەبوون و پێکەوەژیانێکی هارمۆنیک لەگەڵ ئەوانی دیکەدا کە بەر بەم هێزە دەگرێت کە هەر بە سرووشت دژ و سنووربەزێنە.

ئەو کاتەی کە ڕاسکۆڵنیکۆف گەیشتە شکست و دارمانی ئاکاری، ئەو بیرکردنەوەیەی کە ئەو حەشەرەیەکی بێنرخ و لەرزۆکە، هێرشی هێنایە سەر زەینی. هەر لەبەر ئەوەشە کە میریشکۆفسکی لە هەستانەوەی ڕاسکۆڵنیکۆف پەست و تووڕەیە، چونکە خزان و خلۆربوونەوەی پاڵەوانەکەی بەرەو ئاپۆڕا و چینێکی بێشێوە بینیبوو، بەڵام تێکشکانی ڕاسکۆڵنیکۆف مانایەکی دیکەی هەبوو؛ ئەمە نەک دابەزین بەڵکە خۆناسین بوو، خۆناسییەک کە لە ئەنجامی ئەو دیالێکتیکە ئازیز و بەنرخەی ڕاسکۆڵنیکۆفدا هێندەش بێخەوش و کەموکوڕی نییە. دۆستۆیفسکی، خۆناسینی چوواندووە بە دۆزینەوەی ئایدیالگەلێک کە بەرەو گۆڕانی مەعنەوی و ڕادیکاڵی کەسایەتی دەڕۆن؛ بە مرۆڤدۆستییەکی ڕەسەن و ئامادەبوون بۆ قوربانیدان. بە پێچەوانەوە، پاڵەوانی پارادۆکساڵی ڕۆمانی *یادداشتە ژێرزەمینییەکان* بە ئایدیاڵە هەمیشەیی و ئاساییەکانی تاقەتی ئایدیاڵی *لەخۆبردوویی و قوربانیدانی* نییە. سەرئەنجام، ڕۆمانی گەمژە دواهەمین بۆچوونی نووسەرەکەی ئێمەیە لەبارەی بڕواداڕانی ئایدیای قوربانیدانەوە.

بەم پێیە، گەرچی میریشکۆفسکی لەگەڵ فەیلەسووفانی دیکەی سەدەی بیستەمدا دان بە سەرکەوتنی دۆستۆیفسکی بەسەر ڕاسکۆڵنیکۆفدا نانێت و جەختی لەسەر دەکردەوە کە ڕاسکۆڵنیکۆف شکستی نەخواردووە و بەشی کۆتایی ڕۆمانەکەش وەک مافی نەریتێکی باو، نکوڵی لەمە دەکات، بەڵام سەرکەوتنی دۆستۆیفسکی بە تەواوی دیار بوو: ململانێی نێوان ئەو و پاڵەوانەکەی لە کۆتازەمینەی ڕیزە لۆژیکییەکاندا، ڕەنگدانەوەی ژیانێکی زیندوو بوو و ئەگەریش

لۆژیکی ڕاسکۆلنیکۆف دانی بە شکستدا نەدەنا، خۆ لانیکەم سرووشتە مرۆییەکەی لەژێر گوشـــاری ئەزموون و هەڵەیەکی تۆقێنەردا بوو و بەردەوامیش بۆ لێخۆشبوون دوعای کردبوو.

دوای *تاوان و ســزا*، ڕێگەی پاڵەوانە تووڕەکەی دۆســتۆیفســکی بەرەو ڕزگـاربوون دادەخرێـت. ڕاســـکۆلنیکۆف، تـاقـانە پـاڵەوانی دۆستۆیفسکییە کە بە کلاوڕۆشنەیەکی تەسکدا تێدەپەڕێت و هەنگاو دەنێتە جیهانی هەستانەوەوە.

ئەی لە بنەڕەتەوە بۆچی ڕاسکۆلنیکۆف تووشـی دوورەپەرێزی و تەنیایی بوو؟

یەکەم لەبەر ئەوەی ڕێگەی بە ڕواڵەت ئـاوەڵای کۆتـاییهـاتوو بە ڕزگاری لەڕێی تاوانەوە، لە خۆیدا تۆقێنەر و پڕ لە مەترســـییە. لەم بارەدا، تاوان چ بمانەوێ و چ نەمانەوێ دەبێتە وادەی هەســـتانەوە بە یـارمەتیی ئەزموونی لێبڕاو و دواهەمین دیـالێکتیـک لە ئـاژاوەیەکی ژەهراویدا کە پاڵەوانەکەی ئێمەی تێ کەوتووە و، هەروەها بە یارمەتیی مژدەدەری ڕزگاری و هەســـتانەوە. دووەم هۆکاریش ئەوەیە کە، برا بچووکەکانی ڕاســـکۆلنیکۆف –ســـتاڤرۆگین و ئیڤان کارامازۆف– (بە ڕێکخســـتن لە *شـــەیتانەکان* و *برایانی کارامازۆف*)دا ماوەیەک دواتر بوو کە لەسەر بنەمای ڕەوشی پەرەسەندن و پێشکەوتنی سەرچاوەی تاکایەتی و کەســـی و لەســـەر بنەمای خوامرۆڤ بەرەو پێش چوون. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە ئەو کلاوڕۆشنە تەسکە، تەسک و تەسکتر بووەوە بۆیان و ئیدی هەر دەتگوت مرۆڤ تەنیا لە خەیاڵیدا ڕێگەیەکی ڕزگـاربوون بەدی دەکات. لەم پەیوەندییەدا بەتایبەت کەســـایەتیی ستاڤرۆگین نموونەییە؛ ستاڤرۆگینێک کە هەر دەڵێی دۆزەخێک بوو بۆ خۆی!...

١٩٩٠

# گوتەی کۆتایی *تاوان و سزا*

نیکۆلای ستراخۆف

ڕاسکۆڵنیکۆف نموونەیی نییە. ئەو وەک پێوست ڕەسەنایەتیی نییە و هێندەش هەڵگری خاسیەتی تایبەت و جیاواز نییە کە بتوانین وەک ڕووخسارێکی زیندوو و ڕاستەقینە بیهێنینە بەرچاوی خۆمان. بە کورتییەکەی و بە مانای ڕاستەقینەی وشە نیهلیستیش نییە و تەنیا شێوەیەکی شێواوی ئەو جۆرە نیهلیستییە ڕاستەقینەیە کە کەم تا زۆر پێی ئاشناین و ئیڤان تورگنێف، بەر لەوانی دیکە و هەڵبەتە وردتر لە هەموویان، لە کەسایەتیی *بازارۆف*ی نێو ڕۆمانی *باوکان و کوڕان*دا وێنای کردبوو، بەڵام ئایا ئەم خاڵە لە ڕۆمانەکەدا کێشەیەک دروست ناکات؟

بڕوامان وایە ئەو کەسانەی کە *تاوان و سزا*یان خوێندووەتەوە لەوەدا لەگەڵمان هاودەنگن کە لەدەستدانی ئەو حاڵەتە باوانە و نموونەییبوون زیانێک بە ڕەوتی چیرۆکەکە ناگەیەنن و تەنانەت یارمەتیشیان داوە. ئەمە بێئۆقرەیی و فرەویستیی ڕاسکۆڵنیکۆفە کە، بە گوتەی پۆرفیری، دەبێتە هۆکاری هەڵسوکەوتی سەیروسەمەرەی ئەو و لە لایەکیشەوە، نائاگایانە هەست دەکەین کە بازارۆف لەژێر هیچ هەلومەرجێکدا ئەوەی لێ نەدەوەشایەوە. لە لایەکی دیکەشەوە، ناکرێت بڵێین هەڵبژاردنەکەی دۆستۆیڤسکی ناڕاست بووە...

ڕوونە کە لێرەدا تاک یان وەسفکردنی نموونەیەکی تایبەت، کەڵکەڵەی سەرەکیی کارەکە نییە و چەقی قورسایی ڕۆمانەکەش ئەمە

نەبووە. ئامانجی ڕۆمانەکە ئەوە نییە کە نموونەیەکی تازە بخاتە بەرچاوی خوێنەر، یان جارێکی دی وێنای شتێکی وەک *ڕەشوورووتەکان، یادداشتە ژێرزەمینییەکان*، مرۆڤەکانی *یانەی ڕۆحەکان، باوکان و کوڕان* و... بکێشێتەوە. سەرتاسەری ڕۆمانەکە لە کردەوەیەکدا چڕ بووەتەوە و ئەوەی کە چۆن هەندێک لە کردەوەکان لە دایک دەبن و چ کاریگەرییەک بەسەر ڕۆحی بکەرەکەیانەوە دادەنێن. ناوی ڕۆمانەکەش هەر لەسەر ئەو بنەمایە هەڵبژێردراوە. لەسەر بەرگ، ناوی پاڵەوانی کەسایەتییەکە نەنووسراوە؛ ناونیشانەکە، لە بنەڕەتدا، پوختەی باسی ئەو ڕووداوانەیە کە دێنە ڕێی ئەو. بابەتەکە بە تەواوی ڕوونە: چیرۆک، چیرۆکی تاوانە و سزا.

خوێنەرانی ئەم ڕۆمانە لەوەدا هاوڕان کە ڕۆمانەکەی دۆستۆیڤسکی کارێکی تەواو ناسراوە و ئەو ڕەوتی ڕووداوانەی کە لە زەینی تاوانبارەکەدا کامڵ دەبن، بە شێوەیەکی سەرسووڕهێن ناسراو و نموونەیی وێنا کراون؛ بەڵام لە بنەڕەتدا ئەم خاڵە بابەتی ڕۆمانەکە دروست دەکات و خوێنەر دەتاسێنێت. ڕۆمانەکە، زۆر قووڵ و زیندوو نیشانی دەدات کە چۆن ئایدیای تاوان لە دەروونی تاکدا سەر هەڵدەدات و بەهێز دەبێت، کەچی ڕۆحی لەگەڵیدا ناکۆکە و بە شێوەیەکی خۆڕسک هەست دەکات وەها ئایدیایەک تا چ ڕادەیەک ترسناکە؛ چۆن مرۆڤێک کە ئەم بیرکردنەوە چەپەڵەی لە خۆیدا پەروەراندووە، لە ئەنجامدا ویست و ژیریی لەدەست دەدات و کوێرکوێرێک شوێنی دەکەوێت؛ چۆن بێ بیرکردنەوە و بێ هەست لە تاوانێکەوە دەگلێ کە ماوەیەکی زۆر لەوەوبەر ڕەگی لە بوونیدا داکوتیوە، پاشانیش ترس و بەدگومانی و تووڕەیی لەبەرانبەر خەڵکی لەودا بێدار دەبنەوە و خەڵکی هەڕەشەی سزادانی لێ دەکەن؛ چۆن بەرەبەرە لە خۆی و لەوەی کە کردوویەتی؛ بێزار دەبێت؛ چۆن ڕەوتی ئەم ڕووداوە، بەرهەستکردنی ژیانی گەرم و پڕ لە جۆشوخرۆش

دەکاتە شـــتێکی دژوار و ئەشـــکەنجەی پەشـــیمانییەکی نائاگایانە لە بوونیدا دەورووژێنێت و، ســــەرئەنجام، هەر بەو جۆرەی کە خۆی بە سـۆنیا دەڵێت، چۆن *لووتبەرز، ئیرەگەر، بێباک، بێزراو و ڕقئەسـتوور* دەبێت:

دایکی داماوم مانگانەکەی بۆ دەناردم. خۆشم دەمتوانی پارەی خواردەمەنی و پێڵاو و جلوبەرگەکەم دەربێنم. ئەرێ، دەکرا! وانەی تایبەتی هەبوو کە یەکی نیو ڕۆبڵی تێدا بوو. ڕازومیخینیش خەریکی ئەمەیە خۆ! بەس من نەمویســــت ئەو کـارە بکەم، هەمووشی لەبەر بوودەڵەیی خۆم... بەڵێ، هیچ شتێ لەمە باشتر نـاتوانێ وەســـفی بکـا: بوودەڵەیی ڕووت! پـاشــــان، وەک جـاڵـجـاڵـۆکەیەک بە تەون دەوری خـۆمـم تەنـی! خـۆ تـۆ کونەمشـکەکەی منت دیوە... دەتزانی ژوورێکی تاریک و تەسـک بە بنمیچێکی نزمەوە بەرەبەرە ڕۆح و مێشـــکی مرۆڤ دەخوا؟ ئاخ، چەندە ڕقم لەو کونەمشکە بوو، کەچی ئامادەش نەبووم لێی بێمە دەر! ئەمەش هەمووی دەسئەنقەست بوو! شەو و ڕۆژم لەو کونەدا بەســـەر دەبرد، نە ئیشـتێکم دەکرد و نە ئیشـتیهاشـم بۆ خواردنی شتێ هەبوو. تەنیا لەوێ تەخت بۆی ڕاکشابووم. ئەگەر ناسـتاسـیا پاروونانێکی بۆ بهێنابام دەمخوارد؛ دەنا بە درێژایی ڕۆژ بە برسییەتی دەمامەوە. شەوانەش مۆم و چرام نەبوو و لە تـاریکدا دەخەوتم، چونکە ئـامـادە نەبووم تەنانەت جووڵەیەکیش بکەم و پارەی مۆمەکەم دەربێنم! دەبوو خەریکی خوێندنەکەم بم، بەس تەنانەت کتێبەکانیشـم فرۆشـتبوون! ئێسـتەش یەک پەنجە تۆز نیشـــتووەتە ســـەر مێز و پەڕە و دەفتەرۆکەکانم. من زیاتر حەزم دەکرد تەخـت بۆی ڕاکشـــێم و تەنیـا و تەنیـا خەریکی بیرکردنەوە بم... هەر وا خەریکی بیرکردنەوە بووم.

ئەو لووتبەرزی و تووڕەییەی کە لە ڕاســـکۆڵنیکۆفدا دەرووژێت، تایبەتمەندییەکانی تاکێکن کە ئایدیای تاوان لەســـەر بنەڕەتیان بنیاد ناوە.

ئەو ڕەوتەی کە تاوانکار بە شێوەیەکی ئاسایی دەیبڕێت، بە باشی وێنا کراوە: هەڵدەچێت، بە کردەوەیەکی تۆقێنەر خۆی تووشی گێرەوکێشە دەکات و تا ئەو جێیە دەچێتە پێش کە هۆشی بەسەر خۆیەوە نەمێنێت. ڕۆمانەکە لە ساتی پێکهاتنی تەواوی ئەم ڕەوتەدایە کە دەست پێدەکات. ڕاسکۆلنیکۆف دەچێتە لای پیرێژنە سووخۆرەکە تا مەشق لەسەر پلانەکەی بکات، بەڵام وا دیارە سرووشتی لەدژی دەوەستێتەوە و بێزارییەکی بێکۆتا بەسەر ڕۆحیدا زاڵ دەبێت. کتوپڕ دەڵێیت شتێک ئەو بەرەو خەڵکی ڕادەکێشێت. تووشی مارمیلادۆف دەبێت و لەگەڵیدا دەچێتەوە ماڵەکەی و چاوی بە خێزانەکەی دەکەوێت. ئەم دیمەنە هەمدیسان شەپۆلی نەگریسی لە بوونیدا دەورووژێنێت و دووبارە بیرکردنەوەی ڕەش جڵەوی ویستی لە دەست دەستێننەوە. نامە و هەواڵگەلێکی خراپی لە دایکییەوە پێ گەیشتوون؛ خوشکی نیازیەتی لەبەر خاتری خۆشگوزەرانیی دایکی و براکەی خۆی بکاتە قوربانی. تووڕەیی ڕاسکۆلنیکۆف دەگاتە لووتکە. ئەو نیگەرانی و کێشمەکێشە دەروونییەی کە ڕاسکۆلنیکۆف بە پێگەیشتنی نامەکە تووشی دەبێت، بە باشترین شێوە وێنا دەکرێت. گەنجەکەی ئێمە بە شێوەیەکی ئازاراوی هەوڵ دەدات وێرانی و شێواوییەکەی خۆی ڕێک بخاتەوە و وێڕای دەسەوەسانی، هەوڵی باشترکردنی دۆخەکە دەدات:

> گەنجەکە لەناکاو بە توندی ڕاچەنی؛ هەمدیسان یەکێک لە بیرەکانی دوێنێی هەروەک چەخماخە هێرشی هێنابووەوە سەر زەینی، بەڵام ئەوە خێرایی هێرشی ئەو بیرە نەبوو کە ڕایتەکاند. دەیزانی و هەستیشی کردبوو کە ئەو بیرە بەبێ دوودڵی دەگەڕێتەوە و تەنانەت چاوەڕوانیشی کردبوو. وەلێ ئەم بیرە تەنیا تایبەت نەبوو بە دوێنێوە. جیاوازییەکەی ئەوە بوو کە مانگی پێشوو یان تەنانەت دوێنێ، لە حەزێک بەولاوە زیاتر نەبوو، وەلێ ئێستە... ئێستە ئیدی نەک خۆی لە شێوەی حەز بەڵکە لە شێوەیەکی تازە و هەڕەشەئامێز و تەواو نامۆدا نیشان دابوو.

ڕاسکۆڵنیکۆف کتوپڕ لێی تێگەیشت و... وەک ئەوەی گورزێکیان لە سەری دابێت، هەموو شتێک لە بەرچاویدا ڕەش داگەڕا.

ڕاسکۆڵنیکۆف ئیدی دەسەڵاتی بەسەر خۆیدا ناشکێت و وەهم و خەیاڵات دەستیان بەسەر بوونیدا گرتووە. بەرکەوتن لەگەڵ کچێکی سەرخۆش لە بولواردا کە وا دیاربوو لەخشتەیان بردووە، لە دڵیدا خەفەتی خوشکەکەی قورستر دەکات. لە درێژەی هەوڵدانیدا بۆ ڕزگاربوونی لەم بیرکردنەوە چەپەڵانەیە، بەرەو لای ڕازومیخین تار دەنرێت، بەڵام هۆشی نامێنێ و دوای ئەوەی دێتەوە سەر خۆی، بڕیار دەدات:

*ئمممم... ڕازومیخین. ئەوە هەر دەچمە دیدەنیی ڕازومیخین، بێگومان دەچم... وەلێ ئێستە نا... هەر دەچم بۆ لای... بۆ ڕۆژی دوایی دەچم، ڕۆژی دوای ئەو مەسەلەیە؛ کاتێک کارەکە ئەنجام درابێ و هەموو شتێ سەرلەنوێ دەستی پێ کردبێتەوە...*

دیسان و بۆ دواهەمین جار هەست و خرۆشی ڕاستەقینەی دەروونیی دەورووژێتەوە. بەرەو کونەمشکە ترسناکەکەی دەکەوێتەوە ڕێ، هەمان ئەو سندووقەماڵە بچووک و شوومەی کە هەر لەوێ و لە ماوەی مانگی ڕابردوودا ئەم بیر و خەیاڵەی کەوتبووە سەر و ڕەگی تێدا داکوتیبوو.

بەر لەوەی بگاتە دوورگەی پترۆفسکی، لەنێو کۆمەڵێک دەوەن و لەسەر سەوزاییەک خەو دەیباتەوە و مۆتەکەیەکی ئەشکەنجەدەر دەبینێت کە ڕەنگدانەوەی کێشمەکێشە دەروونییەکەیەتی. لە خەونـدا، خۆی دەبینێت کە وا منداڵێکە و بەدیار دیمەنی کوشتنی دڵڕەقانەی ماینێکەوە دەتاسێت. کە هایی دەبێتەوە، لە بارێکدا کە پەرێشانە بەدەست ئەم خەونەوە، بە ڕوونی هەست دەکات سڕووشتی لەبەرانبەر ئەو تاوانەدا دەوەستێتەوە کە ئەم بیر لە ئاکامەکەی دەکاتەوە.

سـەراپای لەشـی کفت و کوتراو بوو و ڕۆحیشـی ڕەش و پەرێشان. ئەنیشکەکانیی خستنە سەر ئەژنۆکانی و دەستەکانیشی بە سـەرییەوە نان. *خوایە! یانی هەر بە ڕاسـتی من، هەر بە ڕاستی من تەور هەڵدەگرم و دەیکێشم بە سەری ئەو پیرێژنەدا؟ یانی هەر بە ڕاستی پێم دەخەمە خوێنی گەرمی ئەوەوە، بە زۆر قوفڵی ئەو سندووقە دەکەمەوە، دزی دەکەم، هەڵدەلەرزم و خۆم دەشارمەوە، جا گەوزاو لە خوێنیشدا و... تەوربەدەست؟ خوایە، ئەی پەروەردگار، یانی هەر بە ڕاستی ئەوەم لێ دەوەشێتەوە؟*

بەدەم گوتنی *ئەمانەوە* وەک بی دەلەرزی. جـارێکی دیکەش خۆی بەرز کردەوە و وەک ئەوەی تەواو تاسـابێت، درێژەی پێ دا: *ئـای لەو قسـە قەڵبوقۆڕانە! خۆ من هەر خۆم دەمزانی کە ئەوەم لێ ناوەشـێتەوە و پیاوی ئەوە نیم، ئەی بۆچی بە درێژایی ئەم هەموو ماوەیە خەریکم خۆم ئەشکەنجە دەدەم؟ دوێنێ، هەر دوێنێ کە ڕۆیشـتم گوایە مەشـقی لەسـەر بکەم، زۆر باش تێگەیشـتم کە دەرەقەت نایێم و لەژێر ئەو بارەدا دەپلیشـێمەوە... کەواتە بۆچی وا هەمدیسـان بیری لێ دەکەمەوە؟ چۆن دەکرێت هێشـتا هەر ڕاڕا بم، ها؟ ئەی دوێنێ کە لەو پلیکانانەوە هاتمە خوارێ، نەمگوت سـەرلەبەری ئەم بیر و خەیاڵانە تاوانن؟ ئەی نەمگوت ئای لەو کارە چەپەڵە؟ تەنانەت وێناکردنیشـی وەهای تۆقاندم کە نەخۆش کەوتم! نا کاکە، من پیاوی ئەوە نیم، دەرەقەت نایێم! گریمان هەموو نەخشـە و وردەکارییەکانم لەجێ بن و هەر بڕیارێک کە لەم مانگەدا داومە وەک ڕۆژ ڕۆشـن و دوو کەڕەت دوو یەکسـانە بە چوار بن... وەلێ خوایە، لەگەڵ ئەوەشـدا هەر زاتیم نییە. دەزانم، کۆتـاییەکەی هەر تێـدەکەوم! دەزانم کە دەرەقەت نایێم! ئەی بۆچی هەر وا خەریکم پێچ دەدەمە خۆم؟*

هەسـتایەوە، بە سـەرسـووڕماوی ڕووانییە چواردەوری، وەک ئەوەی خۆشـی نەزانێت بۆچی هاتووەتە ئەوێ. بە ئاراسـتەی پردی تۆچکۆف کەوتە ڕێ. ڕەنگی بە ڕووەوە نەبوو، چـاوی

دەکزایەوە و ئـازای ئەنـدامی لەتـاو کوتراوی چڵی دەدا، بەس دەتگوت هەناسـەدانی ئاسـانتر بووە. هەسـتی دەکرد لە شـەڕی بارێکی تۆقێنەر و قەدشکێن کە لەمێژ بوو لە کۆڵی نابوو، نەجاتی بووە و وەک ئەوە وابوو ڕۆحیشی سووکباڵ و هێور بووبێتەوە. دوعای کرد: *خوایە خۆت ڕێگەی ڕاستم نیشـان بدە و منیش واز لەم فکرە نەفرەتیانە دەهێنم.*

کاتی تێپەڕین بەسـەر پردەکەدا، ئارام و ئاسـوودە سـەیری ئاوی ڕووباری نێڤا و زەردەپەڕی خۆری درەوشـاوەی کرد. وێڕای بێهازیی جەسـتەیی، بە هیچ شـێوەیەک ماندوو نەبوو. دەتگوت ئەو دمەڵەی کە مانگی ڕابردوو بەسـەر دڵییەوە ڕوابوو، پێگەییوە و دەمی کردووەتەوە. ئیـدی ئەوە ئـازادی بـوو! سـەربەسـتی بوو! ئێسـتە ئیدی لە سـیحر و جادووی هەموو خەیاڵات و فریوە نەفرەتییەکان ڕزگاری بووبوو!

کەم تا زۆر نەکردەیە لەمە زیاتری لەسەر بگوترێت. ڕاسکۆڵنیکۆف، ماندوو و لەسـەرچۆککەوتوو بەدەسـت کێشـمەکێشـی دەروونییەوە، دواجار خۆی دەداتە دەست ئەو فکرەی کە دەمێک لەوەوبەر لە زەینیدا پەروەراندبووی. وەسفکردنی خودی تاوانەکە، سەیر و سەرسووڕهێنە و بێ وشـەکانی دۆسـتۆیڤسـکی ناتواندرێت بە وشـەگەلی دیکە باسـی بکرێت. ڕاسکۆڵنیکۆف کتوکوێر و نائاگایانە، ئەو پلانە جێبەجێ دەکات کە دەمێکە گەڵاڵەڕێژیی کردووە، بەڵام دەڵێـت ڕۆحی مردووە و، خۆی، وەک ئەوە وایە بەدەم خەوەوە هەنگاو بنێت. کەم تـا زۆر نە ژیرییەکی بۆ ماوەتەوە و نە یادگەیەک؛ ئەوەی کە لێی دەوەشـێتەوە، ناپەیوەسـت و بەهەڵکەوتە. دەڵێت ئینسـانیەت دەروونی ئەوی چۆڵ کردووە و تەنیا غەریزەی ئاژەڵیی فێڵبازانەی خۆپاراسـتنە کە ناچاری دەکات کارەکە بگەیەنێتە کۆتایی و خۆی ڕزگار بکات. کەواتە، ڕۆحی مرۆیی مرد و خووی ئاژەڵی بە زیندوویی مایەوە.

دوای تاوانەکە، ڕاسکۆڵنیکۆف لە دوو ئاستدا تووشی ئەشکەنجە دەبێت. یەکەمین ئاستی ئەشکەنجەکەی ترسە. گەرچی ئاقیبەتی کارەکە ناڕوونە، کەچی بەدگومانی بۆ ساتێکیش دەستی لێ هەڵناگرێت و بچووکترین ئاماژەی دەرکەوتنی مەترسی، ترسێکی ئەشکەنجەدەر دەخاتە گیانییەوە. لە ئاستی دووەمدا، پەیوەندیی نزیکی بکوژ لەگەڵ ئەوانی دیکەدا هەمان ئەشکەنجە بنەڕەتییەکەیە، کەسانێک کە هیچ شتێک بارستایی ناخاتە سەر ڕۆحیان و لێوڕێژن لە گەرما و ژیان. ئەم پەیوەندیی نزیکایەتییەش بە دوو جۆر دروست دەبێت. لە شێوەی یەکەمدا، خودی تاوانکار بەرەو خەڵکی دەکشێت، ئاخر حەز دەکات لەگەڵ ئەواندا هاوشان بێت و ئەو بەربەستە لەنێو بەرێت کە خۆی خستبوویە نێوان خۆی و ئەوانەوە. ڕێک لەبەر ئەم هۆکارەیە کە ڕاسکۆڵنیکۆف دەچێت بۆ لای ڕازومیخین:

> خۆ من وا دیسان بێ ویست هاتمەوە بۆ لای ڕازومیخین! دیسان هەمان بەزمە... زۆر سەرنجڕاکێشە بزانم مەبەستێک لە هاتنەکەمدا هەبووە یان هەر وا بە هەڵکەوت لێرەوە سەرم دەرهێناوە؟ واز بێنە، خۆ پێرێ بوو کە گوتم ڕۆژێ دوای ئەو مەسەلەیە دێم بۆ لای؛ ئێ وا ئێستە هاتووم ئیترا دەڵێی ناتوانم دوو هەنگاو سەرکەوم و سەرێکی لێ بدەم...

هەمدیسان هەر لەبەر ئەمەیە کە بە ئازارێکی زۆرەوە، لەبەر خاتری مارمیلادۆفی شێلدراو لەژێر تایەی گالیسکەدا دەکەوێتە کردوکۆش و لە خێزانە کۆستکەوتووەکەی و، بەتایبەت لە سۆنیا نزیک دەبێتەوە. هۆکارێکی دیکە کە وا دەکات ڕاسکۆڵنیکۆف بگەڕێتەوە نێو خەڵکی و پەیوەندییەکی نزیکیان لەگەڵدا ببەستێت، هاتنی ئەندامانی خێزانەکەیەتی بۆ پیتەربورگ.

لە نامەکەی دایکیدا، کە دەبێتە هۆکاری یەکلاکەرەوەی تاوانەکەی، ئەوە ڕادەگەیەندرێت کە دەبێت دایک و خوشکی بێن بۆ پیتەربورگ،

پیتەربورگێک کە بڕیارە خوشـــکەکەی لەوێ خۆی بکاتە قوربانی و شـوو بە لوژن بکات. بەم پێیە، ڕاسـکۆلنیکۆف کە تا ئەو کاتە تەنیا و دوور لە خەڵک بوو، خۆبەخۆ لەنێو کەسـانێکدا سـەر دەردەهێنێت کە نزیکترین پەیوەندیی لەگەڵیاندا هەبووە و خوێنەر هەسـت دەکات گەر پێشـــتر ئەوانی لەلا بووبان، ئەو هەرگیز لە وەها تاوانێکەوە نەدەگلا. ئێســـتە کە ئیدی تـاوانەکە ڕووی داوە، ئەوان تەنیـا و تەنیـا دەبنە هۆکـاری ئەوپەڕی ئەشـــکەنجە لە گیـانی تـاوانکـارەکەدا و بەرەو دوورەپەرێزییەکەی پاڵی پێوە دەنێن.

پێکهاتەی ڕۆمانەکە بەم جۆرەیە، تەواو سـادە، بەڵام ئێجگار ڕاسـت و هونەرمەندانە. ڕەوتی ناسـراوی ئەشکەنجەی دەروونیی بکوژەکەش فرە جوان وێنا کراوە. ڕاسـکۆلنیکۆف هەر لە سـەرەتاوە پەرێشـان و گیرخواردووە و تەنانەت نەخۆشـیش دەکەوێت. یەکەمین هەوڵی ئەو بۆ چوونەوە نێو خەڵک، دیدارەکەی ئەوە لەگەڵ ڕازومیخیندا و ئەم دیدارە هۆش لە سەری دەڕفێنێت.

> کاتی سەرکەوتن بە پلیکانەکاندا تا ناو ژوورەکەی ڕازومیخین، ئاگادار نەبوو کە بڕیارە ڕووبەڕوو دیدەنیی هـاوڕێکەی بکات. ئێســـتە لە چاوترووســـکاندنێکدا دەتگوت لەوە تێگەیشـــتووە دواهەمین شـــتێـک کە لەم دونیـایەدا ئـامـادەیی بۆی هەیە، ڕووبەڕووبوونەوەی مرۆڤەکانە. پەســـت بوو و ئەو کاتەش کە خەریک بوو لە ئاســـتانەی دەرگەی ژوورەکەی ڕازومیخینەوە هاتە ژوور، هێندە لە خۆی تووڕە بوو کە خەریکبوو دەخنکا.

دەچێتە دیدەنیی ڕازومیخین، بەڵام خۆی پێ کۆنترۆڵ ناکرێت. بەم پێیە، بکوژ، یەکەمین ئـاســـتی ئەشـــکەنجە، واتە ئەشـــکەنجەی ســـەرچاوەگرتوو لە ترس ئەزموون دەکـات، ئەو خەونە تۆقێنەر و ئەشـکەنجەدەرەی (لەنێو دوو لاپەڕەی ســەیر و دۆشـداهێنەردا) کە ڕاسـکۆلنیکۆف بەدوایدا، بەرەبەرە نەخۆش دەکەوێت، بەڵام لە لایەکی

دیکەشـــەوە، *تـاوانبار* هێزێکی زیـاتری تێ دەگەڕێت. ڕووبەڕووی ڕازومیخین دەبێتەوە، زامیۆتۆف دەخەڵەتێنێت و ئامادەگی و ڕۆڵێکی بەرچاوی لە چارەنووسـی خێزانەکەی مارمیلادۆف و خوشـکەکەیدا دەبێـت، خۆی لە وەڵامـدانەوەی لێکۆڵەرە زیرەکەکە -پۆفیری- دەدزێتەوە، نهێنییەکەی خۆی لەلای سۆنیا دەدرکێنێت و...، بەڵام تا ئەو سـاتەی کە تـاوان بەسـەریـدا زاڵە، نەک هەر بە تەنیـا هیچ لە ئەشـکەنجەکەی کەم نابێتەوە، بەڵکە بە بەردەوامی و تینێکی زیاترەوە ئازاری دەدات.

سـەرەتا شـەپۆلی شـادمانی ڕۆحی دەتەنێتەوە، هەڵبەتە تەنیا ئەو کاتەی کە ترس، فرە بە هەڵکەوت و کتوپڕ، لە دڵی دەردەچێت یان لەو سـاتەدا کە دەتوانێت لەوانی دیکە نزیک ببێتەوە و زیاتر لە جاران هەسـت بە مرۆڤبوونی خۆی بکات، بەڵام ئەم جۆلانەکردنانە دواتر نامێنن. نووسەر دەڵێت:

> لەم دواییـانەدا جۆرە دڵەڕاوکێیەکی دیکە یەخەی گرتبوو. شـتێـک نەبوو کە ئـازارێکی ئەوتۆی بـدات یـان لە نـاخەوە بیسـووتێنێت، بەڵام بە جۆرێک لە جۆرەکان وای هەسـت دەکرد کە دەشـێت دوایی نەیێت. دەتگوت بڕیار وا بوو تاهەتا بەردەوام بێت، جا سـاڵ دوای سـاڵیش بیرهێنەرەوەی پەشـێوییەکی تاڵی بێکۆتا و دڵتەزێن بێت، لە هەمان ئەو بستە زەوییەدا.

ئەمانە مەبەسـتگەلێکن کە بەشـێکی گەورە و کرۆکی تەوەرەیی ڕۆمانەکەیان لەسـەر بنیاد نراوە. دەبێت ئەوە بیر خۆمان بهێنینەوە کە گەرچی لەو بابەتانەدا بە دژواری دەتوانین پشـت بە تێگەیشـتنی تاکەکەسی ببەستین و ئەوە باشترە کە متمانە بە فەراسەت و تیژبینیی هونەرمەند بکەین، لە ناخی ڕاسـکۆڵنیکۆفدا لە سـەرووی ترس و ئـازارەوە، دەکرا سـێیەم بـابەتیش پێگەی تـایبەتیی خۆی هەبێـت: یادەوەریی تاوان.

وا دێتە بەرچاو کە وێناکردنەوەی دووبارەی تاوان و یادەوەرییەکەی پەیوەندییەکی زیاتری لەگەڵ ئەم کارە تۆقێنەرەدا هەبێت. بۆ ئەوەی خاڵی جێسەرنجم روونتر بکەمەوە، ئاماژە بە وەسفی ناوازەی تاوان لە رۆمانی بەناوبانگی *چارلز دیکز* (هاوڕێی هاوبەشی ئێمە) دەکەم. *بێردلی مدستون* (مامۆستا)، بێوگێنی *ریبۆرن* دەکوژێت. دۆخی بکوژەکە پاش تاوان و رزگاربوون لە مەترسی، بەم جۆرە وەسف دەکرێت:

بێردلی دەتگوت بە زنجیری بیرکردنەوە و هەستی تۆڵە و رقی دەروونی بەسترابووەوە و بە ئاستەم هەنگاوی دەنا. لەبەرخۆیەوە بیری دەکردەوە کە دەکرا هەم ئاگری تۆڵە و هەم رقەکەی بە شێوەگەلی ئێجگار باشتر لەوەی خۆی دابمرکێنێتەوە. دەکرا کەرەستە و شوێن و کاتێکی باشتریش بۆ کوشتنەکە هەڵبژێردرێت. کێشان بە سەری *کابرا*دا لە پشتڕا، جا لە قەراخ رووباریش، نەخشەیەکی باش بوو، بەڵام دەشیا *کابرا* دەسبەجێ کەلەلا ببووبا نەک ئەوەی بتوانێت لێی هەڵگەڕێتەوە و دەست بداتە یەخەی لێدەرەکە. لە ئەنجامدا ناچار بووبوو بەر لەوەی فریای *کابرا* بکەون، یەکجاریی بکات و بیخاتە نێو رووبارەوە؛ جا ئەوەش لە کاتێکدا کە هێشتا گیانی تێدا مابوو! گەر دەرفەتێک هەبێت تا هەمدیسان نەخشەکە جێبەجێ بکرێتەوە، نابێت کارەکە بەم دیوەدا بشکێتەوە. بۆ نموونە وای دابنێ تا ماوەیەک سەری بنابا نێو ئاو، یان یەکەمین لێدانی بەهێزتر لێبدابا. وا دابنێ کابرای بە گوللە بکوشتبا. وای دابنێ کە بیخنکاندبا. وای دابنێ کە بەم جۆرە... وای دابنێ بەو جۆرە؛ بەڵام نەکا بۆ ساتێک گریمانەی ئەوە بکرێت کە دەکرا واز لەو بیرکردنەوەیە بهێنێت. نا، وەها شتێک بە هیچ شێوەیەک رێی تێنەدەچوو! بۆ رۆژی دواتر خوێندنگە کرایەوە. خوێندکاران گۆڕانێکی ئەوتۆیان لە رووخساری مامۆستاکەیاندا بەدی نەکرد، لەبەر ئەوەی کە ئەو هەمیشە هەمان ئەو بارە مەینەتبار و گوشارلەسەرەی هەبوو،

بەڵام لە بارێکدا کە خەریک بوو وانەی لە خوێندکارەکانی دەپرسییەوە، لە زەینیدا ئەو کردەوەیەی جێبەجێ دەکرد و هەر جارێکیش باشتر لە جاری پێشوو. بەر لەوەی شتێک بنووسێت، گەچبەدەست لەبەرانبەر تەختەڕەشەکەدا ڕاوەستا. بیری لە شوێنی کوشتنەکە دەکردەوە و ئەوەی کە ئەگەر تاوەکە قووڵتر با یان کەوتنەکە ڕاستتر، بەرزتر، نزمتر... چی دەبوو. بە بیریدا هات چەند هێڵێک لەسەر تەختەڕەشەکە بکێشێت تا خۆشی باشتر لەوە تێبگات کە مەبەستی لە ڕاستتر و بەرز و نزمتر چییە. لە کاتی دوعاکردندا، لە کاتی لێپرسینەوە و لە هەر ڕۆژێکدا، لە چوارچێوەی بیرکاریانەی زەینیدا دووبارە و دووبارە ئەو کردەوەیەی پاتە دەکردەوە؛ هەر جارێکیش باش و باشتر.

وا دێتە بەرچاو ڕاسکۆڵنیکۆفیش هەر تووشی هەمان نەهامەتی بێت. هەڵبەتە ڕاسکۆڵنیکۆف تەنیا دوو جار تاوانەکە لە زەینی خۆیدا زیندوو دەکاتەوە. لەم نێوەندەدا دەبێت بە ویژدانەوە بڵێین کە نووسەر هەردوو جارەکە بە لێهاتووییەکی سەرسوڕهێن و درەوشاوەوە وێناکە دەخاتەوە بەر دیدەی خوێنەر. جاری یەکەم، خۆنەخوازانە بەرەو شوێنی تاوانەکە دەکشێت و بە پێی خۆی دەچێتە ئەوێ. جاری دووەم، دوای ئەوەی کاسبێکی غەوارە لە شەقامدا بە بکوژ بانگی دەکات، خەون دەبینێت کە وا خەریکە بۆ دووەم جار قوربانییەکەی دەکوژێت. لەوانەیە بکرێت ئەم خەونە و دوو خەونەکەی پێشتر (کە باس کران)، بە باشترین بەشەکانی ڕۆمانەکە دابنێین. بە ڕوونی و سەرنجێکی ناوازەوە خەیالاتیبوونی خەونەکان وێنا کراوە و پەیوەندیی قووڵ و هەمەلایەنەیان بە واقعییەتەوە سەراسیمەکەرە. دواهەمین خەون لەگەڵ خەونەکانی پێشتر بەراورد ناکرێت. ڕاسکۆڵنیکۆف دواهەمین خەون (کە زۆر بە ڕوونی نووسراوە و کەشێکی نمایشیی ساردی هەیە)، لە زیندانی بێگارەکاردا دەبینێت. بەم پێیە، دەکرێت بڵێین کرۆکی تەوەرەیی ڕۆمانەکە، بە مەبەست وێنای

هەڵمەتی ترسی تووند و ئازاری ڕۆحیی سەرچاوەگرتووە لە بێداریی ویژدانەوە. نووسەر وەک هەمیشە، بە تەکنیکە تایبەتییەکانی خۆی، ڤێرشنە جۆراوجۆرەکانی خۆی لەسەر پایەی ئەم بابەتانە دەئافرێنێت و یەک بە یەک شێوەگەلی جیاوازی گۆڕاوی هەمان ئەو هەستانەمان بۆ شی دەکاتەوە. یەکجۆریی ئاهەنگ (لەحن) لە سەرانسەری ڕۆمانەکەدا هەر لەبەر ئەمەیە، گەرچی لە سەرنجڕاکێشییەکەی نادات، وەلێ ڕۆمانەکە لەبری ئەوەی ببێتە هۆی سەرسامکردنی خوێنەر، ئەشکەنجەی دەدات. ڕاسکۆڵنیکۆف لەنێو ئەو ساتە کاریگەرانەی بەسەریان دەبات، لە ئەشکەنجە بێکۆتاییەکەیدا ون دەبێت؛ جا چ ئەو ئەشکەنجانەی کە تاویان کەمتر دەبێت و چ ئەوانەی کە تازە سەر هەڵدەدەن. نابێت بڵێین ئەم ڕەوتە هەڵەیە، بەڵام دەکرێت ئاماژە بەوە بکەین کە هێندەش ڕوون نییە. چیرۆکەکە، لەو ساتە دیارانەدا چڕ نەبووەتەوە کە دەستبەجێ قووڵایی ڕۆحیی ڕاسکۆڵنیکۆف بۆ خوێنەر ڕۆشن دەکەنەوە. سەرەڕای ئەوە، ساتگەلێکی زرۆی لەم چەشنە لە ڕۆمانەکەدا سڕدراونەتەوە، بەتایبەت دیمەنگەلێک کە تێیاندا بە ڕوونی دۆخی ڕۆحیی ڕاسکۆڵنیکۆف وێنا دەکرێت. واز لە دیمەنگەلی هەڵمەتی تۆقین و دەرکەوتنی ترس و خووی ئاژەڵانە (بەو جۆرەی کە خودی نووسەر وێنای دەکات) دەهێنین، چونکە لایەنی ئەرێنیی بابەتەکە بۆ ئێمە گەلێک سەرنجڕاکێشتر دەبێت: بێداریی ڕۆحی تاوانکار و وەستانەوەی لەبەرانبەر نواندنی توندوتیژیدا. ئەم تاوانە ڕاسکۆڵنیکۆف لە مرۆڤە بێوەیەکان دوور دەخاتەوە؛ هەر ئەوەندەش بەسە کە شان لە شانی ژیان بخشێنێت، تا ئەشکەنجەکەی دووبەرانبەر ببێت.

ئێمە ئاگادارین کە ڕاسکۆڵنیکۆف تەنانەت بەرگەی دیداری ڕازومیخینیش ناگرێت، بەڵام دوای ماوەیەک، ئەو کاتەی کە ڕازومیخینی دڵباش ئەرکی چاودێریکردنی ئەو دەگرێتە ئەستۆ، ئامادەگیی وەها مرۆڤێک بەو ڕۆحە گەورەیەیەوە ڕاسکۆڵنیکۆف هەتا

سەر سنووری شەیدایی دەبات، بەس ئەم ڕاسکۆلنیکۆفەی ئێمەش هەتا بڵێیت بەوە دڵخۆشە کە یارمەتیی ئەوانی دیکە بدات و ئای کە شاگەشکەیە بەوەی کە هەلومەرجێک هاتووەتە پێش تا بتوانێت بە بیانووی مردنی مارمیلادۆفەوە ببێتە بەشێک لە ژیانی غەوارەیەک! دیمەنی ڕووبەڕووبوونەوەی بکوژ و کچە بچووکەکەی مارمیلادۆف (پۆلینکا)، ئێجگار درەوشاوەیە.

ڕاسکۆلنیکۆف لای لە کچۆڵەکە کردەوە. ئەویش تا خوارەوەی پلیکانەکان هاتبوو و تەنیا یەک پێپلە لە سەرووی ئەوەوە ڕاوەستابوو. ڕۆشنایییەکی کز لە دەرێڕا دەدرەوشایە ژوورێ. ڕاسکۆلنیکۆف توانیی ڕووخساری لاواز وەلێ بچووک و جوانی کچەکە ببینێت کە بە زەردەخەنەی شیرینی منداڵانەیەوە تەماشای ئەوی دەکرد. بێگومان هەواڵێکی بۆ ئەو پێ بوو کە ئاوها بە هەڵەداوان دوای کەوتبوو و دیاریش بوو گەلێک بەوە دڵخۆشە کە گەیاندنی ئەو هەواڵەی لە ئەستۆ گرتووە. پەلەپەل و هەناسەسوار گوتی:

– ئێوە ناوتان چییە؟ ماڵتان لە کوێیە؟

ڕاسکۆلنیکۆف دەستەکانیی خستنە سەر شانەکانی کچۆڵەکە و نیگای شاد دیار بوو. تەماشاکردنی کچۆڵەکە، لە چێژێکی سەیروسەمەرەدا نغرۆی کرد و خۆیشی نەیدەتوانی نهێنییەکەی بزانێت.

گوتوبێژەکە بە ڕستەیەکی ئێجگار قوول کۆتایی پێ دێت. پۆلینکا باسی دەکات کە چۆن لەگەڵ دایک و خوشک و برا بچووکەکەیدا دوعا دەکەن. ڕاسکۆلنیکۆف داوا لە کچۆڵەکە دەکات دوعا بۆ ئەویش بکەن. دوای ئەم شەپۆلە بەگوڕمەی ژیان، ڕاسکۆلنیکۆف دەچێتە لای ڕازومیخین، بەڵام لە چاوترووسکاندنێکدا، ئەو خۆشکەیفی و

بڕوابەخۆبوونە کاتییە لەدەست دەدات. پاشان سەرەی گورزێکی تازەیە: هاتنی دایک و خوشک.

ڕاسکۆلنیکۆف کە هاتە ژووری، بەدەم هاوارێکەوە لەناو جۆش و حاڵ، خرۆشاوانە پێشوازییان لێ کرد و دووقۆڵی فڕکەیان کردە لای، بەڵام ئەو دەتگوت بووەتە بەرد. کتوپڕ هەموو گیان کەیل بووبوو لە هەستێک کە وا دیار بوو بەرگەگرتنی نەکردەیە. تەنانەت باوەشی بە ڕوودا نەکردنەوە و نەیدەتوانی دەستی هەڵبڕێت. دایک و خوشکی توند باوەشیان پێدا کرد، ماچیان کرد، پێکەنین و گیان... بەڵام ڕاسکۆلنیکۆف جووڵەی نەکرد، جا ڕەتێکی بردەوە و بە بێهۆشی تەختی زەوی بوو.

ئامادەیی دایک و خوشک و قسەکردن لەگەڵیاندا، جار دوای جار زیاتر تاوانبارەکە ئەشکەنجە دەدەن. کاتێک دایکەکە پێی دەڵێت دڵخۆشە بەوەی کە هەمدیسان بە دیداری شاد بووەتەوە، قسەکەی دایکی دەبڕێت و دەڵێت:

ڕاسکۆلنیکۆف تەماشای دایکیی نەکرد، بەڵام دەستیی گوشی و وڕ و ون ورتاندی:

– با بەسی بێ، دایە گیان! ئێستە دەرفەت هەیە ئیتر بە ئاسوودەیی قسەکانمان بکەین.

هەر کە ئەم ڕستەی بە دەمدا هات، کتوپڕ پەشێوی بوونیی تەنییەوە و ڕەنگ بە ڕووخسارییەوە نەما. هەمدیسان ئەو هەستە تۆقێنەرە سەیرە کە لەم دواییانەدا دیلی دەکرد، لەگەڵ سەرمایەکی مەرگاویدا چنگی بە ڕۆحیدا کرد و دیسان بۆی ڕوون بووەوە کە ئەم جارەشیان درۆیەکی تۆقێنەری کردووە. تێگەیشت کە نەک هەر بە تەنیا دەرفەتی بۆ قسەکردنێکی سەربەستانە نییە، تەنانەت لەمەودواش ئیدی ناتوانێت ببێتە هاودەمی هیچ بەنیئادەمێک. وەها شەپرزەییەک لەگەڵ ئەم بیرکردنەوەیەدا بەرۆکی گرت کە دەتگوت بۆ خولەکێک خۆی بیر چووەتەوە، هەستایەوە و بێ

ئەوەی تەنانەت نیوەســەرنجێکیش لەوانی دیکە بدات، بەرەو دەرگەکە کەوتە ڕێ.

کاردانەوەی دواتری ئەو، ئاسـاییە. ئەم ئەشـکەنجانە، لەودا ڕقێک بەرانبەر بە خێزانەکەی دەورووژێنن کە هۆکارەکەشـی هەر خۆی بووە.

*دایکم و خوشکم... منێک کە ئەوەندە خۆشم دەویستن، بۆچی ئێستە پێیان پەستم؟ ئەرێ، ڕقم لێیانە، بە جۆرێ لە جۆرەکان ڕقم لە ئامادەبیانە و بەرگەی نزیکبیان ناگرم!... چوومە لای دایکم و ماچم کرد... ئەوەم لە بیرە... باوەشـم پێدا کرد و بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەگەر تێبگا چی... یانی بەتەمام پێی بڵێم؟ جا خۆ شتی واشم لێ دەوەشێتەوە! ئممممم!*

گەلێک شـیاوی لەسـەروەسـتانە بزانین لە قۆناغی دواتردا بیرکردنەوەی شـپرزەی ڕاسـکۆڵنیکۆفی پەریشـان، ڕوو لە چ لایەک دەنێت:

*ئاخ من ئێستەش چەندە بێزارم لەم پیرێژنە نەفرەتییە! لام وایە گەر هەمدیسـان زیندوو بێتەوە، جارێکی تریش لێی دەدەم و دەیکوژمەوە! تۆ سـەیری لیزاڤێتـای دامـاو، ئـاخر بۆچی لە کتوپڕێکدا خۆی بە ژووردا کرد؟... وەلێ زۆر سـەیرە کە نازانم بۆچی لیزاڤێتاشـم هەر بە خەیاڵدا نایێ؟ هەر نالێی ئەویشـم کوشتووە!.. لیزاڤێتا! سۆنیا! ئەو منالە پاک و ژیکەلانە، بەو چاوە جوانانەیانەوە... ئەمانە چەندە نەرمونیانن! ئەی بۆچی ناگرین؟ بۆچی ئاە و ناڵەیان بەرز نابێتەوە؟ هەموو شـتێکیان لەدەسـت داوە... چەندە هێمن و بێگەردانە تەماشا دەکەن... سۆنیا، سۆنیا! سۆنیای هێمن!...*

دوای ئەوە سـەرەی بەگژداچوونەوەی لوژن و سـڤیدریگایلۆف بوو؛ بەڵام بیرکردنەوە لە پەیوەندی لەگەڵ خەڵکیدا، هەر وا ئازاری

دەدا. ڕاسکۆڵنیکۆف بەو مەبەستەوە دەچێتە لای سۆنیا تا نهێنییەکەی خۆی لە لا بدرکێنێت. لە ڕەوتی گفتوگۆ لەگەڵ ئەودا، دەرک بە ئەوپەڕی بێگەردی، نەرمونیانی و دڵسۆزیی ئەو دەکات و بۆ ساتێک دڵی دەتەزێت.

پێنج خولەکێک تێپەڕی. ڕاسکۆڵنیکۆف هێشتا لە بێدەنگییەکی تەواودا بە درێژی و پانیی ژوورەکەدا ئامۆشۆی بوو. دواجار چووە لای سۆنیا؛ چاوەکانی بریقەیەکی خراپیان لێ دەهات. دەستی خستە سەر شانی کچە و ڕاستەوخۆ لە ڕووخسارە بە فرمێسک خووساوەکەی ڕاما. نیگا بەهێزەکەی وشک و ئاگرین بوو و لێوی توند دەلەرزی... کتوپڕ دانەوی و خۆی خستە سەر زەوی و پێی سۆنیای ماچ کرد.

بەڵام ڕاسکۆڵنیکۆف دانپێدانانەکە دوا دەخات بۆ جاری داهاتوو. ململانێیەکی نوێ لەگەڵ لوژن و پۆرفیریدا بەڕێوەیە و ڕاسکۆڵنیکۆف هەمدیسان هێزی خۆی کۆ دەکاتەوە. دەچێتە لای سۆنیا تا دان بە هەموو شتێکدا بنێت و ئەو قایل بکات کە کارەکەی ڕەوا بووە، کەچی فێڵ و تەڵەکەکەی ئەو لەبەرانبەر مرۆڤێکی ئاساییدا تووشی نوشووستی دێت، مرۆڤێکی ئاسایی لەو خەڵکەی کە بەردەوام ئارەزووی دەکرد بچێتە ڕیزیانەوە. دیمەنی بیرهێنانەوەکە، کلیلییە و بە باشترین دیمەنی سەرتاسەری ڕۆمانەکە دێتە ئەژمار. ڕاسکۆڵنیکۆف کە لەوپەڕی دڵەڕاوکێدایە، دواجار لەبەردەم سۆنیادا پێدێت و سۆنیاش لەسەر بنەمای سرووشتی خۆی، بە مرۆڤانەترین شێوە مەحکوومی دەکات:

سۆنیا مەدهۆشانە لە جێگەکەی پڕتاوی کرد و لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا ڕاوەستا و پەنجەکانیی لێک گرێ دان، بەس زۆر زوو گەڕایەوە و لەتەک ڕاسکۆڵنیکۆفەوە دانیشت. ئەم جارەیان کەم تا زۆر شانی لە شانی ئەو دەسووی. کتوپڕ وەک ئەوەی بریندار بووبێت، هاوارێکی لێوە هەستا و بێ ئەوەی تەنانەت

هۆکارەکەشی بزانێت، لەبەردەم ڕاسکۆلنیکۆفدا کەوتە سەر ئەژنۆ و بە خەفەتباری گوتی:

– باشە ئێوە چیتان لە خۆتان کردووە؟

ئەم جارەیان بەرزەپا ڕاست بووەوە و خۆی لە شان و ملی ڕاسکۆلنیکۆفەوە ئالاند، باسکی بە دەوریدا هێنا و توند گرتییە باوەش.

ڕاسکۆلنیکۆف کشایەوە و بە زەردەخەنەیەکی خەمگینەوە سەیری کرد:

– تۆ کچێکی سەیری، سۆنیا! من باسی چیم بۆ کردی کەچی تۆ ماچم دەکەی و دەمگرییە باوەش! خۆشت نازانی خەریکی چیی.

سۆنیا تەنانەت یەک وشەش لە قسەکانی ئەوی نەبیست و شێتانە هاواری کرد:

– ئێستە لە سەرانسەری دونیادا هیچ کەسێ نییە هێندەی تۆ خەمگین بێ!

جا پاشان لە پرمەی گریانێکی تۆقێنەری دا.

شەپۆلی هەستێک کە ڕاسکۆلنیکۆف زۆر دەمێک بوو ئەزموونی نەکردبوو، دڵی تەنییەوە و هێوری کردەوە، ئەویش هیچ بەرگرییەکی نەکرد و دوو دڵۆپە فرمێسک بەسەر برژانگییەوە کەوتنە سەما.

– یانی دەستم لێ بەرنادەی، سۆنیا؟

نیگاکردنەکەی لە سۆنیا، شتێکی وەک هیوای تێدا بوو.

سۆنیا هاواری کرد:

– نا، نا، نا، هیچ کات و لە هیچ کوێ بە تەنیا جێت ناهێڵم! دەکەومە شوێنت، بۆ هەر کوێ بێ دەکەومە شوێنت! خوایاااا، چ

ئازارێک لە سـینەی مندایە!... باشـە ئێمە بۆ زووتر یەکتریمان نەناسی؟ تۆ بۆچی زووتر نەهاتی؟ خوایا!!!!

لێرانەدا ئینسـانییەت بە تەواوی خۆی لە ڕاسـکۆلنیکۆفدا نواندووە، کەچی ئەو هێشتا بەوەی نەزانیوە، لەگەڵ ئەمەشدا، هەست دەکات لەم دونیـایەدا هیچ کەسـێک نییە هێندەی ئەو چـارەڕەش بێـت و لە چارەڕەشـییەکەشـیدا هەر خۆی بەرپرسـیارە. دوای چەند خولەکێک دەڵێت:

*سۆنیا، من ڕۆحم ڕەش بووە، ئەمەت لەبیر بێ! ئەمە لە خۆیدا زۆر شـت ڕوون دەکاتەوە.* دواجار ئەشـکەنجەکەی دەگاتە ئەوپەڕی خۆی و لەو سـاتەدایە کە ڕاسـکۆلنیکۆفی زیرەک و لووتبەرز بۆ ڕاوێژ ڕوو لە سۆنیای هەژار دەنێت:

ڕاسکۆلنیکۆف کتوپڕ سەری هەڵبڕی و بە دەموچاوێکی قەڵس و گرژ لەتاو هەناسەساردی، چاوی بڕییە سۆنیا:

– دەی، ئێستە دەبێ چی بکەم؟ تۆ بڵێ!

– دەپرسی دەبێ چی بکەن؟

سـۆنیا لە جێگەکەی قووت بووەوە. کتوپڕ بریقە کەوتە چاوە فرمێسکاوییەکانییەوە:

– هەستە!

جا دەسـتی خسـتە سـەر شـانی ڕاسـکۆلنیکۆف. گەنجەکە هەستایەوە و تاساوانە لەوی ڕوانی و سۆنیاش درێژەی پێ دا:

– هەر ئێسـتە دەچی لەسـەر چوارڕیانەکە ڕادەوەسـتی، دەکەویە سەر ئەژنۆ، سەرەتا ئەو خاکە ماچ دەکەی کە حورمەتیت نەگرت و پـاشـانیش لەبەردەم هەموو دونیـادا، لەئـاسـت چوارقوڕنەی جیهاندا، مل کەچ دەکەی و بە هەموو خەڵکی دەڵێی:

*من بکوژم!* ئەوسا خوا هەمدیسان ژیانت پێ دەبەخشێتەوە. خۆ دەڕۆی، ئەری؟ دەڕۆی؟

بەو جۆرەی کە دیارە، سۆنیای کڵۆڵ زۆر باش دەزانێت دەبێت چی بکات، بەڵام ڕاسکۆڵنیکۆف هەر وا ملەجیڕە دەکات و هەوڵ دەدات بەسەر ئەشکەنجەکەیدا زاڵ بێت؛ تەنیا ئەو کاتەش بڕیار دەدات ڕاسپاردەکەی سۆنیا جێبەجێ بکات کە پۆرفیرییی تەڵەکەچی وای لێ هاتووە چاو دەبڕێتە چاوی ئەو و دەڵێت: *یانی چی کە بکوژەکە کێیە؟... بکوژەکە ئێوەن ڕۆدیۆن ڕۆمانۆڤیچی ئازیز! بکوژەکە خودی ئێوەن.*

ئیدی بەم جۆرەیە کە ڕاسکۆڵنیکۆف لە کۆتاییدا خۆی بەدەستەوە دەدات و ماڵئاوایی لە دایک و خوشکی دەکات. دایکەکە تەنیا سۆسەی ڕووداوێکی وای دەکرد و خوشکەکەش لە سەرتاسەری ڕووداوەکە ئاگادار بوو. ئەم دیمەنانە، بەو جۆرەی کە لە بەرچاوی ئێمەدا دەردەکەون، لە دیمەنەکانی دیکە لاوازترن و، لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە هیچ هەستێکی تازە لە ناخی ڕاسکۆڵنیکۆفدا ناوروژێنن. یەکێکیان لە دواهەمین خولەکەکانی بەر لە تێگەیشتنی دەستکردی ڕاسکۆڵنیکۆفە کە خاوەنی گرنگی و هێزێکی ئێجگار زیاتریشە. ڕاسکۆڵنیکۆف لە ڕێگەی ئاشنای سێنناياوە بەرەو بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس دەکەوێتە ڕێ، بەڵام *کاتێک گەیشتە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکە، لەناکاو شەپۆلی هەستێکی نامۆ گیانیی تەنییەوە هەموو گیانی، جەستە و زەینی.* لەناکاو قسەکانی سۆنیاشی دێنەوە یاد: ... *ڕوو لە چوارقوڕنەی جیهان، سەر دادەنەوێنی و بە دەنگی بەرز بە هەموو خەڵکی دەڵێی: من بکوژم!*

ئەمە سەرتاسەری گۆڕانی ڕۆحیی ڕاسکۆڵنیکۆفە. قسە لەسەر ئەو پەسڵانە نییە کە لە بەشی کۆتایی کتێبەکەدا باس کراوە. ئەم پەسڵانە بە تایبەتمەندیگەلێکی تەواو ئاشنا باسی لێوە کراوە و خودی

نووسەریش دەڵێت ئەم پەسلانە نەک بەم چیرۆکەی کە لە بەردەستدایە، بەڵکە پەیوەندیی بە مێژووی ژیانەوە و لەدایکبوونەوەی دووبارەی مرۆڤەوە هەیە.

بەم پێیە، راسکۆلنیکۆف تا کۆتاییش هەر نەیتوانی لەو ئاژاوەیە تێبگات کە کەوتە گیانییەوە و تووشی ئەو پەژارەیەی کرد. هەروەها نەشیتوانی لە چێژ و بەختەوەریی ئەو بڕیارەشی تێبگات و ئەزمی بکات کە لەژێر کاریگەریی سۆنیادا دای. *راسکۆلنیکۆف گەنجێکی بەدبین و دوورەپەرێز بوو، لە ئەنجامیشدا، بێبەزەیی*، ئەمە ئەو وەسفەیە کە نووسەر لەبارەی پاڵەوانەکەیەوە خستوویەتییە ڕوو. قین و تووڕەیی راسکۆلنیکۆف مۆڵەتی ئەوەی پێ نەدەدا بانگی بەرزی دەروونی ببیستێت. ئێستە ڕوون دەبێتەوە کە بۆچی دەڵێین نووسەر لەنێوان دوو پرسی کلیلی بەرهەمەکەیدا تەنیا یەک دانەیانی کامڵ کرد.

بە گشتی، *تاوان و سزا*، بەدوای چییەوەیە؟ خوێنەر لە ساتی ڕوودانی تاوانەکەوە بەردەوام چاوەڕوانیی چ شتێک دەکات؟ ئەو چاوەڕێی گۆڕانی دەروونی و بێداریی هزر و هەستە مرۆڤانەکانی راسکۆلنیکۆفە. ئەو بنەمایەی کە راسکۆلنیکۆف دەیەوێت لە خۆیدا بیکوژێت، دەشیا لە دەروونی ئەودا زیندوو ببێتەوە و بە هێزێکی زیاترەوە بە گژ ڕابردوویدا بچێتەوە.

بەڵام نووسەر بە جۆرێک پرسەکانی ڕێک خستن، کە پەرژانەسەر ئەم دیوەی پرسەکە لەم بەرهەمەدا بۆی بووە کارێکی ئێجگار سەخت و نەکردە. لەوانەیە بکرێت ئەم خاڵە هەم بە خەوش و هەم بە گرنگیی ئەم ڕۆمانەی دۆستۆیفسکی بزانین. دۆستۆیفسکی شێوەی پرسەکەی ئەوەندە بەرفراوان کرد و راسکۆلنیکۆفی ئەو هێندە نالەبار و دوورەپەرێز دەرچوو کە زیندووبوونەوەی ڕۆحی هەر وا سووک و

ئاسـان نەبوو و، ئێسـسـتەش زیاتر، دەرکەوتنێکی جوانیی مەعنەوی و هارمۆنیای پێکهاتەیەکی گەورەمان دەهێنێتە بەرچاو.

راسـکۆلنیکۆف رووسـیێکی راسـتەقینەیە، چونکە تا ئەوپەڕ لەگەڵیدا دەڕوات، تـا ئەوپەڕی جـادەیەک کە ئەقڵی ویێڵی ئەوی پێـدا پەلکێش دەکرد. ئەم تایبەتمەندییەی رووسـەکان یانی جددییەتێکی لەڕادەبەدەر، جا کتومت وەک ئەو رەنگە مەزهەبییەی کە بیرکردنەوەیانی پێ رەنگ دەکەن، هۆکاری زۆربەی گێچەڵەکانی ئێمەیە. ئێمەی رووسـەکان حەز دەکەین بە تەواوی خۆمـان تەرخـان بکەین، بەبێ هیچ درێغیکردن و وەسـتانێک لە نیوەی ڕێدا. ئێمە ناخەڵەتێنین و فڕوفێڵ ناکەین، هەر لەبەر ئەوەشـە کە لەو مامەڵە جیهانییەدا لێناگەڕێین فکرمان بێتە ژێر باری واقیعیەت. هەر لەبەر ئەوەشـە کە ناچینە ژێربـاری مـامەڵەی جیهـانیی گۆڕینەوەی فکرمـان لەگەڵ واقیعیەتدا. دەکرێت هیوادار بین ئەم سـیفەتە بەنرخ و بەرزەی رۆحی رووسـی سـەردەمێک لە بابەتگەلێکدا کە هەر بە راستی بەرزن، بدرەوشایایەتەوە، بەڵام ئێستە، بە لەبەرچاوگرتنی شـێواوی ئاکاریی بەشـگەلێک لە کۆمەڵگەی ئێمە و پووچی و ئەو بۆشـاییەی کە چەند بەشـێکی دیکەی تەنیوە، ئەم تایبەتمەندییە سنوور تێدەپەڕێنێت و، هەرچۆنێک بووە، ژیان ژەهراوی دەکـات و تەنـانەت مرۆڤەکـان بەرەو فەوتـان پەلکێش دەکـات. نووسەرەکەی ئێمەش کتومت لەبەر ئەم هۆکارە بوو کە وێنەی یەکێک لە خەمناکترین و تایبەتترین دیاردەکانی وەها نەهامەتییەکی کێشا.

# خـــــواوەندانـــــی مـــــەرگ و ژیـــــان

## سەرنجێک لە جیهانی دۆستۆیڤسکی

ڕالف میتلا، زانکۆی پرینستۆن، نیوجێرسی

شـــرۆڤەکەی ئێمە، هەر بەو جۆرەی کە بە ناونیشـــانەکەیدا دیارە، نیازیەتی لەبارەی دۆســـتۆیڤســـکی و مەرگەوە بدوێت و زنجیرە وێنـایەکی خۆکوژی، کوشـــتنگەلێکی جـاڕزکەر و چەپەڵانە، کۆمەڵە ڕووداوێکی کارەساتبار، ئازار، نەخۆشی، زووخاو و گوللەبارانکردنی دڵڕەقانەی نامرۆڤانە لە زەینی خوێنەردا زیندوو دەکاتەوە. گەر لایەنە پڕ لە دڵپەرۆشـی و هەرا زیادەڕۆیانەکەی ئەدەبیاتی دۆسـتۆیڤسـکیش لە بەرچاو بگرین، هەر ڕووخســـاری مەرگ بە جۆرێک لە بەرهەمی ئەودا دووبارە دەبێتەوە کە زەنگی مەترســـیمان بۆ لێ دەدات، بەڵام دووبارەبوونەوە و ئاساییبوونی مەرگ بە هیچ شێوەیەک لە گرنگی و قووڵییەتییەکەی کەم ناکاتەوە. نووســـەر، لە دوو لاپەڕەی بەناوبانگی *تاوان و ســـزا* و گەمژەدا بە ڕوونی ڕاکردنی مرۆڤ لە مەرگ ڕوون دەکاتەوە و، هەڵبەتە، بیر و خەیاڵەکانی *کیریللۆفـی شـــەیتانەکان*یش لەبارەی وەستێنەرانی خۆکوشـتنەوە دەخەینە ســەر ئەمانە، بەڵام ئەم ڕاکردنە هەمیشـــە وەک پرســـێکی دەروونناســـی لێی ڕوانداروە نەک وەکوو دەستمایەیەک بۆ کنەکاری لە دەقی ڕۆماندا.

شێوازی دۆستۆیفسکی لە وەسفی هەناسەی مەرگدا، خاڵی دەستپێکێکە بۆ خستنەبەرباسی بابەتی جیاسی چەمکی مەرگ لە بەرهەمەکانیدا. ئەو تەرمانەی کە دۆستۆیفسکی لەسەر یەکیان هەڵدەچنێت، دەتوانین لە سێ بەشدا لێکیان جیا بکەینەوە: قوربانیانی خۆکوشتن، قوربانیانی مەرگگەلی توندوتیژانە و ژمارەیەکی کەمیش لە مردنی سرووشتی کە دایمەش هاوڕێن لەگەڵ شکۆ و حورمەتدا. بە دڵنیاییەوە دەبێت پۆلێنکردنەکە وردتریش بکەینەوە، بۆ نموونە ئەو منداڵانەش کە لە ناموراديان دەست دەدەنە خۆکوژی، یان کەسانی وەک کیریللۆف و کرافنت کە بە ئامانجی تەواو ئەقڵانی بەڵام خۆنوێنانەوە هەنگاو دەنێنە ئەم ڕێیەوە و کەسانی ساردوگەرمچەشتووی وەک ستاڤرۆگین و سڤیدریگایلۆف کە لەگەڵ دەرککردن بە ئەوپەڕی نووشووستی ڕۆحی، خۆیان لەسەر سەکۆی نمایشی ڕۆژگار دەسڕنەوە، بەڵام بێ گوێدانە فڵانە بەشی پۆلێنکردن و لق و ئەوەی کە پرۆسەی مردنەکە کورت بێت یان درێژ و هەناسەبڕ، ئەو ڕوونکردنەوەیەی کە دۆستۆیفسکی لەبارەی مردنەوە بەبێ جیاوازی دەیخاتە ڕوو، پوخت و تێروتەسەلە و لەسەر بنەڕەتی حەقیقەت؛ هەر دەڵێیت وەڵامی پرسیارگەلی فەرمیی بەرپرسی دادگە دەداتەوە. گەرچی وشک و کورت ئاگادار دەکرێینەوە کە *سڤیدریگایلۆف پەلەپیتکەکەی چرکاند*، یان بە تانەوە کە فڵان *لەپشت دەرگەکەوە خۆی بە تەناف هەڵواسیبوو* و یان ئاسایتر و دووبارەبووەوەترین دەربڕینی کورتوپوختی وەک فڵان *مردبوو*. نووسەر جاروباریش دەپەرژێتە سەر پرسی هۆکار و سەلامەتیی ئەقڵ، یان سەر وردەکاریی بەرهەست و جەستەیی، بۆ نموونە ئەو دژدامانە بێدەنگەی کە لە کەمژەدا دەیبینین: دژدامان لەبەر خوێنلەبەرڕۆیشتنی بێڕادەی ئەندێک ناستاسیا فیلیپۆڤنا دوای بەرکەوتنی چەقۆ، بەڵام تەنانەت ئەم وردەکارییە ساتییەش بایەخێکی

ئەوتۆی پێ نادرێت و نووسەر ئەو ساتەوەختە تایبەتە دوورودرێژ ناکاتەوە.

لە *شەیتانەکان*دا، ڕوونکردنەوەی کوشتنی *شاتۆف* تێروتەسەلتر دەبێت:

> لەو ساتەدا بوو کە تۆلکاچنکۆ لەپشت درەختێکەوە دەرکەوت و لە پشتڕا هەڵمەتی شاتۆفی دا، ئێرکلیش هەر لە پشتڕا هەردووک ئەژنۆی گرت. لیپۆتین لە پێشڕا پەلاماری دا. سێقۆڵی دەرفەتیان نەدا و تەختی زەوییان کرد. ئێستە سەرەی پیۆتەر ستیپانۆڤیچ بوو کە دەمانچەبەدەست وەک تیر پرتاوی کردە لایان. دەڵێن شاتۆف توانیی سەری بەرەو ئەو بسووڕێنێت، ببینێت و بیناسێتەوە. سێ فانۆس ڕووناکییان دەپرژاندە دیمەنەکە. کتوپڕ هاوارێکی تاساو و داماوانە لە سنگی شاتۆفەوە دەرچوو، بەڵام دەنگەکەیان کپ کردەوە. پیۆتەر ستیپانۆڤیچ بە پەیڕەویکردن لە ڕێسای تایبەتی کارەکە و بە دەستێکی بەهێزەوە، لوولەی دەمانچەکەی ڕێک بە تەوێڵی ئەوەوە نووساند، گوشاری خستە سەر و پەلەپیتەکەی چرکاند. وا دیارە دەنگی تەقەکە هێندەش بەرز نەبووە، لانیکەم لە سکوورۆرێشنیدا هیچ نەبیسترا.

ئێمە خوێنەری ڕستەگەلێکی کورت و تا ڕادەیەک سادەی هەواڵیین کە ڕووداوەکە بە سەرنج و جۆرێک لە بێلایەنیی وردەوە ڕوون دەکەنەوە، گەرچی تەنیا بەپێی یەکبەدوای‌یەکیی کات ڕووداوەکان دەگێڕنەوە. ئەو بەشەی پێکهاتەکە کە لە ڕووی زمانەوانییەوە ئاڵۆزترە، هەمدیسان جەخت لەسەر هۆکار، پەیوەندی و بنەڕەت و پەیڕەوکردنی ڕستە دەکاتەوە.

> ئێرکل یەکەم کەس بوو کە بەردەکەی خۆی هێنا؛ جا پیۆتەر ستیپانۆڤیچ بەدەم هەناسەهەناک و جوێنپێدانەوە پیاوە مردووەکەی بە تەناف بەستەوە و بەردەکەشی لە پێی مردووەکە توونـد کرد. تۆلکاچنکۆ بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە کەمیش

نەبوو، بەردەکەی بە ڕێکی گرتبووە دەست و بەشی سەرەوەی جەستەی بە جۆرێک لە ڕێزەوە چەماندبووەوە، دەیویست هەر کە داوایان کرد، یەکسەر بەردەکە پێشکەش بکات و ئەسڵەن ئەوەشی بە بیردا نەهات کە بە درێژایی ئەو کاتە، بارە قورسەکە بخاتە سەر زەوی.

ئەوەی کە بە دڵنیاییەوە دیمەنەکەی بەهێزتر کردووە، ڕستەگەلێکن کە ناهاودەنگیی ئەوان، بەشی نائاسایی کار و نالەباری کردەوەکە بەرجەستەتر دەکات؛ هەڵبەتە ئەو خاڵەش گرنگییەکی زۆری هەیە کە دۆستۆیفسکی بەوپەڕی وردییەوە، شێوەی میکانیکیی مەرگی لە جۆرە مەعنەوییەکەی جیا کردووەتەوە. ئەو کەسایەتیانەی کە دەستیان لە تاوانەکەدا هەیە، نە نیگەرانییەکی ئەوتۆ نیشان دەدەن و نە خۆیان ئاشکرا دەکەن، هەڵبەتە تا ئەو کاتەی کە لەپڕ دەنگی نارەزایەتیی ویرژینسکی بەرز دەبێتەوە کە *ئەمە ڕاست نییە، ڕاست نییە، بە هیچ شێوەیەک ڕاست نییە*، جا وەها توورەیی و هیسترایەکی تەشەناکەر دەهێنێتە ئارا کە لە خودی تاوانەکە سامناکترە، چونکە ئەم دەنگی نارەزایەتییە، هەر بە ڕاستی، بە جۆرێکی تاسێنەر ئەو تۆقینە وەسفهەڵنەگرە وێنا دەکات کە لە نابوودکردنی دەستئەنقەست و پاکانەبۆنەکراوی ژیانی مرۆیی دەکەوێتەوە. بۆ خوێنەری ئێمە، مردنی شاتۆف، تاڵتر و جەرگبڕترە و لانیکەم لە ڕوویەکەوە لە سەرلەبەری ئەو مردنانە جیاوازە کە دۆستۆیفسکی ئافراندوونی، چونکە ڕێک دوای ڕەوانەوەی گومانە میتافیزیکی و دینییەکانی شاتۆف ڕوو دەدات. لە کاتی لەدایکبوونی منداڵەکەیاندا، دیدی ئەو مانا دەبەخشێتە ژیان و بەم پێیە، واتا و بایەخی مردنیش دەگۆڕێت. یەکەمین گریانی بێهازی کۆرپەکە -پەرجووی لەدایکبوون- لە دواهەمین هاواری نارەزایەتییەکەی شاتۆفدا زایەڵەی هەیە و لەو کاتەدا دەیبیستین کە ویرژینسکی و لامشین خۆیان لە بەهەندوەرنەگرتنی تاوانەکە دوور دەگرن.

بەبێ تێگەیشتنێکی مانادار لە ژیان، هیچ مردنێک بایەخێکی تایبەتیی نابێت. ئەوە ڕاستە کە لە بەرهەمی دۆستۆیفسکیدا مەرگ بێبەزەییانە گورز دەوەشێنێت، بەڵام لایەنێکی دیکەی، کۆتاییهاتنی کێشمەکێش و نامورادییەکانی ژیانە، نەک برەوپێدانیان. پێداگری لەسەر نیشاندانی وێناگەلی بێزارکەر و تاسێنەر و ئازاری مردن و هاوشێوەیان، بەزۆری لەبەر ڕاکێشانی سەرنج بۆ ئەو زووخاو و ئازارە جەستەییە نییە کە ئێمە دەخاتە ژێر کاریگەرییەوە، بەڵکە کتومت سەرنجمان بۆ بینینی ئەوە کێش دەکات کە ئازاری جەستەیی هێندەی ئەو زووخاوە ڕۆحی و ئەشکەنجە زەینییە بەسوێ نییە کە کەسایەتییەکان دەیچێژن. مردنی شاتۆف بە چەشنێکی زەق ئەم دوو جۆرە ئازارەمان نیشان دەدات. لە گەمژە و وەسفکردنی تابلۆی پیێتای بەرهەمی *هۆلباین*یشدا[1] بە ڕوونی سەرنج لەسەر ئازار چڕ کراوەتەوە. پیێتا ئیمانی یەک بە یەکی ئەوانەی کە لەو ڕاماون، دەخاتە بەردەم هەڕەشەوە، چونکە هێندە ورد و نکۆڵیلێنەکراو ئازاری جەستەیی و زووخاوی ڕۆحیی مەسیح دەنوێنێت کە لێبڕاوانە چەوت بەسەر ئەگەری پەسلاندا دەهێنێت. *ئەیپالیت* زۆر ورد وەها پرسێک دەخاتە بەرباس: *ئەگەر مردن تا ئەم ڕادەیە تۆقێنەرە و ڕێساکانی سرووشت تا ئەم ئاستە مەزن و بەهێزن، ئەی چۆن دەتوانین بەسەریاندا زاڵ بین؟* جا بەم جۆرە درێژەی دەداتێ کە *سرووشت هێزێکی ڕەش و ڕووداماڵراوی بێلۆژیکە، بەڵام تامەتاییە و هەموو شتێ دەبەزێنێ.* ئەو گومانانەی کە بەدشێوەیی دەیانوروژێنێ، ناتواندرێت لە چوارچێوەی ڕێچارە زەمانی و جەستەییەکاندا چاروبڕ بکرێن، بەڵام لە لایەکەوە، ناتوانرێت

---

١. Hans Holbein : هانس هۆلباین (١٤٩٧-١٥٤٣) یەکێکە لە هونەرمەندە بەناوبانگەکانی ئەڵمانیا، کە بە شێوازی ڕێنیسانسی تابلۆی کێشاوە. هانس یەکێک بووە لە برەوپێدەرانی تابلۆی ئایینی و بە یەکێک لە گرنگترین ڕووخسار و هونەرمەندانی سەدەی شازدە دێتە ئەژمار. «و. ک»

لە زەیندا دەربکرێن، چونکە مرۆڤ ناتوانێت بێباکانە چاو لە تیاچوونی هاوتوخمەکەی بپۆشێت و بە ناچاری لەبەرانبەر سرووشتدا دەسەوەستانیی خۆی پەسەند نەکات. تاکە ڕێگەی ڕزگاری، لە ئەودیوسرووشتدایە. لەگەڵ هەنگاونانە وەها جیهانێکەوە، بایەخی مەرگی جەستەیی دەگاتە ئەوپەڕی کەمیی خۆی. بۆ پشتڕاستکردنەوەیەکی زیاتری خاڵی جێباس، ئاماژە بە دیمەنی *بەدیار سەیرکردنی مردووەوە* دەکەین کە دەکەوێتە بەشەکانی کۆتایی کەمژەوە، کە ئێجگار سەرنجڕاکێش و بەرجەستەیە. ئەم دیمەنە بە جۆرێک لە جۆرەکان ئاوەژووسازیی پێیێتای هۆڵباینە، چونکە بەنیازە بە ڕێگەگەلی نائاسایی بەر بە بۆگەنبوون و شیبوونەوەی تەرمی ناسـتاسـیا فیلیپۆڤنا بگرێت: بە داپۆشین، دژەهەوکردن و گوڵلەسەردانان، بەڵام ئەمانە هەمووی هەوڵگەلی بێبەرهەمن: یەکێک لە پەنجەکانی پێ دەرچووە، رووتە و وا وەسف دەکرێت کە *بێجوولەییەکەی تۆقینەری تێدا بێت، وەک بڵێی لە مەڕمەڕ دایانتاشیبێت.* پەنجەی ڕووت و گیزەگیزی مێشێک کە بەسەر سەرینی ژنەی مردووەوە دەنیشێتەوە، ئەم وەهمە لەناو دەبات کە ئەو ڕێسا هەمیشەکۆکەی سرووشت –بۆگەنکردن و شیبوونەوەی تەرم– دوا خراوە. کارتێکەریی دیمەنەکە، جارێکی دیکە لەسەر گۆڕانی پلەبەپلەی دۆخی کەسایەتییەکانی دادەمەزرێتەوە، گۆڕانی دۆخ لە خەمساردی بەرانبەر بە مەرگی جەستەیی تا پەسەندکردنی تەواوەتیی حەقیقەتی مەرگ هاوکات لەگەڵ تۆقین و تێگەیشتنی کورتخایەنی کردەییبوونی دەرکەوتنی بۆ خۆیان.

کەواتە بە سەرنجدان لەو نموونانەی کە هێنامانەوە، دەتوانین باسەکەمان گشتگیر بکەین. لە بەرهەمی دۆستۆیڤسکیدا، مردنی جەستەیی تەنیا قۆناغێکە لە ناکۆکیی سەیروسەمەرەی نێوان دوو سیستم. هاوکات ئاقیبەتی بێمانای کاری سەرسەختانە نەخرانە سەر

ڕاستەڕێ و هەنگاوێکی بێچەندوچۆنە لە ڕەوتی سەرکەوتن بەسەر مەرگدا، واتە لە پەسلاندا، کە تەنیا بە نسبیی ئەو پەشیمانانە دەبێت خوازیارن بخرێنە سەر ڕاستەڕێ. مادام لە هیچکام لەم حاڵەتانەدا مەرگ گرنگییەکی ئەوتۆی نییە، ڕۆڵی ئەو ئاسانکردنی گێڕانەوەیەکی بێلایەنانە و دوور لە دەمارگیرییە. ئەم گێڕانەوە بێلایەنانەیە، بە ئاراستەی پشتگیریکردن و بەهێزکردنی ڕۆڵی مەرگێکی تایبەت و گرنگییەکەی بۆ ئەوانی دیکە بەرنامەڕێژی کراوە. دیوە دراماتیکییەکەی بەرهەمی دۆستۆیفسکی لە پرسی مەرگ یان ژیاندا نەشاردراوەتەوە، ئاخر گەر وا بێت دەکرێت مانای مەرگ بخرێتە ژێر پرسیارەوە: بۆ نموونە هەڵسوکەوتی تۆلستۆی لەگەڵ شازادە ئاندری یان ئیڤان ئیلیچدا. لەوێدا و لە درامی دۆستۆیفسکیدا، بینەری توخمگەلی دووبارەبووەوەی لەدایکبوونەوە و پەشیمانی و ڕێتێچوونی کەوتنەسەر ڕاستەڕێی ڕۆحیین.

ئەگەر مەرگ، بە دیاریکراوی گریمانەی واتای لەناوچوونی بۆ بکرێت و تەنانەت بە جۆرێک لە جۆرەکان هاوواتای ئەو کێشکردنە سەیر و سەرسەختانەیە بێت بۆ لەناوچوون، کە بە شەهوەتی مەرگ ناو دەبرێت، ڕەنگە لە لایەکی دیکەوە وا لێک بدرێتەوە کە ببێتە بەرانبەرێک بۆ ئەو کێشکردنە ئەرێنی و تاهەتایی و تازەلەدایکبووەی کە بە شەهوەتی ژیان ناو دەبرێت. بەڵام مەرگ تەنانەت وەها ڕۆڵێکیش لە بەرهەمی دۆستۆیفسکیدا ناگێڕێت، کەواتە لەم پێکهاتەیەدا دەبێت پرسی مەرگ وەلا بنێین. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئێمە لە بەرهەمی دۆستۆیفسکیدا ڕووبەڕووی ئەو شتەین کە شەهوەتزێنە نەک غەریزە شەهوەتییەکان. ماشووقەی لاهووتی ئامادەیە، کەچی عەشق، هیچ منداڵێکی نەخستووەتەوە. عەشق و شەهوەتی ژیان، بەرئەنجامەکەیان هێنانەدونیای منداڵ نابێت، بەڵکە سەرئەنجامەکەی نارەزاییدەربڕینە و تەنیا نارەزاییدەربڕین. تەنانەت دەکرێت منداڵەکەی

شاتۆفیش بە بەرئەنجامی لاوەکیی ئەو گاڵتەیە بزانین کە ستاڤرۆگین دەبێتە هۆکاری. کیریلۆف بە شاتۆف دەڵێت مرۆڤ هەر کاتێک گەیشتە ئەوپەڕی توانای خۆی، ئەوسا منداڵخستنەوە واتای خۆی لەدەست دەدات و دەبێت بوەستێندرێت. *مرۆڤی گاڵتەجار*یش بۆچوونێکی لەو چەشنەی هەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی سەروکاریمان لەگەڵ دۆستۆیڤسکیدا هەیە، بەپێی چاوەڕوانیی ئێمە دەجووڵێتەوە و بەرەو شێواندنی هارمۆنیی ژیان دەکشێت. هەڵبەتە کەسانێکیش هەن کە شەهوەتی ژیان دەخەنە گەڕ تا ژیان ئەزموون بکەن. ڕەوشی ئەمانیش یان گەندەڵکردنێکی ئاگایانە و دەستەنقەستی منداڵانەیە کە تا ڕادەیەکی زۆر لە بزواندنێکی زەینییەوە سەرچاوەی گرتووە یان زیادەڕۆییکردن لە مەیخواردنەوەدا. هەندێک لە کەسایەتییەکانی کە ئامادەی چوونە ژێرباری جیهانێکی ئاکاری و ئامادەی نین، بۆ ماوەیەکی کاتی لە باوەشکردن بە ئیرۆتیزمدا ڕێگەی هەڵهاتن دەبیننەوە و داماوانە دەکۆشن لە ژیانی جەستەییدا نیشانەیەکی نەمری و بەفیرۆنەچوون بەدی بکەن. مادام ئەم ڕێی هەڵهاتنەش لە بنەڕەتدا لە وەهمێک بەولاوە هیچی دیکە نییە، تاکە ئەنجام کە لێی دەکەوێتەوە، پشتڕاستکردنەوەی نەمێنی و جەستەییبوون و ناچاربوونی تاکە بۆ پەسەندکردنی مەرگ وەک ڕاستییەکی ژیان. بەم پێیە، گرنگی و پێویستیی تێرکردنی ئیرۆتیک دووهێندە دەبێت و ڕەنگە لەبەر ئەمە بێت کە بە ئەپۆکالیپسی (دونیائاخر) ئاوەژووی فیۆدۆر کارامازۆف دوایی دێت؛ کشانی ئارەزووبازانەی ئەو بەرەو هەر ژنێک کە دێتە سەر ڕێگەی، بەڵام بە شێوەیەکی ئاسایی، ئەنجامەکەی توندوتیژییە، گەردەلوولێکی وێرانکەرە کە بەهۆی لەکۆنترۆڵدەرچوونی شەهوەتەوە هەستاوە. دیمیتری کارامۆزۆف بیرمان دەخاتەوە کە وەها ئارەزووبازییەک لە یەک بە یەکی مرۆڤەکاندا هەیە و ناتواندرێت ڕەد بکرێتەوە یان نکۆڵیی لێ بکرێت. ئەگەر بەسەریدا سەرنەکەوین، دەگۆڕێت بۆ شێوازێکی ئازاردەر و کاولکەری دیکەی لاساری و

سەرەڕۆیی؛ بەلاڕێدابردنی ژیان و کەفوکولێکی لەناوبەر و کارەساتبار کە سـزای بەدوادا دێت. ئەوە ڕوونە کە تاکە ڕێی جڵەوکردنی ئەم کەفوکوڵە مەرگـاوییە، هێنـانەئـارای گۆڕانکـارییەکی بنەڕەتییە لە کەسایەتیدا.

تەرازوو دوو تای هەیە و تاکەکەی دیکەی عەشـق و مەعنەویەتی تێدایە کە هەندێک جار بێتوانایی و کەموکوڕیی جەسـتەیی لەگەڵدایە، بەس تەنانەت گەر واش نەبێت، بەبێ جیاوازی ڕەگەکەی لە دووانەی زەین و جەستەدایە. دەکرێت وەها عەشقێک ئەنجامێکی وەک *سۆنیای تاوان و سـزای* لێ بکەوێتەوە کە تەنانەت کاسـبییەکەشـی لایەنێکی نەجیبانە و بەبەهای هەیە، بەڵام دۆسـتۆیڤسـکی لە لەخۆبردوویی ئەو نابوورێت و حسێبی قوربانیدانی بۆ ناکات.

سۆنیا بە هەراسانی هاواری کرد:

– گوتتان شانازی بووە بۆ خوشکتان کە لەلای من دانیشتووە! شـانازی؟ لەلای منێک کە... هیچ حورمەتێکم بۆ نەماوەتەوە؟... منێک کە گونـاحبـارم، گونـاحبـارێکی گەورە! ئـاخ، بۆچی واتـان گوت؟ بۆچی؟

– لەبەر بێحورمەتی و گونـاحەکـانـت نەبوو، لەبەر ئەو کوێرەوەرییە وام گوت کە تۆ دەیکێشی. ئەوەی کە تۆ گوناحباریت ڕاستە و هیچ گومانێک لەئارادا نییە.

ڕاسکۆڵنیکۆف خرۆشاوانە درێژەی پێدا:

– گەورەترین گوناحیشت ئەوەیە کە لەبەر هیچ خۆت فرۆشت و لەناو برد، لەبەر هیچ! لەمە ترسناکتر هیچ هەیە؟ وا لەناو پیسی و چەپەڵییەکـدا دەگەوزێی کە پڕبەدڵ بێزت لێی دەبێتەوە و خۆشـت باش دەزانی تەنیا دەبێ چاوەکانت بکەیتەوە و ببینی کە ئەم کارانەت برینی هیچ کەسـێکیان سـاڕێژ نەکردووە و هیچ کەسێکیش ڕزگار ناکەن! خۆت بڵێ...

ڕاسکۆڵنیکۆف کە خەریک بوو دەگەیشتە ئاستی شێتبوون، هێشتا هەر قسەی هەبوو:

– ئاخر چۆن دەکرێ لەلایەکەوە ئەو هەستە پیرۆزانەت هەبن و لە لایەکی ترەوە ئەم سەرشۆڕی و شوورەیی و نەگبەتییە؟ کاری باش و ڕاست ئەوەیە کە... یانی هەزار جار ژیرانەتر و باشترە کە سەراوسەر خۆت هەڵدەیتە ناو ئاو و ئیتر بۆ تاهەتا کۆتایی پێ بهێنی!

نموونەیەکی دی، ئەو دیمەنەیە کە گرۆشینکا (کە هەموو جوانیی دڵڕفێنی خۆی، بۆ لەخشتەبردنی ئالیۆشا کارامازۆف خستبووە کار) دەزانێت ئالیۆشا بەبۆنەی مردنی زۆسیماوە خەمبارە. ناهۆگریی زەین و لەش، شەهوەت و عەشقی مەعنەوی و دژبەریی مەرگ و غەریزەی ژیان لە دیمەنی چاودێریکردنی مەرگ لەلایەن ناستاسیا فیلیپۆڤناوە هێندە بەهێز وێنا کراوە کە لە هیچ دیمەنێکی دیکەدا وەها هێزێکمان بەرچاو ناکەوێت، چونکە شەهوەتی ڕاگوزین و عەشقی مەعنەویی مێشکین بە یەک ڕادە لە مەرگی ئەودا بەرپرسیارن.

دەکرێت نارەزاییەک دەرببڕدرێت، نارەزایەتییەکی ڕێپێدراویشە: کە لەنێوان ئەم تەریکی و زیادەڕۆییەدا ئاستێکی مامناوەندیش هەیە، واتە ئەوەی کە لە بنەڕەتدا جیهانی دۆستۆیڤسکی بە کەسانێک تەندراوە کە شەهوەت لە ژیانیاندا ڕۆڵێکی ئەوتۆی نییە و بەوە قایلن کە بەپێی دابونەریت زەماوەندێک بکەن و خێزانێکیان هەبێت و، ئەمانە، لانیکەم دەبنە زەمینەیەک بۆ گوتار و پەیدۆزییەکانی دۆستۆیڤسکی، بەڵام ئەم هەست و ئاکامە ئاسایی و سرووشتییە مرۆییانە، دەڵێیت بۆ ئەوە هەن تا بینە بنەڕەتی ژیانی خەڵکی ئاسایی و ئەو کەسانەش (ئەوانەی کە ئاساییبوون دەخەنە ژێر پرسیارەوە) لەو مەودا گەورەیە بەئاگا بێننەوە کە کەوتووەتە نێوان ئەوان و خەڵکییەوە. لە بەرهەمی دۆستۆیڤسکیدا هیچ کەسایەتییەکی عەودالمان ناکەوێتە بەرچاو کە بە

ڕوونکردنەوەیەکی کەمتر لە تاوتوێیەکی تێروتەسەلی جیهان و ئەوەی کە تێیدایە، قایل ببێت و هیچکامیشـیان، ناتوانن لە چێژە ئاسـاییەکانی ژیاندا، بەوپەڕی ڕەزامەندییەوە ڕێگەی هەڵهاتن بدۆزنەوە. هەڵبەتە هیچکامیان لەبەرانبەر هێرشـی بێئامانی عەشـقدا خۆیان ڕاناگرن؛ هێرشـێک کە زریانێکە و پڕ لە ئاژاوە و بە ڕواڵەت پزیسـکە بەدیهێنەرەکەشـی دەرککردنە بە پێویسـتییەکی میتافیزیکی و تەواوکەرێک کە ئافرێندراوە دووتوخمییەکەی ئارسـتۆفان لە سـەمپۆزیەمدا[1] بیر دەهێنێتەوە. لەبری عەشـقگەلی ئاگرین و ڕوو لە پتەوبوون، مشتومڕی گەرم لەئارادایە و سەرقاڵی زەینی و جەستەیی هەستی یان پەیوەندیگەلی سەرمەستانە لە ئاستی سەرووشوێنی و سـەرووکاتییەوە. هەڵبەتە ئەگەر ئەنجامی ئەم هێرشـە بێئامانە هۆگربوونێکی پتەو بێت، دۆسـتۆیفسـکی خۆی لە تاوتوێکردنی نادات. دۆخی شـاتۆف دوای لەدایکبوونی منداڵی هاوسـەرەکەی، لە خۆیدا دەکرێت ببێتە دەسـتمایەی ڕۆمانێکی دیکە، بەڵام ڕۆمانێکی بێگانە بە بەرهەمەکانی دیکەی دۆسـتۆیفسـکی و چەندان فەرسـەنگ لێیانەوە دوور دەبێت. هەر بە ڕاسـت ئێمە چ شـتێکمان هەیە لە دیمەنی ڕاسـکۆڵنیکۆف و سـۆنیا لە کاتی پەروەردەکردنی منداڵێکدا سەیروسەمەرەتر بێت؟

کەواتە پایە و بنەڕەتی عەشق، یان تەوەرەی سەرەکیی ئەو، شتێکی دیکەیە. دیمیتری *کارامازۆف* بڕوای وایە کە بەشێکی گەورەی بریتییە لە ڕق و بیرمان دەهێنێتەوە کە عشـق و نەفرەت دەبێت شـانبەشـانی

---

١. سەمپۆزیەم: وشەیەکی یۆنانییە بە واتای «پێکەوەخواردنەوە» دێت. لە سەردەمی خۆیدا ئاماژە بووە بۆ: «خواردنەوە لەگەڵ یەکدیدا بە شـادی (کۆڕی شـادنۆشـی)». لە یۆنانی کەوناراداا بە نیازی خوادۆستییەوە ئەم «کۆڕە شاد»انەیان بەپێی نەریتێک بەڕێوە دەبردن. ئەم دەربڕینە کۆنەی یۆنـانی کەونـارا، ئەمڕۆکە بۆ کۆڕی زانکوش بەکار دێت. «و. ک»

یەک ڕابوەســـتن و، ئەوەی کە هەرکامێکیان بە ئاســـانی دەتوانێت بگۆڕێت بۆ ئەوی دیکەیان. دەکرێت ئەنجامی عەشــق منداڵخســـتنەوە بێـت، بەڵام بەرئەنجـامی ڕق مردنە. خـاڵی دواتر ئەوەیە کە لە بەرهەمەکانی دۆســـتۆیڤســـکیدا، عەشــق دایمە وابەســـتەی پاڵنەرێکی دەرەکییە و مەبەســـتێکی دیکەی بەدەر لە خودی عەشـــقی هەیە، بۆ نموونە کردوکۆش بۆ دروســـتکردنەوەی مرۆڤێک یـان بە تەواوی تەفروتووناکردنی. ســـەرئەنجام، دەکرێت بەســـەر شـــوێنگۆڕکێی ئەم عەشـــق–ڕقەدا زاڵ بین، بەڵام لەم بارەدا بۆ تاهەتا هیوا بە یەکبوونی دیوە مانابیە جیاوازەکانی عەشق لە چوارچێوەی مانایکی یەککرتوودا، لەدەست دەدرێت. نووسەر، شازادە میشکین بەکار دەهێنێت تا نیشانی بدات هێزی درەوشـاوەی عەشـق، چۆن ڕێگە لەبەردەم توخمی ڕەشـی شەهوەتدا والا دەکات و ئەوەی کە لەم دونیایەدا، دابەشبوونی عەشق لە تراژیدیایەک بەولاوە هیچی دیکە نییە و، شەهوەت بە تەواوی ئەوی لە خۆیدا تواندووەتەوە و هەر کەســـێک بیەوێت لە کردەوەی خۆیدا ئەمە پەســـەند نەکات، ســـزای لەناوچوونی بەســـەردا ســـەپێندراوە. پێکچوونێک لەنێوان وزەی ئیلهامبەخشی ئەفلاتوونی و ئەو شەهوەتەدا هەیە کە دۆستۆیسـڤکی لە بەرهەمەکانیدا دەپەرژێتە سـەری، بەتایبەت ئەگەر ڕەوتی پلەبەپلەی ئەو لە قۆناغی نزمی جەستەییدا بەرەو قۆناغە بڵندە مەعنەوی و جوانیناسییەکەی لە بەرچاو بگرین. تا ئەو کاتەی کە شـــەهوەت و تینوێتی، ڕەنگدەرەوەی پانتاییەکی بەرینتری جیهانی ماددە و جەســتە بن، نواندنەوەی جەسـتەیی و تەنانەت لاڕێییەکەشـی بەو چەشـــنە قێزەون و دزێو نییە کە لە هەلومەرجەکانی دیکەدا دێتە بەرچاو. ئەو وێنا شـــەهوەتیانەی کە دۆســـتۆیڤســـکی دەیانخاتە بەرچـاومـان، ڕێـک وەک وێنـای مردنەکـانی، تەنـانەت دزێوترین و ڕاچڵەکێنەرترین وردەکاریش بە شـــێوەیەکی ناتەبائـامێز و پاک و بێگونـاهـانە دەخـاتە بەر دیـدە و ئەوەش کە بە ڕوواڵەت دێوێکی

ترســـــناکە، لەڕێی ئەو هەلومەرجەوە کاڵتر دەکاتەوە کە بووەتە هۆی بەدیهاتنی.

سڤیدریگایلۆف سەراسیمە ئەمەی گوت و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشــــا. دەتگوت بارێک بە کۆڵییەوە، نا، بەســــەر دڵییەوە لابرابوو. لەوانەشە هەر بە تەنیا ترس لە مەرگ نەبووبێت، چونکە دوور بوو لەو ســــاتەدا وەها هەســــتێکی هەبێت؛ جۆرێک لە ئازادبوون لە هەستێکی دیکەی بێ لە مەرگ، هەستێکی ڕەشتر و تاڵتر، کە خۆیشــــی نەیدەتوانی بڵێت چییە. چووە لای دونیا و بە نەرمی باســـکی بە دەوری کەمەریدا هێنا. کچە بەرگریی نەکرد، تەنیــا وەک بی دەلەرزی و نیگــای تکــاکــارانەی لەو بڕیبوو. سڤیدریگایلۆف هەوڵی دا شتێک بڵێت، وەلێ تەنیا لێوی تەکانێکی دا و نەیتوانی یەک وشــــە دەربڕێت یان تەنـانەت دەنگێک لە دەمییەوە دەربکات.

– لێگەڕێ بڕۆم!

دونیا کەوتبووە پاڕانەوە.

سڤیدریگایلۆف لەرزی و دەنگی دونیا بە تەواوی گۆڕابوو.

– یانی بە هیچ شێوەیەک منت خۆش ناوێ؟

بە هێمنی ئەمەی لە دونیا پرسی و کچەش سەری بادا.

– هەروەها... بە هیچ جۆرێکیش ناتوانی خۆشــــت بوێم؟ یانی هیچکات؟

سـڤیدریگایلۆف داماو و لەژێر لێوەوە پێی داگرت. دونیاش بە ورتە وەڵامی دایەوە:

– هیچکات!

خولەکێک زیاتر بە ململانێیەکی تۆقێنەر و ناڕوونی ناو دڵ و ڕۆحی سـڤیدریگایلۆفەوە تێپەڕی. نیگایەکی لەوەسـفبەدەری گرتە

دونیا. کتوپڕ دەستیی کشاندەوە، توند ڕووەو پەنجەرەکە سووڕا و هەر لەوێ و پشـــت لە دونیا ڕاوەســـتا. خولەکێکی دیکەش تێپەڕی.

– ئەوەش کلیلەکە. ئەوەتانێ.

کلیلەکەی لە گیرفـانی چەپی کۆتەکەی دەرهێنـا و بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە یان سەیری دونیا بکات، خستییە سەر مێزەکە.

– خێرا کلیلەکە هەڵگرن!

دەبێت ڕۆڵی یادگەش بۆ ئەم مەڵغەمەیە[1] زیاد بکەین، کە چەندان جار یاری بە ئێمە دەکات. لە جیهانی دۆســـتۆیڤســـکیدا تووشـــی دیمەنگەلێک دەبین کە تەژین لە تامەزرۆیی و خرۆش و چاوەڕوانی، یانی ئـاواتی ســـەرکوتکراو و بەدینەهـاتوو، بەڵام تەنـانەت نـاتوانین ئاماژە بە یەک نموونەش بدەین کە تێیدا دۆســتۆیســڤکی لە دیمەنێکدا پەیوەندیی جەســتەیی کەســایەتییەکانی بە شــێوەیەکی ســۆزداری و شــەهوەتئامێز وەســف کردبێت، بە پێچەوانەوە، ســەروکاریمان لەگەڵ جۆرێک لە پەرینەوە لە ســـۆز و دڵەڕاوکێدا هەیە. بەشـــی ئێرۆتیکی هەمیشـــە لە چوارچێوەی پوختەیەکی دابڕاو لە دەمی گێڕەرەوە یان کەسی سێیەمەوە دەخرێتە ڕوو و هەلومەرجەکە هێندە بەتاڵە کە زیاتر لە باسـگەلی قووڵی فەلسـەفی دەچێت، بۆ نموونە گوتوبێژی نێوان *لیزا* و *پیاوی ژێرزەمینی* لە *یادداشتە ژێرزەمینییەکان*دا.

لە کۆتاییدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە غەریزەی مەرگ و ژیان لە جیهانی دۆستۆیڤسکیدا دژیەک نین و، بە پێچەوانەوە، دوو دیوی یەک حەزن و دەکرێت دانەیەکیان لەبری ئەوی دیکەیان لە بەرچاو بگرین. مەرگویســـتی و ژیـانویســـتی لە پـانتـایی دووانەیی فەلســـەفیی دۆستۆیڤسکیدا دەگیرسێتەوە و لە شێوەی دژبەریی چاکە و خراپە و

[1]. مەڵغەمە: ئالیاژی جیوە و کانزایەکی تر، کە دەکرێ ڕەق یان نەرم ببێت.

مەعنەوییەت و جەسـتەییدا خۆی دەنوێنێت. دۆسـتۆیفسـکی هەوڵ دەدات بە شێوەیەکی دۆزخوازانە (ئایدیالیست)ـانەی جوانیناسـانە بەسـەر ئەم دووانەییبوونەدا سـەرکەوێت، هیوادار بەوەی کە جوانی، خۆی، عەشـقێکی لێ دەکەوێتەوە کە دەتوانێت ڕزگـارکەر بێت و ئازادمان بکات؛ بەو بڕوایەی کە جوانییەکی بڵند و بەرزتر کە ئیمانە، بە یارمەتیی چەمکی جوانی، لە جیهاندا سـەرکەوتوو دەبێت. دیدی جوانیناسـیی دۆسـتۆیفسـکی کە بناوانی ڕێدۆزی ئەوە، لە لقی ئاینی ژیانگەراییەوە سـەرچاوە دەگرێت، نەک لە لقی ئاگاپەوە؛ چونکە ئاگاپە دەڵێت جوانی، بەرهەمی پەیوەندییە لەگەڵ ئـافرێنەردا. ئەم دیدگە تایبەتەی دۆستۆیفسکی، دەستی ئەو والا دەکات تا جۆرێک لە هەستی پێکهۆگری جوانینـاسـیی قـابیلکەر بگوازێتەوە بۆ خوێنەر و، وەهـا هەستێک، تەنانەت ڕێچارە جیاواز و پەرشـە پێشنیارکراوەکانیشی بە شێوەیەکی کۆ و یەکپارچە نیشان دەدات.

هەڵبەتە ئامانج ئەمە نییە کە زۆر بە سـادەیی پرسـەکە بکشـتێنین و بەو ئەنجـامە بگەین کە ڕێچـاری دۆسـتۆیفسـکی بۆ ژیـان بەبێ ئاڵۆزییەکی تایبەت تەنیا ڕێچارێکی یەکانگیر و تاکڕەهەندیی و ئایینییە؛ هەروەها نامانەوێ مشـتومڕ لەسـەر ڕێچارەکەی ئەو بکەین. ئامانجی سـەرەکیی ئێمە ئـامـاژەکردنەوەیەکی دووبـارەیە بەو بـابەتەی کە پێشـزەمینەی ئایینی و فەلسـەفیی کاری ئەو، دۆخێکی ڕێکخراو و پارادۆسکیکاڵ دروست دەکات کە تێیدا، پرسی هەمیشـەیی و چەمکی نەمری و بمێنی پەسـەندکراو نییە، بەڵام لە لایەکی دیکەوە، ناتواندرێت بەبێ پەسـەندکردنی نەمری و پرسـی بمێنی کاتی ئێسـتە تێپەڕێنین. ڕۆمانەکانی دۆسـتۆیفسـکیش، لە گرژیی وەها دۆخێک بەدوور نین. گومانەکان، دەردەبڕدرێن و بە ڕوونی شـی دەکرێنەوە، بەڵام ڕێچاری یەکلاکەرەوە نـاخرێتە ڕوو، مەگەر لە کۆی ڕۆمـانەکەدا، چونکە پێویسـتیی گەیشـتن بە ڕێچارێکی گشـتی و پتەو ئەوەیە کە هەر

کەسایەتییەک، قۆناغی تێپەڕکردنی سۆز تێپەڕێنێت و بگاتە دۆخێکی سۆزداریی تازەوە، وەلێ لە کۆتاییدا وێڕای ئەوەی کە بەرپرسیارییەکی تەواو و هەمەلایەن لەئاست هەردووک دیوە دووانەییە ناسراوەکەی دۆستۆیفسکیدا هەیە، هەر دەڵێت ژیان لە بەرزەخدا دەگوزەرێت. دۆستۆیفسکی بە پەسەندکردنی بێچەندوچۆنی مەرگ و هەوڵدان بۆ سەرکەوتن بەسەر عەشقە سنووردارەکاندا بە نووسین لەبارەی ئەوەی کە بەزۆری هەوڵدانێکی ناچارانەیە بۆ زاڵبوون بەسەر مەرگدا، توانیی بە وردی تاوتوێی دیوە چەندلایەنەکانی بەرگری، نارەزایەتی، ڕەدکردنەوە یان تەنانەت بێتوانایی لە پەسەندکردنی گشتییەتیی سیستمی ژیان بکات. تێگەیشتنی ئێجگار کەسیی ئەو بۆ ئەم پرسە، یانی پێکهێنانی کنەکارییەکی فرەدیوی مانای ژیان لە چوارچێوەی پرسە ئاسایی و ڕۆژانەییەکاندا، ڕێدۆزێکی تازە و بێڕادە کاریگەرە، کە ڕەوشی ئاسایی جووڵە دەشێوێنێت. دیدگە ئاڵۆز و بەپێزەکانی دۆستۆیفسکی کۆتاییان نییە. لێهاتوویی نووسەر وای کردووە ئافرێندراوەکانی ڕۆڵێکی نەسڕاوە بەسەر بۆچوون و هەڵسوکەوتی ئێمەوە جێ بهێڵن، بەم پێیە، ڕەوشێکی تازە بۆ لێکدانەوە و تێگەیشتنی مرۆڤی مۆدێرن بنیاد دەنێت و باشترین پێشەکییە بۆ باسکردنی مەرگ لە ئەدەبیاتی تازەدا.

١٩٦٠

# دۆستۆیڤسکیی دوای باختین

## *تاوان و سزا*: شێتاندنی ئەوانیدی[1]

ئەم بەشە سەرەڕای درێژیی ڕۆمانی *تاوان و سزا* کەم تا زۆر کورت دەبێت. ئامانجی من لێرانەدا خوێندنەوەیەک نییە بۆ سەرانسەری ڕۆمانەکە، بەڵکە شیکردنەوەی هەندێک لە ڕێکارە بەکاربراوەکانی ناویەتی. یەکەمین ڕۆمانی گرنگی دۆستۆیڤسکی، لە بوارە تازەکاندا دەرفەتی بەرفراوانبوونی پانتایی شیکردنەوەی دەروونناسی دەڕەخسێنێت، بەتایبەتی لە بوارەکانی هەڵسوکەوتی تاکەکەسی و پێکەوەژیان کە باختین بە شێوەیەکی تێروتەسەل پەرژاوەتە سەریان. ئەم ڕۆمانە لە ئەنجامی هەڵبژاردنی شێوازی گێڕانەوە لەسەر زاری کەسی سێیەمی تاک کە وا دەکات گێڕەرەوە لە یەک کاتدا سەرنجی لەسەر زیاد لە یەک کەسایەتی بێت و لەوەش گرنگتر ئەوەی کە بەپێی بنەمای «فرەدەنگی» کەم تا زۆر هەموویان دەخاتە دۆخێکی هاوئاستەوە، چەند پرسێک ڕوون دەکاتەوە کە لە بەرهەمگەلی شیکراوەی وەرزەکانی پێشووتردا تەنیا بە شێوەیەکی تاکلایەنە وێنا کراون. ئەم بەرهەمە بۆ نموونە هەوڵ دەدات نیشانی بدات بەرئەنجامی کار چی دەبێت لە کاتێکدا کە تاکەکان هاوکات هەوڵ دەدەن یەکدی بەبابەت و پۆلێنبەند بکەن، دوو یان چەند وێنایەکی ناجۆر بەسەر کەسێکی دیکەدا بسەپێنن، هەروەها ڕێکارگەلێک بخەنە

---

١. وەرگیراو لە کتێبی «داستایفکی پس از باختین / نویسندە: ملکم‌وی.جونز / ترجمەی امید نیک‌فرجام»، کە لە دەقە فارسییەکەی کتێبی *تاوان و سزا*دا نییە.

بەردەم یەکدی کە لە ڕووی ســـۆزدارییەوە ئازاردەرن. ئەمە بوارێکە کە باختین نەپەرژاوەتە سەری.

ڕۆمـانەکە لە چوارچێوەی پاڵەوانەکەی خۆیـدا (ڕاســـکۆڵنیکۆف)، وێنای دژبەریی دەروونیی نێوان پێویســتیی سـۆزداریی بەبابەتکردن[1] (بە تەرخـانکراوی، بەڵام نەک بەتـایبەت، بۆ ئەوانی‌دی) و (نێوان) خودی[2] دەکات. لەنێوان ئەم دوو پاڵنەرەدا، دانەیەکیان توانای تێڕامان دەبەخشێتە ئەو و تا ڕادەیەک ڕێگەی تێوەگلان لە کوشتنی بۆ خۆش دەکـات، هـێـزێـک کە بە «ڕیـزپەڕ»نـاوبـردنـی خـۆی و «چەپەڵ»ناوزەدکردنی ئالیۆنا ئیڤانۆڤنا لە چوارچێوەی ســیســـتمی بیروبڕواکاندا بەدەستی دەهێنێت کە لەناوبردنی ژیانی ئەندامانی سـەر بە دەســـتەی دووەم لەلایەن دەســـتەی یەکەمەوە، لەژێر هەلومەرجی تایبەت و دیاریکراودا بە ڕێپێدراو دەزانێت، بەڵام پاڵنەرێکی دی وا دەکات پەیوەندییەک لەنێوان ئەو و سۆنیادا دروست ببێت.

## دۆستۆیڤسکیی دەروونناس

دۆســـتۆیڤســـکی کە دەڵێت: «من بە دەروونناس ناو دەبەن، بەڵام ئەوە ڕاســـت نییە. من تەنیا واقعگەرایەکم بە مانایەکی بڵندتر، بەو واتـایەی کە قووڵایی دەروونی مرۆڤ وێنـا دەکەم»، بە یەکەمین ســەرنج ڕوون نییە کە کتومت نکۆڵی لە چ شــتێک دەکات. لایەنگرانی

---

١. بەبابەتکردن؛ واتە شــتێک لە خۆیدایەتی و ناوەکییە، ئێمە وەک بابەت جەســتەی پێ دەدەین و بەرجەستە و دەرەکیی دەکەین.

٢. نێوانخودی؛ واتە لە یەک کاتدا چەند خودێک یەکتر دەبڕن و دەچنە ناو یەکەوە دەربارەی پرسێک یان بابەتێک.

تیۆریی یۆنگ دەتوانن بڵێن بەشـــی دووەمی قســـەکەی ئەو بەشـــی یەکەمی بەتاڵ دەکاتەوە، بەڵام نیچە (١٨٤٤-١٩٠٠) کە ستایشی دیوە «دەروونناس»ـــانەکەی *تاوان و سزا* و گەمژەی دەکرد بیستوسێ ساڵ گەنجتر بوو. فرۆیدیش ئەوە لە ساڵی ١٨٥٦دا لە دایک بوو. مادام دۆســـتۆیفســـکی خۆی ئەم ڕۆمانەی بە *ڕاپۆرتێکی دەروونناســـانە لەبـارەی تـاوانـێکەوە* نـاو بـردووە، ئـاشـــکرایە کە وشـــەی «دەروونناسـانە»ی لەم زەمینەیەدا بە تەواوی لەلا نامۆ نەبووە، بەڵام ئەوەی کە ئەو لەبـارەی خۆیەوە نـایزانێـت، ڕەنگە ئەو جۆرە لە دەروونناسـیی دوودیو بێت کە پۆرفیری پیترۆڤیچ بە سـەرکەوتوویی لەبەرانبەر ڕاسـکۆڵنیکۆفدا بەکاری دەهێنێت. سـەرکەوتنی پۆرفیری پیترۆڤیچ لەم کـارەدا بەرهەمی ئەم خـاڵەیە کە دەروونـناســـی وەک شـێوازی دڵنیاکەرەوە بۆ گەیشـتن بە حەقیقەت بەکار ناهێنێت، بەڵکە تەنیا وەک سـتراتیژی و نەخشـەیەک بۆ ناچارکردن بە دانپێدانان بەکاری دەهێنێت و لێی دەڕوانێت. ئەمەش جیاکارییەکی گرنگە.

لەبارەی دەروونناسـیی کەسـایەتییەکانی دۆسـتۆیفسـکییەوە زۆر گوتراوە و نووسـراوە. هەمیشـە ئەم نووسینانە تیشکیان خستووەتە سەر تاکی چەندکەسایەتی یان کەسایەتیگەلی لاوەکی وەک «هاوزا»ی ئەوان. نیازم نییە لەو بەشـانەدا کە پەیوەسـتن بە ڕۆمانە گرنگەکانی ئەوەوە، لە سەرانسەری دەقەکەدا شوێن ئەم تێمایانە[1] بکەوم و لاشم وا نییە لێرانەشـدا گرنگ بێت بە تێروتەسـەلی بپەرژێمە سـەر جۆراوجۆریی هەڵسـوکەوتی ڕاسـکۆڵنیکۆف، جۆراوجۆرییەک کە هەمیشە بە دیوە دڵسۆز و هێژایانە و دیوە شەیتانی و ناپلیۆنییەکەوە پەیوەسـت دەکرێن؛ دیوی [پۆنتیۆس] پیلاتئاسـا کە لە شـەقامەکەدا پشـت لە کچەکە دەکات و دەسـت لە چارەنووسـی دەشـواتەوە، جا

١. تێم؛ تێما؛ هێلی گشـتیی ڕۆمان. بەشـێکی بەرچاو و چەندپاتەکراو لە تەختی شوێنەوارێکی هونەریدا.

لەبەرانبەر دیوە پاڵەوانانەکەیدا کە لە دژی پیلانەکەی لوژن بەرگری لە سۆنیا دەکات. من (لەگەڵ زۆر کەسی دیکەدا) لە شوێنی دیکەشدا لەم بارەیەوەم نووسیوە (هەروەها نووسیویانە). ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئێمە لە قاڵبی ڕاسکۆلنیکۆفدا ڕووبەڕووی نموونەیەکی بلندی جۆلانەکردنی سۆزداریی بێویستانەین لەنێوان دوو نەهامەتیدا کە پێشتر لە کەسایەتییەکانی دیکەی دۆستۆیفسکیدا ئاماژەمان پێ کردوون، هەروەها لەگەڵ هەوڵی کەسایەتی بۆ دوورکەوتنەوە لەم بارە دەروونییە.

لەبارەی پەیوەستیی ئایدیا و هەستەکان لە جیهانی دۆستۆیفسکیدا، زۆر گوتراوە. ڕاسکۆلنیکۆف مرۆڤایەتی بەسەر دوو بەشدا پۆلێن دەکات، ئاسایی و ڕیزپەڕ، ئەمەش بە ڕوونی هێمایەکە بۆ ناکۆکیی دەروونیی ئەو. دۆزینەوەی لێکدانەوەی دەروونیش بۆ خەون لە *تاوان و سزا*دا هێندە دژوار نییە: بەتایبەت خەونی ماینە پیرەکە. زیاد لە ڕادەی پێویستیش ناپەرژێینە سەر دژواریی هەڵاواردنی «واقعیەتی گشتی» لە توێکانی «دەق»دا (خەونەکان، خەیاڵات، باری نێوان خەون و بێداری، نامەکان، گوتارەکان، کتێبەکان، تیۆرییەکان، هەواڵە ڕاست و هەڵە و شێویندراوەکان، کتێبی پیرۆز، دەنگگەلی دژ و ناتەبای ئەوانی دی، هەموو کاردانەوەکان لە ئەرکسترالا هتروگلاسیایی یاوەریی دەقەکاندا کە یەکدی بەهێز یان لاواز دەکەن) هەڵبەتە بۆ ڕاسکۆلنیکۆف (هەندێک جاریش بۆ خوێنەر). لەگەڵ ئەوەشدا ئەم دۆخەی کە جاروبار شپرزەکەرە، دەکرێت سەر لە کەسایەتییەکان و خوێنەریش بشێوێنێت، جا باری ئەم سەرلێشێواوییە لە هەمان کاتدا دەکرێت ئەوان بخاتە بەردەم ئەگەری شپرزەبوون و سەرەگێژەیەکی زیاترەوە.

## دۆخی بەرگریلێنەکراو

لەم بەشـــەدا کـارەکەی ر.د. لینـگ لە دەیەی ١٩٦٠دا دەکەمە سەرمەشقی خۆم و بە بڕگەیەک لە کتێبەکەی ئەو (کە ناونیشانەکەی *خود و ئەوانی‌دی*یە) کە تێیدا چەندان جار ئاماژە بە دۆســتۆیڤســکی دەکات، دەســـت بە کارەکەی خۆم دەکەم. ئەو لەم بڕگەیەدا لەبارەی ئەو نامە دوورودرێژەوە دەنووسـێت کە ڕاسـکۆڵنیکۆف لە دایکییەوە پێی دەگـات و لە دەزگیرانـداربوونی دونیـا ئـاگـادار دەکرێتەوە. ڕاسـکۆڵنیکۆف ڕێک بەر لە پێگەیشـتنی نامەکە، لە مەیخانەدا تووشـی مارمیلادۆفی ســــەرخۆش دەبێت کە باس لەوە دەکات چۆن پارەی خێزانە ڕەشـوڕووتەکەی دزیوە، سۆنیای کچیی بە لەشفرۆشـی ناچار کردووە و بۆ کڕینی مەشرووب پارەی لێ وەرگرتووە. لە ڕاستیدا ئەم دۆخەی کە هاوشێوەی دۆخی خودی ڕاسکۆڵنیکۆفە لە پەسەندکردنی قوربانیدانەکەی خوشـکیدا (ڕاسـکۆڵنیکۆف لە ڕاسـتیدا مادام ناتوانێت خەرجیی خێزانەکەی دەربهێنێت، دەبێتە هۆی ئەوەی خوشـــکەکەی ناچار بێت زەماوەند لەگەڵ لوژندا بکات و پاشـــانیش خێر لە ئەو و هاوســـەری داهاتووی ئەو وەربگرێت)، لە زەینی ئەودا دەمێنێتەوە و هیچ لە پەرێشانییەکەی کەم ناکاتەوە.

لینگ ســــەرەتا لە ڕووی تێکەڵکردنی خەون و خەیاڵات و دیتنی (موشـــاهەدە) لە بێداریدا ڕاســـکۆڵنیکۆف دەخاتە بەر ســـەرنج، بەڵام دواتر بـاس لەوە دەکـات کە دۆســـــتۆیڤســـکی چۆن ئەزموونی ڕاسـکۆڵنیکۆف بەو دۆخەوە پەیوەسـت دەکات کە بەر لە کوشـتنەکە «تێی دەکەوێت». بە بۆچوونی لینگ، دەکرێت ئەم دۆخە بە «هەڵە»، «ڕێتێنەچوو»، «بەرگریلێنەکراو» و «دژوار» نـاوزەد بکرێـت. ئەو داوامان لێ دەکات سەرنج بخەینە سەر ئەو دۆخەی کە ڕاسکۆڵنیکۆف بە وەرگرتنی نامەکە تێی دەکەوێت.

بەو دەڵێن: «دەزانم تۆ هەرگیز ڕێ نـادەی هیچ کەســـی ســـووکایەتی بە خوشـــکەکەت بکا». هەروەها ئەو لە نامەکەدا دەیخوێنێتەوە کە خوشـــکەکەی دوای ئەزموونێکی ئێجگـار ســـووکـایەتیئـامێز جـارێکی دیکە (بەو جۆرەی کە دایکی ڕاســـکۆلنیکۆف بە تەواوی بۆی ڕوون دەکاتەوە) لە بەرەبەری بوونەقوربانیی ســـووکایەتییەکی گەورەتردایە. لە یەکەمین جاردا خوشـــکەکەی ڕاســـکۆلنیکۆف هیچ تاوانێکی نەبووە، بەلام ئەم جارەیان بە چوونە ژێر باری زەماوەند کە بێ لە لەشفرۆشییەکی یاســـایی هیچ شـــتێکی دی نییە، لە ڕاســـتیدا گورز لە ئاوڕوو و حورمەتی خۆی دەدات. دایکی ڕاســـکۆلنیکۆف پێی دەڵێـت خوشکەکەی تەنیا لەبەر ئەو (براکەی) دەچێتە ژێر باری ئەم کارە. جا چاوەڕوانیشە ئەو پێشوازی لەم کارە بکات.

بەلام بینیمان کە دایکەکە پێشتر وەک پیاوێک تاریفی ئەوی کرد کە هەرگیز ڕێ نادات سـووکایەتی بە خوشـکەکەی بکرێت. کەواتە دەکرێت ئەو هاوکات پیاوێک بێت کە ڕێ دەدات خوشـــکەکەی لەبەر خـاتری ئەو خۆی بفرۆشـــێت؟ ئەمە هەمـان ئەو دۆخ و هەلومەرجە سەخت و بەرگرپێنەکراوەیە.

گرفت و گێچەڵێکی دیکە پەیوەســـتە بە بەختەوەریی ئەوانەوە. «تـۆ بەخـتەوەر بـیـت کەواتە ئـێـمەش بەخـتەوەریـن». بە لەبەرچـاوگرتنی بوون بەو جۆرە پیـاوەی کە دەبێـت ئەو ببێـت، چۆن دەتوانێت لەم دۆخەدا هەست بە بەختەوەری بکات؟

پرسێکی دیکەی دژوار پەیوەستە بە ئایین و بیروباوەڕییەوە. خاڵی سەرەکی لە بەشی هەرەزۆریی نامەکەدا ئەمەیە کە کەسێک ژیانی خۆی بکاتە قوربانی تا ئەوی‌دی بەشـــی ئەوە پارەی دەســـت بکەوێت کە ژیانێکی خۆشـــگوزەرانانە بژی. دایکەکەش ئەمە بە

نیشـــانەی «دڵگەورەیی»ی دونیـا (کە دەربڕینێی تەمـاوییە) و فریشتەبوونی ئەو دەزانێت.

بەڵام ئەو پییاوە مەسـیحییەی کە بڕیارە ئەم خێرپێکردنە پەسەند بکات، دەبێت بکەوێتە چ دۆخێکەوە؟

لینگ پرسگەلی دیکەی ئاڵۆزیش دەخاتە بەرباس و بۆی زیاد دەکات کە کردنەوەی هەموو گرێکـانی ئەم نـامەیە یـان تەنـانەت هەر ئەم گرێیانەی لە برگەکەی سـەرەوەدا هاتن، پێویسـت بە لێکدانەوەیەکی زۆر تێروتەسـەلتر لە خودی نامەکە دەکات. ئەو ئەمە بە پێویسـت و بەسـوود دەزانێت کە لە کاتی خوێندنەوەی نامەکەدا ئەو کاریگەرییە وێنا بکەین کە بەسـەر خوێنەرەکەیەوە دایدەنێت؛ یانی سـەرەڕای ئەو کێشـانەی کە لە نامەکەدا ئاماژەیان پێ دراوە، بیر لەو کاریگەرییە ئازاردەرەش بکەینەوە کە ئەم کێشانە بەسەر دوێنراوی نامەکەوە جێی دەهێڵن.

بە کورتییەکەی دایکی ڕاسـکۆڵنیکۆف بە دوو جۆری لێکدژ ئەو وەسف دەکات: ئەو لەلایەکەوە بە ناڕاستەوخۆ وا وەسف دەکرێت کە سـووکایەتیبەخۆکردنی خوشـکەکەی بۆ یارمەتیدانی خۆی پەسـەند دەکات تا بۆ خۆی لە جیهانێکدا ڕابوێرێت کە سـەرانسـەر کوفر و بێباوەڕییە و وەک شـتێکی فەرمی دان بە خۆشـەویسـتی و سـۆزدا نانێت. ئەو هەروەها وەک تاکێک نیشـان دەدرێت کە بەوە دڵی خۆی خۆش دەکات کە هەموو ئەمانە لەگەڵ بنەمای مەسـیحییەت کۆکن و دوای بیسـتنی هەواڵی قوربانیدانی خوشـکەکەی، دەتوانێت شـاد و بێخەم درێژە بە ژیانی خۆی بدات، بەڵام ئەو لە لایەکی دیکەوە بە ئاشکرا وەک پیاوێکی مەسیحی وەسف دەکرێت کە هەرگیز ڕێ نادات خوشـکەکەی لەبەر ئەو خۆی سـووک و ڕسـوا بکات و مەراییکاری و دووڕوویش بۆ خۆی بە ڕێپێدراو نازانێت...

بەڵام لەم نێوەندەدا توخمگەلی نێوەندیش بوونیان هەیە: ئەو دەبێ لەبەرانبەر خوشـکیدا بەئەمەک بێت؛ دەبێت قوربانیدانەکەی خوشـکی ئەو بگەیەنێتە بەختەوەری، چونکە هەر بۆ بەختیـارکردنی ئەوە، کە دەســـت دەداتە وەها کارێک. کەواتە دایکەکە پێی دەڵێت ئەرکی ئەو وەک برایەکی باش ئەوەیە کە وەک مەســـیحییەکی ڕاســـتەقینە بیر بکاتەوە و هەســت بکات، لە هەمان کاتیشـدا بە جۆرێک هەڵسـوکەوت بکات وەک ئەوەی مەسـیحییەکی بڕوادار نەبێت. بۆچی؟ لەبەر ئەوەی هەلومەرجە ماددی و جیهانییەکە وا دەخوازێت.

بە دڵنیاییەوە دایکی ڕاســـکۆڵنیکۆف پەنجەی خســـتووەتە ســـەر بەســـوێترین پرســـی ئەو. ئەو لە ڕاســـتیدا بەهاگەلێک بیر کوڕەکەی دەهێنێتەوە کە ڕۆڵێکی بەرچـاویـان لە پەیوەنـدیی نێوان ئەوانـدا وەک دایک و کوڕ هەبووە (هەمان ئەو بەها مەسـیحیانەی کە فرمێسـک بە چاوی ڕاســـکۆڵنیکۆفدا دەهێنن)، بەڵام ئەمە هەمان ئەو بەهایانەن کە ئەو بە ناچاری هەوڵی داوە بیانشـــارێتەوە یان ســـەرکوتیان بکات. دایکەکە بەهاگەلێک بیر ڕاســـکۆڵنیکۆف دەهێنێتەوە کە ئێســـتە بۆ ئەو کامڵ و هەڵســـەنگێندراو و گونجاون لەگەڵ واقعیەتدا، تەنیا گرفتەکە ئەوەیە کە لە دۆخێکدا دەخرێنەوە بەرچاوی کە بێزارکەر دەردەکەون، ئاخر لە ئێسـتەدا مەسـەلەی خوشـکەکەی لەنێواندایە. دایکەکە هاوکات بە ئاماژە ئەو خاڵەشـی تێدەگەیەنێت کە چاوەڕوانیی ئەوەی لێی هەیە بە ناوی بەها مەسیحییەکانەوە درێژە بەو هەڵسوکەتە بێزارکەرە بدات (هەمان ئەو شتەی کە ڕاسکۆڵنیکۆف بە هەڵەوەڕیی مەسیحیانە ناوی دەبرد)، بەڵام بە وردبوونەوە لە دەقی نـامەکە دەتوانین لەوە تێبگەین کە دایکەکە هەم خۆی دەخەڵەتێنێت و هەم بێســـوود هەوڵی فریودانی کوڕەکەشی دەدات.

ڕاسـکۆڵنیکۆف بە شـێوەیەکی دیار لە هەموو ئەم شـتانە تێدەگات و لە لاپەڕەگەلێکدا کە لە درێژەی نامەکەدا دێن، بەدەســـت هەموو ئەم

شتانەوە ئازار دەچێژێت. ئەو ساڵانێکە گیرۆدەی ئازار و ئەشکەنجەی ئەم پرسانەیە. لەگەڵ ئەوەشدا نامەکە ئەو ڕاستییەی دەخاتەوە بەرچاو کە دەبێت خۆی دەستبەکار بێت، کارێک کە بەپێی بنەمای ئاکاری تەنیا لە بارێکدا دەکەوێتە سەرووی کاری خوشکەکەی کە ئامانجی سەرەکیی دابینکردنی خۆشگوزەرانی و ئاسوودەیی خێزانەکەی بێت، بەڵام ئایا دونیا زیاتر بەوە ئاسوودەیە کە لەپێناو ئەودا کەسێک بکوژرێت یان ئەو زیاتر بەوە ئاسوودەیە کە خوشکەکەی لەبەر خاتری ئەو زەماوەند دەکات؟ وەلامی ئەم پرسیارە، کە یەکێکە لەو پرسارانەی بە مێشکی ڕاسکۆڵنیکۆفدا نایێت، لە درێژەی ڕۆمانەکەدا ئاشکرا دەبێت.

نامەی دایکەکە ململانێی دەروونیی ڕاسکۆڵنیکۆف دەهێنێتە ئاستی زەینییەوە، جا ئەم ململانێ دەروونییە لە دیمەنێکی دوای ئەوەدا بەدراما دەکرێت، ئەو کاتەی کە ئەو لە شەقامەکەدا بەر کچێکی سەرخۆش دەکەوێت، سەرەتا هەوڵ دەدات یارمەتیی بدات و پاشانیش وازی لێ دەهێنێت. لە سەرانسەری ئەو لاپەڕانەدا وێناکە تایبەتە بە کچێکی قوربانییەوە کە یان لەپێناو خێزانەکەی یان لەبەر ئەوەی کەسێک لەخشتەی دەبات لە داوێنپیسییەوە دەگلێت. هەڵبەتە لەم لایەنەوە زیاتر لەبری کچی قوربانیدەر جەخت لەسەر کچێک وەک بوونەقوربانیی پیاوێکی ئارەزووباز دەکرێتەوە و لە ئاکامیشدا لەسەر کاردانەوەی ڕاسکۆڵنیکۆف بەرانبەر ئەو تەنگژەیەی کە تێیدا گیرۆدەیە. هەڵبەتە ڕوونە کە ڕاسکۆڵنیکۆف ئەم وێنایانە لەگەڵ یەکدیدا تێکەڵ دەکات. بۆ نموونە، ئەو پیاوەی کە بەو ناوەدا دەخوولێتەوە، ئەو بە «سڤیدریگایلۆف» (ئەو کەسەی کە لە نامەکەی دایکیدا ئاماژەی پێ دراوە و خوشکەکەیی ئازار داوە) ناو دەبات. کاتێکیش بیر لە نامەکەی دایکی دەکاتەوە، سۆنیا (کچە سۆزانییەکەی مارمیلادۆف)ی دێتەوە خەیاڵ.

لە دیمەنی دواتردا ڕووبەڕووی خەونی «وەهماوی و نەخۆشانە»ی ئەو دەبینەوە کە بە مـاییـنێکی تێلاکـاریکراوەوە بینیبووی، بەم پێیە جارێکی دیکەش ســەرنج لەســەر قوربانییەکی بێتاوان و کاردانەوەی ڕاســکۆڵنیکۆف چڕ دەکرێتەوە و هەوڵ بۆ ئەوە دەدرێت کە پێکهاتەی ســۆزداریی پرســـەکەی ئەو بە نـاکۆکیی نێوان بەزەیهـاتنەوە بە قوربانییەکەدا و دڵڕەقیی ســـادیســـتی، هەروەهـا دوورکەوتنەوەی ســۆزداری لە دیمەنەکە کاڵ بکرێتەوە. کەسـایەتییەکانی نێو خەون و کەســایەتییەکانی ژیانی ڕاســکۆڵنیکۆف (لەنێویاندا خۆی و باوکی کە ســـاڵانێکە مردووە) پەیوەندییەکی چەندلایەنیان لەگەڵ یەکدیدا هەیە. ئەم پەیوەنـدییە لە شـــرۆڤەکەی ئێمەدا ڕۆڵێکی لاوەکیی هەیە، بەڵام وێنـای قوربـانییە بێتـاوانەکە دەگوازرێتەوە ســـەر ئەو پیرێژنەی کە ڕاسکۆڵنیکۆف نیازی کوشتنیی هەیە.

ئەو دوای بەئاگاهاتنەوە لە خەونەکەی، لە خۆی دەپرسـێت ئایا هەر بە ڕاستی دەیەوێت بە تەور ئەو پیرێژنە بکوژێت؟ لێرانەدا هەموو ئەو گێڕانەوانەی کە دراونەتە پـاڵ یەک، ئـامـاژەن بە بێتـاوانبوونی قوربانییەک و کەینوبەینی ئاکاریی ڕاسـکۆڵنیکۆف لەگەڵ جەللادەکەیدا هەمیشـــە بیری بە خۆیەوە مەژغووڵ دەکات. ئایا دەبێت ســۆز و خۆشــەویســتی بنوێنێت (نێوانخودی[1])؟ ئایا دەبێت لەســەر بنچینەی بەڵگەی پشتبەستوو بە ئامار و ئەوەی کە ئەم شتانە تەنیا بۆ کەسێکی دیاریکراوی نێو مرۆڤایەتی ڕوو دەدەن پەســـەندی بکـات، جـا بەم پێیەش دەست لەم بابەتە بشواتەوە؟ (بەباتکردن)؟ ئایا دەتوانێت خۆی بە بوون بە هاودەستی جەللادەکان قایل بکات، ئەگەر ئەم کارە چاکەی لەپشــتەوە بێت؟ ئایا لەم کارەدا ئاســوودەییەکی دەروونی بەدەســت نـاهێنێت و ئـایا پاڵنەرەکەی نـاکەوێتە ژێر پرســـیـارەوە؟ ئەم جۆرە

---

١. نێوانخودی؛ واتە لە یەک کاتدا چەند خود یەکتر دەبڕن و دەچنە ناو یەکەوە دەربارەی پرسێک یان بابەتێک.

پرســــیارانە یان بە ڕاشـــــکاوی ناگوترێن یان دواتر بیری ئەو بە خۆیانەوە قاڵ دەکەن.

ئەزموونەکـان دەبنە یـادەوەری و یـادەوەرییەکـانیش دەبنە دەنگگەلێکی نێو گفتوگۆیەک کە تێیـدا وێنـایەک بە ڕەنـگوبۆیەکی سۆزدارییەوە پێک دێت و ئاسەوارێکی تاهەتایی جێ دەهێڵێت...

## بەبابەتکردن و زەینییەت

لەبەرانبەردا، کۆمەڵێک نیشانە و ئاسەوار هەن کە ڕاسکۆڵنیکۆف بۆ کوشـــتنەکە هان دەدەن. ئەم نیشـــانانە لە پاڵنەری ئەوەوە زاون بۆ پشـتگیریکردن لە شــوناســێکی دیاریکراو بۆ خۆی کە بە هەســتی یارمەتیدران لەلایەن چارەنووسەوە بەهێز دەکرێت، چارەنووسێک کە وا دیارە تایبەتمەندیی مەکینەکانی هەیە. لەم قۆناغەدا وا دەردەکەوێت کە ئەو، وزە لە وێنای خۆی وەک پێشـەوایەکی سـیاسـی و پاڵەوانێکی مەزنەوە وەردەگرێـت، گەرچی لە وەرزەکـانی پێشــــووتردا هیچ ئاســــەوارێکی دیاری لەو جۆرە نابینین. ئەوەی کە ئەو دنە دەدات ئاگاییەک بووە لەبارەی پرۆژەیەکەوە کە پێشــــتر بەشــێک بووە لە ململانێیەکی وەرەزکەر و بێئەنجامی دەروونی کە پلەبەپلە و کەم تا زۆر بە شــــێوەیەکی پەرجووئاســـا خۆی دەنوێنێت و بەرەبەرە هەر هەســـتێکی دژ و نـاکۆک وەلا دەنێـت. ئەو بۆ ئەم کـارە (لەڕێی چـارەنووســـــەوە؟) بەڵگەیەکی ئەقڵانی و ڕیزێـک لە ڕووداوی بۆ دەڕەخســێن و ڕێ لەبەردەم جێبەجێکردنی پلانەکە و ڕاکردنیدا خۆش دەکەن. ئێستە هەموو شتێک ئامادەیە: تەنیا شتێک کە بۆ تەواوکردنی کارەکەی ئەو پێویستە، خودی کردەوەکەیە.

ئەمەی بە شـــتێکی نائاســـایی دەهاتە بەرچاو. ئەم گفتوگۆ ســـەرپێییە لە مەیخانەدا، زۆرترین کاریگەریی بەســـەر ڕەوتی ڕووداوەکانی داهاتووی ژیانی ئەوەوە هەبوو. وەک ئەوەی هەر بە ڕاستی چارەنووس بڕیاری لەسەر گشت شتێک دابووبێت و ئاماژەگەلێک لەئارادا بووبن... خۆزگە دەیتوانی بۆ ساتێک هەموو شـــتێک تـاوتوێ بکـات و لەبـارەی ڕووداوەکـانەوە بڕیـاری یەکلاکەرەوە لەسەر گشت وردەکارییەک بدات، خۆزگە ئیدی هیچ گومان و دوودڵییەک لەئارادا نەبا؛ لەم بارەدا پێدەچوو بتوانێت وەک پلانێکی بێهوودە، دزێو و نەکردە ڕەدی بکـاتەوە و ئیـدی درێژەی پێ نەدات... وەلێ ڕووداوەکەی ئەو ڕۆژەی دوایی کە بێ پێشـەکی هاتبووە پێش و هەموو شـتێکی لە چاوترووسـکاندنێکدا ڕێک خســـتبوو، کاریگەرییەکی خۆنەخوازانەی خســـتە ســـەری؛ دەتگوت کتوکوێرانە و بێ هیچ نارەزاییدەربڕین و بەرگرییەک لە لایەن خۆیەوە، کەسێک چنگی بە دەستیدا کردبوو و بە توانایەکی ســەروومرۆیی و بەرگەنەگیراوەوە ڕایدەکێشـا. وەک ئەوە وابوو چمکێکی جلەکەی گیرابێتە پێچکی[1] مەکینەیەک و ئێســـتەش خەریک بێت کێشی بکاتە ناو خۆی.

ئەم یەکلاییبوونەوەیەی کۆتایی (لەو جۆرەیە کە ئەگەر سەرلەبەری وردەکارییەکانی نەخشـــەکەی لە بەردەســـتدا بان و تاوتوێی بکردبان بۆی هەبوو بە تەواوی لە کردنی وەها کارێک پاشگەزی بکەنەوە) دوا دەکەوێت تا ئەوەی کە خێرایی و هێزی هارەری مەکینەکە هێندە تاو دەســـەنێت کە ئیدی نـاتوانێت لە بەرانبەریـدا خۆی جڵەو بکـات و زەینییەتی ڕاسکۆڵنیکۆف لەنێو پێچکەکانیدا ون دەبێت.

---

١. پێچک؛ تەگەرە؛ لڕ؛ خڕ؛ بازنەئاسایەک کە بە دەوری خولگەیەکدا دەسووڕێتەوە.

دەبێت ئاماژە بەوە بکەم بەشێکی زۆری گفتوگۆکانی بەشی یەکەمی کتێبەکە و وەرزەکانی دواتر گوتوبێژی ناوەکی یان بەناوەکیکراوی ڕاسکۆلنیکۆفن (بەو مانایەی کە ئەو گوتەی ئەوانی دی بیر خۆی دەهێنێتەوە). ئەو هەمدیسان لە بەستنی پەیوەندیی بینازەینی لەگەڵ ئەوانی دیکەدا دەسەوەسانە: لە ئەنجامدا خۆی بەدوور دەگرێت لە بەرکەوتنی ئەوانی دیکە و تەنیا مەگەر لە هەندێک هەلومەرجی ململانێئامێز یان فریوکارانەدا کە ئەوی‌دی دەبێتە ئۆبژە. جا ئێستەش کە خۆی لە بارێکی پەرێشانیی سۆزداریدایە و نهێنییەکی ترسناک و سەرمۆرکراوی هەیە، ئەم حەزە دووهێندە زیاد دەکات.

هەمیشە ئەوە گوتراوە و ئاماژەی پێ کراوە کە گەرچی گێڕانەوە لە *تاوان و سزا*دا لەسەر زاری کەسی سێیەمەوەیە، کەچی نیشانەگەلێکی ئاشکرای نووسخە سەرەتاییەکەی پێوە دیارن؛ مەبەست ئەوەیە کە لە سەرانسەری کتێبەکەدا بەر گۆشەنیگای ڕاسکۆلنیکۆف دەکەوین. ئەوەی کە لەم بابەتە بەدەرە، ئەو برگانەن کە پەیوەستن بە سڤیدریگایلۆف و خۆکوشتنەکەیەوە، بەڵام ئەمە بە تەواوی ڕاست نییە. لە شوێنێکی کتێبەکەدا چەقی سەرنج بێ ئەملا و ئەولا ڕێک دەگوازرێتەوە سەر ڕازومیخین (بەشی سێیەم، نێوان وەرزی یەکەم تا کۆتایی وەرزی دووەم) و لانیکەم پێگەیەکی هاوشانی هی ئەوەی ڕاسکۆلنیکۆفی پێ دەدرێت و لەو زنجیرەجارانەی کە گێڕەرەوە لەگەڵ خوێنەردا تێیدا هاوبەشن، ئەو هەڵدەکشێنێت. سۆنیاش لە شوێنێکدا دەبێتە چەقی سەرنج (بەشی سێیەم، ناوەڕاستی وەرزی چوارەم)، بەڵام لەم نێوەندەدا ئەوە ڕازومیخینە کە دژی پۆلێنکردن و بەبابەتکردنێک کە لەگەڵ تەوژمی پێشکەوتن و بیورۆکراسیدا یەکسانی دەکات، دێتە گۆ:

«گەر کەسێ لە خۆت بتارێنی ئیتر ناتوانی چاکسازیی تێدا بکەی، جا گەر کابرا مناڵیش بێ ئەوا پێویستە دووهێندە لە خەمیدا بی. ئاخ

بەدەســت ئێوەی دەبەنگی پێشــکەوتنخوازەوە کە هیچتان بە مێشــکدا نــاچێ!»... ڕازومیخن بە گوڕوتینەوە درێژەی پێ دەدات: «ئەویش خراوەتە ڕیزی بکوژەکانەوە!»... «ئەوان بەدوای بەڵگە و بێلایەنییەکی تەواوەوەن، ئەمە هەمان ئەو شــتەیە کە بەدوایەوەن. دەســت دەدەنە هەر کارێک تا خۆیان نەکەونە نێوان.»

گرنگترین شــتێک کە بتواندرێت لەســەر ڕاســکۆلنیکۆف بگوترێت ئەوەیە کە ئەو «خۆی»ـــــەتی: «ڕازومیخین ئەو توانایەی هەبوو کە دەستبەجێ و بە تەواوی قســەی دڵی خۆی بکات، جا ئەوەشــی بەلاوە گرنگ نەبوو کە لە چ دۆخ و حاڵێکدایە، لەبەر ئەوە خەڵکی هەر زوو دەیانزانی سەروکارییان لەگەڵ چ کەسێکدایە.»

ئەگەر لەســـەر ئەوە هاوڕا بین کە ئەم ڕۆمانە وێنای ئاســـتەنگیی بەبابەتکردن و پۆلێنبەندیی ئەوانیدی و ســـەرتربوونی پەیوەندییە ئاشــکرا و ڕاشــکاوەکان دەکات، ئەوا دەتوانین بڵێین ڕازومیخین لەم نێوەندەدا پێوەری دروستیی دەروونی و کۆمەڵایەتییە.

ڕاسکۆلنیکۆف تا ئەو کاتەی لەســەر شــەقام تووشــی مارمیلادۆفی نیوەگیان دەبێت، لەسەر بڕینی پەیوەندیی کەسیی خۆی لەگەڵ ئەوانەدا کە نیازیان چاکە و چاو لە ســووکایەتییەکانی ئەو دەپۆشــن، ســوور دەبێت. لێرانەدا دەتوانین ئەم شــێوە تازەیەی هەڵســـوکەوتی ئەو بە ڕووداوێکەوە گرێ بدەین کە -بە سەرنجدان لە سەرخۆشی، ئەسپ و گالیسکە و مردن- بیرهێنەرەوەی خەونەکەیەتی. ئەم جارەیان پیاوێک لەژێر تایەی گالیســکەدا دەمرێت و لێخوڕەکەی تاســاو و پەرێشــانە. ڕاســـکۆلنیکۆف دەچێــت بەدەم مــارمیلادۆفەوە. ئەم ســـۆز و خۆشەویستییە خۆڕسکە لەلایەن ئەوەوە و پەیوەندیی لەگەڵ کچەکەی مارمیلادۆف، لە ڕاســـتیدا ژیانی بۆ دەگەڕێنێتەوە. وەک ئەوە وایە کە ئەو بەشــێک لە خەونەکەی خۆیی (کوشــتنی پیرەماییینەکە بە بەشــێکی دیکە؛ ســۆز بۆ قوربانی) بەتاڵ کردبێتەوە. هەڵبەتە گوتوبێژی ناوەکیی

ئەو هەروا بەردەوامە، بەڵام بەم کارە دیوێکی بنیادیی هاوسەنگیی دەروونیی بەهێز دەکات. لە ڕاستیدا ئەو بە دانپێدانانێکی ڕاشکاوانە بە هەڵبژاردنی ئاکار، ئەوین، سۆز و باوەشکردنەوە بە ڕووی ئەوانی دیکەدا، دەگەڕێتەوە ناو ژیان، بەڵام بەم کارەی، باوەش بۆ کاریگەریی ئەوانی دیکە بەسەر ژیانی سۆزداریشییەوە ئاوەڵا دەکات.

## شێتاندنی ئەوانیدی

هەر بەو جۆرەی کە لینگ لە شرۆڤەکەی خۆی و لە باسی نامەکەدا ئاماژەی پێ دەکات، لێرانەدا پرسەکە هەر بە تەنیا ڕەنجان و شپرزەیی دەروونی نییە، بەڵکە ئاسەواری ئازاردەری گوتاری کەسێک بەسەر ئەویدیکەشەوە بەرباسە. لە وەرزەکانی پێشووتردا بینیمان کاتێک بە شێوەیەکی پێویست هەست بە پشتگیریکردنی ئەوانی دیکە دەکرێت و ئەویدیکە کاردانەوەیەکی نەرێنی یان تاسێنەری دەبێت، تاک تووشی پەرێشانییەکی سۆزداریی توند دەبێت. لینگ هەندێک لەم نیشانە و کاردانەوە حەپەسێنەرانەی لێک داونەتەوە. ئەو لە زاری هـ . ف. سێرلزەوە پێرستێکی شەش خاڵیی شێتاندنی ئەوانی دیکەی ئامادە دەکات. «هەر یەکێک لەم شەش تەکنیکە بە شێوەیەکی ئاسایی متمانەی ئەویدی بە کاردانەوە سۆزدارییەکانی خۆی و تێگەیشتنی خۆی لەبارەی واقعیەتەوە لەنێو دەبەن».

بنەمایەکی ڕەها و یەکلاکەرەوەمان بۆ ژمارەی ئەم تەکنیکانە یان ڕێگە و سەرمەشقەکانیان نییە. من لێرانەدا کەمێک دەسکاریم کردوون، بە دەربڕینێکی وردتر تەنیا شوێنگۆڕکێم بە وروژێنەری سۆزداری و وروژێنەری دیاری جنسی کردووە.

١. ئەلف بەردەوام ســەرنج لەســەر ئەو لایەنانەی کەســایەتی چڕ دەکاتەوە کە بێ ئاگاییەکی کەمتری لەبارەیانەوە هەیە، لایەنگەلێک کە بە تەواوی لەگەڵ ئەو جۆرە لە تاکایەتی و ناســینەدا جیاوازن کە بێ لەبارەی خۆیەوە هەیەتی.

٢. ئەلف لە دۆخێکدا لە ڕووی ســۆزدارییەوە بێ دەورووژێنێت کە تێیدا خۆشحاڵبوون بۆ بێ کارەساتە.

٣. ئەلف هاوکات هەم ســتایشــی بێ دەکات و هەمیش دەیشــکێنێت یان دەیخاتە دۆخێکی شکاندن و ستایشکارانەی واوە کە بە خێراییەکی بەرچاو شوێنگۆڕکێ دەکەن.

٤. ئەلف لە چەنـد لایەنێکەوە لە بێ نزیـک دەبێتەوە کە هـاوکـات پەیوەندییان لەگەڵ یەکدیدا نییە (بۆ نموونە لە لایەنی ســۆزداری و فکرییەوە).

٥. ئەلف لە باری قسەکردن لەسەر یەک بابەت، شەپۆلی سۆزداریی خۆی دەگۆڕێـت (بۆ نموونە لەبـارەی یەک بـابەتەوە هەم بە جـددی دەدوێت و هەم بە گاڵتەوە).

٦. ئەلف هاوکات لەگەڵ پاراســتنی شــەپۆلی ســۆزداریی خۆی لە بـابەتێکەوە بـاز بۆ بـابەتێکی دی دەدات (بۆ نموونە وەک چۆن لە سـەرپێییترین شـتەکان دەدوێت، هەر بە هەمان شـێوەش لە پرسـگەلی وەک مەرگ و ژیانەوە دەدوێت).

بە بۆچوونی ســـیرلیز، هەوڵـدان بۆ شـــێتـانـدنی ئەوانی دی دەســـئەنقەســـت لە ئاســتی نائاگاییدا ڕوو دەدات. بە بڕوای لینگ، ئەم تەکنیکانە بە کاردانەوەی نێوان تاکەکان دەناســرێنەوە کە هەمیشــە بابەتەکە لێڵ یان نهێنیئامێز نیشـــان دەدەن. «ئەمە وا دەکات تاک بە

دژواری بۆی ڕوون ببێتەوە کە خۆی "کێیە"، ئەوانی دی "کێن" و لە چ "هەلومەرجێک"دان».

دەبێت لە پەیوەندیی نێوان ڕاسکۆلنیکۆف و ئەوانی دیکەدا بە ڕوونی ڕێکارە جیسەرنجەکانی سیرلز بەدی بکەین. مەبەستم لە بێڕێزیی شێتانە و پێنەزانانەی ڕاسکۆلنیکۆف نییە لەبەرانبەر دڵسۆزیی ڕازومیخیندا. گەرچی ئەگەر وای دابنێین کە دڵسۆزیی ڕازومیخین لانیکەم تا ڕادەیەک بەرئەنجامی ئەو هەستە گەرمانەیە کە لە ڕابردوودا لە ڕاسکۆلنیکۆفدا بەدیی کردوون (بە پشتبەستن بە گوتەکانی ئەو بۆ دونیا و دایکی، ڕوونە کە ئەو هەر بە ڕاستی وەها هەڵسوکەوتێکی لەوەوە بەدی کردووە)، ئەوسا دەتوانین ئەم پەیوەندییە بە هەمان ئەو ڕێکارانەی نائاگاییەوە گرێ بدەین.

لێرانەدا زیاتر سەرنجم لەسەر دیمەنگەلێکی وەک ڕووبەڕووبوونەوەکانی ڕاسکۆلنیکۆف و پۆرفیری پیترۆڤیچە، هەر لەبەر ئەوەی کە زۆر بە باشی ڕێکارە باسکراوەکان نیشان دەدەن و هەم لەبەر دوو هۆکاری دیکە: یەکەمیان ئەوەیە کە پۆرفیری ئاگایانە ئەم تەکنیانە بەکار دەهێنێت و لە ڕاستیدا بەشێکیشیان ئاشکرا دەکات؛ دووەمیشان ئەوەیە کە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم دوو کەسایەتییە خاڵێکی سەرنجڕاکێشی دیکە دەخاتە ڕوو کە لینگ ئاماژەی پێ دەکات: لانیکەم ڕێکاری یەکەم (بەردەوام تێشکخستنە سەر ئەو لایەنانەی کەسایەتی کە لەگەڵ ئەو لایەنانەدا جاوازن کە بەرانبەر لەبارەی کەسایەتیی خۆیەوە وێنای کردوون) نەک هەر بە تەنیا بۆ سەرلێشێواندنی کەسی بەرانبەر بەکار دەهێندرێن، بەڵکە دەروونشیکاران وەک بەشێک لە شێوازی چارەسەری خۆیان بەکاری دەهێنن. بە دەربڕینێکی دی، ئەوەی کە لە دۆخێکدا هۆکاری شپرزەکردنە، دەکرێت لە دۆخێکی دیکەدا ببێتە مایەی ڕوونی و هاتنەوە سەرخۆ.

ئەم ڕێکارانە بەتایبەت لە کاتێکدا کاریگەرن کە تاک دەکەوێتە بارێکەوە کە نازانێت لە چ دۆخ و هەلومەرجێکدایە یان دۆخێکی وەک ئەوەی ڕاسکۆڵنیکۆف کە نهێنییەکی سەرمۆرکراوی هەیە و خۆی بە تاوانبار دەزانێت.

ئەمە هەمان ئەو دۆخەی ڕاسکۆڵنیکۆفە لەو کاتەی کە لەگەڵ ڕازومیخیندا دەچێت بۆ لای پۆرفیری پیترۆڤیچ تا پێی بڵێت شتگەلێکی لەلای پیرێژنەکە بە بارمتە داناون. لە ڕاستیدا ڕاسکۆڵنیکۆف نهێنییەکی سامناکی هەیە و سەرەڕای ئەوەش پێ دەنێتە لانەی شێرەوە. ئەو دەبێت وریا بێت و وا نەکات ئەوان بێنە سەر ئەو بڕوایەی کە ئەو بکوژە.

ئەو پێشتر بە چەند تەڵەکەیەکی بوێرانە سەری لەوان شێواندووە (بۆ نموونە ئەو کاتەی کە وای دەنوێنێت دەیەوێت لەبەردەم زامیۆتۆفدا دان بە تاوانەکەیدا بنێت، هەستی کونجکۆڵیی ئەو دەورووژێنێت، جا ئەم هەستەی لەلا دروست دەکات کە بکوژی ڕاستەقینە هەرگیز زاتی نییە تا ئەم ڕادەیە پێی لێ ڕابکێشێت). لە ڕاستیدا ڕاسکۆڵنیکۆف کونجکۆڵیی ئەوانی ورووژاندووە و بێ ئەوەی هیچ زانیارییەکیان پێ بدات هەر وا وێڵی کردوون، بەڵام ئەو هێشتا دڵنیا نییە تا چەندە سەرکەوتوو بووە. ئێستە کە لە بارێکدا بە ئاسانی هەڵدەچێت و شپرزە دەبێت، تەنیا دەیەوێت هەتا دەکرێت بە شێوەیەکی ئاسایی گوتوبێژەکە ئەنجام بدات و هیچ شتێک ئاشکرا نەکات، هاوکاتیش بزانێت ئەوان کتومت چ زانیارییەکیان لایە، بەڵام گەیشتن بەم دوو ئەنجامە لە یەک کاتدا کارێکی سادە نییە، بەتایبەت گەر بەرانبەرەکەتان کەسێک بێت کە لە بەکاربردنی ئاگایانەی ئەم جۆرە تەکنیکانەدا دەستێکی باڵای هەبێت. پۆرفیری لە لایەنێکی دیکەشەوە بەسەر ڕاسکۆڵنیکۆفدا زاڵە. ئەو لەبەر ئەوەی خەمی ئاشکراکردنی نهێنییەکی سامناکی نییە، پشوودرێژ و خوێنساردانە تەکنیکەکان بەکار دەهێنێت.

ڕێی تێناچێت ڕاسکۆڵنیکۆف بتوانێت پۆرفێری شێت بکات، بەڵام دەکرێت هەڵسوکەوتەکەی ئەو تووڕە بکات، وەلێ ئەمە پێچەوانەکەی ڕاست نییە. پۆرفێری هەر بە ڕاستی پێویستیی بەوە نییە ڕاسکۆڵنیکۆف شێت بکات و بەدوای ئەوەشەوە نییە ناچاری بکات دان بە تاواندا بنێت. ئەو دەیەوێت لە وزەپێبەخشین و بەرزکردنەوەی ورەی ڕاسکۆڵنیکۆفدا ڕۆڵی هەبێت و هیواداره بتوانێت ئەو دیوە لە کەسایەتیی ئەو بخاتەوە بەرچاو کە دژبەری ئەو کەسایەتییەیە کە ئەو بۆ خۆیی وێنا دەکات، ئەمەش دەکرێت لە داهاتوودا بۆ ئەو ببێتە بنەڕەتی ژیانێکی سۆزدارانەی پتەو. بەم پێیە یەکەمین ئامانجی ئەو ورووژاندنی جۆرە ئازارێکی سۆزداری و زەینییە کە گومان لەسەر گوتار و نیازەکانی پشتی دروست دەکات.

پۆرفێری هەر بە ڕاستی پێویستیی بەوە نییە کارێک بکات تا زەین و ڕۆحی ڕاسکۆڵنیکۆف بشێوێنێ و سرەوتی لێ ببڕێت:

له زەینی ڕاسکۆڵنیکۆفدا بیرگەلی ئاڵۆز لێک دەئالان و تووڕەیی سنووری تێپەڕاندبوو: *له هەمووی خراپتر ئەوەیه که تەنانەت ئەرک ناکێشن و شتێک بشارنەوە؛ هەر نازانن ڕێز و حورمەت چییە! باشە هەی خوێڕی، من و تۆیەک کە تا ئێستە چاومان بە یەکتری نەکەوتووە، ئاخر چۆن کتوپڕ لەگەڵ نیکۆدیم فۆمیچ باسی من دەهێنیتە ناوەوە؟ کەواتە تەنانەت بۆشیان گرنگ نییە پەردەپۆشییەک بکەن، وەک ڕەوە سەگێکی هار کەوتوونەتە شوێنم. خەریکن بە ڕۆژی ڕۆشن تف دەکەنە دەموچاوم!*

له ڕقان سەرتاپێی هەڵدەلەرزی: *بسرەوێننە بناگوێم، تەنیا یاریی مشک و پشیلەم لەگەڵ مەکەن. له ئێوە ناوەشێتەوە، پۆرفێری پێترۆڤیچ... ئەم هەڵسوکەوتە باش نییە، ڕێک ناپیاوییە! وەلێ هاکا منیش لێتان هاتمە دەنگ، جەنابی پایەبەرز. که هەستامەوە و حەقیقەتم تف کردە دەموچاوی ناشیرینتان، ئەوسا تێدەگەن که چەندە بێز له چرچاوی یەک بە یەکتان دەکەمەوە!*

هەناسەی بۆ نەدەدرا.

*بەس کێ ناڵێ تووشی خەیالات نەبوومە؟ ڕەنگە هەموو شتێ تەنیا خەیالاتێکی پووچ بێ و من تووشـــی هەڵەیەکی گەورە بووبم؟ ئـاخر خۆ ئەزموونیشـــم نییە، ئەی ئەگەر لە گەرمەی بابەتەکەدا پەســـت ببم و نەتوانم لە یارییەکی ئێندە چەپەڵانەدا ڕۆڵی خۆم بگێڕم؟ لەوانەشە هیچ شتێک دەستەنقەست نەبووبێ. ناڵێم شتێکی تایبەتییان گوت، هەر قسەی ئاسایی بوو، وەلێ هەر لەم قســـە ئاســـایی و ڕۆژانەییانەیاندا شـتێ هەیە کە... باشـــە من بۆچی ئاوها ڕێکوڕاست گوتم لای ئەو خاتوونە؟ ئەی زامیۆتۆف؟ بۆچی گەڕایەوە بۆ ئەو کـاتە و فلتـانـدی کە ئێوە زۆر ئـاقڵانە قســـەتان دەکرد و تەنانەت دەشـــتوانم بڵێم لێهاتووانە؟ باشـــە شێوازی قسەکردنی ئەمانە بۆ دەبێ ئاوها بێ؟ ئەرێ، شێوازی... باشـە ئێستە پۆرفیری چاوی لێ داگرتم یان دای نەگرت؟ قسـەی بەلاشـــە، ئاخر بۆ دەبێ چاو دابگرێ، قلۆری ئاوها! دەیانەوێ پەستم بکەن؟ یان خەریکن پێم ڕادەبوێرن؟*

جا هەر بەم جۆرە لەســـەری دەڕوات. لێکدانەوە و واتای زۆرێک لە قسە و حاڵەتەکانی پۆرفیری هەم بۆ ڕاسکۆڵنیکۆف و هەم بۆ خوێنەر ئێجگار دژوارە. لە قســـــەکانی ڕازومیخینەوە تێدەگەین کە پۆرفیری بەوە ناســـراوە کە بە جۆرێک لە جۆرەکان کردەییانە گاڵتە بەوانی دی دەکات، کە بەپێی ئەو گاڵتەیە لەبارەی کار یان قســـــەیەکی گرنگەوە (وەک ڕۆیشـــتن بۆ کڵێســـا یان زەماوەندکردن) بە لاڕێیاندا دەبات و باری ڕووخســـاریشـی بە هیچ شـێوەیەک ئەوە نیشـان نادات. یەکەمین قســـــەی پۆرفیری (لەبارەی هاتنەژووری ڕازومیخینەوە) «شـــاد و ڕووخۆش»ییە، جا تۆزێک دواتر «پێدەکەنێت». ئەم هەســـتە لەگەڵ ئێمەدا دەمێنێتەوە تـا ئەو شـــوێنەی کە گێڕەرەوە لە چوارچێوەی وەســـفێکی گشـــتیی ئەودا پێمان دەڵێت کە ڕووخســـاری پۆرفیری «هۆشیار و تەنانەت مانادار» دەردەکەوت و سەرەڕای ئەو هەستەی

که چاوەکانی له بەرانبەرەکەیدا سەوزی دەکەن که بەردەوام وا هەست دەکات چاو دادەگریت، ڕواڵەتیکی نەرمونیان و چاکەخوازانەی هەیە. تەنانەت وشەی «دایکانە»شی لەبارەوه بەکار دەبریت. ئەو پاشان به باریکی فەرمی ڕاسکۆڵنیکۆف بانگ دەکات و «هیندە به سەرنجیکی زۆر و جددییەتەوە [سەیری کرد] که دایمه مرۆڤ لەو بارانەدا هەر له سەرەتاوە ناڕەحەت و شەرمەزار دەبیت و بەتایبەت... لەبەر ئەوەی گەر ئەو قسەیەی که کەسەکه نیازیەتی بیکات، لەچاو ئەو بەهەندوەرگرتنەدا هیندە گرنگ نەبیت».

کەشی جددی و فەرمی بۆ ساتیک شوینی خۆی دەداته نیگایەکی بەئاشکرا مانادار و چاوداگرتنیک که تەنیا ساتیکی کورت دەخایەنیت. تۆزیک دواتر پۆرفیری دەچیته دەر تا ڕاسپیریت چای بهینن و کتوپڕ به باریکی شادترەوه دەگەڕیتەوە، جا تا گوتوبیژ لەبارەی کوشتنەکەشەوه زیاتر دریژه بکیشیت و تیروتەسەلتر بیت ئەو زیاتر کەیفکۆک دەبیت و هەر جاریکیش سەیری ڕازومیخین بکات پیدەکەنیت. خولەکیک دواتر به «جددییەتیکی سەرسووڕهینەوە» وەلامی پرسیارەکەی ئەو دەداتەوە. پاشان بەدەم گوتوبیژەوە دەگەنه سەر ئەو گوتارەی که ڕاسکۆڵنیکۆف لەبارەی کوشتنەوه نووسیویەتی. بەشیکی گەورەی ئەو گفتوگۆیەی که بەدوای ئەوەدا دیت، به ڕوونکردنەوەی ئاشکرای گیرەوە ناپچڕیت. به سەختی دەتوانریت ئەوه ڕوون بکریتەوە که ئاخۆ پۆرفیری تا چەنده ئەم گوتاره (بەدەر لەو زانیارییەی که لەبارەی نووسەرەکەیەوە بەوی دەدات) بەهەند وەردەگریت تا ئەو شوینەی که ئاماژه به «تانەوەشاندنی ئاشکرا و توند و ئازاردەر و بیڕیزانە»ی پۆرفیری و ئەوە دەکریت که ناتوانیت به ئارامی دابنیشیت.

ماوەیەک دواتر وا دەردەکەویت لەوە دوودڵه که ئاخۆ ئەم پرسیاره دڵگرانکەره له ڕاسکۆڵنیکۆف بپرسیت که ئایا ئەو خۆی به مرۆڤیکی ڕیزپەڕ دەزانیت یان نا، پاشان چاوی چەپی لی دادەگریت و بیدەنگ

پێدەکەنێت و بە پرسیارێکی رووقایمانەتر شوێن ئەم پرسیارە دەکەوێت. «بە شێوەیەکی دڵخواز» داوای مۆڵەتی لێ دەکات، بە بارێکی ئێجگار هاوڕێیانە دەستی درێژ دەکات، جا لە هەمان ئەو کاتەدا کە فێڵەکەی بۆ ناچارکردنی راسکۆڵنیکۆف بۆ دانپێدانان سەرناگرێت، دەموچاوێکی شەرمەزار نیشان دەدات. ئەم قسە و حاڵەتانە ئێجگار لەو قسە و حاڵەتانە دەچن کە گۆلیادکین لە هاوزاکەی خۆیدا بەدییان دەکات و هاوکات سووریشە لەسەر لێکدانەوەیەکی روون.

لەوانەیە بکرێت سەرلەبەری ئەم گۆڕانکاریانە بدەینە پاڵ گۆڕانی بابەتی گفتوگۆکە (گەرچی لێرانەدا هیچ پەیوەندییەک لەنێوان ئەم دووانەدا نییە)، بەڵام ئەم گفتوگۆیە هەم بۆ راسکۆڵنیکۆف و هەم پۆرفیری یەک بابەتی هەیە کە ئێجگار جددیشە: لەئەستۆگرتنی کردەوەی کوشتنەکە لەلایەن راسکۆڵنیکۆفەوە. ئەو پرسیارانەی کە لە سەری ئەواندان، جیاوازن. پرسیاری پۆرفیری ئەمەیە: «ئایا دەتوانم سەری لێ بشێوێنم و ناچار بە دانپێدانانی بکەم؟» هەروەها پرسیاری راسکۆڵنیکۆفیچ ئەمەیە: «ئایا دەتوانم تا ئەو رادەیە شپرزەی بکەم کە نەتوانێت لە هیچ شتێک دڵنیا ببێت و ئایا ئەو بەڵگەیەکی جددیی لە بەردەستدایە؟» بەڵام هیچکامێکیان لەو پرسیارە دڵنیا نین کە ئەوی دیکەیان هەر بە راستی دەیەوێت بیکات و ناتوانن بێ ئەوەی هەلومەرجی خۆیان بخەنە مەترسییەوە بە راشکاوی لەم بارەیەوە بپرسن. پۆرفیری زۆر لەم قۆناغە نزیک دەبێتەوە، بەڵام دەبێت ئەوەمان لە بیر بێت کە دۆخەکەی ئەو فرە باشترە و چەند کارتێکی براوەشی بە دەستەوەیە.

پۆرفیری لە کاتی قسەکردن لەبارەی یەک بابەتەوە بەردەوام شەپۆلی سۆزداریی خۆی دەگۆڕێت (لەبارەی یەک خاڵەوە هەم جددییە و هەم فشەقیاتچی). لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بە گێڕانی رۆڵی دوولایەنی خانەخوێی نەرمونیان و رووخۆش کە لەبارەی پرسگەلی

تیۆریی تاوانیشـەوە کونجکۆڵییەکی هەیە (هەڵەکە دەقۆزێتەوە تا چەند پرسـیارێک لە نووسـەری گوتارێکی ئێجگار سـەرنجڕاکێش بکات) و لێپرسـینەوە لە گومانلێکراوێک بە کوشـتن، هەروەها بە ڕاکردنی کتوپڕانە و پێشبینینەکراو لە ڕۆڵێکەوە بۆ ڕۆڵێکی دی، دەستئەنقەست سـەر لە ڕاسکۆڵنیکۆف دەشـێوێنێت تا هەر بە ڕاسـتی نەزانێت «لە چ دۆخێـک»دایە، «کێیە» «میوانی ئەدیـب/جـانی»، ئەی ئەوی دیکە «کێیە» «خانەخوێی ڕووخۆش/لێکۆڵەر». لە ڕاسـتیدا ئەو هاوکات لە دوو ئاستی بە ڕواڵەت ناپەیوەستدا پەیوەندی لەگەڵ ئەودا دەبەستێت. لە دۆخێکدا هەستی خۆپەسەندیی ڕاسکۆڵنیکۆف لە پێگەی نووسەردا دەورووژێنێت کە ڕێگەدان بە دەربڕینی هەسـتی خۆپەسـەندی بۆ ئەو کارەسـاتبار دەبێت، جا هاوکات هەم دنەی دەدات و هەم شـپرزەی دەکات، هەم پاڵپشتیی دەکات و هەم بە درۆی دەخاتەوە. لە کۆتاییشدا هێندە ئاسـایی و ئاسـان پرسـی مەرگ و ژیان لەگەڵ ڕاسـکۆڵنیکۆفدا دەخاتە ڕوو، ڕازومیخین کە ئاگاداری حەقیقەتەکە نییە، سـەرکۆنەی دەکات.

پۆرفیری چاک دەزانێت بۆ کەسـانێک کە هەسـت بە هەڕەشـە و سەرلێشێوان دەکەن، ڕۆشنیی «دۆخ» چەندە گرنگە-ئەوەی کە بزانن لە چ دۆخێکـدان، کێن، ئەی کەسـی بەرانبەریـان کێیە. ئەو لەو گفتوگۆیەی کە دواتر لە بنکەی پۆلیس لەگەڵ ڕاسـکۆڵنیکۆفدا دەیکات، سـوود لەم تەکنیکانە وەردەگرێت، بەڵام ئەوەش ڕوون دەکاتەوە کە بۆچی دەستبەجێ کەسانی بەرگومان دەستبەسەر ناکات:

> دەمەوێ دۆسـییەکەم هەتا بڵێی تۆکمە بێ و هەموو شـتێکی، وەک دەڵێن، وەک هاوکێشـەیەکی بیرکاری ڕوون بێ. بەڵگەیەکم دەوێ بە ڕوونیی دوو جـاران دوو یەکسـانە بە چوار، بەبێ چەندوچۆن! ئێسـتە گەر هەسـتم و هیچیهیچنەبوو بەرانبەرەکەم دەسـتبەسـەر بکەم، جا با دڵنیاش بم کە ئەو بووە، بە ئەگەرێکی زۆر هەلی شـکاندنەوەی بەڵگەکەم بەسـەر ئەودا لەکیس خۆم

داوە. بۆچی؟ چونکە بەم جۆرە ئەوە منم کە دۆخەکەی بۆ دیاری دەکەم. هەلومەرجە دەروونییەکەشی ئەمەیە: یەکلاییم کردووەتەوە و هێوریشی دەکەمەوە. ئەوسا چی دەکا؟ لە من دوور دەکەوێتەوە و دەخزێتە قەپاغەکەی خۆیەوە... وەلێ گەر هەر وا واز لەم کاکی بەرگومانە بەرێزە بهێنم، زۆری بۆ نەهێنم، زووزوو بانگی نەکەمە ئێرە و لە خۆڕا نارەحەتی نەکەم و تەنیا وا بکەم کە تێبگا یان لانیکەم هەر ساتەو لە ترس و دڵەڕاوکێی ئەوەدا بێ کە من هەموو شتێ دەزانم و شەو و ڕۆژ چاوم لەسەریەتی، بەردەوام لە باری تۆقین و دڵەڕاوکێدا دەمێنێتەوە و ئاخرییەکەی بە یەکجاری لە سەری دەدا و بە پێی خۆی دێتە لام. لەوانەشە وا بکا کە هەموو شتێ وەک دوو جاران دوو یەکسانە بە چواری ڕێسا بیرکارییەکانی لێ بێ و تەواو... پاشانیش مەسەلەی مەزاج، با مەسەلەی مەزاجیش لەبیر نەکەین!... هەموو تاوانکارەکان بە جۆرێ لە جۆرەکان نەخۆشن، تووڕە و مەزاجین!... زۆریش بەدبینن! هەڵبەتە ئەمە بۆ ئێمە دەستکەوتە.

پۆرفێری بە وەسفێکی کەم تا زۆر کتومت ڕاستێ گیرۆدەیی ڕاسکۆڵنیکۆف و بەیەکسانزانینی گیرۆدەییەکەی ئەو لەگەڵ دۆخی بکوژێکدا کە ئەو بەدوایەوەیەتی، دەبێتە هۆی ئەشکەنجەیەکی زۆر بۆ ڕاسکۆڵنیکۆف. ئێستە هەر بە ڕاستی خەریکە یاریی مشک و پشیلەی لەگەڵدا دەکات، بەو دەڵێت دەزانێت کە ئەو تاوانبارە، کەچی هەنگاوی دواتر نانێت و دەستبەسەری ناکات. ڕاسکۆڵنیکۆف پەتی سەبری دەپسێت و بێ ئەوەی دان بە تاوانەکەیدا بنێت ئەمەی پێ دەڵێت. لێرانەدایە کە پۆرفێری دواهەمین گورزی لێ دەوەشێنێت و بەو دەڵێت ئارام بێت، چونکە «بەم جۆرە خۆتان شێت دەکەن». بە دەربڕینێکی دیکە، ئەو ناڕاستەوخۆ نکوڵی لەوە دەکات کە وا خەریکە لەڕێی ئەو تەکنیکانەوەی کە مووبەموو بۆ ڕاسکۆڵنیکۆفی باس کردن، ئەو شێت دەکات و ئاماژە بەوە دەدات کە هەڵسوکەوتی خودی ڕاسکۆڵنیکۆف

کێشـــەیەکی هەیە و بووەتە هۆی خۆناڕەحەتکردن. لێرانەدا دەکرێت دوو تەکنیکی دیکەش دیاری بکەین:

٧. **ئەلف**، ناڕاســـتەوخۆ و بەردەوام نیشـــانی دەدات کە ئاگاداری نهێنییەکەی بێیە و هاوکاتیش خۆی لە ئاماژەپێکردنی ڕاســـتەوخۆ دەدزێتەوە، بەم جۆرە دەتوانێت نکۆڵی لەوە بکات کە بە ئاشـکرا وەها ئاماژەیەکی کردووە.

٨. **ئەلف**، بەوە **بێ** تۆمەتبـار دەکـات گوایە بووەتە هۆی ئـازارێکی توند (ئاگایانە یان نائاگایانە) کە خۆی لە ئەنجامی خۆهەڵقورتاندنی **ئەلف**دا هاتووەتە ئارا.

خراپ نییە لەبـارەی ئەم ڕێکـارەی کۆتـاییەوە ڕوونکردنەوەیەکی زیاتر بدەم. تا ئێرە مەبەستم ئەوە نەبووە کە ڕاسکۆڵنیکۆف لەهەمبەر باری دەروونییدا بەرپرسـیار نییە. لەوەش گرنگتر دۆخ و هەلومەرجی ئەو بەرئەنجامی هەڵسوکەوتی ئەوە لەگەڵ ئەوانی دیکەدا، بەڵام گومان لەوەدا نییە کە ئەو پەرێشـــانییە تایبەتانەی کە لە بەرکەوتنی لەگەڵ پۆرفێریـدا یەخەی دەگرن، لە دیـدی ئەوەوە بەرهۆی **هەوڵـدانی** پۆرفێرین بۆ زیاتر سەرلێشێواندنی ئەو.

پۆرفێری لە ڕێگەگەلی جیاوازەوە هەوڵ دەدات بەم ئامانجە بگات، بۆ نموونە وای دەنوێنێت کە بەڵگەگەلی تاوانباربوون لە ڕاستیدا دەبنە هۆی ئـازادکردنی تـاوانبـار و بە پێچەوانەوە، کە ئەقڵی دروســـت پارانۆیایە[1] و بە پێچەوانەشەوە، لەڕێی بیرهێنانەوەی وشەگەلێکەوە کە هەرگیز نەگوتراون و لەبیرکردن یان خەوشـدارکردنی وشـەگەلێک کە گوتراون. ئەو لەپشـت هەموو ئەم کارانەوە هیواداره ڕاسـکۆڵنیکۆف وا بیر بکاتەوە کە نائاگایانە خۆی ئاشـکرا کردووە و لەبارەی ئەوەی کە

---

١. پارانۆیا: چەشـنێک لە نەخۆشـیی پەرێشـانیی دەروونیی درێژخایەن، کە نەخۆش تووشـــی خەیاڵاتی بەرزەفڕی یان گومانخراپی دەکات، بەڵام بەشـــەکانی دیکەی کەسایەتیی ئەو نەخۆشە وەک خۆیان دەمێننەوە. «و. ک»

پۆرفیری هەر بە ڕاستی چ شتێک دەزانێت و چی نازانێت و دەتوانێت چ شتێک بسەلمێنێت یان نەسەلمێنێت و چ شتێک زادەی خەیاڵیەتی و چ شتێکیش هەر بە ڕاستی ڕووی داوە، تووشی سەرەگێجەی بکات.

بە دەربڕینێکی دی، ڕاسکۆلنیکۆف هەست دەکات بووەتە یاریچە و بابەت، هەروەها حەز دەکات بزانێت ئایا وەک بکوژ بەبابەت کراوە یان لەڕێی بەڵگەگەلێکی لاوازەوە قوربانییەکی بێتاوانە. پۆرفیری دەیەوێت ئەو لە باری گومان و سۆسەدا بهێڵێتەوە تا بەشکووم دواجار هێندە تیابمێنێت کە خۆی بۆ چارەکردنی کێشەکە هەنگاو بنێت.

ڕاسکۆلنیکۆف لە ڕاستیدا دان بە تاوانەکەیدا دەنێت—بەلام لە بەردەم سۆنیادا. ئەو لەلای سۆنیا گرێی دڵی خۆی دەکاتەوە. بەس ئەوەی کە لە هەموو شتێک بۆ ئەو ئاسانترە، دەستخستنی بەڵگەگەلێکی پەسەندکراوە تا ڕەوایەتی بەو کارە بدەن کە کردوویەتی.

## ئەشکەنجە و دانپێدانان

هاوکات لەگەڵ ئەو دواهەمین ڕووبەڕووبوونەوەیەی نێوان ڕاسکۆلنیکۆف و پۆرفیریدا کە باسی کرا، ئەو (سەرەڕای ئەوەی کە هێشتا نهێنییەکەی ئاشکرا نەبووە) پەیوەندییەکی باشتری لەگەڵ ئەوانی دیکەدا بەستووە. هاوڕێیەتیی لەگەڵ ڕازومیخیندا گەرموگوڕە. بە سەرنجدان لە پەیوەندییەکانی تەنانەت لەگەڵ سڤیدریگایلۆفیشدا خراپ نییە. سڤیدریگایلۆف لەسەر ئەوە سوورە کە ئەو دوانە چەند لێکچوونێکیان لەگەڵ یەکدیدا هەیە کە ڕاسکۆلنیکۆف تەنانەت حەز ناکات بیریشی لێ بکاتەوە، ئاخر ئەو بە سڤیدریگایلۆف پەست دەبێت و لە لایەکی دیکەشەوە ئەو خوشکەکەی ئازار دەدات و خۆیشی بە شێوەیەکی گشتی بەدگومانە. گەر قسەکەی لوژن ڕاست بێت، سڤیدریگایلۆف دەستی لە «کوشتنێکی باوەڕپێنەکراو»دا هەبووە کە بە یارمەتیی هاوسەرە کۆچکردووەکەی توانیویەتی پینەی بکات و بە

بێوەیی لەدەســـت ئاقیبەتەکەی نەجاتی ببێت، ئیدی پێکچوونی دۆخی خۆی لەگەڵ هی ڕاسکۆڵنیکۆفدا بۆ ئەو بە ڕوونی ئاشکرایە.

ڕاسکۆڵنیکۆف کە بیر لەم بابەتە دەکاتەوە، هەست دەکات نەکردەیە بتوانێـت جـارێکی دی لەوانی دیکە نزیـک ببێتەوە و بـاوەش بۆ خێزانەکەی بکاتەوە. لەو کاتەی کە ئیدی لوژن پەیوەندیی بە ژیـانی خوشـکەکەیەوە نامێنێت و میراتەکەی مارفا پیترۆفنا لەگەڵ پێشـنیارە کارییەکانی ڕازومیخین خوشـک و دایکی لە هەژاری و دەسـتکورتی ڕزگـار دەکەن، هەمـدیســـان بێ لە دوورکەوتنەوە لە ئەوانی دی و تەنیایی، هیچ ئارەزوویکی دیکەی نابێت.

ئەم ڕووداوانەی کە بەڵێنی ئاسوودەیی و شادمانییان بۆ خێزانەکەی پێیە، کاریگەریی گرنگترین پاڵنەرەکانی ڕاسـکۆڵنیکۆف بۆ تێوەگلان لە کوشـــتنەکە دەسـرنەوە، پاڵنەرێکی وەک ڕزگارکردنی خوشـــکی لە خۆکردنەقوربانی لەبەرانبەر لوژندا، خۆڕزگارکردنی لە وابەســـتەیی بەوانەوە و نەجاتدانی دایک و خوشکی لە نەداری. ئێستە ئەو لەدەست ئەو بەرپرسیاریەتییە ئاکاری و هەراسانکەرانەی کە لێیەوە دەکەوتنەوە و لە ســـەرەتـاوە ئـازاریـان دەدا، ڕزگـاری بووە. کەچی دژیەکییەکە ئەوەیە کە لەم کـاتەدایە ئەو لەبەرانبەر ڕازومیخینی هـاوڕێیـدا بۆ یەکەمین جار دان بە تاوانەکەیدا دەنێت.

ڕاڕەوەکە، تاریک بوو و ئەوان لە نزیک چراکەوە ڕاوەستابوون. بۆ ماوەی خولەکێک بە بێدەنگی لە یەکدی ڕامان. ڕازومیخین تا کۆتایی تەمەنی ئەو یەک خولەکەی لە بیر نەکرد. نیگای سووتێنەر و ڕاماوی ڕاسکۆڵنیکۆف، سات بە سات بەهێز و بەهێزتر دەبوو و ڕۆح و زەینیی دەڕووشـــانـد و دزەی دەکردە نـاویـانەوە. ڕازومیخین کتوپڕ لەرزی لێ نیشـــت. دەتگوت شـــتێکی نـامۆ لەنێوانیان ڕووی دا؛ وەک ئەوەی فکرێک یان ئاماژەیەک بووبێت کە بەبێ ویسـت ئاشـکرا بووبوو، خاڵێکی ترسناک و زراوبەر کە دەتگوت لەنـاکـاوێکـدا بۆ هەردووک لا ڕوون بووبووەوە... ڕازومیخین وەک گەچ سپی هەڵگەڕا.

– دەی، ئێستە تێگەیشتی؟

کاتی دیدەنیکردنی ســۆنیا کە بەدوای ئەم ڕووداوەدا دێت، لەنێوان ئەم دووانەدا ئەو جۆرە دۆئیلە[1] ئـاگـایـانەیە نـایێتە ئـارا کە لەنێوان ڕاســـکۆلنیکۆف و پۆرفێریـدا ڕووی دا. لەگەڵ ئەوەشـــــدا گەرچی هەردووک لا لە ڕووی ســــۆزدارییەوە ئێجگـار گەزنگـازن[2]، بەڵام هەلومەرجی ڕاسـکۆلنیکۆف باشـترە. باوکی سـۆنیا کەمێک لەوەوبەر دوای ڕووداوێکی ترســـناکی هاتوچۆ بە بەرچاوی ئەوەوە مردووە. لە ئێستەدا خێزانەکە تەنیا پشت بەو دەبەستێت و بۆ شێوازی دابینکردنی بژێویی خێزانەکەشی لەبەرانبەر ڕاسکۆلنیکۆفدا هەست بە شەرمەزاری دەکات.

کەم تـا زۆر دەتوانرێت هەموو دیمەنەکان لە بەرڕۆشـــــنایی ئەو تەکنیکـانەدا لێـک بـدرێنەوە کە بۆ شـــێتکردنی ئەوانی دیکە بەکـار دەهێندرێن، بەڵام ئەم دیمەنە لەم ڕووەوە زیاتر جێســـەرنجە. ســۆنیا نازانێت لەبەرانبەر ڕاســــکۆلنیکۆفدا پێگە و دۆخی چۆنە. ئەو هەر بە تەنیـا ئەوەنـدە لەســــەر ڕاســــکۆلنیکۆف دەزانێت کە ڕۆژێـک وەک بێگانەیەک دەرکەوت و دارونەداری خۆی بەخشـییە ئەوان، بێگانەیەک کە بە بۆچوونی زڕدایکی فریشتەی چاودێری ئەوانە، بەڵام ئەم پیاوەی کە ئێستە لەبەرانبەریدا ڕاوەستاوە بەدبین و گرژ و ڕەق و بێبەزەییە، بەردەوام پەنجە دەخاتە سـەر خاڵگەلێکی هەسـتیاری ژیانی سۆنیا، بە ئاماژە بیری دەهێنێتەوە کە زڕدایکی لەســـایەی بەدڕەوشـــتیی ئەوەوە دەژی، بە «دڵڕەقی»یەوە (گەرچی ئەم جارەیان نادەســــئەنقەســــت) زڕدایکی و بـاوکیی بیر دەهێنێتەوە و بە ئەرخەیـانی پێی دەڵێت بەم زووانە دایکی دەمرێت، بە شـێوەیەکی سـادیسـتانە ئەم بیرەی دەخاتە

1. دوئیل: جەنگی تەن بە تەن، بە چەکی سارد یان گەرم بۆ پاککردنەوە و پاراستنی شەرەف.

2. گەزنگاز: ناسک و بێبەرگری؛ ئامادە بۆ بریندار‌بوون و ئازارپێگەیشتن.

مێشکەوە کە دوای مردنی دایکی چی بەسەر منداڵەکاندا دێت، تەنانەت لەوەش خراپتر دەپرسێت کە ئایا ئەو ئالوودەی داوێنپیسی بووە یان نا. ئەو وێنایەکی تۆقێنەر دەهێنێتە بەرچاوی کە تێیدا پۆلیاش بووەتە سۆزانی، بیرکردنەوەیەک کە سۆنیا بە هیچ شێوەیەک بەرگەی ناگرێت. کوڕەکە هەوڵ دەدات بڕوای ئەو بە خوا لەق بکات و تەنانەت پێشی دەڵێت ئەو لە بەرەبەری شێتبووندایە.

پاشان کتوپڕ لەبەردەم سۆنیادا دەکەوێتە سەر ئەژنۆ و پێیەکانی ماچ دەکات، «لەبەرانبەر هەموو ئازارەکانی مرۆڤایەتیدا» سەری کڕنۆش دادەنەوێنێت، لەو دەپرسێت ئایا خۆکوشتن شەرەفمەندانەتر نییە لەچاو چوونەژێر باری ئەم هەموو سووکی و ڕسواییەی کە هاوڕێی هەستگەلێکی پیرۆزە، چونکە ئەو [سۆنیا] دەزانێت کە توانای نەجاتدانی هیچ کەسێکی نییە. سۆنیا ناتوانێت ئەو قسەیەی ڕاسکۆڵنیکۆف پەسەند بکات کە خواوەند لێدەگەڕێ کەسانی وەک ئەو چارەڕەش بن. ئەمە لایەنی نەرێنیی نهێنیی سۆنیایە، هەر لەبەر ئەوەشە بەو ڕادەیە بەلایەوە دژوارە چیرۆکی عازر بۆ ڕاسکۆڵنیکۆف بخوێنێتەوە، چیرۆکێک کە پەرجووی ئیلاهی دەسەلمێنێت؛ هەر لەبەر ئەوەشە چاک دەرک بەو یەهوودییە دڕدۆنگانە دەکات کە گومان لەوە دەکەن مەسیح بتوانێت پیاوە مردووەکە زیندوو بکاتەوە، جا لە سەرکەوتنی ئەودا بەشدار دەبێت. لەرز و تا سەراپای دەتەننەوە.

بەڵام سۆنیا نائاگایانە ڕاسکۆڵنیکۆف دەورووژێنێت. دەڵێت لیزاڤێتای کوژراو هاوڕێی نزیکی ئەو بووە، هەر ئەویش ئەو کتێبەی (پەیمانی نوێ بە زمانی ڕووسی) پێ داوە کە ئێستە ڕاسکۆڵنیکۆف داوای لێ دەکات بیخوێنێتەوە، هەندێک لەو تایبەتمەندییە باشانەشی تێدا بوونە کە ڕاسکۆڵنیکۆف لەودا دیونی و پەسەندی کردوون. سۆنیا تەنانەت لە کڵێسادا تازیە بۆ هاوڕێ کوژراوەکەشی دادەنێت. ئەو نائاگایانە پاڵ بە ڕاسکۆڵنیکۆفەوە دەنێت تا پەردە لەسەر نهێنییەکەی هەڵبماڵێت، نەک هەر بە تەنیا پاڵپێوەنان بۆ دانان بە تاوانەکەیدا، بەڵکە

بۆ ئەوەش کە توێ قووڵەکانی دەروونی هەڵبداتەوە و هۆکارەکەشـی بزانێت. ئەو لە کۆتاییدا ڕێی ڕزگاری بە کوڕەکە نیشـان دەدات، بەڵام سۆنیا کەللەڕەق و نەسازە و ئەمەش ئازاری ڕاسکۆلنیکۆف دەدات.

لە ڕاسـتیدا هەر یەکێکان لەوی دیکەدا «چەند لایەنێکی کەسـایەتی [دەخاتەوە بەر دید] کە بەرانبەرەکەی هێندە لێی بەئاگا نییە و لەگەڵ ئەو کەسـایەتییەدا جیاوازە کە تاک بۆ خۆی وێنای دەکات». لام وایە لێرانەدا دەتوانرێت ئەم نموونەیە چوارچێوەدار و دیارتر بکرێت: هەر یەکەیان لەوی دیکەدا چەند لایەنێک لە کەسـایەتی دەورووژێنێت کە جیـاوازییەکی بنەڕەتیی لەگەڵ ئەو وێنـایەدا هەیە کە تـاک بۆ خۆیی کێشـاوە تا بتوانێت بەسـەر ئەو ژینگە نەسـاز و دژەدا زاڵ ببێت. خسـتنەژێرپرسـیاری ئەم وێنـایە تەنیا بە مانـای لێکدانەوەیەکی ئاوێتەکراو بە ئاسـوودەیی و بێلایەنانە نییە، هەڕەشـەکردنێکە بە لەناوچوونی ڕەها. لەم شـوێنەی چیرۆکەکەدا، ڕاسـکۆلنیکۆف خەریکی بەراوردکردنی وێنا کەسـییەکەی خۆیەتی و بۆ یارمەتی و پاڵپشـتیی ئاکاری دەچێت بۆ لای سۆنیا، وەلێ سۆنیا زیاتر لە ئەو سەرلێشێواو و پەرێشانە.

بەر لە شـێوی تازیەکە، بەسـەرهاتی نێوان لوژن و سـۆنیا، مردنی کاترینا ئیڤانۆڤنا و هەرەوەزیی نێوان ڕاسـکۆلنیکۆف و سـڤیدریگایلۆف بۆ یارمەتیدانی منداڵە هەتیوەکان، هەموو شتێک تەماوی دەردەکەوێت. ڕاسکۆلنیکۆف هیوادارە کێشمەکێشێک، گێرەوکێشەیەک یان پەلامارێک بێتە ئارا تا ببێتە هۆی ئەوەی هێزی خۆی چڕ بکاتەوە، ڕێک وەک ئەو کاتەی کە لوژن هاتبووە سـەر سـەکۆی دیمەنەکە، ئاخر لوژنیش لە پۆلێنبەندی و بەبابەتکردنی مرۆڤەکاندا دەستێکی باڵای هەبوو.

لێرانەدایە کە پۆرفێری قوت دەبێتەوە و بەو دەڵێت کە دەزانێت ئەو بکوژە و ڕێی بۆ خۆش دەکات تا دان بە تاوانەکەیدا بنێت. پۆرفێری دەرک بەوە دەکات کە ئەو ئیدی بڕوای بە تیۆرییەکەی نییە و بەر لە هەر شـتێک پێویسـتیی بە دۆخێکی ڕوون و یەکلایی و «هەوای تازە»

هەیە. ئەوە سڤیدریگایلۆفە کە زاراوەی «هەوا»ی خستووەتە بەرباس. لە ڕاستیدا «هەوا» هێمای ڕێگەی ڕاکردنە لە دۆخێکی بەرگریلێنەکراو. سڤیدریگایلۆف ئێستاکە بە شێوەیەکی تەلیسماوی جێگەی سەرنجی ڕاسکۆلنیکۆفە. بۆچی؟ ڕەنگە لەبەر ئەوەی کە ئەویش تێکەڵەیەکی سەیرە لە پاڵنەری خراپەکارانە و ویستی چاکە. لەوانەشە لەبەر ئەوە بێت کە ڕاسکۆلنیکۆف دەترسێت سڤیدریگایلۆف ئەو زانیاریانە بۆ سوودوەرگرتنێکی خراپ لە سۆنیا بەکار بهێنێت. لەوانەشە لەبەر ئەوە بێت کە پێدەچێت سڤیدریگایلۆف لەبارەی ڕاسکۆلنیکۆفەوە «نهێنی»یەک بزانێت –هەڵبەتە نەک بە تەنیا تاوانی کوشتنەکە، گەرچی هەر ئەمەش بەسە تا دەسەڵاتێکی زۆر بداتە ئەو- بەڵکە نهێنییەکی ناوەکی و دەروونناسیش. هاوکات ڕاسکۆلنیکۆف هەست دەکات یان دەبێت ڕێگەی ڕاکردنەکەی سۆنیا بگرێتە بەر یان ڕێگەی سڤیدریگایلۆف، بەڵام نازانێت ئەو ڕێگەیە چییە کە سڤیدریگایلۆف لە بەرچاوی گرتووە، هەر ئەوەندە دەزانێت کە ڕێگەکەی سۆنیای ڕەد کردووەتەوە.

ئەو «نهێنی»یەی کە سڤیدریگایلۆف لە ڕاسکۆلنیکۆفدا ئاشکرای کردووە، شتێکە بە «شیلەریزم/شیلەرئاسا» ناوی دەبات و ئەمەش دەبێتە هۆی پەستی و بێزاربوونی ڕاسکۆلنیکۆف. بە دڵنیاییەوە ڕەدکرانەوە لەلایەن ڕاسکۆلنیکۆف و دونیاوە ڕۆڵێکی سەرەکیی لە بڕیاری خۆکوژییەکەی سڤیدریگایلۆفدا دەبێت، ئاخر ئەویش پێویستیی بەوە هەیە کەسێک دانی پێدا بنێت کە بەلایەوە بەڕێزە. لێرانەدا پەرژانە سەر سڤیدریگایلۆف تەواو لەجێیە، چونکە بەسەرهاتی ئەو بە شێوەیەکی کاتی پێش بەسەرهاتی ڕاسکۆلنیکۆف دەکەوێت و ئەو پرسەی کە چ شتێک ئەو ناچار بە خۆکوشتن دەکات، پرسێکی گرنگ و جێ‌مشتومڕە.

هەرچۆنێک بووە لێرانەدا ئەم ئاماژەیە بۆ پرسەکەی سڤیدریگایلۆف بەسە. سڤیدریگایلۆف بەبێ دانپێدانانی کەسێک کە بە بەڕێزی

دەزانێت، وەک داوێنپیسـێک کە تەنانەت ئیدی خۆشـی بێزی لێ دەکاتەوە، بە تەنیا پشـتی تێ دەکرێت. بە هەڵچوونەوە ئەو حوکمەی ڕاسـکۆلنیکۆف ڕەد دەکاتەوە کە دەڵێت ئەو «بێ لە داوێنپیسـێک» هیچی دیکە نییە. ئەویش کەوتووەتە دۆخێکی بەرگریلێنەکراوەوە، بەلام بەبێ هـاوکـاریی کەسـێک کە ئـامـاژە بە تـایبەتمەنـدییەکی شـەرەفمەندانەی ئەو بکات، لەو دۆخەدا تەنیا تاقە ڕێیەکی ڕاکردنی لە بەردەمدایە. سـەرەڕای ئەو کارە مرۆڤدۆسـتانە و چاکانەی کە بۆ کاریگەریدانان لەسـەر ڕاسـکۆلنیکۆف و دونیا دەیانکات، ئەوان هـاوکاریی نـاکەن. لە گفتوگۆکەیدا لەگەڵ دونیـا، پاڵنەرە دوولایەنە و لێڵەکانی بۆ خۆیشـی ئاشـکرا دەبن. ئەوسـا نەک هەر بە تەنیا دونیا، تەنانەت خۆشی خۆی ڕەد دەکاتەوە. جا پەلەپیتکەکە دەچرکێنێت.

## ڕێگەی هەڵهاتنی ڕاسکۆلنیکۆف

لەم کـاتەدا ڕاسـکۆلنیکۆف بـاوەش بۆ ئەو بەهـا مەسـیحیانەی سـەردەمی منداڵیی دەکاتەوە کە دایکی لە نامەی جێسـەرنجدا ئاماژەی پێ کردبوون. ئەو دایکی مـاچ دەکـات و لێی دەخوازێت دوعـای بۆ بکـات. بیرکردنەوەی خۆکوژی ڕەد دەکـاتەوە. ئەو بە پێچەوانەی سڤیدریگایلۆفەوە کەسـانی زۆر دەناسـێت کە ئامادەن «هەڵسـوکەوتی شـەرەفمەندانە»ی پشـتڕاسـت بکەنەوە و بڕوایان بە داهاتووی ئەو هەبێت: خێزانەکەی، ڕازومیخین و تەنانەت پۆرفیری پیترۆڤیچیش. ئەو بە پێچەوانەی سـڤیدریگایلۆفەوە، چواردەوری بە کەسـانێک نەتەنراوە کە بەردەوام هەڵسـوکەتە خراپەکـارانەکەیی بە چـاودا بـدەنەوە. لە ڕاسـتیدا ڕاسـکۆلنیکۆف ڕێگەی هەڵهاتنی لە «دۆخی بەرگریلێنەکراو» لە بەردەستدایە، گەرچی ئەمە ڕێگەیەکی خوازراو نییە، بەس هەمووان ئاماژەی پێ دەکەن.

ئەوەی کە ئەو ژنـانی چواردەوری خۆی ئـازار داوە، زیـاتر لە «ڕاسـتی»ی کوشـتنەکە ئەو دەخاتە ژێر کاریگەری و بە خۆی دەڵێت گەر تەنیا بووبا، هەموو شتێک بە باشی و خۆشی بەڕێوە دەچوو. بە دڵنیـاییەوە گەر تەنیـا بووبـا –گەر نـامەیەکی لەلایەن دایکییەوە پێ نەگەیشتبووبا و مەسەلەی سۆنیاش لەئارادا نەبووبا– بۆی هەبوو بە هیچ شێوەیەک لەو کوشتنانەوە نەگلێت (ئەو هەمیشە دووەم کوشتن لە یاد دەکات). ئەگەر ڕاسـکۆلنیکۆف هەر بە ڕاسـتی «قسـەیەکی تازە»ی بۆ مرۆڤایەتی هەبا و هاوڕێیانێکیش کە ببووبانە هاوبەشـی، ئەوسا «تاوانەکەی» لە دیدی خۆی و ئەوانی دیکەوە بە جۆرێکی دی دەردەکەوت. ئەوسـا ڕازومیخین بەوە ورەی دەدایە بەرخۆی کە بۆی هەیە لە پلانێکی سیاسییانەوە گلاندبێت، وەلێ ئەو نە قسەیەکی تازەی هەیە و نە هیچ هاوڕایەکیش.

تەکنیکەکانی شـێواندنی هەسـت و هۆش بە شـێوەیەکی ناتەبا و پلەبەپلە دۆخەکەیان ڕوون و ئاشـکرا کردووە، بەڵام ئەم بابەتە بەو جۆرەش سـەرنجڕاکێش نییە کە دەردەکەوێت. هەر بەو جۆرەی کە لینگ لەبارەی یەکەمین ڕێکاری سـیرلزەوە گوتوویەتی (ڕاکێشـانی سەرنج بۆ ئەو لایەنانەی کەسـایەتی کە لەگەڵ ئەو لایەنانەدا جیاوازن کە تاک بۆ کەسایەتیی خۆی وێنا کردوون)، دەروونشیکارانیش سوود لەم ڕێکارانە وەردەگرن. بەم پێیە پرسـیارێک دێتە پێش: ئەم ڕێکارە کەی دەبێتە هۆی ڕزگاربوون و کەی بە پێچەوانەوە دەبێت. وەڵامی ئەو ئەمەیە کە لەم بـابەتـانەدا چـارەسـەرکردن پێویسـت بە شەونوکەوکردنی کۆمەڵێک ئەگەر دەکات کە لەسەر بنەمای سیستمە خەیاڵییە هاوبەشەکان دەخرێنە ڕوو. دەبێت دابڕانێک بەرچاو بکەوێت. کـاتێـک ئەوە دەرکەوت و بۆ یەکەمین جـار ڕووبەڕووبوونەوەیەک لەگەڵیدا هاتە ئارا، ئەوسـا پەرێشـانی دەگۆڕێت بۆ دژبەرەکەی». ڕاسـکۆلنیکۆف سـەردەمێکی دوورودرێژ سـەرلەبەری ئـامـاژە

ســــۆزدارییەکانی ئیدراکی خۆی دیون، کەچی تا دواهەمین ســــاتیش ڕووبەڕوویان نابێتەوە.

ئەوەی کە گۆشــەنیگای ژنان بەســـەر زەینی ڕاســکۆلنیکۆفدا زاڵە (تەنانەت پۆرفێری پیترۆڤیچیش چەند تایبەتمەندییەکی ژنانەی هەن، هەروەها ئاماژە بە دیدگەی دەزگیرانەکەی ڕاســکۆلنیکۆفیش کراوە لە ڕابردوودا) لەوانەیە بۆ ئەو کەسانە جێسەرنج بێت کە بانگەشەی ئەوە دەکەن ژنان لە ڕۆمانەکانی دۆستۆیڤسکیدا ڕۆڵێکی لاوەکییان هەیە. تا ئەو شــــوێنەی کە وایە، دوور نییە ئامادەیی چالاکترانەی ژنان لەم ڕۆمانەدا نیشــــانەیەکی پووچەڵکردنەوەی پێکهاتەشــــکێن بێت کە لە گەمژەدا دەگاتە ترۆپک، بەڵام نووسەر ناچار بوو بە کێشانی ڕەنجێکی زۆر لە ڕەوتی دەستنووســە زۆرەکانی خۆیدا چەندان جار ئەوە تاقی بکاتەوە. تایبەمەندییەکی دیاری گوتاریی کەســـایەتییەکان لە *تاوان و سزا*دا، ڕەوشــی کەســایەتییەکانی کە بەڵگە (هەمیشــە قســەی ئەوانی دی) وەردەگرن و بۆ دروســـتکردنی چیرۆکگەلی پەســـەندکراو بەڵام نەســـەلمێندراو، لەســـەر بنەمای لۆژیکی «دەروونناســـی»، بەکاری دەهێنن. ئەم خــاڵە نەک هەر بە تەنیــا لەبــارەی گفتوگۆکــانی ڕاســکۆلنیکۆف و پۆرفێرییەوە، بەڵکە کەم تا زۆر لەبارەی هەرهەموو کەسایەتییەکانەوە ڕاستە. کاترینا ئیڤانۆڤنا و پولخێریا ئالێکســاندرۆڤنا بەتایبەت لەم بوارەدا دەستێکی باڵایان هەیە و فکری بەتاڵ و خەون و خەیاڵ ڕۆڵێکی ئێجگار کاریگەر لە ژیانی ئەم کەســانەدا دەگێڕن. خاڵی جێســـەرنج ئەوەیە کە ئەم ڕۆمانە ڕەخنەگرانی ناچار کردووە کتومت دەســـــت بدەنە ئەم کــارە. بەکــارهێنــانی ئەم ڕێکــارە، کــارابوونی ڕێکارەکانی شــــێتکردنی ئەوانی دیکە ســـــانا دەکات. بەس لە هیچ شــــوێنێکی ئەم ڕۆمانەدا ئاماژە بەوە ناکرێت کە خودی گێڕەرەوەش دەچێتە ئەم چوارچێوەیەوە یان ئەوەی کە کاریگەرییەکی هاوشــێوەی بەسەر خوێنەرانەوە هەیە. ئەم پرسە لە ڕۆمانی دواتری دۆستۆیڤسکیدا کە گەمژەیە، زیاتر بەرجەستە دەبێت.

# پەیوەندیی بیستیاریی ڕاسکۆڵنیکۆف
# لە بیستنەوە تا گوێگرتن

دانیل شومان، زانکۆی بامبرگ، بایرن - ئەڵمانیا

## دۆستۆیڤسکی و دەروونناسیی دەرککردن

لەنێو ئەو گوتارە پەیدۆز[1] و جێباسە زۆرانەی کە پەیوەستن بە توێژینەوە لە بەرهەمەکانی دۆستۆیڤسکی، ئەم پرسەش خراوەتە بەرباس کە ئایا ئەو کەسایەتیانەی نووسەری ڕووسی ئافراندوونی، قایلکەرن؟ نیچە ڕستەیەکی بەناوبانگی هەیە: *دۆستۆیڤسکی تاکە دەروونناسە کە توانیی شتێکم فێر بکات*[2]. شتێکی سەیرە کە وێڕای ئەوەی سەدە و نیوێک تێپەڕیوە و توێژینەوەی دەروونناسی وردەکارییەکی زیاتر لەوەی بۆ زەینی مرۆڤ زیاد کردووە کە دۆستۆیڤسکی و نیچە توانییان ببینن، کەچی ئەم ڕستەیە هێشتا لەلای بەشێکی زۆر لە خوێنەران سەنگی خۆی لەدەست نەداوە. لەگەڵ ئەوەشدا، دەبێت بیرمان بێت کە هەموو خوێنەرانی هەڵبژاردە ئەو

---

١. پەیدۆز یان پەیدۆزی: کار و ڕەوتی کون، چاڵ، یان کەلێنخستنە شت یان بابەتێک، بۆ شرۆڤە و لێکدانەوە.

٢. لیف شستۆف، فەیلەسووفی ڕووسی، لە ساڵی ١٩٠٢دا ئەم ڕستەیەی گواستەوە و لەوەودوا چەندان جار لە زەمینەگەلی جیاوازدا گوتراوەتەوە. «و. ف»

ستایشە پڕ لە جۆش‌وخرۆشەی نیچە لەبارەی دیدی دەروونناسانەی دۆستۆیڤسکییەوە پەسەند ناکەن. یەکێک لەو کەسانەی کە لەگەڵ هەڵوێستەکەی نیچە و بڕێکی دیکەی هزرڤانانـدا نـاکۆکە، خودی کەسـایەتیی ڤلادیمیر نابۆکۆفە کە لە *گوتارگەلێک دەربارەی ئەدەبیاتی ڕووس*دا کەم تا زۆر ڕەخنە لە هەموو کەسایەتییە سەرەکییەکانی دۆستۆیڤسکی و بەتایبەت کەسایەتییە ژنەکانی دەگرێت. ئەو هەڵسەنگاندنەی کە نابۆکۆف بۆ دۆستۆیڤسکیی دەکات، بەو بەدبینییە ناسراوەشییەوە لە بابەتی بانگەشەی دەروونناسیدا، بە شێوەیەکی گشتی نەیتوانیوە لەم خاڵە زیاتر بڕوات کە *بەرهەڤۆکی کەسایەتییەکانی ئەو کەم تا زۆر لە دەروونتژاکاو و شێتەکاندا سنووردار دەبێت*.

لەگەڵ ئەمەشدا، ئەگەر ڕێگەکەی نیچە بگرینە بەر، لەوانەیە ئێمەش دۆستۆیڤسکی بە مامۆستای ڕێچاری دەروونزانیی وەرگرتن، بەتایبەت لە جۆرە لاڕێیانەکەی سەبارەت بە وەرگرتنی گشتەوە بزانین. یەکێک لە ڕێدۆزە ڕێتێچووەکانی دەروونناسی لە خوێندنەوەی دۆستۆیڤسکیدا، دۆزینەوەی ڕەگی هۆکارگەلی پێکهێنەری ئەم وەرگرتنە لاڕێیانە جۆراوجۆرانەیە. بەم پێیە، دەکرێت لە پێکهاتەی دەروونناسیی کەسایەتییەکانی دۆستۆیڤسکیدا بگەینە دیدێکی بەبایەخ؛ کە زۆربەیان کەسانێکن بە حەزگەلێکی چەندپارچەوە لەبارەی ئەوەی کە دەیبینن، دەیبیستن و هەستی پێدەکەن. لەنێو ئەو کەسایەتیانەی کە ئەم نووسەرە ڕووسییە دەیانئافرێنێت، چەندان و چەندان جار کێشمەکێشی نێوان شێوەگەلی تێگەیشتنی ناکۆک لە جیهان بەرچاو دەکەوێت: دەکرێت کەسایەتییەکی وەک *کۆلیادکین* لە ڕۆمانی *هاوزا*دا شتگەلێک و کەسانێک ببینێت کە بوونێکی ڕاستەقینەیان نییە و یان دەشێت پیاوی ژێرزەمینی وای بۆ بچێت کە *دوو کەڕەت دوو دەکاتە* پێنج، تەنانەت لە کاتێکیشدا کە خۆی دەزانێت ئەمە پێچەوانەی هەموو بەڵگە دیدەوانییەکانە. لە بەرهەمی دۆستۆیڤسکیدا هەمیشە سنووری نێوان

بۆچوونی وەهماویی بیستیاری و نارێکییە جۆراوجۆرەکانی دەرککردن نارِوونە.

ئەوەی کە بەردەوام دۆستۆیفسکی تیشک دەخاتە سەر بەهەڵەلێکدانەوەی واقعیەت، دەکرێت لەوەوە سەرچاوە بگرێت کە نووسەر لە سەردەمێکدا دەژیا و کاری دەکرد کە پەرەسەندنی زانست و تەکنەلۆژیا نەک هەر بە تەنیا کاریگەرییەکی قووڵی لە گۆڕانە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکاندا هەبووە، بەڵکە گۆڕانکاریشی بەسەر چۆنیەتیی خوێندنەوەی جیهانی دەوروبەریشدا لەلایەن تاکەوە هەبووە. بەرفراوانبوونی بڵاوکراوە کاتییەکان و پێشوازیلێکردنیان لەلایەن بەشێکی زۆری خەڵکییەوە لە ناوەندە شارییەکانی ئیمپراتۆریەتی رووسیادا، وا نیشان دەدات کە لە سەردەمی ژیانی دۆستۆیفسکیدا *ئەلفوبێ* و لە ئەنجامدا *هەستەوەری چاو* بۆ تێگەیشتنی لێکەوتە لێکترنجاوەکان و بە شێوەیەکی گشتی بۆ تێگەیشتنی واقعیەت گرنگییەکی زۆری پەیدا کردووە. لە هەمان کاتدا، لە زۆربەی بەشە لادێییەکانی وڵاتەکەدا، کۆمەڵگە بە شێوەیەکی گشتی پشتی بە نەریتی زارەکی و بیستیاری بەستبوو. دۆستۆیفسکی بە کارە ڕۆژنامەوانییەکانی، چالاکانە لە ڕەوتی بەخشینی *چاو* لەبەرانبەر *گوێ*دا بە خەڵکی رووسیا بەشدار بوو و هاوکات کاریگەرییە لابەلاییە کۆمەڵایەتی و دەروونناسانەکانی ئەو ڕەوتەش نیشان دەدات. لە دوو ناوەندی سەرەکیی ڕووسیادا (مۆسکۆ و پیتەربورگ)، ئەم دوو جۆرە کاریگەرییەی تێگەیشتنی هەستی -بینین و بیستن- توندترین ڕووبەڕووبوونەوەیان هەبوو و دژبەریی *چاو* لەبەرانبەر *گوێ*دا بە ئاشکرایی کاریگەرییەکی لاوازکەری لەسەر بەشێکی زۆری کەسایەتییە سەرەکییەکانی دۆستۆیفسکی دانا. ئەوان زۆربەیان ناتوانن شێوە جۆراوجۆرەکانی دەرککردنی جیهان لەگەڵ یەکدیدا بسازێنن. وەک چۆن لەبارەی گۆلیادکینی ئێجگار بەرزەفڕی کارمەندی

میری لە ڕۆمـانی *مـاوزا*دا خراوەتەوە ڕوو، دەکرێـت بێتوانـایی لە هەماهەنگکردنی تێگەیشـتنە تاکەکەسـییەکان لەگەڵ ئەوەدا کە ئەوانی دی دەیبینن، کۆتاییەکەی شێتی بێت، هەر لەم بارەیەوە دۆستۆیڤسکی لە *یادداشـتە* ژێرزەمینییە*کان*دا دەپەرژێتە سـەر کەسـاسـیی پاڵەوانی مۆدێرن. پاڵەوانە مۆدێرنەکەی ئەو بە پێداگریی کەللەڕەقانەی لەسـەر تێگەیشـتنە تاکەکەسـییەکانی لەبارەی واقیعیەتەوە کە بە ڕوونی لەگەڵ بەڵگە دیدەییەکاندا ناکۆکن، خۆی تووشی دوورەپەرێزی کردووە.

وا دیارە *تاوان و سزا* لەچاو بەرهەمەکانی دیکەی دۆستۆیڤسکیدا، بۆ لێکۆڵینەوە لەم بابەتە، زەمینەیەکی باشـترمان دەخاتە بەردەسـت؛ ڕەگی ڕۆمانەکە کە بە قووڵی لە جیهانی بچووکی شـاریی پیتەربورگی دەیەی ١٨٦٠دایە؛ ئەو شـارەی کە *مارتی شـتیفر* وای وەسـف دەکات کە لەبەردەم گۆڕانکاریی دەنگیی شـاری بچووک بۆ گەورەشـاردایە. لەم کەشەدایە کە دۆستۆیڤسکی کەسایەتیی سەرەکیی خۆی (ڕۆدیۆن ڕۆمانۆڤیچ ڕاسـکۆڵنیکۆف)ی خوێندکاری وازهێناو لە خوێندنی ماف، دەئافرێنێت. ڕاسـکۆڵنیکۆف ئالیۆنا ئیڤانۆڤنا و خوشـکەکەی دەکوژێت، بەڵام لە کۆتاییدا، خۆی دەداتە دەسـت پۆلیس. وا دێتە بەرچاو بنەمای پتەوی *تاوان و سـزا*، لێهاتوویی دۆسـتۆیڤسـکییە لە ئافراندنی بەرهەمێکی هونەریی ئـاڵۆزدا کە ڕۆجەر ئەنـدرسـن بە *جـارڕەدەری قەیرانی ڕوولەکەڵەکەبوونی ئەورووپا لە بواری پێشـکەوتنی مرۆیی و بـاوەڕی دینی* نـاوی دەبـات، نەک بە تەنیـا ئـافرانـدنی وێنەیەکی دۆشداهێنەری پیتەربورگ لە دەیەی ساڵی ١٨٦٠دا. ڕۆمانەکە، لێزانانە کرۆکی پێشـکەوتن لەبەرانبەر *باوەڕ*دا بە خسـتنەپاڵیەکدیی بینین و بیسـتن لێک دەچنێت؛ ئەو لایەنەی کە وا دیارە لەنێوان ئەو هەموو خوێندنەوە ئایینیانەی کە تا ئێستە بۆ ئەو دەقە کراون، کەمتر سەرنجی لێ دراوە. ئەم نووسراوەیە هەوڵ دەدات لە یەکەمین ڕۆمانی گەورەی

دۆستۆیفسکی لەنێو پێنج ڕۆمانە قەبارەگەورەکەیدا، بە گواستنەوەی سەرنج لە بێژەرەوە بۆ بیسەر، هاوسەنگییەک بهێنێتە ئارا.

١

## ئاوێتەبوونی دەروونناسی، کۆمەڵناسی و خواناسی

*تاوان و سزا* زیاتر لە ڕۆمانەکانی دیکەی دۆستۆیفسکی نیشانی دەدات کە دەکرێت سەرنجخستنە سەر لایەنە جۆراوجۆرەکانی وەرگرتنی بیستیاری و ڕەمزداریکراو لە دەقدا، ڕێدۆزێکی ئێجگار کارا بێت بۆ شرۆڤەکردنی بەرهەمەکانی ئەو. بێ گومان لێکدانەوەی بەرهەمەکانی دۆستۆیفسکی لەسایەی میخاییل باختین و داهێنانی چەمکی ڕۆمانی فرەدەنگییەوەیە لەلایەن ئەوەوە؛ جۆرێک لە ڕۆمان بە شێوەیەکی پێکرایی دەنگە نارەزا و ناکۆکەکان، کە نووسەر و گێڕەرەوەکەی هیچ دەنگێکی تایبەتی نەخستووەتە سەرووی ئەوانی دیکەوە. دۆزینەوەکانی باختین لەگەڵ یارمەتیدان بۆ شیکردنەوەی هەندێک لە داهێنانە شێوازییەکان، ڕێدۆزێکی ئاراستەداریش دەهێننە ئارا کە زیاتر تیشک دەخاتە سەر گوتن نەک بیستن و گوێگرتن: زۆرێک لە نووسەرانی پەیوەست بە قوتابخانەی ڕەخنەی باختین، وێڕای تامەزرۆیی بۆ پاڵپشتیکردنی ئەو بانگەشەیەی کە دۆستۆیفسکی باوکی ڕۆمانی گفتوگۆییە، بە شێوەیەکی گشتی گرنگیی بیستن و گوێگرتنیان لە پەیوەندیدا پشتگوێ خستووە. بەم پێیە، تەنانەت لێدوانی ڕەخنەیی پێشەنگانەی کەرنەڤاڵی باختینیش جەختی لەسەر ئەم لایەنە نەکردووەتەوە. وا دیارە بەشێکی زۆری ڕەخنەی دۆستۆیفسکی تایبەتە بە تێگەیشتنی سینەمایی، نمایشی، مۆسیقایی و... کە ئەوانیش بە چڕکردنەوەیەکی زیاتری سەرنج لەسەر وێنا و کەشی دیدار، دیوە بیستیارییەکەی ڕۆمانی دۆستۆیفسکییان پشتگوێ خستووە.

*تاوان و سزا* لەڕێی ناوەڕۆکی وەرگرتنی بیستیارییەوە، دەکرێت نموونەیەکی ئاشکرای وێنای ڕووسیا بێت لە سەردەمی سەختی قەیرانی قووڵی فەرهەنگیدا. دۆستۆیفسکی *تاوان و سزای* لە سەردەمێکدا نووسی کە بە گەشەکردنی دەسەڵاتی حکومەت و بەرئەرکبوونی بۆ گرتنی تاوانباران، ڕۆڵی مەعنەویی کڵێسای ئەرسەدۆکس بە خێرایی لاواز بوو. هەروەها دەیەی ١٨٦٠ شایەتی شەپۆلی کۆچێکی بەرفراوان بوو بۆ ناوەندە شارییەکانی ڕووسیا کە بە واتای لەناوچوونی پلەبەپلەی گرنگیی پێشینی خێزان دێت وەک ناوەندێکی ئاکاری و ئابووری. ڕووسیا بە ڕەوتی تێپەڕاندنی نموونە لادێییە پشتئەستوورەکان بە فەرهەنگی بیستیاری و زارەرەکیی ژیاندا تێدەپەڕی و، لێکەوتەی بێچەندوچۆنی ئەوەش، لەدەستدانی دەستکەوتە ئاکارییەکان بوو. دۆستۆیفسکی لە *تاوان و سزا*دا بە داڕشتنی بنەڕەتی گەلاڵەی ڕۆمانەکە لەبارەی ناوەڕۆکی دەرکی بیستیارییەوە، پەرژاوەتە سەر ئەم پرسە و پرسیارگەلێکی بنەڕەتی دەخاتە بەرباس، بۆ نموونە: جیاوازیی نێوان بیستن و گوێگرتن چییە؟ دەبێت گوێ لە کام دەنگانە بگرین؟ بیستن و گوێگرتن لە جیهاندا چ ڕۆڵێکیان هەیە؟

٢

## دوولایەنیی بیستن و گوێگرتن

گەر چاوێک بە پێرستی *وشەکانی تاوان و سزای دۆستۆیسڤکیی* ئاندو ئاتسوشی، ئورای یاسو و موشیزاکی تسودا بخشێنین، بە ئاسانی دەتوانین گرنگیی بیستن و گوێگرتن وەک تێمایەکی پتەو کە پێکهاتەی *تاوان و سزا* ساز دەدات، هەڵبسەنگێنین. ئەوە وەک بانگەشەیەکی بێمانا دەردەکەوێت گەر بڵێین لە ڕۆمانی دۆستۆیفسکیدا

بیستن وەک پانتاییەکی دەستەوشەیی لە بینین گرنگترە، بەڵام بە دڵنیاییەوە ئاماری ئەو دەستەوشانەی ژێرەوە شیاوی تێڕامانە:

*گوێگرتن* – ١٩ جار

*بیستن لەبارەی شتێکەوە* – ٥١ جار

*بیستن (کردن)ی بۆنی شتێک* – ٢١١ جار

*بە هەڵکەوت بیستن، گوێگرتن بە دزییەوە* – ١٠ دار

*گوێدانە شتێک* – ٦١ دار

هەمەجۆریی ئەو وشانەی کە ئاماژە بە شێوەگەلی وەرگرتنی بیستیاری دەکەن، نیشاندەری دەوڵەمەندیی ئەو ماناسازیانەن کە دۆستۆیفسکی دەیانخاتە بەردەست خوێنەرانەوە. هەر بەو جۆرەی کە لە دەقەکەدا ئاماژەی بۆ کرا، دەکرێت بیستن ببێتە کەرەستەیەکی شیاو بۆ هێنانەدیی پەیوەندییەکی باشی کۆمەڵایەتی، بەڵام هاوکات ڕێشی تێدەچێت لە ڕووی دەروونناسی و ئاکارییەوە لە کەسایەتیی تاکەکاندا لادان دروست بکات. هەر چۆنێک بووە ئەم نیشانە دەستەوشەییە ئەوە دەردەخات کە دۆستۆیفسکی لە *تاوان و سزادا*، بێ شک، بەرگری لە پێچەوانەیی ئەوە دەکات کە مەک لوئین بە نموونەی ئاشکرای نەریتی پاشگۆتەنبێرگیی دادەنێت: دەکرێت گۆڕانکاریی ڕاسکۆڵنیکۆف بە هەوڵێک بزانین بۆ زاڵبوونی *گوێ* بەسەر *چاو*دا.[1]

---

١. لەوانەیە سەرقاڵیی دۆستۆیفسکی بە بیستیاری و مانا وێرانیە دینییەکەی لە *تاوان و سزادا*، هۆکاری دیدی توندی ڕەخنەیی نابۆکۆف بێت لەم بەرهەمە: من نە

راسکۆلنیکۆف لە کەشێکی دێهاتیانەدا گەورە بووە، لەژێر ڕکێفی قسەوقسەلۆک، فرەڕێسی، پەیوەندیی زارەکی/بیستیاری و لە ئەنجامدا، گوێ. لەبەرانبەردا، پایتەختی ڕووسیا شوێنێکە کە تێیدا ئەم نەریتە کۆنە لە هەموو لایەنێکەوە شوێنی خۆی بۆ خوێندنەوە، نووسین، شانۆ، بەرهەمی هونەری و بڵاوکراوە وێنەدارەکان چۆڵ کردووە. راسکۆلنیکۆف لە ئەنجامی فێربوونی شیاو و پەیوەندییەکی کەم تا زۆر نزیک لەگەڵ دایک و خوشکیدا کە هێشتا بەشێکن لە ژینگە دێهاتییە بیستیاریتەوەرەییەکەیان، ئەم چوار کارامەییە سەرەکییەی پەیوەندی پێکەوە گرێ دەدات: بیستن/گوێگرتن، گوتن، خوێندنەوە و نووسین. پێدەچێت تراژیدیای ئەو لێرەوە سەرچاوە بگرێت کە زۆربەی کات هەڵسوکەوتی ئەو لەنێوان هەردووک لایەنی دژبەری وەرگرتن و کاردانەوە لەبەرانبەر جیهانی دەوروبەردا جۆلانێ دەکات. ئەو بە بڵاوکردنەوەی گوتارێک لە گۆڤارێکدا خەریکە دەبێتە مرۆڤی چاو. لەگەڵ ئەمەشدا، ئەو کاتەی کە واز لە زانکۆ دەهێنێت و پلانە کارەساتبارەکەی جێبەجێ دەکات، خەریکە جارێکی دیکە دەبێتەوە بە مرۆڤی گوێ و تەنانەت دوای کوشتنەکەش، دەگەڕێتەوە بۆ دۆخی پێشفێربوونی بیستیاریی غەریزی.

بەم جۆرە، راسکۆلنیکۆف بە یارمەتیی سۆنیا دەتوانێت لەڕێی گوێگرتن لە کتێبی پیرۆزەوە، بینین و بیستن بخاتە ئاستی یەکدییەوە. دۆستۆیڤسکی لادانی ئاکاریی راسکۆلنیکۆف (کە وەهمی سەرپشکبوون ئەوی بەرەو کوشتنی ئالیۆنا ئیڤانۆڤنا بردووە) بە دوو بنەماوە گرێ دەدات: ئەو ئایدیا ناپلیۆنییەی کە بنەڕەتەکەی تێگەیشتنێکی بەلاڕێدابراوە لە واقعیەت –هۆکارەکەی ئاشناییەکی کەم تا زۆر ڕووکەشیی ئەوە بۆ مێژووی ئەورووپا– هەروەها گفتوگۆی

---

*گوێیەکی مۆسیقیم هەیە و نە گوێی بیستنی دەنگی دۆستۆیڤسکی پەیامبەر، هەڵبەتە بەوپەڕی داخەوە! «و. ف»*

بەهەڵکەوتی نێوان خوێندکار و ئەفسەرێکی سوپا کە ڕاسکۆڵنیکۆف ماوەیەک بەر لە کوشتنەکە لە مەیخانەدا گوێی لێ دەبێت. کاتێک خوێندکارەکە باسی چاوبرسییەتی ئالیۆنا ئیڤانا بۆ بەرانبەرەکەی دەکات و ئەوەی کە بە کوشتنی ئەو و دزینی سامانەکەی هەست بە هیچ ئازارێکی ویژدان ناکات، ڕاسکۆڵنیکۆف گوێی هەڵخستووە و زیاتر و زیاتر لە خەیاڵاتە لادەرانەکانی خۆیدا لەبارەی *مرۆڤە ڕیزپەڕەکانەوە*، کە بە هیچ شێوەیەک وابەستەی بنەما ئاکارییەکان نین، ڕۆدەچێت. پێشڕەویی ڕاسکۆڵنیکۆف لە جڵەوشلکردن بۆ یارییە زەینییە کارەساتبارەکان تا تووشبوونی کردەیی تاوانەکە، نیشانی دەدات کە ئەم جۆری گوێگرتنە، بەهەڵکەوتبیستنی قسەی خەڵکی و گوێهەڵخستن، نەک هەر بە تەنیا لە خۆیدا لەڕووی کۆمەڵایەتی و دەروونناسییەوە زیانبارە، بگرە دەکرێت بە بەلاڕێداچوونێکی ئاکاریی پیسیشدا بشکێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە دۆستۆیڤسکی بە سەرنجەوە گێڕەرەوەکەی ڕادەسپێرێت تا ڕەخنەی ئاکاریی خۆی لەبارەی بیستنی *کوێرانە* و *بە دزییەوە* بشارێتەوە، وێنای سڤیدریگایلۆفی بە ڕواڵەت داوێنپیس و دەستدرێژیکەر –کە گوێهەڵخستنەکەی لە زۆربەی نموونە هاوشێوەکانی نێو ڕۆمانەکە جێسەرنجترە– تیشکێکی ئێجگار نەرێنی دەخاتە سەر بەشێک لە شێوەکانی وەرگرتنی بیستیاری لە ڕۆمانەکەدا.

لە بەشی یەکەمی *تاوان و سزا*شدا نموونەگەلی لەم جۆرە، کە ئاماژە بە نەرێنیبوونی *بیستن و گوێگرتن* دەکەن، بە شێوەیەکی چڕوپڕ دەست دەکەون. ئەم جۆرە ئاماژە نەرێنیانە لە کات و دەوروبەری دیمەنی کوشتنەکەدا دەگەنە ترۆپک. لەوێدایە کە کرۆکی وەرگرتنی بیستیاری بەردەوام خۆی نیشان دەدات، بۆ نموونە ئەو کاتەی کە سووخۆرەکە و ڕاسکۆڵنیکۆف بە جیا لە دوو سەری ماڵەکەی ئالیۆنا ئیڤانۆڤناوە گوێیان هەڵخستووە. ئەم جۆرە گوێهەڵخستنە کەمینبەستووانەییە، مرۆڤانە نییە؛ ئاژەڵان بۆ دووربوون

لە دۆخی مەترســـیدار و ئەوەی کە ژیانیان چ کاتێک لە مەترســـیدایە، هەســـتی بیســـتنی خۆیان بەکار دەهێنن. لەناو ئاژەڵانی ڕاوچیشـــدا گوێهەڵخستن بۆ دەستخستنی نێچیر، هەر دەچێتە ڕیزی ئەم بابەتەوە. ئەم جۆرە بیسـتیارییە، ئەندامی بیسـتن هەر بە تەنیا بۆ بەرژەوەندیی خۆخوازانە و مـانەوەتەوەر بەکـار دەهێنێت، بەبێ ســـەنجدان یـان ڕەچـاوکردنی ئـامـاژە کۆمەڵایەتییە فراوانترەکـانی هەڵســـوکەوتی تاکەکەسی.

ڕاســـکۆلنیکۆف دوای کوشـــتنی ئەو دوو پیرێژنە بە تەور و لەو کاتەی کە لە ئەپارتمانێکی خاڵیدا خۆی شـــاردووەتەوە، بە گوێگرتنی غەریزی دەتوانێت خۆی لەو گێچەڵە ڕزگار بکات. لەم هەلومەرجەدا، هەسـتی بیسـتیاری یادگارییەکی پێش‌ئاکاریی ڕابردووی مرۆڤە کە لە باوانەوە جێ ماوە، ســـەردەمێک کە هەڵســـوکەوت مرۆڤی ئاراســـتە دەکرد تا بە پێویستی بزانێت لەبەرانبەر مەترسیی کارەساتباردا سوود لە هەستوهۆش وەرگرێت، بەڵام ڕاسکۆلنیکۆف بە ئاشکرا لە توخمی مرۆڤی نائاکاری، یان بە دەربڕینێکی دی، بەو جۆرەی کە خۆی بۆی دەچێت، لە توخمی پاشئاکاری نییە، هەر بەو جۆرەی کە دۆستۆیڤسکی بە شـــێوەیەکی لێوەشـــاوانە خۆدوێنییە دەروونییەکانی کەســـایەتیی ســـەرەکی لەگەڵ گوتە واقعییەکانی و ڕوونکردنەوەکانی گێڕەرەوەدا لێک دەچنێت، دەردەکەوێت کە بانگی ویژدانی ڕاســـکۆلنیکۆف بەو ئاسـانییە کە لە داڕشـتنی بیرۆکە دلێرانەکەیدا لەبارەی مرۆڤە ڕیزپەڕە ناپلیۆنییەکانەوە هـاتووە، نـاتوانێت کپ ببێتەوە. ڕاســـکۆلنیکۆف تـا ماوەیەک لە لێواری جۆرێک لە گۆڕانی کەســـایەتیی شـــیزۆفرنیدا[1]

---

١. شیزۆفرینیا: جۆرە نەخۆشییەکی دەروونییە کە هەرەس بە بیری تاک دەهێنێت و لەم نەخۆشـییەدا تێگەیشـتنی کەسـی تووشـبوو بۆ واقعیەت بە جۆرێکی نائاسـایی دەبێت. گەرچی تا ئێستە هۆکارەکانی نەخۆشـیی شـیزۆفرینیا دیاری نەکراون، بەڵام هۆکارە بۆماوەییەکان لەم نەخۆشـــییەدا ڕۆڵیان هەیە. گرنگترین نیشـــانەکانی ئەم

ڕاوەستاوە و وا دەردەکەوێت بە هەڵکەوت نەبێت کە دۆستۆیڤسکی ئەم لەدەستدانە نزیکەی ڕێنوێنیکردنە دەرکییەی لەڕێی وەهمێکی بیستیارییەوە نیشان داوە: وێنای شەقکاریکردنی خاتوونی خاوەنماڵ لەلایەن ئیلیا پیترۆڤیچی ئەفسەری پلەبەرزی پۆلیسەوە. لەم دۆخەدا، خەیاڵڕێسیی ڕاسکۆڵنیکۆف لەژێر گوشاری توندی تاواندا بڵێسە دەدات، دۆخێک کە وا دیارە هۆکارەکەی برسییەتی و تای توندە. لەم دیمەنەدا دۆستۆیڤسکی هەواڵی ئەو شتە دەگەیەنێت کە دەکرێت بەبێ گوێپێدان و یارمەتیی کۆمەڵگە -کە ڕاسکۆڵنیکۆف یارمەتی و چاکەویستیی ئەوی لەدەست داوە- لە چاوەڕوانیی ئەودا بێت:

دونیا تاریک بوو کە قیڕەیەکی زراوبەر ڕایچڵەکاند. هاوار خوایە، ئەمە چ قیڕەیەک بوو؟ پاشانیش دەنگگەلی نائاسایی، ئاه و ناڵە، نەڕە، فرمێسک و کڕووزانەوە، تێهەڵدان و جنێوبارانێک کە لە تەمەنیدا نەیبیستبوو. وێنایەکی هێندە بەدفەڕانە و شەڕەنگێزییەکی وەها شێتئاسا بوو کە تەنانەت لە خەیاڵیشیدا جێگەی نەدەبووەوە. تۆقیوانە لە جێگەکەی دانیشت و وەخت بوو لەتاو ئەشکەنجە بێهۆش بکەوێت. وەلێ ئاژاوە و شیوەن و جنێوەکان تەشەنایان سەند. پاشان، لە بارێکی ئەقڵنەبڕدا دەنگی خاوەنماڵەکەیی هاتە گوێ. ژنەتیوە دەقریشکایەوە و دەیقیژاند و هێندە پەلەپەل و خێرا هەڵیتوپەڵیتی دەگوت و دەینالاند کە ڕاسکۆڵنیکۆف نەیدەتوانی تێبگات چی دەڵێت. بێگومان دەلالایەوە کە ئیدی لێی نەدەن، چونکە لە پلیکانەکاندا خەریکبوون دڵڕەقانە شەقکارییان دەکرد. دەنگی تۆقێنەری لێدەرەکە هێندە دڕندانە و شەڕەنگێزانە بوو کە کەم تا زۆر لە خێسەخێس دەچوو، بەڵام

---

نەخۆشییە: ١. بەدگومانی: گومانکردن لەوەی کە ئەوانی دیکە ئازاری دەدەن یان پیلانی لە دژ دەگێڕن. ٢. خەیالاتی سەیروسەمەرە: بڕوابوون بەوەی کە بوونەوەرگەلی نازەمینی مێشکی ئەو جڵەو دەکەن. ٣. وەهمی بینایی-بیستیاری: بینین یان بیستنی شتگەلێک کە لە واقعدا نین. ٤. بەدخوویی ٥. بێهەستبوون «و. ک»

ئەویش خۆی خەریـک بوو پەلەپەل و خێرا و نـاڕوون، بە پچڕپچڕی شـتگەلێکی دەگوت. ڕاسـکۆڵنیکۆف کتوپڕ سـەرتاپێی لەرزی لێ هـات، ئـاخر دەنگەکەی دەنـاسـییەوە: دەنگی ئیلیـا پیترۆڤیچ. ئیلیا پیترۆڤیچ لەوێ بوو و وا لە خاوەنماڵەکەی دەدا! وا داویەتە بەر لەقە و سـەری بە پلیکاندا دەکوتێ... وەک ڕۆژ ڕۆژشـنە، بە دەنگ و قیڕوهوڕەکەدا دیارە! چی بووە؟ دونیا سـەراونخوون بووەتەوە؟ دەیبیسـت کە وا کۆمەڵ کۆمەڵ لە نهۆمەکان و پلیکانەکانەوە دەڕژێنە دەرێ. دەنگی نیشـتەجێکانی دەژنی[1] و پرتەوبۆڵە و تانەکانیان؛ زرمەی دەرگە و تەقەلێدانیان. *ئاخر بۆ، لەبەر چی؟ باشـە وەها شـتێ چۆن ڕێی تێدەچێ؟* هەیتاهەیتا ئەمانەی دەگوتنەوە و هەر بە جددی بڕوای کردبوو کە ئاوەزیی لەدەسـت داوە. وەلێ نا، هەموو شـتێکی بە ڕوونی دەبیست!... بێگومان دواتریش سەرەی ئەو بوو. *تەواوە دەی، ئەم جارەیان لەسەر ئەو مەسەلەیەیە... لەسەر مەسەلەکەی دوێنێیە... خوایە!* تەنانەت نەیدەتوانی دەسـتیش هەڵبڕێت دەنا بێگومان دەرگەکەی کڵۆم دەکرد، هەرچەندە سـوودێکی ئەوتۆشـی نەبوو. تۆقین بە چەشنی دەستێکی سەهۆڵی دڵیی گوشی، ئەشکەنجەی دا و سڕی کرد...

زۆر زوو ڕوون دەبێتەوە کە ناسـتاسـیای خزمەتکاری ماڵەکە، هیچکـام لەو دەنگە تێکەڵوپێکەڵانەی نەبیسـتوون کە لە گوێی ڕاسـکۆڵنیکۆفدا زرنگاونەتەوە. چڕیی ئەم خەیاڵاتە بیسـتیارییە، بە ڕوونی ئاستی گەزنگازیی دەروونی ڕاسکۆڵنیکۆف دەردەخات، ئەمەش سـەرەڕای هەبوونی وەهمە ئایدیالیسـتییەکەی لەبارەی کەسـایەتیی ناپلیۆنیی خۆیەوە. ئەو لە ماوەی ڕۆژانی دواتردا پێشـوەختە و بە شـێوەیەکی ناڕاسـتەوخۆ وەک بکوژێک زیاد لە جارێک نهێنییەکەی

---

1. دەژنی: دەبیسـت؛ ئژنی؛ ئژنەوێ. ژنین: بیسـتن؛ ژنیەی؛ ئژنیەی. لە هەورامییەوە وەرگیراوە و نازانم بۆچی ئێستە بە هەڵە (ژنەفتن یان ژنەوتن) بەکار دەهێندرێت!

خۆی ئاشکرا دەکات، بەڵام دانی پێدا نانێت و بەرەبەرە تێدەگات کە لە دژی ئەو هیچ بەڵگەیەکی یەکلاییکەرەوەیان بەدەستەوە نییە. بەهەرحاڵ مەودای نێوان ئەوەی کە ڕاسکۆڵنیکۆف لە *تاوان و سزا*دا دەیبینێت و تێی دەگات و ئەوەش کە دەیبیستێت و هەستی پێ دەکات زیاتر دەبێت، بەرەبەرە ڕوون دەبێتەوە کە ئەو بە هیچ شێوەیەک ناتوانێت هاوسەنگیی فکریی خۆی لەو دۆخەدا بپارێزێت.

## ٣

## گوێگرتنی دژەکۆمەڵگە

لە باری بەرەوپێشچوونی ڕۆمانەکەدا، ناوەڕۆکی دەرککردنی بیستیاری بەرەبەرە لە ڕاسکۆڵنیکۆفەوە تەشەنا دەکاتە ناو دوو کەسایەتیی دیکەش: پۆرفیری پیترۆڤیچی لێکۆڵەر و سڤیدریگایلۆفی چێژپەرست. ڕێک لەم دۆخەدایە کە چەمکی بیستن، کۆمەڵگە دەگەڕێنێتەوە نێو ژیانی ڕاسکۆڵنیکۆف. پۆرفیری خەریکە بە شێوەیەکی نائاسایی لێکۆڵینەوە لەگەڵ ڕاسکۆڵنیکۆفدا دەکات. ئەوەی کە ئەو دەیەوێت بیبیستێت دانپێدانانە و بەردەوام هەوڵ دەدات بە فێڵی ناکاوگیرکردن بگاتە ئامانجی خۆی و تەنانەت بۆ ئەم مەبەستە کەسێک ڕادەسپێرێت لە ژوورەکەی تەنیشتدا گوێ هەڵبخات. گەرچی کاتێک نیکۆلای بۆیەچی بەرپرسیارییەتیی کوشتنەکە دەگرێتە ئەستۆ، ئەم ڕاسپێردراوەی بیستن -ئەو چەرمچییەی کە ڕاسکۆڵنیکۆفی لە کاتی گەڕانەوەدا بۆ شوێنی کوشتنەکە دیوە- بەو ئەنجامە دەگات کە پۆرفیری لەخۆڕا گومانی لە ڕاسکۆڵنیکۆف کردووە و لە ئەنجامدا ئەم ڕێکارە شکست دەهێنێت.

ناوەڕۆکی گوێهەڵخستن بەرەبەرە ڕۆڵێکی سەربەندی (تەرجیعبەند)ی پەیدا دەکات کە نەخشەی لاوەکیی ڕۆمانەکە پێک دەهێنێت و جۆزێف فرانک بە دروستی ئەمە بە *ڤێریەیشن ماملۆستایانەی دۆستۆیڤسکی لە نەریتی گوێهەڵخستندا* وەسف دەکات. ئەم جۆرە گوێگرتنە، لە کۆتاییدا، دەبێتە تایبەتمەندیی دیاری سڤیدریگایلۆفی ناپابەند؛ کەسایەتییەکی ئێجگار ئاڵۆز کە لە زۆر لایەنەوە هاوشانێکی شیاوی ڕاسکۆڵنیکۆفە.

سڤیدریگایلۆف زۆر بە هەڵکەوت دەتوانێت ئەو کارە بکات کە پۆرفێری پیترۆڤیچ دەرەقەتی نەهاتووە: لەپشت دەرگەی تەنیشتەوە گوێ هەڵدەخات و دەتوانێت دانپێدانانەکەی ڕاسکۆڵنیکۆف لەبەردەم سۆنیادا ببیستێت. ئەمە ترۆپکی هێڵێکی درێژی تۆماتیکە کە بە وردی بە *تاوان و سزا*دا درێژ بووەتەوە و سەرنج دەخاتە سەر ئایدیای گوێهەڵخستنی بەمەبەست بۆ گفتوگۆی خەڵکی؛ ئەم هەڵسوکەوتە متمانەی بەرانبەر کە بنەمای کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییە، لەناو دەبات.

خاوەنی ئەو مەیخانەیەی کە مارمیلادۆفی هەمیشەمەستی ئێمە لەوێ لەبەردەم ڕاسکۆڵنیکۆفدا دانی پێدا دەنێت کە پارەی خێزانەکەیی بەفیڕۆ داوە، هیچ هەوڵێک بۆ شاردنەوەی گوێهەڵخستنە بەمەبەستەکەی نادات، بەڵام پۆرفێری و سڤیدریگایلۆف زیاتر لە هەموویان سوود لە گوێگرتنی بەمەبەست دەبەن. پۆرفێری دەتوانێت بانگەشە بکات کە ئەو کەسەی ڕایسپاردووە گوێ هەڵبخات، نوێنەری کۆمەڵگەیەکە کە ڕاسکۆڵنیکۆف بە ئاشکرا بنەما ئاکارییەکانی ئەوی پاشێل کردوون. سڤیدریگایلۆف، لە بەرانبەردا، ناتوانێت بانگەشە بکات کە ئەو جۆرە پاڵنەرە بەرزانەی هەبوونە. ئەو چێژپەرستێکە کە بەر لە هەر شتێک چێژ لەوە دەبات بە دزییەوە لە ژوورەکەی تەنیشتدا گوێ لە دانپێدانانەکەی ڕاسکۆڵنیکۆف بگرێت و لەزەت لە حەزی بیستیارییەکەی دەبات کە بەرەبەرە باجدانێکی کارەساتباری لێ

دەکەویتەوە. وا دەردەکەوێت کە هۆکاری وجوودیی ئەو، لەئەستۆگرتنی بەشێک لە تاوانگەلێکە کە بەرئەنجامی ئەو خراپەکارییانەیە کە تووشیان بووە، بۆ نموونە ئازاردانی جنسیی ئەو کچە کەڕ و لاڵەی کە دواتر خۆی دەکوژێت و هەروەها هەبوونی ڕۆڵێکی ناڕوون لە مەرگی هاوسەرەکەیدا.

ئەوەی کە ڕاسکۆلنیکۆف لە سڤیدریگایلۆف جیا دەکاتەوە، چۆنییەتیی پێشبردنی ئەزموونی گوێگرتنە لە نواندنی ئەم دوو کەسایەتییەدا لەلایەن دۆستۆیفسکییەوە[1]. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە، گرنگە ئاماژە بە چەند خاڵێکی گشتی لەبارەی مانای بیستیاری و گوێگرتنەوە بکەین. لەڕووی دەستەوشەیی و ماناییەوە، مانای هەردووک کارەکە تەواو ئاڵۆزە و دژبەریی باوی نێوان دەرککردنی بیستیاری وەک وەرگرتنێکی بیستیاریی کوێر و گوێگرتن وەک کارێکی چالاک و بەمەبەست لە توێژینەوەکانی کۆتاییدا ئێجگار بەهەندوەرنەگیراو بووە. سەرەڕای ئەوەی کە پانتایی واتایی هەردوو کردارەکە تا ڕادەیەکی دیاریکراو تێکەڵە، دەکرێت ئەم دوو وشەیە بۆ وەسفی ئاستگەلی دیاری پێکهاتەی زەینی، کۆمەڵایەتی و تەنانەت دەروونیی ڕاسکۆلنیکۆف بەکار ببرێن، کە لە بیستنەوە تا گوێگرتنی دژەکۆمەڵگە و لە کۆتاییدا گوێگرتنی کۆمەڵگەتەوەر و لەوانەیە تا بنەمایەکی مەعنەویش پەل بهاوێت. هەر لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی *تاوان و سزا*وە لە ساڵی ١٨٦٦دا، ئەوە جێی مشتومڕ بووە کە ئایا لە کۆتاییدا ڕاسکۆلنیکۆف ئیمانی بۆ گەڕاوەتەوە یان نا؟ بەشێک لە خوێنەران *ژیانی تازەی* ڕاسکۆلنیکۆفیان لە پاشگوتاری ڕۆمانەکەدا پەسەند نەکردووە؛ بۆ نموونە بۆ میخاییل باختین، کۆتایی *تاوان و سزا* بە

---

١. شایەنی باسە هەموو خوێنەران، لە ڕووی دەروونناسییەوە ڕاسکۆلنیکۆف و سڤیدریگایلۆف وەک دوو لێکچوو دەبینن و ئەو دووانە، هاوزا نا، بەڵام بە وێنەیەکی ئاوێنەیی یەکدی دادەنێن. «و. ک»

دڵنیاییەوە پاشگوتارێکی تاکبێژانەی ئاساییە، هاوکات هارۆڵد بلومیش کۆتایی رۆمانەکەی بە لاوە شیاو نییە:

هەردووکیان بێهاز و ژاکاو بوون و رەنگیان بە رووەوە نەبوو، بەڵام کازیوەی داهاتوویەکی نوێ درەوشابووە ئەو رووخسارە نەخۆش و بێرەنگانەوە و ژیانێکی تازە چاوەروانیی دەکردن. عەشق، دڵی هەریەکەیانی کردبووە سەرچاوەیەکی بێکۆتایی ژیان بۆ ئەوی دیکەیان.

بریاریان دا دان بە خۆیاندا بگرن و چاوەرێ بن. دەبوو حەوت ساڵی دیکە لەم دۆخەدا بەسەر بەرن و جا چ چەرمەسەرییەکی بێئامان و چ شادییەکی بێکۆتاییان لە بەردەمدا بوو! بەڵام راسکۆڵنیکۆف گەرابووەوە بۆ ژیان و خۆشی دەیزانی و لە سەرانسەری بوونیدا هەستی بەو نوێبوونەوەیە دەکرد، بەڵام سۆنیا؛ بۆ مەگەر ژیانی سۆنیا جیا بوو لە ژیانی ئەو؟

عەسری هەمان رۆژ، کە دەرگەی شوێنخەوی زیندان پێوە درا، راسکۆڵنیکۆف لەسەر تەختە لادارییەکەی راکشا و بیری لە سۆنیا کردەوە. تەنانەت بە درێژایی ئەو رۆژە بە خەیاڵیدا هاتبوو ئەو سزادراوانەی کە تا ئەو ساتە بە خوێنی ئەو تینوو بوون، ئیدی وا بە جۆرێکی دی لێی دەروانن. تەنانەت توانیبووشی سەری قسەیان لەگەڵدا بکاتەوە و ئەوانیش بە شێوەیەکی هاورێیانە وەڵامیان دابووەوە. ئێستە کە راکشابوو، ئەمانەی دەهاتنەوە بیر و لەبەرخۆوە بیری دەکردەوە کە دەبوو هەر وا بێت، بۆ مەگەر هەموو شتێک نەگۆرابوو و نوێ نەبووبووەوە؟

بەهەرحاڵ، وا دیتە بەرچاو کە بتوانرێت لە چوارچێوەی بیستیاریدا لە گۆرانکاریی راسکۆڵنیکۆف لە شێوازی دەرککردنی جیهانی دەوروبەریدا بکۆڵینەوە.

ڕسکانی ڕاسکۆڵنیکۆف لە ڕۆمانەکەدا لە قۆناغی بیستنەوە دەست پێدەکات و دیارە ئەمەش قۆناغێکی ئێجگار پێشمرۆییە. ڕاسکۆڵنیکۆفی بێناز و داخراو وەک ئاژەڵێکی برسی بە شەقامەکانی پایتەختی ڕووسیادا وێڵە، زۆر بە هەڵکەوت چەند گوتوبێژێکی بەر گوێ دەکەون، جۆرەها مۆسیقا و دەنگگەلی شاریش. بەم جۆرەیە کە ئەو خۆی لە ژاوەژاوی پیتەربورگدا نغرۆ دەکات. دەکرێت ئەم جۆرە لە وەرگرتنی بیستیاری لەڕێی گوێگرتنەوە، ببێتە پایە و بنەڕەتێک بۆ دەرککردنی گۆڕانکاریی کەشی ڕۆمانەکە. ئەم جۆرە لە وەرگرتنی بیستیاری پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بە قەڵەمڕەوی هەستگەلی وەک ترس، برسییەتی و چێژەوە هەیە، بەڵام لە کرۆکدا سوودەکەی کورتمەودایە و بەرییە لە ستراتیژیەتی درێژمەودا و پێوەرگەلی ڕوون لەبارەی شتێکەوە کە بیسەر دەیەوێت ببیستێت. خاڵی گرنگتر ئەوەیە کە ئەم جۆرە وەرگرتنە بیستیاریانە ستراتیژیی مانەوەن لە شارێکدا کە مەترسییەکی زۆری کۆمەڵایەتیی لەگەڵدایە. ڕاسکۆڵنیکۆف دەسووڕێتەوە و گوێ دەگرێت تا لەگەڵ کۆمەڵگەکەیدا پەیوەندی ببەستێت، کۆمەڵگەیەک کە ماوەیەکی زۆر بەر لە کوشتنەکە بە شێوەگەلی جۆراوجۆر خۆی لێی دابڕیوە: سەرەتا بە جێهێشتنی زێدگەکەی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ژیان لە پایتەختی ڕووسیادا، پاشانیش بە ئامادەنەبوون لە وانەکانی زانکۆدا، دوای ئەوەش، بە کێشمەکێش لەگەڵ یارییە زەینییە ترسناکەکانی، کە بنەڕەتەکەیان *ئایدیای ناپلێۆنیی*یە. بەبێ هاودەمێکی پشوودرێژ کە بتوانێت خەیاڵاتەکانی ڕاسکۆڵنیکۆف (کە لەڕێی گوێوە سەریان هەڵداوە) بگەڕێنێتەوە بۆ دیدگەیەکی کۆمەڵایەتی، وا دێتە بەرچاو ئەنجامی بێچەندوچۆنی زیادەڕۆییکردن لە گوێگرتنی کوێرانە یان گوێگرتنی خۆویستانە، بە پێوەرێک شێتی و گیرۆدەبوونی لێ بکەوێتەوە.

٤

## گوێگرتنی کۆمەڵایەتی

دۆستۆیڤسکی مۆڵەت دەداتە ڕاسکۆلنیکۆف تا بە پێچەوانەی سڤیدریگایلۆفەوە ڕێی جۆرێک لە گوێگرتن بگرێتە بەر کە سنوورە تەسکەکانی خۆویستی، ئاژەڵئاسایی و ململانێ تێدەپەڕێنێت. ئەم جۆرە گوێگرتنە، چەشنێکە لە وەرگرتنی دوولایەنە کە تێیدا بەها کۆمەڵایەتییەکان و ئیمانی هاوبەش ڕێخۆشکەرن بۆ هەڵبژاردنێکی وردی شتێک کە تاک دەیەوێت ببیستێت و ڕەخساندنی ئامادەبوونی کەسێکە کە تاک دەیەوێت گوێی لێ بگرێت. زۆر لەمێژە ئاماژە بەم خاڵە کراوە کە هەستی بیستیاری هۆکارێکی سەرەکییە بۆ پتەوی و یەکپارچەیی کۆمەڵگە. ئیمانوێل کانت ئاگاداری ئەم ڕاستییە بوو و لە پەیامەکەیدا (*خەڵکناسی لە دیدگەیەکی واقعگەرایانەوە*)، لە شیکردنەوەی دیتنی (موشاهەدە) گشتیی خۆیدا دەڵێیت کەسێک کە کەڕ بووە دواتر لە ژیاندا و لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە گەلێک خێراتر و ئێجگار قووڵتر لە کەسێک کە نابینایە تووشی گۆشەگیری دەبێت. وا دیارە بێمتمانەیی دیدی تاک، بۆ خۆی لە کۆتاییدا بە سستبوونی ڕایەڵە کۆمەڵایەتییەکان دوایی دێت. لەوانەیە هۆکارەکەی ئەوە بێت کە گوێگرتن لەلای کەسانی کەڕ کاریگەرییەکی ئەوتۆی نییە بۆ ڕەخساندنی وەرگرتنێکی دوولایەنە. بۆ ئەوان زۆرترین ڕێکارەکانی متمانەسازیی هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی پشتی بە هەستی بینین بەستووە.

له *تـاوان و ســـزادا*، گوێگرتنی دوولایەنە تـایبەتمەنـدیی نێوان ڕاسکۆڵنیکۆف و سۆنیایە، بەڵام زۆر لە پێشترەوە لەم ڕۆمانەدا ئاماژە بەم نـاوەڕۆکە کراوە. هەروەهـا پەیوەنـدییەکی جێســـەرنجی بە ڕایەڵەکانی خێزانەوە هەیە و یەکەمین ئاســـەوارەکانی ئەم جۆرە لە گوێگرتن لە گوتوبێژی نێوان ڕاســـکۆڵنیکۆف و باوکی ســـۆنیادا – مـارمیلادۆف، کۆنەکـارمەنـدی میری– دەردەکەوێـت. لە دیمەنی مەیخـانەکە و *یەکەمین دەرەوشـــانەوەی ئیلاهیی* ڕۆمـانەکەدا، ڕاسـکۆڵنیکۆف گوێ لە بەســەرهاتی ژیانی بەفیڕۆچووی مارمیلادۆف دەگرێت و ئەمەش، لە خۆیدا، بنەڕەتی پەیوەندیی دواتری نێوان ئەو و ســـۆنیـا دادەڕێژێـت. گەرچی ئەم گفتوگۆیە لە بنەڕەتـدا زیـاتر لە تـاکگۆییەکی مـارمیلادۆف دەچێـت بۆ ئەو مشـــتەریـانەی کە وەک شـــایەتگەلێکی بیســـتیاری لە دەوری کۆ بوونەتەوە، بەڵام گێڕەرەوە ڕوونی دەکاتەوە کە هەر لە ســەرەتای بەرکەوتنەکەوە ڕاسـکۆڵنیکۆف حەزێکی دۆســتانە بۆ مارمیلادۆف نیشــان دەدات. وا دێتە بەرچاو کە ئەمە یەکێک بێت لە پێشنیازەکانی پەیوەندییەکی گوێیی دوولایەنە.

> ڕاســـکۆڵنیکۆف کەســـێکی کۆمەڵایەتی نەبوو و بەتایبەت لەم دواییانەشـدا خۆی لە هەر کەسێک بەدوور دەگرت، بەڵام ئێستە هەســـتێک خەریک بوو ئەوی بەرەو مرۆڤەکان دەکشـــاند. لە دەروونیدا شتێک دەکەوتە سەر پێ کە نوێ بوو و ئەوی تینووی تێکەڵیکردنی خەڵکی دەکرد. مـانگێکی ڕەبەقی لە پەشـــێویی بەردەوام و هەڵچوونێکی خەمناکدا بەسەر بردبوو و ئێستە ئیدی بە چەشــنێک بێزار بووبوو کە دەیویســت بۆ ســاتێکیش بێت، لە دونیایەکی بەدەر لە دونیاکەی خۆیدا هەوایەک بگۆڕێت، گرنگیش نەبوو چۆن و لە کوێ بێت.

بەهەرحاڵ، پەیوەندیی گوێیی ڕاستەقینە پێویستیی بە شتێکی زیاتر لە ســـەرنجی قووڵی بیســـەر هەیە. وەها پەیوەندییەک پێویســـتیی بە پێچەوانەبوونەوەی تاوتاوی ڕۆڵی نێوان بیســەر و قســەکەرەوە هەیە.

تەنیا لە گەڵاڵەی لاوەکیی ڕاسکۆڵنیکۆف-سۆنیادایە کە گوێگرتنی دوولایەنە، دەبێتە بابەتێکی دوولایەن و ڕەوتێکی تەواو پێچەوانەبووەوە وەردەگرێت کە تێیدا هەردوو لا ئامادەن ڕۆڵی بیسەر بگرنە ئەستۆ. ڕاسکۆڵنیکۆف دوو جار لە ئەپارتمانەکەی سۆنیادا دەچێتە دیداری ئەو و لە بەشێکی هەرەزۆری ئەم دیدارانەدا ئەوە سۆنیایە کە گوێ لە دانپێدانانەکانی ڕاسکۆڵنیکۆف دەگرێت. هەڵبەتە لە ماوەی یەکەمین دیداری نێوان ڕاسکۆڵنیکۆف و سۆنیادا ڕۆڵەکان بە شێوەیەکی ئێجگار بەرچاو گۆڕانکارییان بەسەردا دێت: ڕاسکۆڵنیکۆف لە سۆنیا دەخوازێت بەسەرهاتی عازری نێو کتێبی پیرۆزی بۆ بخوێنێتەوە و ئەم جارەیان گوێ دەگرێت.

> سۆنیا هەناسەیەکی هێندە قووڵی هەڵکێشا وەک ئەوەی ئازارێکی هەبێت و بە دەنگێکی تەواو زوڵاڵ و تەژی لە باوەڕەوە درێژەی بە خوێندنەوە دا؛ ڕێک وەک ئەوەی لەبەردەم خەڵکیدا بەدەم هاوارەوە دان بە باوەڕی خۆیدا بنێت.
>
> *– بەڵێ گەورەم. من بڕوام هێناوە کە تۆ ئەو مەسیح و کوڕی خوایەی کە دەشیا بێتە ئەم دونیایە.*
>
> سۆنیا هەمدیسان بێدەنگ بوو. سەری هەڵبڕی و بە دزییەوە تەماشایەکی ڕاسکۆڵنیکۆفی کرد، بەڵام دووبارە خۆی کۆ کردەوە و درێژەی بە خوێندنەوە دا. ڕاسکۆڵنیکۆف لە جێگەکەیدا نەبزوابوو، هەر لەوێ دانیشتبوو و گوێی دەگرت. هێشتا ئەنیشکەکانی بەسەر مێزەکەوە بوون و نیگاشی لەوبەری ژوورەکە ڕامابوو.

وا دێتە بەرچاو ئەم دیمەنە ڕەنگدانەوەی دیمەنەکەی پێشتر بێت کە پۆرفیری لە ڕاسکۆڵنیکۆف دەپرسێت ئایا باوەڕی بە زیندووبوونەوەی عازر هەیە و ڕاسکۆڵنیکۆفیش وەڵامێکی ئەرێنی دەداتەوە، گەرچی هەر بە ڕاستیش ڕوون نییە کە ئەو باوەڕی بەو چیرۆکەی کتێبی

پیرۆز هەیە یان نا؛ هەر بەو جۆرەی کە دەکرێت بە تەتەڵەکردنی لە کاتی وەڵامدانەوەکەدا دەرک بەوە بکەین. وا دەردەکەوێت لێرانەدا هۆکاری زمانگیرانەکەی ڕاسکۆڵنیکۆف ئەوە بێت کە لەبەر هۆکارگەلێکی جۆراوجۆر هێشتا ناتوانێت بڕوا بەو شتە بکات کە بیستوویەتی (لەبری ئەوەی خوێندبێتییەوە): عازرناوێکی خەڵکی بەیت عەنیا تازەبەتازە مردووە و دەتوانێت زیندوو ببێتەوە، تەنیا لەبەر ئەوەی عیسای مەسیح پێی دەڵێت هەستەوە.

دەکرێت ئەم کەموکوڕییە گوتارییە -بەراورد بە نموونە نووسراوەکەی- بدەینە پاڵ ئەو ڕاستییەی کە ئیمان هیچ شوێنێکی لەو پەیوەندییەدا نییە کە لێکۆڵەری پۆلیس لە کاتی گوێگرتندا پێکی هێناوە و، ئەم پەیوەندییە، لە ڕاستیدا چالاکییەکی یەکلایەنەیە. گوێگرتنی پۆرفێری بەشێکە لە سیستمێکی بیستنی حکومەتی کە ماریی شێیفر بە وردی ناوی ناوە گوێی *دیونیزوس*. گەرچی لەوانەیە وەها کارێک ڕوونکردنەوە و پاکانەی ئاکاریی خۆیی بۆ پێشگرتن و ئاشکراکردنی تاوان هەبێت، بەڵام ئەم جۆرە گوێگرتنە لە دانپێدانانی یاسایی، لەو متمانە دوولایەنە بەرییە کە بنەڕەتی پەیوەندیی ڕاسکۆڵنیکۆف-سۆنیا پێک دەهێنێت.

## ٥

## گوێگرتن وەک ڕێگەیەک بەرەو ئیمان

خاڵی جیاوازی ئەوەیە کە بەسەرهاتی عازر لە کتێبی پیرۆزدا ڕۆڵێکی بەرچاوی هەیە. بەسەرهاتی هەستانەوە لە *ئینجیلی یوحەنا*دا بە جۆرێک خراوەتە ڕوو کە بابەتی ئیمان و بیستن/گوێگرتن پەیوەندییەکی نەپچڕاویان پێکەوە هەیە: عیسا دوای ئاگاداربوونەوە لە نەخۆشییەکەی عازر بڕیار دەدات سەردانی بکات و بچێتەماڵی، بەڵام

کاتێک دەگاتە ئەوێ کە ئیدی زۆر درەنگە. بەر لەوەی پەرجووی زیندووبوونەوەی ئەو بگاتە ئەنجام، هاورێیەتیی دێرینی خۆی لەگەڵ مارتای خوشکی عازردا تازە دەکاتەوە. لە گوتوبێژێکی کورتی بەر لە دیمەنی ئارامگەکەی عازر، کە وا دەردەکەوێت بە ڕۆڵێکی پێچەوانە لە گوتوبێژەکەی نێوان ڕاسکۆلنیکۆف و سۆنیا لە *تاوان و سزادا* ڕەنگی دابێتەوە، عیسا بەر لەوەی ڕاستەوخۆ ڕووی دەمی بکاتە خواوەند، لە ئیمانی مارتا دڵنیا دەبێتەوە:

*باوکە، سوپاس بۆ تۆ کە دوعاکەی منت بیست. دەمزانی کە هەمیشە دوعای من دەبیستی؛ وەلێ من تەنیا لەبەر ئامادەبووانی ئێرە ئەم قسەیەم کرد، تا باوەڕ بەوە بکەن کە من نێردراوی تۆم.*
عیسا دوای ئەم قسانە، بە دەنگی بەرز گوتی: *عازر، وەرە دەرێ!*
ئینجا ئەو پیاوەی کە مردبوو، هاتە دەر... هاتە دەرێ لە بارێکدا کە دەست و پێی بە کفن بەسترابوونەوە و دەموچاویشی پارچەیەکی سپیی لێ پێچرابوو. (یوحەنا ٤-٤١: ١١)

پەرجووەکانی *ئینجیل* کە یوحەنا ژماردوونی، لەبارەی بڕوابوون بە هێزی شتێکەوەن کە دەبیسترێت و بنەماکەی دڵنیاییە لە بیستران (گیرابوون)ی دوعای باوەڕداران لەلایەن خواوەندەوە، بە دەربڕینێکی دی، بیستن/گوێگرتنی دوو لایەنە لە پەیوەندیی نێوان بەندە و خوادا کاتێک دێتە ئارا کە بڕوایەکی پتەو کرابێتە بنەما. ئایدیای نزیکیی نێوان باوک و کوڕ لە بنەڕەتی ئەم چەمکە ئینجیلییەدایە. لەبەر ئەوەی ڕاسکۆلنیکۆف و سۆنیا هەتیون، لە کۆتایی ڕۆمانەکەدا دەکرێت گەڕان بەدوای باوکێکی مەعنەویدا بە جۆرێک لە تایبەتمەندیی هاوبەش بۆ بەهێزکردنی نێوان ئەو دووانە دابندرێت. ئەم خاڵەی کە عازر دوای بیستنی فەرمانەکەی عیسا بە چاوی بەستراوەوە لە گۆڕەکەیدا هەڵدەستێتەوە، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ڕەسەنترین ئەندامی مەعنەویەت گوێیە نەک چاو. وێڕای زاڵیی لایەنی بیستیاری بەسەر

چیرۆکەکەدا، بەرجەستەکردنی نمایشێکی سەرنجڕاکێش لە دیمەنی وەرگیراو لە کتێبی پیرۆزەوە لەئارادایە و تەنانەت لایەنی هەستی بۆنکردنی پەرجووەکەش (واتە بەریبوونی ئاشکرا لە هەر جۆرە بۆنێک) پشتگوێ نەخراوە. لەگەڵ ئەمەشدا، بەم پاژە نیشانی دەدات کە لایەنی نمایشیی ئاماژەیی، زیاتر ڕێککەوتنێکی ستراتیژییە لەلایەن عیساوە بۆ قایلکردنی ئەو شایەتانەی کە بە هەڵکەوت لەوێن؛ یارۆ ئەو یەهوودیانەی کە هێشتا لە ئیمانی مریەم و مارتادا هاوبەش نین. بۆ ئەوان هەر بە تەنیا بیستنی هەستانەوەی عیسا بەس نییە؛ ڕێک وەک *گومانکردن*ـەکەی تۆماس کە خوازیاری بینینی نیشانەکانی لەخاچدانی عیسا و شوێنی بزمارەکانی سەر هەردوو دەستییەتی و دەیەوێت دەستی بخاتە پاڵی (وەرگیراو لە یوحەناوە ٢٩: ٢٠)، ئەوانیش بۆ بڕواهێنان پێویستییان بە بەڵگەی زیاتر هەیە کە دەکرێت لەڕێی وەرگرتنی هەستیی زیادەوە بەدەست بێن.

بە بەسەرهاتی عازر و ڕۆمانی هەستانەوەی ڕاسکۆڵنیکۆفی دۆستۆیفسکی، دەتوانین شایەتی پەیوەندیی لێکدانەبڕاوی نێوان کۆمەڵگە و مەعنەویەت بین لە ناوەڕۆکی بیستن لەبەرانبەر گوێگرتندا. لە ڕاستیدا ناچار نیین لە باوەڕە ئایینییەکانی نووسەردا هاوبەش بین تا دەرک بە گرنگیی پەڕینەوە لە بیستنەوە بۆ گوێگرتن لە موتوربەکردنی ڕاسکۆڵنیکۆف (پاش ئەو تاوانە کارەساتبارەی کە تووشی بوو) بە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییەوە تێبگەین. ئەم ڕەوتە نەیدەتوانی بەبێ بنەمای موتوربەکردنی دژبەری دەست پێبکات کە بنەماکەی گۆڕانی تاوتاویی ڕۆڵی قسەکەر و بیسەرە. ڕاسکۆڵنیکۆف سەرەتا گوێ لە دانپێدانانی مارمیلادۆف (باوکی سۆنیا) دەگرێت کە باس لە چۆنییەتیی فەوتاندنی خێزانەکەی دەکات، پاشانیش گوێ لە ئینجلخوێندنەوەی سۆنیا. سۆنیاش لەبەرانبەردا گوێ لە دانپێدانانی ڕاسکۆڵنیکۆف دەگرێت. بەم جۆرەیە کە دۆستۆیفسکی نیشانی دەدات

گوێگرتن کەرەستەیەکە بۆ پەیوەستبوون بە کۆمەڵگەوە، بەم پێیە ڕێککەوتنێکی بێچەندوچۆن لەنێوان قسەکەر و بیسەردا دەهێنێتە ئارا. ئەمە هەمان ئەو شتەیە کە گەلاڵەی لاوەکیی ڕاسکۆلنیکۆف–سۆنیا پێک دەهێنێت. لەتەک نموونەکانی دیکەی بیستن و گوێگرتنەوە لە ڕۆمانەکەدا، سفیدریگایلۆف و پۆرفیریش نموونەی گوێگرتنن، تەنانەت گوێگرتنی پۆرفێریش، ئامانجێکی ڕاستەقینەی ئاشتکردنەوەی دووبارەی ڕاسکۆلنیکۆفی لەگەڵ کۆمەڵگەدا لەپشتە. سەرەڕای کردوکۆشی ئەوان، هیچکامیان (بە ڕازومیخینی هاوڕێی ڕاسکۆلنیکۆفیشەوە)، وەک سۆنیا نەیانتوانی گوێگرتنێکی دوولایەنە بهێننە ئارا. ڕەگی ئەم لێهاتووییە، لە دیوە کۆمەلایەتی و مەعنەوییەکەی ئەواندایە. ڕاسکۆلنیکۆف و سۆنیا هەردووکیان بە کۆمەڵگە بێگانەن، قورسایی باری دابڕان لە کۆمەڵگە ئازاریان دەدات و سەرەڕای بیرکردنەوەی گومانـاویی ڕاسکۆلنیکۆف، هەردووکیان وەک دوو گەڕۆک بەدوای ئیماندا وێنا کراون. ئەم جۆرە لە پەیوەستکردن بە کۆمەڵگەوە، لە توخمی ئەو جۆرە گرێبەستە کۆمەلایەتییە نییە و نابێتە شوێنگرەوەی کە پۆرفێری یان ڕازومیخین دەیخەنە ڕوو، تەنانەت ئەو جۆرە هاودەستییە تاوانبارانەیەش کە سفیدریگایلۆف پێشنیاری دەکات، هەر ناتوانێت شوێنی بگرێتەوە.

## ٦

## ڕزگاریی بیستیاریی ڕاسکۆلنیکۆف

ڕاسکۆلنیکۆف لە بەشێکی زۆری ڕۆمانەکەدا کەللەڕەقانە لەسەر بیروباوەڕە مولحیدانەکەی بەردەوام دەبێت. گەرچی ڕاستگۆیانەش ڕێوڕەسمی ئەو تۆبەیە جێبەجێ دەکات کە سۆنیا پێی ڕادەسپێرێت و لەبەر هەڵسوکەوتی باشی، خۆی بە شایەنی ئەو کاردانەوەیەی

پۆرفیری دەزانێت، بەڵام ئەوە تەنیا لە کۆتا لاپەڕەکانی تاکبێژییەکەیدایە کە دەڵێت ئیمانی سۆنیا پەسەند دەکات. هەروەها هەڵسوکەوتیشی نیشاندەری ئەوە نییە کە بەو جۆرەی لە وەڵامی پۆرفیریدا بانگەشەی بۆ کردبوو، هەر بە ڕاستی بڕوای بە پەرجووی زیندووبوونەوەی عازر هەبێت. خاڵی جێسەرنج ئەوەیە کە دۆخی ئایینی لە گەڵاڵەدا لەگەڵ ئەزموونێکی دیداری و بیستیاریی سەختدا خراوەتە ڕوو کە جارێکی دیکە ناوەڕۆکی وەرگرتن بە پرسی ئیمانەوە گرێ دەداتەوە. لە بارێکدا کە ڕاسکۆڵنیکۆف لە دەرەوەی شەرمەزارگەی سیبیریا و لە قەراخ ڕووباری ئەیتریشدا بە تەنیا دانیشتووە، لە دوورڕا دەنگ و تارمایی ئاوێتەی یەکدی دەبن و زەینی ئەو دەبزوێنن:

> ڕاسکۆڵنیکۆف لە کارگە هاتە دەر و هەر لە کەنارەکە و لەسەر کۆما هێزمێک دانیشت و بە سەیرکردنی ئەو چۆڵەوانییە بەرفراوانەوە سەرقاڵ بوو. لە سەرووی ڕووبارەکەوە دیمەنێکی بەرین لە بەرچاویدا واڵا دەبووەوە و دەنگی گۆرانییەکی ناڕوون و دوور، لە لایەکی دیکەی قەراخ ڕووبارەکەوە بەر گوێی دەکەوت. لەو دەشتە بەرینەدا کە لەژێر تیشکی خۆرەتاودا خەوتبوو، دەیتوانی پەڵەگەلی ڕەشی لێڵ ببینێت کە لە بنەڕەتدا خەیمەی کۆچەرییان بوون. ئازادی، لەوێ بوو. لەوێ خەڵکانێک دەژیان کە لەگەڵ نیشتەجێیانی ئەمبەری ڕووبارەکە جیاوازییان هەبوو... بیری لە شتێکی تایبەت نەدەکردەوە، بەڵام خەمێک لە دەروونیدا هەبوو کە ئازاری دەدا و پەرێشانی دەکرد.

وێڕای ئەوەی بینین و بیستن لەم دیمەنەدا بە ڕوونی لێک تەنراون، ئەوە دیوە بیستیارییەکەی ئەو شتەیە کە ڕاسکۆڵنیکۆف وەری دەگرێت کە لە کۆتاییدا تێرامانە تا هەنووکە بێبەرهەمەکانی ئەو دەگەیەنێتە درەوشانەوەی خواوەند، کە پەسەندکردنی ئەوەش بۆ زۆرێک لە خوێنەران شتێکی دژوارە. وا دیارە لەم برگەیەدا بە

دڵنیاییەوە ئەوە بە هەڵکەوت نییە کە دۆستۆیفسکی بە شێوەیەکی ئاماژەیی *ئینجیلی یوحەنا* بەسەر دەکاتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، وەسفی دیمەنی گۆڕانی ڕاسکۆلنیکۆف گرنگیی بیستن لەگەڵ جەختکردنەوە لەسەر پێوارییی بزوێنەری دەنگی بەرجەستە دەکات: نەک بە تەنیا سۆنیا کە *کەم تا زۆر نەبی دەنگ* دەپەرژێتە سەر کەسایەتیی سەرەکی و لەڕێی جووڵە و بارەکانی ڕووخسارییەوە هەست بە دۆخی ڕاسکۆلنیکۆف دەکات و وای لێک دەداتەوە کە بێدەنگی فەرمانڕەوایی بەسەردا دەکات. دەڵێی دۆستۆیفسکی بە پەسەندکردنی دەسەڵاتی بێدەنگی بەسەر دیمەنەکەدا، ئاماژە بەوە دەکات کە لە کۆتاییدا، کەوتنی ئاشکرای دەنگ، بۆ دەرککردن بەوەی کە زیاتر وێنانەکراو بوو، ئارامییەکی پێویست بە زەینی ڕاسکۆلنیکۆف دەبەخشێت، ئارامییەکی زەینی کە لە هەراوزەنا و ژاوەژاوی شەقام و مەیخانەکانی پیتەربورگدا نەکردە بوو. لە ئەنجامدا، دەتوانین بڵێین لە *تاوان و سزادا* ڕێک وەک گێڕانەوە ئینجیلییەکەی عازر، بیستن و گوێگرتن ڕێخۆشکەرن بۆ ئیمان، لە بارێکدا کە بینین لەم دەقەدا، تەنیا وەک پاڵنەرێکی مامناوەندی کار دەکات.

کاتێک ڕاسکۆلنیکۆف هەمان ئەو شێوەی کە بەسەر جێگە تەختەییەکەیەوە لە قەراخ ڕووباری ئەیرتیش لە درەوشانەوەی خواوەندا نغرۆ بووە، جارێکی دیکە یادگارییەکەی خۆی و چیرۆکی عازری بە زەیندا دێتەوە. بە یارمەتیی ئەو ئینجیلەی کە لە سۆنیای داوا کردووە، دەیتوانی بە ئاسانی و لەڕێی بەکارهێنانی هێزی بینینەوە، سەرلەنوێ چیرۆکەکە بخوێنێتەوە تا پاساوێکی ئەقڵانیی بۆ پەرجووە ئینجیلییەکەی دەست بکەوێت، بەڵام ئەم کارە ناکات، لەبری ئەوە، لێدەگەڕێ یادەوەرییە زارەکییەکەی چیرۆکی *ئینجیلی یوحەنا* لە زەینیدا بمێنێتەوە. ئەم خاڵە ئاماژە بەوە دەکات کە کاتێک بابەتی

دەرکەوتنی ڕێکارێکی ئیمانی لەنێواندا بێت کە ناچار بەڵگەی ئەقڵانی پشـــتگوێ دەخات، هەمیشـــە گوێ گرنگییەکی زیاتری لەچاو دیدەدا هەیە. دۆستۆیڤسکی لە کەسایەتییە سەرەکییەکەی خۆش دەبێت و ئەو چارەنووســـەی لێ لادەدات کە بۆ ســـڤیدریگایلۆفی نیهلیســـتی –کە ناتوانێت بڕوا بەوە بکات کە ژیان بەدەر لەوەی کە بە چاو دەبیندرێت و بە ڕاســـتی دەبیســـترێت، هیچ شـــتێکی زیاتری تێدایە– لە بەرچاو گرتووە. ڕێکـاری دۆســـتۆیڤســـکی بۆ ئەم مەبەســـتە، تێپەڕینی ڕاســـکۆڵنیکۆفە لە بیســـتن و گوێگرتنی دژەکۆمەڵگانەوە بۆ گوێگرتنی دوولایەنە، کە بنەڕەتی پەیوەندیی تاکەکەســـی قســـەکەر/بیســـەر پێک دەهێنێـت. جۆرە پەیوەنـدییەکی هـاوشـــێوەی پەیوەنـدی کۆمەڵگە مەسیحییە سەرەتاییەکان.

ئەوەی کە ئـایـا وەهـا ڕەوتێـک دەبێتە هۆی ئەوەی کە خواوەنـد دوعای بەخشینی ڕاسکۆڵنیکۆف و سۆنیا ببیستێت یان نا، پەیوەندیی بە ئیمانەوە هەیە. بەهەرحاڵ، بێدەنگیی ئاشکرای گێڕەرەوە سەرئەنجام خوێنەر ناچار دەکات لێکدانەوە بۆ قســـەی نەگوتراوی ڕۆمانەکە وەک پاڵنەرێکی ئیمانهێنان لە بیســـتنەوە بۆ گوێگرتن بکات و وەهاش دێتە بەرچـاو کە شـــێوەی بـانگەشـــەیی *تـاوان و ســـزا* وای کردووە دۆستۆیڤسکی پشتگیریی زۆرێک لە خوێنەران لەدەست بدات. ڤلادیمیر نـابۆکۆف بە ســـەرنجدان لە ســـەرقـاڵیی زەینیی بە نەبینـدراو و نەبینراوەوە، نەیتوانیوە پشـــتگیریی ئەو ڕێچـارە گێڕانەوەییە و ڕێکـارگەلی ئـاینیی بیســـتیـاریی وەک پێشـــبینی، دانپێـدانـان و قســـەلەگوێگرتنی بڕوادارانە بکـات کە لە زۆربەی ڕۆمـانەکـانی دۆســـتۆیڤســـکیدا هەن. لەوانەیە پێویســـتمان بە بیرمەندێکی وەک نیچە هەبێت، بە زەینێکی هەســـتیار لەئاســـت گرنگیی گوێدا، تا بتوانێت لە ڕووی دەروونناســـییەوە بەســـەرهاتی ڕزگاربوونی ڕاســـکۆڵنیکۆف بە

شـــێوەیەکی قـایلکەرانە لێـک بـداتەوە. دەکرێـت ئەمە ببێتە بـابەتی گوتارێکی دیکە، بەڵام بابەتەکەی ئێمە لێرانەدا گەیشتووەتە کۆتایی.

٢٠١٤

# دۆستۆیڤسکی لە دیدێکی دیکەوە

## *تاوان و سزا*

ستانیسلاڤ ماکسکیڤیچ

سەرەڕای هەوڵە تاقەتپڕووکێنەکانی دۆستۆیڤسکی، بڵاوکردنەوەی گۆڤاری *دەوران* بە ناچاری لە بەهاری ساڵی ١٨٦٥دا وەستێندرا. ئێستە دابینکردنی بژێویی ژیانی ژنی براکەی و منداڵەکانی لە ئەستۆی ئەودایە؛ هاوکاتیش خەریکە ڕۆمانێک دەفرۆشێتە کرایفسکی تا لە **یادداشتە نیشتمانییەکان**دا چاپ بکرێت کە هێشتا نەینووسیوە. کرایفسکی ئەم پێشنیارە ڕەد دەکاتەوە. دۆستۆیڤسکی لە حوزەیرانی ساڵی ١٨٦٥دا کە لە ڕووی ماددییەوە لەژێر گوشارێکی هەمەلایەنەدا بوو، گرێبەستێکی سەیر و ئەقڵنەبڕی لەگەڵ ستیلۆفسکیی بڵاوکەرەوەی سووخۆر و کڵاوچیدا واژۆ دەکات. بڕیار وایە ستیلۆفسکی بڕی ٣٠٠٠ ڕۆبڵ، بەشێکی بە نەختی و بەشێکی بە شێوەی چەک، بداتە نووسەر. لەبەرانبەردا نووسەر مافی تەواوی بڵاوکردنەوەی سەرلەبەری ئەو بەرهەمانەی کە تا ئەو سەردەمە نووسیونی دەداتە ئەو و لەگەڵ ئەوەشدا بەڵێن دەدات تا بەرواری یەکی تشرینی دووەمی ساڵی ١٨٦٦ ڕۆمانێکی تازە بە ژمارە لاپەڕەیەکی دیاریکراو بداتە بڵاوکەرەوە، جا گەر لە ماوەی دیاریکراوی

نێو گرێبەستەکەدا نەتوانێت ئەم بەڵێنە بەرێتە سەر، ستیلۆفسکی بۆی هەیە بەبێ بەرانبەر هەرهەموو بەرهەمەکانی نووسەر چاپ بکاتەوە- هەم ئەو بەرهەمانەی کە تا ئێستە نووسیونی و هەم ئەوانەش کە لە هەر کاتێکی داهاتوودا دەیاننووسێت. دۆستۆیڤسکی لە نووسینگەی بەڵگە فەرمییەکاندا ئەم گرێبەستە واژۆ دەکات. دواتر ستیلۆفسکی بە هەموو شوێنێکدا هەلومەرجی ئەم گرێبەستە جاڕ دەدات تا بگاتەوە گوێی خاوەنقەرزەکان و بەم پێیە کابرای قەرزار ئەوپەڕی متمانەی خۆی لەلای ئەوان لەدەست بدات، ئەوسا هەموو پسووڵەگەلی براکانی دۆستۆیڤسکی بە پەنابایەک دەکڕێت و بەم پسووڵانە بەشیکی زۆری ئەو سێ هەزار رۆبڵە دەدات. دۆستۆیڤسکی بڕێک لەو پارەیە دەداتە ژنی براکەی و هەندێکیشی بە پاشا و جا بە ١٧٥ ڕۆبلی گیرفانییەوە بەرەو ئەڵمانیا دەکەوێتە ڕێ، بەو هیوایەوەی کە لە *ڤیسبادن*، لەڕێی یاریی ڕۆلێتەوە دەستی بە سامانێک ڕابگات. نەگبەتییەکەی ئەوەیە کە لە ڤیسبادن یادەوەرییەکی خۆشی هەیە، چونکە لە یەکەمین گەشتیدا بۆ دەرەوە، لە ساڵی ١٨٦٣دا توانیبووی بڕێکی زەوەندەی دە هەزار فرانکی لە ڕۆلێتدا بباتەوە، بەڵام ئەم جارەیان هەرچیی لە گیرفاندایە دەیدۆڕێنێت، کاتژمێرەکەشی دەخاتە گرەوەوە و ئەویش دەدۆڕێنێت. نامەیەکی تکاکارانە بۆ تۆرگنێف دەنووسێت و داوای ١٠٠ فرانک قەرزی لێ دەکات. پەیوەندیی نێوان دوو نووسەرەکە ئێجگار فەرمییە، وەلێ تۆرگنێف کە لەنزیک ڤیسبادندا دەژی، لەگەڵ پێگەیشتنی نامەکەدا، لەبری سەد، پەنجا فرانک بۆ هاونیشتمانییە داماوەکەی دەنێرێت و داوای لێبوردنی لێ دەکات کە لەوە زیاتری پێ نییە. دۆستۆیڤسکی دەستبەجێ ئەو پەنجا فرانکەش دەدۆڕێنێت. لەم نێوەندەدا دەموچاوی سۆسلۆڤا لە ڤیسبادندا دەردەکەوێت و بە پێدانی بڕە قەرزێکی کەم فریای دەکەوێت. سۆسلۆڤا ڤیسبادن جێ دەهێڵێت و دۆستۆیڤسکی دارونەداری خۆی لە قوماردا دادەنێت. ئەو ناتوانێت کرێی هۆتێلەکەی بدات، پێشخزمەتەکان فراوێنی بۆ ناهێنن، پێڵاوەکانی

بۆ بۆیاخ ناکەن، وەڵامی پرسیارەکانی نادەنەوە و ڕووی لێ وەردەگێڕن، تەنیا چای ساردی بۆ دەهێنن و بە سکاڵاکردن لەلای پۆلیس هەڕەشەی لێ دەکەن. میلۆکفی هاوڕێی لە پیتەربورگدا هەوڵی پێشفرۆشکردنی ئەو ڕۆمانەی ئەو دەدات کە هێشتا نەنووسراوە، (بیرمان نەچووە کە پێشتر دۆستۆیفسکی بەرهەمێکی نەنووسراوی فرۆشتبووە ستیلۆفسکی) سەردانی نووسینگەی **کتێبخانەکانی خوێندنەوە، هاوڕۆژگار، یادداشتە نیشتمانییەکان** دەکات، لە هەموو شوێنێک وەڵامی نەرێنیی دەدرێتەوە. زنجیرەیەکی سەیر لە نامورادی. ئێستە دەبێت دۆستۆیفسکی ستایش بکەین و هەمواریی زەین، پشوودرێژیی مێشک و هێزی داهێنەرانەی ئەو بەرز بنرخێنین، ئاخر ئەو لە چنگی ئەو بارودۆخە ئێجگار نائومێدکەرە و دوای ئەزموونی عەشقێکی نامورادانە، لە تاریکانی شەو و لە کازینۆیەکدا، لەو شوێنەدا کە دارونەداری خۆی دۆڕاندووە، دێتە دەر و برسی و بەبێ کاتژمێر و بە گیرفانی خاڵییەوە لە شەقامە تاریکەکانی پارکدا دەکەوێتە ڕێ و بەدەم ترس و دڵەڕاوکێی گەڕانەوەوە بۆ هۆتێل، بیرۆکە و کەڵاڵەی گەورەترین شاکاری خۆی و یەکێک لە گەورەترین شاکارە ئەدەبییەکانی جیهان دادەڕێژێت: **تاوان و سزا**. لێرانەدایە تێدەگەین ئەم تاکە بە ڕووالەت شپرزە و لێکهەڵوەشاوە تایبەتمەندیی تۆپێکی پلاستیکیی هەیە کە هەر کات چارەنووس بە زەوییدا دەکوتێت، یەکسەر هەڵدەبەزێتەوە. لەوانەیە ئەو چڵەی کە خرایە نێو ئەم ئاگرەوە تا نەهێڵێت گڕەکەی بکوژێتەوە و دابمرکێتەوە، دیدەنیکردنی سۆسلۆڤا بێت کە تا ڕادەیەک ئازاری ئەو شکستەی دەسرەواند کە دۆستۆیفسکی خەریکی ئەزموونکردنی بوو. هەرچۆنێک بووە ئەو دەست دەداتە پێنووس و نامەیەک بۆ بارۆن ورنگلی پشتوپەنای خۆی -کە ئێستە لە کۆپنهاگندا کونسوولی ڕووسیایە- دەنووسێت. ورنگل برە پارەیەکی بۆ دەنێرێت. ئاکامی کارەکە دڵخۆشکەر دیارە، چونکە کاتکۆف پەیدا دەبێت و پێشەکی ئەو ڕۆمانە دەکڕێت کە بڕیار وایە دۆستۆیفسکی

بینووســـێت و هەر بەو بۆنەیەشـــەوە برە پارەیەکی دەداتێ. ئەمە هەمووی لە ســـاڵی ١٨٦٥ و لە قۆناغێکدا ڕوو دەدات کە کاتکۆف و دەزگـاکەی ئـیـدی کەوتـوونەتە بەر پەلامـاری ڕقـی ئەڵقەی ئەو خۆرئاواخوازانەی کە ئەو خۆیشـــی ســـەردەمانێک ئەندامی بوو. ئەو دەســـتی یارمەتییەی کە کاتکۆف لەو دۆخە دژوارە کەســـییەدا بۆ دۆســـتۆیڤســـکیی درێژ دەکات، دەبێتە هۆی ســـازبوونی کەشـــێکی دەروونیی شـــیاو تا بڵاوکەرەوەی دیار و نووســـەرە گەورەکە لە داهاتوودا لە ڕووی فکرییەوە زیاتر لێک نزیک ببنەوە.

**تاوان وسزا** کە دوای دەرچوونی سۆسلۆڤا لە ڤیسبادن دەستی پێ کرد، هیچ وێنایەکی ئەو ژنەی تێدا نییە -وێنەی ئەو دواتر لە ڕۆمانی قومارچی و گەمژەدا دەردەکەوێت- ئاخر نووسـەر وەک هەمیشـە لەم قۆناغەدا ســـەرقاڵی بەســـەرکردنەوەی یادەوەرییەکانی ڕابردوویەتی، ڕووخســـاری یەکەمین هـاوســـەری وێـنـا دەکـات، وێـنـای گـۆنـا داگیرساوەکانی و شێوازی ڕێکردنی، ئەو شاڵە گەورەیەی کە بەسەر کۆڵیدا دەدا و بەر لە هەر شـــتێک، درۆ، فشـــەبازی، دەمەقاڵێ و ڕسواییەکانی. نامەیەکمان لە بەردەستدایە کە لە ڤیسبادنەوە بۆ ورنگڵ نێردراوە و تێیدا دۆسـتۆیڤسـکی هاوسـەرە کۆچکردووەکەی بە «ئەو فریشـــتەیە» ناو دەبات، کەچی لە **تاوان و ســـزا** و لە کەســـایەتیی تۆقێنەری خاتوو مارمیلادۆڤدا نەمری دەکات، هەروەها لە شـــێوەی مەیخۆرێکی «پێشـــتر مرۆڤ»دا مێردەکەی پێشـتریشـــی وێنا دەکات. نووســـینی دەربڕینی «ئەو فریشـــتەیە» لەو نامەیەدا کە بۆ بارۆن ورنگڵی دەنێرێت، بێ لە ڕەچاوکردنی ڕێز و حورمەتێکی مەراییکارانە و نوانـدنێـک هیچی دیکە نەبوو، ئەمەش لە بـارێکـدا کە ســـیفەتی تۆقێنەربوون لە ڕۆمـانەکەدا حەقیقەتێـک بوو بە وەســـفکردنێکی هونەرمەندانە و ڕاستییەکی ئەزموونکراوەوە.

پێشتر گوتم که دۆستۆیڤسکی دایمه خوازیار بوو نووسەرێکی ڕووسی بێت، کەچی بووە نووسەرێکی جیهانی، ئاخر ئەو پرسانەی که له ڕۆمانەکانیدا خراونەته بەر باس، پرسگەلێکی ئینجیلی بوون. سەنگ و بایەخی جیهانیی دۆستۆیڤسکی بەوە پشتئەستووره که ئەو کتومت پەنجه دەخاته سەر ئەو پرسانەی که له کتێبی پیرۆزدا دێنه بەرچاومان، هەر لەبەر ئەوەشه که ئەو هەر دەڵێیت شرۆڤەکارێکی مۆدێرنی کتێبی پیرۆزه؛ کەسێکه شرۆڤەکانی له شێوەی ڕۆمانگەلێکی پله یەک یان شاکارگەلێکدا دەخاته ڕوو. له سەردەمی ڕۆمانتیسیزمدا هەندێک له شاعیران ئەو مۆڵەتەیان به خۆیان دەدا که دادگایی خواوەند بکەن یان ئیلهامئاسا له چەند قۆناغێکدا ڕووی دەمیان له ئەو بکەن، بەڵام ئەمه زۆربەی کات تەنیا چەند گوتەیەک بوو له شێوەگەلێکی جوان و ڕازاوەدا. **تاوان و سزا** له بنەڕەتەوه بەرهەمێکی جیاوازه. دۆستۆیڤسکی ڕووداوانه ئەم پرسیاره دەخاته ڕوو که ئایا بنەما ئاکارییه ئایینییەکان پێویسته ڕەچاو بکرێن یان نا؟ جا پاشان به هەستی پەشیمانی و تاوانبارییەوه دێته وەڵام: ئەرێ. ئەمه دادگایەکه و بۆ ئەوە پێک هێنراوه تا وا له ئێمه بکات دان به حەقیقەتی ئینجیلدا بنێین. **تاوان و سزا** ئەم پرسیاره دەخاته بەرباس که ئایا دەبێت پابەندی ده فەرمانەکه بین یان نا. دەبێت سەرنج لەوه بدەین که گەورەیی و بلیمەتیی دۆستۆیڤسکی له هەڵبژاردنی ئەم بابەتەدا دەردەکەوێت. ئەم بابەته نەک هەر به تەنیا له پرسەکانی ڕووسیا و پرسگەلی زەینیی هاوکاره ئەدەبییەکانییەوه دوور بوو، نەک هەر به تەنیا هیچ پەیوەندییەکی به باسگەلی نێوان سلاڤییەکان و خۆرئاواخوازان و بابەته بەرباسخراوەکانی ئەو قۆناغەی ڕووسیاوه نەبوو، بەڵکه مەودایەک لەنێوان ئەو و ئەدەبیاتی ئەورووپا و به گشتی ئەدەبیاتی سەدەی نۆزدەی میلادیدا هەبوو. دۆستۆیڤسکی به نووسینی **تاوان و سزا** له پەیکەری ڕۆمانسێکی بولواریدا، له ڕووی فۆرمەوه، هاوئاراستەی سەردەمی خۆی (سەدەی نۆزده) هەنگاوی نا، وەلێ له

ڕووی بابەت، ئایدیا، ناوەڕۆک و ماهیەتی بەرهەمەوە، هەنگاوی نایە کەشـــگەلێکی ئاســـمانی و چەند قاقڕێکی بێکۆتاییەوە و ڕووبەڕووی پەیمانی کۆن، پەیمانی نوێ و خوای تاقانە ڕاوەســـتا. خوێندکارێکی هۆشـیار، ئاوڕوودار و نەرمونیان بە ناوی ڕاسـکۆلنیکۆف، ناوێک کە واتای لەدینهەڵگەڕاو دەگەیەنێت، لە خۆی دەپرســـێت: بۆچی نابێت بکوژم؟ من خاوەنی هێزی تەواو و هۆش و بەتوانام، دەمەوێ خزمەتی کۆمەڵگەکەم بکەم، نیازم وایە زۆربەی هاوتوخمەکانم بەختەوەر بکەم، لێرانەشـــدا حەشـــەرەیەکی قێزەون، قرچۆڵێکی ســـووخۆر هەیە کە تەنانەت ستەمکردن لە خوشکەکەی خۆیشی بە ڕەوا دەبینێت، کەسێکە کە لە ماڵەکەی خۆیدا پارەیەکی زۆری کەڵەکە کردووە. گەر ئەم پارەیە بەدەســـت منەوە بێت دەتوانم کەســـانێکی زۆر لە کێشـــە ڕزگار بکەم، کەواتە بۆچی نابێت ئەو پارەیەی لە دەســـــت دەربێنم؟ ناپلیۆن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی چەند کەسی کوشت؟ ڕاسکۆلنیکۆف و ئێمەش کە خەریکی خوێندنەوەی ئەم ڕۆمانەین، دوای ئەو ئەزموونە و پاش جێبەجێکردنی نەخشەی کوشتنەکە جا لە بایەخ و سەنگی تیۆرییەکەی ئەو تێدەگەین. ڕاســـکۆلنیکۆف مرۆڤ دەکوژێت و دەمودەســـت دوو بازنەی دۆزەخی و جادوویی دەوری دەدەن. یەکەمین بازنە لەو خاڵانە پێک دێت کە لە کاتی کێشـــانی نەخشـــەی کوشـــتنەکەدا پێشـــبینیی نەکردبوون –هەنـدێـک وردەکـاری، وردەڕووداوی بەهەڵکەوت و پێشـــبینینەکراو، کۆمەڵێک خاڵی لاوەکی ڕێ لەبەردەم ئاشـــکرابوونی تاوانەکە و ناســـاندنیدا خۆش دەکەن. یەکەمین بازنە بەرئەنجامی ئەم کارەســاتەیە کە ڕاسـکۆلنیکۆف بە پێچەوانەی ویسـتی خۆیەوە، ناچار بووە نەک هەر بە تەنیا ئەو حەشەرە سووخۆرە، بەڵکە خوشکە دڵباش و بێتاوانەکەشـــی بکوژێت. ئەو دواجار خۆی لە یەکەمین بازنە قوتار دەکـات؛ بە دژواری و ئـازارەوە، بەڵام هەرچـۆنـێـک بـووە نیوەســـەرکەوتوو. وەلێ دووەمین بـازنەش هەیە کە دەبێت لەویش دەربـاز بـبـێـت، بـازنەیەک هەر دەڵـێـت لە شـــەیـتـانـۆچـکە

ژارخەندلەسەرلێوەکانی سەدەکانی نۆزدە پێک هاتووە. ئەمە بازنەیەکە کە لە دژبەرییەکانی ویســـتی ئەو پێک هاتووە، لە هۆکاری ناکۆکی خۆیی، لە وەسـوەسـەگەلێک بۆ دانپێدانان. ڕاسـکۆلنیکۆف لە گەمارۆی ئەم بـازنەیەدا قوتـاری نـابێت. کەواتە ئیدی بە ئـاشـــکرایی دان بە تاوانەکەیدا دەنێت. فەرمانی «مرۆڤ مەکوژە» ســـەرکەوتوو بووە، ئەزموونی ململانێی نێوان ویســـتی مرۆیی و فەرمانی کۆنی ئاکاری، ئەنجامەکەی ســـەرکەوتنی پرســی پێویســتیی پابەندبوون بە ئاکارەوە بووە.

ئایا هەر بە ڕاســـتی ســـەرکەوتنێک بەدەســـت هاتووە؟ لە درێژەی ڕۆمـانەکەدا دەبینین ڕاســـکۆلنیکۆف لە تـاراوگەی ســـیبیریـادا ڕایدەگەیەنێت ئەوە تەنیا ویستی ئەو بوو کە شکستی خوارد، هەر بە تەنیا ئەوەندە. ئەو هەروەها دەتوانێت ئاماژە بەوە بکات کە لە ڕەوتی ئەم بەســـەرهاتەدا کەســـانێکی زۆر هەبوون کە گەرچی مرۆڤیان نەدەکوشــت، بەڵام دەســتیان بە جۆرێک لە گەندەکاری ئالوودە بووە بێ ئەوەی باجی تاوانەکەشـــیان بدەن، کەواتە بۆچی تەنیا دەبێت ئەو ســزا بدرێت؟ هەندێک لە نووســەران بڕوایان وایە دۆســتۆیفسـکی بە ڕوونی وەڵامی ئەو پرسیارەی نەداوەتەوە کە خۆی خستوویەتییە بەر بـاس، کەواتە ئـایـا دەبێـت فەرمـانی «مرۆڤ مەکوژە» بە هێزێکی بێچەندوچۆنی پابەندبوون پشـــتئەســـتوور بێت یان نا؟ بێ گومان لە سەردەمی دۆستۆیفسکییەوە تا ئێستە لەسەر ئەم گۆ خاکییەدا گەلێک شت لە هەموو ڕوویێکەوە گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووە، بەڵام تا ئەو جێیەی کە پەیوەندیی بەم نووســـەرە ڕووســـییەوە هەیە، وەڵامی ئەو وەک ڕۆژ ڕۆشنە و ئەو کەسانەش کە ئەوە نابینن، بە هیچ شێوەیەک لە ئایدۆلۆژیای **تاوان و سزا** تێنەگەیشتوون. دۆستۆیفسکی دەیویست بڵێت خەڵکی دەتوانن هەرچییان پێ خۆش بوو لەبارەی کردەوەکەی ڕاسکۆلنیکۆفەوە بیڵێن، بۆ نموونە بڵێن ئەو لەژێر گوشاری مێشک یان

بەهۆی هەلومەرجی نالەبار یان دڵەڕاوکێوە لە کارەکەیدا شکستی هێنا. بەڵام خودا! خودا لەگەڵ بنەمای «ئامانج پاکانە بۆ کەرەستە دەکات»دا نییە و هەر ئەویشە کە سزا بۆ سەرپێچیکەر لە فەرمانی «مرۆڤ مەکوژە» دادەنێت. ڕاسکۆڵنیکۆفیش دەتوانێت لە زینداندا تا دڵی حەز دەکات بیر بکاتەوە، تەنانەت دەتوانێت لەوەش پەشیمان بێت کە دانی بە تاوانەکەیدا ناوە؛ بەس خۆ ئامانجەکەی ئەو شتێک نەبوو لەگەڵ واقعیەتدا کۆک بێت، نەدەکرا سەرکەوتوو بێت، چونکە بانگی دەروونی پێی دەگوت کە ئەوە کارێکی نەشیاوە؛ ئەو بانگە دەروونییەی کە مرۆڤ گوێی لێ دەگرێت و ملکەچی دەبێت. دۆستۆیفسکی لە چیرۆکەکەیدا بەرگری لەم دیدگەیە دەکات کە ناتواندرێت لەڕێی بکە و مەکەوە (ئەمر و نەهی) ئەم سیستەمە ئاکارییە خوازراوە لەنێوان تاکەکانی مرۆڤایەتیدا جێگیر بکەیت، بەڵکە دەبێت بە هەمان ئەو پاڵنەرە دەروونییە پشتئەستوور بێت. ڕەوتی چیرۆکەکەش کتومت هەمان ئەم نیازەی نووسەر پشتڕاست دەکاتەوە. بە چواردەوری فەرمانی «مرۆڤ مەکوژە»دا هەڵایەک لە بەڵگە و دژەبەڵگە هەڵدەستێت، هەڵایەکی هێندە بەرز کە ئیدی تێیدا هیچ شتێک لەئاست تێگەیشتندا نابێت، بەڵام هەر لەگەڵ دەرکەوتنی ئەو پاڵنەرە دەروونییەدا، بەبێ هیچ قسەیەک، لە بێدەنگییەکی قورس و سامناکدا، هەموومان تێدەگەین کە تاوانکردن بە ناوی ئامانجی باشەوە سەرکەوتوو نابێت، هەروەها کارێکی بێمانا، دەبەنگانە و گوناحبارانەیە. دۆستۆیفسکی لە ڕۆمانەکەیدا لە زمانی هیچ کەسێکەوە ئەم وانانە بەیان ناکات، بەڵکە گرنگترین خاڵەکان بە شێوەیەکی نەدرکێندراو، بە جۆرێکی هەستی و بە ئاماژە ڕادەگەیەنێت. ئەم کتێبە لە هەناوی ئیمانێکی پتەوەوە هەڵقوڵاوە، نەک تابلۆیەکی ڕێنسانسی کە گوایە وێنەی خێزانە مەسیحییەکی پیرۆزی کێشاوە و بە ڕووالەت مەسیحیانە دەردەکەوێت، کەچی لە واقعدا سەراپا کفرئامێز و نامەسیحیانەیە، ئاخر هونەرمەند لە کاتی کێشانی نیگارەکەدا بیری لە جوانیی جەستەیی مۆدێلەکان و

جۆراوجۆریی ڕەنگەکان و بە کورتییەکەی هەموو شتێک کردووەتەوە بێ لە نهێنی و کۆدی پیرۆزی ئایینی مەسیح. ئەمە کتێبی نووسەری مۆدێرنە، بەرهەمێکی تەژی لە تامەزرۆیی دینی؛ هەر دەڵێی چرپەی ڕازونیازی یەکەمین مەسیحییەکانە لە قووڵایی ژێرزەمینەکانیانەوە.

بەدەر لەمە، چەندان جار ئاماژەمان پێ کردووە: «تیزی دۆستۆیفسکی»، دیدگەی دۆستۆیفسکی». تێزەکانی دۆستۆیفسکی هەر ئەوانەن کە ئاماژەمان بۆ کردن، بەڵام دەبێت بیرمان نەچێت کە ئەو بانگەشەچییەتی نییە، هونەرمەندێکی گەورەیە، هونەرمەندی گەورەی ململانێ و مشتومڕەکانە. تێزی ئەو لەگەڵ ئەنتیتێزەکەیدا دەکەوێتە ململانێوە—ڕێک وەکوو دوو زۆرانبازی نێو مەیدان بە دوو هێزی یەکسانەوە. ئەو لەو جۆرە گوتەبێژە وشکانە نییە کە هەر لە سەرەتاوە بە گوتەی ژیرانە تێزەکەی خۆیان دەردەبڕن و ئەنتیتێزەکەشیان بە قسەی گەمژانە دەورە دەدەن. تێز و ئەنتیتێزی ئەو لە مەیدانی ململانێیەکی تەن بە تەندا بە هێزی یەکسان و مەرگبارەوە ڕووبەڕوو دەبنەوە. ئەو هەرگیز لێناگەڕێت تەنانەت بەرزترین جۆری بانگەشە و فێرکاریش وێنای هونەرمەندانە و زۆرانبازیی کەسانی نێو مەیدانەکانی خەوشدار بکەن. لەوانەشە هەر لەبەر ئەمە بووبێت کە زۆر کەس وا دەزانن دۆستۆیفسکی دەیویست بڵێت: ئەری، مرۆڤ بکوژە.

بۆ خوێنەر ئەوە شتێکی سەختە کە لەوە تێبگات سەروکاریی لەگەڵ کتێبێکی ئایینیدایە (ئاخر ئەم ڕۆمانە هەر بە ڕاستی شیاوی ئەم ناونیشانەیە)، چونکە ڕۆمانەکە بە شێوەیەکی تۆقێنەر ڕیالیستییە. لە سەرتاسەری کتێبەکە و لە هەر لاپەڕەیەکیدا کە شەڕەنگێزی و ڕسوایی فوارە دەکات، تەنانەت یەک دۆخ، تەنانەت یەک هەلومەرجی نەشیاو، درۆیینە، ناڕاست یان دەستکرد بەدی ناکرێت. ئەم واقعگەراییە سامناکە مەودایەکی ئێجگار بەرینی لەگەڵ ئەو دۆخە ناسرووشتیانەدا

هەیە کە نووسەرانی دیکەی هاوسەردەمی دۆستۆیفسکی ئافراندیان. بۆ نموونە، ڕاسکۆلنیکۆف تۆبە دەکات، ڕووەو خەڵکی خوا سەری ڕێز دادەنەوێنێت و دان بە تاوانەکەیدا دەنێت. لێرانەدا ئاخۆ بێ لە دۆستۆیفسکی دەشێت کێ هەبێت چاو لە ڕێز و حورمەتی باو بپۆشێت، لەوەی کە خەڵکی لانیکەم گوێ لە قسەی کەسایەتیی چیرۆکەکەی بگرن. بەڵام دۆستۆیفسکی دەنووسێت کاتێک ڕاسکۆلنیکۆف لە بازاڕدا و بە بەرچاوی خەڵکییەوە پەشیمانی و شەرمەزاریی خۆی ڕادەگەیەنێت، هیچ کەسێک بەهەندی وەرناگرێت، تەنیا چەند کرێکار و کەسێکی ئاسایی کە نزیکتر لە هەموویان ڕاوەستاون، پێی پێدەکەنن. ڕۆحی ئەم بەرهەمە حەقیقەتی ژیانە، بەڵام چیرۆکەکە دیوێکی دیکەشی هەیە: گەورەشار. دۆستۆیفسکی یەکەمین نووسەری ڕووسییە کە وەسفی دیاردەی گەورەشار دەکات. کاتێک پاڵەوانەکەی پووشکین بە سواریی تاخورکەوە دەچێت بۆ قەراخ ڕێژاوی نێڤای پیتەربورگ، هەمووان دەزانن ئەو کێیە، دایکی کێ بووە و چ برە پارەیەک قەرزارە. زانیاریی پەیوەست بە پاڵەوانەکەی گۆگۆڵەوە بەرفراوان و لەسەرزارانە و لەگەڵ زەنگی زەنگۆڵەکانی ترۆیکایشدا ڕێ دەکات. کەچی لێرانە و لە شاری گەورەدا، بەرین و پەرش و هاوکات سیخناخ لە دانیشتوو، لە پیتەربورگدا، پاڵەوانە نەناسراوەکانی دۆستۆیفسکی –ئەرێ، کەسانێکی نەناسراو و ونناو و بە شێوەیەکی دەستپێڕانەگەیشتوو شاراوە لەنێو ئەم ئاپۆڕایەدا– ڕێگەی خۆیان تەی دەکەن. خەڵکی شار بەتەنیشت یەکدیدا تێدەپەڕن، شان بە یەکدیدا دەکێشن، کەچی هیچ شتێک لەبارەی یەکدییەوە نازانن و زیاتر لەم شارە مەزنەدا دەتوانن خۆیان بشارنەوە تا لە لێرەوارێکی چڕدا. ئێرە پیتەربورگە: دیمەنی بەرفراوان، شەقامگەلی ڕێک، کۆڵان و لاکۆڵان، کەنداو، ئاو، پارکەکان، شەقامگەلی ناوئاشنا، کڵێساگەلی گشتی و کڵێسای بچووک؛ شار بە هەموو تایبەتمەندییەکانییەوە، پلیکانگەلی شێدار و بەدبۆ و کونجوکەلەبەری بۆگەن و تاریک و

حەوشــەخەڵوەتییە[1] قووڵە چاڵئاســاکانی. پیتەربورگ، شــاری دوکانە بچووک و کەمڕووناکییەکان، شــــاری باران و گوڕ و بەفر و تەم. ڕەخنەگرانی ئەمڕۆیی، لە بارێکدا کە کتێبی دۆســـتۆیفســـکییان بە دەســـتەوەیە، هەنگاو بە هەنگاو بەو شـــەقامانەدا کە ناویان براوە، ڕێ دەکەن و تەنانەت بۆ هەندێک لە خانوو و مەیخانە و ڕێســـتۆرانتەکانی نێو ڕۆمانەکانیشــی دەگەڕێن و هەوڵی ناسینەوەیان دەدەن. گوایە ئەو بەردەشیان دۆزیوەتەوە کە ڕاسکۆڵنیکۆف دوای کوشتنەکە کەلوپەلە دزراوەکەی لەژێردا شـــــاردبووەوە. بەرهەمگەلێکی لێکۆڵینەوەیی لەبارەی «پیتەربورگی دۆستۆیفسکی»یەوە دەنووسرێت، گەڕانگەلێکی لێکۆڵینەوەیی بە ناوی «پیتەربورگ، بەو جۆرەی کە دۆســـتۆیفســـکی دیویەتی» ساز دەکەن. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، پیتەربورگی **تاوان و سزا** هاوکات هەم پیتەربورگی ڕاستەقینەیە و هەم ئەویش نییە. چونکە ئەو شـــــارە نەک هەر بە تەنیا پیتەربورگ، بەڵکە دیمەنی گشـــتیی گەورەشـــــارەکانە؛ بگرە شـــــارێکی گەورەتر لە شـــــاری پیتەربورگی ڕاســـتەقینەی ڕۆژگاری دۆســـتۆیفســـکی، شـــارێک کە تێیدا تەنانەت مرۆڤەکـان وننـاوتر، تەنیـاتر، ســـەرگەردانتر و بێبەهـاتریشـــن. دۆستۆیفسکی بە چاویلکەیەکی گەورەکەر لە شاری دەروانی و لەچاو شـــاریشـــدا بە چاویلکەیەکی بچووککەرەوەتر تەماشـــای مرۆڤەکانی دەکرد. ڕەنگە هەر لەبەر ئەم هۆکارەش بێت کە خوێنەران لە **تاوان و سزادا** بەدوای پیتەربورگی ڕاستەقینەدا دەگەڕێن، چونکە لەم چیرۆکە دووورودرێژەدا بێ ئەوەی تایبەتمەندییە پیتەربورگییەکانی لەدەســـت بـدات، جۆرێکە لە نیویۆرکی ســـەدەی بیســـتەم. ئەمە وێنـای گەورەشـــارێکە. خواوەند، دیتنی ئایینی و وێنای شـــارێکی گەورە – ئەمانە توخمەکانی **تاوان و سزان**– یەکەمین شاکار لەنێو شاکارەکانی

---

1. حەوشـەخەڵوەتی: حەوشـەیەک کە دەکەوێتە بەشـی پشـتەوەی خانووەوە. دیارە هەر بە ناوەکەیدا دیارە کە شوێنێکی چۆڵ، بێدەنگ و خەڵوەتە.

نووسەری گەورەی ڕووس. با لێی گەڕێین، چونکە من مۆڵەت نادەم خۆم بە هەڵسەنگاندنی ئەم بەرهەمە جیهانییەوە خەریک بکەم.

# ترا‌ژیدیانووس[1]

ریچارد پویر

«بەنیازم دەست بدەمە کارێکی بێپێشینە و سەیروسەمەرە، سێ شێوازی چاپی [٤٨٠ لاپەڕەی چاپی] لە ماوەی چوار مانگدا بنووسم کە دوو ڕۆمانی جیاواز پێک دەهێنێت، دانەیەک بەیانیان و ئەوی دیکەیان شەوانە کاری لەسەر بکەم، جا لە ماوەیەکی دیاریکراودا تەواویان بکەم. دەزانی، ئانا ڤاسیلیۆنای ئازیز، ئێستە تەنانەت هەتا بڵێیت بەم شتە سەیر و نائاساییانە دڵخۆشم. من بە هیچ شێوەیەک لە ڕیزی مرۆڤە وەڕەزکەر و چەقبەستووەکاندا جێگەم نابێتەوە...» دۆستۆیڤسکی بەم شێوە پڕ لە جۆشوخرۆشە تایبەتە لە هاوینی ١٨٦٦دا دۆخی نالەباری خۆی بۆ هاوڕێیەکی وەسف دەکات. لەو کاتانەدا تەمەنی چلوپێنج ساڵ بوو و دە ساڵی زیندان و دوورخرانەوە

---

١. ئەمە پێشەکیی وەرگێرانە ئینجگلیزییەکەیە، لەبەر بایەخی گرنگی ئەو پێشەکییە، بە باشم زانی وەریبگێڕمەوە و بیخەمە ڕیزی شرۆڤەکانەوە، چونکە هەر بە ڕاستی شرۆڤەیەکی تیروتەسەلە، جا بۆیەش وەک پێشەکی دامنەنایەوە، چونکە چارەنووسی زۆربەی کەسایەتییە سەرەکییەکان ئاشکرا دەکات و بەشێک لە ڕووداوەکان دەخاتە ڕوو، کە ئەمەش ڕەنگە لەزەتی خوێندنەوە نەهێڵێت و وا بکات خوێنەر بە تامەزرۆییەکی ئەوتۆوە شوێن گرێچنی ڕووداوەکانی ڕۆمانەکە و مەتەڵەکانی نەکەوێت (بەتایبەت بۆ ئەو خوێنەرانەی کە یەکەم جاریان بێت ***تاوان و سزا***) بخوێننەوە. «و. ک»

بە تاوانی «چالاکیی دژەدەوڵەتی»، مردنی هاوسەری یەکەم و نزیکترین برایی (میخاییل) ئەزموون کردبوو و ٤٣ هەزار ڕۆبڵ قەرزار بوو. ساڵێک بەر لەوە، بە ١٧٥ ڕۆبڵی گیرفانییەوە لە دەستی خاوەنقەرزەکانی لە وڵات ڕایکردبوو، هەڵبەتە پێشوەختە گرێبەستێکی لەگەڵ ف. ت. ستلۆفسکیی کتێبفرۆشی بێویژداندا واژۆ کردبوو کە بەپێی ئەو گرێبەستە، دەبێت تا تشرینی دووەمی ساڵی ١٨٦٦ ڕۆمانێکی نوێی بۆ بنووسێت، کە ئەگەر لەو کارەدا ناموراد بووبا (هەڵبەتە ستلۆفسکی هیوادار بوو ناموراد بێت) مافی چاپکردنەوەی سەرلەبەری کتێبەکانی ڕابردوو و داهاتووی دەبووە هی کتێبفرۆشەکە.

خۆشبەختانە دۆستۆیڤسکی توانیی ئەم کارە بێپێشینەیە ئەنجام بدات، گەرچی بەو شێوازەش نەبوو کە خۆی چاوەڕوانیی کردبوو. کارکردن لەسەر یەکێک لە ڕۆمانەکان، کە لە کانوونی دووەمی ١٨٦٦دا بە شێوەیەکی زنجیرەیی لە گۆڤاری ***ڕوسکی وستنک*** [پەیکی ڕووسی] چاپ دەبوو، هەتا پاییز ئەوی بە خۆیەوە سەرقاڵ کرد، جا لەم نێوەندەدا هێشتا یەک وشە لە کتێبەکەی ستلۆفسکی نەنووسرابوو. دواجار لەسەر پێشنیاری هاوڕێیانی پەلەنووسێکی (ئانا گریگۆریێونا سنیتکینی گەنج) دامەزراند، کە دوای ماوەیەک بووە هاوسەری. ***قومارچی***، کە لە مانگی تشرینی یەکەمدا بۆی خوێندرایەوە، لە کاتی خۆیدا ڕادەستی کتێبفرۆش کرا و دۆستۆیڤسکی لە مانگی تشرینی دووەمدا درێژەی بە کارکردن لەسەر بەرهەمە گەورەکەی دا، کە بە شێوەیەکی زنجیرەیی دەردەچوو – ***تاوان و سزا***: یەکەمین ڕۆمان لەنێو ئەو پێنج ڕۆمانە گەورەیەی کە تەقەللا هونەرمەندانەکانی دۆستۆیڤسکیی لە پازدە ساڵی کۆتایی تەمەنیدا گەیاندە کەماڵ.

هەوڵدانی ڕەخنەگر و لێکۆڵەران بۆ باس و شرۆڤەکردنی ئەوەی کە لەم ڕۆمانانەدا بەدییان کردووە، چیرۆکی فیل و هیندییەکانمان بیر دەهێنێتەوە کە هەر یەکەیان بەپێی دەستهێنان بە بەشێک لە لەشی

فیلەکەدا ئەویان وەسف دەکرد[1]: «مار»، «باوەشێن»، «درەخت»، «گسک»، «دیوار». بە کورتییەکەی دۆستۆیفسکی لەبارەی ئەم ڕۆمانانەوە، لە نامە و یادداشتەکانیدا بە شێوازێکی بێڕۆح، تێکترنجاو و ونرێکەر دەدوێ، ئاخر هیچ ڕۆمانێک نییە لەمانە بێڕۆح و تێکترنجاوتر بێت. ئەو هەمیشە ئامادە بوو لەگەڵ ئەو بابەتە تازانەی کە لە ڕەوتی نووسیندا دەیدۆزینەوە، دووبارە چاو بە گەڵاڵەکانیدا بخشێنێتەوە. هەر لەم بارەیەوە لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٨٦٥دا بۆ بارۆن ڤێرانگلی هاوڕێی نووسیی ئەو ڕۆمانەی کە ماوەی حەوت مانگ خەریکی نووسینی بووە (یەکەمین نووسخەی ***تاوان و سزا***) «ڕۆمانێکی گەورەی شەش‌بەشیی لێ دەرچووە. پێشتر دەستم کردبووە نووسینی و تا کۆتایی تشرینی دووەم ئامادەم کردبوو، بەڵام **هەموویم سووتاند**. ئێستە دەتوانم دان بەم کارەدا بنێم کە خۆم لێی ڕازی نەبووم. **پەیکەرێکی نوێ، گەڵاڵەیەکی نوێ** منی شەیدای خۆی کرد و ئیدی لەبەر ئەوە سەرلەنوێ دەستم بە کارەکە کردەوە. شەو و ڕۆژ ئیشی لەسەر دەکەم و سەرەڕای ئەوەش کارەکان وەک پێویست بەڕێوە ناچن. ڕۆمانەکە بەرهەمێکی شاعیرانەیە. مرۆڤ بۆ نووسینی وەها بەرهەمێک پێویستیی بە ئاسوودەیی ڕۆحی و هەستی هەیە...» ڕۆمان، لانیکەم ڕۆمانەکەی دۆستۆیفسکی، «بەرهەمی شاعیرانەیە» —

---

١. چیرۆکی «فیل و هیندییەکان» چیرۆکێکی ناسراوە و نازانم ئاخۆ تا ئێستە لە بەرهەمی چەند نووسەردا دووبارە بووەتەوە، وەلێ لە «مەسنەویی مەعنەوی»ی مەولانادا بەرچاوم کەوتووە و واتای چیرۆکەشیعرەکە بەم جۆرەیە: فیلێک لە شوێنێکی تاریک و داخراودایە و چەند هیندییەکیش بە چواردەوریدا، هەر کەسەو دەست لە شوێنێکی فیلەکە دەسوێت (لووت، گوێ، قاچ، کلک و سک) و بە گومانی خۆی بە شتێکی دیکەی تێدەگات. مەولانا لەڕێی ئەم چیرۆکەوە ویستوویەتی ئاماژە بەوە بکات کە مرۆڤەکان بەپێی ئاستی فکری و چۆنیەتیی جیهانی زەینیی خۆیان لە حەقیقەت تێدەگەن، وەک چۆن لە چیرۆکەشیعری «مووسا و شوان»یشدا هەر ئاماژە بە هەمان تێگەیشتن لەبارەی خواوەندەوە دەکات. «و. ک»

واتە هاوکات ئافراندن لە چەند بوارێکدا- جا بە لەبەرچاوگرتنی ئەمە، دەکرێت لە ڕەخنەگران ببوورین گەر لە تێگەیشـــتنی ئەم ڕۆمانەدا بە لاڕێـدا چووبن، چونکە یەکەمین بەلاڕێـداچوونی ڕەخنە ئەوەیە کە دەبێت بە وشـــەگەلی تاکمانایی قســـە لەســـەر دیاردەیەکی چەندمانایی بکات.

وەلـێ بەدەر لەمە، ئەمـانە جـۆرە ڕۆمـانـێـکـی نـوێ بـوون، فرەبوارییەکەیان هێندە پەرش و تەنانەت لێکدژ بوو کە کەم تا زۆر لە وەســـف بەدەرە. هەر بەو جۆرەی کە بەشـــێک لە ڕەخنەکان کە بە ڕاســتی ئاماژە بە تەکنیکی نمایشـــی و بایەخی زۆری نووســـینەکانی دۆستۆیڤسکی دەکەن و بەرهەمەکانی کۆتاییان بە «ڕۆمان-ترازیدی» ناو بردووە، کەچی بەشێکی دیکە، هەر بە هەمان ڕاستی، ئاماژە بەوە دەکەن کە ڕەگی ئەم ڕۆمـانـانە لە تەنزی منیپە و چەمکی کەرنەڤالی جیهاندایە. تاقانەیی دۆسـتۆیڤسـکی لە پێگەی هونەرمەندیدا، بۆ داهێنانی پەیکەرێک دەگەڕێتەوە کە دەتوانێت ئەم هەموو دژیەکییە لە خۆیدا کۆ بکاتەوە، ئەم قووڵاییانە هەڵبســـەنگێنێت (زەردەخەنەی کەرنەڤالی بە هەمان ئەندازەی ترازیدیا قووڵە)، هاوکات بە هیچ شـــێوەیەکیش لە نیشـــانـدانی جیهـانی هـاوچەرخ، بـابەتە ڕۆژانەییەکـان بە هەموو وردەکارییە باوەکانیانەوە ڕاناوەستێت. لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە ڕۆمانەکانی دۆســـتۆیڤســکی لە ســـەردەمی خۆیاندا بەند ناکرێن، بەو جۆرەی کە ڕۆمانەکانی تۆڵســـتۆی، تورگنێڤ و گانچارۆڤ بەندن؛ ڕۆمانەکانی ئەو لە خاڵە مێژووییەکەی خۆیان دەردەچن و بە چەشنێک ڕووبەڕووی ئێمە دەبنەوە کە هەر دەڵێیت هێشتا کۆتا قسەی خۆیانیان نەکردووە.

پرسـیارەکە ئەوەیە کە چ شـتێک بووە ئیلهامبەخشـی ئەم پاڵنەرەی دۆســـتۆیڤســـکی تا ئەم پەیکەرانە بئافرێنێت، ڕۆمانەکانی ئەو لاســـایی کامە واقعیەت دەکەنەوە، یـان ئـایـا دەتوانین لێرانەدا هەر وا بـاس لە

«لاســایی واقعیەت» بکەین؟ بۆ وەڵامدانەوە دەبێت بگەڕێینەوە ســەر ***یادداشــتە ژێرزەمینییەکان*** کە لە ســاڵی ١٨٦٤ و ســاڵێک بەر لەوەی دۆستۆیڤسکی دەست بە ***تاوان و سزا*** بکات، بڵاو بووەوە. ئەم ڕۆمانە بچووکە ناکۆکنوێنە ئاماژەی بە قەڵەمبازێک دەکرد، دەســتپێکێکی نوێ لە هونەری ئەودا، هەروەها بە مانایەک ســــەرلەبەری بەرهەمەکانی دواتری لە هەناوی ئەو ڕۆمانەوە هاتنە دەر. هەر دەڵێی ئەم ڕۆمانە بۆ خودی دۆستۆیڤسکیش وەک شتێکی سەرسووڕهێن دەردەکەوت. دۆســتۆیڤســکی هەوڵی دابوو وەڵامێکی ڕەخنەگرانە بۆ چرنیشــفســکیی کۆمۆنیســتی یۆتۆپیایی (لەبەرانبەر ڕۆمانە فێرکارییەکەیدا ***دەبێت چی بکەین؟*** بڵاوکراوە لە ســاڵی ١٨٦٣دا) بنووســـێت. جا لەبری گوتار، ڕۆمانێکی نووســی –هاوکات بەرگری و دانپێدانان– لەبارەی پیاوێکی بێناوەوە لە ژێرزەمیندا.

ململانێکانی دۆســتۆیڤســکی لەگەڵ ڕادیکاڵەکانی[1] دەیەی ١٨٦٠دا وا دیارە گۆڕانکارییەک لە بیروبۆچوونی ئەودا ئاشـــکرا دەکەن، بەڵام قســەوباس لەو جۆرە بابەتانەدا هێندە ئاســان نییە. ئەو وەک لیبراڵ و ڕەخنەگرێکی ملهوڕییەکانی دەسەڵات دەستی بە ژیانی ئەدەبیی خۆی کردبوو، هاوخەمی مرۆڤە بێنازەکان بوو، شەیدای ئەندێشەکانی فوریە و سن‌سیمۆن و دۆزخوازانی فەڕەنسی بووبوو، لە کۆتاییەکانی دەیەی ١٨٤٠دا لە کۆبوونەوە نهێنییەکانی دەستەی پێتراشفسکیدا ئامادە بوو، ئەو دەســـتەیەی کە خـاوەنی ئـامێری چـاپ بوو و دەیویســـــت نووسـراوەکانی فوریە چاپ بکات. ئەم کارەش بە گیرانی ئەو لە ساڵی ١٨٤٩ و زینـدانیکردنی لەگەڵ کـاری زۆرەملێـدا و دوورخرانەوەی کۆتـایی هـات. لە ***یـادگـارییەکـانی یـانەی مردووان***دا (گێڕانەوەیەکی نیوەداســـتانی لەبارەی ئەزموونەکانی ســـەردەمی زیندانییەوە)، کە یەکەمین جـار لە ســـاڵی ١٨٦٠ و ســـاڵێک بەر لە گەڕانەوەی بۆ

---

١. ڕادیکاڵ: بنیادخواز؛ لایەنگری گۆڕانکاریی بنەڕەتی، شێواز یان پێکهاتەگەل.

پیتەربورگ بڵاو کرایەوە، دەگێڕێتەوە کە دادەنیشت و لە گۆشەیەکی ئاسمانی شین ڕادەما و بیری دەکردەوە کە لەوێ، لەپشت دیوارەکانی زیندانەوە، ژیانێکی دیکە هەیە، ئازادی هەیە، جا ڕۆژێک دادێ کە زیندان جێ دەهێڵێت و ئەو ژیانە بەدەست دەهێنێتەوە کە چاوەڕوانییەتی و ئیدی خۆی لە هەر هەڵەیەک بەدوور دەگرێت.

ئایا ناکۆکیی دۆستۆیفسکی لەگەڵ ئایدۆلۆژیای ڕادیکاڵی دەیەی ساڵی ١٨٦٠ ئاماژەی بە گوناحبارێکی تۆبەکار دەکرد کە ئامادە بوو بڕوا بە دەسەڵات و ڕێبازی ئەرسەدۆکس و چاکەی ئەم جیهانە بهێنێت کە پێشتر دەرکی بە بەهاکەیان نەکردبوو؟ ئەگەر لەسەر بنەمای ***یادداشتە ژێرزەمینییەکان*** داوەری بکەین، ئەوا بە هیچ شێوەیەک وا نییە. شتێکی دیکە لە ئەودا، لە کەسایەتیی پیاوەژێرزەمینییەکەدا سەری دەرهێنا، ئەم «پیاوەی کە خاوەنی زەینییەتێکی بەرزە»، بەو هێرشکردنە گاڵتەجاڕێئامێزەیەوە بۆ سەر ڕێساکانی سرووشت، بیرکاری، هۆشمەندی، سوود، پێشکەوتن، شارستانییەت و بۆ سەر خودی ئەقڵ، قەشمەری بە «کۆشکی بلوورین»ی داهاتووی زانستی-یۆتۆپیایی چرنیشفسکی دەکات، وەلێ لەوەش زیاتر دەڕوات ئەو کاتەی کە ڕایدەگەیەنێت: «بەڕێزان، دوو کەڕەت دوو یەکسانە بە چوار ئیدی ژیان نییە، بەڵکە دەستپێکی مەرگە.» دەبێت ئاماژە بەوە بکەین کە سەرەتاکانی دەیەی ١٨٦٠ کۆمەڵێک چاکسازیی بە خۆیەوە بینی کە لەسایەی ئالێکساندەری دووەم، تزاری فریادڕەسەوە بوو -هەڵوەشاندنەوەی سیستمی ئاغا و ڕەعیەت، بنیادنانی دادگەیەکی ئاشکرا بە ئامادەیی لیژنەی دادوەری، چاکسازیی زەوینی، کەمکردنەوەی سانسۆر- کۆمەڵێک چاکسازی کە

لیبراڵەکانی[1] دەیەی ١٨٤٠ تەنیا بە خەون شتگەلێکی وایان دەبینی. بە هیچ شێوەیەک ڕوون نییە کە پیاوی ژێرزەمینی، ئەگەر ئەم جۆرە شتانەی بەلاوە گرنگ بان، ئەم کۆمەڵگە چاکسازی تێداکراوەی زیاتر لە «کۆمەڵگەی بیرمەندانەی داهاتوو» بە لاوە دڵخوازتر دەبوو یان نا. ئەو ژێرزەمینەکەی خۆی لە هەموو ئەم دونیایانە بەلاوە گرنگترە. سەرەڕای ئەوەش لە شوێنێکدا دەنگ هەڵدەبڕێت: «وەلێ لێرانەشدا من درۆ دەکەم! درۆ دەکەم چونکە خۆم دەزانم، وەک دوو کەڕەت دوو یەکسانە بە چوار، بابەتەکە ئەوە نییە کە ژێرزەمین باشترە، بەڵکە شتێکی جیاوازە، تەواو جیاواز، کە تینوویم، وەلێ هەرگیز دەستم پێی ڕاناگا!»

دیارە کە سنووری ئەم ململانێیە، ئەگەر ململانێ بێت، سنووری دژبەریی کۆمەڵێک ئەندێشە لەبەرانبەر کۆمەڵێکی دیکە تێدەپەڕێنێت. وا دیاربوو پاش گەڕانەوەی دۆستۆیفسکی لە تاراوگەوە، شتێکی سەیر بۆ ئەو ڕووی دابوو. دەتگوت ئەو دونیایەی کە لە زینداندا بە خەیاڵ وێنای کردبوو، دونیای ئاسمانی شین و ئازادی، ئیدی بۆی نەدەناسرایەوە و لەبری ئەو شتێکی دیکە دەرکەوت، حەقیقەتێک کە ئەو ئامادەی نەبوو و تەنیا دەیتوانی کتوکوێرانە بەدوایدا بگەڕێت. لە ڕاستیدا، جارێک وەسفی ئەزموونکردنی ئەو ساتە تەلیسماوی و خەونئامێزەی خۆی کرد، وەلێ سپاردییە ڕابردوو. لەگەڵ هەموو ئەوەشدا، ئەم وەسفە لە ***خەونەکانی پیتەربورگ بە شیعر و پەخشان***دا هات، بەرهەمێکی بچووک کە لە ساڵی ١٨٦١دا نووسرا. بە گەنجی ئێوارەیەکیان دەگەڕایەوە بۆ ماڵ و بەدیار سەیرکردنی درێژایی ڕێژاوی نێڤاوە ڕاوەستا:

---

١. ئازادی؛ ئاماژەی سیاسی و ئابووری کە لەسەر ئازادی و سەربەخۆیی ئابووری، کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی تاکەکانی کۆمەڵ دەڕوات و بەر بە دەسەڵات دەگرێت. «و. ک»

دواجار وا دەهاتە بەرچاو سەرلەبەری ئەم جیهانە، بە هەموو نیشتەجێیانییەوە، بەتوانا و لاواز، بە هەموو شوێنەکانی نیشتەجێبوونییەوە، جا چ لانەی هەژارەکان و چ کۆشکە بە زێڕ ساخدراوەکان، ئەلەم کاتژمێرەی دەمەوشەواندا لە خەونێکی خەیاڵی و سیحراوی دەچێت، خەونێک کە لەناکاوێکدا ون دەبێت و وەک هەڵمێک لە ئاسمانی شیندا دەڕەوێتەوە. کتوپڕ بیرکردنەوەیەکی سەیر لە دەروونمدا دەرکەوت. بە جۆرێک ڕاچەنیم وەک ئەوەی لەو ساتەدا دڵم تەژی بووبێت لە فوارەکردنی خوێنێکی گەرم کە کتوپڕ لەتاو هێرشی هەستێکی بەهێز هاتبووە جۆش، هەستێک کە تا ئەو ساتە بۆم نەناسراو بوو. دەکرێت بڵێم لەو ساتەدا دەرکم بە شتێک کرد کە تا ئەو کاتە تەنیا لە مندا جموجوولێکی هەبوو، بەلام هێشتا تێی نەگەیشتبووم. دەکرا بڵێم لە خۆمدا شتێکی تازە و بە ڕوونی دونیایەکی سەرانسەر نوێم دەبینی کە بۆ من نەناسراو بوو و تەنیا لە مەودای بیستراوگەلی ناڕووندا بەری کەوتبووم، لەڕێی جۆرێک لە نیشانەی تەلیسماوییەوە. لام وایە لەو خولەکە تایبەتانەوە بوو کە بوونی ڕاستەقینەی من دەستی پێ کرد...

لە هەمووی گرنگتر وردەکاریی دواتری ئەم ئەزموونەیە:

بەرەبەرە بە حەزەوە سەیری چواردەورمم دەکرد و کتوپڕ چاوم بە خەڵکانێکی سەیروسەمەرە کەوت. هەمووی ڕووخسارگەلی سەیری نائاسایی، پێکڕا بێڕۆح، بە دڵنیاییەوە کەسانێکی وەک دۆن کارلۆس یان پوسا نەبوون، بەڵکە کۆمەڵێک فەرمانبەری ڕاستەقینە و هاوکات، دەکرێت بڵێم، کارمەندگەلێکی خەیاڵی. ئەو کەسەی کە لەپشت هەموو ئەم ئاپۆڕایەوە خۆی شاردبووەوە، بە ئاشکرا خەریکی تەشقەلەکردن بوو و بە چەند دانە تاڵ و ئیسپرنگێکەوە خۆی سەرقاڵ کردبوو، جا یاریچەکانی بەردەستی دەجووڵانەوە و ئەویش پێدەکەنی و وەک کەرەستەی گەمە لە هەموو شتێکی دەڕوانی.

لە هەموو بەرهەمەکانی کۆتایی دۆســتۆیڤسـکیدا دەکرێت پێکەنینی تەماویی ئەم ئافرێنەر یان دێوە ببیســـتین. لێرانەدا تۆوی واقعیەتێک هەبوو کە هێزی لاســـاییکردنەوە ئەوی بانگهێشـــتی ململانێ دەکرد، «شتێکی تازەی» ناڕوون، دونیایەکی تەواو نوێ و نائاشنا، ڕاستەقینە و هاوکات خەیاڵی کە تا ئەو نەیویستبا نەیدەتوانی هیچ ڕووخسارێک بنوێنێت، وەلێ لەو دیمەنە ڕەویوەیە **ڕاستەقینەتر** بوو کە ئەو بەسـەر نێڤاوە تەماشای دەکرد. ئەوەی کە دۆستۆیڤسکی ئەم ساتە خەیاڵییەی تۆمار کردووە، وا دەگەیەنێت کە بە جۆرێک لە جۆرەکان لەو ســاتەدا خەریکی ژیانەوە بووە.

دۆسـتۆیڤسـکی دەیتوانی لەپشـت ئەندێشـەی ڕادیکاڵانەی کەسـانی وەک چرنیشفسکییەوە دەنگی پێکەنینی ئافرێنەر ببیستێت (نەک ئەوەی کە شـــوێنهاتە جددییەکانی ئەم ئەندێشـــانە بەهەند وەرنەگرێت؛ بەڵکە بەوپەڕی ڕوونییەوە پێشـــبینیی دەکردن). وەڵامەکەی ئەو دونیایەکی هاوشـێوەی ئەو دونیایە بوو کە پیاوە ژێرزەمینییەکە دەیبینی، پیاوێک کە هەمان ئەو ئەندێشـــانە تێفکرینەکانی ســـنووردار دەکەن، بەڵام پیاوێک کە تێگەیشـتووە ناتواندرێت بەم ئەندێشـانە ژیانی خۆی ڕوون بکاتەوە، لە ڕاســـتیدا بە هیچ یاســـا یان یەکپارچەییەکی لۆژیکی نـاتوانـدرێـت ڕوون بکرێتەوە. هەروەهـا نەک ئەوەش کە بکرێـت بە شێوازی یەک لەدوای یەکی ماناداری ڕووداوەکان بگێڕدرێتەوە، بەڵکە لەڕێی پەخشـــانێکی کێشـــدار و بەشـــکۆوە. ئەم ژیانە ســـەرانســـەر بێشـــیرازەیە، پڕ لە ڕووداوگەلی کتوپڕانە و چـاوەڕواننەکراو، نـاهەمـاهەنـگ و پڕوپووچ، بەســـــام و هـاوکـات گـاڵتەجـاڕانەیە. دۆستۆیڤسکی لەسەر بنەمای ئەمە هێرشی خۆی بۆ سەر جیهانبینیی ئەورووپـایی ســـەدەی ڕۆشـــنگەری (بەتـایبەتی بەو جۆرەی کە ڕۆشنبیرانی ڕووسی کەڵکیان لێ وەردەگرت) دەگشتێنێت.

بەر لە دۆســـتۆیفســـکی هەرگیز هیچ کەســـێک وەها کتێبێکی نەنووســیبوو. ناکامبوونی کتێبەکە لە گەیشــتن بە ئامانجی هەنووکەیی خۆی (وەڵامدانەوەی ئایدۆلۆژیای ڕادیکاڵی زەمانە)، جێی ســەرســامی نییە: دیالەکتیکەکەی ئەو بۆ ئەم ئامانجە هەتا بلێیت ئاڵۆز و لە ڕووی هونەرییەوە بۆ خوێنەری ئاســایی بێڕادە ســەمەرە و ئازاردەر بوو. لە ڕاستیدا، دانپێدانان بەم جۆرە شتانەدا لەبارەی خودەوە، بەو چەشنەی کە پیاوە ژێرزەمینییەکە دەیکات، هەروەها ئەو جۆرە تانەوەشـــاندنە ورد و چزوودارە لە بـاوترین «ڕاســـتییەکـان»ی کۆمەڵگە و ئەقڵی مرۆڤ، زیاتر دەستدرێژی (سنووربەزاندن)ـە نەک بەڵگاندن، هەر بەو جۆرەی کە پـاڵەوانە بێنـاوەکە خۆی لێی بەئـاگـایە. ***یـادداشـــتە ژێرزەمینییەکـان*** زەینی دووانەیی تـاوانبـار و ســـەرکێشـــێکی سنووربەزێنی هۆشیار دەردەبڕێت. وەلێ پیاوە ژێرزەمینییەکە تەنیا لە زەینیی خۆیدا ســـنوور دەبەزێنێت، لەڕووی فەلســـەفییەوە، لە ڕێی حەقیقەتێکدا کە خۆی پێیەوە هەڵدەواســێت هەرچەندە ناتوانێت ناوێکی لێ بنێت، چونکە دەزانێت ئەو ســـنوورانەی کە پێیـاندا تێدەپەڕێت هەرچۆنێک بووە نـادروســـتن، تەنـانەت ئەگەر بە هیچ شـــێوەیەک نەتوانێت ئەو «شــتە جیاوازە» پەیدا بکات کە لە ژێرزەمینەکەی خۆی باشترە.

لە ***تاوان و ســزا***دا، کە دوو ســاڵ پاش ئەوە بڵاو بووەوە، پاڵەوانی چیرۆکەکە سنووربەزێنێکی ڕاستەقینەیە-ڕاسکۆڵنیکۆف «بیرۆکەوان-بکوژ». هەروەها پەیوەندیی نێوان بینەر، دیمەنی جیهان و ئەم «شــتە تازە» یان «شــتە جیاوازە» (کە پێکەنینی ئافرێنەر ئاشـکرای دەکات)، کە لە بنەڕەتەوە لە ***یادداشتە ژێرزەمینییەکان*** و «خەیاڵی سەر ڕێژاوی نێڤا» یەکێکە، دووبارە دەردەکەوێتەوە. لە ڕاســتیدا لە بەشــی دووەمی ***تاوان و سزا***دا برگەیەک هەیە کەم تا زۆر هاوشێوەی ئەو ساتەیە کە دۆســتۆیفســکی لە ***خەونەکانی پیتەربورگ***دا وەســفی کردبوو. ڕۆژێک

دوای تووشبوونی تاوانەکە، ڕاسکۆڵنیکۆف خەریکە بەسەر پردێکی بان نێڤادا ڕادەبووریێت، جا ڕادەوەستێت و لە شار ڕادەمێنێت:

ڕاوەستابوو و جووڵەی نەدەکرد. تا ماوەیەکی زۆر لە ئاسۆ ڕاما. زۆر چاک شارەزای ئەو ناوە بوو. کە دەچوو بۆ زانکۆ، هەمیشە لە ڕێگەی گەڕانەوەیدا بۆ ماڵەوە سەدان جار بەبێ جووڵە لەوێدا ڕادەوەستا و لاڵ و کەڕ بەو دیمەنە بێوێنەیەدا واقووڕ دەبوو و نزیکەی هەموو جارێکیش بەدیار ئەو هەستە ناڕوون و تەلیسماوییەوە دۆش دادەما کە ئەو دیمەنە دەیخستە سەری. سەرمایەکی سامناک بەر گیانی دەکەوت؛ ئەو دیمەنە شکۆدارە لەو ساتەدا بۆ ئەو خاڵی و بێگیان بوو. هەر جارێکیش کە لە تێگەیشتنی خەمناک و ورکەری خۆی بۆ ئەو دیمەنە سەری دەسووڕما و لەبەر ئەوەی متمانەی بە خۆی نەبوو، دۆزینەوەی هۆکارەکەی دوا دەخست. ئەو دڕدۆنگی و کێشە ئازاردەر و دێرینانەی بە ڕوونی دەهاتنە بەرچاو و وای بۆ چوو کە ئەسڵەن بە هەڵکەوت نەبوو کە ئێستە خەریک بوو بیری لێ دەکردنەوە.

پێکەنینی بەرز لێرانەدا بووە بە سەرمای سامناک، ئافرێنەر بە «ڕۆحی وڕ و کەڕ» — مەتەڵەکە هەر وا ماوەتەوە، وەلێ شێوازی گوتەکە بە ئەندازەیەکی بەرچاو تاریکتر بووە. ڕاسکۆڵنیکۆف چەندان جار تووشی ئەم هەستە بووە؛ ئەم هەستە بەرهەمی تاوانەکەی ئەو نییە؛ بە پێچەوانەوە، ئێستە بە جۆرێک ئەوە بیر دەهێنێتەوە وەک ئەوەی کردەوەکەی تا ڕادەیەک یەکەمین هەنگاو بووبێت لە هەڵهێنانی ئەو مەتەڵەدا. ***تاوان و سزا*** ڕۆمانێکی تەلیسماویی ئێجگار ناباوە: تەلیسماویترین کەسایەتیشی خودی بکوژەکەیە.

لە نامە و یادداشتەکانی دۆستۆیفسکیدا زۆر شتمان لەبارەی ئافراندنی ئەم بەرهەمەوە دەست دەکەوێت. لە تەمووزی ساڵی ١٨٦٥دا گەشتی کرد بۆ دەرەوەی وڵات، لە زەینیدا کۆمەڵێک گەڵاڵەی بۆ دوو بەرهەمی جیاواز هەبوو؛ دانەیەکیان ڕۆمانێکی دووروودرێژ کە بڕیار

وابوو ناوی **هەمیشـــەمەســـتان** بێت و، هەر بەو جۆرەی کە خۆی لە کاتی پێشـنیارکردنیدا بۆ سـەرنووسـەری ***یادداشـتەکانی سـەرزەمینی باوک*** (کە پەسـەندی نەکرد) دەڵێت، خۆی بە «کێشـەی هەنووکەیی هەمیشـەمەسـتان»ـەوە خەریک دەکات؛ ئەوی دیکەشـیان، «گێڕانەوەیەکی دەروونناسیانە؟ تاوانێک»، بیرۆکەیەک کە پازدە ساڵ پێشـتر لە زینـدانـدا بە زەینیـدا هـاتبوو. هیوادار بوو زووتر ***هەمیشەمەستان*** تەواو بکات، کەچی لەبری ئەوە شـەیدای ڕۆمانەکەی دیکە بوو. لە ئەیلوولی سـاڵی ١٨٦٥دا توانیی ڕانانێک و گەلاڵەی ئەو ڕۆمانە بۆ میخاییل کاتکۆفی سـەرنووسـەری ***پەیکی ڕووسی*** بنێرێت. لە بنەڕەتدا وەک بەرهەمێک لێی دەڕوانی کە لەسـەر زاری کەسـی یەکەمەوە دەگێڕدرێتەوە—دانپێدانانی خودی تاوانبار. هەر بەو جۆرەی کە بۆ کاتکۆفی دەنووسـێت، بکوژ «کوڕە گەنجێکە بە ئەندێشـەیەکی پێشـکەوتنخوازانەوە کە تەنانەت مەیلێکیشـی بۆ چاکەکاری هەیە» و «لەژێر کاریگەریی هەندێک لەو ئەندێشـە سـەیرانەدا (ناتەواو)، بە شـێوەیەکی سـسـت و لەرزۆکانە مرۆڤ دەکوژێت...» بە دەربڕینێکی دی، بڕیار وا بوو ئەم چیرۆکە کنەکارییەکی وردتری شـوێنهاتەکانی ئایدۆلۆژیای ڕووسـی بێت، بەتایبەت ئایدۆلۆژیای نیهلیسـتەکان کە لە نیـوەی دەیەی ١٨٦٠دا دەرکەوت. ڕۆمـانەکە لەڕووی پەیـکەرەوە (چوارچێوە)، وەک ***یادداشـتە ژێرزەمینییەکان*** دەردەچوو. ئەمە هەمان ئەو نووسخەیە بوو کە دۆستۆیڤسکی لە کۆتاییدا سووتاندی.

ڕۆمانەکە لە پەیکەری تازەیدا، تایەتمەندییە گشتییەکانی پاڵەوانەکەی بە هەمان ئەو شـێوازە پاراسـتن کە دۆسـتۆیڤسـکی بۆ کاتکۆفی باس کردبوون، وەلێ بابەتەکانی بە ڕادەیەکی زیاد بەرفراوان بووبوون و ئیـدی لە چوارچێوەی دانپێدانـانـدا شـوێنیـان نەدەبووەوە. هەر لە دەسـتپێکی ***تاوان و سـزا***دا، ڕاسـکۆڵنیکۆف بە هەڵکەوت بە سـیمیۆن زاخارۆڤیچ مارمیلادۆف ئاشـنا دەبێت. بەسـەرهاتی ئەم فەرمانبەرە بێکارە، ژنە سـیلاوییەکەی (کاترینا ئیڤانۆڤنا) و خێزانەکەی لە لاپەڕە

لابراوەکانی ***هەمیشەمەستان*** بوو کە هاتە نێو ئەم ڕۆمانەوە؛ ئەڵقەی ئاسـایی پەیوەندیی نێوان ئەم دوو بەرهەمەش کە لە سـەرەتاوە هیچ پەیوەندییەکیان بە یەکدییەوە نییە، سـۆنیای کچی مارمیلادۆفە. ڕێک دوای ئەم دیدارە، ڕاسکۆڵنیکۆف نامەیەکی دووروودرێژی لە دایکییەوە پێ دەگات کە هەمدیسـان چیرۆکێکی دیکە دەهێنێتە نێو ڕۆمانەکەوە، کە چیرۆکی دونیای خوشکی و لوژنی دونیاپەرست و سڤیدریگایلۆفی بەدفەڕ و سـەرنجڕاکێشـە. ئیدی لەوسـاوە لەبری نەخشـەیەک سـێ نەخشـە بوونی هەبوو؛ جا ئێمەش بەرەبەرە شـتێک لە ڕەوشـی ئافراندنی دۆسـتۆیفسـکی لەم هاونشـییەی ***بکوژکان***دا دەبینین کە خۆی لە ئەنـدازەیەکی گەورەدا نمـایش دەکـات—لە مـاوەیەکی بێڕادە کورتکراوەی گێڕانەوەدا. بەشـی یەکەم لەگەڵ کوشـتنەکەدا کۆتایی دێـت، بەڵام پێشـوەختە بە ڕووبەڕووبوونەوە، گوتوبێژ و ململانێ ئاوساوە.

سـەرەوەختی بڵاوبوونەوەی یەکەمین بەشـی ڕۆمانەکە لە ژمارەی کانوونی دووەمی ١٨٦٦ی ***ڕوسکی وستنیک***دا، پرسـیارگەلێکی گرنگ لە زەینی دۆسـتۆیفسـکیدا بێوەڵام مابوونەوە. یادداشـتەکانی ئەو لە مانگی شـوباتدا نیشـانی دەدەن کە ئەو هەر وا خەریک بوو ڕۆڵی سـۆنیـا و، لەوەش گرنگتر، پـاڵنەری ڕاسـتەقینەی تـاوانەکەی ڕاسـکۆڵنیکۆفی نەخشـەڕێژ دەکرد. لە هەندێک لە نەخشـەکاندا، ئەو دەشـیـا ببێتە گوتەبێژی ئێجگـار زمـانپـاراوی نیهلیسـتەکـان کە «خۆپەرسـتیی ئەقڵانی»یان لەگەڵ دیدگەیەک لەبارەی خودەوە (وەک چاکەویسـتانی مرۆڤایەتی) تێکەڵ دەکرد. کەسـایەتیی ناپلیۆنیی «تاکی دەسـەڵاتدار» شـوێنی ئەم نەخشـەیە دەگرێتەوە کە لەپێناو دەسـەڵاتی خۆیـدا دەجووڵێتەوە. لە نووسـخەیەکـدا، بڕیـار وا بوو کـارەکەی ڕاسـکۆڵنیکۆف بە خەونی مەسـیح و کردەوەیەکی پـاڵەوانـانەی لەخۆبردووانە و بە ئاشـتی کۆتایی پێ بێت؛ لە نووسـخەیەکی دیکەدا سـەرکێشـییەکانی ئەو بە شـێوەیەکی تەواو شـەیتانی خۆیان دەنواند؛

دواجاریش بە گوللە خۆی دەکوشـت. ئاخیرییەکەی دۆسـتۆیڤسـکی بڕیـارێکی بە پێچەوانەی ئەم دوو ئـاکـامەوە دا، جـا پـاڵنەرەکـانی ڕاسـکۆڵنیکۆفیش بە نەنـاسـراوی مـانەوە، کە ئەمەش گەلێـک لە بەرژەوەندیی ڕۆمانەکەدایە. هەروەها دۆسـتۆیڤسـکی کە نیازی بوو ڕۆڵی نەیارێکی دەمڕاستی ئەندێشەکەی ڕاسکۆڵنیکۆف بداتە سۆنیا کە کەللەڕەقـانە دژایەتیی دەکرد و تەنـانەت نـامەگەلێکی بۆ دەنووسـی (هەڵگری چۆنییەتییەکی هونەریی بەرز بوون)، دواجـار تەنیـا ڕۆڵی شـایەتێکی کەم تا زۆر بێدەنگی ئەم نموونەیەی پێ دا. لە بەشـی چوارەمـدا لەجێی خەونـی مەسـیح، خوێنـدنەوەی گێڕانەوەی زیندووبوونەوەی عازر (لە ئینجیلدا) هاتووە. خۆپەرسـتیی ئەقڵانی دەستەنقەست بە نسیبی لوژن دەبێت، گوللەکەش بەر سڤیدریگایلۆف دەکەوێت.

لەگەڵ ئەوەی کە بابەتی ڕۆمانەکە دەچووە چوارچێوەی پەیکەرێکی تازەوە، جەختکردنەوە لەسـەر ئەندێشـەی سـەرەکیی دۆسـتۆیڤسـکی، واتە «گێڕانەوەی دەروونزانیی تاوانێک» و ململانێی بێوەستانی لەگەڵ نیهلیسـتەکاندا، کاڵتر دەبووەوە. جەختکردنەوەی لەسـەر بابەتێکی تایبەت لە ***یادداشتە ژێرزەمینییەکان***دا شـوێنی خۆی بۆ وێنای گشـتی بەرفراوانبووی جیهـانێکی جێگیربوو لە یەک سـاتی زەمـانیدا چۆڵ کردووە—جیهـانی کـاسـبکـارانی ڕاسـتەقینە و هـاوکـات خەیـاڵی، خاوەنمەیخانەکان، بۆیەچیانی بینا، سـووخۆران، ناسـتاسـیای شـیرپێکەنین، زامیۆتۆفی پۆلیسـی بەرتیلخۆر، لیبیزیاتنیکۆفی ڕادیکاڵی دەمارگیر و خۆشـەویسـت و ڕاگری بەدخووی هەڵەشـە. هونەری دۆسـتۆیڤسـکی تەنانەت بوونێکی سـەرنجڕاکێش بە بێبایەخترین کەسـایەتییەکانیش دەبەخشـێت، ئەمانەش بەردەوام لەسـەر سـەکۆی نمایش پاڵەپەستۆیانە و یەکدی بەرەو دواوە پاڵ پێوە دەنێن.

وێڕای ئەمەش، ***تـاوان و سـزا*** لەنێو ڕۆمـانەکـانی کۆتـایی دۆستۆیڤسکیدا زۆرترین تیشکی خستووەتە سەر بابەتێکی یەکپارچە.

کەسایەتییەکان و ڕووداوەکانی پێکڕا لە دەوری مەتەڵی ڕاسکۆڵنیکۆفدا دەخوولێنەوە. ڕاسکۆڵنیکۆف لەنێو چل دیمەنی ڕۆمانەکە لە سی و حەوت دانەیاندا دەردەکەوێت، ئێمەش تەنیا دەرفەتمان هەیە دزە بکەینە نێو زەینی و ئەو و هەروەها بۆ ماوەیەکی کورتتریش تێکەڵی زەینی سڤیدریگایلۆف ببین. لە لایەنێکی دیکەوە، پانتایی ڕووداوەکان ئێجگار بەربڵاوتر بووەتەوە؛ یان باشترە بڵێین، سنوورەکانی واقعیەتی وەسفهەڵگر، سنوورەکانی مرۆڤ لە سرووشتدا، دەسڕدرێنەوە. خەونەکان، وەرمەکانی[1] بێداری، تەنانەت ڕۆحەکانیش بە هەمان ئەندازەی بیناکان، پردەکان و ڕێڕاوەکانی پیتەربورگ بەشێکن لەم جیهانە؛ ئەو هێڵەی کە دونیای دەرەوە لە دونیای ناوەوە و دیاردە بەرهەستەکان لە دیاردە وەهمئاساکان جیا دەکاتەوە، کاڵتر دەبێتەوە. ئەمە دونیایەکی بزۆکی پڕ لە هەڵکەوت، بەرکەوتنی چاوەڕوانینەکراو بەڵام چارەنووسساز، قسەگەلێکی چارەنووسسازە کە بە هەڵکەوت دەبیسترێن و ئەم دونیایە لە شەقامەکان و مەیدانە پێکپەیوەستەکان، ژوور و ئەپارتمانگەلێکی دراوسێی نێو شار بەرجەستە دەبێت. پیتەربورگ پاشزەمینەی ئەو ڕووداوانە نییە کە دۆستۆیفسکی دەیانگێڕێتەوە، بەڵکە بەردەوام لە هەموو ئەم ڕووداوانەدا ڕۆڵی هەیە و ئاوێنەی ڕۆحی ڕاسکۆڵنیکۆفە. مەتەڵی شار و مەتەڵی پاڵەوانەکە یەکێکن.

مەبەست ئەوە نییە کە ڕاسکۆڵنیکۆف دەروونشێواوێکە و ناچار بەپێی دۆخی دەروونیی خۆی، لای وایە تێفکرینەکانی لە سەرووی جیهانەوەن. ڕاستییەکە ئەوەیە کە ئێمە هەموومان بەو جۆرە دەبینین کە هەستی پێدەکەین، یان باشتر بیڵێم، دیدی ئێمە دایمە ئاڵۆز، بەردەوام ئاکاری، هەمیشە مەعنەوییە: ئێمە جوانی و ناشیرینی «دەبینین»، چاکە و خراپە «دەبینین». کۆشش بۆ خۆخاڵیکردنەوە لەم

---

[1]. وەرم: خەون. وەرمەکانی بێداری؛ خەونەکانی بێداری.

جۆرە ئاڵۆزیانە، دابڕان و جیاییگەلێکی تۆقێنەری لە ڕاسکۆڵنیکۆفدا لێ دەکەوێتەوە. ئەو ناوەکەی لە وشەی **ڕاسکۆلنیک**ـــەوە دێت بە واتای «دابڕاو»، کەسـێک کە لە پەیکەری کڵێسـا جیابووەتەوە؛ بەڵام ئەو هەروەها لە کێشـمەکێش لەگەڵ خۆشـیدا بووەتە دوو پارچە. هەر بەو جۆرەی کنستانتین ماچۆلسکیی ڕەخنەگر دەنووسێت، ئەو «دێوێکە و لە ڕۆحی هیومانیسـتێکدا هێلانەی کردووە.». ئەقڵێک کە ئەو متمانەی پێ دەکات، ئەو بەرەو تاوانکاری ڕێنوێنی دەکات، سـەرەڕای ئەوەش، ئەقڵ نـاتوانێت لەو کـاتەدا کە ئەو پێویسـتیی بە تەورە، بیخـاتە بەردەسـتی. ئەوە بەختە کە ئەم کارە دەکات، بەخت بەردەوام ئەو دنە دەدات و دەیکاتە گاڵتەجاڕ. پیلیڕاکیشـانی ئەو، سـنووربەزاندنی ئەو (مانای سەرەکیی وشەی ڕووسی بۆ «تاوان» «سنووربەزاندن»ـە)، لەگەڵ چەند لایەنێکی جیهان و خۆیدا ڕووبەڕوو دەبێتەوە کە پێشبینیی نەکردبوون و نەیدەتوانی تێیان بگات. ڕاسـکۆڵنیکۆف خوێندکاری بەشـی مافی زانکۆ بووە، بەڵام ئەوە پۆرفیری پیترۆڤیچی نوێنەری یاسا و ڕێتێنەچووترین و جادووبازترینی لێکۆڵەرەکانە کە پێی دەڵێت:

> دەبێ ئەوەمان لە بەرچاو بێ کە ئەو دۆسییە گشتیانە بوونێکی دەرەکییان نییە تا لات وابێ شـێوازە یاسـاییەکان و ڕێکار و ئەم جۆرە شـتانەیان بەتایبەت بۆ ئەوانە دانابێ، بۆچی؟ چونکە هەر دۆسییەیەک، بۆ نموونە هەر تاوانێ، هەر لەگەڵ ڕوودانیدا، دەبێتە بابەتێکی تایبەت و تەنانەت هەندێ کاتیش هێندە ڕیزپەڕە کە تا ئێسـتە هـاوشـێوەی ئەوە ڕووی نەدابێ، هەنـدێ جـاریش بەسەرهاتەکان زۆر گاڵتەجاڕانە و مایەی پێکەنین دێنە بەرچاو.

دەتوانین ئەم گوتەیە لەبارەی ڕێسـاکانی ئەقڵ و سـرووشـتیشـەوە بەکار ببەین. ئەو دونیایەی کە ڕاسـکۆڵنیکۆف بەرەبەرە لە سـاتی جێهێشتنی «کونەمشک»ـەکەی و قوڵهەڵماڵین بۆ تاوانە ئەقڵانییەکەیدا ئاشکرای دەکات، پشتی بە هیچ جۆرە ڕێسایەک ئەستوور نییە، بەڵکە هەمدیسـان، بە «شـتێکی جیاواز» پشـتئەستوورە. هەر ئەم پۆرفیرییە

لە کۆتایی ڕۆمانەکەدا بەو دەڵێت هێشـــتا ســـاڵانێکی زۆری لەبەردەم دان و پێیوســـتە «بێتە ژێر باری ئەو ئازارە»وە و بژی: «وەڵێ هێندە بە زیرەکیی خۆتانەوە مەنازن، تەنیا ڕاســتەوڕاســت خۆتان بســپێرنە دەســـــت ژیــان، بەبێ بەڵگـانـدن.» بەڵام ڕەنگە لە بەرهەمەکـانی دۆستۆیڤسکیدا کینایە هیچ دیمەنێک لەمە کامڵتر نەبێت.

کینایە لە دیدی دۆســـتۆیڤســـکیدا بە هەڵکەوت نییە. لێرانەدا کینایە لەچاو هەر شـــتێکی شـــوێنێکی دیکەدا، لە ڕســـوایی و بێهوودەییە پێکەنینـاوی و تەنـانەت گـاڵتەجـاڕانەکـانیش کە مەرگی تۆقێنەری مـارمـیـلادۆف و ڕێـوڕەســـــمـی نـانـخـواردنـی تـازیەی پـاش بەخاکســـپاردنەکەیان دەورە داوە، ئاشـــکراترە. بەس ڕووداوگەلی پێکەنیناوی لە ســـەرانســـەری ڕۆمانەکەدا زۆرن. تەنانەت بەســـەرهاتی سەرەکیی ڕاسکۆڵنیکۆف و ململانێی لەگەڵ «چارەنووس»دا بەردەوام لە ئاســـتانەی کۆمیدیادایە. لەبەر ئەوە بەشـــێکی زۆر لە کردەکانی ڕۆمانەکە چۆنییەتییەکی نمایشـــیی ســـەیریان هەیە و دۆســـتۆیڤســـکی هەمیشـــە بۆ دیمەنرازاندنەوە زاراوەگەلی نمایشـــی بەکار دەهێنێت (چەنـدان جـار کتوپڕانە ئـامـاژە بۆ «تەمـاشـــاڤـانـان» دەکـات کە وەرگێڕەکانی پێشوو ئەم وشەیەیان بە مانایەکی دیکە دەربڕیوە). ئایا ئەمـانە خەڵکـانێکی ڕاســـتەقینەن یـان ئەکتەری جۆرێک لە نمـایش؟ بنەڕەتی هونەری دۆســـتۆیڤســـکی ئەوەیە کە «دیمەن» بەردەوام گۆڕانکاریی بەســـەردا دێت و لە هەر ســـاتێکدا بۆی هەیە ڕۆبچێتە قووڵایی تۆقینەوە یان تا ترۆپکی پێکەنین هەڵبکشـــێت. ســـەرەڕای هەموو ئەمەش، ئەم کینـایەیە تۆخییەتیی ئـازار کـاڵ نـاکـاتەوە. بە پێچەوانەوە، چ نووســـەرێک توانیویەتی وا بە ڕووتی ئازار نیشـــان بدات؟ جا ئەمەش کتومت لەبەر ئەو هۆکارەی کە خۆدزینەوە ئەقڵانی یان هەســـتییەکانی ئێمە بە ڕەوا نازانێت. لە ***تاوان و ســـزا***دا ئازار لە ترۆپکی خۆیدایە؛ بێچارەیە؛ هیچ یاسـایەکی نییە. کینایە لە جەوهەرەکە نزیک دەبێتەوە، بەڵام لە واقعیەتەکەی نا.

دواهەمین کینـایە خراپەیە. ئەقڵ نـاتوانێت ئەو پەســەند بکـات؛ ئایدۆلۆژییە بانگەشـەکارەکانی ئەقڵانیەت نکۆڵی لە بوونی ئەو دەکەن. هیچ کەسێک ناوی ناهێنێت، ئەم بێدەنگییەش قورساییەک دەخاتە سەر رۆمانەکە، چونکە دونیای *تاوان و ســزا* ســیخناخە لە خراپە، تا ئەو ئاستەی کە خراپە بەرهەست دەبێت. خراپە توخمێکی پەستاوتەیە کە راســکۆلنیکۆف بێ ئەوەی خۆی بزانێت، بەنێویدا رێ دەکات. توانای بەدیکـردنـی خـراپە، کە ئەو لـێـی بەریـیە، وا دیـارە دواجـار بە ســڤیدریگایلۆف دەبەخشــرێت. لە بەشــێکی بەر لە کۆتاییدا، کردە و دیمەنی رۆمـانەکە بە مـانـا راســتەقینە و مەجـازییەکەی لە ئـاودا خووساوە–خووساو بە بارینێکی لافاوئاسا، لە ترسی سڤیدریگایلۆف لە ئـاو، لە خەونەکـانی دەربـارەی هەڵچوونی نیڤـا، کچەی خنکـاو، کچۆلەیەکی ســەرتاپا خووســاو کە هەوڵ دەدات یارمەتیی بدات. «مرۆڤی سرووشتی»، مرۆڤی غەریزە و ئیشتیها، وای بۆ دەچێت کە دەتوانێت بگاتە خاڵێک کە خراپە دەگۆڕێت بۆ پاکی، وەلێ ئەوەی کە بۆ بەرد یان بەور رێی تێدەچێت بۆ مرۆڤ نەکردەیە. ســڤیدریگایلۆف لە شــتێکدا نغرۆیە کە ســیمیۆن وی بەم جۆرە وەســفی دەکات: «نەگۆڕیی خراپە: هەرگیز شــتێکی نوێ نییە، لێرانەدا هەموو شــتێک *هاوبەهایە*. هەرگیز شــتێکی راســتەقینە نییە، لێرانەدا هەموو شــتێک خەیاڵییە. لەبەر ئەم نەگۆڕییەیە کە چەندایەتی رۆڵێکی ئاوها گرنگ دەگێڕێـت... مەحکومبوون بە ئەبەدیەتێکی درۆیینە. ئەمە خودی دۆزەخە.» ســڤیدریگایلۆف ناتوانێت لێی دەرچێت. راســکۆلنیکۆف، گەرچی پڕە لە درۆ و خۆفریودان، بەڵام هەر بەو جۆرەی کە رازومیخینی هاورێی دەڵێت، هێشــتا رێی تێدەچێت «لەرێی درۆوە بگـاتە حەقیقەت.» و لە رۆحیـدا جموجوولێـک هەیە. لە رۆحی ســڤیدریگایلۆفدا، وێڕای راســتگۆییە ســەرســوورهێنەکەی، هیچ جموجوولێک نییە.

تەنیا یەک «ڕووداو» وەڵامی ئامادەیی بەرگریلێنەکراوی خراپەی نێو ڕۆمانەکە دەداتەوە و ئەویش زیندووبوونەوەی عازرە. هەڵبەتە ئەم ڕووداوەش تەنیا دەگێڕدرێتەوە و ســـۆنیا لە دەقەکەدا دەیهێنێت. ئەقڵ ناتوانێت ئەمەش پەســـەند بکات. لەنێو مردووانی چ دونیایەکدا عازر دەتوانێت زیندوو ببێتەوە؟ وەها ڕووداوێک کەموکوڕی دەخاتە نێو سەرلەبەری ڕێساکانی ئەقڵ و سرووشتەوە. ئەم «بابەتە تایبەتە»، دەگمەنە. ڕاسکۆڵنیکۆفی شپرزەڕۆح، پیاوی ئەقڵ، «تاکی دەسەڵات»ی داهاتوو، دەکەوێتە نێوان سۆنیا و سڤیدریگایلۆفەوە و ناتوانێت بڕیار بدات. تەنانەت لە کۆتاییدا و لەبەرانبەر ئەم جیهانەدا کە لای وایە بە شـێوازێکی کوێرانە شـکسـتی بەو هێناوە، هەڵدەسـتێتەوە. بەڵام ئەو بەشـەی بوونی ئەو کە نەبووەتە کۆیلەی ئەقڵ و بەو جۆرە سـامناکە لێی دابڕاوە، لەبەرانبەر ویستی ئەودا وەستاوەتەوە. ڕاسکۆڵنیکۆفیش چون ســڤیدریگایلۆف هەر لە هەمان ئەو شـــەوە بارانی و زریانییەدا ڕۆژ دەکاتەوە، ســـەرەڕای ئەمەش هەر ناتوانێت ئەو ڕێی هەڵهاتنە بگرێتە بەر. ڕوو لە سۆنیا دەکات و بە هەنگاوی هێواش و بەئازارەوە دەسـت دەکاتە شـەقاونان بەرەو «واقعیەتێکی نوێ و تا ئێسـتە تەواو نەناسراو» و دۆستۆیڤسکی لەوێدا بە تەنیا جێی دەهێڵێت.

ئێمەش لێرانەدا خوێنەری ئەم پێشەکییە لەگەڵ هەموو ئەوەی کە بە نەگوتراوی ماوەتەوە بە تەنیا جێ دەهێڵین، چونکە ژیانی ڕۆمانێک نەک لە ئەندێشـــە، بەڵکە لە کردەوەدایە و پوخت ناکرێتەوە. لە هەر هەڵکشان و داکشانێک، هەر ئاواز، لە بوونبەخشین بە هەر کەسایەتی و دیمەنێکی ئەم «بەرهەمە شـیعرییە» تێکترنجاوەدا، دۆسـتۆیڤسـکی لێوەشاوەیی خۆی نیشان دەدات. گەر وەرگێڕانەکەی ئێمە نەیتوانیبێت وەک پێویست ورد پەیڕەویی لێ بکات، ئەمە دەبێتە باشترین شرۆڤە.

ڕیچارد پاڤیەر

